# تەفسیری ڕەوان

## (بۆ تێگەیشتنی قورئان)

نووسینی :
مەلا مەحموودی گەلاڵەیی

بەرگی (یەکەم)

جزمی (١.٢.٣)

بسم الله الرحمن الرحيم

.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★


- ناوی کتێب: تەفسیری ڕەوان
- نوسینی: مەلا مەحموودی گەلاڵەیی
- تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: ﴿٢١٤٠﴾ی ساڵی ٢٠١٣ز پێدراوە.
- چاپ و دیزاین: ﴿سامان محمد أمین﴾.

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

**پێشــەكـــی:**

سوپاس بۆ خودا كە هەر لە منداڵیەوە لەگەڵ قورئاندا پەروەردەی كردم، زوبانی لاڵە پەتەم بە قورئان پڕاو بە وشەكانی راست بووەوە، سوپاس بۆ پەروەردگار كە رێبازی قورئانی لەدڵدا شیرین كردمو جگە لەو رێبازە شەقامە رێیە، رێچكەی ترم رەچاو نەكرد، سوپاس بۆ یەزدان كە هەلی بۆ رەخساندم لەخزمەت مامۆستای پایەبەرزو خوالێخۆشبوو، مامۆستا مەلا موحەمەدی گەلاڵە ناسراو بە (مەلا موحەممەدی رەئیس) هەموو قورئان بەمەعناوە بخوێنم!!

سەیر بوو من لەباتی ئەحمەدیو عەوامیلی جورجانیو تەصریفی زنجانیو ئەو كتێبە سەرەتاییانە، لەسەرەتاوە بۆ كۆتایی قورئانم بەمەعناوە خوێند.!

بەڕاستی لەگەڵ ئەوەدا كە پێش ئەو كاتە من هیچ شتێكم لە زمانی عەرەبی نەخوێندبوو، ناسیاوو قوتابی لە خۆشم بەرەو ژورتر پێیان سەیربوو من یەكسەر قورئان لە باوەش نێمو بەمەعناوە بیخوێنم! بەڵام ئەو قورئان خوێندنەم بەمەعناوە لای ئەو زاتە پایەبەرزە (خودا پایەی بەهەشتی بەرزتر بكا) دەرگای زمانی عەرەبی بۆ كردمەوە، تەماعی بەرنام بۆ درێژەدان بە خوێندنو هەوڵدان بۆ بەرەوپێشەوە چوون! لەوە بەولاوە لە فەڕو بەرەكەتی ئەو قورئانە پیرۆزەوە، هەر شتێكم دەست دەدایە بە ئاسانی لێی حاڵی دەبووم، لە ماوەیەكی كورتو قیاسیدا زۆربەی زانیاریەكانی ناو حوجرەی فەقێیانم تاووتوێ كردن، لە پەیمانگای ئیسلامیو ئەنجار كۆلێژی شەریعەو پاشان خوێندنی باڵای زانكۆی بەغدا سەرم دەركرد، لە بواری زانستە ئیسلامییەكاندا كەرەستەم بەدەست هێنا، دەستو دووی خۆم ناسی، گەلێ بواری نووسینم بەتاقی كردنەوەو تا ئەندازەیەكیش سەركەوتنم بەدەست هێنا! تەماعی ئەوەم كرد تەفسیرێك بۆ قورئان بنووسم، كەڵكەڵەی ئەنجامدانی ئەم مەشروعە چووە مێشكمەوە، هەراسانی لێ هەڵگرتم! قەڵەمم تاودایەو دەستم بە تەفسیر كردن كردو ملم لێ نا دەست لە دەستو قووەت لە خودا!

## پێشەکی

جا هەرچەندە من خۆم بە سوارچاکی ئەم مەیدانە نازانم و تەفسیر کردنی قورئان دەریایەکەو مەلەوانی خۆی دەوێ، بەڵام عەرەب وتەنی ئەرك بە گوێرەی توانایەو چیم لەدەست دێ ئەوەمو هەر ئەوەم لەباردایە. هەر شتێك هەمووی ئەنجام نەدرێ واز لە هەمووی ناهێندرێ، دیاری شوان یا شنگە یان تاڵەکۆکە! هەر دەوەنۆکەن دەبن بەدارو ڕێبازی سەرکەوتن لەیەکەم هەنگاوەوە دەست پێ دەکات! بۆیە بڕیارمدا وەندێکی بۆم بکرێ لەخزمەت قورئاندا بم و واز لە هەموو نوسینێك بێنم، هەموو مەشروعەکانی ترم بەلاوە بنێم، ژیانی خۆم تەرخان بکەم بۆ لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی نامەی پەروەردگار بە زمانی شیرینی کوردی، ئەگەر خودا بکاو بەشێکی کەمیشی وەربگرێ ئەوە تێشووی قیامەت و قازانجم یەك بە هەزارەو بەڵکوو زیاتریش!

هەڵبەتە پێش من، مامۆستایانی پایەبەرزو خوالێخۆشبووانی وەکوو مامۆستا مەلا موحەممەدی کۆیی (مەلای گەورە) مامۆستا مەلا حوسێنی شێخ سەعدی کۆیی و مامۆستا مەلا موحەممەدی خوا هەرزادی پێنجوێنی و مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ (گۆڕیان پڕ نور بێ) هەروەها مامۆستا مەلا عبدولکەریمی مودەڕیس و مامۆستا مەلا عیمانی هەڵەبجە (عثمان عبدولعزیز) - سێبەریان بەر قەرار بێ – لەبواری تەفسیرکردنی قورئاندا بەزمانی کوردی ئەسپی خۆیان هەلینگ داوە.

تەفسیری هەر یەکێك لەم زاتانە تام و بەرامی خۆی هەیە، هەریەکەیان دار گوڵێکە لە باغستانی پڕ فەڕی قورئانی پیرۆزدا، هەوڵ و تێکۆشانە بۆ ئاشنا کردن و تێگەیاندنی موسوڵمانی کوردزمان لە کەلامی پەروەردگار، هەبوونی ئەم تەفسیرانە ڕێگەیان بۆ من خۆش کرد: کە لەو دەرگایە بدەم و خۆی تێدا بە تاقی بکەمەوە، خۆ لە پێڕی ئەو زاتانەدا تۆمار بکەم با لە پەراوێزیشدا بێ! هەڵبەتە لەگەڵ هەبوونی ئەو هەموو تەفسیرانەی کە بەزمانی کوردی بۆ قورئانی پیرۆز نوسراون، هێشتا زۆر کون و کەلەبەری تێدا ماون نووسەری کورد خۆیان تێدا تاقی بکاتەوە..

چونکە قورئان دەریای بێ بن و بێ ئەمسەرو سەرە، هەرگیز مانای تەواو نابێ و دوڕڕو مەرجانی ماناکانی تەواو نابن! کەلامی خودایەو لەبن نایە، کەتەلۆکی بوونەوەرەو ڕۆژ بەڕۆژ

## پێشەکی

مانای تازەو ئاماژەی نوێی تێدادەبینرێن ﴿قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا....﴾ زۆر گوتن قورئـان خۆشـەو چـەندێکی لەبارەیەوە بنووسریٚ هێشتا زۆری مایە!!

ئاشکرایە شەقڵی تەفسیرەکەی من جیاوازە لە هی تەفسیرەکانی تـرو تایبەتمەنـدی خۆی هەیە، خوێنەر بەئاسانی هەست بە گرنگی ئەم جۆرە تەفسیرەو شەقڵی تایبەتی کارەکەی من دەکا، چونکە لەگـەڵ ئـەوەدا کـە هـەوڵم داوە بـە کوردیـەکی رەوانو پـاراو بینووسـم، بەچاولێکەری لەو تەفسیرە عەرەبییانەی کە لە قوتابخانەی شێخ موحەممەدی عەبدە کـەڵکیان وەرگرتووە هاتووم ئایەتەکانم بەش بەشو برِبرِ کردووە، بـۆ هـەر کۆپلـەو کۆمەڵـە ئایـەتێك سەرەباسێکم داناوەو پەیوەندی نێوان ئەم کۆپلەیەم لەگەڵ کۆپلـەی پێـشوودا دەسـت نیـشان کردووە، بەگوێرەی پێویستیش هۆکاری هاتنـە خـوارەوەی ئایەتـەکان (أسباب نزول الآيـة)م دیاری کردووە، ئەجا ئـەوەی بەپێویـستم زانیبـێ بەشـێوەیەکی کـورت حـوکمی ئایەتـەکانم دەرهێناوە!

لـەم راڤەکردنەمـدا پـشتم بـەزۆر تەفـسیری عـەرەبی بەسـتووە، شـتێکم نەنووسـیوە نەمدیبێ، هیچ کاتێ لە خۆوە مانایەکم نەنووسیوە نەنووسرابێ!

**بەشێوەیەکی گشتیو هەمەکاتی بۆ هەموو ئایەتێك لەم تەفسیانەم روانیوەو کـەڵکم لیٚ وەرگرتوون:**

١- ﴿تفسير القران الحكيم﴾ ناسراوە بە ﴿تفسير المنار﴾ دانـراوی مامۆسـتا موحەممـەد رەشید رضا ج ١-١٢.

٢- تفسير المراغي: دانراوی ئەحمەد مصطفى مەراغى ج ١-١٠.

٣- تفسير المنير دانراوی د. وهبە الزحيلي ج ١- ٣٠ لە شانزە جلْدا.

٤- في ظلال القران، دانراوی مامۆستا سەيد قوطب ١ - ٨.

٥- صفوة التفاسير دانراوی موحەممەد عەلی صابونی ج١ - ٣.

٦- تفسير ابن كثير دانراوی ئیسماعیل کوڕی عومەری قورِیشی ﴿إبن كثير﴾ ج ١- ٤.

٧- تەفسیری نامی دانراوی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم موحەممەد ﴿بیارە﴾ ج﴿١-٧﴾.

٨- تەفسیری خاڵ ﴿ئەو حەوت جزمانەی تەفسیری کردووە﴾.

٩- تفسير ايات الأحكام للشيخ على سايس ج ﴿١-٤﴾.

١٠- تەفسیری قورطوبی ج ﴿١-٢٠﴾.

تکام لە خوێنەرانی ئەم تەفسیرە پیرۆزە ئەوەیە: کە بەچاوێکی دڵسۆزانە بیخوێننەوە، هەر هەڵەیەکیان بینیو دڵنیابوون کەبە هەڵەچووم بەهەر هۆیەك کە بۆیان دەست دەدا ئاگادارم بکەنەوە، جگە لەوەی کە پاداشیان لای خودایەو ماندو بونیان بەزایەناچێ، منیش دەستی سوپاسو ئەمەکیان بۆ بەسینگەوە دەگرمو هەوڵ دەدەم لەداهاتوودا هەڵەکانم هەڵبگرمەوە!

خودا یارمەتیدەری هەموولایەکمان بێ.

مەحموود ئەحمەد محمد

سلێمانی ، تەمووزی ١٩٩٦/

## پێشەکی

**تێبینی**:

مامۆستای پایە بەرزو ئەدیبو زاناو خوانـاس: مامۆستا مەلا شێخ (عبدالرؤوف)ی بێژوەیی بەرگی یەکەمو دووەمی (تەفسیری رەوان)ی خودێندۆتەوەو بەم چامە شێعرە کلاسیکییە هەستی خۆی بەرامبەر تەفسیری ناوبراو دەربڕیوە، گەلێکی بە شانو باڵی بەندەدا هەڵداوە، دڵنیام حوسنی ظەننی هەیەو خوا پاداشی بداتەوە؛ ئەگینا من خۆم بە شیاوی ئەو پەسەنییە نازانمو کە دەیخوێنمەوە تك تك ئارەقی شەرم دەرێژم!

بەو پەڕی شانازیو فەخریشەوە لەسەر فەرمانی مامۆستا خۆی، چامە شێعرەکە لێرەدا بڵاو دەکەمەوە. هیوادارم لە ئاستی حوسنی ظەننی ئەودا بمو نزای نفووسی پاکی گاریگەر بێو لای خودا قبووڵ بێ.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

برای بەڕێزو ئازیزم کاکە مەلا مەحمود گیان پێشکەشە

| | |
|---|---|
| سەلاوێکە دیاری مە دیارە | لەدارو بەردی ئەو دارو دیارە |

دیاری پیرۆزیی تەفسیری رەوانم پێگەیی: دڵم پێی گەش بووەوەو چاوم پێی روونو رەوانم پێی شادو کەیف خۆش بوو: خوای گەروە بتپارێزێو پشتیوانت بێ لە درێژەدان بەم خزمەتە پیرۆزە جا ویستم لە پەراوێزی تەفسیرەکەدا ئەم هەڵبەستەیە بنووسم کەوا بۆ ئاگاداری ناردوومە خزمەتت.

| | |
|---|---|
| تەفسیری رەوان قووتی رەوانە | وەك ئاوی حەیات رونو رەوانە[1] |
| مزگێنیو لێ بێ گەلو هۆزی کورد! | تەفسیر، رەوان بوو لە کوردستانە |
| رەوانە دەرسم بۆ ئەم تەفسیرە | کە شی کردنەوەی کوردی زوانە |

## پێشەکی

دەرسی برایەتیو خەباتو شۆڕش — جا لێی فێر ئەبین بە پێی توانا

ڕەوانبێژی کرد لەگەڵ گیان برێژی — تا دابینی کرد ئەم شانە جوانە

ئەو شانەی کەوا شان بە شان ئەکا — بە (روح المعان)، (روح البیان)ە

هەڵاڵەی هێنا کاکی گەلاڵی — لە رازیو قازیو نامیو مەولانا

لەگشت مەڵبەندێ راڤەی کۆنو نوێ — کەوا کراون لەسەر قورئانا

هەر پەرمیەکی پڕە لە هەنگوین — بەڵام هەنگوینێ بێ کەرمشانە

شانازی ئەکەم کاکی گەلاڵی — گەلاڵەیەکەو نوسخەی ئیمانە

سەرمەشقە لە بۆ چینی داهاتوو — تا وەدوت کەون لەم گۆڕەپانە

هەرکەس پێنوسی بێنێتە کایە — دەرگای هونەری لەروی زەمانە

شەرح کا شەرحو تەفسیرو حەدیث — هەم شێعرو ئەدەب عیلمو عیرفانە

ماڵت ئاوا بێ برای عەزیزم! — بەڵام نەك ئاوا لە ئاسمانا

هەروا ئاوابێ بۆ خزمەتکاری — شیرینە تەفسیر لە پیاوی زانا[٢]

کەسی مونکیری تەفسیری تۆ بێ — ئەوە مصداقی (کلا بل ران)[٣]

زۆر لە کۆنەوە مەشهورو باوە — کەشافە (محمود) لەرووی قورئانا[٤]

پێم گەیی تەفسیر وەك عەترو عەبیر — بۆنی جەستە ناوخاوو خێزانا

هەموومان گوتمان ئافەرین (محمود!) — حەمدت ئەکەین بەبێ وەستانا

غولامی پەنجەو دەستو قەڵەمتین — دیاری پیرۆزت لەسەر چاوانە

دیارە دیاری وا دیارە — بۆ کوردی عێراق تورکو ئێرانا[٥]

هەر بەو زوانە هەر بەو زوانە — چاون لە رێوەی سی جزوەکانە[٦]

خوایە بە خاتری سی جزمەی قورئان — بەحەقی سورەی (ئال عمرانا)

تەمەنی درێژ لەگەڵ تەمەنی زۆر — لەگەڵ صیحەتو خۆشی لەژیانا

بدە بە (محمود) مەلای مەلەوان — لە گۆمی ژینا لەمەلەوانا

## پێشەکی

ڕەزای مەلــەوان: لــە بــیرو تەفــسیر
لە خزمەت بە گەل بـە نیشتمانا[٧]

بکــە بــە باعــث ســەرفرازی ئــەو
هۆی ڕضوانی تۆو چوونی ڕضوانا[٨]

بیکــە بــە چــرای ئــەو لەبــەرزەخا
ثیقلـی حەسـەنات لـە تـای میزانـا

بکـەی بـە خـەڵات لـە بـۆ مـن‌و ئـەو
خـەباتی خـاوێن لـە ڕێـی مـەردانا

خــــەڵاتی قــــەبرن لیباســــی تــــەقوا
ژیــانن نــەبێ بــە مایــەی ژانــا[٩]

نامــت وەك نــامی بێتــە نێــو نێــوان
وەك نـوری فـارس یـا وەك (سلمانا)

ڕوناکــە دڵــم بــە نــوری فــارس
خوایـە بێـوەی کـەی لـە دوو جیهانـا

موفــق بکــەی کاکــە (محمــود)یــش
بـۆ درێـژە پێـدان بـەم خزمەتانــە

زیندووەکــەیین بــە یاســای زەمــان
شـاکاری ڕەسـەن، کـوردی ئاسـانە

ڕێگــەو ڕێبــازی یوســفی (ئەصــم)
ئـەو شـێخەمینەی خـەڵکی ئالانــە

خـاوەن تەفـسیرن لـە لوغـەی عـەرەب
بـاوبوو ئـەو ڕۆژە لوغـەی بێگانــە

بـەڵام ئەورۆکـە هـەر کـەس خەریکـە
بە پیزو بە هێـز بە کوردی خوانـا

بنــێ لەســەر خــوان بــێ نیتــەدوکان
زمـانی زگمـاکی بێتــە مەیــدانا[١٠]

خوایــە بــە حــەقی زات‌و صــیفاتت
کوردیش بەشی خۆی بگرێ لـەژیانا

نەقــشە لــە دڵــی نــەقش بەندیــدا
دوعـایی دۆسـتان بـە دڵ‌و بـە گیانـا

**عبدالرؤوف**

## پێشەکی

### چەند زانیاریەکی پێویست دەربارەی قورئانی پیرۆز

پێش ئەوەی بچمە ناو باغو گوڵزاری ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە بە پێویستی دەزانم چەند زانیاریەکی پێویست بە شێوەیەکی کورتو ئاسان بخەمە بەردەستی خوێنەرانی ئەم تەفسیرە پیرۆزە، بۆ ئەوەی رێ خۆشکەرو روونکەرەوە بێ بۆ زێدە تێگەیشتنو ئاشنابوون بە کەلامی پەروەردگار!

### ١- پێناسەی قورئانی پیرۆز:

**قورئان:** بریتییە لەو نامە ئاسمانییە: کە بۆ حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) نێردراوەتەوە خوارێ، خوێندنەوەکەی بە تاعەتو خواپەرستی حلێب دەکرێ، نوێژ- کە کۆڵەکەی ئایینە – بەبێ خوێندنی بەشێك لە قورئان تێیدا ئەنجام نادرێو دروست نابێ.! یان دەڵێن:

قورئان نامەی خودایە، کەلامێکی سەر ئاسایە، جندۆکەو ئادەمیزاد داماوو دەستەوسانن لەوەدا بتوانن وێنەی کورتترین سورەتی ئەو قورئانە بخەنەڕو، بە زمانی عەرەبی بۆ حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) نێردراوەتە خوارێو لەناو دوو توێی موصحەفدا نووسراوەتەوە، خوێندنەوەکەی بە تاعەتو خوداپەرستی حلێب دەکرێ، واتە: نوێژ بەبێ خوێندنی بەشێك لەو قورئانە دروست نییە، هەروەکوو چۆن تەنیا خوێندنەوەو گوێ لێگرتنو تەماشاکردنی بۆ موسڵمانان بە پاداشو خوداپەرستی دەژمێردرێو خێرو ئەوابیان دەگاتێ!

قورئان بەو شێوەیەی کە ئێستا لەبەردەست دایە، پشتاو پشتو چیناو چین بە شێوەی تەواتوور بە ئێمە گەیشتووە، بە سورەتی فاتیحە دەست پێ دەکاو بە سورەتی (الناس) کۆتایی دێ، یەکەم پیتی بە (ب)ێ دەست پێ دەکا دواپیتیشی بە پیتی (س) کۆتای دێ، ئەم دوو پیتە لێك بدەین وشەی (بس) پێك دێ، واتە: کەسێك پەیڕەوی قورئان بکا بەسیەتیو پێویستی بە هیچ یاساو بەرنامەو پڕۆگرامی تر نییە.

### ٢- ناوو ناوەڵناوەکانی قورئان:

قورئانی پیرۆز زۆر ناوو ناوەڵناوی هەن، لەناو ئایەتە پیرۆزەکانیدا ئەم ناوو ناوەڵناوانەی بۆ بەکاردەهێنرێ وەکوو: (الکتاب، النور، القران، الذکر، التنزیل، هدی، شفاء، رەحمة، موعظة، مبارك، مبین، بشری، عزیز، بشیر، نذیر ...هتد)

وشەی (موصحەف)یشی بۆ بەکاردەهێنرێ کە لە وشەی (صحف) وەرگیراوە.

هەر یەکێ لەم ناوو ناوەڵناوانە لە ڕووی ماناییکەوە بۆی بەکاردەهێنرێ‌و کالا بەقەد بالایە، (ئیسم لەسەر موسەمایە).

### ٣- چۆنیتی هاتنە خوارەوەی قورئان:

قورئانی پیرۆز هەمووی بە یەکجار نەهاتۆتە خوارێ، بەڵکوو وەجبە وەجبەو ئایەت ئایەت‌و سوڕەت سوڕەت بە گوێرەی ڕووداوو بارودۆخی بانگەوازی ئیسلامی، بۆ وەلامدانەوەی پرسیارو دیاریکردنی حوکمی ئیسلامی بۆ ڕوداوەکان‌و پەروەردەکردنی کۆمەڵی موسوڵمانان‌و ڕێکخستنی کۆمەڵگای ئیسلامی‌و تەوجیهکردنی کۆمەڵ بۆ دەستەبەر کردنی ژیانێکی بەختەوەرو کۆمەڵگایەکی ئازاد. لەماوەی بیست‌و سێ ساڵدا بەشێوەی نیگاو بەهۆی حەزرەتی جوبرائیلەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نێردراوە، بەگوێرەی پێویست لە مەککە یان لە مەدینە یان لە ڕێگەی نێوانیاندا یان لەشوێنی تر بۆ حەزرەتی موحەممەد هاتووە:

سەرەتای هاتنە خوارەوەی قورئان لەشەوی لەیلەتولقەدرا لە مانگی ڕەمەزاندا دەستی پێکردووە، پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ – البقرة/ ١٨٥﴾.

یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُّبَارَكَةٍ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ – الدخان/٣﴾، یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ – القدر/١.﴾.

جاری وا هەبووە سوڕەتێکی تەواو هاتۆتە خوارێ، وەکوو سوڕەتی فاتیحەو (المدثر) و (الأنعام). جاری وا هەبووە (دە) ئایەت پێکەوە هاتوونە خوارێ، وەکوو

## پێشەکی

چیرۆکی بوختـان لـه سورەتی (النـور)داو سـەرەتای سورەتی (المؤمنـون). زۆر جـاریش پێنـج ئایەت پێنـج ئایەت هاتۆتە خوارێ، جاری وا بووە برێ لە ئایەتێك هاتۆتە خـوارێ وەکوو رستەی ﴿غَيْرُ أُوْلِي الـضَّرَرِ﴾ لـه سورەتی (النـساء) ئایـەتی (٩٥)دا کـه لـه دوا ﴿لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ەوە چەسپێندراوەو نووسراوە!

حیکمەتی هاتنە خوارەوەی قورئان بە شێوەی پارچە پارچەو لـه کـاتو شـوێنی جیا جیادا زۆرو هەمە جۆرن، ویستو ئیرادەی خـودا وا داخـوازی بـووەو ئـەنجام دراوە، خودا دەفـەرموێ: ﴿وَقُرْآناً فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَى مُكْثٍ وَنَزَّلْنَـاهُ تَنـزِيلاً – الإسـراء/ ١٠٦﴾.

### هەندێ لەو نهێنیو حیکمەتانە ئەمانەن:

١- چەسپاندنی قورئان بە لەفظو مەعنایەوە لە دڵی پێغەمبەردا (دروودی خـوای لەسەر بێ)و بەهێزکردنی دڵو دەروونی بۆ ئەوەی لەبەری کاو لێی حاڵی بـبێ! چونکە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) نەخوێنـدەوار بـووە، خوێندنـەوەو نووسـینی نەزانیوە!

٢- بەرچـاوگرتنی حاڵەتی تـەدەرروج لـه شـەریعەتداو لـه هاتنـه خـوارەوەی هـەر ئایەتێك کە لە کاتو شوێنی جیاجیادا دەهات بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بـێ) موعجیزەیەکی سەربەخۆو هێزو توانایەکی نوێی بۆ پەیدا دەبوو، دڵی زیاتر دادەمـەزرا وەکوو خودا دەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ﴾[١].

٣- بەشێوەی قۆناغ قۆنـاغو گواسـتنەوەی کۆمـەڵگا لـه حاڵەتێکەوە بـۆ حاڵـەتێکی باشترو پێشکەوتووترو رژانی رەحمەتی خودا بەسەریاندا.

---

١- علوم القرآن – مناع القطان لاپەڕە ١٠٧ – ١١٠. نـوری قورئـان – عبدولکـەریمی مـودەریس لاپـەڕە ٦٩.

چونکە ئاشکرایە عەرەبەکان لە پێش هاتنی ئیسلامدا لە بەرەڵاییەکی تەواودا بوون، ئەگەر بهاتایەو قورئان هەمووی بە یەکجار بهاتایە خوارێ بۆ سەریان ئەرکی سەرشانیان قورس دەبوو، نەدەهاتنە ژێربارو رام نەدەبوونو پابەندی فەرمانو جڵەو گیرییەکان نەدەبوون!

٤- پەیوەست کردنی جمو جوڵی کۆمەڵگای موسڵمانان بە نیگای خوداییەوە، چونکە لکاندنی نیگای خودایی بە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) پارمەتیدەرێکی بەهێز بووە بۆ ئەوەی کە خۆ گرو ورە بەرزو دڵ قایم بێو خۆ لە بەرامبەر جۆرەها هەڕەشەو تەماعو ئەزیەتداندا بگرێو هیچ شتێ کاری تێ نەکاولە هەڵوێستی پیرۆزی خۆی نەیهێنێتە خوارێ، نیگا بەو شێوە پچڕ پچڕییە هەمیشە دەبووە بژێوێکی گیانی بۆ حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ).

هەروەکوو چۆن هۆکارێك بوو بۆ بەهێزکردنو پتەوکردنی بیرو باوەڕی موسڵمانانو چەسپاندنو شیرین کردنی ئەو رێبازە لە دڵو دەروونییاندا، چونکە کە نیگای خودا بێتە خوارێ بۆ چارەسەر کردنی تەنگو چەڵەمەیەك کە بەرەو رووی موسڵمانان بووەوە ئەوە دەبێتە نیشانەی راستی پەیامی پێغەمبەرو بانگەوازی ئیسلامی.

کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وەڵامی پرسیارێك ناداتەوە، دوایی نیگا دێ وەڵامەکەی تێدایە، موسڵمانان هەست بە پەیوەست بوونیان بە پەروەردگارێکی زاناو بە توانا دەکەن! زیاتر بیرو باوەڕیان پتەو دەبێو دڵنیا دەبن لە راستی رێبازە پیرۆزەکەیانو بەدڵنیاییەوە چاوەڕوانی ئەو وادەو بەڵێنانە دەکەن: کە خودا پێی داون! ([2])

٥- مەککیو مەدەنی: لەم رووەوە قورئان دەکرێ بە دوو بەشەوە، بەشێکی مەکەییەو بەشێکی مەدینەییە.

[2]- پێشەکی التفسير المنير/د. وهبه الزحيلي ج/١٦ – ١٧.

## پێشەکی

**مەشهورترین ڕا بۆ پێناسەی مەککیو مەدەنی ئەمانەن:**

**١-مەککی: ئەو ئایەتو سورەتانەن کە لە ماوەی سێزدە ساڵدا لە مەککەو دەوروبەریدا وەکوو میناو عەرەفاتو حودەیبیە، یان لە ڕێگای نێوان مەککەو مەدینەدا پێش ئەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بگاتە مەدینە هاتبێتە خوارێ.**

**٢- مەدینەیی: ئەو ئایەتو سورەتانەن کە لە دوا کۆچکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بۆ مەدینە لە ماوەی (دە) ساڵدا هاتبێتە خوارێ، جا لە خودی مەدینەو دەوروبەریدا هاتبێتە خوارێ، وەکوو بەدرو ئوحودو سەلع، یان لە مەککە ساڵی رزگارکردنی، یان لەحەجی ماڵئاوایی، یان لە سەفەرو گەشتەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ)دا هاتبێتە خوارێ.**

**سەرچاوە بۆ زانینی ئایەتو سورەتە مەککیو مەدینەییەکان زانینو لەبەربوونی هاوەڵانی پێغەمبەرو چینی (تابعین)ن.**

**زانینو دەست نیشانکردنی مەککەیو مەدینەیی یارمەتیدەرە بۆ مێژووی ناسیخو مەنسوخ.**

**تایبەتمەندی ئایەتە مەککەییەکان، ڕێکو پێک کردنی بیروباوەڕو ئەخلاقو رەوشتە، هەروەها هەوڵدانە بۆ روخاندنی قەڵای شیرکو بتپەرستیو چەسپاندنی بیروباوەڕی یەکتاپەرستیو قەڵاچۆکردنی پاشماوەی دابو نەریتی سەردەمی نەفامیو نەزانینە، وەکوو کوشتنی نارەواو داوێنپیسیو زیندە بەچاڵ کردنی کچ بەبێ ئەوەی تاوانێکی کردبێ!**

**هەروەها بڵاوکردنەوەی ئادابو ئەخلاقی ئیسلامی، وەکوو دادپەروەریو پابەندبوون بە وادەو بەڵێنو کارچاکیو دوورکەوتنەوە لە خراپەکاریو وازهێنان لە لاسایی کردنەوەی کوێرانەو دارو بەرد پەرستن بۆ بەندایەتیکردنی خودای باڵا دەست، پەند وەرگرتن لە چیرۆکو سەرگوزشتەی پێغەمبەرانو پیاو چاکان لەگەڵ گەلو نەتەوەکانیاندا.**

## پێشەکی

ئایەتە مەککییەکان کورتی‌و وشە ئاراییی‌و مانا پتەوییان پێوە دیارە، پڕن لە مانای هەڕەشەو ترساندن، هەست کردن بە شان‌و شکۆمەندییەکی خوداوەندییان تێدایە، واتە: لەو کاتانەدا موسڵمانان بێ هێزو لاواز بوون‌و خەڵکی بەدزی خوداپەرستییان دەکردو موسوڵمان دەبوون! کەچی ئایەت‌و سورەتەکان لەکاتێکدا هێزو تواناوە ئاراستە دەکران‌و هەست بە هێزو توانایەکی لە خۆڕادیو دەکرێ تێیاندا.

ئەوەی کەلە ئایەتە مەدەنییەکاندا بەدی دەکرێ چەسپاندنی یاساو شەریعەت‌و چۆنیەتی ئەنجامدانی عیبادات‌و چۆنییەتی حوکمە مەدەنی‌و حوکمە سزا ئامێزەکانە، دابینکردنی پێداویستیەکانی ژیان بۆ دروست کردن‌و دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی لە مەدینەداو ڕێکخستنی کاروباری رامیاری‌و فەرمانڕەوایی‌و چەسپاندنی یاسای شوراو دادپەروەری لە دەرکردنی بڕیاری حوکمەکاندا، هەروەها ڕێکخستنی چۆنیەتی پەیوەندی نێوان موسڵمانان‌و گەل‌و نەتەوەی تردا لە ناوەوەو دەرەوەی مەدینەدا، لە کاتی شەڕو ئاشتیدا، دانانی یاسای جیهادو تێکۆشان‌و بەرەنگار بوونەوەی دوژمنان، دانانی یاسای پەیماننامەو صولح کردن لەگەڵ بەرامبەرو نەیاران دا بەمەبەستی چەسپاندنی ئاشتی‌و ئارامی لەناو کۆمەڵگای ئیسلامیدا! ئەمەش داخوازی ئەوە بوو ئایەتە مەدەنییەکان شێوە نەرمییەکیان پێوە دیار بێ، هەروەکوو چۆن حوکمی ئایەتە مەدەنییەکان بەردەوامی‌و درێژخایەنییان لێ وەردەگیرێ![3]

٦- سورەت: سورەت بەشێکە لە قورئان. سەرەتاو کۆتایی هەیە، هەر سورەتەی ناوێکی تایبەتی یان چەند ناوێکی هەیە، ناوە بەناوبانگەکانیان لەلایەن پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆیەوە دیاری کراون.

١- سورەتە درێژەکان (الطوال) ئەمانە حەوت سورەتن: (البقرة، آل عمران، النساء، المائدة، الأنعام، الأعراف) حەوتەمیان سورەتی (الأنفال)و (براءة)یە چونکە ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾ یان لەنێواندا نیە، هەندێکیش دەڵێن سورەتی (یونس)ە.

[3]- سەیری علوم القران – دانراوی مناع قطان لاپەڕە / ٦٣ بکە.

٢- سورەتە سەدییەکان (المئين) ئەمانە ئەو سورەتانەن کە ئایەتەکانیان لە سەد زیاترن یان لەو ژمارەیە نزیك دەبنەوە.

٣- المثاني: ئەو سورەتانەن کە ئایەتەکانیان لە سەد ئایەت کەمترین، بۆیە پێیان دەگوترێ: (المثانی) چونکە دوبارە بوونەوەی رستەو ئایەتیان تێدایە.

٤- سورەتە ناوانکراوەکان (المفصل) ئەم جۆرەیان لە سورەتی (ق)ەوە تا کۆتای قورئان، یان لەسەرەتای سورەتی (الحجرات)ەوە دەست پێ دەکا، ئەمەشیان دەبنە سێ بەش: درێژو مامناوەندیو کورت.

ا- درێژەکان لەسورەتی (ق) یان (الحجرات)ەوە تا سورەتی (عم) یان سورەتی (البروج).

ب- مامناوەندی لە سورەتی (عم) یان (البروج)ەوە تا سورەتی (الضحی).

ج- کورتەکان (قصار) لە سورەتی (والضحی)وە تا سورەتی (الناس).[4]

ژمارەی سورەتەکانی قورئان (١١٤) سورەتن، هەموو سورەتێکیش وەکوو گوتمان: ناوی تایبەتی هەیە، برێکیشان زیاد لە یەك ناوی هەیە، بۆ نموونە: سورەتی فاتیحە چەند ناوی هەن: وەکوو لەسەرەتای تەفسیری سورەتەکەدا باسیان دەکەین! ناونانی سورەتەکان جاری وا هەیە لەیەکەم وشەو سەرەتای سورەتەکە خۆیەوە وەرگیراوە، جاری وا هەیە چیرۆكو رووداوی تایبەتیو ئەحکامی شەرعی دەورێکی بالآیان هەبووە لە ناونانی سورەتەکاندا.[5]

ژمارەی ئایەتەکانی قورئان (٦٢٠٠) شەش هەزارو دووسەد ئایەتن لەوە بەولاوە را جیایی تێدایە، بەلام زۆربەی زانایانی ویسلام لەسەر ئەو ژمارەیە کۆکن.

---

[4]- مباحث في علوم القرآن/ مناع القطان ص ١٤٥ بۆیە ئەم جۆرەیان بە (المفصل) ناوبراوە چونکە ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ ناوانیان کراوە.

[5]- پوختەی ئایینی ئیسلام بەرگی یەکەم لا ٢٣٧ هەندێ کەسیش پێیان وایە (١١٣) سورەتن لەم رووەوە کە سورەتی (الأنفال) و (براءة) یان بەیەك سورەت حلێب کردووە.

٧- ریزكردنی سورەتو ئایەتەكانی قورئان:

ڕێكخستنو ریزكردنی ئایەتەكان لەسورەتەكاندا بە فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەنجام دراوە، واتە: كارەكە (تەوقیفی)یە. برێك لە زانایان كۆڕایی (اجماع)ی زانایانی ئیسلامیان لە سەر ئەمە ریوایەت كردووە، دەڵێن: ئەمە شتێكە هیچ راجیایی تێدا نییە، بێگومان حەزرەتی جوبرئیل دەهاتە خزمەتی پێغەمبەرو نیگای بۆ دەهێناو شارەزای دەكرد، ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی بە نووسەرەكانی نیگا دەكرد، كە لەو شوێنەدا بینووسنەوە: پێی دەفەرموون: ئەم ئایەتە بخەنە فلان شوێنی فلان سورەتەوە لە دوای فلان ئایەتو پێش فلان ئایەتدا بینووسن[6]

هەروەها بەلای جەماوەری زانایانەوە ریزكردنی سورەتەكانیش لەناو موصحەفدا بەفەرمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بووەو (تەوقیفی)یە.

ئەبوبەكری ئەنباری دەڵێ: هەموو ئەو قورئانەی خودا ناردویەتیە خوارێو فەرمانی كردووە بە چەسپاندنی شێوەكەی، ئیتر نەسخی نەكردۆتەوەو خوێندنەوەكەشی هەڵنەگرتۆتەوە..[7]

قورئان ئەوەیە ئێستا لەنێوان دوو بەرگدایە، پێی دەگوترێ موصحەفی عوسمانی، هیچ زیادو كەمی تێدا نەكراوە، ڕێكخستنو ریزكردنی وشەو ئایەتو سورەتەكانی، خودا چۆنی داناوەو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چۆن ئەنجامی داوە، ئاوا ماوەتەوەو بە ئێمە گەیشتووەو وشەیەكی لێ پاشوپێش نەكراوە، موسڵمانان چۆنیان لە پێغەمبەرەوە وەرگرتووە، بەبێ گۆڕانكاریو دەست لێدان ئاوا لە شوێنی خۆیدا چەسپاندویانە، شوێنی هەموو سورەتو ئایەتێكیان زانیوەو شێوەی خوێندنەوەو جۆرەكانی خوێندنەوەیان بەتەواوی كۆنترۆڵ كردووە، خودای مەزن چۆنی بۆ

[6] مباحث في القرآن / مناع القطان ص ١٣٩.

[7] - پێشەكی تەفسیری ( صفوة البیان في معاني القرآن).

## پێشەكی

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ناردووە بەبێ زیادو كەم نووسراوەتەوەو پارێزگاری كراوە، چۆنیان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بیستووە ئاوا نووسیویانەتەوە، هیچیان لێ پاشوپێش نەكردووە.[٨]

پێغەمبەر هەمیشە هاوەڵانی دەرس دادەدا، فێری ئەو ئایەتو سورەتانەی دەكردن كە تازە بۆی دەهاتنە خوارێ، هەر ئایەتو سورەتێك بهاتایە خوارێ، شوێنی بۆ دیاری دەكردنو دەیفەرموو: ئەو ئایەتە دەخرێتە پاش فلان ئایەتو لە فلان سورەتدا دەنوسرێ، هاوەڵانیش بەوپەڕی دڵسۆزیەوە فەرمانەكەیان ئەنجام داوەو بە موو لێیان لانەداوە!.

(ابن الحصار) دەڵێ: ڕێكخستنی سورەتەكانو دانانی ئایەتەكان لەناو سورەتەكاندا بەپێی نیگای خودا بووە، هەركە نیگا بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەهاتە خوارێ دەیفەرموو: فلان ئایەت بخەنە فلان سورەتەوە، لەپاش فلان ئایەتەوەو لەپێش فیسار ئایەتدا دای بنێن.. بێگومان دڵنیایی تەواو بۆ موسوڵمانان پەیدا بووە: كە قورئان بەم تەرتیبو ریزكردنەی كە ئێستا هەیەتی، ئاوا لە پێغەمبەرەوە بیستراوە، هەموو هاوەڵانیش كۆك بوون كە بەو شێوە لە موصحەفدا بینووسنەوە.[٩]

بڕێك لە زانایان پێیان وایە: كە ریزكردنی سورەتەكان (تەوقیفی) نیە، بەڵكوو بەئیجتیهادی هاوەڵان خۆیان جێبەجێ كراوە، بەڵگەشیان هەبوونی جیاوازیی نێوان ریزبەندی موصحەفەكانی هاوەڵانە!! ئەوەتا موصحەفی علی كوڕی ئەبو طالب بە گوێرەی هاتنە خوارەوەی قورئان نووسراوەتەوە: یەكەمجار بەسورەتی (علق)و ئەمجا (المدثر)و ئەمجار (ن والقلم)و پاشان (المزمل) ...هتد.

لە موصحەفی ئیبنو موسعوودیشدا یەكەمجار سورەتی (البقرە)و دوایی سورەتی (النساء)و ئەمجار سورەتی (ال عمران) ...هتد.

---

[8] - مباحث في علوم القرآن/ مناع القطاع/ ١٣٩ – ١٤٠.

[9] - الاتقان في علوم القرآن ج١/٦٢ ومباحث في علوم القرآن / ١٤٢

له موصحه‌فی (أبی)یشدا یه‌كه‌مجار سوڕه‌تی (البقره) پاشان (النساء)و ئه‌مجار (ال عمران) ... ڕێكخرابوو.[10]

## ٨- سوودی زانینی هۆكاره‌كانی هاتنه خواره‌وه‌ی ئایه‌ت‌و سوڕه‌ته‌كان:

بێگومان زانینی هۆی هاتنه خواره‌وه‌ی ئایه‌ت‌و سوڕه‌ته‌كان به گوێره‌ی ڕوداوو بۆنه جیاجیاكانه‌وه سوودی زۆره، ڕۆڵێكی گرنگی هه‌یه بۆ ڕافه‌كردنی قورئان‌و تێگه‌یشتن له مه‌به‌سته‌كانی به‌شێوه‌ی ڕاست‌و دروست.. چونكه هۆكاره‌كانی هاتنه خواره‌وه‌ی قورئان قه‌رینه‌و نیشانه‌ی به‌هێزن بۆ ڕونكردنه‌وه‌ی مه‌به‌سته‌كان، مه‌به‌ستی حوكم‌و هۆكاری شه‌ریعه‌ته‌كه ڕوون ده‌كاته‌وه، نهێنی‌و مه‌به‌سته‌كان ئاشكرا ده‌كاو یارمه‌تیده‌رێكی به‌هێزو پته‌وه بۆ تێگه‌یشتن له قورئان به‌شێوه‌یه‌كی گشتی، ته‌نانه‌ت له‌بری كاتدا بێ زانینی هۆكاری هاتنه خواره‌وه مه‌به‌سته‌كان نازانڕێن!

بێگومان هۆكاره‌كانی هاتنه خواره‌وه‌ی قورئان ئه‌وه‌مان بۆ دووپات ده‌كاته‌وه كه شه‌ریعه‌تی قورئان له ژوور ئاستی ڕوداوه‌كاندا نیه‌و له ده‌ره‌وه‌ی چوارچێوه‌ی واقیع دا خۆی نانوێنێ.

شه‌ریعه‌تێكی میثالی وانیه قبوولی جێ به‌جێ كردن‌و ته‌طبیق نه‌كا به‌ڵكوو شه‌ریعه‌تێكه هاوچه‌رخی ڕوداوه‌كانه، له‌هه‌موو سه‌رده‌م‌و شوێنێكدا له‌گه‌ڵ ڕوداوه‌كاندا ده‌گونجێ‌و چاره‌سه‌رێكی سه‌ره‌كییه بۆ بنبڕكردنی هه‌موو نه‌خۆشییه كۆمه‌ڵایه‌تیه‌كان‌و له‌مپه‌ڕو به‌ربه‌ستێكی پته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی نه‌هێڵێ تاكه‌كانی كۆمه‌ڵ له ڕێبازی ڕاست‌و دروست‌و خوداویست لابده‌ن!

## ٩- یه‌كه‌م به‌ش‌و دوابه‌ش له قورئان كه هاتۆته خواری:

یه‌كه‌م به‌شێك له قورئان كه هاتۆته خوارێ ئه‌م پێنج ئایه‌تانه‌ی سوڕه‌تی (العلق)ن كه ده‌فه‌رموێ: ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾

[10] - مباحث في علوم القرآن/ ص ١٤٢

## پێشەکی

اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ ﴿٣﴾ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ الإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾﴾ ﴿سورەتی علق﴾.

زانایان دەفەرموون: ئەم ئایەتانە ڕۆژی دووشەممە حەڤدەی مانگی ڕەمەزان ساڵی (٤١)ی تەمەنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە ئەشکەوتی حیرادا بەهۆی حەزرەتی جوبرەئیلەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هێندراون.

بە گوێرەی ڕاسترین ڕاو قسەی چەسپاو، دوا بەشی قورئان کە هاتبێتە خوارێ ئایەتی ﴿٢٨١﴾ی سورەتی ﴿البقرة﴾یە کە دەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ – سورةتی البقرة/ ٢٨١﴾

لەدوای حەجی ماڵئاوایی بە نۆ شەو پێش لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر ﴿دروودی خوای لەسەر بێ﴾ هاتۆتە خوارێ.[11]

هەڵبەتە ڕاو بۆچوونی تریش هەن کە ئایەتو سورەتی تر دەست نیشان دەکەن بۆ سەرەتاو کۆتایی هاتنەخوارەوەی قورئان. بەڵام ئێمە تەنیا ئاماژەمان بۆ ڕا پەسەندکراوەکان کردو بەس!

### ١٠- کۆکردنەوەی قورئان:

لە سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) قورئان لەناو دوو توێی موصحەفێکدا کۆنەکرایەوە، چونکە هێشتا حەزرەت لە ژیاندا مابوو، تا ئەویش لە ژیاندا مابوو هیوای زیادبوونی نیگاو هاتنە خوارەوەی بەشی تر لە قورئان چاوەڕوان دەکرا، پاشان کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وەفاتی کردو لە دونیا دەرچوو ئەو هیوایە بڕا، قورئانیش پارچە پارچە لەسەرتاشە بەردو لقی دار خورماو ئێسقانو تەختەدارو پێستی خۆشکراوی ئاژەڵ نووسرابووەوە، هەروەها لە دوو توێی سینگی

[11] - مباحث في علوم القرآن/ ٦٥ – ٦٩. پێشەکی تەفسیرو لمنیر.

هاوەڵانیشدا نەخشی بەستبوو، زۆربەی هاوڕێكانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) كەم تا زۆر قورئانیان لەبەربوو.[12]

١- كۆكردنەوەی جاری یەكەم:

كە حەزرەتی ئەبوبەكر كرا بە جێنشینو فەمانڕوای موسڵمانانی درایە دەست، شەڕی پاشگەزبووەكان (حروب الردة) روویدا، یەكێك لەو شەڕە سامناكانە شەڕی یەمامە بوو كە (٧٠) كەس لە قورئان لەبەرەكانی تێدا شەهید بوونو گیانی خۆیان لە رێگای ئیسلامدا بەخت كرد، لە ئاكامی شەهید بوونی كۆمەڵێكی زۆر لە هاوەڵە قورئان لەبەرەكان حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) ترسی لێ نیشت كە بە شەهید بوونی ئەو قورئان لەبەرانە قورئان بفەوتێ! بۆیە داوای لە حەزرەتی ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێ بێ) كرد كە فەرمان بدا بە كۆكردنەوەی قورئانو لە دوو توێی موصحەفێكدا كۆی بكاتەوەو بكرێتە كتێبێكی تایبەتی. حەزرەتی ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەسەرەتادا دوو دڵ بوو. چونكە بەلایەوە گران بوو، ئیشێك بكا كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە ژیانیدا نەیكردبێ، بەڵام دوایی رای گۆڕیو بەرژەوەندیی ئیسلامی تێدا بینیو هاتە سەر ڕای حەزرەتی عومەرو پێشنیارەكەی ئەوی پەسەند كردو بانگی زەیدی كوڕی ثابتی ئەنصاری كرد، ئەم ئەركە پیرۆزەی خستە ئەستۆی، چونكە زەید لە هەموو هاوڕێكانی پێغەمبەر زیاتر لە خزمەت پێغەمبەردا بوو بوو، لە هەمووان زیاتر ئامادەی كۆڕو مەجلیسی جۆراو جۆری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بوو، زیاد لەمەش لە هەمووان زیاترو باشتر قورئانی لەبەر بوو، بۆیە ئەنجامدانی ئەم كارە پیرۆزە روو بە رووی ئەو كرایەوە..

ئیتر زەیدی كوڕی ثابیت زۆر چالاكانەو لێهاتوانە بە كارەكە هەڵساو هەموو قورئانی كۆكردەوە، لە دوو توێی پەڕاوێكی تایبەتیدا نووسیەوە ئەمجار بە حەزرەتی

[12] - پوختەی ئایینی ئیسلام لەبەرگی یەكەم / ٢٤ - ٢٥

ئەبوبەکری سپارد ئەمیش ئەم نوسخە قورئانەی لای خۆی گل دایەوەو لەلای خۆی پاراستی! لەکاتی پێویست دا موسڵمانان دەگەڕانەوە بۆ سەر دەقەکەی:[13]

ئەم کۆکردنەوەیە بریتییە لەو شێوە قورئانەی کە لە سینەی پێغەمبەردا نەقشی بەستبوو، هاوەڵان لێیان بیستبوو، بەم شێوە تەرتیبەی کە ئێستا لەبەرچاوە خستیە دوو توێی موصحەفێکەوە، هەڵبەتە لە پێش ئەم کۆکردنەوەیەدا قورئان بە پارچە پارچە نووسرا بوەوەو ئەم پارچانە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەڵگیرا بوون، زۆربەی هاوەڵانیش روونووسیان لەلا بووە، جگە لەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵان بە قورئان لەبەر دەناسران‌و لە سەرەتاوە تا کۆتایی بەم شێوەی ئێستای قورئانیان لەبەر بوو، بەم شێوە وادەو بەڵێنەکەی پەروەردگار هاتەجێ کە دەفەرموێ:
﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ﴾ – القيمة/ ١٦ – ١٩.

وەکوو دەڵێن: لە پێش هاتنی ئەم ئایەتەدا کە جوبرائیل دەهات بۆلای پێغەمبەرو نیگای بۆ دەخوێندەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خێرا خێرا دەیگوتەوەو زمان‌و دوو لێوی دەجوڵاندن، دەترسا وشەیەکی لەبیر بچێ، دەیەویست لەبەری بکا، کە ئەو ئایەتە هاتە خوارێ نیتر کە جوبرائیل نیگای بۆ دەخوێندەوە گوێی رادەگرت. کە جوبرائیل دەڕۆیی چۆنی بۆ خوێندبوەوە دەیخوێندەوە!

هەموو ساڵێکیش لە رەمەزاندا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) جارێك قورئانی بۆ جوبرائیل دەخوێندەوە، لە مانگی رەمەزانی پێش لە دونیا دەرچوونیشی دووجار هەموو قورئانی بەسەر جوبرائیل دا خوێندۆتەوە، هەر بەو شێوە لەبەربوونەش بۆ هاوەڵانی خوێندۆتەوە، ئەوانیش نووسیویانەتەوەو لەبەریان کردوە! کەواتە: دەتوانین بڵێین: کۆکردنەوەی قورئان بۆ یەکەمجار لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەردا بووەو لە دوو شێوەدا رەنگی داوەتەوە:

[13] - پوختەی ئایینی ئیسلام، بەرگی یەکەم / ٢٥ - ٢٦

## پێشەكی

١- كۆكردنــەوەی لــە ســینەی پێغەمبــەر (دروودی خــوای لەســەر بــێ) ئــەمجار لەسینەی قورئـان لەبەرەكانـدا بەشـێوەیەكی ڕێـك‌و پێـك‌و بـەم شـێوەی كـە ئێـستا لـە مەصحەفدا نووسراوەتەوە!

٢- كۆكردنەوەی بە نووسینەوە، بـەڵام بەشـێوەی پارچـە پارچـەیی‌و بـەش بـەش، چونكە پێویست نەبوو هەمووی لە موصـحەفێكدا بنووسـرێتەوە، لەبـەر ئـەوەی هێـشتا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسـەر بـێ) لـە ژیانـدا مـابوو، چاوەڕوانی هاتنـە خـوارەوەی نیگای تر دەكرا!!

ئیمامی زەركەشی دەفەرموێ: لەسـەر دەمـی پێغەمبـەردا (دروودی خـوای لەسـەر بێ) قورئـان لەیـەك موصـحەفدا نەنوسـرایەوە، بـۆ ئـەوەی لـە ئاكـامی هاتنـەخوارەوەی نیگـای تـازە گۆڕانكـاری تێـدا نـەكرێ! بۆیـە نووسـینەوەكەی دواكـەوت، كـە پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسـەر بـێ) لـە دونیـا دەرچـوو تـازە هیـوای ئـەوە نـەما كـە نیگـا بێتـە خوارێ،[14] ئیتر شتێكی گونجاو بـوو كـە پـاش لـە دونیـا دەرچـوونی پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە دوو توێی موصحەفێكدا بنووسرێتەوە!

كە وابێ دەبێ قسەی زەیـدی كـوڕی ثابیـت كـە دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) لـە دونیـا دەرچـوو قورئـان هێـشتا لـە هـیچ شـتێكدا كۆنـەكرابووەوە — وا ئاڕاستە بكەین بڵێین: مەبەستی كۆكردنەوەیەكی وەهایە: كە ئایەت‌و سورەتەكانی ڕێك بخرێن‌و لە دوو توێی موصحەفێكدا دابنرێن!

ب — كۆكردنەوەی قورئان جاری دووەم

وەكو ئاماژەمان بۆ كـرد زەیـد كـە قورئـانی كۆكردەوەو نووسـیەوە لـە دوو تـوێی موصحەفێكدا لای حـەزرەتی ئەبوبـەكر دانـرا، ئـەو ماوەیـەی حـەزرەتی ئەبوبـەكر لـە ژیانـدا بـوو موصـحەفەكە لای ئـەو پـارێزراو بـوو، كـە تەشـریفی كۆچـی دوایـی كـرد، موصحەفەكە برایە لای حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لـێ بـێ) بـە درێـژایی ڕۆژگاری

[14]- مباحث في علوم القرآن — مناع القطان / ١٢٤.

## پێشەکی

فەرمانڕەوایی حەزرەتی عومەر ئەو موصحەفە لای ئەو پارێزرا، کە کۆچی دوای کردو حەزرەتی عوسمان کرا بە جێنشین. لەسەردەمی ئەمدا روبەری جیهانی ئیسلامی زۆر بەرفراوان بوو، زۆربەی روبەری کیشوەری ئاسیاو ئەفریقا، کەوتە ژێر ئالآی ئیسلامەوە، بەهۆی بەرفراوانی جیهانی ئیسلامی و لێك دوورکەتنەوەی هاوەڵە قورئان لەبەرەکان و هۆکاری تر، خەریك بوو جیاوازی بکەوێتە جۆری خوێندنەوەی قورئانەوە، هەر شارو ولآتێك بە گوێرەی شێوە خوێندنەوەی ئەو هاوەڵانەی بۆی نێردرا بوون قورئانیان دەخوێندەوە!

جا هەر چەندە ئەو قیرائەتانە هەموویان لە پێغەمبەرەوە بیسترا بوون و راست بوون، بەڵام ترسی ئەوە دەکرا کە ئەم جوداوازییە لەئاکامدا سەربکێشێ بۆ فیتنەیی و ئاژاوەو لێك ترازانی کۆمەڵی موسڵمانان! بۆیە دوای راوێژکردن لەگەڵ هاوەڵانداو تاوتوێ کردنی بارودۆخی رووداوەکان رایان هاتە سەر ئەوە کە ئەو نوسخەیەی کە لەسەردەمی حەزرەتی ئەبوبەکردا بەیەك شێوە خوێندنەوە نووسرابووەوە شەش نوسخەی لێ بنووسنەوەو بەسەر شارە ئیسلامیەکاندا بلآوی بکەنەوە!

ئیتر حەزرەتی عوسمان ناردی لەلای خاتوو حەفصە نوسخەکەی سەردەمی ئەبوبەکریان هێنا، چونکە دوای کۆچی عومەر موصحەفەکە کەوتبووە لای خاتوو حەفصە.

ئەمجار ناردی بە دوای زەیدی کوڕی ثابیتی ئەلئەنصاری و عەبدوڵلآی کوڕی زوبەیرو سەعیدی کوڕی عاص و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەلحاریثی کوڕی هیشام، کە هەموویان قورەیشی بوون، فەرمانی پێ کردن کە نوسخەکان بنووسنەوە، لە هەر شوێنێکا نووسینەوەکەی زەید لەگەڵ سێ قورەیشیەکاندا کەوتە خیلافەوە، ئەوە بە زمانی قورەیش بینووسنەوە، چونکە قورئان بەشێوەی خوێندنەوەی ئەوان هاتۆتە خوارێ!

ئیتر ئەو لیژنە ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجامداو شەش نوسخەیان لە رووی موصحەفەکەی سەردەمی حەزرەتی ئەبوبەکر نووسیەوە، ئەمجار حەزرەتی عوسمان

## پێشەکی

هەر نوسخەیەکی بۆ وڵاتێك ناردو فەرمانی کرد لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا چی نوسخەی تر هەیە جگە لەو نوسخانە هەموویان کۆبکرێنەوەو بسوتێندرێن!

زەید دەڵێ: کاتێك قورئانمان دەنووسیەوە ئایەتی ژمارە (٢٣)ی سورەتی (الأحزاب) کە بۆخۆم چەند جار لە پێغەمبەرم بیستبوو دەمخوێندەوە بەدوایدا گەڕاین پاشان لای خوزەیمەی ئەلئەنصاری بە نووسراوەیی دەستمان کەوت و خستمانە شوێنی خۆی لە موصحەفدا.

ئیتر نوسخەی موصحەفی عوسمانی بوو بە بناغەو نوسخەی بڕوا پێ کراو لە هەموو عالەمی ئیسلامیداو هەموو هاوەڵان پشتگیری ئەم کارەیان کردوووەو بەلایانە سەد دەر سەد ڕاستو بی کەمو کوڕیو بێ غەلو غەشە.

هەر ئەم نوسخەیەش بناغەی هەموو ئەو نوسخە چاپکراوانەی قورئانە کە ئێستا لەبەر دەستدان.

شایانی باسە ئەم کارە شاکارە ساڵی (٢٥)ی کۆچی ئەنجامدراوە، تا سەردەمی جێنشینی حەزرەتی عوسمان موسڵمانان بەچەند شێوە خوێندنەوە قورئانیان دەخوێندەوە، ئیمامی عوسمان (ڕەزای خوای لێ بێ) خستیە سەر یەك قیرائەتو یەك شێوە نووسین، بۆیە ئیمامی عوسمان ئێستا بە کۆکەرەوەی قورئان دەژمێردرێ.

زانایانی ئیسلام دەربارەی ئەو موصحەفانەی کە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی عوسماندا نووسراونەوەو ناردراون بۆ شارو وڵاتەکان چەند ڕایەکیان هەیە:

أ- هەندێك دەڵێن: حەوت نوسخە بوون نێردراون بۆ مەککەو شامو بەصرەو کوفەو یەمەنو بەحرەینو نوسخەیەکیش لە مەدینە هێڵدراوەتەوە.

ب- هەندێك دەڵێن: ژمارەیان چوار بووە: موصحەفی عێراقی، موصحەفی شامی، موصحەفی میصری، موصحەفی ئیمام.

ج- برێـك رایـان وایـە ژمـارەی موصـحەفەکان پێـنج بـووە. ئـەو نوسـخەیەی لای خاتوو حەفصە بوو هەر لای خۆی مایەوە تا لە دونیا دەرچوو. پاشان شۆردیانو لەناو برا[15] گوتەیەکیش هەیە دەڵێ: مەروانی کوڕی حەکەم بردیو سوتاندی.

ئەو نوسخە موصحەفانەی کە لە سەردەمی عوسماندا نووسرانەوە ئەمڕۆ هیچیان نەماون. ئیبنو کەثیر دەڵێ: من بۆخۆم لە مزگەوتی دیمشق دا لە شام نوسخەیەکم لەم موصـحەفە بینیـوە لـە پێـستی حوشـتر نووسـرا بـووەوە!. دەڵـێن: ئـەم نوسـخەیە گوێزراوەتەوە بۆ ئینگلتەرە، پاش ئەوەی کە ماوەیەك لە دارولکوتوبی لینینگراد لای قەیسەرەکانی رووس پارێزراوبوو.

گوتەیەکیش هەیە دەڵێ: ساڵی ١٣١٠ی کۆچی لە مزگەوتی دیمەشق سووتاوە!!

## ١١- شێوە نووسینی موصحەفی عوسمان:

لـەوەپێش باسـی کۆکردنـەوەی قورئانمـان کـرد لەسـەردەمی حـەزرەتی عوسمانـدا (ڕەزای خوای لێ بێ).. بێگومان زەیـدی کـوڕی ثـابیـتو سـێ هاوەڵـە قوڕەیـشییەکان کـە لەگەڵیدا بوون بۆ نووسینەوەی قورئان شێوەیەکی تایبەتیان رەچاو کرد. کە حـەزرەتی عوسمان رەزامەندیی خۆی بەرامبـەر ئـەم شێوە نووسـینە دەربـڕی، زانایـان ئـەم شـێوە نووسـینەیان ناونـا: (الرسـم العثمـاني للمـصحف) شـێوەو نووسـینەوەی موصـحەفی عوسمـانی (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) لەوسـاوە ئـەو شـێوەیە رەچـاو کـراوەو لـە جیهـانی ئیسلامیدا لەسەر ئەم شێوە قورئـان نووسـراوەتەوە، دوایـش کـە چاپەمەنی داهات بـۆ یەکەمجار ساڵی ١٥٣٠ی ز لە (بەندوقیيە) لەچاپ دراو دوایی کە لە (سانت بترسبوغ) لـە روسـیا سـاڵی ١٧٨٧ی ز لـەژێر دروشمـی (طبعـة اسـلامية خالـصة للقـران)و ئـەمجار لـە ئاستانە ساڵی ١٨٧٧ی ز قورئان چاپ کرا بەو رێنووسە چاپ کراوە، ئێستاش بەزۆری ئەو رێنووسە بەکار دەهێنرێ!!!

---

[15] - تفسر الطبري ج١/ ٦١.

## پێشەكی

**زانایانی ئیسلام دەربارەی حوكمی ئەم ڕێنووسەی موصحەفی عوسمانی چەند راو بۆچونێكیان هەیە:**

١- جەماوەری زانایان – لەوانە ئیمامی مالیك و ئەحمەدو هی تریش – پێیان وایە: ئەم شێوە نووسینەی عوسمان پێی رازی بووە (تەوقیفی)یە، واتە: لەلایەن پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دیاری كراوەو پێویستە هەر بەو شێوە قورئان بنووسرێتەوەو چاپ بكرێ.

ئیبنولوبارەك لە عەبدولعزیز دەبباغی مامۆستایەوە دەگێڕێتەوە گوتوویەتی: هاوەڵان و غەیری هاوەڵان بە ئەندازەی مویەك لە شێوە نووسینەوەی قورئاندا رۆڵیان نەبووە، بەڵكوو ئەم ڕێنووسە لەلایەن پێغەمبەر خۆیەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دیاری كراوە، ئەو فەرمانی پێ كردوون كە بەم شێوە تایبەتییە بینووسنەوە، لەبرێ شوێن (الف) زیاد بكەن، لە هەندێ شوێندا لایبەرن، ئەم ڕێنووسە نهێنییەكی تێدایە كە ئەقڵ و هۆشی ئێمە پەی پێ نابات، ئەمە نهێنییەكە كە پەروەردگار تایبەتی كردووە بە قورئانەوەو بەس! وەكوو چۆن تێكستی قورئان بە وشەو مانایەوە موعجیزەو سەرئاسایە، شێوە نووسینەوەكەشی هەر موعجیزەیە.

زانایان بۆ ئەم ڕێنووسە چەند وردەكارییەكیان باس كردووە، بۆ نمونە: زیاد كردنی پیتی (ی) لەوشەی (اید) لەئایەتی (٤٧)ی سورەتی (والذاریات)دا كە بەم شێوە نووسراوە (أیید)، دەڵێن: ئەوە ئاماژەیە بۆ بەگەورە زانینی هێزو توانای پەروەردگار كە بەو دەستی قودرەتە ئاسمانی دروست كردووەو هیچ هێزو توانایەك لەو هێزە ناچێ، ئەمەش لەسەر ئەم یاسایە: كە زێدەیی وشەو پیت نیشانەی زێدەی مانایە!

٢- ڕای دووەم: هەندێ لە زانایان لەوانە ئەبوبەكری باقلانی و (عزالدین)ی كوڕی (عبدالسلام)و ئیبنوخەلدون پێیان وایە: كە دروستە قورئان بە ڕێنووسی تریش بنووسرێتەوە، واتە: خەڵكی چۆن وشەی عەرەبی تری ئاسایی دەنووسن، دتوانن بەو ڕێنووسە قورئانیش بنووسنەوە! چونكە دەربارەی ڕێنووسی قورئان دەقێك نەهاتووە بەپێویستی دابنێ.

## پێشەکی

لیژنەی (فتوی) لە زانکۆی (الأزهر) ساڵی ١٩٣٧ی ز لە گۆڤاری (الرسالة) ژمارە (٢١٦)دا فتوایەکی دەرکرد وای بەباش زانی کە ڕێنووسی قورئان هەر لەسەر ڕێنووسی موصحەفی عوسمانی بمێنێتەوە، بەمەبەستی ئیحتیات کردنو مانەوەی قورئان لەسەر شێوەی خۆی، چ لەبارەی فۆنەتیکەوە، چ لەبارەی ڕێنووسەوە. هەروەها بۆ پارێزگاری کردنی ڕێنووسی قورئانو پابەند بوون بەو ڕێنووسە. کە لە هەموو چاخە مێژووییەکانی رابردووی ئیسلامدا موسڵمانان پێیەو پابەند بوونو لە هیچ زانایەکی بەناوبانگی ئیسلامی نەبیستراوەو نەبینراوە کە گۆڕانکاری لە ڕێنووسی عوسمانیدا کردبێ. هەروەها بۆ زانینی شێوەی پەسەندو ناپەسەندی خوێندنەوەی قورئان، هەروەها بۆ ئەوەی قورئان موعەڕڕەض نەبێ بۆ گۆڕانکاریو دەسکاری کردنی، یان یاری کردن بە ئایەتەکانی لە رووی ڕێنووسەوە!

بەڵام بەرای زۆربەی جەماوەری زانایان چ خراپەیەکی تێدا نییە ئەگەر لەبواری فێرکردنو دەرس خوێندندا قورئان بە ڕێنووسی ئاسایی عەرەبی بنووسرێ، هەروەها دروستە بەمەبەستی شایەد هێنانەوە بە ئایەتێك یان زیاتر لەناو کتێبەکاندا یان بۆ را نواندنی بڕی ئایەت لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن بە شێوەی ڕێنووسی تازە بنووسرێتەوە!

## ١٢- حەوت زاراوە یان حەوت جۆرە خوێندنەوەکەی قوڕئان

بێگومان عەرەبەکان چەند جۆر زاراوەی جیاجیایان هەبوون، کە هەموویان لە سروشتی تایبەتیو ژیانی سارانشینیو تایبەتمەندی ولاتەکەیان هەڵقولاو بوون، هەموو زاراوەیەك دەنگو رەنگی خۆیو تایبەتمەندییەکی پێوە بوو، کتێبە تایبەتیەکانی وێژەو فیقهی زمانو قیرائات ئاماژەیان بۆ کردوون! هەر هۆزو خێڵێکی عەرەب لەحنو دەنگێکی تایبەتی بۆ زۆربەی وشەکان هەبوو، کە ئەو جۆرە لەحنو دەنگە لەلای هۆزو خێڵێکی تریان دەست نەدەکەوت!

بەڵام هۆزی قوڕیش لەناو هەموو هۆزەکانی عەرەبدا بەهۆی نیشتەجێ بوونیان لە پەنا کابەداو دابەشکردنی ئاو بەسەر حاجیانداو ئاوەدانکردنەوەو خزمەت کردنی کابەو چاودێری کردنیو وەدەست خۆ گرتنی کاروباری بازرگانی لەو هەرێمەداو گەلێ شتی تریش هۆکارێکی بۆ گونجاندبوون کە زاراوەکەیانی وا لێ کردبوو نیمچە پێشەنگییەکی بدرێتێ، لە ناو هەموو زاراوە جۆراو جۆرەکانی عەرەبدا جۆرە ستاندەرییەکی بەدەست هێنابوو، عەرەبەکان تێکڕا هەموویان ئەم زاراوەیان بە باوکی زاراوەکانی خۆیان دەزانی!

کەوابێ شتێکی سروشتی بوو: کە قورئان بە زاراوەی قوڕیش بنێردرێ بۆسەر پێغەمبەری رەچەڵەك قوڕەیش (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆ ئەوەی عەرەبەکان ئولفەتی پێوە بگرنو لێی نامۆ نەبن! هەروەها بۆ چەسپاندنی سەرئاساییو (اعجاز)ی قورئانو بۆڕدانی عەرەبەکان کە ناتوانن وێنەی ئەو قورئانە، یان نمونەی کورتە سوڕەتێکی بخەنەڕوو!

جا کە زاراوەی خێڵە عەرەبەکان بۆ گەیاندنی مەبەستێکی تایبەتی جۆرێك لە جۆرەکانی جیاوازیی تێدا بەدی دەکرێ، دەبێ ئەو قورئانەی کە خودا بە نیگا بۆ پێغەمبەری خۆی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) ناردویەتیە خوارێ، کۆکەرەوەو پوختەی هەموو ئەو زاراوەو شێوە خوێندنەوانە بێ کە لەناویاندا باو بووە. بۆ ئەوەی بە ئاسانی فێری خوێندنەوەی ببنو لە بەری بکەنو تێی بگەن

## پێشەکی

فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) زۆرن دەربارەی ئەوە کە قورئان بە حەوت جۆر خوێندنەوەی هاتۆتە خوارێ.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَقْرَأَنِي جِبْرِيلُ عَلَى حَرْفٍ، فَلَمْ أَزَلْ أَسْتَزِيدُهُ حَتَّى انْتَهَى إِلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ»[16]

عومەری کوڕی خەتتاب ﴿ڕەزای خوای لێ بێ﴾ لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە: کە فەرموویەتی: «إِنَّ الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ».[17]

واتە: ئەم قورئانە بە حەوت جۆر خوێندنەوە هاتۆتە خوارێ، کام شێوە خوێندنەوەتان بۆ ئاسانە بەوە بیخوێننەوە! ئەمە مانای ئەوە نییە هەموو وشەیەکی قورئان بە حەوت شێوە زاراوە دەخوێندرێتەوە، بەڵکوو مەبەست ئەومیە لەو حەوت شێومیە دەرناچێ!

واتە: وشەکانی قورئان یان بە زاراوەی قوڕیش دەخوێندرێتەوە کە ئەمەیان زۆربەی قورئان دەگرێتەوە، یان بە زاراوەی خێڵەکانی تر دەخوێندرێتەوە.[18]

ئەو حەوت لۆغەتو زاراوە مەشهوورەو وشە ئاودارانەی قورئانی پێ هاتۆتە خوارێ، لۆغەتی (قورەیشو هوزەیلو تەمیمو ئەزدو رەبیعەو هەوازینو سەعدی کوڕی بکر)ن. برێك لە زانایان پێیان وایە مەبەست بە (الأحرف السبعة) ئەو جۆرە گۆڕانکارییەیە کە وشەکان لێك جیا دەکاتەوە!

وەکوو:

١- جوداوازی لە (تثنية)و (جەمع)و (تأنيث)دا بە نموونە ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ – سورەتی المؤمنون/٨﴾.

---

[16] - بوخاریو موسلیم ریوایەتیان کردووە.

[17] - بوخاریو موسلیمو ئیمامی مالیك ریوایەتیان کردووە. جامع الاصول ج٢/ ٣١.

[18] - سەیری کتێبی (الاتقان في علوم القران) بەرگی یەکەم لاپەڕە / ٤٧ بکە.

وشەی (لأماناتهم) کە جەمعە بە شێوە موفرەدیش خوێندراوەتەوە (لأمانتهم) لە موصحەفی عوسمانیشدا ڕێنووسەکەی (لأمـانتهم)ە کە هەردوو شێوە خوێندنەوەکە هەڵدەگرێ.

٢- جوداوازی لە (اعراب)دا وەکوو ﴿مَا هَذَا بَشَرًا﴾ ﴿سورەتی یوسف / ٣١﴾.

جەماوەری قورئان خوێنەکان (قراء) وشەی (بشرا) یان بە مەنصوبی خوێندۆتەوە، لەسەر ئەم بنەمایە گوایە (ما) وەکوو (لیس) وایە (اسم)ی خۆی مەرفوع‌و خەبەری مەنصوب دەکا.

ئەمە لوغەتی ئەهلی حیجازەو قورئان بەو شێوە دابەزیوە. ئیبنو مەسعوود وشەی (بشر)ی بە مەرفوعی خوێندۆتەوە ﴿مَا هَذَا بَشَر﴾ لەسەر بنەمای لوغەتی تەمیم کە عەمەلی (لیس) نادەن بە (ما).

٣- جوداوازی لە گۆڕاندن (تصریف)دا وەکوو ﴿فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا – سورەتی سبأ / ١٩﴾ وشەی (ربنا) بە مەنصوبی خوێندراوەتەوە لەسەر ئەم بنەمایە کە (منادى) بێ وشەی (باعد) بەشێوەی ئەمر خوێندراوەتەوە.. لە جۆرە خوێندنەوەیەکی تردا وشەی (ربنا) بە مەرفووعی خوێندراوەتەوە وشەی (باعد) بەشێوەی فیعلی ماضی خوێندراوەتەوە.

٤- جوداوازی بە پێش خستن‌و دواخستن جا یا لە (پیت)دا وەکوو ﴿أَلَم يـأس– الرعد / ٣١﴾ خوێندراویشەتەوە ﴿ألم يأيس﴾. یان لە وشەدا وەکوو ﴿ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ – سورەتی التوبة / ١١١﴾. بە پێچەوانەشەوە خوێندراوەتەوە. یان وەکوو ﴿وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ – سورەتی ق/١٩﴾. خوێندراویشەتەوە ﴿وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْحَقِّ بِالْمَوْتِ﴾.

٥- جوداوازی بە زێدەو کەمی وەکوو ئایەتی ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الأَنْهَارُ– سورەتی التوبه/ ١٠٠﴾. خوێندراویشەتەوە ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتَهَا الأَنْهَارُ﴾ بەو زیاد کردنی پیتی (من).

٦- جوداوازی بەهۆی گۆڕینی پیت یان وشە بە پیتو وشەیەکی تر نمونەی گۆڕینی پیت بە پیت ﴿وَانظُرْ إِلَى العِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا– سورەتی البقرە /٢٥٩ ﴾، وشەی ﴿نُنشِزُهَا﴾ نوونی یەکەمی مەضمومەو کۆتاییەکەشی زای نوختەدارە، خوێندراویشەتەوە ﴿نَنشُرُهَا﴾ نوونەکە مەفتووحەو کۆتاییەکەشی (رای) بێ نوختەیە.

٧- جوداخوازی بە گەورە کردنو چوك کردنەوەی وشەکان بە مەفتووح کردنو خوارکردنەوەی (الأمالة)و دەرخستن (الأظهار)و تێك نان (الأدغام) وەکوو ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ مُوسِي – سورەتی النازعات / ١٥﴾ بە لارکردنەوەش خوێندراوەتەوە ﴿هَلْ أَتَيكَ حَدِيثُ مُوسَى﴾، واتە وشەی (أتى)و (موسى) بە کراوەیی خوێندراونەتەوە. وشەی ﴿الطلاق﴾ بە لامی قەڵەوو بە لامی بچووکیش خوێندراوەتەوە. وشەی ﴿خَبِيرًا بَصِيرًا – سورەتی الإسراو / ١٧﴾ بە ڕێی قەڵەوو بە ڕێی بچوکیش خوێندراوەتەوە.

ئەمە کورتەیەك بوو لە (علوم)ی قورئان هیوادارم سود بەخش بێ.

(مەلا مەحموودی کەلاڵەیی)

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

## سورەتی فاتیحە

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (١) الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٢) الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (٣) مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ (٤) إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥) اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (٦) صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ (٧)﴾.

سورەت: بریتییە لە کۆمەڵێك وشەو رستە، کورترین سورەت لە سێ ئایەت پێك هاتووە، هەموو سورەتێك ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە، ناوی سورەتەکان بە گێرانەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێ بێ) بە ئێمە گەیشتووە، ئەم سورەتە کە بە سورەتی (فاتحة) مەشهوورە، چەند ناوێکی هەیە، هەرە بەناوبانگەکانیان (أم الکتاب)و (أم القران)ە چونکە هەموو مەبەستە سەرەکیەکانی قورئانی لە خۆ گرتووە: کە حەمدو ثەنای پەروەردگارو گەردنکەچی بۆ فەرمان و نەهی و ئامۆژگارییەکانی و هەموو رونکردنەوەی مژدەو هەڕەشەکانی کە لە قورئاندا هەن لە خۆی گرتوون، هەروا پێی دەگوترێ: (السبع المثانی) چونکە لە نوێژدا ئایەتەکانی دووبارە دەکرێنەوە، هەروا پێی دەڵێن (الأساس) چونکە بناغەو سەرەتای قورئانە، ناوێکی تریشی هەیە: پێی دەڵێن: (الفاتحە) چونکە لە تەرتیبی موصحەفدا یەکەم سورەتە کە دەخوێندرێتەوەو دەنووسرێتەوە، یان یەکەم سورەتە کە نێردراوەتە خوارێ.. چەند ناوی تریشی هەن! لە کتێبە تەفسیرەکاندا باسکراون. دەربارەی فەڕو گەورەیی ئەم سورەتە چەند حەدیثی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕدراونەتەوە: یەکێ لەو حەدیثانە

ئەو فەرموودەیە کە ئیمامی بوخاریو ئیمامی ئەحمەد لە ئەبو سەعیدی کوڕی (المعلی) گێڕاویانەتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی گوتم: ((لأعلمنك أعظم سورة من القرآن قبل أن تخرج من المسجد، قال فأخذ بيدي، فلما أراد أن يخرج من المسجد قلت يا رسول الله: إنك قلت لأعلمنك أعظم سورة في القرآن، قال: نعم، الحمد لله رب العالمين هي السبع المثاني والقرآن العظيم الذي أوتيته)).

واتە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: پێش ئەوەی ئەمڕۆ لە مزگەوت بچێتە دەرەوە گەورەترین سوڕەتی قورئانت فێر دەکەم، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ویستی دەرچێ، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ بە منت فەرموو: گەورەترین سوڕەتی قورئانت پێ دەڵێم؟! فەرمووی: بەڵێ: ﴿الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ...﴾ە ئەو سوڕەتەیە کە پێی دەگوترێ: (السبع المثانی) هەروەها ئەو قورئانە گەورەو بەرێزەیە کە پێم دراوە.

## ١- سورة الفاتحة

## بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

بەناوی خودای بەخشندەو دلۆڤان خاوەنی رەحمو بەزەیی لە جیهاندا بۆ هەموو گیانلەبەرێك، بەخێوکەرو رزقو رۆزیدەرە بۆ کافرو موسوڵمان لە دونیادا، خاوەنی رەحمو بەزەیی یە بۆ خودا پەرستان لە ڕۆژی دوایی دا. ﴿الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ سوپاسو ستایشی بێپایان لە هەر کەسێکەوە دەربچێ لەسەر هەر چاکەیەك بێ، هەر بۆ زاتی پەروەردگارە، کە بەدیهێنەری هەموو بوونەوەرە، سەرپەرێشتیکارو بەخێوکەرو پەروەردگاری ئادەمیزادو ئاژەڵو دارو درەختو رووەکی وشکانیو ناو دەریایە، هەر حەمدو سوپاسێك بکرێ، هەر بۆ خوایە، چونکە ئەو بۆ خۆی کانو سەرچاوەی بوونی هەموو هەبوونێکەو هەر ئەو هەڵسوڕێنەرو کارگێڕو رێکخەری بونەوەرە، هەر لە

سەرەتاوە تا كۆتایی ئاگادارو چاودێری هەموو شتێكە، هەر ئەو رێنیشاندەرو ئیلهام بەخشە بۆ چاكەكاری، سوپاس بۆ بەخشندەییو شوكرو ئەنا بۆ نیعمەتەكانی!

**پەروەردەكردنی پەروەردگار بۆ ئادەمیزادلە دوو جۆردا رەنگ دەداتەوە:**

١- پەروەردە كردنی جەستەو لەشو لارو گەشەپێدانی تا دەگاتە هەرەتی هێزو توانا، هەروا گەشەپێدانی ئەقڵو هۆشو تێفكرینو بیركردنەوەو زانینو زانیاری.

٢- پەروەردە كردنی ئایین بە ناردنی پێغەمبەرانو كتێبی ئاسمانیو بەرنامەی تێرو تەسەل بۆ ناویان تا پێغەمبەرەكان بتوانن لە ژێر رۆشنایی ئەو نیگاو پەیامەدا بیرو باوەڕی راستو دروست لە دەروونی شوێنكەوتوانیاندا بڕوێنن.

﴿الرَّحْمَنِ﴾ بەخشندەو میهرەبانو بە بەزەییە بێ سنورو بێ ئەندازە لە دونیادا بۆ هەموو كەسێك ﴿الرَّحِيمِ﴾ دلۆڤانو بە بەزەییە لەدوا رۆژدا تەنیا بۆ موسڵمانانو دەیانخاتە بەهەشتەوە...

پەروەردگار كە ئەم دوو صیفەتەی لە پاش وشەی ﴿رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ەوە هێنان بۆ ئەوەی هێنان بیسەلمێنێ كە خوایەتیەكەی بۆ بەندەكانی خودایەتی میهرەبانیو چاكەو بە بەزەییە، بۆ ئەوەی بەندەكانی جۆرە كردارێك بكەن ئەو رازی بكەن، بە دڵو دەرونێكی فراوانەوە رووی تێبكەنو بەندایەتی خۆیان بنوێنن، ئەو سزایانە كە پەروەردگار بۆ بەندەكانی خۆی دایناون لە دنیاو دوا رۆژدا، ئەوە بۆ ئەو كەسانەیە كە سنووریان بەزاندبێ! رێزی پیاوانی خودایان نەگرتبێ، ئەم سزایانە بە رواڵەت قەهرو غەزەبن بەڵام لە حەقیقەتدا دادپەروەریو رەحمەتو میهرەبانییە، بۆ پەروەردە كردنی ئادەمیزاد بۆ ئەوە لە شەقامە رێ لانەدا، چونكە لە گرتنە بەری رێبازی خودا خۆشبەختی هەر دوو دونیایان دەست دەكەوێ، بەڵام بەلادان لێی تووشی بەدبەختیو سەرلێشێواوی دەبن. ﴿مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ خاوەن دەستەڵاتو دەست رۆیشتووە لە رۆژی قیامەتدا بۆپاداشت دانەوەو تۆڵە سەندنەوە.

بێگومان پاداشو تۆڵەستاندنەوەی رۆژی قیامەت شتێكی دادوەرانەیە، چونكە ئادەمیزاد هەر چەندە جار جارە لە جیهاندا پاداشی چاكەو تۆڵەی خراپەكاریان لێ

وەردەگرێتەوە، بەڵام زۆرجار ئەو پاداش‌و تۆڵەیە پڕاو پڕ نابێ، ئەوەتا ئێمە زۆرجار دەبینین زۆر کەسی گومڕا لە نازو نیعمەتدان‌و بەخۆشی ژیان دەبەنە سەر، بەڵێ جار جار توشی ناخۆشی دەبن، جاری وادەبێ کابرای گومڕا بەڵایەکی بۆ دێ ماڵ‌و منداڵی سەرنگون دەبێ، یان خۆی تووشی نەخۆشی دەبێ، تووشی بێ ئەقڵی‌و شێتی دەبێ، بەڵام ئەم جۆرە بەڵایانە نابنە تۆڵەیەکی پڕاو پڕی ئەو تاوانە گەورانەی ئەنجامی داون!!

یان دەبینین زۆر کەس راستاڵەو خودا پەرستە، کەچی مافی پێشێل دەکرێ، ئەزیەت دەدرێ، ماڵی دەخورێ، کوڕی دەکوژرێ، پاداشتی پڕاو پڕی نادریتەوە.. بەڵێ: لەوانەیە کەمێکی پاداش دەست بکەوێ وەکوو دڵ رەحەتی لەش ساغی، زیرەکی، رەوشت جوانی، بەڵام ئەمانە نابنە پاداشی پڕاو پڕی ئەو پاداشەی شیاوی ئەوە، تەواوی ناکا، جا کە وابێ هەبوونی رۆژی قیامەت دادوەرانەو عادڵانەیە، بۆ ئەوەیە هەموو کەسێك سزاو پاداشی خۆی پڕاو پڕ وەربگرێتەوە، چاکە بە چاکەو خراپە بە خراپە ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾ هەر کەسێك بە ئەندازەی گەردیلەیەك چاکە بکا پاداشی ئەو چاکەیەی دەبینێتەوە هەر کەسێك بە ئەندازەی گەردیلەیەك خراپە بکا تۆڵەی لێ دەسەندرێتەوە، ﴿وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾ خودای تۆ ستەم لە کەس ناکا، ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ هەر زاتی پاکی تۆ دەپەرستین، بە دڵ هەست بە گەورەیی زاتی بێچونی تۆ دەکەین، بڕوامان وایە دەستەڵاتێکت هەیە، عەقڵ‌و بیرو بۆچوونی ئێمە دەرکی ناکا، چونکە ئەو دەسەڵاتە زۆر لەوە فراوانترو بەرزترە: کە ئێمە حەقیقەتەکەی بزانین! بۆیە لەناخەوە هەست بە خودایەتیت دەکەین، سەری بەندایەتیت بۆ نەوی دەکەین.

خواپەرستی (عیبادەت) چەند جۆرو شێوازێکی هەیە، بەگوێرەی ئایینەکان‌و رۆژگار ئاڵ‌و گۆڕی تێدا کراوە، هەموو جۆرە عیبادەتەکان بۆیە دانراون ئادەمیزاد هۆشیار بکەنەوە روو بکاتە ئەو دەسەڵاتە بەهێزە بەرزەی کە هیچ دەستەڵاتێکی لە پشتەوە نییە، هەروەها بۆ راست کردنەوەی ئەخلاق‌و رەوشتی نارێك‌و ناشیرین‌و بۆ

خاوێن کردنەوەی دڵو دەروونە، هەرکاتێ عیبادەتەکە ئەم ڕەنگدانەوەی لە ئادەمیزاددا نەبیبنرا، ئەوە ئەو عیبادەتە نییە کە خودا داینـاوەو لێی داوا کـردوین!! بۆ نموونـە پەروەردگار فەرمانی پێ کردوین کـە نوێـژ بکەینو بـە ڕێـكو پێکی ئـەنجامی بـدەین، فەرمووشیەتی کە کاریگەری نوێژ ئەوەیە کە نوێژکەرەکە لە تاوانو کـرداری ناشـیرینو گفتاری نابەجێ دووردەخاتەوە. ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ﴾ هـەر کاتـێ نوێژ ئەم ڕەنگدانەوەی لە ئادەمیزاددا نەبینرا ئەوە ئەو نوێژە نییە کە خودا فـەرمانی پـێ کـردووە، بـەڵکوو ئـەوە کـردارو گوفتارێکـە ڕوحـی خـودا پەرسـتی تێـدا نییـە، حیکمەتو نهێنییە تایبەتییەکانی کە بۆی دانراوە لەدەستی داوە، تەنانەت پـەروەردگار هەڕەشەی سەختی لەو نوێژکەرانە کردووەو فەرموویەتی ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾ هاوار، یان شیوی (وەیل) بۆ ئـەو نوێـژ کەرانـەی بـە ڕواڵەت نوێـژ دەکەنو بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان لەمانای نوێژەکەیان بێ ئاگان، بەدڵ ئاگایان لەوە نییە، ڕوویان لە کێ کردووەو لەگەڵ کێ ئاخاوتن دەکەن!!

جا وەکوو چۆن پـەروەردگار لـەم ئایەتـەدا فـەرمانی پـێ کـردوین کـە جگـە لـەو، عیبادەت بۆ کەسی تر نەکەین چـونکە هـەر ئـەو خـاوەن دەسـتەڵاتەو شـیاوی عیبـادەت بۆکردنە، هەروەها فەرمانی پێ کردوین کـە پـشتو پـەنا هـەر بەئـەو ببەسـتینو داوای کۆمەکی هەر لەئەو بکەین، بۆیە دوا بەدوای ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ دەڵێین: ﴿وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ هەر لە زاتی پاکی تۆ داوای کۆمەکی دەکـەین، پـشت هـەر بـە هێـزی لەبننـەهاتووی تـۆ دەبەستین، هەموو کارێك بەپشتیوانی تۆ ئەنجام دەدرێ، هـەر ئیـشێك تـۆ ڕەزامەنـدیت لەسەر نەبێ سەر ناگرێ، جا ئەمە مانای وانییە ئێمە پشت بە خودا ببەستینو پاڵی لێ بدەینەوە، بەڵکوو پێویستە لەناو خۆماندا هاریکاری یەکتری بکەین ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ ئێمە پێویستە دەرمـان بـۆ نەخۆشـیمان دابـین بکـەین، چـەكو تەقەمـەنی پێویـست بـۆ سـوپامان دابـین بکـەین، سـەربازو سـوپا ڕێـك بخەین، فێری بـەکارهێنانی چـەكو پیلانـی شـەڕ ببـین، زەوی بکێڵینو زبڵـی کیمیـاوی پێوە بکـەینو بـژاری بکـەینو ئـاوی بـدەینو خزمـەتی بکـەین ئـەمجارە پـشت بـەخودا

ببەستین بۆ چاکبوونەوەی نەخۆشمانو سەرکەوتن بەسەر دوژمنداو زۆری بەروبوومو داهاتمان! نزای لێ بکەینو لێی بپاڕێینەوە، کە هەموو کارەکانمان کاریگەر بن، ئیتر زیاد لەوە دەبێ ئیشی خۆمان حەواڵەی زانینو دەسەڵاتی خودا بکەین، چونکە جگە لەخودا کەسی تر دەسەڵاتی ئەوەی نییە، پەروەردگار بۆ خۆی بەڵێنی پێ داوین هەرکاتێ نزای لێ بکەین، بەهانامانەوە دێ، دەفەرموێ: ﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ بانگم لێ بکەن هاوارم بۆ بێنن وڵامتان دەدەمەوە. ئەوەشی پێ ڕاگەیاندوین کە هەمیشە لێمان نزیکەو نزامان دەبیستێ ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ﴾ کەواتە داوای کۆمەکی لە گۆڕی پیاو چاک، داوای جێ بەجێ کردنی کارێك یان ئاسان کردنی، یان چاك بوونەوەی نەخۆشێ، یان بە هیلاك چوونی دوژمن! دواکردنی ئەنجامدانی ئەم کارانە لە غەیری خودا کارێکی بێ شەرعینو جۆرە بتپەرستییەکە لە پێش هاتنی ئیسلاما باوبووە تا ئێستاش شوێنەواری ماوە، پێویستە هەر کەسە لە عاستی خۆیەوە هەوڵی قەڵاچۆ کردنی بدا، پێویستە ئادەمیزاد داوای یارمەتی لە خوا بکا لە کارێکدا کە کردەوەی ئەوی تێدایە، کەسێ کردەوە واز لێ بێنێو هیچ نەکاتو پێی وابێ پشتی بەخودا بەستووە، ئەوە دژی سروشتی ئادەمیو دابو نەرێتی ئیسلامی رەفتاری کردووە، ڕێبازی شەریعەتی واز لێ هێناوە، ذەم کراوو ترۆ کراوە، نەك خاوەن تەوەکولو سوپاس کراو، کەواتە داوای کۆمەکی لە خودا بەو مانایەی باس کرا ئەوە تەوەکول لەسەر خودایە، هەر کاتێ ئادەمی بەو شێوەیە رەفتاری کردو داوای کۆمەکی لە خودا کرد، ئەوە بەندەیەکی گەردن کەچو فەرمانبەرداری یەزدانەو خوداپەرستی بەڕاستییە، لەگەڵ خەڵکیشدا ئازادو سەربەرزو سەرفرازە، گەردن کەچی دەستەڵاتی هیچ مرۆڤێکی زیندو مردو نییە، بەمەش خۆی رزگار دەکا لە کاریگەری لێپرسراوی خوانەناسو فێڵباز ﴿اهدِنَا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ﴾ خودایە! شارەزاییمان بکە بۆ ڕێگەی ڕاستو بمانگەیەنە بە مرادو هیدایەتمان بدەو مەهێڵە لەو ڕێبازە ڕاستەقینە لابدەین.

**ڕێنومایی‌و هیدایەتی پەروەردگار بۆ بەندەكانی بەچەند جۆرێكە:**

١- هیدایەت‌و ڕێنومایی ویژدانی (هیدایة الألهام) وەكوو ڕێنومایی كردنی منداڵ لە دوای هاتنە دونیاوە كە هەست دەكا بە برسێتی‌و پێویستی بە خۆراك! هەر كە برسی بوو دەست دەكا بە گریان‌و كڕوزانەوە.

٢- هیدایەت بەهۆی هەستەكانەوە (هدایە الحواس) ئەم جۆرە ڕێنومایییە ئادەمی‌و ئاژەڵ تێیدا هاوبەشن بەڵكوو لە ئاژەڵدا بەهێزترە، چونكە بێچولەی ئاژەڵ هەر كەمێك دوای لە دایك بوونی، ئەم هەستەی لا پەیدا دەبێ! بەڵام لە ئادەمیدا وردە وردە سەر هەڵدەدا.

٣- ڕێنومای عەقڵ‌و هۆش (هدایة العقل) ئەم جۆرە هیدایەتە لە دوو جۆرەكانی تر گرنگترە، ئادەمی بە عەقڵ‌و هۆشی لە ئاژەڵ جیا دەبێتەوە، ئادەمی بە سروشت ژیانی كۆمەڵایەتی هەڵدەبژێری، دەیەوێ لەگەڵ هاونشینانی خۆیدا هەڵ بكا، دیارە هەست‌و ویژدان ئەم پێویستییەی بۆ دابین ناكەن، بەڵكوو عەقڵ‌و هۆشی، ئەم كەلێنەی بۆ پڕ دەكەنەوە، كەوا بوو بۆ ئەوەی هەڵەكانی هەست‌و ویژدانی ڕاست بكاتەوە، پێوستی بە عەقڵ‌و هۆشی هەیە، چونكە بڕێ جار هەست دەكەوێتە هەڵەوە عەقڵ هەڵەكەی بۆ ڕاست دەكاتەوە، بۆ نمونە خێل یەك بە دوو دەبینێ‌و نەخۆش ئاوی شیرین بە تاڵ دەزانێ‌و بینەرو چاوساغ دارێكی ڕاست لەناو ئاودا بەخوار دەبینێ!

٤- هیدایەتی ئایین‌و شەریعەت، ئەم جۆرە هیدایەتە زۆر پێویستە بەتایبەتی بۆ كەسێك كە هەواو ئارەزو عەقڵی لێ ستاندبێ، بووبێ بە كۆیلەی هەواو هەوەسی خۆی‌و ڕێبازی خوارو خێچی گرتبێ، ستەم لە خۆی‌و هاونشین‌و هاوجینسی خۆی بكا، هەركاتێ هەواو هەوەس بەسەر عەقڵدا زاڵ بوو، هەر بە ئایین‌و ڕێبازی ڕاست دەدۆزرێتەوە، هەر بە عەقڵ‌و تێفكرین سنوور بۆ هەموو شتێك دادەنرێ.

٥- جۆرێكی تر لە هیدایەت هەیە، پێی دەڵێن: ڕێنومایی‌و یارمەتیدان‌و دەست بە پشتەوە گرتن (هیدایة المعونة و التوفیق) ئەم جۆرە هیدایەتە تەنها لە دەسەڵاتی خودادا هەیەو ئەو دەیبەخشێ تەنانەت پێغەمبەریش ئەو دەسەڵاتەی پێ نەدراوە!

ئەوەتا پەروەردگار بە پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاء – القصص /٥٦﴾.

واتە: ئەی محمد! ئەتۆ ناتوانی هەر کەسێکت خۆش بوێ بیخەیتە سەر رێبازی راستو بەردەوام بێ لەسەری، بەڵکوو خودا دەتوانی ئەم کارە ئەنجام بداو هەر کەسێکی بوێ بێگەیەنێتە سەر رێگای حەقو نەهێڵێ لێی لابدا، ئەوە دەستەڵاتی ئەوە هی کەسی تر نییە. ئێمە کە روو دەکەینە بارەگای پەروەردگار دەڵێین: ﴿اهدِنَا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ﴾ ئەم جۆرە هیدایەتەمان مەبەستە، واتە: خودایە! رێنوماییمان بکە بەشێوەیەك ئەو رێنومایی کردنە لە تەکماندا بێ، رێنومایی کردنێك بێ دەستی قودرەتی غەیبی لەگەڵدا بێ نەهێڵێ لە رێگەی راست لادەین، نەهێڵێ بکەوینە هەڵەوە بەردەوام بین لەسەر رۆیشتن بە رێگای راستدا.

بەڵام هیدایەت کە بەمانا شارەزایی کردنو رێگا پیشاندانو ئامۆژگاری کردن بێ، ئەوە پلەیەکە دراوە بە بەندە راستاڵەکانی خوداو بە گوێرەی دەقی قورئان ئەرکی هەرە پیرۆزی پێغەمبەری ئیسلام بووە، دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ – الشوری /٥٢﴾. بێگومان تۆ ئەی پێغەمبەر! ئادەمیزادان شارەزا دەکەی بۆ رێگای راستو بانگەوازی دڵسۆزانەیان دەکەی: ﴿صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ﴾ رێنوماییمان بکەو بەردەوامان بکە لەسەر رێبازی پێغەمبەرانو راستگۆیانو راستاڵان، ئەو خودا پێداوانەی کە نیعمەتی عیبادەتو خوداپەرستیو حەقناسینت پێ بەخشیونو دڵیان بەخوا پەرستی پەیوەست بووە، هەموو خۆشیەکیان لە بەندایەتی تۆدا بینیوە، سەرفرازی هەردوو دونیا بوون ﴿غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ﴾ نەك ئەوانەی رقت لێیانە، غەزەبی تۆیان لەسەرە، خودایە! نەمانخەیتە سەر رێبازی ئەوانەی ئایینی تۆیان پێگەیشتووەو بڕوایان پێ نەهێناوە! رەشیان کردۆتەوە رقو غەزەبی تۆیان بەدەست هێناوە، چارەڕەشو بەدبەختی دونیاو قیامەت بوون ﴿وَلاَ الضَّالِّينَ﴾ هەروەها نەك گومڕایان: ئەوانەی حەقیان نەناسیوە، وەکوو پێویستو بەشێوەی رێكو پێك حەقیان

نەدۆزیوەتەوە، وەکوو ئەوانەی کە پەیامی پێغەمبەرانیان پێ نەگەیشتووە یان پێیان گەیشتووە بەڵام بە شێواوی پێیان گەیشتووە، سەرلێشواو وگومڕانو ناتوانن ڕێبازی ڕاست بدۆزنەوە ﴿آمین﴾ خوایە! ئەم نزایانەمان وەربگرەو نزاو پاڕانەوەمان قبووڵ بفەرموو.

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

## ٢- سورة البقرة

سوڕەتی بەقەرە دووەم سوڕەتە لە قورئاندا بە پێی تەرتیبی موصحەفی عوسمانی. (٢٨٦) ئایەتە، درێژترین سوڕەتی قورئانە، کورتترین سوڕەتیش سوڕەتی کەوثەرە، تێکڕای زانایان رایان وایە کە سوڕەتی بەقەرە مەدینەییە (مەدەنییە) بەڵکوو دەفەرموون: یەکەم سوڕەتە کە دوای کۆچکردنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە مەککەوە بۆ مەدینە هاتۆتە خوارێ، گەلێ فەرموودەو حەدیثی ساغ دەربارەی فەزڵو گەورەیی ئەم سوڕەتە هاتووە، لە حەدیثێکی صەحیحدا کە ئیمامی موسلیم — خوا لێی رازیی بێ — ریوایەتی کردووە دەفەرموێ: (ئەوی لەبەری بێ یا بە نووسراوی هەڵی بگرێ سیحرو جادو کاری لێ ناکا).

## ڕەوشتی موسڵمانانو پاداشتی خودا پەرستان

﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٥﴾ ﴾

﴿الم﴾: ئەمە هێماو رەمزە، هەر خودا بۆخۆی مانای دەزانێ‌و، پێغەمبەری (دروودی خوای لەسەر بێ) لە مەبەستەکەی حاڵی کردووە، بەڵام ماناکەی بۆ ئێمە روون نەکراوەتەوە، هەروا هاو وێنەکانیشی وەکوو ﴿المر﴾و ﴿المص﴾و ﴿كهيعص﴾..هتد. زۆر قسەو باس لەسەر ئەم پیتە پچڕ پچڕانە کراوە، پوختەکەی ئەمەیە: دوور نیە کە ئەم پیتانە کلیلی پەیبردن بە هەنێ نهێنی بن!!

﴿ذَلِكَ الْكِتَابُ﴾ ئەم قورئانە بەرزو پیرۆزە کە بە پێنووسی قودرەت لە ﴿لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ﴾دا نووسراوە لە ماوەی ﴿٢٣﴾ ساڵدا بە گوێرەی پێویست بە فریشتەی تایبەتیدا: کەناوی (جوبرائیلە) بۆ پێغەمبەر ﴿دروودی خوای لەسەر بێ﴾ نێردراوە، یان ئەو قورئانە پیرۆزەی کە لە سەر زمانی پێغەمبەرانی پێشوو باسی کراوە، لە کتێبەکانیاندا باس‌و خواسی نووسراوە ﴿لاَ رَيْبَ فِيهِ﴾ هیچ شك‌و گومانی تێدا نییەو شایانی ئەوە نییە ئێوە لێی بکەونە گومانەوە، ﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ ئەم قورئانە چراو پیشاندەرو هۆی شارەوزایی کردنی پارێزگارانە، واتە: ئەوانەی: کە دەیانەوێ خۆیان لە سەرپێچی کردنی فەرمانی خودا بپارێزن ﴿الَّذِينَ﴾ ئەوانەی ﴿يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ﴾ بڕوایان بەو شتە پەنهانە هەیە، کە لە بیرو باوەڕی ئیسلام دا باسی لێ کراوە، وەك باوەڕ بە پەروەردگاری نادیارو نیشانەکانی‌و، باوەڕ بە فریشتەو پێغەمبەران‌و رۆژی دوایی‌و بەهەشت‌و دۆزەخ، چونکە ئێمە ئەمانەمان نەدیون، بەڵام لە نەدیوی لە سەر فەرمایشتی ئایین بڕوایان پێ دەکەین، لە سنووری جیهانی ماددەو شتە بینراوەکاندا خۆمان قەتیس ناکەین.

﴿وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ﴾ وە لە هەمان کاتدا نوێژ – کە کۆڵەکەی دینە – بە رێك‌و پێکی ئەنجامی دەدەن.. تاد ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ لەو ماڵ‌و داراییەی: کە پێمان داون زەکاتی لێ دەردەکەن، سەرەڕای ئەوەش خێرو خێراتی تر لە سامانەکانیان دەکەن. وەك دەست گیرۆیی هەژاران‌و ماڵ بەخت کردن لە رێگەی خوداو کۆمەکی کردنی سامانیی بۆ پێشکەوتنی ئابووری وڵات. بە مەش خۆیان لە رژدی‌و چروکی رزگار دەکەن‌و

دەچـنە ریـزی بـەرێزی سـەخی سرووشـتانو دڵفراوانـانو بەرچـاو تێـران! هـەروەها ﴿والَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾ ئەوانەی باوەڕیان بەو قورئانو نیگایە هەیە: کە بۆ تۆ نێردراوەتە خوارێ: ﴿وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ هەروەها بڕوایان بەو کتێبە ئاسمانیانە هەیە کە بۆ پێغەمبەرانی پێشوو نێردراونەتە خـوارێ، وەکو: صـوحوفو تـەوراتو زەبـوورو ئینجیل. لەتەك ئەوەشدا ﴿وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾ بڕوای پتەویان بە ڕۆژی دوایـی هەیـە ﴿أُوْلَئِكَ عَلَى هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ﴾ ئـەو خـودا پێداوانـە بەرنامـەی ژیانیـان بـە تێگەیـشتنو پێگەیشتنی ڕێبازی یەزدانی دامـەزراوەو ڕێگـای راسـتیان گرتـۆتـە بـەرو ﴿وَأُوْلَئِـكَ هُـمُ الْمُفْلِحُــونَ﴾ ئەوانــە، بــەڵێ هــەر ئەوانــە لەناخۆشـی ڕۆژی دوایـی رزگاریـان بـووەو رەزامەنـدیی خودایـان بەدەسـت هێنـاوە، ئـەوەی مەبەسـتیان بـووە دەسـتیان کـەوتووە ئەوەی لێی ترساون لێی قوتار بوون...

لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەم دوو شتە باس کراون: - بناغەو دیوار- بناغەکە بریتییـە لە بڕواو نوێژ کردنو ماڵ بەخشین، دیوارەکەش بریتییـە لـە پـەیڕەو کردنـی قورئـان، کۆی هەمووشـیان دەبێتـە خۆپاراسـتن ﴿التَّقْـوَى﴾. دوور نییـە مەبەسـت لـەم قسەیە ئەمـەی خـوارەوە بێ.. بێگومـان خـەڵکێکی زۆر لـەم پێکـەوە بەسـتنە بێ ئاگـان، بـۆرە باوەڕێکیان بە قورئان هەیە، بە نیوە ناچڵی نوێژ دەکەنو بـەنا بـەدڵی زەکاتو مـەکات دەدەن، ئـیتر خۆیـان بـە تـەقواکارو خۆپـارێز دەزانـن، گەرچـی لـە فەرمانـەکانی تـری قورئان تەواو بێ ئاگان.

## ڕەوشتی کافران

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٦﴾ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٧﴾ ﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار باسی بڕوا دارانی کردو ڕەوشتەکانیانی روون کردەوەو ئاکامی کردەوەکانیان – کەرزگاربوونیانە لەتەنگو چەڵەمەی ڕۆژی دوایی – دیاری کرد، ئەمجار هاتە سەر باسی ئەوەبێ بڕوایانەی کە هیچ پەندو ئامۆژگاریەك کاریان تێ ناکا! فەرمووی:

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ لە راستیدا ئەو کافرو بێ بڕوایانەی سەر بۆ هەق دانانەوێنن، زۆر باش دەزانن: کە پێغەمبەرایەتی تۆ راستو دروستە، وە قورئان هەقە، بەلام بە ئەنقەست گوێی خۆیانی لێ کەڕ دەکەن چاوی لێ دەقونجێنن، یان هەوڵ نادەن راستییان بۆ دەرکەوێ، خۆ لە هەموو شتێك گێل دەکەن، بە دڵ گوێ بۆ بانگەوازی هەق ناگرن، وە بە چاوی ورد بینیەوە تەماشای شت ناکەن!! ئەو خوانەناسانە: یەکسانە لایان: چ بیانترسێنی چ نەیانترسێنی باوەڕت پێ ناکەن، ئیمان بە پێغەمبەرایەتیت ناهێنن!! پرسیارێك دێتە پێشەوەو دەڵێ: دەی کە وابێ چ پێویست دەکا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆیان پێوە ماندوو بکاو ترسیان بخاتە بەر، لە کاتێکدا ئەوانە لە عیلمی خودادا بە کافری دەمێننەوەو بڕوا ناهێنن؟

لە وەلامدا دەڵێین: بۆ خاتری ئەوەی لە ڕۆژی قیامەتدا بەهانەیان نەمێنێ، سەرەڕای ئەوەیش بانگەوازی ئیسلام گشتییەو رووی لە هەمووانە، دیاریشە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر ئەم ئەرك کێشانەو زەحمەتی ڕاگەیاندنە پاداشتی گەورە وەردەگرێ ﴿خَتَمَ اللّهُ عَلَى قُلُوبِهمْ وَعَلَى سَمْعِهِمْ وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ﴾ پەروەردگار مۆری ناوە بە دڵیانەوە، چاوی دڵیان کوێر بووە، وەك هەر پێنج هەستەکەیان لەکار کەوتبێ وایە، دەڵێی گوێچکەیان ئاخندراوەو چاویان پەردەی لەسەرە، بۆیە لە گومڕایی خۆیاندا سەرگەردانن! ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ عظِيمٌ﴾ ئەوانە سزای گەورەیان بۆ ئامادەکراوە.

## رەوشتی دوو رووەكان

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾ ﴾.

دوای ئەوەی كە باسی موسوڵمانان‌و خوانەناسەكانی كرد ئەمجار دێتە سەرباسی دوو رووەكان ﴿مُنَافِقِينَ﴾و دەفەرموێ:

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللّهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ﴾ خەڵكانی واش هەن بە دەم دەڵێن: ئێمە موسڵمانین‌و بڕوامان بە خوداو ڕۆژیی دوایی هەیە، بەڵام ئەوانە درۆ دەكەن ئەوانە موسڵمان نین، بەڵكوو بە درۆ خۆیان بردۆتە ریزی موسڵمانانەوە، هەتا نوێژكردن‌و هاموشۆی مزگەوت‌و ئەمانەیان بۆ خودا نییەو بۆ مەبەستی دونیایی‌و بۆ رواڵەتە، ئەگینا ئەوەندە ساختەچییەتی‌و فێڵبازی‌و نارەواییان نەدەكرد، ئەوەندە كاری نەگونجاوو دوور لە ئایینیان ئەنجام نەدەدا، جارێك لە خراپە دەگەڕانەوە، ئەوەتا هەرچی لەدەستیان بێ لە خراپەكاری بە دزییەوە ئەنجامی دەدەن، وەكوو خۆركە لەناو موسڵماناندا كنە دەكەن، ئەگەر بە رواڵەت هاتوچۆی مزگەوت بكەن، یان نوێژ بكەن یا یارمەتی هەژار بدەن یا ئامادەی غەزا ببن، ئەوە بۆ شوێنە ونییە ﴿يُخَادِعُونَ اللّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا﴾ بە خەیاڵی خۆیان فێڵ لە پێغەمبەری خوداو موسڵمانان دەكەن‌و ئەوان هەڵدەخەڵەتێنن، بۆیە وا دەكەن تا كوشتن‌و گرتن‌و سەرانە لێ وەرگرتن لە خۆیان دوور بخەنەوە، بەشە غەنیمەت‌و تالانی بۆ خۆیان وەربگرن‌و ئاگاداری نهێنی كۆمەڵگای موسڵمانان ببن‌و بیگەیەننە كافرەكان!

دەی با وانەزانن کە لە کارە چەپەڵەکەیاندا سەرکەوتوونو خوداو پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ) ئاگاداری کردارەکانیان نین! بەڵکوو خودای مەزنو زانا ئاگاداری هەموو خەیاڵو خەتەرەو بیرو بۆچوونو کردارێکیانە، هەر فێڵێك بکەن پێی دەزانرێ ﴿وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُم﴾ هەر فرووفێڵێك بکەن بە خراپە بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوەو زیانی بۆ خودی خۆیان دەبێ، کەوابێ وەکوو فێڵ لە خۆیان بکەن وایە، چونکە زیانی فێڵ کردنەکەیان هەر بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ ئەوانە لەبەر زێدە گومڕاییو سەرگەردانیو ڕۆچوونیان لە بەدکاریدا هەست بەو زیان لەخۆ کەوتنە ناکەنو هەر دەڵێی بێ هەستن!! چونکە ئەوان ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ لە دڵو دەرونیاندا، نەخۆشیو دووڕووییو فێڵبازی هەیە، ناتوانن، یان نایانەوێ هەقو ڕاستی بزانو شوێنی بکەون، وەکوو چۆن جەستەی نەخۆش ناتوانێ وەکوو پێویست کاروباری خۆی ئەنجام بدا، دڵی ئەو دووڕووانەش ئاوا لەکار کەوتووە، ئەمجا بۆ زیادە بەدبەختیو چارە ڕەشییان ﴿فَزَادَهُمُ اللّهُ مَرَضاً﴾ پەروەردگار نەخۆشی دڵو دەروونیانی بۆ دوچەندانەو، چەند چەندانە کردونەوە، تا بە تەواوی لە قوڕاوی گومڕاییدا سەرنگوون بنو ڕزگاریان نەبێ ﴿وَلَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بۆ ئەوانە هەیە سزایەکی سەختی بەئێش ﴿بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ بە هۆی ئەوەوە کە درۆو دووڕوویان لەگەڵ پێغەمبەرو موسوڵمانان دا کردووە.

## ڕەوشتی دووڕووەکان

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ قَالُوٓا۟ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ وَلَـٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُۗ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾﴾.

خوێنەری موسڵمان! پەروەردگار لەو سێ ئایەتەی پێشوودا حەقیقەتو چۆنێتی دووڕوویی ﴿النِّفَاق﴾ی بۆ روون كردینەوە، ئەمجارە سێ نموونە لە قسەو هەڵوێستی دووڕووەكانمان بۆ دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ قَالُواْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ﴾ ئەگەر بەو دووڕووانە بگوترێ: ئاشوبو ئاژاوە لەناو وڵاتدا بەرپا مەكەنو واز لە خراپەكاری بێنن، هەر بەوەندە ناوەستن كە بڵێن: ئێمە ئاشوب ناگێڕینو خراپەكار نین، بەڵكوو زرۆ بێ شەرمانە دەم درێژی دەكەنو دەڵێن: ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ﴾ ئێمە ئیشو كارمان هەر رێكخستنو ئیصلاحی كۆمەڵە، كە هامشۆی نا موسڵمانانیش دەكەین بە مەبەستی زەمانەسازیو دیبلۆماسییە، ئاشكراشە ئەوانەی ئاشوب دەگێڕنو خۆشیان بە دڵسۆزو رێكخەرو موصلیح دەزانن لە هەموو چەرخو دەورێكدا زۆرو زەبەندن!! هەركاتێ تەرازووی دڵسۆزیو ئیخلاص لاسەنگ بوو، هەموو كاروبارێك تێك دەچێو دونیا دەبێتەت كانی ئاشووب، ئەوانەی ئیخلاصو دڵسۆزییان لە سروشتدا نییە بۆ پەروەردگاریان، هەرگیز هەست بە خراپەكاری خۆیان ناكەن، بۆیە پەروەردگار بەو شێوە بۆچوونەكەیان رەت دەكاتەوە، دەفەرموێ: ﴿أَلا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِن لاَّ يَشْعُرُونَ﴾ ئاگاداربنو بزانن! بێگومان ئەوان ئیشو كاریان، هەڵسو كەوتیان، هەر خراپەكاریو بەرپاكردنی ئاشووبو گێرەو كێشەو فیتنەییو تێكدانی ریزەكانی كۆمەڵی موسڵمانانە! كەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەلای ناخێریان پێیان وایە كردارەكانیان باشن، چونكە ئەوانە هەستیان نیەو شعوور ناكەن.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُواْ كَمَا آمَنَ النَّاسُ﴾ ئەگەر كەسانێك بۆ ڕەزامەندیی خودا ئامۆژگارییان بكەنو بیانەوێ راستییان بۆ دەربخەنو پێیان بڵێن: دە ئێوەش وەكوو ئەو خەڵكە هۆشمەندە خودا پێداوانە موسوڵمان بنو ئیمان بێنن، تووڕە دەبنو بە

شێوەیەکی گاڵتە ئامێز ﴿قَالُواْ أَنُؤْمِنُ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاء﴾ دەڵێن: ئێمە چۆن موسوڵمان دەبین و دەچینە ریزی ئەو بێ عەقڵ و نەفامانەوە؟! چۆن ئێمە شتی وا دەکەین؟! ئیتر پەروەردگار لە جیاتی موسوڵمانان وەڵامی دایەوەو فەرمووی: ﴿أَلا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاء﴾ ئاگادار بن و بزانن، بێگومان هەر ئەوان بێ عەقڵ و کورت بین و نەفامن، ﴿وَلَكِن لاَّ يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام بێ عەقڵ و گەوجیەتییەکەیان لەوە دایە کە بە خۆیان نازانن و هەست بە گومڕایی خۆیان ناکەن!!

## رەوشتی دووڕووەکان

﴿ وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَىٰ شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ (١٤) اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ (١٥) أُولَٰئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الضَّلَالَةَ بِالْهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَارَتُهُمْ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ (١٦) ﴾

رەوشتێکی ناشیرین تریان هەیە کە لووت بەرزی و خۆ بە زل زانین و خود پەسەندییە بەسەر ئادەمیزاددا بەگشتی، بۆ ئەوەی پلەو پایەی کرچ و کاڵ بۆ خۆیان پەیدا بکەن و لە پێش چاوی خەڵکی خۆیان بە هەڵبژێراو پیشان بدەن.

بێگومان لە هیچ چاخ و سەردەمێکدا وەکوو ئەم سەردەمەی ئێمە – کە کۆتایی چەرخی بیستەمە – دووڕوو خۆ بە زل زان پەیدا نەبووە، ئەوەتا دەبینن ملهوڕانی دووڕوو گاڵتە بە موسوڵمانان دەکەن، بە بێ عەقڵ و نەفام و کۆنە پەرست و بیر تەسک و

مێشك وشك ناویان دەبەنو لە هەموو کەس زیاتر بێ ڕێزییان لەگەڵدا دەکەن، لە کۆڕو کۆبوونەوە تایبەتییەکاندا بە تانووت لێدانو بە خراپە باس کردنی ئەوان کات بەسەر دەبەن ﴿إِذَا لَقُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ قَالُواْ آمَنَّا﴾ دوو ڕووییەکەیان لەوەدایە: کاتێ دەگەن بە موسوڵمانان – لەبەر ناچاریو بەدرۆ دەڵێن: ئێمە موسوڵمانین هاوبەشی خۆشیو ناخۆشیتانین ﴿وَإِذَا خَلَوْاْ إِلَى شَيَاطِينِهِمْ﴾ بەڵام کاتێ لەگەڵ هەوادارو مامۆستا شەیتان ئاساکانییاندا کۆدەبنەوەو سەر دەکەن بە یەکا ﴿قَالُواْ: إِنَّا مَعَكُمْ﴾ دەڵێن: ئێمە بە دڵ لەگەڵ ئێوەینو هەر لەسەر بیرو باوەڕی ئێوەینو هەر هەڵوێستی ئێوەمان هەیە، کە تێکەڵاویو هامشۆی موسوڵمانەکان دەکەین، ئەوە بۆ کات بەسەر بردنە، بۆیە دەچینە ناویانەوە بۆ ئەوەی ڕیزەکانیان تێك دەین، چی نهێنیو پیلانو نەخشەیان هەیە دژی ئێمە لێیان بدزینو پوچەڵی بکەینەوە ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِؤُونَ﴾ ئیشی ئێمە دەرحەق بەوان هەر گاڵتە کردنە پێیانو هیچی تر!!

بێگومان لە هیچ کاتێکدا وەکوو ئەم سەردەمەی ئێمە کە کۆتایی چەرخی بیستەمە ئەم جۆرە گرۆهانە پەیدا نەبوون! چونکە بۆ ئەم مەبەستە لە هەموو شوێنێك داموو دەزگای کوفرو ئیلحادو کۆڕو کۆمەڵی ماسۆنیو حیزبو ڕێکخراوی عیلمانیو خوانەناسیو دەزگای خیانەتکارو جەمعیاتی بێ دینو کۆمەڵو گرۆهی بێ ویژدانو دژ بە ئیسلامو گومڕاکار دەبینین، زۆر لە ڕۆڵەکانی موسوڵمانان بە ڕواڵەت خۆیان بە موسوڵمان دەزانن و تەسکەرەکەیان لێی نووسراوە موسوڵمانە بەڵام تێکۆشانو هەوڵو تەقەلایان بۆ بەرژەوەندی ئەو داموو دەزگایانەیەو هەمیشە بۆ رووخاندنی ئیسلامو لاوازبوونی بیروباوەڕی موسوڵمانان تێ دەکۆشن. بەڵام با دڵنیابین کە خوا گەورەیەو ئاگاداری کاروباریانە هەر ئەویش چاودێری موسوڵمانانەو بەرگریان لێ دەکاو تۆڵە لەو زۆڵە موسوڵمانانە دەستێنێ ﴿اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ ئەمە دڵنیاکردنە بۆ موسوڵمانانو هەڕەشە کردنە لەو دووڕووانە. واتە: پەروەردگار بۆخۆی سزای ئەو گاڵتە کردنەیان دەداتەوە، تۆڵەی ئەم فرتو فێڵەو دووڕوویییەیان لێ دەکاتەوە، بەڵام جارێ جڵەویان بۆ شل دەکاو نیعمەتو بەخششیان بۆ زیاد دەکا، بۆ

ئەوەی زیاتر لە گومڕاییو سەرلێ شێواوی خۆیاندا نقووم ببنو بە تەواوی چاوی دڵو چاوی سەریان کوێر ببێو هیچ شتێك بەڕاستی نەبینن! بەڕاستی ئەمانە چارە ڕەشنو دواڕۆژێکی سامناك چاوەڕوانیانە ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ اشْتَرُوُاْ الضَّلاَلَةَ بِالْهُدَى فَمَا رَبِحَت تِّجَارَتُهُمْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ﴾ ئەو دوو ڕووانە لە جیاتی ئەوەی ڕێبازی هەقو ڕاستی هەڵبژێرن ڕێبازی گومڕاییو سەر لێ شێوانیان پەسەند کردووە، واتە: بیرو باوەڕی هەقیان گۆڕیوەتەوە بە گومڕاییەك کە کافرییە! جا یەکسانە کەسێك موسوڵمان بووبێو هەڵگەڕابێتەوە، یان هەر لە سەرەتادا لەجیاتی نووری ئیمان تاریکایی کوفری هەڵبژاردبێ! بێگومان لەم سەودایەدا قازانجیان نەکردووەو کردەوەکەیان شارەزاییو هۆشمەندی تێدا بەکار نەهاتووە.

قەتادە، فەرموویەتی: سوێندم بە خوا لێم ڕوونو ئاشکرایە کە ئەمانە لە ناو نووری ئیمانەوە چونەتە ناو تاریکایی کوفرو گومڕایی، یەکێتیو برایەتییان گۆڕیوەتەوە بە پەرتەوازە بوون، ئاسایشو کامەرانییان گۆڕیوەتەوە بە ترسو لەرزو سوننەت بە بیدعەت: دەی ئەوانە چیان دەست دەکەوێ لە کارو بارو کاڵای دونیایی با دەستیان بکەوێ، ئەوان هەر خەسارەت مەندن!!.

ئەمجارە دوای ئەم ڕوونکردنەوەیە دەربارەی چۆنیەتی دووڕووەکان دوای ئەوەی پەروەردگار چەند نمونەیەکی لە گوفتارو هەڵوێستیان هێنایەوە، بە جۆرێك پێناسەی کردن کە بتوانین بیان ناسین، دوو سەر گورشتەی پەند ئامێزیان بۆ دیاری دەکاو تیشك دەخاتە سەر هەڵسو کەوتیان بە جۆرێك دەتوانین بە تەواوی چۆنیەتی دووڕووەکان بزانینو شێوەو ڕوخساریان بناسین سەر گورشتەی یەکەم بۆ کۆمەڵێك لەو دووڕووانەی کە لەوەپێش موسوڵمان بوونو هەڵگەڕاونەتەوەو بوونە دووڕووی تەواو.

سەر گورشتەی دووەم بۆ ئەو دووڕووانەی کە هێشتا دوو دڵنو دڵە ڕاوکێیانە.. کۆمەڵی یەکەم گومڕا بوونو تازە هیوای گەڕانەوەیان بۆ ژێر نووری ئیمان بڕاوە، بەڵام کۆمەڵی دووەم هێشتا هیوا بڕاو نەبوون.

هەندێ راڤەکەرانی قورئان (مفسرین) پێیان وایە هەردوو سەر گورشتەکە بۆ یەك کۆمەڵی دووڕوون، بەڵام هەڵەیە.

## چەند نموونەیەکی دووڕووەکان

﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ ﴿١٧﴾ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿١٨﴾ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ۚ وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ ۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا۟ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾﴾

﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً فَلَمَّا أَضَاءتْ مَا حَوْلَهُ﴾ حاڵو سەر گورشتەی ئەم دووڕووانە لەوەدا کە لەحیاتی نووری ئیمان گومڕاییان کڕیوە، لە دوای ڕاست بینیو حەق زانینیشیان خۆیان کوێر کردووە، وەکوو سەر گورشتەی کەسێك وایە کە لە شەوە زەنگێکی تاریکدا ئاگرێك بکاتەوە جا کە ئاگرەکە بڵێسەی بەرز دەبێتەوەو ڕووناکی دەدا بە دەوروبەرو لە هەر چوار لای خۆی شت دەبینێ لە ناکاوێك ئاگرەکە بکوژێتەوەو کابرا بکەوێتە ناو شەوە زەنگەوەو هیچ شتێك لەم لاو لەولای خۆی

نەبینێ‌و بە هیچ لایەكدا نەتوانێ هەنگاو بنێ، لەگەڵ ئەوەشا كەڕ بێ‌و هیچ نەبیسێ لاڵ بێ‌و قسەی بۆ نەكرێ. كوێرو كوتر بێ بە جۆرێك كە ڕووناكیش هەبێ هیچ نەبینێ، لەبەر ئەوە ناتوانێ بگەڕێتەوە سەر حاڵی پێشووی. حاڵی دووڕووەكانیش بەو جۆرەیە چونكە ئەوانیش لە باتی هیدایەت‌و نووری ئیمان گومڕایی‌و سەر لێ شێواویان هەڵبژاردو ڕێ لێ تێكچونیان لە لا باشتر بووە لە شارەزای‌و چوونە سەر ڕێگای هەق‌و ڕاستی!!

لەم لێك چواندنەدا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێ ئەم جۆرە دووڕووانە لە سەرەتادا بڕوادارو موسوڵمان بوون دوایی گومڕاو كافر بوون. ئیمامی ڕازی دەفەرموێ: تەشبیهو لێك چواندنەكە لەو پەڕی ڕاستی‌و دروستی دایە، چونكە ئەوانە بە موسوڵمان بوونیان لە سەرەتادا نوورو ڕووناكی ئیمانیان بەدەست هێناوە، دوایی بە موونافیق بوون‌و پاشگەز بوونەوەیان كەوتوونەتە ناو سەر لێ شێواویەكی گەورەوە ئاشكراشە هیچ سەر لێ شێواوییەك لە سەر لێ شێواوی لە دیندا سامناكتر نییە.

بەڵێ ﴿ذَهَبَ اللّهُ بِنُورِهِمْ﴾ پەروەردگار ئەو نووری ئیمانەی كە بە هۆیەوە هەموو شتێك وەكوو خۆی دەبیندرێ لێی كوژاندنەوەو ﴿وَتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَاتٍ﴾ لە قوڕو لیتەی گومان‌و كوفرو دووڕوویی دا دەیان هێڵێتەوە ﴿لاَّ يُبْصِرُونَ﴾ شارەزای ڕێگای ڕاست‌و حەق نابن، ڕێبازی خێرو چاكە نادۆزنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ﴿صُمٌّ﴾ كەڕو كوندن‌و قسەی خێرو بە سوود نابیستن ﴿بُكْمٌ﴾ لاڵە پەتەن‌و قسەی چاك‌و سوودبەخشیان بۆ ناكرێ ﴿عُمْيٌ﴾ كوێرو كوترن ڕێگای حەق‌و ڕاست نادۆزنەوە، چاوی دڵیشیان هەر كوێرەو لە گومڕایی دان، ﴿فَهُمْ لاَ يَرْجِعُونَ﴾ لەبەرئەوە ناتوانن بگەڕێنەوە سەر ئەو حاڵ‌و چۆنیەتەی كە لەوەپێش لەسەری بون‌و ئەو حاڵەی هەیانبوو پێش ئەوەی هیدایەت‌و نووری ئیمان بفرۆشن بە گومڕایی‌و سەر لێ شێواوی، كەوابوو تازە ناتوانن بگەڕێنەوە سەری.

خوێنەری هێژا ئەم سەر گورشتەو چۆنیەتە ئاوێنەیەکی بالاّ نومایە بۆ زۆربەی زۆری رۆڵە موسوڵمانەکانی سەردەممان، ئەوەتا ئەو رۆڵانەمان دوای ئەوەی کە رۆژگارێکی دوورو درێژیان لە خودا پەرستیدا بەسەر بردووە؛ ئێستا سەر لێ شێواونو گاڵتە بە رابردووی خۆیان دەکەن، رۆژانە تاوان لەسەر تاوان ئەنجام دەدەن، پەندەکەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەر مرۆڤێك شتەکانو رووداوەکان بە دووربینی ئیسلام نەبینێو لە روانگەی ئایینەوە سەیری نەکا دوو رووە، چونکە شتەکان بە نووری خودا نابینێ، حەقائقو چۆنیەتی شتەکانی وەکوو پێویست بۆ روون نابێتەوە. ئەمە سەرگورشتەو پەندی یەکەم بوو!! ئەمجار دوای ئەوە هاتە سەرباسی سەرگورشتەی (مەثەل)ی دووەم دەفەرموێ: ﴿أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ السَّمَاء فِيهِ ظُلُمَاتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصْابِعَهُمْ فِي آذَانِهِم مِّنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ واللّهُ مُحِيطٌ بِالْكافِرِينَ، يَكَادُ الْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَارَهُمْ كُلَّمَا أَضَاء لَهُم مَّشَوْاْ فِيهِ وَإِذَا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُواْ وَلَوْ شَاء اللّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ إِنَّ اللَّه عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾.

لەم ئایەتانەدا حاڵو چۆنیەتی جۆری دووەمی دووڕوو ناپاکان دەخاتە ڕوو دەفەرموێ: حاڵو چۆنیەتەکەیان وەکوو کەسانێك وایە: کە لە دەشتێکی کاکی بە کاکیدا لە شەوە زەنگێکی ئەنگوستە چاودا، بارانێك لێیان دابکا، بە هۆی پڕی هەورەکەو زۆری بارانەکەوە ئەوەندەی تر تاریکاییەکە زۆر تر بێ، ئەمجا ناڵەو گرمە گرمی هەورو شریخو بەرقو بریقو چەخماخەی هەورەکان ئەوەندەی تر جەوەکە سامناك بکەنو بکەونە ناو ترسو بیمێکی زۆرەوە، هیچی کەیان دەسەلاّت نەمێنێ جگە لەوە کە پەنجەیان بخەنە ناو گوێچکەیانەوەو لە ترسی مردن دوو گوێیان بهاخنن! بەلاّم کوا ئەوە چاریان دەکا؟ چۆن لەدەست دەسەلاّتی خودا رزگاریان دەبێ؟ خودا لە هەموو لایەکەوە دەورەی داوون، نزیکە بریسکەی چەخماخەی هەورەکە چاویان بەرێ، هەر کاتێ چەخماخەکە دەوروبەری بۆ رووناك کردنەوە هەنگاو هەڵدێنن کە رووناکییەکە کۆتایی دێ رادەوەستنو نازانن بۆ کوێ بڕۆن، چاوەڕێی تروسکەیەکی ترن!! خۆ ئەگەر خودا بیویستایە هێزی بیستنی گوێچکەیانو نووری

دیتنیانی لێ دەستاندنەوە کەرو کوێر دەبوونو هەستیان نەدەما، بەڵام خودا ئەومیان لەگەڵ ناکا بۆ ئەوەی زیاتر لەو ترسو بیمەدا بمێننەوە، بێگومان خودا بەسەر هەموو شتێکدا بە تواناو بە دەستەڵاتە چی بوێو چۆنی بوێ ئاوا ئەنجامی دەدا!!

لەم سەر گورشتەدا تەشبیهی ئایینی ئیسلام کراوە بە باران لەوەدا کە چۆن باران زەوی زیندوو دەکاتەوە ئایینیش دڵو دەروون زیندوو دەکاتەوە..

شكو گومانی ناو دڵی ئەم ناپاکانەش تەشبیه کراوە بە تاریکایی، هەڕەشەو ترساندنی ئایینیش شوبهێندراوە بە شریخو هوڕی هەور، ئەو تروسکاییە ئیمانەی کە لە دڵیان دایە بە رووناکی بریسکەی هەور، ئەو ترسو دڵە خورپەی کە تووشیان دەبێ، تەشبیه کراوە بە چەخماخەو کاریگەری هەورە بروسکەکە.

## فەرمان بە یەکتا پەرستیو هۆکارە داخوازیەکانی

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار لە سەرەتای سورەتەکەدا کۆمەڵە بەرپرسیارەکانی باس کردن – موسوڵمانانو کافرو دووڕوو – یەکە یەکە رەوشتو هەڵسو کەوتو چۆنیەتی روون کردنە، جارێکی تر بانگەوازی خۆی ئاراستەی کۆمەڵی نادەمیزاد بە گشتی کردووە،، بەچەند ئایەتێك بانگی کردنەوە بۆ پەرستنو بەیەك ناسینی خودا، بەڵگەی راستو دروستی بۆ هێنانەوە، لە چۆنیەتی بەڕێوەبردنو

دروستکردنی بوونەوەر؛ چەند بەڵگەیەکی بەرچاوی هێنانەوە، مژدەی دا بەوانەی کە بە پیر بانگەوازەکەیەوە دێن و ئەو خۆش بەختییەی کە بۆی ئامادە کردوون بۆی روونکردنەوە، ئەمجار هۆی سەرەکی گومڕابوونی گومڕایان و کافرو دووڕووەکانی دیاری کردو بەڵگەی لەسەر هێنانەوەو فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ ئەی گرۆهی ئادەمیزاد! خودا پەرستی خودای خۆتان بکەن، یەکتاپەرستی ئەو بکەن، مافی خودایەتی بدەنیّ و بە تەواوی گەردن کەچی ئەو بن، ئەو خودایەی ئێوەو گرۆهانی ئادەمیزادی پێش ئێوەی لە نەبوونەوە هێناوەتە روانگەی بوونەوە! بەو شێوەو روخسارە ئەندام و هۆکاری ژیانی بۆ رەخساندون بۆ ئەوەی ئێوەش لە پاداشتی ئەوەدا تەقوای بکەن و بیپەرستن و خۆتان لە سزای بە ئێشی سەرپێچی کردنی بپارێزن، چونکە ئەو شیاوی پەرستش و بەندایەتی بۆ کردنە، بەدیهێنەری خۆتان و باوك و باپیرانتانە ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً﴾ خودایەکی وەهایە زەوی بۆ ئێوە کردووە بە جێگای دانیشتن و نووستن و حەسانەوە، بە رواڵەت ئەم زەوییەی بۆ ئێوە وەك فەرش راخستووە ﴿وَالسَّمَاء بِنَاء﴾ لە ژوورتانەوە ئاسمانی کردووە بە سەر قاپێکی گەورەو هەڵاشێکی پان و پۆڕ، یان ئاسمانی کردووە بە کۆشك و باڵەخانەیەکی گەورە، واتە: وەکوو چۆن کۆشك پێك دەهێندرێ لە چەند کەرەسەیەکی جیاجیاو بەهۆی چەند شتێکەوە بەیەکەوە دەبەسترێت، ئاواش ئاسمان پێك هێنراوە لە مانگ و رۆژو ئەستێرەکانی تر.. جا هەر چەندە ئەو ئەستێرانە لێك دوورن، بەڵام بە هۆی هێزی کێشندەیەکی تایبەتی بەیەکەوە بەستراون، هیچیان لە تەوەری خۆیان لانادەن ﴿وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء﴾ لە هەورەوە بارانی باراندووەو دەیبارێنێ ﴿فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَّكُمْ﴾ بە هۆی ئەو بارانەوە لە زەوی بەروبووم و میوەی بۆ ئێوە دەرهێناوەو کردوویەتی بە بژێوی ئێوە، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوە: کە ئێوە ئەو پەروەردگارە بناسن و بیپەرستن و بە تاقە خودای بزانن! کەوابێ ﴿فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَاداً﴾ ئێوە هیچ هاوەڵ و هاوبەشێك بۆ ئەو زاتە بێچوونە دیاری مەکەن و کەس بە

هاوشانی ئەو مەزانن ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئێوە بۆ خۆتان ئەوە دەزانن: كە ئەو كەسەی دەیكەن بە هاوەڵی خودا نە هیچی پێ دروست دەكرێ وە نە دەتوانێ رزق‌و رۆزیی بەكەس بدا.

## تەحەددا كردن لە بێ بڕوایان: كە بتوانن نموونەی كورتترین سورەتی قورئان بخەنە ڕوو

﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾﴾

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار زاتی خۆی پێ ناساندن لە روانگەی دیاردەی دروستكردن‌و چاودێری كردنەوە بە جۆرێك كە تاك‌و تەنیایی خودایەتی خۆی چەسپاندو هاوبەش دانانی بۆ خودا پوچەڵ كردەوە، بەندایەتی كردن‌و پەرستشی بۆ خودا جەخت كردەوە، ئەمجار هاتە سەر بەڵگە هێنانەوەو بانگەوازی كردن بۆ چەسپاندنی راستی‌و دروستی پەیامەكەی پێغەمبەرو ئەو بەڵگانەی كە سەر ئاسای قورئان دەسەلمێنن، بە جۆرێك كە پێویستە بیكەین بە چرای رێگای ژیانمان‌و پەیرەوی فەرمانەكانی بكەین، بۆ ئەوەی رەوشتی تەقواكاری بەدەست بێنن، دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ﴾ ئەگەر ئێوە لە شك‌و گوماندان دەربارەی ئەو قورئانەی: كە بە پێی پێویست وەجبە وەجبە ناردومانەتەوە خوارێ بۆ سەر بەندەی بەڕێزمان (محمد)و پێتان وایە كتێبێكی ئاساییەو سەرئاسا نییە، دە ئێوە بتوانن بە ئەندازەی سورەتێكی وەكوو ئەو بێنن، تەنانەت ئەگەر كورتترین سورەتیش

بێ!! ئەوەتا ئێمە ئەم قورئانەمان هەر لەو پیتانە پێك هێناوە کە ئێوە ئاخاوتنی پێ دەکەن، دە ئێوەش بتوانن لەو پیتانە کورتە سورەتێکی وەکوو هی ئەم قورئانە بخەنە روو، ﴿وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللّهِ﴾ بانگی هەوادارانی خۆشتان بکەن، ئامادە بن شایەتیتان بۆ بدەن، بێگومان پەروەردگار شایەدی بۆ بەندەی خۆشەویستی خۆی داوەو جەختی لەسەر راستی بانگەوازییەکەی کردووە ﴿إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەگەر راست دەکەن‌و خاوەنی قسەی خۆتانن..

بەڵێ ئەم تەحەدایە بە سەرینی پێغەمبەرو دوای لە دونیا دەرچونیشی تا ئێستاش‌و بەڵکوو هەتا هەتایە بەردەوامەو بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر راستی‌و سەر ئاسایی قورئان!! هەتا ئێستا ئەم پەڕاوە بە ئاشکرا جیاوازی لەگەڵ ئاخاوتنی ئادەمیزاددا هەیەو هەرواش دەمێنێتەوە!! چونکە لە توانای ئادەمیزادا نەبووە نووسراوێکی ئاوا بخاتە ڕوو!! لە تواناشی دا نابێ، ئەی ئەوە نییە پەروەردگار بە راشکاوی دەفەرموێ!

﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ﴾ جا ئەگەر نەتانتوانی‌و ناشتوانن کە بە ئەندازەی کورتە سورەتێکیشی بخەنە ڕوو ﴿فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾ خۆ بپارێزن لەو ئاگرەی کە سوتەمەنیەکەی ئادەمیزادو بەردی گۆگردە: کە زوو دادەگیرسێ‌و درەنگ خامۆش دەبێ‌و بۆگەنی ناخۆشیشی لێ دێ‌و وەکوو موغناتیسیش بەجەستەوە دەنووسێ‌و لە هەموو روویەکەوە زێدە ئێش‌و ئازار دەگەیەنێ‌و ئامادە کراوە بۆ خوانەناسان‌و گومڕایان!

یان خۆتان بپارێزن لەئاگری دۆزەخ: کە سوتەمەنییەکەی ئادەمیزادەکان‌و بت‌و صەنەمەکانیانن، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَنتُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ حَصَبُ جَهَنَّمَ...﴾.

لەم ئایەتە ئەوە وەردەگیرێ کە بەهەشت‌و دۆزەخ ئێستا هەن‌و دروست کراون‌و ئامادەن.. گەرچی بڕێ لە زاناکان دەفەرموون: هێشتا دروست نەکراون.

بەڵێ ئەم تەحەدایەی قورئان بۆ عەرەبەکانی ئەو سەردەمەو بۆ هەموو مرۆڤایەتی بە گشتی لەو کاتەوەو تا ئێستاو لەمەو دواش هەتا هەتایە شتێکی سەر سوڕهێنەرەو دڵنیابوونیش لەوە کە کەس ناتوانێ بەرامبەری بکا سەرسوڕهێنەرترە! خۆ ئەگەر عەرەبەکان لە توانایاندا ببوایە ئەو تەحەدایە بە درۆ بخەنەوە هەرگیز بێ دەنگ نەدەبوون و ساتەوەختێکیش ئەم سەرشۆڕییەیان قبوڵ نەدەکرد! کە وابوو چەسپاندنی قورئان بەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَن تَفْعَلُواْ﴾ ناتوانن نموونەی سورەتێکی ئەم قورئانە بێنن، تەحەددایەکی زەق و ئاشکرایەو لە سەرچاوەیەکی خاوەن دەستەڵاتی رەهاوە ئاراستە کراوە، رۆژگاریش چەسپاندی کە ناتوانن! ئا ئەمە بۆخۆی گەورەترین موعجیزەی قورئانەو بەهێزترین بەڵگەیە کە قورئان ئاخاوتنی پەروەردگارەو شاکاری دەستی قودرەتەو لە توانای ئادەمیزاد بەدەرە.[١٩]

## پاداشتی خاوەن باوەڕی کردار باش

﴿ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا ۙ قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا ۖ وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار لەو ئایەتانەی پێشوودا رێبازی خودا پەرستی روون کردەوەو بەڵگەی لەسەر پێویستی ئەو خودا پەرستییە هێنایەوەو ئەوەشی

[19] - هەر کەسێ دەیەوێ زیاتر لەم بارەیەوە قووڵ ببێتەوە با سەیری پوختەی ئایینی ئیسلام بکا لە باسی (قورئان داوای بەرامبەری دەکا...) هتد.

چەسپاند، کە ئەم قورئانە کەلامی پەروەردگارەو شاکاری زاتی بێچونەو دیاری خۆیەتی بۆ مرۆڤایەتی، هەڕەشەی ترسناکیشی لە خوانەناسان کردو ترساندنی لە ئاگری دۆزەخ، وەك ئەوە، بڵێی ئادەمیزاد هیچ بیانوێکی بۆ نەمایەوە کە بڕوا نەکاو ئیمان نەهێنێ‌و کردەوەی باش ئەنجام نەدا، بۆیە پەروەردگار رووی خطاب دەکاتە پێغەمبەرو (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی پێ دەکا کە مزگێنی بدا بە بڕواران‌و کردارچاکان‌و دەفەرموێ: ﴿وَبَشِّرِ الَّذِين آمَنُواْ﴾ مزگێنی بدە بەو کەسانەی بڕوایان بە شتە پەنامەکیەکان (غەیبییەکان) هەیە، بڕوایان بەو قورئانە هێناوە کە بۆ (محمد) نێردراوەتە خوارێ‌و هەروا ئەو نامە ئاسمانیانەی کە لەوەپێش بۆ پێغەمبەرەکانی تر نێردراون‌و بڕوایان بە ڕۆژی دوای هەیە، ﴿وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ﴾ وێڕای ئەوەش کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن لە نوێژ کردن‌و ماڵ بەخشین سستی ناکەن‌و بە گوێرەی قورئان‌و حەدیث ئەرکەکانی خۆیان جێ بەجێ دەکەن..

عەطف‌و بەسەر داهاتنەوەی کردەوەی چاك بۆ سەر ئیمان هێنان بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە ئیمان‌و کردەوەی چاك دوو شتن‌و لێك جیاوازن..

ئەی پێغەمبەر! مزگێنیان بدەرێ کە ﴿أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ﴾ هەیە بۆ ئەوان چەند باخ‌و باخاتێك کە لق‌و پۆپی دارەکانیان تێك چڕژاوە ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ بە ژێر دارستانی پڕی ناویاندا جۆگەو جۆباری زۆر دەکشێن.

ئیمامی مەسروق دەفەرموێ: چۆمەکانی بەهەشت دەکشێن بە بێ ئەوەی بەرزی‌و نزمی دروست بکەن!! جوانترین‌و رازاوەترین باخ‌و باخاتیش ئەوەیە دارەکانی گەڵادارو لق‌و پۆپدار بن‌و سێبەر بکەن‌و بە ژێریاندا چۆم‌و روبار بکشێن.. ئاوی رەوان نیعمەتێکی گەورەو لەززەتێکی کەم وێنەیە دارو سەوزایی هەر چەندە جوان‌و سەرنج راکێش بن بەڵام ئەگەر جۆگا ئاویان بە ژێردا نەڕۆن چاو رۆشن‌و دڵ فێنك ناکەنەوەو ئارامی بە گیان ناگەیەنن، بۆیە پەروەردگار لەتەك باخ‌و باخاتدا باسی چۆم‌و جۆگاش دەکا!

بۆیە پێش هەموو خۆشیو جوانیو رازاوەیەکی بەهەشت باسی رەوان بوونی رووبارەکانی دەکا ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقاً قَالُواْ هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ وَأُتُواْ بِهِ مُتَشَابِهاً﴾ هەر کاتێكو چەندێکیان بدرێتێ لەو میوە خۆشانە، دەڵێن: ئەمە ئەوە بوو پێش تۆزێك پێماندراو لێمان خوارد، ئەم میوەجاتە هەر ئەو میوەجاتەی دونیایە، ئاوا بەو جۆرە میوەهاتیان بۆ دێنن لە وێنەی یەکتری بەڵام تامو بۆنیان عاسمانو رێسمانە.

بە کورتی ئەم باخانەی بەهەشت میوەیان هەیە، جۆری میوەکانیان لەو میوانەی دونیایە، بەڵام تا خوا حەز دەکا بۆنو بەرامیان لە هی دونیا خۆشترە، بۆیە میوەکانی لە جۆری میوەی دونیانو جۆری تر نین، چونکە ئادەمیزاد هەموو کات حەزی لەو شتەیە کە خووی پێوە گرتووە، جا ئەگەر زێدە خۆشیەکی تێدا بینی زیاتر حەزی لێ دەکاو لەززەتی لێ دەچێژێو هۆگری دەبێ ﴿وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾ زیاد لەو نازو نیعمەتانەش ژنی پاكو تەمیزی بێ عەیبو خەوشیان هەیە لە ناو بەهەشتاو لە گەڵیان رادەبوێرن ﴿وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئەو خودا پێداوانە بە خۆیانو هاسەرەکانیانەوە لە بەهەشتدا لەژیانی هەتا هەتایی دانو هەرگیز ئەم خۆشیو خۆش رابواردنەیان کۆتای پێ نایەو نابرێتەوە...

خوێنەری هێژا! لە زۆر شوێنی قورئاندا باسی بەهەشتو خۆشیەکەیو دۆزەخو ناخۆشیەکەی دەکرێ، ئێمەی موسوڵمان دەبێ باوەڕمان پێیان هەبێ کە هەنو ئامادە کراون بەڵام لە کوێنو چۆنن؟ ئەوە خودا بۆخۆی دەزانێو بەس!

## سوودی پەند هێنانەوە لە قورئاندا بۆ ئادەمیزاد

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسۡتَحۡيِۦٓ أَن يَضۡرِبَ مَثَلٗا مَّا بَعُوضَةٗ فَمَا فَوۡقَهَاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۖ

وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًاۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًاۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾

له سەرەتای سورەتەکەوە فەرمووی: ﴿ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ﴾ ئەم قورئانە بەرزو بێ وێنەیە لە خوداوە هاتووەو هیچ شكو گومانی تێدا نییە، ئەمجار دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ﴾ ئیتر گومڕایان دەستە وەستان بوون، هیچیان بۆ نەمایەوە جگە لە ڕەخنە گرتنی بێجێ نەبێ، ڕەخنەیان لە پەند (أمثال)ە كانی قورئان دەگرتو دەیانگوت: خودا چۆن شەرم ناكا لە قورئاندا باسی جاڵجاڵۆكەو مێشوولە دەكاو دەیانخاتە ناو پەندەكانەوە؟ ئەم شتە پڕو پووچانە چین باسیان دەكا؟ دەیانگوت: خودا زۆر لەوە گەورەترە كە پەند بەو جۆرە شتانە بهێنێتەوە، ئەمانە شیاوی ئاخاوتنی ڕەوانبێژی نین: جا بۆ ڕەتكردنەوەیان فەرمووی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَحْيِي أَن يَضْرِبَ مَثَلاً مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا﴾ خودا شەرم ناكاو بەلایەوە نەنگی نییە: كە نموونەو پەند بە مێشوولەو بچوكتر لە مێشوولەش بهێنێتەوە، چونكە هەموو شتێك لەم بونەوەرەدا دروستكراوی خۆیەتی: بۆ خوا چ فیلێك دروست بكا، وە چ مێشوولەیێ دروست بكا چون یەكە، هیچیان لە هیچیان گرانتر نییە، ئەو كارسازیو موعجیزەیەی لە دروست كردنی فیلدا هەیە لە دروست كردنی مێشو مێشوولەشدا هەیە.. ئەمجارە مەبەست لەم پەند هێنانەوەیە تێگەیاندنی مەردومەو نزیك

خستنەوەی مانای شتەکانە لە زەینیان، روون کردنەوەی شتی نادیار لە چوارچێوەی شتی بینراودا ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ ئەوانەی بڕوادارن‌و خوا پەرستن ئەم پەند هێنانەوەیان بەلاوە راست‌و حەقە، بڕوایان قایم دەبیٚ‌و دەزانن: کە ئەم پەند هێنانەوەیە لە لایەن پەروەردگاریانەوەیەو ئەویش قەت کارو گوفتاری نا بەجیٚ ناکا ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَـذَا مَثَلاً﴾ بەلاّم ئەوانەی کافرو خوانەناسن دەڵێن ئەوە خوا چ مەبەستێکی لەم پەند هێنانەوە هەیە؟ کەی ئەم شتانە شایستەی باسکردنن؟ ئەمجار خودا وەڵامیان دەداتەوەو بەشێوەی هەڕەشە پێیان دەفەرموێ: ﴿يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً﴾ بەلاّم پەند هێنانەوە زۆر کەس گومڕا دەکات‌و سەریان لیٚ تێك دەدا ﴿وَيَهْدِي بِهِ كَثِيراً﴾ زۆر کەسی تریشی پیٚ دەخاتە سەر رێبازی راست‌و خواپەرستی، واتە: خودا زۆر جار بەندەکانی خۆی تاقی دەکاتەوە بە خۆشی‌و ناخۆشی، جا ئادەمیزادی وا هەیە کە خودا تووشی خۆشیەکی دەکا لە خۆی ناگۆڕیٚ‌و زیاتریش ستایش‌و سوپاس گوزاری خودا دەکات، ئەرکی سەر شانی خۆی بەرامبەر بە خوداو بەندەکانی بە رێك‌و پێکی ئەنجام دەدا، ئی واش هەیە خۆی لە خۆی دەگۆڕیٚ‌و یاخی دەبیٚ‌و هەر کەتۆزێك باری ئابووری، یان تەندروستی بەرەو پێش چوو، ئیتر شا بە سەپانی خۆی نازانیٚ‌و لە خودا هەڵدەگەڕێتەوە، یان بە پێچەوانەوە ئادەمیزادی وا هەیە کە تووشی بەلاّو موسیبەتێك دیٚ خۆراگرو بە سەبرو تەحەمول دەبیٚ، ناشکوری ناکا، پێی وایە ئەوە تاقیکردنەوەیەو پلەی بەهەشتی پیٚ زیاد دەکا، هی واش هەیە کە تووشی ناخۆشییەك دەبیٚ ئیتر دونیای لەبەر چاو تاریك دەبیٚ‌و دەست دەکا بە ناشکوری کردن‌و دادو فیغان، هەر بەو جۆرەش ئەو پەندانە دەبنە هۆی تاقیکردنەوە، ئەوی موسوڵمان‌و خواناس بیٚ، زیاتر دڵنیا دەبیٚ، ئەوانەی گومڕاو بیٚ باوەڕیش بن ئەوەندەی تر گومڕا دەبن ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلاَّ الْفَاسِقِينَ﴾ هەر کافرو خوا نەناس بەم پەندانە گومڕاو سەر لیٚ شێواو دەبن!

وشەی فاسق لە زاراوەی شەرعدا بەکەسێك دەگوتریٚ تاوانێکی گەورەی کردبیٚ یان بەردەوام بیٚ لەسەر گوناهی بچوك، بەلاّم لە قورئاندا ئەگەر لە زنجیرەی کافرو دوو

رووداو هات ئەوە مەبەست کافرە، ئەگەر لە گەوەندی باسکردنی موسوڵماناندا باسی هات ئەوە مەبەست دوو ڕوومەکانە، بۆ موسوڵمانی خەتاباریش بەکاردەهێنرێ چونکە زۆر جار ئەو هەڕەشانەی کە ئاراستەی کافرو دوو ڕوومەکان دەکرێ ئەو موسوڵمانە تاوانبارانەش دەگرێتەوە کە هاوکاری کافرو خوا نەناسەکان دەکەن.

ئەمجار پەروەردگار ڕەوشتی ئەو چارە ڕەشانەی کە شایانی گومڕابوونن بەم فەرموودەیە روون کردەوە: کە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ اللَّـهِ مِن بَعْدِ مِيثَاقِهِ﴾ ئەوانەی کە لەگەڵ خودا پەیمان دەبەستن‌و بە سوێندو بەڵێنیش قایمتری دەکەن، کەچی لەدوایی دا هەڵی دەوەشێننەوە، دوای ئەوەی کە جەختیان لەسەر کردەوەو خۆیان پابەندی بوون....

### پەیمانی خودا لەگەڵ ئادەمیزاد لەچەند نموونەیەکدا خۆی دەنوێنێ:

یەکەم: ئەو پەیمانە سروشتییەی کە لەناخی هەموو ئینسانێکدا هەیە.

دووەم: ئەو پەیمانەی کە خودا لە ئادەمی وەرگرت دەربارەی ئاوەدانکردنەوەی زەوی کە دەفەرموێ: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾.

سێیەم: ئەو بەڵێن‌و پەیمانانەی کە پێغەمبەران لە گەلەکانیان وەرگرتووە: کە بەندایەتی خودا بکەن‌و بەرنامەکەی خودا بکەنە یاسای کارپێکراوی خۆیان لەژیاندا... هتد.

ئاشکراشە کەسێك پەیمانی بەستراوو مەحکەم کراو هەڵوەشێنێتەوە، هەموو پەیمانێك هەڵدەوەشێنێتەوە، کەسێك پەیمانی خودا پێشێل بکا ڕێزی هیچ پەمانێکی تر ناگرێ ﴿وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَن يُوصَلَ﴾ ئەو پەیوەندیانە دەپچڕێنن کە خودا فەرمانی کردووە بە قایم کردنیان: وەکوو پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی پەیوەندی نێوان موسڵمانان، پەیوەندی لەگەڵ پێغەمبەراندا جا هەرکاتێ ئەو پەیوەندییە کە خودا فەرمانی کردووە: کە پتەو بکرێ بیپچڕێنن، ئیتر هەموو پەیوەندییەکی

كۆمەڵایـەتیو ئـایینی دەپـچڕێنو پـشێوی لەسـەر زەوی بـەرپا دەبـێو ئاشـووب دونیا دادەگـرێ ﴿وَيُفْسِدُونَ فِـي الأَرْضِ﴾ ئاشـووبو پـشێوی لەسـەر زەوی بـەرپا دەكـەن بـەدیارترین دیـاردەی بـێ دینـی، بـۆ ئەنجامـدانی تـاوان داوێـن پیـسیو ژێوانـكردنـەوەی ئادەمیزادەكانە لەبیرو بـاوەڕی خوداپەرسـتی ﴿أُولَئِـكَ هُـمُ الْخَاسِـرُونَ﴾ بەڕاسـتی ئـەو چارەڕەشـانە خەسـارەتمەندن، چـونكە لـەجیاتی پاپەنـد بـوون بـە پەیمانەكانـەوە هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەكانیان كردووە بەپیشەی خویان، لـەجیاتی بەسـەر كردنـەوەی خزمو پەیوەندی كردنی خزمایەتی، خزمایەتی تێك دەدەنو لەجیاتی نێوان ڕێكخستن ئاشووب دەگێڕن، لەباتی پاداشتی باش سزای كوشندەیان بەدەست هێناوە.

## دیاردەكانی دەسەڵاتی خودا لە دروستكردنی ئادەمیزادو بەدیهێنانی زەویو ئاسماندا

﴿ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾ هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار باسی ڕەوشتی دووڕووەكانی كردو هەڵوێستی كافرەكانی بەرامبەر قورئـان دیـاری كـرد، ئـەمجار لـەم دوو ئایەتـەدا خیطـاب ئاڕاسـتەی كافرەكـان دەكاو سەرزەنشتی هەڵوێستو ڕەوشتیان دەكا، دیـاردەی خودایـەتی خـۆی دیـاری دەكـاو دەفەرموێ:

﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتاً فَأَحْيَاكُمْ﴾ ئێوە چۆن بڕوا بە خودا ناهێنن‌و بەكافری دەمێننەوە؟! لە كاتێكا ئێوە لەسەرەتادا گشت پارچەیەكی جەستەتان لەناو گڵ‌و ئاوو توخم‌و عونسورەكانی تری بونەوەردا بووە، هیچ بونێكتان نەبووەو گیانتان نەبووە، خودا لە نەبوونەوە هێناونیە گۆڕەپانی ژیانەوە! مەبەستی ئەو كاتەیە كە مرۆڤ گڵە، چونكە تۆم لە خواردەمەنییەوە دروست دەبێ، خواردەمەنیش لە ئاوو گڵ پەیدا دەبێ! ژیانی یەكەم بریتییە لەو ژیانەی: كە لەناو رەحمی دایكەوە دەست پێ دەكا، تا ڕۆژی مردن ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ﴾ دوای كە ئەجەلتان هات دەتان مرێنێ ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ ئەمجا ڕۆژی قیامەت زیندووتان دەكاتەوە، بۆ لێكۆڵینەوەو حەق‌و حساب ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ ئەمجار راپێچ دەكرێن بۆ سزا، یان مانای ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ بەم جۆرەیە: ئەمجار لەپاش مردن لە گۆڕا زیندووتان دەكاتەوە، دوایی بۆ حیساب‌و بۆ لێكۆڵینەوەو سزادان، بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە: واتە: بەڕاستی زۆر سەیرە لەگەڵ هەبوونی ئەم روداوو چۆنیەتییەدا: كە هەموویان دەبوایە ببنە هۆكاری شوكرو سوپاسگوزاری‌و خوداپەرستن نەك ببنە هۆی كوفرو پشت هەڵكردن‌و بێ ئاگایی لە خوداو حاڵ‌و چۆنیەتی دروستبوون‌و پاشەڕۆژی خۆتان ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً﴾ پەروەردگار خودایەكی وایە، چی لە زەویدا هەیە بە بەروبووم‌و ئاو هەواو ئاژەڵ‌و پەلەوەرو گەنج‌و جەواهێراتەوە هەمووی بۆ بەرژەوەندی ئێوەی ئادەمیزاد دروست كردووە، بۆ ئەوەی سوودی لێ ببینن‌و بۆ بەرژەوەندی خۆتان بەكاریان بهێنن‌و شوكرو سوپاسی خودای لەسەر بكەن!! ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە هەموو شتێكی سەر زەوی كە بشێ سوودی لێ ببیندرێ لەبناغەدا شیاوو حەڵاڵە مەگەر بەڵگەیەكی بڕوا پێ كراو نەیی لێ بكاو.. بۆیە زانایانی ئوسوڵی فیقە قاعیدەیەكیان داناوە دەڵێن: (الأصل في الأشياء الإباحة مالم يأت دليل بخلافه) لە بنەڕەتدا هەموو شتێ حەڵاڵ‌و دروستە مەگەر بەڵگەیێ هەبێ لەسەر پێچەوانەكەی ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ﴾ ئەمجار ویستی قەبارە بەرزاییەكان، دروست بكا،

ئیتر ڕێك‌وپێكی كردن‌و كردنی بە حەوت ئاسمان ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ پەروەردگار زاناو ئاگادارە بە هەموو ئەو شتانەی كە لە ئاسمان‌و زەویدا دروستی كردوون!

ئاسمان واتە: بەرزایی جاری وا هەیە بۆ بەرزایی رووت بەكار دەهێنرێت، جاری وایش هەیە بۆ بەرزایی نزیك بەكار دەهێنرێ، جا وشەی ﴿السَّمَاء﴾ لە ئایەتەكەدا لەجاری یەكەمدا بۆ بەرزایی رووت بەكار هێندراوە، لەجاری دووەمدا بۆ حەوت ئاسمانە تایبەتیەكە بەكارهێندراوە..، ئەمجارە لێرەدا بەپێویستی دەزانین كە بڕێ بۆچوونی زانایانی سروشتناسی بخەینە ڕوو، بە مەزەندەی زانایانی سروشتناسی تەمەنی ئەو كاكەشانە ئەو تەوەرەیەی كە كۆمەڵەی ڕۆژیی (المجموعة الشمسية) بەشێكە لەو، نزیكەی دە ملیار ساڵە، لە هەمان كاتدا مەزەندەی تەمەنی زەوی‌و خۆریان كردووە بە چوار ملیارو پێنج ملیۆن ساڵ، كە وابێ تەمەنی زەوی زۆر لە تەمەنی كاكەشانەكان كەمترە، كە وابوو ئاسمان لە زەوی كۆنترە!! لەئاكامی ئەم بەراوردیەوە بڕێ لێكۆڵەرەوە كەوتوونە سەر سوڕمانەوە، چونكە قورئان ئەوە دەگەیەنێ كە ئاسمانەكان دوای دروست كردنی زەوی دروستكراون؟؟ هۆی سەر سوڕمانەكەش لەوەوەیە: كە ئەو لێكۆڵەرەوانە فەرقی ئاسمان بە مانای گشتی‌و ئاسمان بە مانا حەوت ئاسمانە تایبەتیەكەیان نەكردووە، نەهاتوون لە ئایەتەكانی قورئان كە تایبەتن بەم باسە ورد ببنەوە، ئەوەتا قورئان بەئاشكرا ئەوە دەچەسپێنێ: كە حەوت ئاسمانە تایبەتەكە دوای دروستكردنی زەوی ڕێك‌وپێك كراون‌و دروست كراون، هەر قورئان ئەوە دەچەسپێنێ كە زەوی دوای ئاسمان — بە ماناگشتیەكەی — دروست كراوە.

هەندێكی تر پێیان وایە: كە مەبەست لە (سبع سموات) مەجەرەكانن، یان حەوت ئەستێرە گەڕۆكەكانن: ئەمەش لە دوولاوە خستونیە هەڵەوە، جا بۆ ڕوونكردنەوەو راست كردنەوەی ئەم هەڵەیە دەڵێین: وشەی (سماء) لە قورئاندا بۆ زیاتر لە مانایەك بەكار دەهێندرێ، جاری وا هەیە، مەبەست پێی بەرزایی (مطلق)ە ئیتر هەواو ئەستێرەكان‌و ئاسمانەكان‌و تەوەرە كاكەشانەكان دەگرێتەوە، جاری وا هەیە مەبەست پێی حەوت ئاسمانە تایبەتیەكانە كە جێگای فریشتەكانەو گیانی موسوڵمانان بۆیان

بەرز دەبێتەوەو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە شەوی میعراجدا بۆیان چووەو پێیاندا گەڕاوە، کە لە ئاسمانی حەوتەمیندا بەهەشت هەیەو سەرووەکەی عەرشی خودایە.

ئیتر جیاوازی نەخستن لە نێوان مانای ئیصطلاحی کە مەبەست حەوت ئاسمانە تایبەتیەکەیەو مانا لوغەوییەکە کەمانای بەرزایی رووت دەگەیەنێ، دەبێتە هۆی هەڵخلیسکان لە تێگەیشتن لە قورئانو مانای (سبع سموات).. لەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ﴾ حەوت ئاسمانە تایبەتیەکە دەگەیەنێ، ئەو حەوت ئاسمانانەی کە پێویستە بڕوامان بە هەبوونیان هەبێ، بڕوا نەبوون بە بوونیان کوفرو بێ باوەڕییە! دەمێنێتەوە ئەوە ئاخۆ ئەم ئاسمانانە پەنامەکیو نهێنین یان نا؟ یان لە ژوور مەجەڕەکانەوەن یان نا؟ ئەمانە هەموویان بۆچوونن لە مانای ئایەتەکانو ڕای زانایان وەردەگیرێتو بڕوا هەبوون بەو چۆنیەتە یان ئەم چۆنیەتە چ زیانێکی بۆ بیروباوەڕ نییە، بەڵام لێرەدا وردە باسێك ماوەو دێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە ظاهیری مانای ئایەتەکەی ئێرەو ئەو ئایەتانەی کەلە سورەتی (فصلت)دا لەم بارەیەوە هەن جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە حەوت ئاسمانەکان دوای دروست کردنی زەوی دروست کراون، کەچی پەروەردگار لە سورەتی ﴿النازعات﴾دا دەفەرموێ: ﴿أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاء بَنَاهَا، رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا، وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا، وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا﴾ ئەوەتا لێرەدا قورئان ئەوە دەگەیەنێ کە پەروەردگار دوای دروست کردنی ئاسمان، زەوی بڵاوکردۆتەوەو پانی کردۆتەوە، بۆ یەکالاکردنەوەی ئەم باسە دەبێ بگوترێ: کە حەوت ئاسمانە تایبەتەکە کە باسمان کردن دوای زەوی دروست کراون، ئەوەی کە پاڵپشتی ئەم بۆچوونە دەکا ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَق السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاء﴾ ئیمامی ئالووسی لە جلدی یەکەم لاپەڕە (٢١٧)دا دەفەرموێ: ئەوەی لە نووسینی نووسەرە موسوڵمانەکان وەردەگیرێ ئەوەیە کە

ئاسمان بەگشتی پێش زەوی دروست کراوە، ئەمجار زەوی دروست کراوە، دوای دروست کردنی زەوی حەوت ئاسمانە تایبەتیەکەی دروست کردون، ئەمجار شتەکانی سەر زەوی وەك كانو رووەكو ئەمجار عالەمی ئاژەڵو ئەمجار عالەمی ئادەمیزادی هێناوەتە وجوود. بەهەر حاڵ ئەم بۆچوونەی ئالووسی لە هەندێ لاوە پێویستی بە بەڵگە هەیە، بەڵام لەگەڵ کاکڵەی قورئانەکەدا گونجاوە، وەڵێ پێویستە ئەوە بزانین کە قورئان ئەوەی چەسپاندووە، کە دروست کردنی مەجەڕاتەکان پێش دروستکردنی زەوی بووە..

## جێنشین کردنی ئادەمیزاد لەسەر زەویو فێرکردنی زمانەکان

﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسْمَآءِ هَـٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُواْ سُبْحَـٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ

قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّيٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾.

دوای ئەوە: کە پەروەردگار ئەو ڕاستییەی بۆ روون کردینەوە کە زەوی و ئەوەی تێیدایە بۆ بەرژەوەندی ئێمەی ئادەمیزاد دروستکراوە، چیرۆکی دروست کردنی خۆمانمان بۆ دەگێڕێتەوە حەزو ئارەزوو چالاکی و توانامان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ ئەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سەر گورشتەی دروستکردنی ئادەمیزاد بۆ خەڵك باس بکە، کاتێ خودای تۆ بە فریشتەکانی راگەیاندو فەرمووی: من دەمەوێ لەسەر زەوی جێنشینێ دابنێم زەوی ئاوەدان بکەنەوە، لەجیاتی من لەناو خەڵکدا دادپەروەرانە حوکم بکا ﴿قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ فریشتەکان وتیان: خودایە: تۆ چ مەبەستێکت لە دروستکردنی ئەو جۆرە بەندانە هەیەو بۆچی کەسانێك دەخەیە سەر زەوی: کە ئاشووبی تێدا بگێڕن و خوێنرێژی تێدا بکەن؟ ئەگەر مەبەست لە دروستکردنی ئەو ئادەمیزادانە عیبادەت و پەرستنی زاتی بەرزتە، ئەوە ئێمە هەموو دەم لە یادو پەرستنی تۆداین و تۆ دەپەرستین و هەرگیزاو هەرگیز سەرپێچی کردن و ئاشووب گێڕان و خوێن رشتنمان لێ روو نادا، دەی بۆچی گرۆهی تر دروست دەکەی؟ ئیتر پەروەردگار وەڵامی ئەم پرسیارەی دانەوەو فەرمووی: ﴿إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ من دەزانم چ بەرژەوەندیەکی باڵا هەیە لە دروستکردنی ئەم جۆرە گرۆهەو ئەوە بەرژەوەندییەکی باڵاترە لەو ئاشووب و تاوانانەی کە برێکیان بەرپای دەکەن و ئێوە دەیکەن بە پاساوو لەمپەڕ بۆ ئەوەی من لەو کارە وازبێنم! چونکە لەو ئادەمیزادانە پێغەمبەران دروست دەکەم!! ئادەمی راستگۆو خوداپەرست و شەهیدو راستاڵ و دونیا نەویست و خۆشەویستان و پیاوچاکان و زاناو لە خواترس و خۆشەویستانی خوا دروست دەکەم!! ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن و سەری لێ

دەرناکەن ﴿وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاء هَـؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ پەروەردگار ناوی هەموو شتێکی بوونەوەری فێری حەزرەتی ئادەم کرد، جۆری ئەو شتانەی دروستی کردبوون هەموویانی بەئادەم ناساند، فێری کرد ئەمە: حوشترە، ئەسپە، هەورە، مانگە، خۆرە، مەحجەرمیە، دەفتەرە، قەڵەمە،.....هتد ئەمجار ئەم شتانەی هێنایە سەر شاشەی بوونەوەرو فەرمانی بە فریشتەکان کردو فەرمووی: دەی ئێوە ئەگەر راست دەکەن‌و بۆچوونەکەتان تەواوە ناوی ئەم شتانەم بۆ شی بکەنەوە ﴿قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ فریشتەکان هەموو بەیەکجار وتیان: پەروەردگارا! پاک‌و بێ عەیبی هەر بۆ تۆیە، تۆ زانای بە هەموو شتێک‌و بەرژەوەندی بوونەوەرو دوا ڕۆژی روداو لای زاتی تۆ ئاشکراو نومایانەو ئێمە جگە لەو زانیاریە کەمەی کە فێرت کردوین هیچی تر نازانین... بێگومان زاتی تۆ، زانایە بە هەموو شتێک کارەکانت هەموویان حیکمەت ئامێزن‌و هەموو شتێکت، لە جێی خۆیدایە لە بوونەوەردا، کاری بێ هوودە ئەنجام نادەیت، دەزانی چییان فێر دەکەی‌و چییان فێر ناکەی، چییان پێ دەبەخشی‌و چییان پێ نابەخشی، لەهەموو کارێکتا دادپەروەرو کارسازی.

ئەمجار بۆ ئەوەی زێدە ڕێزی حەزرەتی ئادەم لەلای فریشتەکان بەتەواوی نومایان بێ ﴿قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُمْ بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ﴾ فەرمووی: ئەی ئادەم ناوو سوودو تایبەتمەندی ئەو شتانەیان پێ بڵێ، کاتێک حەزرەتی ئادەم وەکوو پێویست زانیاریی تەواوی پێدان، ئەمجار پەروەردگار فەرمووی: من پێم نەگوتن؟ کە هەر خۆم نهێنی‌و شتە پەنامەکییەکانی ئاسمان‌و زەوی دەزانم؟! ئاگادارم بەو هەڵوێستەی دەرتان بڕی کە بریتیە لەوە گوتتان: بۆچی کەسانێک دەخەیە سەر زەوی: کە ئاشووبی تێدا بەرپا بکەن‌و خوێنی تێدا بڕێژن!! ﴿وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ﴾ هەروەها زانا بووم بەو رەخنەی کە لەناو دەروونی خۆتاندا شاردبوتانەوە، مەبەست هەڵوێستەکەی شەیتانە کە سەرپێچی کردنەکەیەتی لە فەرمانی خوداو خۆ بەزل زانین‌و لووت بەرزیەکەیەتی.

## ڕێزلێنانی پەروەردگار بۆ ئادەم

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾.

ئەمجار دوای ئەوەی کە پەروەردگار زێدە ڕێزی ئادەمی نیشانی فریشتەکان داو ئەوانیش هەستیان بە دەسەوسانی خۆیان کرد لە بەرامبەر ئادەمدا، فەرمانی پێ کردن کە ڕێزی ئادەم بگرن ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾ کاتێك بە فریشتەکانمان گوت:هەمووتان کڕنووش بۆ ئادەم بەرنو ڕێزی لێ بگرن! یەکسەر فریشتەکان هەموویان کڕنووشیان بۆ بردو سەری ڕێزو نەوازشیان بۆ خستە سەر زەوی، تەنیا شەیتان نەبێ، ئەو سەرپێچی لە فەرمانی خودا کردو خۆی بەزل زانی کڕنووشی بۆ ئادەم نەبرد، ئەو نەفرەت لێکراوە لە زانیاری خودادا لە ڕیزی کافران بوو، لە کۆمەڵی شەیاتینی بوو، یان دەڵێن: (کان) بەمانا (صار)یە واتە: بەهۆی لووت بەرزیو خۆ بەزل زانیەوە کافر بوو، هەرچەندە بە ڕواڵەت لە ناو فریشتەکاندا بوو! چونکە ئەو لە بڵێسەی ئاگر دروست کراوەو فریشتە لە رووناکی (نور) دروستکراون، شەیتان سەرپێچی کرد گوێڕایەڵی فەرمانی خودا نەبوو، فریشتەکان هیچ کاتێ سەرپێچی فەرمانی خودا ناکەنو چییان پێ بفەرموێ یەکسەر ئەنجامی دەدەن ﴿لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ یان خودا دەفەرموێ: ﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاء مِن دُونِي﴾ واتە: ئایا ئێوە شەیتانو وەچەکانی لە جیاتی من دەکەنە گەورەو پەرستراوی خۆتان؟! دەی خۆ فریشتە وەچەو نەوەیان نین، کەوابوو شەیتان لە رەچەڵەکی فریشتە نیە، دەی کە وابێ شەیتان چۆن بەر ئەو فەرمانەی خوا کەوت کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ﴾؟؟ لەوەڵاما دەڵێین شەیتان هەرچەندە لە بەرەی فریشتە نەبووە، بەڵام چونکە چووبووە ڕیزی ئەوانەوەو کرداری ئەوانی دەکردو خۆی بە یەکێك لە وان دەزانی بۆیە داخڵی فەرمانەکە بووە.

١- ماوەتـەوە ئـەوە بڵێین: کـە کڕنـووش بردنەکـە بریتـی بـووە لـەوە ناوچـەوان بخاتە سەر زەوی بۆ خودا، کڕنوش بردنەکەش بـۆ ئـادەم بـووە نـەك بـۆ خـودا، چـونکە ئەگەر بۆ خودا بوایە شەیتان سەرپێچی نەدەکرد، ئەو کڕنووش بردنە لەوە پـێش ڕەوا بووە بەڵام لە شەریعەتی ئیسلامیدا کڕنووش بۆ غەیری خودا حەرام کراوە.

٢- شەیتان بەخیلی بە ئادەم بـردو پێـی نـاخۆش بـوو: کـە خـودا ئـەو ڕێـزەی بـە ئادەم دا، وتی: من لە ئاگر دروست کراومو ئادەم لە گڵ دروست کراوە، خۆی بە بـەرزتر زانـی لـووت بـەرزی کـرد، کـە وابـوو یەکـەم تـاوان کـە کـراوە تـاوانی خـۆ بـەزلزانیو لووتبـەرزی بـووە، ئەمـەش شـایانی ئـەوە بـوو: کـە نـەفرەتی لێ بکـرێو لـە بەهەشـت دەربکرێ.

## ئادەمو حەوا لە بەهەشتداو هەڵویستی شەیتان بەرامبەریان

﴿ وَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَـٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَـٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَـٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾ قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ

هُدَایَ فَلَا خَوْفٌ عَلَیْهِمْ وَلَا هُمْ یَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِینَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔایَـٰتِنَآ أُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِیهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾﴾.

ئایەتەكان جۆرەكانی رێزلێنانی پەروەردگار بۆ ئادەمیزاد دیاری دەكەن، رێزلێنانەكەی ئێرە بریتیە لە جێنشین كردنی ئادەم‌و حەوا لە بەهەشتدا بەشێوەیەكی كاتی، چونكە حیكمەت‌و مەبەستی خودا لە دروست كردنیان لە ئاكاما ئاوەدانكردنەوەی زەوی بوو، دەرخستنی تایبەتمەندی ئادەمیزاد بوو، لەناو دروستكراوندا، رێژەی توانینی بەربەرەكانی‌و دژایەتی كردنی بۆ شەیتان‌و ئارەزووەكانی، لە گێرانەوەی ئەم چیرۆكەدا دڵنەوایی كردنی پێغەمبەری تێدایە. بۆ ئەوەی بزانێ سەرپێچی كردن بەشێكە لە سروشتی ئادەمیزاد دەفەرموێ: ﴿وَقُلْنَا یَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلاَ مِنْهَا رَغَداً حَیْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الْظَّالِمِینَ﴾ دوای ئەوەی كە بەو جۆرە رێزمان لە ئادەم گرت‌و فریشتە كڕنووشیان بۆ برد بە (ئادەم)مان گوت: تۆ بە خۆت‌و خێزانتەوە لە بەهەشتدا جێگیر بن‌و لەمیوەو بەروبوومی، لە جۆگاو جۆباری بە ئارەزووی خۆتان بخۆن‌و بخۆنەوە لەهەر كوێیەك حەزتان لێیەتی ئارامی تێدا بگرن‌و تێیدا ڕابوێرن! بەڵام نزیك ئەو دارە – دەڵێن داری ترێیە هەندێكیش دەڵێن: داری هەنجیر بووە – مەكەونەوەو لە میوەكەی مەخۆن تەنها ئەو دارەتان لێ قەدەغەیەو توخنی نەكەون!!

پەروەردگار بۆ ئادەم‌و خێزانی سنووری داناو پێی فەرموون: ئەگەر ئێوە نزیك ئەو دارە بكەونەوە دەچنە ڕیزی ستەمكارانەوە، ئاشكراشە هیچ ستەمكارییەك لەسەرپێچی كردنی فەرمانی خودا گەورەتر نیە، وشەی (الجنة) كەلە ئایەتەكەدا هاتووە ئەو بەهەشتەیە كە پەروەردگار دایناوە بۆ پاداش دانەوەی خواپەرستان...

(موعتەزیلە) پێیان وایە: كە ئەو بەهەشتە بریتی بووە لە باخاتێك لەسەر زەوی، چونكە بەهەشتی بەناوبانگ شوێنی تەكلیف نیەو كەسێكیش چووە ناوی لێی

دەرناچێ، بۆ وەڵامی ئەوە دەگوترێ: کەسێك لێی دەرناچێ کە لە ئاکامی پاداشتدا بچێتە ناوی، ئەوەتا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) شەوی میعراج چووە ناویو تێیدا گەڕاو دوایی لێیشی دەرچوو، لەلایەکی ترەوە دانیشتوانی بەهەشت لەسەریانەو موکەلەفن بە خواناسیو یەکتاپەرستی.

﴿فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا﴾ واتە: شەیتان فریوو تەفرەی دان بەهۆی ئەو دارەوە هەڵێنان بۆ هەڵەکردن، یان شەیتان لەبەهەشت دووری خستنەوە بەهۆی درۆ بۆ کردنو سوێند خواردن بۆیان کە ئەو دڵسۆزیانەو مەبەستی خۆشبەختی ئەوانە ﴿فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ﴾ شەیتان ئادەمو حەوای لەبەهەشت یان لەو خۆشیو نیعمەتو کامەرانییە دەرکردە دەرەوە. ئێستا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە وەکوو لە سورەتی (ص)دا هاتووە پەروەردگار دوای سەرپێچی کردنەکەی شەیتان پێی فەرموو: ﴿اخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ﴾ بڕۆ دەرەوە - لە بەهەشت تۆ نەفرەت لێکراویو شاربەدەر کراوی! دەی باشە چۆن توانی ئادەمو حەوا هەڵخەڵەتێنێ؟ بۆ وەڵامی ئەوە دەگوترێ: شەیتان کە بەهەشتی لێ قەدەغە کراوە لەبارەی ڕێزو تەکریمەوەیە: واتە: ناتوانێ وەکوو فریشتە بچێتە ناو بەهەشتەوە، بەڵام بەشێوەی وەسوەسەو بۆ تاقیکردنەوەی ئادەمو حەوا ڕێگای لێ نەگیراوە، بڕێ زانای ئیسلامیش پێیان وایە: کە شەیتان دەتوانێ دوراو دوریش وەسوەسە بخاتە دڵی خەڵکەوە ﴿وَقُلْنَا اهْبِطُواْ﴾ پێمان گوتن: هەستن بڕۆنە خوارێ: فەرمان پێکراو ئادەمو حەواو شەیتانە.. بڕێك پێیان وایە کە فەرمانەکە ڕوو لە ئادەمو حەوا دەکا چونکە شەیتان لەوە پێش دەرکراوە، بۆیەش ڕاناوی کۆی بەکار هێناوە مەبەست ئادەمو حەواو وەچەکانیانە، لەم بارەیەوە کە ئادەمو حەوا بناغەی ئادەمیزادنو سەرچاوەی ئەوانن ﴿بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ هەندێکتان دەبنە دوژمنی هەندێکتان... بە مانای یەکەم مەبەست ئەم چۆنیەتەیە کە هەمیشە ئادەمیزاد لەناو یەکتردا هەیانە، وەکوو دوژمنایەتیو هەڵخەڵەتاندنی یەکتری ﴿وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ﴾ بۆ ئێوە لەسەر زەوی شوێنی ئارام گرتنو

مانەوە هەیە هەتا ڕۆژی قیامەت، یان كاتی مردنتان ﴿فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ﴾ ئەمجار خودا پاڕانەوەو نزایەكی خستە دڵی ئادەمەوە، ئەویش بە دڵێكی پڕ بڕواوە، رووی كردە بارەگای پەروەردگارو وتی ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ خودای پەروەردگارمان! ئێمە ستەمو ناحەقیمان لە خودی خۆمان كردو سەرپێچی فەرمانی تۆمان كرد، ئەگەر لێمان خۆش نەبیو بەزەییت پێمانا نەیەتەوە، ئێمە لە گرۆهی چارەڕەشو زەرەرمەندانینو تێداچووین ﴿فَتَابَ عَلَيْهِ﴾ پەروەردگار نزاكەی قبوڵ كردو بەزەیی پێیانا هاتەوەو لێیان خۆش بوو ﴿إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ بێگومان خودا تۆبەی تۆبەكاران قبوڵ دەكاو خاوەنی بەزەییو رەحمەتە ﴿قُلْنَا اهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعاً﴾ بە ئادەمو حەوامان گوت: هەستن بڕۆنە خوارێ بۆ سەر زەویو دەست بكەن بە ئاوەدانكردنەوەی زەویو هەموو كاتێ چاوەڕوانو بە ئاگابن ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى﴾ هەركاتێ نیگایەك، یان پەیامێك، پێغەمبەرێك هات بۆ ناوتان گوێڕادێریان بنو بە قسەیان بكەن، چونكە ﴿فَمَن تَبِعَ هُدَايَ﴾ هەركەسێك شوێن پەیامی من بكەوێ ﴿فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ هیچ ترسی ڕۆژی دواییان لەسەر نیە ﴿وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ داخو خەفەتی ژیانی ڕابوردوشیان ناخۆن، پەرۆشی ماڵو خێزانی دوای خۆیان نیە ﴿وَالَّذِينَ كَفَرواْ وَكَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا﴾ ئەوانەی كافرو خوانەناسن پێغەمبەرانی ئێمەیان بەدرۆ خستۆتەوەو گاڵتەیان بە مەعجیزەو نیشانەی پێغەمبەرایەتیەكەیان كردووە ﴿أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ﴾ ئەوانە شایەنی ئەوەن جێگایان دۆزەخ بێو بچنە ناویەوە ﴿هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ فڕێ دەدرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوەو هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە.

## ئەرکی سەرشانی نەتەوەی ئیسرائیل

﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴿٤٠﴾ وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلۡتُ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُمۡ وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرِۭ بِهِۦۖ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗا وَإِيَّٰيَ فَٱتَّقُونِ ﴿٤١﴾ وَلَا تَلۡبِسُواْ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُواْ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٤٢﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾

ئەمجار پەروەردگاردوای ئەم ئامۆژگاریو هەڕەشەو وادە پێدانەو دیاری کردنی سەرەنجامی هەموو کردەوەیەك، چاك بێ یان خراپ، چیرۆکێکمان بۆ دەگێڕێتەوە، چیرۆکی گەلێك: کە پەیامی بۆ نێردراوە، پێغەمبەریان بۆ هاتووە، کتێبی ئاسمانییان بۆ نێردراوە، عەهدو پەیمانیان لێ وەرگیراوە، لەوەپێش بە هۆی فەرمانبەرداری پەروەردگارەوە تووشی خۆشیو هەرزانیو ئازادیو وەدەست هێنانی دەسەڵات بوون، لەهەمان کاتدا بەهۆی سەرپێچی کردنیان لە فەرمانی خودا تووشی نەهامەتیو ماڵ وێرانیو گومڕایو سەر لێ شێواوی بوون، ئەو گەلو نەتەوەیە هۆزی بەنو ئیسرائیل بوون، کە وابێ ئەرکی سەر شانی ئەو هۆزمیە: کەبە پیر بانگەوازی ئیسلامیەوە بچن، بڕوا بە حەزرەتی محەمەد بکەن، شوێن پەیامەکەی بکەون، کە دوا کتێبی ئاسمانیە، شوێن پێغەمبەری ئیسلام بکەون: کە دوا پێغەمبەری خودایە بۆسەر ئادەمیزاد، بەتایبەتی: کە لەکتێبی بڕوا پێکراوی ئەواندا ناوو نیشانو ڕەوشتی ئەم پێغەمبەرە

دیاری كراوە، بۆیە پەروەردگار لەم ئایەتانەی دوایی دا رووی خیطاب دەكاتە ئەو هۆزەو دەفەرموێ: ﴿يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُواْ نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ﴾ ئەی نەوەی یەعقوب شوكرو سوپاسی ئەو هەموو نازو نیعمەتانە بكەن: كە بە باوك‌و باپیری ئێوەمان بەخشیون، لە ژێر دەستەیی‌و كۆیلایەتی فیرعەن ڕزگارمان كردن‌و فیرعەونمان لەناو برد، لە بەردی ڕەق‌و تەق سەرچاوەمان بۆ هەڵقولاندن، لە رەحەڵەكی خۆتان پێغەمبەرمان بۆ ناردن، كتێبی تایبەتیمان بۆ ناردن ﴿وَأَوْفُواْ بِعَهْدِي﴾ ئەو عەهدو پەیمانەی پێم گوتون پابەندی بن، كە بریتیە لە شوێنكەوتنی پێغەمبەران‌و پارمەتیدانیان پابەندی بن، حەزرەتی (محمد)یش دوا پێغەمبەرەو تەورات بە ئاشكرا پێی گوتوون: هەر كاتێ ئەو پێغەمبەرە پەیدابوو، بڕوای پێ‌بكەن‌و یارمەتی بدەن‌و شوێنی بكەون، ئەگەر ئێوە ئەم كارانەی خۆتان جێ‌بەجێ كرد ﴿أُوفِ بِعَهْدِكُمْ﴾ منیش ئەو بەڵێنەی پێم داون بەجێی دێنم، كە بریتیە لەوە: لە گوناهتان خۆش ببم‌و بتانخەمە بەهەشتەوە ﴿وَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ﴾ هەر لە من بترسن جگە لە من لەكەسی تر مەترسن! زۆر بترسن لەوەی كە ئەگەر سەرپێچی بكەن وەكوو چینەكانی پێشووتان بەڵاو موسیبەتی سامناكتان بۆ دەنێرم، بێگومان سزای قیامەت زۆر بە ئازارو توندترە ﴿وَآمِنُواْ بِمَا أَنزَلْتُ مُصَدِّقاً لِّمَا مَعَكُمْ﴾ ئیمان بێنن بەو قورئانەی كەبۆ پێغەمبەرم ناردووە، پاڵپشتی كتێبە ئاسمانیەكان – تەورات‌و ئینجیل – دەكا پاڵپشتی دەقە ئەسڵیەكان دەكا پێش ئەوەی گۆڕانكاریان تێدا بكرێ ﴿وَلاَ تَكُونُواْ أَوَّلَ كَافِرٍ بِهِ﴾ ئێوە ئەی نەوەی (یعقوب)! لەگەڵ ئەو هەموو زانیارییەی كە لەم بارەوە هەتانە حەق وایە یەكەم كۆمەڵ بن كە بڕوای پێ بكەن‌و ئیمانی پێ بهێنن، نەك یەكەم تاقم‌و كۆمەڵ بن: كە دژی بوەستن‌و بە كتێبی خودای نەزانن؟ ﴿وَلاَ تَشْتَرُواْ بِآيَاتِي ثَمَناً قَلِيلاً﴾ لەجیاتی بڕوا هێنان بە نیشانەكانی خوایەتیم‌و ڕاستی ئایینی ئیسلام‌و بڕواكردن بە پێغەمبەرو پەیامەكەی، حەزو ئارەزووی دونیا هەڵ مەبژێرن، چونكە خۆشییەكانی دونیا كەم بایەخ‌و ماوە كورت‌و ئاكام فەوتاوە، هەموو دنیاو چی تێدایە لەبەرامبەر

ڕەزامەندی خودادا شتێکی زۆر کەمو کەم نرخە ﴿وَإِيَّايَ فَاتَّقُونِ﴾ بەجۆرێك لێم بترسن کە هەڵتان بنێ بۆ پابەند بوونتان بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانمو دوورکەوتنەوە لەوەی (نەهی)م لێ کردوون.

﴿وَلاَ تَلْبِسُواْ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُواْ الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ حەقو ڕاستی تێکەڵ بە بەتاڵ مەکەنو بەم ڕەنگە حەق بشارنەوەو بەتاڵ بخەنە ڕوو بیخەنە بەرگی حەقەوە، سەر لەخەڵك تێك بدەنو لەهەمان کاتیشدا خۆتان باش دەزانن؛ کە ئەو کارەی دەیکەن شاردنەوەی حەقو بەدەرخستنی بەتاڵەو سەر لێ شێواندنی خەڵکە.

قەتادە دەفەرموێ: مانای ئایەتەکە بەم جۆرەیە: ئایینی جولەکەو ئایینی مەسیحی تێکەڵاو بە ئایینی ئیسلام مەکەن، لەکاتێکدا ئێوە دەزانن: کە ئایینی پەسەند لای خودا ئایینی ئیسلامە ﴿وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ وَارْكَعُواْ مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾ نوێژی موسوڵمانانە بکەن، زەکاتی ماڵو دارایيتان بەشێوەی موسوڵمانانە بدەن بەهەژاران، بچنە ڕیزی موسوڵمانان بۆ جومعەو جەماعەت...

برێك لە زانایان ئەم ئایەتە دەکەن بە بەڵگەی واجبی نوێژی بەکۆمەڵ (جەماعەت). لەم ئایەتەدا پەروەردگار فەرمانی بەنەوەی ئیسرائیل کرد: کە سوپاسی نیعمەتی خودا بکەنو وەفا بە عەهدو پەیمانی خودا بکەن، یەکەم گرۆهبن: کە موسوڵمان دەبنو ئایینی ئیسلام بە دونیا نەگۆڕنەوە، لەخودا بترسن، تەقوای بکەن، حەق تێکەڵاوی بەتاڵ نەکەن، نوێژی موسوڵمانانە بکەنو وەك ئەوان زەکات لە ماڵو دارایی خۆتان دەرکەن، لەگەڵ موسوڵمانان نوێژی جومعەو جەماعەت ئەنجام بدەن، ئەگەر ئەمانەتان جێبەجێ کرد ئەوە دەبنە بەندەی ڕاستاڵو باش بۆ خۆشتان پێتان وایە: بانگەواز کەری ڕاستیو خودا پەرستین.

## چەند نموونەیەك دەربارەی بەدی جوولەكەكان

﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾ وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُوا۟ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾.

ئیمامی واحیدیو ثەعلەبی لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە: كە دەفەرموێ: ئەم ئایەتانە واتە ئایەتی (٤٤) تا (٤٨) دەربارەی جوولەكەكانی مەدینە هاتوونە خوارێ: كە فەرمانیان بەخەڵك دەكرد شوێن ڕێبازی پێغەمبەر بكەون بەڵام خۆیان نەیان دەكرد، بۆیە پەروەردگار دوای ئەم فەرمانو ئامۆژگارییانە جارێكی تر رووی خیطابی تێ كردنو بەشێوەیەكی سەركۆنە كردنو رەخنە لێ گرتنو سەرسوڕمان لە حاڵو هەڵوێستیان فەرمووی: ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ﴾ ئایا ئێوە ئەی گروپی جوولەكە! فەرمان بە ئادەمیزاد دەكەن خودا پەرست بنو تەقواكار بن، كار بە فەرمانەكانی قورئانو ڕێنومایییەكانی بكەن وەفا بە عەهدو پەیمانەكانیان بكەن، كەچی خۆتان لەبیر چۆتەوەو بۆ خۆتان پەیڕەوی

ئامۆژگارییەکانی خۆتان ناکەن، وەلحال ئێوە تەورات دەخوێننەوە، دەزانن هەڕەشەی توندی تێدایە بۆ ئەوانەی گفتارو کرداریان لێك جیایە،، ئەوە بۆ عاقڵ نابن و عەقڵی خۆتان ناخەنە کار؟! دەی کە ئەوان راست دەکەن، بۆ خۆیان ئیمانیان بە پێغەمبەر دەهێناو شوێن پەیامی قورئان دەکەوتن!! بەلام ئەوانە درۆزنن و ئامۆژگاری کردنەکەیان بەساختەچییەتی یەو ئەوان لە چاکەکاری دوورن، خۆ ئەگەر لە بانگەوازییەکەیاندا راستگۆ بوونایە یەکەم کەس خۆیان پابەندی بانگەوازییەکەی خۆیان دەبوون؟! ئەوانە ئامۆژگاری خەڵکی دەکەن بۆ ئیمان هێنان بە پێغەمبەرو خۆیان لەبیر چۆتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە بۆ خۆیان تەورات دەخوێننەوەو لەوێدا فەرمانیان پێ کراوە کە بڕوا بە پێغەمبەری ئیسلام بکەن و موسوڵمان ببن. تاگەی فام ناکەنەوەو عەقڵ و هۆش پەیدا ناکەن!!

قورئان کە سەرزەنشتی جوولەکەکان دەکا، لەسەر ئەوە نایکا کە فەرمان بە چاکەو نەهی لەخراپە دەکەن، ئەمە واجبێکە ئەرکی سەرشانی هەموو کەسە بیکا! بەڵکوو لەسەرئەوە سەرزەنشتیان دەکا کە فەرمان بەچاکە دەکەن و بۆ خۆیان نایکەن نەهی لەخراپە دەکەن و بۆ خۆیان دەیکەن! کەوابێ سەرزەنشتەکە لەسەر چاکە نەکردنەکەیانە...

دوای ئەوەی کە پەروەردگار فەرمانی پێ کردن و نەهی لێ کردن، سەرزەنشتی کردن، ئەمجار شارەزای کردن بۆ کردارو هەڵوێستێك ئەگەر پابەندی بن، جێبەجێ کردنی هەموو فەرمانێکی کە پێیان کراوە بۆیان ئاسان دەبێ ئەویش ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلاَّ عَلَى الْخَاشِعِينَ﴾ لەهەموو تەنگانەو پێداویستییەکانتانا، لەکاتی بەلاو موسیبەتا پەنا بەرن بۆ صەبرو خۆڕاگری و گەڕانەوە بۆلای خودا، بەڕۆژوو بن، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ((الصوم نصف الصبر)) رۆژوو نیوەی صەبرو خۆڕاگرییە، نوێژ بکەن، واتە: صەبرو نوێژ بکەن بە قەڵغان و سوپەر بۆ هەموو تەنگانەو ئاستەنگ و گیرو گرفتێك، خۆڕاگربن بۆ نارەحەتی و ئەرکی بەجێ هێنانیان. بەدڵێکی پاك و بێگەردەوە

بەنییەتێكی خاوێنو بە بەرچاو گرتنی ئەدەبو حیشمەتەوە لەگەڵ ترسان لەخوداو هەست كردن بەوە كە لەبەردەم خاوەنی ئەرزو ئاسماندا راوەستاون پێویستیاتی نوێژ بەجێ بهێنن ﴿وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلاَّ عَلَى الْخَاشِعِينَ﴾ بێگومان بەجێ هێنانی نوێژەكان لەكاتی خۆیانداو ئەنجام دانیان وەكوو پێویست كارێكی قورسو گرانە، مەگەر بۆ كەسانێك نەبێ كە لەخودا دەترسن ﴿الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلاَقُو رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ ئەوانەی كە دڵنیان لەوەی دوایی بە خودای خۆیان دەگەنو دەگەڕێنەوە بۆ بارەگای خودای پەروەردگاریان، بە بڕواو دڵنیاییەوە نوێژو رۆژوو خودا پەرستیو ئەركەكانی سەرشانیان ئەنجام دەدەن، بەڵام كەسێك بڕوای بە پاداشو سزا نەبێ، ئەنجامدانی ئەو ئەركانەی لەسەر شانی قورسو ناخۆشە، وەكوو چۆن دووڕوو ریا بازەكان بە بەجێهێنانی ئەركە ئیسلامییەكان ناڕەحەت دەبن! بۆ نمونە ئەگەر كرێكارێك، بەڵێنی پێ بدرێ كە پاش ئەنجامدانی كارەكە زێدە كرێیەك، زێدە بەخششێكی دەدرێتێ دەبینی بە لێبوردەییو چوستو چالاكی ڕو دەكاتە ئیشەكەو بە گورجی پەلاماری دەداتێو چەند كاری تێدا بكا هەست بە ماندووبوون ناكا، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر كرێكارێك بە زۆر دەرەبەگێكی ستەمكار كاری پێ بكاو بە بێگار هەڵیسوڕێنێ، دەبینی چەند ئیش كردنەكەی بەلاوە قورسە! كورد وتەنی دەڵێی بێگاری پێ دەكەن!! هەر لەم ڕوەوەیە: كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ((وجعلت قرت عيني في الصلاة)) واتە: فێنكایی چاوم لە نوێژدایە، كە دەست دەكەم بە نوێژ فێنكای بە چاومدا دێ، دڵم خۆشی پێ دەگا، (بە نوێژ چاو دڵم رۆشن دەبێتەوە).

ئەمجار پەروەردگار لەم چەند ئایەتەی دوایی دا بڕێ نیعمەتو بەخششی خۆی – كە بە نەوەی بەنو ئیسرائیلی بەخشیوە – ڕیز دەكاو وەبیریان دێنێتەوە كە كاتی خۆی زێدە ڕێزی داونێ، لە چنگی فیرعەون ڕزگاری كردوون، تەوراتی بۆ ناردوون، دوای تاوان كردنو گوێرەكە پەرستنیان تۆبەی لێ قبوڵ كردون، كاتێك كە سزای دانو مراندنیو جارێكی تر زیندووی كردنەوە، هەوری بۆ كردن بە سێبەر، گەزۆو گۆشتی بە تامی بۆ كردن بە سفرەو خوان، دەسەڵاتی پێدان، كانیاوی بۆ هەڵقوڵاندن، چییان

حەز لێ بوو بۆی حەڵاڵ كردن!! ئەمجا لەگەڵ ئەم هەموو ڕێزو نازو نیعمەتەدا هەڵوێستە خیانەتكاریەكانیان دەگێڕێتەوە، سزاو تۆڵەی خودایی كە لەسەر خراپەكاری لێیان ستێنراوە باس دەكا، باسی ئەوە دەكا كە لە ئاكامی سەرپێچی كردنەكەیان هەر ڕقو نارەزامەنـدیی خودایـان بـۆ مایـەوە. كاتـێ پـشتیان لـە ئـایینی خـودا هـەڵكردو پابەنـدی فەرمانـەكانی نـەبوون، تووشـی زەلیلـیو ژێـر دەسـتەیی بوونـەوە، لـە هـەموو لایەكەوە بەڵاو موسیبەت رووی تێ كردنەوە، دونیـای روناكیـان لێ بـوو بـە شـەوەزەنگ، ژیانیان لێ تاڵ بوو!! ئەمـەش پەنـدو ئامۆژگاریـەكی مێژووییـە، بـۆ ئێمـەی موسـوڵمان! پێویستە تەمێ خواردو ببینو وانەی خودا پەرستی لێ فێر بین، پێش هەموو شتێكیش وازهێنـان لـە شـوێن كـەوتنی ئـەو گرۆهانـەو سـڕینەوەی پێـشەوایەتیو ڕێـزداری موسوڵمانان. لە دڵو دەروونی خۆماندا.

﴿يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُواْ نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ﴾ ئەی نەوەی یعقوب! ئەمجارەش بۆتان دووبارە دەكەینەوە، شوكرو سوپاسی ئەو نـازو نیعمەتانـە بكـەن: كـە كاتی خۆی بە باوكو باپیری ئێوەمان بەخشیوە! ﴿وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ مـن بەسەر گەلو كۆڕو كۆمەڵی ڕۆژگاری خۆتاندا زێدە ڕێزم دابوونێ، پێغەمبەرم لێ ناردن، كتێبی ئاسمانیم بۆ ناردنە خوارێ، سەڵتەنەتو دەستەڵاتم پێ بەخشین!!

قورئـانی پـیرۆز، جـۆری ڕێزگرتنـەكەی یـەكالا نەكردۆتـەوە، هـەر بـە مـوطلـەقی فەرمویەتی: ئاشكراشە كە زێدە ڕێزدان پێیان یەكێكە لە نیعمەتە گەورەكانی خـودا بـۆ ئەوان، بۆیەش دوای باسی نیعمەت بە تایبـەتی زێـدە ڕێزگرتنەكەی دووبـارە كـردەوەو لەبەر گرنگی ئەو بەخششە..

عەقلیەتی جوولەكە عەقڵیـەتێكی لـەخۆ بـایی بـوونو بـەخۆ نـازینو لەتبەرزیـە بەجۆرێك ئەومیان لەلا چەسپاوەو لە دڵیاندا نەخشی بەستووە: كە گەلی جوولەكە هەر چۆنێك بنو هەرچی بكەن، چەند ئاژاوە بگێڕنو ئاشووب بەرپا بكەن، پێیان وایە گەلی هەڵبژێراوی خودان، ئەمە رەوشتێكی هەمیشەییو گشتییانە، بۆیە پـەروەردگار لەتـەك باسـكردنی ئـەم نیعمەتانـەدا لۆمـەو سەرزەنـشتیان ئاڕاسـتە دەكـا، لەسـەر لادانو

پشتهەڵكردنو لەخۆ بایی بوون، هەڕەشەیان لێ دەكا بۆ ئەوەی پێیان بسەلمێنێ كە خراپەكارنو ئەگەر واز نەهێنن لەتاوانو بە خۆیاندا نەچنەوە، نەیەنە ژێر ئاڵای ئیسلامو لەگەڵ كۆمەڵی ئیسلامدا خۆیان جۆش نەدەن، ئاوێتەی بەرنامەكەی ئیسلام نەبن، ئەوە خودا لێیان دەڕەنجێ، كەسێكیش خودای لێ ڕەنجا، لە دونیا قیامەتدا ئۆخەی لە گیانی خۆی ناكا.

دوای ئەوەی بەسەرپێیو بە كورتی باسی نیعمەتو زێدە ڕێزی گەلی ئیسرائیلی كرد، ئەمجار ڕووی خیطابی تێكردنو ڕۆژی قیامەتی بیر هێنانەوەو فەرمووی: ﴿وَاتَّقُواْ يَوْماً﴾ خۆتان بپارێزن لەسزای ڕۆژی دوایی،كە لەو ڕۆژەدا ﴿لاَّ تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْئاً﴾ كەس فریای كەس ناكەوێ ﴿وَلاَ يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَاعَةٌ﴾ هیچ كەسێكی موسوڵمان ناتوانێ شەفاعەت بۆ كەسێكی تاوانباری كافر بكا، خۆ ئەگەر بیشیكا لێی وەرناگیرێ، ئەمە ڕەوانترین ڕەتكردنەوەی بیرو بۆچوونی جولەكەكانە: كە دەیانگوت، باوكو باپیرانی ئێمە كە پێغەمبەر بوون شەفاعەتمان بۆ دەكەن، هەروەها ڕەتدانەوەی مەسیحیەكانیشە كە دەیانگوت: حەزرەتی عیسا تاوانەكانیان بۆ هەڵدەگرێ.

موعتەزیلە ئەم ئایەتەیان كردۆتە بەڵگە لەسەر نەبوونی شەفاعەت بۆ موسوڵمانانی تاوانبار، بەڵام دیارە بۆچوونەكەیان بەچەند دەقێكی تری قورئان ڕەت دەكرێتەوە، كە ڕاستەوخۆ هەبوونی شەفاعەت دەچەسپێنن، كەواتە: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی شەفاعەت بۆ كافران، نەك بۆ موسوڵمانانی گوناهبار. ﴿وَلاَ يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ﴾ ئەو كافرانە هەروەكوو شەفاعەتیان بۆ ناكرێ بەدەڵیشیان لێ وەرناگیرێ ﴿وَلاَ هُمْ يُنصَرُونَ﴾ كەس یارمەتیان ناداو كەس كۆڵیان پێوە هەڵناگرێو هەوڵیان بۆ نادەن لە سزاو ئازار ڕزگاریان بكەن.

ڕۆژی قیامەت مەراییو بەرتیلو شەفاعەت، یارمەتیدانو هاریكاری نامێننو هەموو فەرمانو فەرمانڕەواییەك بۆ خودای پەروەردگارە، دادپەروەرانە، حەقو حیسابیان لەگەڵ دەكا.

مامۆستا سەعید حەوا دەفەرموێ: وەبیرهێنانەوەی رۆژی دوایی بۆ جولەکەکان‌و چۆنیەتی حیساب لەگەڵ کردنیان‌و ریزکردنی نیعمەت‌و بەخششەکانی خودا بۆیان تێگەیاندنیانە بەوەی کە ئەوان بەرپرسیارن، لەسەر چاکەو خراپە حسابیان لەگەڵ دەکرێ، بەمەش ئەوەیان لێ داوا دەکرێ کە سوپاسی خودا بکەن نەک لەخۆیان بایی بن، طاعەتی خودا بکەن نەک لێی قاچاغ بن!! ئەرکی سەرشانیان ئەنجام بدەن نەک خۆیان لە ئەرکەکانیان بدزنەوە، لە راستیشدا وانەیەکە بۆ موسوڵمانان‌و پێویستە پەندی لێ وەربگرن‌و ئەوانیش نەکەونەوە ئەو هەڵەو تاوانانەی کە ئەوەی (یعقوب)و گەلەکانی تر تێی کەوتوون، بەداخەوە لەم رۆژگارەدا زۆر لە رۆڵەکانی گەلەکەمان کەوتوونە هەمان ئەو هەڵانەی کە جوولەکە بە درێژایی مێژوو تێی کەوتوون.

### دە نیعمەتی گرنگی پەروەردگار کە بە جوولەکەکانی بەخشیوون

﴿ وَإِذْ نَجَّيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٤٩﴾ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ فَأَنجَيْنَٰكُمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٠﴾ وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذْ

ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿٥٣﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾﴾.

دوای فەرمان پێكردن بە نەوەی یەعقوب كە نیعمەتەكانی خودا بێننەوە یادی خۆیانو بزانن: كە خودا لە كاتی خۆیدا زێدە ڕێزی داونیو پاشان فەرمانی پێكردن: كە خۆیان لەسزای رۆژی قیامەت بپارێزن، ئەمجار پەروەردگار نیعمەتەكانی خۆی یەكە یەكە بۆ ئەو گەلە ریز دەكاو هەموو نیعمەتێكی خۆی بە وشەی ﴿إِذْ﴾ دەست پێ دەكا، لە هەمووشیاندا مەبەستی سەرەكی ئەمەیە: كە موسوڵمانان ئاگاداری خۆیان بنو نەكەونە ئەو هەڵانەی كە نەوەی ئیسرائیل تێی كەوتوون.

**ئەمانەش نیعمەتەكانن:**

١- ﴿وَإِذْ نَجَّيْنَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوَءَ الْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءكُمْ وَفِي ذَلِكُم بَلاء مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾. ئەی نەوەی یەعقوب بیری ئەو نیعمەتەی من بكەنەوە، كە پێم بەخشیونو سوپاسی لەسەر بكەن، كە لە چنگی فیرعەون (پادشای میصر)و گەلەكەی رزگارم كردن، بێگومان ناشیرینترین هەڵسو كەوتیان لەگەڵ دەكردن، جۆرەها ئەشكەنجەو ئازاریان دەدان، كوڕەكانتانیان سەردەبڕیو كچەكانتانیان دەهێشتنەوە بۆ كارەكەریو خزمەتی خۆیان، بە ئەمەش ناموسو شەرەفتانیان دەشكاندو ئەوپەڕی سزاو نارەحەتییان ئاراستە دەكردن، بەژێر دەستەیو كۆیلایەتی رۆژگارتان بەسەر دەبرد.. وشەی ﴿بَلاءٍ﴾ دوو مانا هەڵدەگرێ، نیعمەت، یان نیقمەت، لێرەدا بۆ هەر دوو ماناكە گونجاوە، ئەگەر ئاماژە بێ بۆ

هەڵوێستو کرداری فیرعەون لەگەڵیاندا ئەوە مەبەست ناڕەحەتیو نیقمەتە، ئەگەر مەبەست رزگاربوونیان بێ لە چنگی فیرعەونو دارو دەستەکەی ئەوە بە مانا نیعمەتو بەخششە... زۆربەی راڤەکەرانی قورئان لەسەر ئەوەن کە وشەی ﴿بَلاءٌ﴾ لێرەدا بە مانای نیقمەتو ناخۆشیو نارەحەتیە.

٢- ﴿وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ الْبَحْرَ فَأَنْجَيْنَاكُمْ وَأَغْرَقْنَا آلَ فِرْعَوْنَ وَأَنْتُمْ تَنظُرُونَ﴾. لەم ئایەتەدا پەروەردگار ئەوە دەخاتەوە بیری نەوەی ئیسرائیل... کە چۆن دوای ئەوەی لە چنگ فیرعەونو دارو دەستەکەی رزگاری کردنو لەگەڵ حەزرەتی موسادا لە میسر دەرچوونو بەرەو فەلەستین کۆڕەویان کرد، فیرعەون بە خۆیو لەشکرەکەیەوە شوێنیان کەوت، بۆ ئەوەی قەڵاچۆیان بکاو نەهێڵێ لەژێر دەسەڵاتی ئەو دەربچن، حەزرەتی موساو نەتەوەی ئیسرائیل گەیشتنە سەر لێواری دەریاو رێگایان بەسترا! فیرعەونیش لە دواوەیان بوو رێگای دەرچوونو رزگاربوونیان بڕا، پەروەردگار نیگای بۆ حەزرەتی موسا کرد کە لە دوازدە شوێنەوە عەساکەی بە دەریادا بێنێ، ئەویش عەساکەی لە دوازدە جێگاوە بە دەریادا هێناو لە هەر دوازدە جێگاوە ئاوەکە شەق بوو، دوازدە رێگا لەناو دەریاکەدا دروست بوو، ئاوی دەریاکە لەم بەرو بەری رێگەکانەوە وەك کێو راست بۆوەو بوو بە دیوار، نەوەی ئیسرائیل کە دوازدە هۆز بوون هەر هۆزەی بە رێگایەکدا بە ناو دەریادا کەوتنەڕێ بە خۆشی پەڕینەوە، فیرعەونو دارو دەستەکەی کە دیتیان رێگای ناو دەریا بە ئاسانیو ئاسایە: یەکسەر ئەوانیش ملیان لێنا بە شوێنیاندا رۆیشتن، پاش ئەوەی پاشەتایان هاتە ناو دەریاوەو پێشەتاکەشیان هێشتا نەگەیشتبووە ئەوبەری دەریا، ئاوەکە یەك هاتەوە، فیرعەونو دارو دەستەکەی هەموویان خنکانو حەزرەتی موساو ئەوانەی لەگەڵیدا بون لەو بەرەوە سەیریان دەکردنو ئاگایان لێ بوو چۆن خنکانو لەناو چوون، بەمەش کفتو کۆی دڵیان دامرکاو دڵنیا بوون لە فەوتانو لەناو چوونی دوژمنی سەرسەختیان.

ئیمامی بوخاریو موسلیمو نەسائیو ئیبن ماجەو ئیمام ئەحمەد لە ئیبنو عەباسەوە حەدیسێك دەگێڕنەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ)

کاتێ هاتە (مەدینە) بینی جولەکەکان ڕۆژی (عاشورا) بەڕۆژو دەبن: فەرمووی: بۆچی ئێوە لە م ڕۆژەدا بەڕۆژو دەبن؟! وتیان: ئەم ڕۆژە ڕۆژێکی پیرۆزە، ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە پەروەردگار نەوەی ئیسرائیلی لەچنگ دوژمنی سەرسەختیان ڕزگار کردووە، کاتی خوای حەزرەتی موسا بۆ شوکرانە بژێری‌و سوپاسگوزاری ئەو ڕۆژە بەڕۆژو بووە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: من لە ئێوە بە موسا نزیکترم، ئیتر بۆ خۆشی بەڕۆژو بوو فەرمانیشی بە هاوەڵانی کرد کە بەڕۆژو بن؟! (الأساس ج١/ ١٤٧)

٣- ﴿وَإِذْ وَاعَدْنَا مُوسَى أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ اتَّخَذْتُمُ الْعِجْلَ مِن بَعْدِهِ وَأَنتُمْ ظَالِمُونَ، ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّن بَعْدِ ذَلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾. پەروەردگار سەر گورشتەیەکی تریان وەبیر دێنێتەوە، دەفەرموێ: ئەوە وەبیر خۆتان بێننەوە، کە هەر دوا بە دوای ڕزگاربوونتان لە فیرعەون‌و ڕزگاربوونتان لە دەریا موسامان بانگ کرد بۆ سەر کێوی (طور)، چل شەو مایەوە، کەچی ئێوە دوای ئەوە بوونە گوێرەکەپەرست‌و خوداتان لەبیر چووەوە سەرباری ئەم تاوانە گەورەشتان خودا تۆبەی لێ وەرگرتن‌و عەفووی کردن‌و بۆ ئەوەی بیرێك لە خۆتان بکەنەوەو واز لە تاوان‌و تاوانکاری بێنن‌و سوپاسگوزار بن.

٤- ﴿وَإِذْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَالْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ بیربکەنەوە کە ئێمە تەوراتمان نارد بۆ (موسی)و (فورقان)مان دایە کە بریتی بوو لە ئەو موعجیزەو نیشانانەی کە حەق‌و بەتاڵ لێك جودا بکەنەوە، وەکوو: گۆچانەکەی کە مارە درۆزنەکانی سیحربازەکانی لوول کردن‌و قوتی دان، یان وەکوو: دەستی موبارەکی موسا کە دەیخستە باخەڵیەوەو دەری دێنایەوە سپی دەبوو، دەدرەوشایەوە، یان مەبەست بە (فورقان) ئەو شەرع‌و یاسایەیە کە درابوو بە موسا، حەق‌و بەتاڵی لێك جیا دەکردەوە ئەمەش نیعمەتی چوارەم بوو کە کتێبێکی بۆ ناردبوو بۆ ڕێنموویی ژیانیان.

٥- ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُمْ بِاتِّخَاذِكُمُ الْعِجْلَ فَتُوبُواْ إِلَى بَارِئِكُمْ فَاقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ﴾. بیر بکەنەوە لە ئەو کاتەی کە حەزرەتی موسا بە قەومەکەی خۆی گوت: ئەی گەل‌و هۆزەکەم! بەڕاستی ئێوە

ستەمێكی گەورەتان لە خۆتان كرد: كە خوداپەرستیتان لە بیرچووەوەو دەستان كرد بە گوێرەكە پەرستی! بگەڕێنەوە بۆلای بەدیهێنەرو دروستكەری خۆتان، دەست بكەن بە كوشتنی یەكتری‌و خوێن ڕشتن‌و یەكتر كوشتن‌و پاساوی ئەو تاوانە گەورەتان بدەنەوە، ئەوە باشەو پەسەندە لای خودای خۆتان! ﴿فَتَابَ عَلَيْكُمْ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾. ئەمجار پەروەردگار تۆبەی لێ قبوڵ كردن‌و لێتان خۆش بوو: بێگومان پەروەردگار زۆر لێ خۆش بووەو بە ڕەحم‌و بەزەیی یە.

لەم ئایەتەدا پەروەردگار ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە كە كاتێ موسا ڕۆیی بۆسەر كێوی طورو مایەوە، دوای ئەو جولەكەكان دەستیان كرد بە گوێرەكە پەرستن.. دوایی تۆبەیان لێ قبوڵ نەكرا هەتا بە چەك كەوتنە ویژەی یەكتری‌و دەستیان بە یەكتر كوشتن كرد! جا لەگەڵ ئەوەشدا كە ئەم یەكتر كوشتنە كارێكی زۆر ستەم بوو كەچی خودا منەتیان بەسەردا دەكا كەوا تۆبەی لێ قبوڵ كردون!! ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوە كە تاوانەكەیان زۆر گەورەیەو بە خۆكوشتن نەبێ پاساو نادرێتەوە، بەتایبەتی: كە ئەوان دوای خواپەرستی‌و خودناسین وازیان لە پەرستنی پەروەردگاری زاناو داناو بەدیهێنەر هێناو رویان كردە گوێرەكە پەرستی، كە ئەمە ئەو پەڕی بێ عەقڵی‌و نەفامی‌و ستەمكاری دەگەیەنێ كەوابوو شایانی ئەو سزایە بوون.

ئەو یەكتری كوشتنە (وەكوو لە تەفسیرەكاندا هاتووە) بریتی بووە لەوە كە ئەوانەی گوێرەكەیان نەپەرست‌و هەر لەسەر خودا پەرستی مانەوە ئەوانە بكوژن كە بوونە گوێرەكە پەرست! یان بریتی بوو لەوە كەتێك بەربن‌و هەر كەسە بۆی كرا ئەوی تر بكوژێ! هەر كەسە تووشی هەر كەسێك بوو بێ سێ‌و دوو بیكوژێ! جا كوژراوەكە كوڕی بێ برای بێ خزمی بێ یان بێگانە بێ، بێگومان جێبەجێكردنی ئەم فەرمانە لەلایەن جولەكەكانەوە هەڵوێستێكی مێژووی زۆر دەگمەن‌و گرنگە، حیكمەت‌و دانای خودای تێدا دەردەكەوێ كە ئەو زێدە ڕێزەی داونێ.. لە كۆتایی ئایەتەكەدا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ﴾ واتە: تۆبە كردن‌و خۆكوشتنتان لەلای خودا باشترە لە بەردەوام بوونتان لەسەر گوناهو تاوان! ئایەتەكە ئەوەش دەگەیەنێ: كە

هەرگیز تاوان بەبێ سزادانەوە نابێ، تاوانبار هەرچۆنێك بێ دەبێ سزای تاوانی خۆی وەربگرێ مەگەر خودا بەرەحمەتی خۆی بیبەخشێو عەفوی بكا، ئەوەش دەگەیەنێ كە پێویستە موسوڵمان لەپێناو رەزامەندیی خودادا لەدەست دانو كوشتنی خزمو كوڕو براو تەنانەت خۆشی بەلاوە گرنگ نەبێ!!

## باقی ماندەو تەواكەری نیعمەتەكانی بەسەر نەتەوەی ئیسرائیل

﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ۖ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ ۚ وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ وَإِذِ

ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾.

٦- ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَى لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّى نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً﴾ بیربکەنەوە ئەو دەمەی کە گوتتان، ئەی موسا: هەتاکو بە ئاشکراو بە چاوی سەر خودامان چاو پێ نەکەوێو نەیبینین، ئێمە بڕوا بە تۆ ناکەینو بە پێغەمبەرت نازانین ﴿فَأَخَذَتْكُمُ الصَّاعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾ ئاگرێك، هەورە تریشقەیەك لە ئاسمانەوە دەوری دانو ئەوانەی ئەو قسە زلەیان کردبوو هەڵی پڕوزاندنو لەناوی بردن، ئێوەش بەچاوی خۆتان ئەم ڕووداوەتان بینی ﴿ثُمَّ بَعَثْنَاكُم مِّن بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ ئەمجارە پاش مردنتان سەر لەنوێ زیندوومان کردنەوە، بەڵکوو ئێوە عار بنێنو شوکرو سوپاسی خودا بکەن!

ڕاڤەکەرانی قورئان دەفەرموون: مەبەست لەم لەناو چوونو مردنە، جۆرە بێ هۆش بوونێکیان بووە، کە کاتێ هەورە تریشقەکە لێی دان لەترسان بێ هۆش کەوتن وەکوو لە سورەتی ئەعرافدا دەفەرموێ: ﴿وَاخْتَارَ مُوسَى قَوْمَهُ سَبْعِينَ رَجُلاً لِّمِيقَاتِنَا فَلَمَّا أَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّايَ﴾ واتە: موسا حەفتا پیاوی لە گەلەکەی هەڵبژارد بۆ ئەو ماوەی بۆمان دیاری کردبوو، جا کاتێك لە ترسانا لەرزە گرتنیو بێ هۆش بوون! موسا وتی: خودایە! ئەگەر بتویستایە لەوەپێش منو ئەوانیشت لەناو ئەبرد، جا بەپێی کۆتایی ئایەتەکە: کە دەفەرموێ: ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ: کە تا ئێستا ڕەوتی ئایەتەکان هەر لە چوارچێوەی منەت ناندا هەنگاو دەنێن، ئەمجار ئەوانەی کە هەورە تریشقەکە لێیدان لەشیان هەڵپڕوزاو کە

هۆش خۆ هاتنەوە پێویستیان بە سێبەرو فێنكای هەبوو دەبوایە خواردنێكی خۆش بخۆنو ئاوێكی خۆشو شیرین بخۆنەوە بۆیە بە هەور سێبەری بۆ كردنو لە گەرمی خۆر پاراستنی، ئەمەش بە نیعمەتی حەوتەم دەژمێردرێ!

٧- ﴿وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ الْغَمَامَ﴾ هەورمان هێنایە ژوور سەرتانو سێبەرمان لێ كردنو لەو دەشتی سینایەدا بۆ هەر شوێنێ بچوونایە هەورەكە لەگەڵیان دەسوڕاو بەرگری تیشكی گەرمی خۆری لێ دەكردنو نەیدەهێشت هەتاو بیان سوتێنێ.

٨- ﴿وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى﴾ ئەمجار گەزۆو پەلەوەری شێلاقەمان بۆ ناردنە خوارێ، واتە: گەزۆ بەسەر دارو درەختەكاندا دەباری ئەوانیش كۆیان دەكردەوە، شێلاقەش كە باڵندەیەكە لە (كەو) گەورەترە (هەندێ دەڵێن لە چۆلەكە گەورەترە) بە زۆری خودا بۆی دەناردن، ئەوانیش راویان دەكردنو گۆشتەكەیان دەخوارد، بۆخۆشیان ئاژەڵی (ماڵی)یان هەبوو ماستو كەرەو پەنیرو لۆركو دۆیان بەرهەم دەهێنا، بەڵام پێویستیان بە بەروبوومو سەوزەی تر هەبوو، جا ئەم پێویستیانەمان بۆ دابین كردنو پێمان گوتن: ﴿كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾ بخۆنو بخۆنەوە لەو خواردەمەنیە پاكو خاوێنەی كە كردومانە بە رزقو رۆزیی ئێوە، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا سەرپێچیان كردو پاشگەز بوونەوە، ستەمیان لەخۆیان كرد، ئەو هەموو نازو نیعمەتو موعجیزەو یارمەتیدانە وای لێ نەكردن سوپاسی خودا بكەن ﴿وَمَا ظَلَمُونَا﴾ نەیان توانی ستەم لە ئێمە بكەنو زیانمان پێ بگەیەنن ﴿وَلَكِن كَانُواْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بەڵكوو ئەوان ستەمیان لە خودی خۆیان كرد، چونكە زیانی تاوانەكانیان هەر روو بە رووی خۆیان دەبێتەوەو بۆخۆیان تووشی سزای سەخت دەبن.

ئیبنو كەثیر دەفەرموێ: لەمەوە بۆمان دەردەكەوێ، هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) چەند وره بەرزو خۆراگرو پشو درێژ بوون، لەگەڵ ئەو هەموو ناڕەحەتیو برسێتیو تینوویەتیەی كە لە غەزاكاندا تووشیان هات، بە تایبەت لە غەزای تەبوكدا، كەچی لەگەڵ ئەمەیشدا هەرگیزاو هەرگیز داوای شتێكی نائاساییان لە پێغەمبەر نەدەكرد! تەنانەت كاتێك برسییەتی تینی بۆ هێنان داوایان كرد كە ئەو

ئەندازە خواردنەی كە ماویانە زۆر بكرێ بۆیان، جا هاتن ئەو خواردنەی لایان بوو هەموویان تێكەڵاو كردو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نزای كردو پاڕایەوە ئیتر هەورێك پەیدا بوو بارانی بۆ باراندن ئاویان خواردەوە حوشترەكانیان ئاودان، كە دوایی سەیریان كرد باران بارینەكە لە دەوروبەری سەربازگەكە تێپەڕی نەكردووە!

٩- ﴿وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُواْ هَذِهِ الْقَرْيَةَ فَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَداً وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّداً﴾ بیری ئەو كاتە بكەنەوە كە دوای ئەوەی لە دەشتی سینا دەرچوون‌و حەزرەتی موسا لە دونیا دەرچوو، یوشعی كوڕی نون بوو بە (جێگری موسا) پێمان گوتن: بچنە ناو ئەم شارەوە كە (بیت المقدس)ە یان (أریحا) بووە، لەوێدا هەموو جۆرە خواردنێكی خۆش‌و بەتام هەیە لەهەر شوێنێ حەز دەكەن بە تێرو تەسەلی بخۆن‌و بخۆنەوە، ئەمجار كاتێك گەیشتنە ئەو دەرگایەی بۆتان دیاری كراوە كڕنووش بۆ خودا بەرن‌و بە مل كەچیەوە بچنە ژورەوە، بەدەم چوونە ژورەوەتان لەسەر شێوەی كڕنووش بردن ﴿وَقُولُواْ حِطَّةٌ﴾ بڵێن: خودایە! لێت دەپاڕێینەوەو نزات لێ دەكەین كە گوناهەكانمان لێ هەڵوەرێنی‌و لێمان دارنی ﴿نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ﴾ ئێمەیش لە گوناهەكانتان خۆش دەبین‌و ﴿وَسَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ﴾ بۆ چاكەكاری پاداشتی چاكەیان بۆ زیاتر دەكەین، ﴿فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُواْ قَوْلاً غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ﴾ كەچی ستەمكاران ئەو شێوە چوونە ژوورەومیان‌و جۆری پاڕانەوەكەیان گۆڕی بە شتێكی تر، واتە: نزاو پاڕانەوەیەك فێركرابوون: كە بیڵێن بریتی بوو لەدوای لێخۆشبوون، ئەوان گۆڕیان بە وشەیەكی تر لە جیاتی ئەوەی بڵێن: (حطة) دەیانگوت: (حنطة) واتە: گەنم، پێیان گوترا بوو: لە كاتی چوونە ژوورەوەدا لە شێوەی كڕنووش بردن دا بچنە ژوورەوە كەچی ئەوان بە قنگەخشكێ چوونە ژوورەوە!

﴿فَأَنزَلْنَا عَلَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ رِجْزاً مِّنَ السَّمَاء بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ﴾ ئێمەش رشتمان بەسەر ئەوانەی ستەمیان كرد سزایەكی بە ئێش لە ئاسمانەوە بە هۆی ئەو سەرپێچییەی: كە كردیان لە جێبەجێكردنی فەرمانەكەماندا!

دوو ئایەتەکانی پێشوتر ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە نازو نیعمەت دەبێ شوکرو سوپاسی لەسەر بکرێ، شوکرو سوپاسیش دەبێ بە وتەو بەکردەوە بێ، ئەوەش دەگەیەنن: کە فەرمانەکە چۆنەو چۆن داوای ئەنجامدانیو تەواوکردنی کردارەکان دەکا دەبێ ئاوا جێبەجێ بکرێن گۆڕانکاریان تێدا نەکرێ، ئەوەشیان تێدایە کە هەرگیز تاوان بێ سزادان نابێ، جا زوو بێ یان درەنگ، ئەمجارە پەروەردگار فەرمانیان پێ دەکا کە نیعمەتێکی تری خودا وەبیر خۆیان بێننەوە، ئەویش دابین کردنی ئاوی سازگارو سافو گەوارایە لە کاتی پێویستی: کە دەفەرموێ:

١٠- ﴿وَإِذِ اسْتَسْقَى مُوسَى لِقَوْمِهِ فَقُلْنَا اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْناً﴾ بیر بکەنەوەو سوپاسم بکەن لەسەر ئەو نیعمەتەی بەسەر ئێوەمدا ڕشت: کە بریتی بوو لە وەڵامدانەوەی ئێمە بۆ پێغەمبەرەکەمان کاتێ داوای ئاوی کرد بۆ خواردنەوەو پێداویستی هۆزەکەی، ئێمەش پێمان گوت: عەساکەت لەو بەردە بدە! - جا یا بەردێکی تایبەتی بووە، یان مەبەست جینسی بەردە – ئەویش بە فەرمانی خودا عەساکەی لە بەردەکەدا، ئیتر لە هەر چوار لاوە ئاوی لێ هەڵقوڵا، هەر لایەی سێ سەرچاوە واتە: دوانزە سەرچاوەی ئاو بە ئەندازەی هەر دوانزە هۆزەکەی نەوەی یەعقوب بۆ هەر هۆزێك کانیاوێك هەڵقوڵا ﴿قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ﴾ هەر گرۆهێك لەوان دەیزانی کامە سەرچاوەو کانیاوی خۆیانە.. ئابەو جۆرە لەو دەشتە کاکی بە کاکیەدا خواردەمەنی گەزۆو گۆشتی پەلەوەریان بۆ دابین کرا، ئاوی سافو سازگارو ڕەوانمان لەبەردی ڕەقو تەق بۆ هەڵقوڵاندن هەمووشیان لە خوداوە بوون ماندوبوونی ئەوانی تێدا نەبوو.. پێمان گوتن ﴿كُلُواْ وَاشْرَبُواْ مِن رِّزْقِ اللَّـهِ﴾ بخۆنو بخۆنەوە لەو خۆراكو ئاوو شیرو شلەمەنیە خۆشانە. ﴿وَلاَ تَعْثَوْاْ فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ سەرباری ئەو هەموو نیعمەتانەمان بۆ ئێوە، درێژە بە لاساریو ئاشووب گێڕی خۆتان مەدەن، وەلە زەویدا چیدی خراپە مەکەن!

خوێنەری هێژا! بە کۆتایی هاتنی ئەم ئایەتە وێنەی حاڵو چۆنیەتی ئەو نیعمەتانەی کەلە دەشتەکەدا پێیان درابوو تەواو بوو، ئەمجار دوابەدوای ئەم ئایەتە

ئایەتێکی تر دێتە پێشەوە: کە جۆرە سروشتێکی تری جولەکەکانمان نیشان دەدا: ئەویش چلێسیو هەتیومەچەییانە، شتی باشو حەلاڵیان دراوەتێ کەچی داوای شتی خراپ دەکەن، گەزۆو گۆشتی پەلەوەریان بۆ دابین کراوە چاویان لە پیوازو نیسكو نۆکە!!.

## چاو چنۆکی جولەکەکانو برێ لە تاوانەکانیان

﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾ ﴾.

﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَى لَن نَّصْبِرَ عَلَىَ طَعَامٍ وَاحِدٍ﴾. ئەوە بیری خۆتان بێننەوە کە ڕەخنەتان لەو خواردنە خۆشانە گرتو وتتان: ئەی موسا! ئێمە لە ئێستا بەولاوە بەم جۆرە خواردەمەنییە رازی نابین چیدی پێی مەدار ناکەین! جا هەرچەندە خواردەمەنیەکەی ئەوان گەزۆو گۆشتی شێلاقە بوو بەڵام چونکە هەموو ڕۆژێ دووبارە

بومتەوە بە یەك خواردەمەنییان حیساب کردووە ﴿فَادْعُ لَنَا رَبَّكَ﴾ داوامان بۆ لە خودا بکە ﴿يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنبِتُ الأَرْضُ﴾. ئەوەمان بۆ دابین بکا کە زەوی دەیرووێنێ ﴿مِن بَقْلِهَا﴾ لە سەوزەواتیو ﴿وَقِثَّآئِهَا﴾. خەیارو ﴿وَفُومِهَا﴾. گەنم، یان سیر، ﴿وَعَدَسِهَا﴾. نیسکی، ﴿وَبَصَلِهَا﴾. پیازی.. ﴿قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ الَّذِي هُوَ أَدْنَى بِالَّذِي هُوَ خَيْرٌ﴾. موسا فەرمووی: ئایا ئێوە داوای ئەو شتە خراپانە دەکەن؟ لە شوێنی گەزۆو گۆشتی بەلەززەتی شێلاقە داوای کەرەوزو ئەعناو خەیارو سیرو پیازو ئەو جۆرە شتانە دەکەن؟! ئەگەر حەزتان لەو جۆرە شتانەیە؟ دە ئازابن خۆتان لەم دەشتی سینایە دەرباز بکەن ﴿اهْبِطُواْ مِصْراً فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ﴾. داگەڕێنە ناو شارێك لەم شارە نزیکانەی وڵاتی فەلەستین، هەر شارێك بچنە ناوی ئەو جۆرە شتانەی تێدا دەست دەکەوێ، چیتان بوێ لەم جۆرە شتانە زۆرو زەبەندەیەو پێویست ناکا دۆعا لە خودا بکەن!! یان مانای وایە بە شێوەیەکی گلەیی ئامێزو سەرکۆنەکردن پێیان دەڵێ: ئەگەر ئێوە بەم نازو نیعمەتەو پلەو مەقامە رازی نین، بگەڕێنە بۆ شاری میصر ئەو شارەی کە لێی وەدەرنران! بگەڕێنە بۆ ئەو ژیانە کولە مەرگیە ژێردەستەییە: کە بارتان پێوە گرتبوو، لەوێ نیسكو پیازو سیرو خەیارو کەرەوزو گەنمتان دەست دەکەوێ.. ئەو ئەرکە پیرۆزەی کە بۆ ئێوە دانراوە وازی لێ بێنن، چونکە وا دیارە ئێوە ئەو پیاوە نین کە ئیشی پیاوانە ئەنجام بدەن!![1] ﴿وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ وَالْمَسْكَنَةُ﴾. زەلیلیو ریسواییان بەسەردا دراو مۆری خوێڕیەتیو چاوچنۆکیو پڕوپوچیان پێوە نرا ﴿وَبَآؤُوْاْ بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ﴾. نارەزامەندی خودایان بۆ خۆیان هێنایەوە، بێگومان ئەم زەلیلیو ریسواکردنەیانو خەشمو نارەزامەندی خودا لێتان لە رووی مێژووییەوە لەسەردەمی حەزرەتی موسادا نەبووە بەڵکوو ئەمە بەچەند چینێك دوای لە دونیا دەرچوونی موسا بووە، دەی بۆ لێرەدا دەست پێشکەری کردو ئەم چۆنیەتەی کە ریسوا بوونو

---

[1] - مامۆستا سعید حەواو سید قطب ئەم مانایانەیان بەلاوە پەسەندە. (الأساس ج١/ ١٥٣، في ظلال القرآن).

بێنەواییانە دوا بە دوای وتەکەی موسا هێنا؟! بۆ ئەوەی گونجاو بێ لەگەڵ هەڵوێستی جولەکەکان کە لەجیاتی گەزۆو گۆشتی شێلاقە، داوای کەرەوزو پیازو سیرو خەیاریان کرد ﴿ذَلِكَ﴾. ئەم ریسوایی‌و سوکایەتی پێ کردنە کە بە باڵایان برا. ﴿بِأَنَّهُمْ كَانُواْ يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللّهِ وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ بِغَيْرِ الْحَقِّ ذَلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ﴾. بەهۆی ئەوەوە بوو کە بروایان بە موعجیزاتی پێغەمبەران نەدەکردو پێغەمبەرانیان بە ناڕەوا دەکوشت، ئەم سەرپێچی کردنەو پرکێشی کردنەیان بۆ تاوان، بەهۆی ئەوە بوو کە لە خودا عاسی بوون‌و دەست درێژییان دەکردو سنوریان دەبەزاند! بەڵێ سەرباری ئەو هەموو نیعمەت‌و ڕێزەی کە پێیان درابوو بڕوانەکردنیان بە نیشانەکانی خوایەتی خوا، بە موعجیزاتی پێغەمبەران هەروەها بەرەنگاری کردنی پێغەمبەران‌و یاخی بوونیان لە خوداو دەست درێژی کردن‌و سنور بەزاندنیان بوو بەهۆی زەلیل بوون‌و ریسوا بوونیان‌و بارینی بەڵاو موصیبەت بۆ سەریان، بە جۆرێك کە ریسوایی‌و بێنەوایی لە هەموو لایەکەوە دایگرتن‌و وەکوو خێمە دایپۆشین. بێگومان مێژووی هیچ گەلێك بە ئەندازەی مێژووی نەوەی ئیسرائیل دڵ ڕەقی‌و سەرسەختی‌و دەستدرێژی کردنی تێدا نیە! کەس ئەوەندە لەگەڵ پێغەمبەران ناکەس بەچەو خوارو خێچ نەبوون، پێغەمبەرانیان کوشتن، سەریان بڕین لەناو دارا بە مشار دایان هێنان: کە ئەمە گەورەترین تاوان‌و پیسترین هەڵوێست‌و خیانەتکارییە کە بەرامبەر بانگەوازی کەرانی حەق‌و راستی کراوە. دەرحەق بە پێغەمبەرانی خودا ئەنجام دراوە، لە کوفرو سەرپێچی کردندا گەیشتنە ئەوپەڕو بە قیزەونترین شێوە دەستدرێژیان کرد، بە ناشیرینترین شێوە لە خودا یاخی بوون، مێژوویان پڕە لە پۆخڵاوات‌و خیانەتکاری‌و سنور بەزاندن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا داوای سەیرو سەمەرەیان هەبووە، زمان درێژو چەقە چەناوو بێ شەرم‌و حەیاو بێ ئابڕوو، هەموو کاتێ پێیان وابووە هەر ئەوان لەسەر حەقن، هەر ئەوان گەلی هەڵبژێراوی خودان، پاداشتی خودا هەر بۆ ئەوانەو بەس، نازو نیعمەتی خودا هەر شایانی ئەوانەو نابێ بۆ کەسی تر بێ..

لێرەدا قورئانی پیرۆز ئەم داوایەی گەلی جولەکە رەت دەکاتەوە بەم ئایەتەی دوایی یاسایەکی گشتی دادەنێ ئەویش یاسای بڕوا بوون بە خودایە، هەرکاتێ هەرکەسێ خۆی تەسلیم بە خودا کردو کرداری باش بوو، ئەوە ئەو کەسە لای خودا بەندەی راستاڵو باشە، فەضلو نیعمەتی خودا هەر بۆ ئەو جولەکانە پاوان نەکراوە، بەڵکوو بۆ موسوڵمانانە بۆ خوداپەرستانە لە هەموو کاتو شوێنێکا، هەر کەسە بە پێی ئەو ئایینەی کە لەسەری بووەو لای خوا پەسەند بووە، تا ئەو ڕۆژەی ئایینێکی گشتی دێ کە ئایینی ئیسلامە.

## دوا ڕۆژ هەر بۆ موسوڵمانانە

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار کردەوەو هەڵوێستی جولەکە پێشینەکانی بۆ جولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) هێنایەوە ئاکامو سەرەنجامیانی روون کردەوە، ئەمجا یاسایەکی گشتی خۆی باس دەکا: کە بریتیە لەوەی هەرکەسێك ئیمانی بە خودا هەبووبێ کردەوەی چاك بووبێو بە مراد گەیشتووە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾. بێگومان ئەوانەی شوێن پێغەمبەر کەوتوونو بە ڕاستی بڕوایان پێ هێناوە ﴿وَالَّذِينَ هَادُواْ﴾. ئەوانەی بڕوایان بە تەورات هەیە، یان ئەوانەی لە پەرستنی گوێرەکە ژێوان بوونەوە ﴿وَالنَّصَارَى﴾. ئەوانەی بڕوایان بە حەزرەتی عیسا کردو شوێن پەیامەکەی کەوتن ﴿وَالصَّابِئِينَ﴾ صائیبەکان.

**زانایان دەربارەیان سێ رایان هەیە:**

یەکەمیان دەڵێن: ئەوانە گەلێکن ئەستێرەو فریشتەیان پەرستووەو ئێستاش پاشماوەیان لە عێراقدا ماوە.

دوومیان دەڵێن: بەوانەی دەگوترێ (صابئة) کە وازیان لە ئایینی بەتاڵ هێنابێ‌و بۆلای خودا گەڕابنەوەو نەزانن ئایینی راست کامەیە.

سێیەم دەڵێن: ئەوانە ئەو ئادەمیزادانەن کە پەیامی هیچ پێغەمبەرێکیان پێ نەگەیشتبێ جگە لە خودا کەسی تریان نەپەرستبێ.

﴿مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحاً﴾. ئەوانەی بڕوایان بە خوداو بە ڕۆژی قیامەت هەبووە لەهەمان کاتیشا کرداری باشیان کردووە ﴿فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾. ئەم چوار کۆمەڵە لای خودای خۆیان پاداشتیان دەدرێتەوە، هیچ ترس‌و نارەحەتییەکیان لەسەر نیەو خەم‌و خەفەتیان تووش نابێ. ترسی داهاتوویان نیەو دڵیان لەسەرەنجامی خۆیان‌و پەرۆشی رابوردووی خۆیان نیەو لە کرداری خۆیان پەشیمان نین.

جا بۆئەوەی باسەکە روون بکەینەوە، دەڵێین: دوای هاتنی ئایینی ئیسلام رێگە نەماوە بۆ جولەکەو فەلەو صابیئەو ئاگرپەرست (مجووسی): کە جگە لە ئایینی ئیسلام‌و شوێن کەوتنی پێغەمبەری ئیسلام هیچ ئایینێکی تر پەیڕەو بکەن، مەگەر بانگەوازی ئیسلامیان پێ نەگەیشتبێ، ئەوە ئەو کاتە موکەلەف نابن. لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا کە ئیمامی موسلیم گێڕاویەتیەوە دەفەرموێ: « وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لاَ يَسْمَعُ بِي أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ يَهُودِيٌّ وَلاَ نَصْرَانِيٌّ ثُمَّ يَمُوتُ وَلَمْ يُؤْمِنْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ إِلاَّ كَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ ». واتە: بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە هەر کەسێك لەم کۆمەڵی ئادەمیزادە جولەکە بێ، فەلە بێ، هەر کەسێکی تر بێ، بانگەوازی منی پێ گەیشتبێ‌و ئیمان بە پەیامەکەم نەهێنێ ئەوە کافرەو ئەهلی ئاگرەو رۆژی قیامەت دەخرێتە ناو دۆزەخەوە﴾ کەوا بێ مەبەست بە (یەهود) ئەو جولەکانەن کە پێش هاتنی حەزرەتی عیسا هەبوون‌و بڕوایان بە عیسا نەکردووە، ئەوە

گومڕاو کافرن. مەبەست بە (نصاری) ئەو فەلانـەن: کـە پـێش هـاتنی حـەزرەتی محمد (دروودی خوای لەسەر بێ) هەبوون کە بە ڕاستی لەسەر ئایینی مەسیح مانەوە، بەڵام دوای هاتنی پێغەمبـەری ئیسلام هـەر مەسیحییەك ئیمانی پـێ نـەهێنابێ ئـەوە گومڕاو کافرە هـەروەها (صـابیئە)کانیش تـا هـاتنی پێغەمبـەر بەهانـەدارن (معـذورن) بەڵام دوای هاتنی پێغەمبەر هەر کەسێك لـە (صابیئە) ئیمان بـە پێغەمبـەر نـەهێنێ، گومڕایە، دەمێنێتەوە پرسیارێك هەیە بکرێ بۆچی لەسـەرەتای ئایەتەکـەدا فـەرمووی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾. ئەوانەی بڕایـان هەیـە، دیـارە مەبەسـت بەوانـە ئومـەتی حـەزرەتی موحەممـەدە (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) خـۆ ئەمانـە لـە ڕووی مێژوویـەوە دوایـین ئومـەتن، بۆچـی پێـشی خـستن؟ وەڵامەکـەی ئەوەیـە موسـوڵمانان چـونکە بڕوایـان بـە هەموو پێغەمبەرانی ڕابوردوو هەیە لەبەر ئەوە ئیمانداری بومتە ناو بۆ ئـەوان. هـەروا قورئان درێژە بە ریزکردنی سەرپێچی کردنەکانی جولەکـەکان دەدا، ئـەوەیان بەسـەردا دەچەسپێنێ کە ئەوانە هـەرگیز لەسـەر وادەو پـەیمانی خۆیـان بـەردەوام نـەبوون هـەر زوو ژێوان بوونـەوەو پشتییان هەڵکردووە.

## برێ لە تاوانی جولەکەو سزادانیان لەسەر تاوانەکانیان

﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۖ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا

لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَاسِئِينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلْنَاهَا نَكَالاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾﴾.

ئایەتـەكانی پێـشوو وەبیـر خـستنەوەی نیعمەتـەكانی خـودا بـوون بەسـەر جولەكەكاندا، ئەم ئایەتانە هەڕەشـەلێكردنو سەرزەنـشت كردنیانـە بـەهۆی سەرپێچی كردنو تاوان ئەنجامدانیانـەوەو دەفـەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ﴾. بیربكەنـەوە كاتـێ پەیمانمان لێ وەرگرتن كە پەیڕەوی فەرمانەكانی تەورات بكەنو چۆن دەفـەرموێ ئـاوا پەیڕەوی بكەن، كەچی دوایی بەلاتانەوە قورس بوو، وتتان: ئێمە ناتوانین ئەم ئەركانە ئەنجام بدەینو بۆمان قبول ناكرێ: ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ﴾. كێـوی (طـور)مـان وەكوو هەور هێنایەوە ژوور سەرتانو موسا پێی گوتن: ئەگەر گەردنكەچ نـەبن! ئـەم كێوەتـان بەسەردا دەڕوخێنێ، ئەمجار بەناچاریو لـە ترسـاندا قبولـتـان كـردو هاتنـە سـەر ڕێگا، ئەمجار پێمان گوتن: ﴿خُذُواْ مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ﴾. ئـەم تەوراتـەی بۆمـان ناردوون بـە ڕێكوپێكی وەری بگرنو بە ڕاستو دروستی كاری پێ بكـەن، بـە دڵسۆزیو لێبوردویی فەرمانـەكانی جێبـەجێ بكـەن، ﴿وَاذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾. بیربكەنـەوە لـەو فـەرمانو فەرموودانـەی تێیـدان، بـە وردی تێیـان بفكـرن، بـەڵكوو خۆتـان لەسەرپێچی فـەرمانی بپـارێزنو لـە سـزای خـودا ڕزگارتـان ببـێ، بـەڵام كـوا ئێـوە وادەو پـەیمانتان هەیە؟! كەی پابەندی وادەو بەڵێنی خۆتان بوون؟! كوا تـا سـەر لەسـەر ڕێگـای ڕاسـتو دروست مانەوە؟ ﴿ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّن بَعْدِ ذَلِكَ﴾. پاشـان پـشتتان هـەڵكردو هـیچ گوێتـان بـە وادەو پەیمانەكانتان نـەداو هـەڵتان وەشـاندەوە، ﴿فَلَوْلاَ فَضْلُ اللّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ﴾. ئەگەر میهرەبـانیو بەخـششو بـەزەیی خـودا نەبوایـە كـە دەس بـەجێ سـزای نـەدانو ڕێنومایی كردن بۆ تۆبەكردنو بەردەوام بوون لەسەر نـاردنی پێغەمبـەران بـۆ سـەرتان ﴿لَكُنتُم مِّنَ الْخَاسِرِينَ﴾. ئێوە لە كۆمەڵی خەسارەتمەندان دەبوونو لە دونیاو قیامەتـدا تووشی سزای سەخت دەبوون!!

جارێكی تر پەروەردگار فرتو فێڵی جولەكەكان دەردەخا، لاساریی‌و بێ ورەیی‌و خۆڕانەگریان لەبەرامبەر حەزو ئارەزوبازیاندا دەخاتە ڕوو ﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ الَّذِينَ اعْتَـدَواْ مِنكُمْ فِي السَّبْتِ﴾. بێگومان خۆتان باش دەزانن‌و ئاگاتان لێیە چۆن ئەو جولەكانە ستەمیان كردو لە ڕۆژی شەممەدا سنوری بۆ دانراویان بەزاند، ئەوەبوو داوایان لە خودا كرد كە ڕۆژێكیان بۆ بكاتە ڕۆژی حەسانەوەو ئیشی تێدا نەكەن، پەروەردگاریش ڕۆژی شەممەی بۆكردن بە ڕۆژێكی پیرۆزی وەها كەنابێ هیچ كارێكی تێدا بكەن، ئەمجار خودا تاقیكردنەوە، بەوە كە لە شەممەدا ماسی زۆر دەبوون‌و ئەوانیش ڕێگایان نەبوو راویان بكەن، لە ڕۆژەكانی تریشدا ماسی نەبوو راوی بكەن، ئیتر ئەوان لەو ڕۆژەدا: كە راوكردنی تێدا قەدەغە بوو لە دەوروبەری دەریاكەدا گۆماویان دروست دەكردن‌و ئاویان بۆ هەڵدەبەستن‌و ماسی دەهاتنە ناو گۆماوەكانەوە، ئەمجار ئاوەكەیان لێ دەبرین‌و ڕۆژی دوایی دەهاتن‌و ماسیەكانیان دەگرتن، ئیتر لە سزای ئەم بەد رەفتارییەیاندا لەسەر ئەو چاوچنۆكی‌و چڵێسییەیان ﴿فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَاسِئِينَ﴾. پێمان گوتن: ببن بە مەیموونی هیچ‌و پووچی بێ نرخ‌و ناشیرین، لە پایەو پلەی ئادەمی دابەزن‌و ئێوە شیاوی ڕێزو پلەو پایەی ئادەمیزاد نین، بچنە ریزی جانەوەرانەوە، كە هەر هەوڵ‌و تەقەڵای گەدەو گیپاڵیانەو خواردن‌و خواردنەوە نەبێ هیچ مەبەستێكی تریان نیە ﴿فَجَعَلْنَاهَا نَكَالاً﴾. ئێمە ئەو بە مەیموون كردنەی ئەوانمان كردە سزاو عیبرەت ﴿لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا﴾. بۆ دانیشتوانی شارو دێهاتەكانی دەوروبەریان ﴿وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ﴾. هەروەها پەندو ئامۆژگاریە بۆ خواپەرستانی دوای خۆیان تا ڕۆژی قیامەت!

**لەم سێ ئایەتەدا پەروەردگار چەند رەوشتێكی ناشیرین‌و نا جوامێرانەی جولەكەكانی بۆ دیاری كردوین:**

١- روو وەرگێڕان‌و پشت هەڵكردنیان لە نیگای خوداو فەرمانەكانی لەگەڵ ئەو نیشانەو بەڵگانەی كە راستی ئەو پەیامانەی خودایان دەچەسپاند كەچی ئەوان هەر سەرپێچیان تێدا كردن‌و بروایان پێ نەكردن..

٢- فرتو فێڵ كردن بۆ خۆ رزگاركردن لە فەرمانو نەهییەكانی پەروەردگار بەدیمەنو رواڵەت پەیڕەویان دەكردو لەناو دڵیاندا بڕوایان پێ نەبوو؟!

## چیرۆكی سەربڕینی مانگاكە

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ ۖ فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ إِنَّ ٱلْبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا ۚ قَالُوا۟ ٱلْـَٰٔنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ ۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا۟ يَفْعَلُونَ

﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَا كُنْتُمْ تَكْتُمُونَ (٧١) فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَى وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ (٧٣)﴾.

ئەمجار پەروەردگار رەوشتێکی تری جولەکەکان باس دەکا، ئەویش رەوشتی دەم درێــژیو چەقەچــەناویو رارایــیو دڵــەراوکێو بــڕوا نــەکردنو زۆر قولبوونــەوەو شیکردنەوەی نابەجێیە، بە هیچ شتێك بڕوا ناکەنو دڵیان ناو ناخواتەوە..

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُوا بَقَرَةً قَالُوا أَتَتَّخِذُنَا هُزُواً﴾. بیربکەنەوە ئەو کاتەی – کە بۆ دۆزینەوەی بکوژی کوژراوێك، چوونە لای موسا – ئەویش پێی گوتن: خودا فەرمانتان پێ دەکا: کە مانگایەك سەر ببڕن، وتیان ئایا تۆ گاڵتەمان پێ دەکەی؟ ئێمە بۆچی هاتوینە لاتو تۆ چیمان پێ دەڵێی؟ موسا وەڵامی دانەوە بەشێوەیەکی نەرمو نیان ﴿قَالَ أَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ﴾. وتی: پەنا دەگرم بە خودا کە من لەکاتی راگەیاندنی فەرمانی خودادا گاڵتە بازی بکەمو نەزانانە هەڵسو کەوت بنوێنم، کەی گاڵتەچێتی لەگەڵ پلەو پایەی پێغەمبەریدا لەگەڵ بەرپرسیارێتی مندا دەگونجێ؟! ئەمجار ﴿قَالُوا ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ﴾. وتیان: داوا لە خودات بکە پێمان بڵێو بۆمان روون بکاتەوە شێوەو چۆنیەتی ئەو مانگایە چۆن بێ ﴿قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لاَّ فَارِضٌ وَلاَ بِكْرٌ عَوَانٌ بَيْنَ ذَلِكَ﴾. دەفەرموێ: ئەو مانگایەی کە سەری دەبڕن دەبێ مانگایەکی نە پیر نەگەنج بێ، مانگایەکی تەمەن مامناوەندی بێ، ﴿فَافْعَلُواْ مَا تُؤْمَرونَ﴾. ئیتر چیدی لێی مەکۆڵنەوە ئەوەی پێتان گوترا بچن ئەنجامی بدەن، ئیتر لە جیاتی ئەوەی گوێرادێری ئامۆژگاریەکانی حەزرەتی موسا بکەن ﴿قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا﴾. وتیان: داوا لە خودا بکە پێمان بڵێ رەنگی مانگاکە چۆن بێ؟! ﴿قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَاء فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ النَّاظِرِينَ﴾. فەرمووی:

خودا دەفەرموێ ئەو مانگایە مانگایەکی زەردی زۆر زەرد بە جۆرێك كە هیچ جۆرە رەنگێكی تری تێکەڵاو نەبووبێ، جا پێویست بوو بەمەندە کۆڵیان بدایەوەو بەو وەصفانە مانگایەکیان دیاری بکردایە، بەڵام بەمەش وازیان نەهێنا ﴿قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ﴾. ئەمجارەش پرسیاری پێشویان دووبارە کردەوە، وتیان: داوا لە خودات بکە بە تەواوی شێوەو ڕوخساری مانگاکەمان بۆ روون بکاتەوە ﴿إِنَّ البَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا﴾. بێگومان مانگای تەمەن ناوەنجی رەنگ زەرد زۆرن، نازانین کامەیان هەڵبژێرین‌و سەری ببڕین ﴿وَإِنَّآ إِن شَاءَ اللَّهُ لَمُهْتَدُونَ﴾. ئێمەش پشت بە خودا ئەمجارە دەگەینە ئامانج‌و ئەو مانگایەمان دەست دەکەوێ، یان بکوژی کوژراوەکە دەدۆزینەوە ﴿قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لاَّ ذَلُولٌ تُثِيرُ الأَرْضَ﴾. وتی: خودا دەفەرموێ: ئەو مانگایە مانگایەکە جوتی پێ نەکراوە نیشانەی ئیش پێکردن‌و ماندوبوونی پێوە دیار نیە ﴿وَلاَ تَسْقِي الْحَرْثَ﴾. بەکارنەهێنراوە بۆ ئاو هەڵێنجان‌و ئاودانی زەوی‌و زار ﴿مُسَلَّمَةٌ﴾. هیچ عەیب‌و شوێنەواری کارپێکردنی پێوە دیار نییە ﴿لاَّ شِيَةَ فِيهَا﴾. زەردێکی پەتییە، پەڵەو خاڵی لە رەنگی تری پێوە دیار نییە ﴿قَالُواْ الآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ﴾. وتیان: ئێستا بەتەواوی شێوەو نیشانەی مانگاکەمان لا ئاشکرا بوو، هیچ لێڵییەکی تێدا نابینین... ئەمجار هەوڵیان داو گەڕان مانگایەکیان دۆزیەوە هەموو سیفەتەکانی تێدا بوو ﴿فَذَبَحُوهَا﴾. سەریان بڕی ﴿وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ﴾. خەریك بوون کارەکە ئەنجام نەدەن جا یان لەبەر گرانی نرخی مانگاکە، یان لە ترسی ئاشکرا بوونی تاوانی کوشتنی کوژراوەکە.

ڕاڤەکەرانی قورئان دەفەرموون: سەرەتای سەرگورشتەکە لە خوێندنەوەدا دواخراوە ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْساً﴾. بیربکەنەوە کاتێك پیاوێك – خزمێکی خۆتان کوشت ﴿فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا﴾. کەوتنە کێشەو نیزاعەوە، هەر یەکەتان تاوانی کوشتنەکەیان دەخستە سەر یەکێکی تر ﴿وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ﴾. خوداش ئەو مەبەستەی لەدڵتاندا بوو دەری دەخاو ناهێڵێ ئاوا بە شاردراوەیی بمێنێتەوە ﴿فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا﴾. وتمان: بەشێك لە لاشەی مانگا سەر بڕاوەکە بکێشن

بەجەستەی کوژراوەکەداو، کوژراو زینـدوو بـوەوەو دەسـت نیـشانی بکوژەکـەی خۆی کرد ﴿كَذَلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَى﴾. بەوێنەی ئەو کوژراوە: کە زینـدوومان کـردەوە هەر ئاواش ڕۆژی قیامەت مردوان زینـدوو دەکەینەوە ﴿وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾. نیشانەی خودایەتی خۆی‌و بەڵگە لەسەر بـەتوانایی‌و بەدەسـەڵاتی خـۆی پیـشانی ئێـوە دەدا، بەڵکوو ئێوە بیرێك لە خۆتان بکەنەوەو بەراوردی ئەوە بکەن کە کەسێك بتوانـێ مردوویـەك زینـدوو بکاتـەوە دەتوانـێ هـەموو مردوویـەك زینـدوو بکاتـەوە، کەچـی لەجیاتی پەند وەرگرتن‌و تەمێ بوون‌و گەڕانەوە بۆلای خودا زیـاتر پێتـان لێ هـەڵبڕی‌و دڵڕەق تر بوون.

## دڵ ڕەقی جولەکەکان

﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٧٤﴾﴾.

﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّن بَعْدِ ذَلِكَ﴾ دوای زینـدوو کردنـەوەی کوژراوەکە، یـان دوای پیشاندانی ئـەو هـەموو نیـشانانەی کـە خودایـەتی خـودا دەچەسـپێنن دڵتـان ڕەق بـوو، دڵتان ڕەش بوو هیچ ئامۆژگاری‌و بەراوردییەکی قبوڵ نەکرد ﴿فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾. دڵتـان وا ڕەش بـووە دەق دەڵێـی بـەردی ڕەق‌و تەقـە، پەنـدو ئامۆژگـاری خێـر هیچ کاریان تێناکا، بگرە لە هەندێ ڕووەوە دڵتان لـە بـەردیش ڕەق تـرە چـونکە ﴿وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الأَنْهَارُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاءُ﴾. بـەردی وا هەیـە درزو قەڵشتی زۆری تێدان، چۆماوی لێ هەڵدەقوڵێ، بەردی وا هەیە لە باری درێژی یـان

باری پانی درزێكی تێ دەبێ ئاوی لێ دەردێ، بەڵام دڵی ئەوان هەرگیز نەرم نابێ‌و دڵۆپێكی خێری لێ پەیدا نابێ ﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللّهِ﴾. بەردی وا هەیە لە ترسی خودا لەسەر كێوێك ڕا گلۆر دەبێتەوە، بەڵام دڵی ئەوان هەر تۆزقاڵێك ترسی خودای تێا نییە ﴿وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾. باش بزانن خودا بێئاگا نییە لەو كردارو گوفتارەی دەیكەن‌و لەو هەڵوێستانەی دەیان نوێنن.

## چاوەڕوان ناكرێ جولەكە بڕوا بە پێغەمبەری ئیسلام بكەن

﴿ أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا۟ لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوٓا۟ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمْ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٧٦﴾ أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٧﴾ وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّآ أَمَانِىَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٧٨﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَـٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَـٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ

لِيَشْتَرُواْ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾.

ئەمجار کە لە ئایەتی پێشودا بەو جۆرە دڵڕقی جولەکەکانی بەیان کردو ئەوەی چەسپاند: کە هەرگیزاو هەرگیز چاوەڕوانی چاکەیان لێ ناکرێ، روو دەکاتە موسوڵمانەکانو پێیان دەفەرموێ: ﴿أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُواْ لَكُمْ﴾. بۆچی موسوڵمانینە! بە تەمای ئەومن: کە ئەو جولەکە فێڵبازو دڵڕەقانە بڕوا بە ئایینەکەتان بکەنو موسوڵمان ببن؟! ﴿وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ﴾. لە کاتێکا کە کۆمەڵێك لە پێشینەکانیانو مالەکانیان ﴿يَسْمَعُونَ كَلاَمَ اللَّهِ﴾. فەرموودەی خودا – کە تەوراتە – دەیان بیستو فێری دەبوون ﴿ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ﴾. پاش تێگەیشتن ئەمجار دەستکارییان دەکرد بە پێی ئارەزووی خۆیان گۆڕانکاریان تێدا دەکرد ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾. ئەوانە دەشیانزانی کە ئەو گۆڕانکارییە شتێکی ناڕەوایە، جا کە ئەمە هەڵوێستی ناپاکانەیان بێ لەگەڵ پێغەمبەرو تەوەراتەکەی خۆیاندا! دەبێ لەگەڵ پێغەمبەری ئیسلامو قورئان، هەڵوێستیان چۆن بێ؟ بێگومان ئەوەی لە ئەوانە چاوەڕوان دەکرێ ئەوەیە کە هەرچی هێزو توانایان هەیە چی فرتو فێڵو تەڵەکەبازییان هەیە دەیخەنەکار بۆ بەرنگاری کردنی ئایینەکەتان، سەیر ئەوەیە جولەکە لەگەڵ ئەو هەموو خراپییەی کە هەیانە رییا بازو دووڕوو ناپاکیشن ﴿وَإِذَا لَقُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ قَالُواْ آمَنَّا﴾. کاتێ جولەکەکان تووشی کۆمەڵێك موسوڵمان دەبوون، دەیانگوت: بڕوامان هەیە کە ئێوە لەسەر حەقن (محمد) ئەو پێغەمبەرەیە کە تەورات مزگێنی پێداوە ﴿وَإِذَا خَلاَ بَعْضُهُمْ إِلَىَ بَعْضٍ﴾. ئەگەر برێکیان لەگەڵ هەندێکیان بەیەك بگەیشتنایەو کۆبونەوەیان لەگەڵ یەکتر بکردایە ﴿قَالُواْ﴾. خوێندەوارو مالەکانیان بە نەخوێندەوارەکانیان دەگوت: ﴿أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾. ئەوە بۆچی ئەو شتانەی کە خوا لە تەوراتا بە ئێوەی گوتووە دەچن بە

موسوڵمانەکانی دەڵێن؟! ئەو دەرگا زانینەی خودا بۆ ئێوەی کردۆتەوە موسوڵمانەکانی لێ ئاگادار دەکەنەوە، واتە: مەچن ئەو شتانەی کە خودا لە تەوراتدا بە ئێوەی گوتووە هاوڵانی (محمد)ی لێ ئاگادار بکەن ئەو ناونیشانەی کە لە تەوراتدا دەربارەی دوا پێغەمبەر هەیە بە موسوڵمانەکانی مەڵێن﴿لِيُحَآجُّوكُم بِهِ عِندَ رَبِّكُمْ﴾. بۆ ئەوەی نەتوانن دەمەدەمێتان لەگەڵ بکەنو بە تەوراتەکەی خۆتان بۆرتان بدەن، ئەو تەوراتەی کە لەلای خوداوە بۆتان هاتووە ﴿أَفَلاَ تَعْقِلُونَ﴾. ئەرێ بۆچی تێناگەنو عاقڵ نابن؟! ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە سروشتی جولەکە وەهایە: کە هەموو کات ئەو شتەی بە ڕواڵەت دەیڵێن، جیابێ لەوەی کە دەیشێرنەوە.. ئەوان بە خەڵك قسەیەك دەڵێن، لە ناو خۆشیاندا قسەیەکی تر دەڵێن: ئەمەش ئەوە دەچەسپێنێ کە ئەمانە بە تەواوی خودا نەناسن، ئەگینا ئەگەر بییان زانیایە کە خودا هەموو نهێنیو ئاشکرایەك دەزانێ دەگەییشتنە ئەو بڕوایە کە ئەوان بۆڕ دراونو بەڵگەیان لەسەر ڕاست کراوەتەوە، بۆیە خودا دەفەرموێ: ﴿أَوَلاَ يَعْلَمُونَ أَنَّ اللّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾. بۆچی ئەوان نازانن ئەوە کە خودا هەموو نهێنیو ئاشکرایەك دەزانێ؟ چی پەنهان ئەکەن چی ئاشکرا دەکەن خودا ئاگای لێیە، هەموو دوو ڕووییو فرتو فێڵو ناپاکییەکی لەگەڵ موسوڵمانانی دەکەن لای خودا گوم نابێ، جا کە ئەمە حاڵی خوێندەوارەکانیان بێو وا بیربکەنەوە ئەدی دەبێ بیرو بۆچوونی رەشە خەڵکەکەیان چۆن بێ؟!

ئەمجار دوای ئەم شیکردنەوە، پەروەردگار باسی ئەوە دەکات کە جولەکە دوو تاقمن دەستەیێکیان نەخوێندەوارو نا تێگەیشتوو هیچ نازاننو هیچ ئاگادارییەکیان دەربارەی ناوەرۆکی تەورات نییە، جگە لە هەندێ بیروڕای پڕوپوچ وەکوو ئەوە گوایە جولەکە گەلی هەڵبژاردەی خودانو هەرچی بیکەن خوا لێیان خۆش دەبێ؟

دەستەیەکی تریان مالەو خوێندەوارەکانیانن کە هەموو زۆرزانو فێڵبازو زمان لووسن، سوود لە نەخوێندەواریو گێلی دەستەی یەکەم وەردەگرن، بەدەم تەوراتەوە درۆ دەکەن، فەرموودەکانی دەگۆڕن، هەندێکی ماناکەی هەڵدەگێڕنەوە هەندێکی لێ ون

دەكەن، هەندێ جار دێن لەخۆیانەوە بۆ مەبەستی تایبەتی شت دەنووسنەوەو بەناوی تەوراتەوە بڵاوی دەكەنەوە!! بە ئارەزوی خۆیان گۆڕانكاری لە بەندەكانی تەوراتدا دەكەن، ئەوەتا لەم ئایەتەی دوایی دا وێنەی دەستەی یەكەممان بەم جۆرە بۆ دەكێشێو دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لاَ يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلاَّ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَظُنُّونَ﴾. واتە: دەستەیەك لەو جولەكانە بۆرە پیاوو نەخوێندەوارن، نە نووسین دەزانن نە خوێندنەوە، ئەوانە تەماشای تەورات ناكەن، ئەگەر تەماشاشی بكەن تێی ناگەن تا بزانن چی تێدایە، ئەوانە هیچ نازانن جگە لە هەندێ هیوای پڕو پووچ، وەكوو ئەوە: كە گوایە خودا خۆشی دەوێن، لە هەموو گوناهێكیان خۆش دەبێ، چی گوناهێ بكەن خودا لێیان دەبوورێ، لەم بیروبۆچوونەشدا هیچ بەڵگەیەكیان بەدەستەوە نییە جگە لە گومانێ بێ جێو وێ نەچوو.

ئێستاش برێ زڕە سەییدو كۆلكە شێخ هەن، پێیان وایە: ئەوانەی وەچەی پێغەمبەرن لەبەر خاتری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەگەر تاوانیش بكەن خودا لێیان خۆش دەبێ، تەنانەت ئەم بیروڕا نادروستانە ئەوەندەیان بانگەشە بۆ كراوە، كەڵەپیاوی وەكوو (سەیید ئەحمەدی نەقیب)یشی پێ كەوتۆتە هەڵەوە لە چامەیەكی دیوانەكەیدا ئەم ڕایەی دركاندووەو دەڵێ:

موحیبی فەخری عالەم ئالو بەیتی چۆن دەبوغزێنێ؟
وەرە (قل لا) بخوێنە لادە لەم تەسویلی شەیتانی
فەقەط وەك بولەهەب بێ كافری موطلەق ئەگەر نەتویست
نەبێ باكت لە باسو خواسی ڕۆژی حەشری جیسمانی
دەڵێی فیعلی دەبوغزێنم درۆیە چونكە قەط نابێ
خراپترین هەموو سەیید، بە كوردی جافی چۆچانی

بێگومان گومڕایی‌و سەر لێ شێوانی تەواو ئەوەیە کە کتێبی خودا هەڵەوگێڕ بە ڕەشە خەڵکەکە ڕابگەیەندرێ! دەقەکانی بەجۆرێك ڕاڤە بکرێن کە هەڵی نەگرن.. گرۆهە گومڕاکانی مێژوو دەستەو تاقمە سەر لێ شێواوەکانی ڕابوردوو، هەموویان بەهۆی ئەم مانا شێواندنە سەریان هەڵداوە، زوربەی کات هۆی گومڕابوونی جەماوەر دەست تێوەردان‌و مانا گۆڕینی فەرمانەکانی پەروەردگارە، وەکوو ئەوە زانا ئاینییەکان بێن بەهەوەسی خۆیان مانای دەقە ئاینییەکان بگۆڕن، یان شتێك بەدەم خوداوە هەڵبەستن: کە نەیفەرمووبێ، حوکمێك بدەن خودا پێی ڕازی نەبێ خۆیان شەرع دابنێن، دەی مالەکانی جولەکە قەشەکانی مەسیحی هەموو ئەم شتانەیان ئەنجام داوە، ئەم ئایەتەی کە دێ کردەوەیەکی ئەو مالانە ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَذَا مِنْ عِندِ اللَّهِ﴾ سزای بەئێش یان شیوی (وەیل): کە شیوێکە لەناو دۆزەخدا، بۆ ئەو زانا جولەکانەیە: کە تەورات دەگۆڕن‌و بەدەستی خۆیان ئەو تەوراتە گۆڕدراوە دەنووسنەوە، ئەمجار دەڵێن: ئەمە لەلای خوداوە هاتووە، بۆچی؟ ﴿لِيَشْتَرُواْ بِهِ ثَمَناً قَلِيلاً﴾ بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوتێکی کەم‌و بێ بایەخ، کە لەو نەخوێندەوارو بۆرە پیاوانە بە چاوو ڕاو وەری دەگرن، ئەمجارەش ﴿فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ شیوی (وەیل) کە شوێنێکی ناخۆشی ناو دۆزەخە ماڵی ئەوانە، یان هاوار بۆیان لەو سزا سەختەی بۆیان ئامادەکراوە، لەسەر کردەوەی ناپەسەندیان: کە نووسینەوەی شتی نابەجێ‌و ناڕاستە، دەشڵێن ئەمە فەرموودەی خوایە ﴿وَوَيْلٌ لَّهُمْ مِّمَّا يَكْسِبُونَ﴾ جارێکی تریش سزای سەخت بۆیان لەسەر ئەو دەستکەوتە کەمە بێ بایەخەی لەم ڕێگایەوە بەدەستی دێنن: کە بریتییە لە بەرتیل وەرگرتن‌و دەست برینی ڕەشە خەڵکەکەو لەخشتە بردنیان.

## گۆڕینی دەقەكانی تەورات لەلایەن مامە جولەكەكانەوە بوختانو درۆو دەلەسەیە

﴿وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً ۚ قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ ۖ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨٢﴾﴾.

ئەمجار پەروەردگار بڕێ لەو بۆچوونە پڕو پووچانەی كە زاناكانی نەتەوەی ئیسرائیل دەیاننوسییەوە بەناوی تەوراتەوە بڵاویان دەكردەوە ریزدەكاو دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلاَّ أَيَّاماً مَّعْدُودَةً﴾. دەیانگوت: بەس تەنها چەند ڕۆژێك بە ئاگر سزا دەدرێین، دوایی ڕزگارمان دەبێ ﴿قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ اللّهِ عَهْداً فَلَن يُخْلِفَ اللّهُ عَهْدَهُ﴾. ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: ئایا ئێوە وادەو پەیمانتان لە خودا وەرگرتووە؟! خۆ ئەگەر راست بكەن بەڵێنتان وەرگرتبێ ئەوە بێگومان خودا پەیمانی خۆی ناشكێنێ: بەڵام شتی وا نەبووەو بەڵێنی واتان وەرنەگرتووە، ﴿أَمْ تَقُولُونَ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾. بەڵكوو ئێوە بەدەم خوداوە شتی وا هەڵدەبەستن: كە نازانن چەند زیان بەخشەو چەند تاوانێكی گەورەیە! بێگومان جولەكەكان زۆر ئازاو دەست بەكارن بۆ گۆڕانكاری كردن لە تەوراتداو هەڵگێڕانەوەی ماناكانی بەمەبەستی تایبەتی خۆیان بۆ ئەنجامدانی

تاوانکاریو فرتو فێڵو دڵ پیسیو چاو ڕاوو، بۆ بەربەرەکانی کردنی پێغەمبەران کەم وێنەن، هەر ئەم ڕەوشتە ناشیرینانەشیان کە بووەتە هۆی دروست بوونی ئەو بیرو باوەڕە پڕوپووچانەیان.

ئەمجار پەروەردگار چۆنیەتیو ڕاستیەکە بەم دوو ئایەتە ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿بَلَى مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِيئَتُهُ فَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾. واتە: وەکوو ئێوە دەڵێن: وانیە بەڵکوو هەر کەسێك گوناهێکی گەورە بکاو تۆبەی لێ نەکاو کرداری چاکەی نەبێ وە لە هەموو لایەکەوە گوناه دەوری دابێ هەرچی کردوویەتی تاوانبێ، ئەوە دۆزەخیەو ڕۆژی قیامەت دەخرێتە ناو جەهەننەمەوەو هەتا هەتایە تێیدا دەمێنێتەوە، ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾. ئەوانەی بڕوایان بە خودا هەیە، ئیمانیان بە پێغەمبەر هێناوەو پەیڕەوی فەرمانەکانی کتێبی خودا دەکەن، لەهەمان کاتیشا کرداریان باشەو ئەوانە بەهەشتینو لە بەهەشتا هەتا هەتایە دەمێننەوە.

لەم شەش ئایەتەی ڕابوردوودا ئەوەمان بۆ ڕوون بووەوە کە ئەم جولەکانە بە گشتی بیروباوەڕێکیان هەیە پێیان وایە چەن ڕۆژێکی کەم نەبێ ناخرێنە ناو دۆزەخەوە، جا بەهۆی ئەم بیروباوەڕیانەوە زۆربەیان هیوای پڕوپووچ سواری دڵو دەرونیان بووە، ئەوانە شوێن زانا ئاینیەکانیان کەوتوون، زاناکانیشیان درۆزنو دووڕوون، قسە گۆڕو سەر لێ شێواون، تەورات دەگۆڕن، لێی زیاد دەکەن، لێی ون دەکەن، مانای نەشیاو نەگونجاو لە تەورات دەدەنەوە، جا خەڵکێك ئەمە هەڵسو کەوتی بێ ئێوە بە هیوای ئیمان هێنانیان مەبن.

## ژێوان بوونەوەی جولەكەكان لە وادەو بەڵێنەكانیان

﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ﴿٨٣﴾ ﴾.

ئەمجار پاش ئەوەی هەڵوێستی جولەكەكانی دەربارەی ئیمان روون كردەوە، سیاقی ئایەتەكان روو دەكەنە ئەوە، كە بەڵگەیان لەسەر بێننەوەو بۆڕیان بداو ئەو بیرو بۆچوونەیان: كە گوایە بڕواهێنانیان بە تەورات بەسیانەو لەسزا رزگاریان دەبێ پووچەڵ بكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ ئەوە بیری خۆتان بێننەوە: كە وادەو بەڵێنمان لە نەوەی ئیسرائیل وەرگرتو پێمان گوتن: ﴿لاَ تَعْبُدُونَ إِلاَّ اللّهَ﴾ جگە لەخودا كەسی تر مەپەرستن، بەندایەتیو گەردن كەچیەتی بەس بۆ ئەو بكەن ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً﴾ لەگەڵ باوكو دایكی خۆتاندا چاكەكاربن ﴿وَذِي الْقُرْبَى﴾ یارمەتیو هاریكاری خزمو كەسو كارتان بدەن ﴿وَالْيَتَامَى﴾ بەزمییتان بە هەتیواندا بێتەوە، دەستی یارمەتیو سۆزیان بۆ درێژ بكەن ﴿وَالْمَسَاكِينِ﴾ چاوتان لە فەقیرو هەژاران بێو داڵدەیان بدەن، ئەوجا ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْناً﴾ قسەی جوانو شیرین بە خەڵك بڵێنو بەباشی لەگەڵیاندا بجوڵێنەوە.

پەروەردگار لەم ئایەتەدا ئەوە دێنێتەوە یادی نەوەی ئیسرائیل كە فەرمانی پێ كردن بەو فەرمانانەی كە لەوەپێش باسكران، عەهدو پەیمانی جەخت لەسەر كراوی لێ وەرگرتن، كەچی ئەوان پشتیان لێ هەڵكردو ئەو هەموو فەرمانو پەیمانانەیان پاش

گوێ خستن‌و بە ئەنقەست روویان لێ وەرگێڕان: بۆ خۆشیان باش دەزانن کە سەرپێچی دەکەن...

لە ئایەتەکەدا پەروەردگار ئەوە دووپات دەکاتەوە: کە فەرمانی پێ کردوون هەر خودا بپەرستن‌و کەس نەکەن بە هاوشان‌و هاوبەشی، ئەم فەرمانە فەرمانێکی گشتییەو بە هەموو کەسی فەرمووە هەر بۆ ئەو عیبادەت‌و خودا پەرستییەش دروستی کردوون، پێویستە هەموو کەسێك پابەندی بێ، واتە: لە ئایەتەکەدا ئەوە روون کراوەتەوە کە ئادەمیزاد حەقی خودای بەسەرەوەیە کە یەکتا پەرستی بکاو کەس نەکا بە هاوبەشی یەزدان، ئەمیش حەقێکە لەزوور هەموو حەقێکەوەیە، ئەمجار مافی ئادەمیزادانیشی لەسەرە، لەپێش هەموو حەقێك حەقی باوك‌و دایکە، ئەمجار خزم‌و کەس‌و کارە، مافی هەتیوو هەژارە، ئەوانە هەموو پێویستە چاکەیان لەگەڵدا بکرێ، ئەمجار پێویستە لەگەڵ خەڵکیدا بەگشتی هەڵس‌و کەوتی مرۆڤانە بێ‌و نەرم‌و نیان‌و قسە خۆش بێ، هاریکارو خۆنەویست بێ.

شێخ حەسەنی بەصری دەفەرموێ: قسەی جوان بریتییە لە فەرمان کردن بە چاکەو نەی کردن لە خراپە، بار قووڵ‌و لەسەرەخۆ بێ، لێبوردوو بێ، ئامۆژگاری خەڵکی بکا بۆ چاکە کردن. بێگومان شتێکی گونجاو بوو: کە دوا بەدوای فەرمان کردن بە کردار چاکی فەرمان بکا بەگوفتار چاکی، هەتاکوو هەردوو لایەنی چاکە – بەکردارو گوفتارەوە – یەك بگرنەوە ئەمجار پاش فەرمان کردن بە خودا پەرستی‌و چاکەکردن لەگەڵ ئادەمیزادا، بە کورتی برێ لایەنی خواپەرستی‌و چاکەکردنی تری بۆ روون کردنەوەو پێی فەرموون ﴿وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ﴾. نوێژ بکەن‌و پێویستیاتی جێ بەجێ بکەن، چونکە نوێژ دڵ‌و دەروون پاك دەکاتەوە، رەوشتی ناشیرین‌و پەستی تێدا ناهێڵێ، بە رەوشتی جوان‌و ئەخلاقی بەرز ئارایشی دەدا، پوختەی نوێژیش بریتیە لە ئیخلاص بۆ خودا، گەردن کەچی بۆ گەورەیی ئەو، هەرکاتێ نوێژ ئەم لایەنە رۆحییەی تێدا نەبوو دەبێتە رێ‌و رەسمێکی رواڵەتکاری‌و تۆزقاڵێك سوودی نابێ!! ﴿وَآتُواْ الزَّكَاةَ﴾ زەکات لە ماڵ‌و دارایی خۆتان دەربکەن‌و مافی فەقیرو هەژاران پێشێل مەکەن: کەچی

ئێوەی جوولەکە لەجیاتی ئەوەی پابەندی ئامۆژگاریەکان بن ﴿ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ﴾ پاش ئەم هەموو فەرمانو ئامۆژگاری کردنە ئێوە پشتتان هەڵکردو گوێتان بەو هەموو عەهدو پەیمانانە نەداو هەمووتان هەڵوەشاندنەوە ﴿إِلاَّ قَلِيلاً مِّنكُمْ﴾ چەند کەسێکی کەمتان نەبێ وەکوو عەبدوڵڵای کوڕی سەلامو هاوڕێکانی ئەوان پابەندی ئەو پەیمانانە بوونو پەیڕەوی تەوراتیان کردو کاتێکیش ئاینی ئیسلام هات یەکسەر ئیمانیان بە پێغەمبەری ئیسلام هێنا ﴿وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ﴾ ئێوە ئەی نەوەی ئیسرائیل! کە پشتتان هەڵکردو ئەو هەموو پەیمانو بەڵێنانەتان پێشێل کردن لە ناخەوە بڕیاری ئەوەشتاندا هەتا هەتایە لەبیر خۆتانی بەرنەوەو جارێکی تر لەم هەڵوێستەی خۆتان ژێوان نەبنەوە! بێگومان بڕێ لەو پشت هەڵکردنو لاساریی‌و سەرپێچی کردنەیان ئەوەبوو کە ماڵەکانیان کردبوون بە خاوەن دەسەڵاتی تەشریعی: ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیان یاسای ژیانیان بۆ دادەنان، شتیان بۆ حەڵاڵو حەرام دەکردن، زیادو کەمیان لە نوێژو ڕۆژوو خوا پەرستیدا بۆ دیاری دەکردن، خۆیان لێ کردبوون بە هاوشانی خوداو شەریعەتیان بۆ دادەنان، سەریان لە گەلەکەیان شێواندو ماڵوێرانی دنیاو قیامەتیان کردن: لەلایەکی ترەوە رژدیو بەخیلییان دەکردلە بەخشینی ماڵو دارایی‌دا، دەست قوچاوو چاو برسیو دڵو دەروون هەژار بوون، بژێوی خزمو کەسو کاریان نەدەدا، زەکاتی شەرعی ماڵو دارایی خۆیان دەرنەدەکردو نەیان دەدا بە هەژارانو ئەوانەی شیاوی زەکات پێدانن، وازیان لە فەرمان بە چاکەو نەی کردن لەخراپە هێناو، بەهەموو جۆرێك سوکایەتیان بەڕێو رەسمی ئاینی دەکرد.

## بڕێ دیاردەی پابەند نەبوونی جولەکەکان بە وادەو بەڵێنەکانیان

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٨٤﴾ ثُمَّ أَنتُمْ

هَـٰٓؤُلَآءِ تَقۡتُلُونَ أَنفُسَكُمۡ وَتُخۡرِجُونَ فَرِيقٗا مِّنكُم مِّن دِيَـٰرِهِمۡ تَظَـٰهَرُونَ عَلَيۡهِم بِٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ وَإِن يَأۡتُوكُمۡ أُسَـٰرَىٰ تُفَـٰدُوهُمۡ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيۡكُمۡ إِخۡرَاجُهُمۡۚ أَفَتُؤۡمِنُونَ بِبَعۡضِ ٱلۡكِتَـٰبِ وَتَكۡفُرُونَ بِبَعۡضٖۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفۡعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ إِلَّا خِزۡيٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَـٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلۡعَذَابِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٨٥﴾ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٨٦﴾ ﴾.

**جولەکەکان هەمیشە شەڕەنگێزو خوێن ڕێژبوون، ئەم دیاردەیە تایبەتمەندییەکە بەوانەوە، هەرگیز لێیان نابێتەوە، بۆیە پەروەردگار خیطابیان ئاڕاستە دەکاو دەفەرموێ:**

**﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ لاَ تَسْفِكُونَ دِمَاءكُمْ﴾ بیر لەوە بکەنەوە ئەوکاتەی کە وەعدو پەیمانمان لێ وەرگرتن: کە خوێنی یەکتری نەڕێژن ﴿وَلاَ تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَارِكُمْ﴾ کەس کەس لە ماڵی خۆی وەدەرنەنێ، کەس بەسەر کەسدا خۆی بانەدا ﴿ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ﴾ ئەمجار ئێوە بۆ خۆتان پێتان لێناو بەقسە پابەندی بوون، کەچی بەکردەوە سەرپێچی لێ دەکەن‌و پابەندی هیچ وەعدو پەیمانێك نابن ئێوە بۆخۆتان**

دەدانتان بەو وەعدو پەیمانەدا ناوە بۆخۆتان شایەتی لەخۆتان دەدەن: ﴿ثُمَّ أَنتُمْ هَـؤُلاء تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقاً مِّنكُم مِّن دِيَارِهِمْ﴾ لەسەردەمی سەرەتای چوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆ مەدینە لەشاری مەدینەدا دوو تاقم جولەکە هەبوون، بەشێکیان (بنو النضير) بوون هاوپەیمانی هۆزی خەزرەج بوون.. بەشی دووەمیان بریتی بوون لە (بنو قینقاع)و (بنو قريظة) ئەمانیش هاوپەیمانی هۆزی ئەوس بوون. جا کە هۆزی ئەوس‌و خەزرەج شەڕیان دەبوو (بنو قینقاع)و (بنو قريظة) لەگەڵ هۆزی خەزرەج خۆیان ئامادە دەکردو دەچوونە شەڕ (بنو النضير)یش لەگەڵ هۆزی ئەوس دەچوونە شەڕ، هەریەکێ لەم جولەکانە شەڕی لەگەڵ براکەی خۆی‌و نەتەوەکەی خۆی دەکردو خوێنی یەکتریان دەڕشت، تەوراتیان ئاگا لێ بوو، دەیانزانی چی تێدایەو چی پێویستە بیکەن‌و چی نەکەن، هۆزی ئەوس‌و خەزرەجیش کافرو خوانەناس بوون نەیان دەزانی بەهەشت‌و دۆزەخ چییەو چی نییە، قەبرو قیامەت هەیە یان نیە، حەرام چیەو حەلاڵ چیە: جولەکە جولەکەی دەکوشت ماڵی یەکتریان داگیردەکرد، یەکتریان وەدەر دەنا، ماڵی یەکتریان تالان دەکرد، خانووی یەکتریان دەڕوخاندن، ئەمەش بەپێی یاسای تەورات حەرام بوو، ئەمجار کە شەڕ دەوەستا بارتەقای جولەکەکانیان دەدا، هەر ئەو جولەکانەی کە لەگەڵ لایەنە سەرکەوتووەکە بوون‌و هاوپەیمان بوون، دەهاتن بە پارەی خۆیان ئەو جولەکە دیلانەیان رزگار دەکردن، عەرەبەکان گاڵتەیان پێ دەکردن‌و پێیان دەگوتن: چۆن شەڕیان لەگەڵ دەکەن‌و کەچی دوایی فیدیەیان بۆ دەدەن؟! دەیانگوت: تەورات فەرمانمان پێ دەکا کە فیدیەیان بۆ بدەین، ئەمە یاسای ئایینی خۆمانە، پێویستە فیدیە بدەین بۆ رزگارکردنی دیل، نەهێڵین بەدیلی بمێننەوە. شەڕکردنیشمان لێ حەرامە، بەڵام بەلامانەوە عەیبە هاوپەیمانەکانمان تێ بشکێن، ﴿تَظَاهَرُونَ عَلَيْهِم بِالإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ یارمەتی هاوپەیمانەکانتان دەدەن دژی یەکتری بۆ ئەنجام دانی زوڵم‌و ستەم ﴿وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَارَى تُفَادُوهُمْ﴾ ئەگەر یەکێ لەو جولەکانە بەدیلی گیرا پیتاکی بۆ

دەكەن‌و پارەی بۆ كۆدەكەنەوەو فیدیەی بۆ دەدەن: تا لە دیلیەتی رزگاری بكەن ﴿وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ﴾ لەكاتێكا حەرامە كە شەڕیان لەگەڵ بكەن‌و دەریان بكەن، واتە: چۆن ئێوە شەڕ لەگەڵ كردن‌و ماڵ وێران كردن‌و دەركردنتان بەلاوە ڕەوایە. كەچی بەلاتانەوە ڕەوا نیە كە ئەو جولەكەیە بەدیلی لای دوژمنەكەی بمێنێتەوە؟! ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ﴾ ئێوە چۆن بڕواتان بە بڕێ حوكمی تەورات هەیەو بڕواتان بە بڕێكی تری نیە! چۆن پێتان وایە كە دەبێ فیدیە بۆ جولەكەی دیل بدەن، پێشتان وایە كە شەڕكردن لەگەڵ هەمان ئەو جولەكانەدا كارێكی ڕەوایەو ماڵ وێران كردنیان‌و دەربەدەر كردنیان كارێكی ئاساییە! ئەمە چەندی بەچەندە؟ ﴿فَمَا جَزَاء مَن يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنكُمْ إِلاَّ خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ هەركەسێك لەمئێوە ئاوا بڕوای بە بڕێك ئەحكامی تەورات هەبێ‌و بڕێ ئەحكامیشی فەرامۆش بكاو بڕوای پێ نەبێ، ئەوە لەژیانی دونیادا ریسوایی‌و سەر شۆڕی بەسەردا دێ، هەمیشە ژێر دەستەو چەوساوە دەبێ ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ﴾ ڕۆژی قیامەتیش دەخرێنە كوشندەترین سزای دۆزەخەوە. مێژووش شاهیدە هەر گەل‌و هۆزێك لە فەرمانی خودا هەڵگەڕێتەوەو سەرپێچی بكا ئەركەكانی ئایین پاش گوێ بخا، بناغەی كۆمەڵایەتییان شەق دەبێ‌و یەكیەتییان نامێنێ‌و پەراگەندە دەبن ڕەوشت‌و ئەخلاقیان دەشێوێ‌و تووشی زەلیلی‌و ریسوایی دەبن‌و دەبنە پەندی زەمانە ﴿وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ هیچ كاتێ خودا بێ ئاگا نییەو نابێ لەو كردارانەی دەیانكەن‌و لەو هەڵوێستانەی دەیان نوێنن: زۆر دادوەرانە سزاتان دەداتەوە هیچی لێ گوم نابێ! ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُاْ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالآَخِرَةِ﴾ ئەوانەی باس كران‌و ئەو هەموو سەرپێچی‌و تاوانەیان هەیە، ئەو جولەكانەن كە لەجیاتی ژیانی قیامەت ژیانی دونیایان هەڵبژاردووەو وازیان لە خۆشبەختی قیامەت هێناوە، بۆ ژیانێكی كورتی دونیای پڕوپووچ، بۆیە ئەوانە بە توندی سزا دەدرێن ﴿فَلاَ يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ﴾ ئێش‌و ئازاریان لێ سووك ناكرێ ساتە وەختێكیش سزایان لەكۆڵ ناكەوێ لە دونیاشدا سوكایەتییان پێ دەكرێ‌و سەرانەیان لێ

دەسێنرێ ﴿وَلاَ هُمْ يُنصَرُونَ﴾ كەس نییە یارمەتیان بداو لەو سزا سەختە رزگاریان بكا، یان سوكایەتیو ریسواییان لێ دوور بخاتەوە، سەرانەكەیان بۆ بدا.

## هەڵوێستی جولەكەكان بەرامبەر بە پێغەمبەرانو كتێبە ئاسمانییەكان

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَـٰبَ وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ ۖ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَـٰتِ وَأَيَّدْنَـٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴿٨٧﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَـٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾.

جولەكە هەمیشە دڵڕەقو پارە پەرست بوون، ئارمزۆبازو خۆپەرستن، بۆیە پەروەردگار پێغەمبەرانی یەك لەدوای یەك بۆ سەر ناردوونو هەڕەشەی لێ كردوون، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا زوو زوو لە ئایین لایان داوەو شەریعەتی خودایان گۆڕیوە، شوێن هەواو هەوەسی خۆیان كەوتوون.

﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ﴾ بێگومان موسامان کردە پێغەمبەری نەوەی ئیسرائیلو تەوراتمان بۆ نارد، هەموو یاساو نیظامێکی ژیانی دونیایی خودا ویستی تێدا بوو بەرنامەی خۆشبەختی قیامەتی لەخۆ گرتبوو ﴿وَقَفَّيْنَا مِن بَعْدِهِ بِالرُّسُلِ﴾ هەر لەدوای لەدونیا دەرچوونی موسا چەند پێغەمبەری ترمان بەشوێن موسادا ناردن، زۆر پێغەمبەرمان ناردنە سەر نەوەی ئیسرائیل لەوانە یوشعو حەسقیلو ئیلیاسو ئەلیەسەعو یونوسو زەکەریاو یەحیاو هی تریش ﴿وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ﴾ بەتایبەتی عیسای کوڕی مەریەم کە کردمانە پێغەمبەرو نیشانەی پێغەمبەرایەتی ئاشکرامان دایە، زۆر موعجیزەی سەر سوڕهێنەرمان لەسەر دەستی ئاشکرا کردن، تا ببنە بەڵگە لەسەر راستی پێغەمبەرایەتیەکەی وەکوو: زیندوو کردنەوەی مردوو چاك کردنەوەی لاڵو بەڵەكو نەخۆشی تریش... هەروەها هەواڵدانی نهێنی داهاتوو زۆر هەواڵی رووداوی غەیبی بە گەلەکەی گەیاندو راست دەرچوون ﴿وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ﴾ نیشانەی پێغەمبەرایەتیو راستی بانگەوازییەکەیمان بە فریشتەی خۆمان کە (جوبرائیل)ە بەهیز کرد، بەتەواوی پاڵپشتیمان کرد. ئەی نەوەی ئیسرائیل ئەوە ئێمە ئەو هەموو پێغەمبەرانەمان بۆ ناردوونو ئەو هەموو موعجیزەو بەڵگەیەمان لەسەر دەستی ئەوان دەرخست، کەچی ئێوە نایەنە سەر رێگای راست!!

بێگومان جولەکەکان هۆی موسوڵمان نەبوونی خۆیانیان بەوە پاساو دەدایەوە کە تەعلیماتی پێغەمبەرەکانیان جێبەجێ دەکەن، پەیڕەوی پێغەمبەرەکانیان دەکەن، جا لێرەدا قورئان پەردە لەسەر رووی رەشو بەد روخساریان لادەداو هەڵوێستو چۆنیەتیان دەردەخا، ئەوەیان لێ ئاشکرا دەکا کە هەرکاتێ پێغەمبەرێك نێردرابێتە سەریانو پەیامەکەی بەهەوەسی ئەوان نەبووبێ ئەوە بە ئەوپەڕی درندەییو ناپیاوییەوە بەرەنگاری بوونەوە دەفەرموێ: ﴿أَفَكُلَّمَا جَاءَكُمْ رَسُولٌ بِمَا لاَ تَهْوَى أَنفُسُكُمُ﴾ ئەی نەوەی ئیسرائیل ئێوە خووتان وا پێوە گرتووە هەرکاتێ پێغەمبەرێك هاتە سەرتانو هاتنەکەی بە گوێرەی ویستو ئارەزۆی ئێوە نەبوو ﴿اسْتَكْبَرْتُمْ﴾ لووت

بەرزیی دەنوێنن‌و پشت هەڵدەکەن‌و دژیان دەوەستن ﴿فَفَرِيقاً كَذَّبْتُمْ﴾ کۆمەڵێکیان بەدرۆ دەخەنەوە، بڕوایان پێ ناکەن ﴿وَفَرِيقاً تَقْتُلُونَ﴾ تاقمێکیان دەکوژن‌و قەڵاچۆیان دەکەن‌و بەوپەڕی دڕندەییەوە شەهیدیان دەکەن، تەنانەت ئێستا هەوڵی ئەوەتانە حەزرەتی (محمد) شەهید بکەن، خۆ ئەگەر پارێزگاریی‌و چاودێریی ئێمە نەبێ فرسەتی لێ دێنن‌و لەناوی دەبەن، وەکوو چۆن سیحرتان لێ کردو گۆشتی بەرخەکەتان بۆ ژەهراوی کرد! ئەمجار پەروەردگار هەواڵی جولەکەکانی سەردەمی ئیسلام بە حەزرەتی (محمد) (دروودی خوای لەسەر بێ) دەگەیەنێ‌و چۆنیەتی گومراییەکەیان ئاشکرا دەکات، لەوەدا کە هەر لەسەر داب‌و نەریتی رابردوویان دەڕۆن‌و هەمان سەر ڕەقی‌و لاسایی ئەوان پەیڕەو دەکەن، بە هیچ جۆرێك نایەنە سەر رێگای راست‌و دەرکەوتووە کە جولەکە بە سروشت جێی متمانە نین‌و پشتیان پێ نابەسترێ‌و هەرگیز بەڵێن‌و پەیمانیان نیە.

﴿وَقَالُواْ قُلُوبُنَا غُلْفٌ﴾ دەڵێن: دڵمان لەناو پەردەدایەو داپۆشراوە، هیچ شتێ لەو قسانەی (محمد) دەیانڵێ تێی ناچێ‌و هیچ حاڵی نابین، با چیتر خۆی لەگەڵ ئێمە ماندوو نەکاو وازمان لێ بێنێ، مەبەستیان ئەوەیە پێغەمبەر نائومێد بکەن لەوە کە چاوەڕوانی ئیمان هێنانی ئەوان بێ، واتە: دڵەکانیان بەشێوەیەکی سروشتی وا دروست بوون کە ئەو جۆرە قسانەی پێغەمبەر وەرنەگرن بە پەردەیەکی ئەستوور ملەمایان لێ براوە ﴿بَل لَّعَنَهُمُ اللَّه بِكُفْرِهِمْ﴾. پەروەردگار بە درۆیان دەخاتەوە دەفەرموێ: راست ناکەن دڵەکانیان وا دروست نەکراون کە حەق وەرنەگرن، بەڵکوو کە نەرم نابن‌و حەق نابیستن بە هۆی ئەوەوە کە کافر بوون‌و بە ئەنقەست لە رێبازی راست‌و رەوان لا دەدەن، رێگای گومراییان گرتۆتە بەرو بە ویستی خۆیان لە ئاستی راستی‌و حەقدا خۆیان کەڕ کردووە، وازیان لە تێفکرین‌و گوێ ڕاگرتن هێناوە، بە ئەنقەست دڵی خۆیان لە کار خستووە ﴿فَقَلِيلاً مَّا يُؤْمِنُونَ﴾. بڕوایەکی کەمیان هەیە بڕوا بە هەندێ ئەحکام‌و ئامۆژگاری تەورات دەکەن، بڕوا بە هەندێکی ناکەن، یان ئەو جولەکانە کەمیان بڕوا بە پێغەمبەر دەکەن.

بـڕێ ڕاڤەکـەرانی قورئـان دەڵـێن: وشـەی (غلـف) سـوك کردنـی وشـەیەکە لـە (غلف)ەوە وەرگیراوە، کە کۆی (غلاف)ە واتـە: دڵمـان بۆتـە کەشکۆڵو تورەکەی زانـین، پڕە لە گەوهەری عیلمو زانست، ئیتر پێویستیمان بە زانیاری تر نیـە، ئـیتر چ پێویـست دەکا (محمد) خۆمان پێوە ماندوو بکا؟؟

پـێش هـاتنی ئیسلام جولەکـەکان ژێـر دەسـتەی عەرەبـەکان بـوون، بـە تایبـەتی جولەکـەکانی مەدینـە، جـا هـەموو کاتـێ خۆیـان بـەوە هەڵدەنایـەوە، دەیـانگوت: پێغەمبەری ئاخر زەمان دێ، ئێمە نیشانەکانی دەزانینو لە کتێبی ئێمەدا باسی کـراوە، هەر کە هات، پێش هەموو کەس ئیمانی پێ دێنین، کەچی ﴿وَلَمَّا جَاءهُمْ كِتَابٌ مِّنْ عِندِ اللّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ﴾. کاتێ ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوان کراوە هاتو قورئانیـان لەلایـەن خواوە بۆ هاتو بڕواکەریش بوو بۆ ئەو کتێبەی کە بە دەستیانەوە بـوو ﴿وَكَـانُواْ مِـن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾. لە پـێش هـاتنی پێغەمبـەرو قورئـان هەمیـشە داوای سەرکەوتنو زاڵبونیان دەکرد بەسەر کافرەکانـدا، دەیـانگوت: خودایـە سـەرمان بخـە بـە ناردنی ئەو پێغەمبەرەی کە باش دەیناسین، کـە (محمـد)ە ﴿فَلَمَّـا جَـاءهُم مَّـا عَرَفُـواْ﴾. کەچی کە (محمد) هات بۆ سەریانو بانگەوازی کردن بۆ موسوڵمان بـوون ﴿كَفَرُواْ بِهِ﴾. پێی کافر بوونو بڕوایان پێ نەکرد لەبەر ملهوڕیو حەسوودیو تـەماعی سـەرکردەیی، بەڵێنـەکانی پێـشوویان لـە بـیر خۆیـان بـردەوە سەرپێـچی فـەرمانی خودایـان کـردو ئیمانیان بـە پێغەمبـەری ئیـسلامو پەیامەکـەی نـەهێنا ﴿فَلَعْنَـةُ اللَّـه عَلَـى الْكَـافِرِينَ﴾. نـەفرینی خـودا لەسـەر بـێ بڕوایـان بـێ، لەسـەر ئـەو جولەکانـە بـێ کـە بڕوایـان بـە پێغەمبەری ئیسلام نەکرد.

## بڕوانەكردنى جولەكەكان بە قورئانو پێغەمبەر كوژییان لە مێژوودا

﴿بِئْسَمَا اشْتَرَوْا بِهِ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ ۖ فَبَاءُوا بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ۚ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ (٩٠) وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُوا بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا نُؤْمِنُ بِمَا أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَاءَهُ وَهُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ ۗ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنبِيَاءَ اللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (٩١)﴾.

جولەكەكانى هاوچەرخى پێغەمبەر (دروودى خواى لەسەر بێ) دەيانزانى كە حەزرەتى (محمد) ئەو پێغەمبەرەيە كە لە تەوراتدا مژدە بە هاتنى دراوە، بەڵام لەبەر حەسوودىو سەر ڕەقى خۆيان ئيمانيان پێ نەهێنا، بۆيە پەروەردگار سەرزەنشتيان دەكاو دەفەرموێ:

﴿بِئْسَمَا اشْتَرَوْاْ بِهِ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُواْ بِمَا أَنزَلَ اللّهُ﴾. بەڕاستى شتێكى خراپو بەد بوو ئەوە كە نەفسى خۆيانيان پێ فرۆشت كە بڕوايان نەكرد بەو قورئانەى خودا بۆ پێغەمبەرى ناردبوو ﴿بَغْياً﴾. لەبەر حەسوودىو هەڵپە كردن بۆ وەدەستهێنانى سەركردايەتى كە ناگونجێ بياندرێتىو شياوى نين.. حەسوودى ئەوەيان دەبردو داخى ئەوەيان دەخوارد ﴿أَن يُنَزِّلُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ عَلَى مَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ﴾. كە خودا بە

فەضلو گەورەیی خۆی سروش بنێرێتە خوار بۆ سەر کەسێك کە هەڵیبژێری بۆ پێغەمبەرایەتی. ئەوەیان پێ ناخۆش بوو: کە پەروەردگار بەندەی خۆی (محمد) هەڵبژاردووە بۆ پێغەمبەرایەتی، ڕقیان لەوە بوو کە خودا بەندەیەکی ناجولەکەی هەڵبژاردووە بۆ ئەرکی گەیاندنی پەیامەکەی، چونکە ئەوان پێیان وابوو ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوان کراوە دەبێ لە نەوەی ئیسحاق بێ، وە خێڵی جولەکە بێ، کە وا دەرنەچوو، ئیتر پشتیان هەڵکردوو بڕوایان پێ نەکرد، ﴿فَبَآؤُواْ بِغَضَبٍ عَلَى غَضَبٍ﴾. گەڕانەوە بە خەشمی خوداوە نەوەی لە نەم سەرپێچی کردنە دستیان کەوت غەزەبی یەك لەسەر یەکی خودا بوو بۆیان غەزەبێك لەبەر بەگوێ نەکردنی فەرمانەکانی تەورات، غەزەبێك لەبەر ئەوەی بڕوایان بە عیسا نەکرد، غەزەبێك لەبەر ئەوە کە بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی موحەمەد (دروودی خوای لەسەر بێ) نەکردو موسوڵمان نەبوون ﴿وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾. ڕۆژی قیامەت بۆ ئەو کافرانە سزای بە ئێش هەیە، لەگەڵ سوکایەتی پێکردندا چونکە سەرپێچی کردنەکەیان لەبەر لووت بەرزیو حەسودیو ملهوڕی بوو دەبێ سزاکەیان سوکایەتی پێکردنیشی تێدا بێ!

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُواْ بِمَا أَنزَلَ اللّهُ﴾. ئەگەر پێیان بگوترێ: بڕوا بکەن بەوەی کە خودا ناردویەتی بۆ پێغەمبەر کە قورئانەو شوێنی بکەونو پابەندی بن، لە وەڵامدا ﴿قَالُواْ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ﴾. دەڵێن ئێمە بڕوا بەو کتێبە دەکەین کە بۆ سەر خۆمان نێردراوە کە تەوراتە، هەموو پێداویستیەکی ئێمەی تێدایە، هەر ئەو ڕاستە ﴿وَيَكْفُرونَ بِمَا وَرَاءهُ﴾. ئەمجار کافر دەبین بەهەر کتێبێك کە لە تەورات بەدەر بێ، جا ئەو پەیامە عیسا هێنابیەتی یان (محمد) کە دوا پێغەمبەرە هێنابیەتی ﴿وَهُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقاً لِّمَا مَعَهُمْ﴾. واتە: بڕوا بە قورئان ناکەن، لە حاڵێکا کە ئەم قورئانە ڕاستەو دەق پشتگیری لەو پەیامە دەکا: کە تەورات گەیاندویەتی ﴿قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنبِيَاء اللّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾. ئەی محمد پێیان بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن بڕواتان بە تەوڕات هەیە

ئەی بۆچی لەوە پێش رابوردوانتان پێغەمبەرانی خودایان شەهید دەکرد، خۆ ئەو پێغەمبەرانە پەیامێکیان هێنابوو کە ئێستا ئێوە ئیدیعای ئەوە دەکەن کە بڕواتان پێیەتی: نەك هەر ئەوە، بەڵکوو ئێوە بڕواتان بە پەیامی (موسا)ش نەکرد کە رزگارکەری گەلی جولەکە بوو.

## جولەکەکان راست ناکەن کە دەڵێن ئیمانمان بە تەورات هەیە

﴿ ۞ وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ۚ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾.

لە ئایەتەکانی پێشوودا باسی گوێرەکە پەرستنی جولەکەکان کرا، وەکوو لە ئایەتی (٥١)ی ئەم سورەتەدا فەرمووی: ﴿وَإِذْ وَاعَدْنَا مُوسَىٰ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً...﴾ ئەمجار لێرەدا هەمان مەبەستی دووبارە کردەوە، بۆ ئەوە بیچەسپێنێ، کە ئەو جولەکانە لەبەر دڵڕەقیو سەرسەختییان بە هیچ شتێك نایەنە سەر رێبازی حەقو راستیو فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ جَاءَكُم مُّوسَىٰ بِالْبَيِّنَاتِ ثُمَّ اتَّخَذْتُمُ الْعِجْلَ مِن بَعْدِهِ وَأَنتُمْ ظَالِمُونَ﴾ بێگومان کاتی خۆی موسا هاتە سەرتان بە نیشانەی پێغەمبەرایەتی ئاشکراو بە هێزەوە، کەچی لە

جیاتی ئەوەی بڕوای پێ بکەن پەیڕەوی فەرمانەکانی بکەن، کە موسا چوو بۆ سەر کێوی طور، ئێوە دوای ئەو دەستان کرد بە گوێرەکە پەرستن، بەراستی ئێوە لەم کارە خراپەتاندا ستەمکار بوون، ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ خُذُواْ مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاسْمَعُواْ﴾ ئەی نەوەی ئیسرائیل، ئەو کاتە بێننەوە یادی خۆتان: کە وەعدو پەیمانمان لێ وەرگرتن: کە پەیڕەوی فەرمانەکانی تەورات بکەن، چی تێدایە بە رێك‌وپێکی ئەنجامی بدەن، کێوی طورمان بەرز کردەوە لە ژوور سەرتانەوە رامان گرت‌و پێمان گوتن: ﴿خُذُواْ مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاسْمَعُواْ﴾ ئەوەی کە فەرمانمان پێ کردوون وەری بگرن‌و ئەنجامی بدەن‌و بە دڵ پابەندی بن‌و گوێ رادێربن ﴿قَالُواْ سَمِعْنَا﴾ وتیان: بەڵێ فەرمانەکەتمان بیست بەڵام ﴿وَعَصَيْنَا﴾ بەگوێت ناکەین واتە: بەقسە وتیان باشە بەکردەوە سەرپێچییان کرد ﴿وَأُشْرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ الْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ﴾ گوێرەکە پەرستییان لەلا خۆشەویست بوو، بەتەواوی لەگەڵ خوێنیان تێکەڵاو بوو بوو، بەهۆی کافر بوونیانەوە لەناخەوە گوێرەکە پەرستی دەیهەژاندن، چۆن ئاو بەناو لق‌و پۆپی داری تەڕدا بڵاو دەبێتەوە ئاوا خۆشەویستی گوێرەکە بەناو دڵیاندا بڵاو بووەوە ﴿قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُمْ بِهِ إِيمَانُكُمْ إِن كُنتُمْ مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەی موحەممەد! بەگاڵتە پێکردنەوە بڵێ: بەڕاستی ئەوە باوەڕێکی بەدو خراپە: کە داواتان لێدەکا گوێرەکە بپەرستن؟! ئەگەر ئێوە راست بکەن ئیمانتان هەبێ ئەوە ئیمانێکی گەڵێ خراپە، واتە: درۆدەکەن، ئیمانتان نییە، چونکە ئیمان فەرمانتان پێ ناکا گوێرەکە بپەرستن.

## دونیا ویستن‌و ژیان خۆشەویستی جولەکەکان

﴿ قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَن

يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٥﴾ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾.

بێگومـان جولەکـەکان زمـان درێـژ بـوونو پـڕو پاگەندەچـی بـوون، جۆرەهـا بانگەشەیان بۆ خۆیان بڵاودەکردەوە، دەیانگوت: ئێمە گەلی هەڵبژێراوی خوداین، تـەنها ئێمە لەسەر ڕێبازی ڕاستیو حەقین، هەر ئێمە لـە قیامـەتا بـە مـراد دەگەینو لەناگر ڕزگارمـان دەبـێو دەچـینە نـاو بەهەشـتەوە، لـەڕۆژی قیامـەتا خۆشـیو سـەرفرازیو ڕەحمەتی خودا هەر بۆ ئێمەیەو کەسی ترو هیچ گەلو هۆزێك لای خودا بـەشو بـاری نییە مەبەستیان ئەوەبوو موسوڵمانەکان زێوان بکەنەوە، دڵیان کرمێ ببێ، پـەروەردگار فەرمان دەکا بە پێغەمبەر کە (موباهەلە) لەگەڵ ئەو جولەکانە بکا، بەم جۆرە هەردوو تـاقم: موسـوڵمانو جولەکـە بەرامبـەر بەیـەك ڕاوەسـتێن، ئـەمجار داوابکـەن خـودای پەروەردگار درۆزن لەناو بەرێ ﴿قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ الدَّارُ الآخِرَةُ عِندَ اللّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ النَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ پێیان بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن خانووی قیامـەت هەر بۆ ئێوەیە بەهەشت زێدە لەهەموو کەس دەدرێ بە ئێـوە، دەناواتـە خـوازی مـردن بـنو داوای مـردنو چـوونە بەهەشـت بکـەن، جـا ئـەم داواکردنـە بـە گوفتـار بـێ، یـان بەکردار بێ، وەکوو ئەوە لەڕێی خودادا شەڕبکەن، شـەهید بـبن، چـونکە کەسێك دڵنیـا بێ لەوە کەمرد دەچێتە نـاو بەهەشـتەوە پێویـستە هەوڵـدا زوو بیگاتـێ، وەکوو چۆن هاوڕێیانی پێغەمبەر لەڕێی خودادا گیانی خۆیان بەخت دەکردو خۆیـان دەفرۆشـت بـە بەهەشت ﴿وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ بەڵام ئەوانە هەرگیز داوای مردن ناکـەن

چونكە بۆ خۆیان دەزانن چەند تاوانبارو ستەمكارن، دەزانن چییان كردووەو چەند گوناهیان هەیە، دەترسێن لەوە كەخودا نزاكەیان گیرا بكاو خێرا بمرن، ئەوكاتە خەسارەت مەندی دونیاو قیامەت ببن، هەردوو دونیایان لەكیس بچێ بەهۆی ئەو كردارە ناپەسەندانەیان كە ئەنجامیان داوە، لەبەرئەوە ئەوان حازر نین (موباهلة) بكەنو داوای مردن بكەن: ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾ پەروەردگار زانایە بە ستەمكاران، دەزانێ چی دەكەنو چی ناكەن. ﴿وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَى حَيَاةٍ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ﴾ تۆ دەبینی جولەكە لەهەموو كەس زیاتر حەزیان لەژیانەو دژی مردنن، چونكە دەزانن: كە مردن راپێچی سزای بەئێش دەكرێن! ﴿ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ هەریەكێ لەو جولەكانە ئاواتەخوازی ئەوەیە: كە هەزار ساڵ لەژیاندا بێ ﴿وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ﴾ خۆ ئەو تەمەن درێژییە لەسزا رزگاری ناكاو سزای لێ دوور ناخاتەوە ﴿وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾ خودا زاناو بینایە بەو، كردارانەی دەیانكەن سزای دادوەرانەی تاوانەكانیان دەداتەوە.

## هەڵوێستی جولەكەكان بەرامبەر جوبرائیلو فریشتەو پێغەمبەران

﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾.

تا ئێستا چەند جارێك قورئان برو بیانووی جولەكەكانی بڕی، هەر ئیدیعایەكی كردیان رەتی كردەوە لەهەموو هەڵوێستو بۆچوونێكیاندا بۆڕی دان، لێرەشدا جارێكی

تـر قورئـان بـیرو بۆچوونێكی تـری ئـەو گێـل كـەذابانـە دەردەخـا بۆچـوونێكی سەیرو سەمەرەیان دەخاتە روو، ئەویش ئەوەیە: كە دەیانگوت: ئێمـە بۆیـە ئیمـان بـە (محمد) ناهێنین، چونكە جوبرائیـل نیگای بـۆ دێنـێ، جوبرائیـل وێـران كاریو بـەلاو ئافـات دێنێتـە خـوارێ، ئەگـەر نیگاكـە حـەزرەتی میكائیـل بیهێنایـە ئـەوە یەكسەر موسوڵمان دەبووین چونكە میكائیـل فریـشتەی خێـرو بێـرە، فریشتەی رزق‌و رۆزییـە، بۆیە پەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللّـهِ﴾ پێیـان بڵـێ: هەركەسـێك دوژمنـی جوبرائیـل بـێ، دیـارە دوژمنـی خودایـە، چـونكە جوبرائیـل فریـشتەی خودایـەو خـودا كردوویـەتی بـە فریـشتەی هـات‌و چـۆو هێنـان‌و بردنی نیگا لەنێوان خۆیو پێغەمبەرانیدا: هەركەسێك دژایەتی ئەو بكا دژایەتی خـودا دەكـا، بێگومـان جوبرائیـل بـە فـەرمانی خـودا ئـەو قورئانـەی بـۆ تـۆ هێنـاوەو بـۆی خوێندویەوەو تێی گەیانـدووی ﴿مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُـدًى وَبُـشْرَى لِلْمُـؤْمِنِينَ﴾ حـاڵی ئەو قورئانە وایە، پشتگیری نـاوەرۆكی كتێبـە ئاسمانییـەكانی پـێش خـۆی دەكـا، رێگـای سەرفرازیی نیشانی موسوڵمانان دەداو مژدەی بەهەشتییان پێ دەدا ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلّـهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَافِرِينَ﴾ هەركەسـێ دوژمنـی خـودا بـێ، دژایەتی فریشتەكانی بكا دوژمنایـەتی لەگـەڵ پێغەمبەرانیـدا بكـا، بەتایبـەتی دژایـەتی جوبرائیل‌و میكائیل بكا، ئەوە دیارە كافرو خـودا نەناسـەو خـوداش دوژمنـی كافرانـەو بەسزای دۆزەخ تۆڵەیان لێ دەستێنێ!

## بڕوانەكردنی جولەكە بە قورئان‌و پابەند نەبوونیان بە پەیمانەكانیان

﴿ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَكُلَّمَا عَـٰهَدُوا۟ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُم ۚ بَلْ

أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ ﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار باسی دەروون پیسیو هەڵوێستی نامەردانەی جولەكەكانی كرد، جارێكی تر بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) ئەوە رادەگەیەنێ كە سروشتی جولەكە وایە ئایەتەكانی خودا بە درۆ بزانن‌و پابەندی وادەو بەڵێن نەبن‌و پێغەمبەران بە درۆ بخەنەوە گوێ بۆ قورئان نەگرن، دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ﴾ بێگومان چەند بەلگەیەكی ئاشكرامان بۆ ناردویتە خواری گەواهی راستیی پێغەمبەرایەتی تۆن ﴿مَا يَكْفُرُ بِهَا إِلاَّ الْفَاسِقُونَ﴾ بێ بڕوا نابێ بەم ئایەت‌و بەلگانە مەگەر سەرپێچی كەرو هەلگەڕاوە! ئەگینا هەموو كەس بڕوایان پێ دەكا؟!

چونكە راستی قورئان ئاشكراو نمایانە، بە هیچ شتێك ناشاردرێتەوە، بەلام جولەكە بڕوای پێ ناكەن، ئیمان ناهێنن ئەمەش لەبەر بەد رەفتاریو بەد رەوشتیو خیانەتكاریو لووت بەرزیو سەررەقیو ملهوڕییانە! ئەمجار پەروەردگار سەرنجی موسوڵمانان رادەكێشێ بەوە: كە هەرەشەی توندو تیژ لە جولەكەكان دەكاو پەردە لەسەر دوو ڕوویی‌و بەد ڕەفتارییان لادەدات، ئەوە دەچەسپێنێ كە ئەوانە كۆمەڵێكی بێ سەروبەرەن، هەر یەكە لە ئاشێك لێ دەكاو رایەكی هەیە، هەرچەندە رەگەزپەرستن! بەلام هەرگیز هەموویان لەسەر عەهدو پەیمان نامێننەوە رەگەزپەرستن بۆ نەژادی خۆیان كەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر پەیمانێك ببەستن كۆمەڵێكیان پشتی لێ هەڵدەكەن‌و پابەندی نابن. وەكوو دەفەرموێ: ﴿وَكُلَّمَا عَاهَدُواْ عَهْداً نَّبَذَهُ فَرِيقٌ مِّنْهُم بَلْ أَكْثَرُهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ ئایا ئەو جولەكانە رەوشتیان وایە وا خوویان پێوە گرتووە هەركاتێ پەیمانێك

ببەستن کۆمەڵێکیان هەڵیوەشێننەوەو پابەندی نەبن؟ بەڵکوو زۆربەیان ئیمان ناهێنن‌و لەسەر گومڕایی خۆیان دەمێننەوە، چونکە هیچ عەهدو پەیمانێکیان بڕوای پێ ناکرێ، چی بەڵێنێك بدەن نایبەنە سەر، بە کورتی لەم ئایەتەدا پەروەردگار دوو رەوشتی جولەکەی ئاشکرا کرد، یەکێکیان ئەوەیە کە بڕوا بە بەڵێن‌و پەیمانیان ناکرێ، دووەمیان، ئەوەیە: کە زۆربەیان ئیمان ناهێنن‌و بەسەرلێشێواوی دەمێننەوە، ئەوەش هەواڵێکی غەیبی بووە، ئەو کاتە قورئان داویەتی‌و هەرواش دەرچووا ئەوەتا بە درێژایی مێژوو لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە راستیانەی کە گەواهی دەدەن لەسەر راستی ئایینی ئیسلام‌و پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرو هەوڵ‌و تێکۆشانی قوتابیانی فێرگەی پێغەمبەر بۆ بلاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام‌و موسوڵمان بوونی ئەو هەموو گەل‌و نەتەوانە، کەچی کۆمەڵێکی کەم نەبێ لە جولەکەکان موسوڵمان نەبوون ﴿وَلَمَّا جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ﴾ کاتێك پێغەمبەری ئیسلام هات بۆسەریان، قورئانێکی هێنابوو کە تەصدیقی تەوراتی ئەوانی دەکردو چی لە کتێبەکەی ئەواندا هەبوو لە یەکتا پەرستی‌و یاسای شەرع‌و ئامۆژگاری‌و سەرگوزەشتەی پێشینان لە قورئاندا هەبوو، کەچی لەجیاتی ئەوەی ئەو جولەکانە بڕوا بە قورئان بکەن تەوراتیشیان پاش گوێ خست‌و وازیان لێ هێنا.. چونکە ئەوان کە پێغەمبەریان بەدرۆ خستەوە لەگەڵ ئەوەشدا کە لە تەوراتدا باسی خواناسی تەواوی ئەوی تێدا بوو، مانای وایە: بەگوێی تەوراتیان نەکردووەو پاش گوێیان خستووە، تەنانەت وایان ئیهمال کرد وەکوو بڵێی شتی وایان نەزانیبێ‌و نەیان بیستبێ!!

## فاڵچییەتی‌و سیحرو جادوبازی جوولەکە

﴿وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُوا الشَّيَاطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَانَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَٰكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ

ٱلنَّاسَ ٱلسِّحۡرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلۡمَلَكَيۡنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنۡ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحۡنُ فِتۡنَةٞ فَلَا تَكۡفُرۡۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنۡهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَزَوۡجِهِۦۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنۡ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡۚ وَلَقَدۡ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشۡتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖۚ وَلَبِئۡسَ مَا شَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَمَثُوبَةٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ خَيۡرٞۖ لَّوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿١٠٣﴾

کاتێك کۆمەڵێك لە زاناو ماڵەکانی جولەکە تەوراتیان پاش گوێ خستو روویان لێ وەرگێڕا چونکە راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێ) دەچەسپێنێ! روویان کردە فاڵچییەتیو سیحرو جادو بازیو چاو بەستو کۆڵەوەنانی، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَاتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ﴾ کۆمەڵێك لە خوێندەوارو ماڵەکانیان، ئەوانەی تەوراتیان فەرامۆش کردبوو، بەئەنقەست خۆیان لێ گێل کردبوو، شوێن ئەو سیحرو جادو بازییەی جندۆکەکان کەوتبوون کە

لەسەردەمی حەزرەتی سولەیماندا کاریان پێ دەکرد، بەڕاستی ئەوە ئەوپەڕی سەر لێ شێواوییە بۆ ئەوانەی کە تەورات پاش گوێ دەخەن‌و پەیڕەوی سیحرو جادو بازی دەکەن! دەیانگوت: کاتی خۆی حەزرەتی سولەیمان هەرچی کتێبی سیحرو جادو بازی هەیە هەمووی کۆکردۆتەوە لەژێر کورسییەکەیدا ژێر خاکی کردوون، لەدوای لەدونیا دەرچوونی سولەیمان ئەو نوسراوانەیان دەرهێناوەتەوە بەناو خەڵکدا بڵاویان کردۆتەوە، بێگومان ئەمەش درۆیەکی شاخداری هەڵبەستراویان بوو، ﴿وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ﴾ حەزرەتی سولەیمان جادوگەری نەکردووەو سیحرباز نەبووە، ئەو پێغەمبەر بووەو پێغەمبەرایەتی دژی جادوگەرێتییە! چونکە سیحرو جادوو روکەشی‌و فێڵ‌و چاوبەستەکی تێدایەو پێغەمبەرانیش لەشتی وا دوورن: ﴿وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُواْ﴾ بەڵکوو شەیاتینی ئادەمی‌و جندۆکە سیحر بازییان پاڵ حەزرەتی سولەیمان داوە. ئەوان سیحرو جادوویان داهێناو نووسیبانەوەو فێری خەڵکیان کرد.

﴿يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ﴾ خەڵکیان فێری سیحرو جادوو کرد بۆئەوەی سەریان لێ بشێوێنن ﴿وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ﴾ هەروەها شوێن ئەوە کەوتبوون: کەلە (بابل)دا نێردرابوو بۆ هاروت‌و ماروت: کە دوو فریشتە بوون، ئەوەی کەبۆ سەر ئەو دوو فریشتە نازڵ کرابوو زانیاری سیحر بوو، مەبەستەکەیشی تاقیکردنەوەی خەڵکەکە بوو، ئەوەی فێری دەبوو کاری پێ دەکرد کافر دەبوو، ئەوەی خۆی لێ دەپاراست، یان فێری دەبوو بەڵام کاری پێ نەدەکرد ئەوە موسوڵمان بوو..

حەسەن: وشەی (الْمَلِكَيْنِ) وا خوێندۆتەوە لامەکەی ژێردار کردووەو واتە: (الْمَلِكَيْنِ بابل) دووپاشا کە لەبابل بوون. ﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولاَ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلاَ تَكْفُرْ﴾ هەرکەسێکیان فێری سیحر بکردایە، جارێ لەپێشدا بەتەواوی ئامۆژگارییان دەکردو پێیان دەگوت: ئێمە بۆ تاقیکردنەوە دانراوین، ئەوەی کە ئێمە فێری تۆی دەکەین تاقیکردنەوەی خوداییە بۆ ئێوە: کە فێری بوون بۆ زەرەرو زیان بەکاری مەهێنن، مەیکەنە هۆی کافربوونتان هەرکەسێك فێری ببێ بۆئەوەی زیانەکانی سیحر

لە ئادەمیزاد دوور بخاتەوە، ئەوە کارێکی باشە، کەسێکیش بۆیە فێری ببێ تا دەردو زیان بەخەڵك بگەیەنێ ئەوە گومڕاو تێداچووە ﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا﴾ خەڵك لەو دوو فریشتە فێری جادوو بازیو سیاسەتمەداری وادەبوون ﴿مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ﴾ کە ژنو مێردییان لێك جیادەکردنەوە ئاژاوەو پشێوییان دەخستنە نێوانیانەوە ﴿وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ﴾ خۆ ئەگەر ویستی خودای لەسەر نەبێ ئەو سیحر بازانە ناتوانن زیان بەکەس بگەیەنن ﴿وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ﴾ ئەمە لەکاتێکدا ئەوانە بە فێربوونی، سیحر زیانیان پێدەگا نەك سوودو قازانج ﴿وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ﴾ بێگومان ئەو جولەکانەی کە تەوراتیان پاش گوێ خستو لەجیاتی کار پێکردنی، سیحرو جادوو بازییان هەڵبژاردوو هێنایانە کایەوە، بۆخۆیان باش دەزانن کە لە رەحمەتی خودا بێ بەرینو بۆنی بەهەشت ناکەن، چونکە ئەوان لەجیاتی تەورات سیحرو جادو بازییان هەڵبژاردووە، ﴿وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ﴾ شتێکی خراپو ناپەسەندە ئەوشتەی: کە ئەوان خۆیانیان پێ فرۆشتووە، ئەگەر بزانن‌و هەست بە هەڵەکەیان بکەن! ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ آمَنُواْ واتَّقَوْا﴾ خۆ ئەگەر ئەوانەی خوویان داوەتە سیحر بازیو خۆیان پێوە هەڵەوگیر کردووە لەجیاتی ئەو کردەوە ناپەسەندە: کە فێربوونی سیحرە، ئیمانیان بە پێغەمبەر بهێنایەو خودا پەرستییان بکردایە ﴿لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ اللَّه خَيْرٌ لَّوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ﴾ پەروەردگار پاداشتی نەدانەوە، ئەو پاداشتەی کە خودا دەیدانەوە زۆر باشتربوو لە ئاکامی ئەو کارە ناپەسەندە: کە فێربوونی سیحرو جادوگەرییەو جگە لە خەسارەتمەندیو ماڵ وێرانی هیچی لێ پەیدانابێ! ئەگەر ئەوان بیانزانیایە هەستیان بە چاکەو خراپەی خۆیان بکردایە گوێ بیستی فەرمانی خودا دەبوون.

**تێبینی**: دەڵێن: حیکمەت لەوەدا کە پەروەردگار ئەو دوو فریشتەی تەرخان کردبوون خەڵکی فێری سیحربازی بکەن، ئەوەیە: کە لەو رۆژگارەدا سیحربازوو جادووگەر زۆربوون، چەند جۆرە شێوەی سیحر بازییان داهێنا، بەڵکوو وا گومان دەبرا

کە ئەو ساحیرانە پێغەمبەر بوون، ئیتر پەروەردگار ئەو دوو فریشتەیەی ناردن بۆئەوەی شێوەو چۆنیەتی سیحر بۆ خەڵك روون بکەنەوە، تا بتوانن جیاوازی نێوان سیحربازو پێغەمبەرایەتی بکەن، بزانن ئەوانەی بەدرۆ لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدەن، سیحر بازن نەك پێغەمبەر! هەندێ لە راڤەکەرانی قورئان بەتایبەتی ئەوانەی کە لەسەدەی بیستەمدا تەفسیریان لە قورئان کردووە کاریگەری قوتابخانەی مامۆستا (شێخ محمد عبده)یان پێوە دیارە لەوانەش خوا لێ خۆشبوو مامۆستا (سید قوطب) پێیان وایە: وشەی (ما) لە ﴿ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ...﴾دا (ما)ی (موصولة) نییە بەڵکوو (ما)ی نافییەیە ئەوکاتە تەفسیرەکە بەم جۆرە دەبێ ﴿وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ﴾ هیچ جۆرە جادووگەریو سیحر بازییەك نەنێردراوەتە خوارێ بۆ سەر هاروتو ماروت: کە گوایە دوو فریشتە بوون هاتوونەتە ناوچەی بابل — کە شارێکە لە عێراق — تا خەڵکی فێری سیحر بکەنو ﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ﴾ ئەم دوو فریشتە هیچ کەسیان فێری جادووگەری نەکردووە ﴿حَتَّى يَقُولاَ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ﴾ هەتا ئامۆژگارییان نەکردنایە بەوە کە پێیان بڵێن ئێمە بۆ تاقیکردنەوەی ئادەمیزاد نێردراوین ﴿فَلاَ تَكْفُرْ﴾ کەواتە: بێ بڕوامەبە هەرکەسێك فێری سیحر بازی ببێو پەیڕەوی بکات کافر دەبێ، هەرکەسێ فێری جادووگەری ببێو کاری پێ نەکات لەسەر بڕوای خۆی دەمێنێتەوە ﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا﴾ تا لێیانەوە فێربن ﴿وَمَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ﴾ سیحرو جادووی وایان لێ فێربن: کە ژنو مێردی پێ لەیەك جیابکەنەوە، بەکورتی ئەم باسە هەر نەبووەو ئەفسانەیەو جولەکە هەڵیان بەستووە!

### ئەدەبی ئاخاوتن لەگەڵ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ)

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرۡنَا وَٱسۡمَعُواْۗ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ مَّا

﴿يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾﴾.

ئەمە خیطابی پەروەردگارە، ئاڕاستەی موسوڵمانان كراوە دەربارەی كارێك كە پەیوەندی بە جولەكەكانەوە هەیە، ڕێنومایی موسوڵمانان دەكا: كە چۆن ئاخاوتن لەگەڵ پێغەمبەردا بكەنو وشەی ناسكو جوان هەڵبژێرن، خۆ لە وشەی وا بپارێزن كە جولەكەكان بۆ مەبەستی تر بەكاری دێننو دەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقُولُواْ رَاعِنَا﴾ ئەی ئەو كەسانەی كە ئیمانتان بە پێغەمبەر هێناوە، لە ڕووی ئەو پێغەمبەرەدا وشەی ﴿رَاعِنَا﴾ بەكار مەهێنن، ئەم وشەیە بە تۆزێك دەم بۆ خواركردنەوە دەبێتە (راعینو)ی عیبری: كە جنێوێكی ناشیرینە، هەچەندە لە زمانی عەرەبیدا بە مانای چاودێری كردنو گوێ بۆ ڕاگرتن دێو لەسەر خۆیی دەگەیەنێ واتە: گوێ بگرە بۆمان تا بتوانین ئەوەی دەمانەوێ لێت بپرسینو ئەنجامی بدەینو لێت حاڵی ببین.. جا كە جولەكەكان گوێیان لێ بوو موسوڵمانەكان لەگەڵ پێغەمبەردا وشەی ﴿رَاعِنَا﴾ بەكار دێنن بە هەلیان زانی ئەوانیش ئەم وشەیەی لەگەڵ بەكار بێنن.. بەڕواڵەت دەیانگوت: مەبەستمان مانا عەرەبیەكەیەتی بەڵام لە ڕاستیدا مانا عیبریەكەیان مەبەست بوو. ئیتر ئەوەبوو پەروەردگار ئەو وشەی لە موسوڵمانەكان قەدەغە كرد: كە لەڕووی پێغەمبەردا بیكەن، بەڵكوو فەرمانی پێكردن كە لە شوێن ئەو وشەیە وشەیەكی تر بڵێن، پێیانی فەرموو: ﴿وَقُولُواْ انظُرْنَا﴾ بڵێن: ڕوومان تێبكەو سەیرمان بكە سەرنجمان لێ بدە، بزانە ئاخۆ فەرمایشتەكانت حاڵی بووین یان نا ﴿وَاسْمَعُوا﴾ فەرمانبەرداری خودابنو گوێ ڕابگرن پێغەمبەر چیتان پێ دەڵێ: دەربارەی شەرعی خودا بیقۆزنەوە، جا لەبەر ئەوەی جولەكەكان بێ ئەدەبییان

لە خزمەت پێغەمبەردا کرد، وشەی (راعینا)یان بە مانا مەبەستەکەی خۆیان – کە شەڕانیو نەگبەتیو شووم دەگەیەنێ – لێ داوەتەوە، ئەمەش کوفرێکی ئاشکرایە، چونکە کەسێك رەوشتی شەڕانیو نەگبەتی وەپاڵ پێغەمبەر بدا، دیارە بڕوای بە پێغەمبەرێتی ئەو نیە، کەواتە لە ریزی خوانەناسانە، بۆیە پەروەردگار لە کۆتایی ئایەتەکەدا بە توندی هەڕەشەی ترسناکیان لێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلِلكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ سزای توندو بە ئێشمان بۆ ئەو جولەکە کافرانە ئامادە کردووەو شایانی ئەو سزا بە ئێشەن:

﴿مَّا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَلاَ الْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ ئەو جولەکەو گومڕایانەی کە دەرحەق بە پێغەمبەرانی خۆیان ئەو هەموو سەرپێچیو فڕوفێڵو تەڵەکەبازیەیان کردووە، ئەوانە هەرگیز نایانەوێ ئێوە خۆشبەخت بن، ئەو جولەکانە پێیان خۆش نیە: کە پێغەمبەر لە خۆتانەو قورئانتان بۆ نێردراوەتە خوارێ، بیروباوەڕی پڕوپووچی بتپەرستیو نەزانیتان لێ ڕەویوەتەوە، بەشێکتان لە خێرو بەرەکەتی پەروەردگارتان بۆ نێردراوەتە خوارێ.. هەروەها کافرەکانیش ئەمەیان پێ ناخۆشە، چونکە دەزانن کە نەپچڕانی نیگاو نازڵبوونی دەبێتە هۆی بەهێز بوونی ئیسلامو بڵاوبوونەوەیو جێگیر بوونی لەدڵی خەڵکدا ئەوان پێیان خۆشە زوو چەرخی چەپگەردتان بەسەردا بسوڕێ، نگینتان نەمێنێو لە گۆڕەپانی ژیانا وەدەرنرێن، بەڵام ئەوە شتێکە عائید بە خودایەو ﴿وَاللّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَن يَشَاء وَاللّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ خودا بە ویستی خۆی کەسێك هەڵدەبژێرێو دەیکاتە فروستادەی خۆی، کەس نیە بتوانێ نەهێڵی خودا ئەم ویستەی خۆی ئەنجام بدا.. خودا خاوەنی فەزڵو گەورەییە بەسەر هەموو کەسدا کە دەیکاتە پێغەمبەری خۆیو نیگای بۆ دەنێرێ، کە وابوو کەس مافی ئەوەی نیە حەسوودی بەو خوداپێداوانە بەرێ، چونکە خودا بۆخۆی دەزانێ کێ شیاوی نیگا بۆ ناردنو پێغەمبەرایەتیە.

## نەسخ لەحوكمە شەرعیەكاندا هەیە

﴿ ۞ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾ ﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار چۆنیەتی نیگا (وەحی)ی باس كردو راو بۆچوونی ناحەزانی رەت كردەوە، ئەمجار حیكمەتو نهێنی هەبوونی نەسخ لە حوكمە شەرعییەكاندا روون دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا﴾ حوكمی هەر ئایەتێك بگۆڕین بە حوكمی ئایەتێكی ترو حوكمەكەی رەش بكەینەوە، یان هەر لە ڕوپەڕی دڵتدا لەبیرت بەرینەوە، نە لەفظو نە مانا هیچیان لات نەمێنن، ئەوە دڵنیابە باشترو گونجاو تر دەخەینە شوێنی ئەو ئایەتە رەش كراوە، یان لە بیر كراوە ﴿أَوْ مِثْلِهَا﴾ یان وەكوو ئەو دێنن.. یان مانای ئایەتەكە بەم جۆرەیە: هەر موعجیزەیەك كە دەیدەین بە پێغەمبەرێك دوایی نایشۆرینەوە، بەم رەنگە نەیدەین بە یەكێكی تر ﴿أَوْ نُنسِهَا﴾ یان هەر لەبیری بەرینەوە بەهۆی كۆن بوونی، ئیللا موعجیزەیەكی باشتر یان وەك ئەوی دەدەمینێ.. ئەمەش بۆ خودا كارێكی ئاسایی‌و رەسایە ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بۆ تۆ نازانی؟ كە خودا بەسەر هەموو

شتێکی گونجاودا بە دەسەڵاتەو هەر شتێ مومکین بێ بێتە وجوود، ئەو دەتوانێ بیهێنێتە گۆڕەپانی بوونەوە ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ بۆ تۆ نازانی کە پەروەردگار خۆی فەرمانداڕەو هەرچی دەسەڵاتو خاوەنیەتیو شکۆداری ئاسمانەکانو زەوی هەیە، هەمووی هەرهی ئەوە؟ چی بۆی دەیکا، چ فەرمانێ بگۆڕێ دەیگۆڕێ، چ فەرمانێ هەڵوەشێنێتەوە هەڵی دەوەشێنێتەوە ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللّهِ مِن وَلِيٍّ وَلاَ نَصِيرٍ﴾ نیە بۆ ئێوە جگە لە خودا کەسێکی تر چاودێری کاروبارتان بکا، یاسای رەساتان بۆ بنێرێ، جگە لە خودا کەسێك نیە بتوانێ یارمەتیتان بداتو پشتیوانیتان بکا، دیارە تۆ ئەمە دەزانیو زانیوتە دەی بەناو خەڵکدا بڵاوی بکەرەوەو تێیان بگەیەنە، با لە هەموو کارێکدا پشت بە خودا ببەستنو داوای یارمەتی لەو بکەن! بە هیچ جۆرێك گوێڕایەڵی ئەو کۆمەڵە ناپاکانە مەکەن کە پڕوپاگەندە بڵاو دەکەنەوە، دژی ئاینەکەتان دەدوێن، چونکە ئەوان دەیانەوێ لەڕێی راست لاتان بدەنو تووشی هەڵدێرو ناستەنگتان بکەن، ئەوانە هیچ شتێکیان بەدەست نیە، ناتوانن زیانو قازانجتان پێ بگەیەنن! ئەوە هەر بەدەست پەروەردگارەو هیچ شتێك بێ رەزامەندی ئەو نابێ!

﴿أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْأَلُواْ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَى مِن قَبْلُ﴾ یان ئێوە ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان دەتانەوێ داوای موعجیزەی ناقۆڵاو نامافوڵ لە پێغەمبەرەکەتان بکەن، وەکوو چۆن لەوەپێش نەوەی ئیسرائیل ئاوا داوای موعجیزەی ناقۆڵاو نالەباریان لە موسا کرد، کە داوایان لە موسا کرد وتیان (أرنا الله جهرة) بە ئاشکرا خودامان نیشان بدە، نەکەن ئەو رێبازە پەیڕەو بکەن، ئەوە رێگایەکی سامناكو خەتەرناکە، لادانە لە ئایینو سەرپێچی کردنی فەرمانی پەروەردگارە، هەڵبژاردنی رێبازی چەوتو خوارە، لەباتی رێگای راستو رەوان ﴿وَمَن يَتَبَدَّلِ الْكُفْرَ بِالإِيمَانِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاء السَّبِيلِ﴾ هەر کەسێکیش لە شوێنی ئیمانو باوەڕ کوفر هەڵبژێرێ، بێگومان رێگای راستی لێ گوم بووە؟!

ئەمەش ئەوپەڕی بەخت ڕەشیو چارە ڕەشیە کە مرۆڤ ڕێگای ڕاستی بۆ ئاشکرا ببێو کەچی خۆی لێ گێل بکاو لێی لادا.

## هەڵویستی ئەهلی کیتاب بەرامبەر موسوڵمانانو چۆنیەتی ڕەتدانەوەیان

﴿ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٠﴾ ﴾.

لەوەپێش پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان کرد کە گوێ بۆ ئامۆژگاریی جولەکەکان نەگرنو بیرو بۆچوونەکانیان ڕەت بکەنەوە، لێرەش هۆی دژایەتی کردنی ئەوان بۆ موسوڵمانان ڕوون دەکاتەوە: کە بریتییە لە حەسوودیو پێیان ناخۆشە کە خودا نیعمەتی ئیسلامی پێداونو ئاواتەخوازن کە موسوڵمانان لە ئایینەکەیان پاشگەز ببنەوە دەفەرموێ: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّاراً﴾ زۆربەی زۆری جولەکەو فەلەکان ئارەزوی ئەوەیانە: کە ئێوە لە ئایین ژێوان بکەنەوە، دوای ئەوەی ڕاستیو حەقتان بۆ دەرکەوتووەدەیانەوێ پاشگەز ببنەوەو بچنە ناو

تاریكایی گومڕایی پێشووتان ﴿حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم﴾ چونكە حەسودیتان پێ دەبەن‌و پێیان ناخۆشە ئێوە موسوڵمان بوون‌و بە موسوڵمانی بمێننەوە ﴿مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ﴾ دوای ئەوەی بۆیان ئاشكرا بووە كە ئایینی ئێوە ئایینێكی حەقەو بەڵگە لەسەر ڕاستی‌و دروستی زۆرو زەبەندن: جا ئێوە ئەی كۆمەڵی موسوڵمان ﴿فَاعْفُواْ وَاصْفَحُواْ﴾ چاوپۆشییان لێ بكەن‌و گوێیان مەدەنێ‌و چیتان بەسەرەوە نەبن ﴿حَتَّى يَأْتِيَ اللّهُ بِأَمْرِهِ﴾ هەتا ئەو كاتەی پەروەردگار ڕێگاتان دەدا كە شەڕیان لەگەڵدا بكەن‌و دەستی خۆتانیان لێ بوەشێنن ﴿إِنَّ اللّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بێگومان خودا بەسەر هەموو شتێكدا تواناو دەسەڵاتی هەیەو كە كاتی خۆی هات تۆڵەیان لێ دەستێنێ، ئێوەش ئەی گرۆهی موسوڵمانان بڕواتان بە خودا هەبێ‌و بزانن چی وادە پێداون دێتە جێ‌و چاوەڕوان بن ﴿وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ﴾ بەردەوام بن لەسەر جێبەجێ كردنی دوو كۆڵەكەی ئایین كە نوێژ كردن‌و زەكات دانە، ئەوەش بزانن ﴿وَمَا تُقَدِّمُواْ لأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللّهِ﴾ هەر كردارو گوفتارو هەڵوێستێك ئەنجام بدەن – جا فەرز بێ یا سوننەت بێ پاداشەكەی لای خودایەو دەستتان دەكەوێتەوە ﴿إِنَّ اللّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بێگومان خودا ئاگادارو بینایە بەسەر هەموو كارو كردەوەیەكتان‌و ڕۆژی دوایی بە گوێرەی پێویست پاداشتتان دەداتەوە.

## ڕای جولەكەو گاور بەرامبەر بەیەكتری

﴿ وَقَالُواْ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُواْ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿١١١﴾ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ

فَلَهُۥٓ أَجۡرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿١١٢﴾ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ لَيۡسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيۡسَتِ ٱلۡيَهُودُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُمۡ يَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ مِثۡلَ قَوۡلِهِمۡۚ فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾.

ئایەتی (١١٣) دەربارەی جولەکەکانی مەدینەو وەفدی نەصرانییەکانی نەجران هاتۆتە خوارێ: کە نەصرانییەکانی نەجران هاتنە خزمەت پێغەمبەر (درووردی خوای لەسەر بێ) مالمەکانی جولەکەش هاتن لەوێ بوو بە دەمەقالێو دەنگیان لێک هەڵبەزییەوە، جولەکەکان وتیان: ئێوە لەسەر هیچ ئایینێک نین! بڕوامان بە عیساو ئینجیل نیە! نەصرانییەکان وتیان: نەخێرە ئێوە لەسەر هیچ ئایینێک نین، ئێمە بڕوامان بە موساو تەوراتەکەی نیە.

ئیتر ئەم ئایەتانە هاتنە خوارێ کە بیروبۆچوونی جولەکەو گاورەکان روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ لَن يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلاَّ مَن كَانَ هُوداً أَوْ نَصَارَى﴾ وتیان: کەسێك جولەکەو گاور نەبێ ناچێتە بەهەشتەوە، واتە: جولەکەکان دەیانگوت: هەرکەسێك جولەکە نەبێت ناچێتە بەهەشتەوە، گاورەکانیش دەیانگوت: بەهەشت هەر بۆ گاورەکانەو کەسێك گاور نەبێ ناچێتە بەهەشتەوە..

﴿تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ﴾ ئەم بیرو بۆچوونانە زادەی خەیاڵی پڕوپووچی ئەوانەیەو بنچینەیەکی زانستی نیەو هەر بە هەوانتە ئەم جۆرە قسانە فڕێ دەدەن ﴿قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: ئەگەر راست دەکەن بەهەشت

هەر بۆ ئەوانەو کەسی تر ناچێتە ناوی، دە بەڵگەی چەسپێنەر بخەنە ڕوو! دیارە بەڵگەیان بەدەستەوە نیەو ناتوانن هیچ جۆرێك لەم بۆچوونانە بچەسپێنن ﴿بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِندَ رَبِّهِ﴾ نەخەیر وا نیە! بۆچوونەکەتان هەڵەیە، وا نیە، کە هەرکەسێك جولەکە نەبێ یا گاور نەبێ ناچێتە بەهەشتەوە! بەڵکوو هەر کەسێك خواپەرست بێ‌و بۆ خودا لێبڕێ خۆی بداتە دەست خوداو چاکەکار بێ، ئەوە پاداشتی باشی لای خودای خۆیەتی‌و بێ کەم‌و زیاد پاداشەکەی وەردەگرێتەوە ﴿وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ نە ترسیان لەبەرەو نە خەم دەخۆن چونکە ئەوان پشتیان بە خودا قایمە دڵنیان لە دادوەری خوداو هیچ دڵەڕاوکێیەکیان تووش نابێ! (ترسیان لە داهاتوو نییەو خەمی ڕابردوویان نییە).

دوای ڕەتکردنەوەی بۆچوونەکەی گاورو جولەکەکان ئەمجار هەڵوێستی هەریەکەیان بەرامبەر ئەوی تریان ئاشکرا دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ لَيْسَتِ النَّصَارَى عَلَىَ شَيْءٍ﴾ جولەکەکان دەڵێن: گاورەکان لەسەر هیچ ئایینێك نین‌و ئەو دینەی خۆیان پێ هەڵەو گیر کردووە بێ بناغەو بێ سەرچاوەیە ﴿وَقَالَتِ النَّصَارَى لَيْسَتِ الْيَهُودُ عَلَى شَيْءٍ﴾ لەهەمان کاتدا گاورەکانیش دەیانگوت: جولەکەکان لەسەر هیچ ئایینێك نین‌و دینەکەیان بەتاڵە، ئەمە لە کاتێکدا ﴿وَهُمْ يَتْلُونَ الْكِتَابَ﴾ ئەوانە کتێب دەخوێننەوە، جولەکە تەورات دەخوێنن‌و لەوێدا مژدەی هاتنی حەزرەتی عیسای تێدایە، هەروەها گاورەکانیش ئینجیل دەخوێننەوە کە لەوێدا باسی ئایینی جولەکەی تێدایە.. کە وابوو ئەوان کافر بوونەکەیان لە نەزانییەوە نیە، بەڵکوو بەئەنقەست خۆیان کافر دەکەن ﴿كَذَلِكَ قَالَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ﴾ عەرەبە خوانەناسەکان‌و هاوبەش پەیداکەرەکانیش هەر ئاوایان دەگوت: دەیانگوت: (محمد) دینەکەی هیچ نیەو بێ بنەماو بێ سەرچاوەیە، دەی ئێوە ئەی مالم‌و قەشەکان! لای خۆی خوێندەوارن‌و تەورات‌و ئینجیل دەخوێننەوە، دەزانن ئایینی موساو ئایینی عیسا لە ڕۆژگاری خۆیاندا ئایینێکی حەق بوون‌و هەر ئەوانیش مژدەی هاتنی پێغەمبەری

ئیـــسلامیان داوە!! کەچـــی ئێـــوە هـــەر قـــسە پڕوپووچـــەکانی عەرەبـــە نەخوێندەوارەکان دەجوونەوە؟!

﴿فَاللّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ پەروەردگار ڕۆژی قیامەت موحاکەمەی نێوانی جولەکەو گاورەکان دەکا، بیرو بۆچوونەکانیان دەربارەی ئایین یەکالا دەکاتەوە سزای گونجاوو شیاویان دەداتەوە.

## ستەمکاری ئەوانەی ناهێڵن نوێژ لە مزگەوتەکاندا بکرێ، نوێژ کردن لە هەموو جێگایەکی خاوێن دروستە

﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَآ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ ۚ لَهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي ٱلْأَخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١٤﴾ وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾ ﴾

زۆر ڕیوایەت هەن دەربارەی هۆکاری هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە: بەهەر حاڵ عیبرەت بەگشتی وشەکەیە نەك بە تایبەتمەندی هۆکاری هاتنە خوارەوەکە، بۆیە دەتوانین بڵێین: هەر کەسێ مزگەوت بڕوخێنێ دەرگای دابخا، هەوڵ بدا خواپەرستان رووی تێ نەکەن، هەر کەسی ببێتە لەمپەرو بەربەست ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە: کە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَاجِدَ اللّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ﴾ کێ لەو کەسە ستەمکارترو تاوانبارترە: کە نەهێڵێ لە مزگەوتەکانی ماڵی خودا یادو ذیکری خودای

تێدا بکرێو شكو گومانو دڵەڕاوکێ بخاتە دڵی موسوڵمانانەوە هەروەها ﴿وَسَعَى فِي خَرَابِهَا﴾ هەوڵ بدا وێرانیان بکا بەم جۆرە نەهێڵێ یادی خودایان تێدا بکرێ، دیوارو کۆڵەکەو دارو بەردیان بڕوخێنێ ﴿أُوْلَئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَا إِلاَّ خَآئِفِينَ﴾ ئەوانە شایەنی ئەوەن کە ڕاوەدو بنرێن وە بترسێندرێنو بخرێنە بەر فشارو سەرکوت کردن، مەگەر پەنا بەرنە بەر مزگەوتەکانو داوای ئاشتی بکەنو خۆ بخەنە ماڵی خوداوە — وەکوو ئەوەی: کە لەساڵی ڕزگارکردنی مەککەدا ڕوویدا کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (من دخل المسجد الحرام فهو آمن) هەرکەسێك خۆ بخاتە ماڵی خودا (کەعبە)وە ئەوە دەستدرێژی ناکرێتە سەریو لێی ناپێچرێتەوە،، ئیتر هەموو ملهوڕەکانی قوڕەیش خۆیان خستە ناو کەعبەوە، دوای ئەوەی کە نەیاندەهێشت پێغەمبەر خودا پەرستی تێدابکا، نەیان دەهێشت هاوەڵەکانی بچنە ناوی ... یان مانای وایە ئەوانە نابێ بچنە ناو مزگەوتەکانی خوداوە، مەگەر بە ترسو خوشوعو گەردن کەچییەوە بچنە ناو ماڵی خوداوە! نابێ بەهیچ کلۆجێك ڕێگەیان پێ بدرێ کە بە لووت بەرزیو کەشو فشەوە بچنە ناو مزگەوتەکانەوە ﴿لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ﴾ ئەوانە لە جیهاندا ڕیسواو سەر شۆڕنو ﴿وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ لە ڕۆژوی دوایشدا سزایەکی کوشندەو گەورەیان هەیەو دەخرێنە ناوی!!

﴿وَلِلّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ﴾ خۆرهەڵاتو خۆرئاواو هەموو زەوی موڵکی خودایە، لەکاتی نوێژکردندا ڕووبکەنە هەر لایەك ڕووکردنە خودایەو لەپێش دەمتانەو خودا پەرستییەکەتان گیرایە ﴿إِنَّ اللّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان خودا شوێنێکی تایبەتی دیاری کراوی نییە، لەهەموو شوێنێکە، لەهەر شوێنێك ڕووی تێ بکەن ئاگاداری ڕووتێکردنەکەیە. دەڵێن: ئەم ئایەتە پێش فەرمانکردن بە ڕووکردنە کەعبە لەنوێژدا نازڵ بووە، بەوەش ئەو بیرو بۆچوونانەی ئایینە کۆنەکانی پوچەڵ کردەوە: کە دەیانگوت: خودا پەرستی هەر دەبێ لەناو دێرو کەنیشتەو لای پەیکەرەکان بکرێ، واتە: ئەگەر نەیان هێشتن نوێژ لەناو کەعبەدا بکەن، یا لەناو بەیتول مەقدیسدا

نوێژ بكەن، ئەوە هەمموو سەرزەوى بۆ ئێوە كراوە بە مزگەوت، لەكوێ نوێژ دەكەن بيكەن، لەهەمموو شوێنێك رووكردنە خودا بەيدەست دەكرێو تايبەت نييە بە شوێنێكەوە!

## درۆو بوختانى ئەهلى كيتابو موشريكەكان كە كوڕ بۆ خودا دادەنێن

﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ١١٦ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ١١٧ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡۗ قَدۡ بَيَّنَّا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ١١٨﴾.

ئەم ئايەتانە — دەربارەى جولەكە هاتوونە خوارێ: كە دەيانگوت عوزەير كوڕى خودايە، هەروەها دەربارەى گاورەكان: كە پێيان وابوو عيسا كوڕى خودايە، هەروەها دەربارەى كافرەكانى مەككە: كە دەيانگوت فريشتە كچى خودان... — هاتوونەتە خوارێ پەروەردگار هەمووى بەدرۆ خستنەوەو فەرمووى:

﴿وَقَالُواْ اتَّخَذَ اللّهُ وَلَدًا﴾ دەڵێن: خودا كوڕى بۆخۆى برِيار داوەو كوڕى هەيە، جولەكەكان دەيانگوت: عوزەير كوڕى خودايە، گاورەكانيش دەيانگوت: عيسا كوڕى خودايە، هاوبەش پەيداكەرانيش دەيانگوت فريشتەكان كچى خودان (سبحانە) پاكو بێ

خەوشی بۆ خودایە، پەروەردگار دوورە لەوە منداڵی هەبێ، چونکە منداڵ بۆ کەسێك پێویستە یارمەتی بدا، دوای مردنی شوێنی بگرێتەوە، کە پێویستی بە یارمەتیدان بێ لە کاروباری ژیانی ڕۆژانەیدا، دەی خودا پێویستی بەوە نیە ﴿بَل لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ﴾ بەڵکوو هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە هەمووی موڵکی خۆیەتی چی تێدایە گەردن کەچو فەرمانبەرداری ئەونو بە ویستو ئیرادەی ئەو لە گەڕدانو هەڵدەسوڕێن! ئیتر بە چ ئەقڵێك ئەو نەفامانە کوڕو کچی بۆ دیاری دەکەن ﴿بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ پەروەردگار خۆی بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی تیاندایە، جا کەسێك بەدیهێنەری ئەو شتانە بێ چۆن دەبێ بڕێ لەو شتانە بکرێنە کوڕو کچیو هاوبەشی؟! خودا خۆی خاوەن دەسەڵاتی رەهایەو هیچ سنورێکی بۆ نیەو هیچ لەمپەرێك نایەتە پێشێ ﴿وَإِذَا قَضَى أَمْراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ هەر کارێك هەر شتێك ویستی ببێ یەکسەر دەبێو بێ چەندو چوون لەخانەی بووندا خۆی دەنوێنی، روتێکردنی ئەو ئیرادەیە بۆ ئەو شتەو پەیوەندی کردنی پێوە بە چۆنیەتێکی تایبەتی ئەنجام دەدرێو عەقڵی ئادەمیزاد پەی پی نابات. چونکە دەرك کردنی ئەو چۆنیەتیە لەژوور توانای عەقڵی ئادەمیدایەو هەر هەوڵو لێکۆڵینەوەیەك بکرێ بۆ دەرك کردنی ئەو نهێنیە بێ هودەیەو خۆ ماندووکردنێکی بێ ئەنجامە ﴿وَقَالَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ لَوْلاَ يُكَلِّمُنَا اللّهُ أَوْ تَأْتِينَا آيَةٌ﴾ نەفامو نەزانو هاوبەش پەیداکەرەکانی عەرەب، یان نەخوێندەوارەکانی جولەکەو گاور زۆر جار تەحەددای پێغەمبەریان دەکرد، دەیانگوت کە راست دەکەی تۆ نیگات بۆ دێو ئەو نیگایە لە خوداوەیە، ئەدی بۆچی خودا بۆخۆی قسەمان لەگەڵ ناکا؟ پێمان ناڵێ (محمد) (دروودی خوای لەسەر بێ) راست دەکاو پێغەمبەری منە؟ وەکوو چۆن لەگەڵ فریشتەدا ئاخاوتن دەکا، یان بۆ نیشانەیەکی راستو دروستمان نیشان نادا لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی تۆ؟ چونکە بڕوایان بە نیشانەکانی پێغەمبەر نەبوو، ئینکاری بەڵگەو موعجیزەکانی پێغەمبەریان دەکرد ﴿كَذَلِكَ قَالَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ﴾ دەی خوانەناسو گومڕاکانی پێشوو

هەر ئەم قسەیەی ئەمانیان دەكردو داخوازی ئاوایان دەخستە ڕوو؟! ﴿تَشَابَهَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ دڵو بیرو بۆچوونی كافرەكانی قورەیشو جولەكەو گاورەكان وەكوو یەك دەچن لە سروشتو بیرو بۆچووندا، لە گومڕاییو سەركێشیدا وەك یەكتر وان، هیچ زێدە ڕێزێك نیە بۆ جولەكە بەسەر كافرە قورەیشیەكاندا، هەموویان لە بیرو بۆچووندا وەكوو یەك دەچن. لە سەرپێچیو گومڕایی دا هیچ جیاوازیەكیان نیە، ﴿قَدْ بَيَّنَّا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ بێگومان ئێمە نیشانەكانی ڕاستی پێغەمبەرایەتی (محمد)مان ڕوون كردۆتەوە بۆ ئەوانەی كە لەدڵی خۆیاندا هەست بە ئارامیی یەقین دەكەن.

## ترساندنو ناڕەزایی دەربڕین لەشوێن كەوتنی جولەكەو گاور

﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۖ وَلَا تُسْـَٔلُ عَنْ أَصْحَٰبِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٩﴾ وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٢٠﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٢١﴾ ﴾.

دوای ئەوە پەروەردگار هەموو بیروبۆچوونی جولەكەو گاورەكانی پوچەڵ كردەوە، مەبەستەكانی ئاشكرا كردنو ئاكامو سەرەنجامەكانی ڕوون كردنەوە، ئەمجار ڕوو دەكاتە پێغەمبەرو ئەركو لێپرسراوێتی دیاری دەكاو پەردە لەسەر حەقیقەتی

جەنگی نێوان پێغەمبەرو جولەكەو گاورەكان لادەداو سروشتو چۆنیەتی دژایەتیەكە رادەنوێنێو خیطاب ئاراستەی پێغەمبەر دەكاو تێی دەگەیەنێ كە ئەو خاوەنی موعجیزەو ئایەتە، دوا بەدوای چەسپاندنی تاكو تەنیایی خودا راستیی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر دەچەسپێنێو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾ ئێمە تۆمان كردووە بە پێغەمبەرو ناردوومانی بۆسەر ئادەمیزاد بەشێوەیەكی راستو دروست، ئەركی سەرشانیشت گەیاندنی پەیامە پیرۆزەكەتە، مژدە بدە بەوانەی پابەندی فەرمانەكانی پەروەردگارن، سەرپێچی كەرانیش بترسێنە، ئەمە رۆڵی سەرەكی تۆیە، مژدەدەرو ترسێنەری، ﴿وَلاَ تُسْأَلُ عَنْ أَصْحَابِ الْجَحِيمِ﴾ تۆ بەرپرسیار نیت لەوانەی كە ئیمان ناهێنن‌و بەهۆی كرداری نارەوایانەوە دەچنە ناو دۆزەخەوە، بەتایبەتی كەتۆ ئەركی سەرشانی خۆتت ئەنجامداو بانگەوازیی ئیسلامت پێ گەیاندن!! ئەوەش بزانە كە ﴿وَلَن تَرْضَى عَنكَ الْيَهُودُ وَلاَ النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ﴾ جولەكەو گاورو هاوپەیمانانیان لەتۆ رازی نابن‌و بەردەوام دژایەتی توندت دەكەن فێڵت لێ دەكەن، پلانت لێ دەگێڕن، گێرەو كێشەت بۆ بەرپا دەكەن، مەگەر واز لەو بانگهێشتنە بێنیت، بانگەوازی ئیسلامی فەرامۆش بكەی‌و بچیتە سەر ئایینی ئەوان، ئەوكاتەیش ماڵوێرانی دونیاو قیامەت دەبی!!

وەنەبێ كە ئەوان ئیمانت پێ ناهێنن، لەبەر بێ بەڵگەیی بێ، ئەوان خۆیان باش دەزانن: كە پەیامەكەت هەق‌و راستە، بەڵام كە ئیمانت پێ ناهێنن لەبەر لووت بەرزی‌و حەسودییە، تۆ هەرچی بكەی ئەوان لێت رازی نابن، مەگەر بچیتە سەر ئایینەكانیان، ئەمەیە تەوەرەی كێشەكە، هەر ئەمەیە ئەو هەموو دژایەتیەی كە دژی ئیسلام‌و بانگەواز كەرانی بەدرێژایی مێژوو ئەنجامی دەدەن، ئەمە شەڕی بیرو باوەڕە لەژێر دروشمێكی ئاڵو والادا، بێگومان ئەو دوژمنانە هەر رۆژە بەجۆرێك خۆ دەگۆڕن‌و ئالایەكی تر بەرز دەكەنەوە، چونكە ئەوان دەزانن: كە موسوڵمانان چەند سركن بەشتێك كە دەربارەی بیرو باوەڕیان ئەنجام بدرێ، لەوەپێش جەنگی دژ بە بیرو باوەڕیان تاقی كردۆتەوە، بۆیە ئالای شەڕەكەیان گۆڕی‌و لەژێر ناوێكی ترداو

هەرجارەی بەبیانووی شتێکەوە، جارێك بەبیانووی پاراستنی زەوی‌و خاك‌و نیشتمانەوە، یان بە بیانووی ئابوری‌و جارێکی تر بە بیانووی رامیاری‌و پایگایی سەربازییەوە......هتد بەڵام لەڕاستیدا دژایەتییەکە هەر بۆ بێ هێزکردنی ئاینی ئیسلامە، بۆ لەریشە کێشانی ئەو گیانە پەیوەستەیە بە پەروەردگارەوە، هەموو ئامانجێکیان بۆ لێدانی ئیسلامە، بۆ روخاندنی ئەو بەربەستە قایم‌و قۆڵەیە: کە جارەهای جار لەبەردەمیا کۆڵەوار بوون‌و بەسەر شکاوی‌و قوند دڕاوی گەڕانەوە، بەڵێ ئەمە شەڕی بیرو باوەڕە، شەڕی ئەرزو بەروبووم‌و پایگاو ئابووری‌و رامیاری نییە.

﴿قُلْ إِنَّ هُدَى اللّهِ هُوَ الْهُدَى﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: بێگومان رێبازی راستی ئیسلام‌و بەرنامەی خودا بۆ ئادەمیزاد کە بریتییە لە پەیامی قورئان، هەر ئەوە شیاوی ئەوەیە پێی بگوترێ: رێبازی راست‌و شیاوی ئەوەیە مرۆڤ بیکاتە رێبازی ژیانی‌و پێیدا بڕوا، هەموو ئەو رێبازو بەرنامەو بۆچوونانەی ئێوە بانگەوازی بۆ دەکەن، دوای هاتنی ئیسلام، پووچەڵ بوونەوە متمانەیان پێ ناکرێ، چاك وایە چیتر ئێوە خۆتان بەوە هەڵەوگیر نەکەن، ئەی رەهبەر! ئاگات لەخۆت بێ بەهیچ جۆرێ لەم هەڵوێستە نەیەیتە خوارێ، بەموو لەم بەرنامە لانەدەیت ﴿وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءهُم بَعْدَ الَّذِي جَاءكَ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللّهِ مِن وَلِيٍّ وَلاَ نَصِيرٍ﴾ ئەگەر شوێن هەواو هەوەسی ئەوان بکەوێ بەتایبەتی دوای ئەوەی کە ئەو ئاینە راست‌و دروستەت بۆ نێردراوەو لێت روونە کە ئاینێکی حەقەو وەکوو رۆژی رووناك دەدرەوشێتەوە، ئەوە خودات لێ دەرەنجێ‌و کەس نییە یارمەتیت بدات، لە خوداوە پشت‌و پەناو یارمەتیدەرت نامێنێ: خەسارەت مەندی دونیاو قیامەت دەبی! ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ﴾ ئەو موسوڵمانانەی کە لەوەپێش لەسەر ئاینی جولەکە، یان ئاینی عیسا بوون، ئێستا موسوڵمان بوون ﴿يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلاَوَتِهِ﴾ ئەو نامە ئاسمانییەی کە هەیانە دەیخوێننەوە، هیچ گۆڕانکاری تێدا ناکەن‌و نیشانەکانی پێغەمبەر چۆن لایان نووسراوە، دەری دەخەن‌و هیچی لێ ناشارنەوە ﴿أُوْلَئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ﴾ ئەوانە بڕوایان بەنامەی خۆیان هەیەو دەزانن راستەو

هەر بەگوێرەی ئەوەیش ئیمانیان بەتۆ هێناوە. ﴿وَمن يَكْفُرْ بِهِ﴾ کەسێك بڕوا بەنامەی خودا نەکاو پابەندی فەرمان و نەهییەکانی نەبێ، بڕوا بە قورئان و بە پێغەمبەرێتی تۆش ناکا!! ﴿فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ ئەوانە خەسارەتمەندی دونیاو قیامەتن و بەدبەختو چارە ڕەشن!

## بیرخستنەوەی نیعمەتەکانی خودا بۆ نەتەوەی ئیسرائیل و ترساندنیان لە دوارۆژ

﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٢٢﴾ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا عَدۡلٞ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٞ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿١٢٣﴾﴾.

ئەمجار دوای ئەم ڕوونکردنەوەو ئەم پەیامە گرنگە کورتبڕە، جارێکی تر سیاقی ئایەتەکە ڕوودەکاتەوە نەوەی ئیسرائیل وەکوو بلێی: بانگەوازی کۆتایی و دوا بانگهێشتنیان ئاڕاستە دەکا..

دوای ئەم هەموو کێشەو بەرامبەری و ڕانواندنی هەڵوێستی جۆراو جۆری جولەکەکان لەگەڵ پەروەردگاری خۆیان و لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان، جارێکی تر بانگەوازییان لێ دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُواْ نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ ئەی نەوەی ئیسرائیل! یادی ئەو هەموو ڕێزو نازو نیعمەتانە بکەنەوە کەداومە بەئێوە، ئەو خۆشبەختییەم پێ ڕەوا بینین، بەتایبەتی کەزێدە ڕێزم دابوونێ بەسەر ئادەمیزادانی ڕۆژگاری خۆتاندا بەرزم کردبوونەوە، پلەو

پایەی تایبەتیتان درابوویە! ئەمجا پێمان گوتبوون: ﴿وَاتَّقُواْ يَوْماً لاَّ تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْئاً وَلاَ يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلاَ تَنفَعُهَا شَفَاعَةٌ﴾ خۆتان بپارێزن لە سزاو تۆڵەی رۆژێك کە کەس لەبری کەس سزا نادرێو کەس ناتوانێ ئێشو ئازاری کەس هەڵبگرێ کەس فیدیەی لێ وەرناگیرێو شەفاعەتو تکاکاری کەس جێی بۆ ناگرێ، چونکە ئەوان بڕوایان بەخودایەتی خودا نەبووەو کافر بوونو کافریش ئەگەر شەفاعەتیشی بۆ بکرێ جێ ناگرێ ﴿وَلاَ هُمْ يُنصَرُونَ﴾ کەس ناتوانێ بەرگرییان لێ بکاو عەزابی خودایان لێ دوور بخاتەوە.

## بە تاقیکردنەوەی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلاَم)و تایبەتمەندی کابەو شاری مەککە

﴿ ۞ وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ١٢٤ وَإِذۡ جَعَلۡنَا ٱلۡبَيۡتَ مَثَابَةٗ لِّلنَّاسِ وَأَمۡنٗا وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ وَعَهِدۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلۡعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ١٢٥ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنٗا وَٱرۡزُقۡ أَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُم بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ

ٱلْءَاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾ ﴾.

پاش ئەوەی یەزدان نیعمەتەکانی خۆی وەبیر نەتەوەی ئیسرائیل هێنایەوەو، ئەوەی دەرخست کە ئەوان چۆن لەجیاتی سوپاس‌و شوکرانە ژمێری، کوفرانی نیعمەتەکانیان کردو لەخودا یاخی بوون! ئەمجار چیرۆکی حەزرەتی (ئیبراهیم) دەگێڕێتەوە کە باوکی پێغەمبەرانەو جولەکەو نەصارا خۆیان بە شوێنکەوتووی ئەو دەزانن‌و ئەگەر راست دەکەن دەبوایە شوێن (محمد) (درودی خوای لەسەر بێ) بکەوتنایەو دەفەرموێ:

﴿وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ﴾ ئەی محمد: بیربکەرەوە لەو کاتەی پەروەردگار بەندەی خۆی ئیبراهیمی بە تاقیکردەوەو کۆمەڵێك ئەرك‌و فەرمانی شەرعی بەسەردا دا، ئەویش بە رێك‌و پێکی ئەنجامی دان، وەفای بە بەڵێن‌و پەیمانەکانی خۆی کرد، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّى﴾ ئەمەش پلەو پایەیەکی پیرۆزە: کە حەزرەتی ئیبراهیم پێی گەیشتووە، لەبەر ئەوە ئیبراهیم شیاوی ئەوە: بوو کە پلەو پایەی زیاتری بدرێتێ ﴿قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا﴾ پەروەردگار پێی گوت: ئەمن دەتکەم بە پێشەوای ئادەمیزادو مەشخەڵێکی رەهنومایی بۆ خەڵك ﴿قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي﴾ حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلاَم) فەرمووی: پەروەردگار ئەم پلەو پایە پیرۆزە بە هەندێ لە نەوەکانیشم ببەخشە ﴿قَالَ لاَ يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ﴾ پەروەردگار فەرمووی: ئەم پلەو پایە گەورەو پیرۆزە نادرێ بە هیچ کەسێکی خوانەناس. با لە نەوەی تۆش بن: هەر کەسێ زاڵم‌و ستەمکاربێ، بە کەڵکی رابەری‌و پێشەوایەتی نایە.

ئەم هەڵوێستەی حەزرەتی ئیبراهیم هەڵقوڵاوی هەستێکی سروشتی قووڵ بوو، ئەو هەستە سروشتیەی کە خودا لە ئادەمیزادا دایناوە بەردەوام بە رێك‌و پێکی هەنگاو

هەڵدێنێ، داهاتوو رابوردوو تەواو دەکا، چینەکان هاوکاری یەکترن‌و شریتی ژیان پێک دەهێنن‌و چین لە دوای چین شوێنی یەکتری دەگرنەوە، کەلەپوور لەیەکتری دەگرن‌و بەسەرهات‌و رابوردوویان بە مێژوو دەخوێننەوە. ﴿وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْناً﴾ ئەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) یادی ئەوە بکەرەوە ئەو کاتەی کە خانووی کەعبەمان کرد بە مەرجەع‌و رۆگە بۆ ئادەمیزاد، بۆ ئەوەی لە هەموو لایەکەوە رووی تێبکەن‌و لێی کۆبنەوە، هەروەها ببێتە شوێنی ئاسایش‌و حەوانەوەی ئەوانەی کە پەنای بۆ دێنن، چونکە پەروەردگار رێزی ئەم خانووەی خستۆتە دڵی عەرەبەکانەوە، بە پیرۆزیی سەیریان کردووە، هەر کەسێ پەنای بۆ بردبێ لەسەرو ماڵی دڵنیا بووە... بە ئادەمیزادی خواپەرستمان گوت: ﴿وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾ شوێنی ئەو بەردەی کە حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلام) کاتی دروست کردنی دیواری کەعبە دەچووە سەری، بیکەنە شوێنی نوێژی سوننەت‌و خواپەرستی لێ بکەن، یان مەبەست بە مەقامی ئیبراهیم ئەوەیە هەموو کەعبە بگرێتەوە، واتە کەعبە یەکەم قیبلەیە کە خواپەرستان روویان تێ کردووە، نەوەکانی ئیبراهیم یەکتاپەرستیان تێدا ئەنجام داوە، جا لەبەر ئەوەی کەعبە ماڵی خودایە موڵکی کەسی تر نیە، بۆیە پەروەردگار ئەرکی پاک کردنەوەی‌و چاک کردنەوەی‌و ئامادە کردنی بۆ خواپەرستی خستە ئەستۆی دوو بەندەی راستاڵی خۆی کە حەزرەتی ئیبراهیم‌و ئیسماعیلە (عَلَيْهِما السَّلاَم) ﴿وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ﴾ فەرمانمان بە ئیبراهیم‌و ئیسماعیل کرد: کە خانووی ئێمە پاک بکەنەوە، هەرشتێ شیاوی پلەو پایەی یەکتاپەرستی نەبێ لێی دوور بخەنەوە، ئامادەی بکەن بۆ ئەوانەی دێنە حەج بە دەوریدا هەڵدەسوڕێن، یان لە ناویدا دەمێننەوە نوێژی تێدا دەکەن، روکوع‌و سوجدەی تێدا دەبەن، ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا بَلَدًا آمِنًا﴾ باسی ئەوە بکە: کە حەزرەتی ئیبراهیم نزای کردو لە خودا پاڕایەوە وتی: خودایا: ئەم شوێنەی کە من عیبادەتخانەی تێدا ئاوەدان دەکەمەوە بیکەی بە شارێکی هێمن‌و ئاسایش‌و خۆشگوزەرانی‌و لە هەموو

ئازارو ناخۆشییەك پارێزراو بی ﴿وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ﴾ دانیشتوانی بە رزقو رۆزیـیو بـەرو بـووم خـەنی بکـە، هـەموو کاتـێ بـازاری پربـێ لـە میوەجـاتو خواردەمەنی ﴿مَنْ آمَنَ مِنْهُم بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ ئەوانـەی لـە نـاو ئـەو دانیـشتوانەدا ئیمانیان بە خوداو رۆژیی دوایی هەیە... ئەمجار پـەروەردگار ﴿قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلاً﴾ فـەرمووی: ئەوانـەی کـافرن لـە ژیـانی دونیـادا هەنـدێ خۆشـییان دەدەمـێ ﴿ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَى عَذَابِ النَّارِ﴾ ئەمجار راپێچیان دەکەم بۆ ناو سـزای دۆزەخ ﴿وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ ئـاگری دۆزەخـیش خـراپترین شـوێنێکە کـە ئـادەمیزاد تێـی بـچێ. ناخۆشـترین شـوێنی حەوانەوەیە.

## بنیاتنانی کەعبەو نزاو پارانەوەی ئیبراهیمو ئیسماعیل

﴿ وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ ﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار نیعمەتـەکانی خـۆی وەبـیر عەرەبـەکان هێنایـەوە، رێـزو شکۆمەندیی کابەی راگەیاند، دوا بـە دوای ئـەوە، ئـەوەی بیرهێنانـەوە کـە ئـەو کەسـەی

ئەو خانووەی دروست کردووە، حەزرەتی ئیبراهیمو حەزرەتی ئیسماعیل بوون، بۆ ئەوەی سەرنجیان رابکێشێ بۆ ئەوەی چاو لەو باوکو باپیرە بەرێزانەیان بکەن، ئایینی پەسەندکراوی وەربگرنو فەرمووی:

﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ﴾ باسی ئەوە بکە ئەو کاتەی کە حەزرەتی ئیبراهیمو ئیسماعیلی کوڕی بناغەی دیواری کەعبەیان دادەناو چینەکانی دیوارەکانیان بەرز دەکردەوەو سەرگەرمی کار لێ کردنی بوون، بەملکەچیو بەندایەتی کردنەوە روویان لە پەروەردگار دەکردو دەیانگوت: ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ خودایە! لێمان قبووڵ بکەو رەنجمان بە زایە مەدەو کارەکەمان سوود بەخش بێ!! بێگومان تۆ هەموو دوعاو نزاو پاڕانەوەیەك دەبیسیو ئاگادارو زانای بەسەر هەموو شتێکدا ﴿رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ﴾ خودایە! وامان لێ بکە بە تەواویو بەردەوامی گەردن کەچو پابەندی فەرمانەکانت بینو بتوانین خوداپەرستی خۆمان ئەنجام بدەین ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ﴾ هەروەها لە نەوەکانیشمان گەلێکی خواپەرستو موسوڵمان بێنە ئاراوە، چونکە دڵی ئادەمیزاد وا لەناو دوو پەنجەی قودرەتی خودادا، چۆنی بوێ ئاوا ئاراستەی دەکا، دوعاکەش ئەوە دەگەیەنێ کە سروشتی گەلی موسوڵمان هاوکاری کردنی یەکترییە لە بیرو باوەڕدا درێژەپێدانی ئەم بیرو باوەڕەیە بۆ چینەکانی داهاتووش ﴿وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ خودایە! شوێنی خوداپەرستیو چۆنیەتی حەج کردنو شوێنەوارەکانمان پیشان بدەو تێمان بگەیەنە چۆن حەج بکەینو لەکوێڕا دەست پێ بکەینو لەکوێ کۆتایی پێ بهێنین... خودایە! لەکاتی ئەنجامدانی کاروباری حەجو خوداپەرستیدا ئەگەر هەڵەیەکمان بوو کەمو کورتیمان هەبوو، یان هەرکاتێ دوای کردنی تاوانێك پەشیمان بووینەوە، بۆ لای تۆ گەڕاینەوە، تۆبەمان لێ قەبوڵ بکەو لێمان خۆشبە، بێگومان هەر زاتی پەروەردگارت میهرەبانو تۆبە وەرگرو بە بەزەییو دلۆڤانە!

پەروەردگارا! نەوەکانی ئێمە لە عەطاو بەخششی بێ پایانی خۆت نائومێد نەکەی رەهنومایان بکەو ئاگاداریان بە ﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ﴾ پەروەردگارا! لەکاتی پێویستدا پێغەمبەرێك بنێرە بۆ سەر ئەو نەوانەی ئێمە: نامەی تۆیان بۆ بخوێنێتەوە، فێری ئادابو کەمالی نەفسیان بکا، ناوەڕۆکی کتێبی تۆیان تێ بگەیەنێ، حیکمەتو ژیرییان فێربکا، ئەو پێغەمبەرە بەهۆی رەوشتو ئەخلاقی بەرزی، دڵیان پاك بکاتەوە لە ئەخلاقی خراپو رەوشتی بەد رزگاریان بکا ﴿إِنَّكَ أَنتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ﴾ بەڕاستی پەروەردگارا! تۆ خودایەکی وەهای دەسەڵاتت بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو هەموو کارێکت پڕ حیکمەتەو لەهەموو ئیشێکا داناو زانای، ئیتر پەروەردگار دوعاکەی ئیبراهیمی وەرگرت!! ئەوەبوو دوای چەند چەرخێك لەنەوەی ئیبراهیم پەروەردگار حەزرەتی (محمد)ی (دروودی خوای لەسەر بێ) کرد بە پێغەمبەرو قورئانی بەخەڵات دایە، ئەویش بەوپەڕی توانایەوە لێبڕا بۆ گەیاندنی پەیامەکەیو رزگارکردنی ئادەمیزاد لە گومڕاییو نەزانیو پاك کردنەوەی بیرو باوەڕیان لەبت پەرستیو هاوبەشی پەیداکردن.

## نەفامی ئەو کەسانەی لەئایینی حەزرەتی ئیبراهیم لادەدەن

﴿ وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ ۚ وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ ۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَآ

إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَـٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾﴾.

ئیبنو عویەینە دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی سەلام، برازاکانی – کە ناویان (سەلەمە)و (موهاجیر) بوو – بانگ کردن بۆ موسوڵمان بوونو پێی گوتن ئێوە دەزانن پەروەردگار لە تەوراتدا فەرموویەتی: من لە نەوەی ئیسماعیل پێغەمبەرێك دەنێرم ناوی (محمد)ە کەسێك بڕوای پێ بکا سەرفیرازو هیدایەتدراوە، کەسێك بڕوای پێ نەکا ئەوە نەفرین لێکراوە (سەلەمە) موسوڵمان بوو (موهاجیر) بە جولەکەیی مایەوە.. ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ:

﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلاَّ مَن سَفِهَ نَفْسَهُ﴾ کەس نیە لابدا لە ئایینی ئیبراهیم کە ئایینێکی پاكو بێ خەوشە، مەگەر کەسێ سوکایەتی بەخۆی بکاو ڕێزی خۆی نەگرێ ﴿وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ﴾ بێگومان ئێمە لە دونیاداو لەسەردەمی خۆیا ئیبراهیممان هەڵبژارد لەناو کۆڕو کۆمەڵی ئەو ڕۆژگارەدا پلەو پایەی پێغەمبەریمان پێ بەخشی، ئەویش بە عەزمێکی پۆڵایینوبە لێهاتوویی ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام داو لە پاشەڕۆژیشا یەکێکە لە بەندە ڕاستاڵەکانی خوداو بە کەڵەمەردی ڕۆژگاری خۆی حسێب دەکرێ، هەموو کەس دان بە پلەو پایەیدا دەنێ، بناغەی ئەم هەڵبژاردنو پلەو پایە پێدانەش لەو کاتەوە بوو کە ﴿إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ﴾ ئەو کاتەی کە خودا فەرمانی پێکردو پێی فەرموو: - واتە خستیە ناو دڵیەوەو فەرمووی – گەردن کەچ ببەو فەرمانبەرداری خودای خۆت بە ﴿قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ئەویش لە وەڵامدا یەکسەر وتی: ئەوا بە هەموو توانامەوە بە لێبڕاوی گەردنکەچی پەروەردگاری بوونەوەر بوومو فەرمانبەردارم.

جا وەنەبێ ئیبراهیم بە ئەوەندە وازی هێنابێ بەڵکوو ئامۆژگاری نەوەکانی دوای خۆشی کرد، وەصیەتی بۆ کردن کە خوداپەرستو موسوڵمان بن ﴿وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ

بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلاَ تَمُوتُنَّ إَلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ ئیبراهیم وەصیەتی بۆ کوڕەکانی کرد هەروەها حەزرەتی یەعقوبیش هەر وەصیەتی بۆ نەوەکانی ئەوەبوو کە هەرگیز واز لە ئایینی ئیبراهیم نەهێنن، وتیان: ئەی ڕۆڵەکانمان! پەروەردگار ئایینی پاكو بی خەوشی بۆ ئێوە هەڵبژاردووە کە ئایینی ئیسلامە کەواتە: ئێوە بە نا موسوڵمانی لە دونیادا دەرمەچن. هەمووتان لەسەر ئایینی ئیسلام بەردەوام بنو پاشگوێی مەخەنو ئەم پلەو پایەی ڕەهبەرییە کە داویەتی بە خانەدانی ئێوە بە فیرۆی مەدەن!

ئەمە بوو وەصیەتی ئیبراهیم بۆ کوڕەکانی، هەروەها وەصیەتی یەعقوب بۆ کوڕەکانی ئەو وەصیەتەی کە یەعقوب لە دوا دوا ساتەکانی ژیانیدا تەنانەت مۆتەکەی مردنیشی نەیتوانی ئەم وەصیەتەی لەبیر بەرێتەوە! چونکە ئەم وەصیەتە، ئەم پەیامە ئەوەندە لە هەستو شعوری یەعقوبدا قووڵ بووبووەوە دێوەزمەی مردنیش نەیتوانی ئەو هەڵوێستەی لەپێش چاو چەواشە بکا، تا لەو کاتەشدا ئەم پەیامە پیرۆزەی لەهەموو شتێك زیاتر لەلای نومایان بوو، ویستی وەکوو ئەرکێکی سەرشانی حەقیقەتێکی پێغەمبەرایەتی دوا ساتەکانی ژیانی ئەم پەیامە پیرۆزە بەسەر بەرێ.

## پوچەڵکردنەوەی داوای جولەکە کە دەڵێن: ئێمە لەسەر ئایینی (ئیبراهیمو یەعقوب)ین

﴿ أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ ٱلۡمَوۡتُ إِذۡ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعۡبُدُونَ مِنۢ بَعۡدِي قَالُواْ نَعۡبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ

تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٤﴾ وَقَالُوا۟ كُونُوا۟ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ تَهْتَدُوا۟ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٣٥﴾ قُولُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِىَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٦﴾ فَإِنْ ءَامَنُوا۟ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا هُمْ فِى شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٣٧﴾

﴿١٣٣﴾ appears before تِلْكَ at the start.

ئایەتی (١٣٣) دەربارەی جولەكەكان هاتۆتە خوارێ كە بە پێغەمبەریان گوت: تۆ نازانی كە یەعقوب لەسەرەمەرگا وەسییەتی بۆ كوڕەكانی كرد كە ئایینی یەعقوب پەیڕەو بكەن، هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٣٥)یش قسەكەی (ابن صوریا)ی جولەكەیە كە بە پێغەمبەری گوت ڕێگای حەق ئەوەیە كە ئێمە لەسەری دەڕۆین، ئەی موحەممەد تۆش شوێن پێغەمبەری ئێمە بكەوە! گاورەكانیش هەمان قسەیان كرد!

پەروەردگار رەدی دانەوەو فەرمووی: ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاء إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِن بَعْدِي﴾ ئایا ئێوە ئەی موسوڵمانەکان! یا ئەی جولەکەکان ئاگادارو شایەت بوون ئەو کاتەی کە یەعقوب پێش مردنی بەچەند چرکەیەك رووی کردە کوڕەکانیو پێی گوتن دوای من کێ دەپەرستن؟ ﴿قَالُواْ نَعْبُدُ إِلَهَكَ وَإِلَهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ إِلَهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ وتیان: ئەو خودایە دەپەرستین کە تۆ دەیپەرستی، خودای تۆو خودای باوكو باپیرانی تۆ. (ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاق) خودایەکی تەنیاو بێ شەریکە، ئێمە گەردنکەچی فەرمانی ئەوینو هەرواش دەمێنینەوە..

بەم وەڵامە جوانە کوڕەکانی یەعقوب باوکیان لە غەرغەرەی مردندا دڵنیا کرد، ئەم ئایەتە پیرۆزە بیروباوەڕێکی جولەکەکان ڕەت دەکاتەوە کە دەیانگوت: کاتی خۆی حەزرەتی یەعقوب وەسیەتی بۆ کوڕەکانی ئەوە بووە: کە لەسەر ئایینی جولەکە بمێننەوەو وە هیچ ئایینێکی تر قبوڵ نەکەن، ئەمە شایەتدانی پەروەردگارە دەرخستنی راستیەکی مێژوییە: کە جولەکەکان دەیانویست بیشارنەوەو بیشێوێنن، جا کە ئەوە هەڵوێستی ئیبراهیمو یەعقوب بووبێ، ئەوە وەسیەتو ئامۆژگاریان بووبێ، بۆ کوڕەکانیانو ئەوەش وەڵامی راستەوخۆی رۆڵەکانیان بووبێ! ئەمەش هەڵوێستی نارەوای ئێستای جولەکەکان بێ بەرامبەربە بانگهێشتنی ئیسلامی، دیارە هەرکەسە بە گوێرەی کرداری خۆی پاداشو سزا وەردەگرێتەوە ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ﴾ حەزرەتی ئیبراهیمو پەیڕەوکەرانی، یەعقوبو کوڕەکانی، ئەوانە پابەندی وەسیەتەکەی ئەو رەهبەرانە بوون، ئەوانە کۆمەڵێکی بەختیار بوونو رابوردنو ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ﴾ چی کردەوەی باشیان کردووە بۆ سودی خۆیانەو خۆیان پێی بەختەوەر دەبن ﴿وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ﴾ ئێوەش چی کرداری باشتان هەبێ بۆ سودی خۆتانە ﴿وَلاَ تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئێوە بەرپرسیار نین لە کرداری ئەوان، بەڵکوو هەموو کەس لە کرداری خۆی بەرپرسیارەو بەس ﴿وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَارَى تَهْتَدُواْ﴾ جولەکەکان دەیانگوت:

وەرنە سەر ئایینی جولەکە سەرفراز دەبن.. گاورەکانیش دەیانگوت: وەرنە سەر ئایینی مەسیحی لە گومرایی رزگارتان دەبێ.. بەم شێوەیە هەریەکەیان خەڵکی بانگ دەکەن بۆسەر ئایینە چەوتو دەست لێدراوەکەیان ﴿قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ ئەی محمد: پێیان بڵێ: بەڵکوو ئێمەو ئێوە شوێن ئایینی باوکە گەورەکەمان حەزرەتی ئیبراهیم دەکەوین کە سەرچاوەی ئیسلامە ئایینێکی پاكو خاوێنە، ئایینی ئەو پێغەمبەرەیە: کە لەگەڵ خودادا پەیمانی داو پەیمانەکەی بردە سەرو هەرگیز هاوەڵی بۆ خودا بە ڕەوا نەبینیوە. بەڵام ئێوە شەریك بۆ خودا دادەنێن! پەروەردگار بانگەواز بۆ موسوڵمانان دەکا بۆ ئیعلانکردنی یەکێتی ئایینی سەرتاسەریی!

هەر لەسەردەمی حەزرەتی ئیبراهیمەوە (باوکی پێغەمبەران) تا سەردەمی عیسای کوڕی مریەمو هاتنی ئایینی ئیسلامو بانگەوازی جولەکەو مەسیحیەکان دەکا بۆ ئەوەی ئیمان بەم ئایینە بێ وێنەو نمونەییە بێنن ﴿قُولُواْ آمَنَّا بِاللّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا﴾ ئەی بڕواداران هەمووتان بەیەك دەم بڵێن بڕوامان هێنا بە خوداو بەو قورئانە گەورەیەی کە بۆمان نێردراوە ﴿وَمَا أُنزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ وَالأسْبَاطِ﴾ ئیمانمان هێناوە بەو پەیامەی کە بۆ ئیبراهیمو ئیسماعیلو یەعقوبو نەوەی ئیبراهیمو ئیسحاق کە پێیان دەگوترێ: ئەسباط ﴿وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى﴾ بڕوامان بە تەوراتی موساو ئینجیلی عیسا هەیە، واتە: بەو تەوراتو ئینجیلەی کە دەستکاری نەکراون ﴿وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ﴾ هەروەها ئیمانمان هەیە بەو پەیامو نیگایەی کە لە خوداوە نێردراوە بۆ پێغەمبەرانی تر بڕوامان بە هەموویان هەیە بەمەرجێك لەلایەن خوداوە هاتبێ موعجیزەو بەڵگەی پێغەمبەرایەتی نواندبێ: ﴿لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ﴾ ناچین بڕوامان بە هەندێکیان هەبێو بڕوامان بە هەندێکیان نەبێ، وەکوو ئەوەی کە جولەکەو گاور دەیکەن ﴿وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ ئێمە هەموومان گەردنکەچی پەروەردگارین، پابەندی فەرمانەکانی ئەوین ﴿فَإِنْ آمَنُواْ بِمِثْلِ مَا آمَنتُم بِهِ

﴿فَقَدِ اهْتَدَواْ﴾ جا ئەگەر خاوەننامەكان – جولەكەو گاورەكان – ئیمانیان هێنا بەو بەرنامەی ئێوە بڕواتان پێیەتی ئەوە ڕێبازی ڕاستیان دۆزیوەتەوە، كەوتونەتە سەر ڕێگای خوداپەرستی ﴿وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ﴾ ئەگەر پشتیان هەڵكردو لە ئیمان هێنان بەو بەرنامەیەی بانگەوازی بۆ كردن‌و نەهاتنە ژێر ئالای ئیسلام‌و بڕوایان بە قورئانەكە نەكرد، ئەوە بزانە ئەوانە دەیانەوێ دوژمنایەتیت بكەن‌و هەرگیز ئەوانە حەق خواز نین ﴿فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللّهُ﴾ ئەی (محمد)! دڵنیابە خودا لەشەڕی شوومی ئەوان دەتپارێزێ ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ پەروەردگار بیسەرە، گوێی لە ئاخاوتنی ئەوانە، زاناو ئاگادارە بەوەی كە لە دڵیان دایە لە فێڵ‌و پیلان‌و شەڕ دژی موسوڵمان.

## مۆركی ئیمان‌و كاردانەوەی لە دەروونـدا

﴿ صِبْغَةَ ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً ۖ وَنَحْنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ ﴿١٣٨﴾ قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِى ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ ﴿١٣٩﴾ أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَٰهِۦمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطَ كَانُواْ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ۗ قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ ۗ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٠﴾

﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١٤١)﴾.

ئیبنو عەباس دەفەرموێ: نەصرانییەكان كە منداڵێكیان دەبوو دوای حەوت رۆژ لە ئاوێكدا كە ناوی (مەعموودی) بوو منداڵەكەیان رەنگ دەكرد پێیان وابوو پاك دەبێتەوەو دەبێتە نەصرانی تەواو ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ كە دەفەرموێ: ﴿صِبْغَةَ اللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ صِبْغَةً﴾ ئەو ئایینەی كە ئێمە پەیڕەوی دەكەین ئایینی خودایە، خودا ئێمەی بەو ئایینە رەنگ كردووە، نیشان زەدی كردوین، شوێنەواری ئەو ئایینەمان پێوە دیارە، وەك چۆن رەنگ بە جلو بەرگەوە دیاریی دەدا. كەس وەكوو پەروەردگار ناتوانێو نازانێ ئایین بۆ ئادەمیزاد دیاری بكا. ﴿وَنَحْنُ لَهُ عَابِدونَ﴾ ئێمە هەر ئەو خودایە دەپەرستین كەسی تر بە خودا نازانین ﴿قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِي اللَّهِ﴾ پێیان بڵێ: ئایا ئێوە دەربارەی خودا كێشەم لەگەڵ دەكەنو پێتان وایە ئێوە كوڕی خوداو خۆشەویستی خودان؟! پێغەمبەران هەر دەبێ لە كۆمەڵی ئێوە بن لە هۆزو نەتەوەی تر پێغەمبەر نەنێردرێن؟؟ ﴿وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ﴾ پەروەردگار خودای ئێمەش‌و ئێوەشە، هەمووومان بەندەی ئەوین ﴿وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ﴾ پاداش‌و سزای كردەوەی خۆمان بۆ خۆمانەو پاداش‌و سزای كردەوەی خۆتان بۆ خۆتانە، كەس گوناهی كەس هەڵناگرێ كەس لەجیاتی كەس سزا نادرێ ﴿وَنَحْنُ لَهُ مُخْلِصُونَ﴾ ئێمە خوداپەرستی‌و بەندایەتیمان بۆ خودا راستاڵانەیەو هەموو كردەوەیەكمان لەبەر خاتری رەزامەندیی خودایە. ﴿أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطَ كَانُواْ هُودًا أَوْ نَصَارَى﴾ یان ئیدیعای ئەوە دەكەن كە ئیبراهیم‌و ئیسماعیل‌و ئیسحاق‌و یەعقوب‌و نەوەكانیان جولەكە یان گاور بوون ﴿قُلْ أَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللَّهُ﴾ ئەی محمد (درودی خوای لەسەر بێ) پێیان بڵێ: ئایا ئێوە ئاگادارترن بە ئایینی ئەو

رەهبەرانــە یــان پــەروەردگار؟ بێگومــان خــودا شــایەتی ئــەوەی بــۆ داون کــە ئەوانــە هەموویان لەسەر ئایینی ئیسلام بوون، نە جولەکە بوون نە گاور! وەکوو لـە شـوێنێکی تـردا دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلاَ نَصْرَانِيًّا وَلَكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا﴾ ئیـبراهیم نە جولەکە بووە نـە گـاور بـووە، بـەڵکوو دینـدارو بـێ خـەوش‌و موسوڵمان بـووە، ئیـتر ئێوەی جولەکەو گاور چۆن پێتان وایە: کە ئەو رەهبەرانە لەسـەر ئـایینی ئێوە بـوون؟ ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَـهَادَةً عِنـدَهُ مِـنَ اللّـهِ﴾ کـێ لـەو کەسـە زاڵـم‌و ستەمکارتره کە ئایەتەکانی تەورات‌و ئینجیل ژێر لێو بخا بیان شـارێتەوە؟ ئـەو ئایەتانـەی کـە مزگێنـی هاتنی حەزرەتی (محمد)ی تێدایە سرپۆشیان بکا؟ کێ لەو کەسە زاڵـم تـرە کـە پـەیامی پەروەردگار: کە دەڵێ پێغەمبەران هەموویان لەسەر ئایینی ئیـسلام بـوون، بیـشارێتەوە ﴿وَمَا اللّهُ بِغَافِـلٍ عَمَّـا تَعْمَلُـونَ﴾ خـودا ئاگـادارە ئەوانـە چـی دەکـەن‌و چـی دەشـێرنەوە، ئاگاری هەموو کردەوەیەکیانەو سـزای دادوەرانـەی خۆیانیـان دەداتـەوە ﴿تِلْـكَ أُمَّـةٌ قَـدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَـسَبْتُمْ وَلاَ تُـسْأَلُونَ عَمَّـا كَـانُواْ يَعْمَلُـونَ﴾ ئـەم ئایەتانـەی دووبارە کردەوە چونکە هەڕەشەو ترساندنی تێدایە. واتە: ئەگەر رەهبەران لەگەڵ ئـەو هــەموو رێــزو نرخــەی هەیانــە ســزاو پاداشــی کــردەوەی خۆیــان وەربگرنــەوە، ئێــوە بەولاترەوە سزاو پاداش وەردەگرنەوە، (پێش کەمێك تەفسیری ئەم ئایەتە کرا).

**بەیارمەتی خودای مەزن تەفسیری جزمی یەکەم لە تەفسیری رەوان بۆ تێگەیشتنی قورئان تەواو بوو، جزمی دووەم بە شوێنیدا دێ‌و بە ئایەتی (١٤٢)ی سورەتی (البقرە) دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ السُّفَهَاء مِنَ النَّاسِ مَا وَلاَّهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ الَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَا قُل لِّلّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ يَهْدِي مَن يَشَاء إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ دەست پێ دەکا. خودایە تەوفیقمان بدە لەسەر درێژەدان بە کارەکەمان‌و بە قبوڵی حەسەن لێمان وەربگرە ئامین!!**

## ڕێخۆشکردن بۆ گۆڕینی ڕوگە (قیبلە)

﴿ ۞ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَاۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُۚ يَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًاۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾ ﴾.

قورئانی پیرۆز هەر بەردەوامە لەسەر بەرەنگاربوونەوەی جولەکەکانو داکۆکی لە گۆڕانی ڕوگە (قیبلە) دەکاو ڕاو بۆچوونی جولەکەو هەموو هاوپەیمانەکانیان ڕەت دەکاتەوە.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە مەدینە کە نوێژی دەکرد رووی دەکردە بەیتولمقدیس! وەکوو چۆن پێغەمبەرانی پێشوو روویان تێ دەکرد، شانزە مانگ یان حەڤدە مانگ لە مەدینە لەسەر ئەم شێوە مایەوە، بەڵام هەمیشە ئاواتەخوازی ئەوەبوو: کە روو بکاتە کەعبەو لە خودا دەپاڕایەوە کە رووی پێ لە ڕۆگەی بابەگەورەی خۆی حەزرەتی ئیبراهیم بکا کە کابەی پیرۆز بوو!

پەروەردگار نزاو پاڕانەوەکەی گیراکردو ئاواتەکەی هێنایە دی! فەرمانی پێکرد کە روو بکاتە خانووە دێرینەکە (البیت العتیق).. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) یەکەم نوێژ کە لە مەدینە رووەو کەعبە کردی، نوێژی عەسر بوو، ئیتر جولەکەکانو دووڕووەکان کەوتنە مقۆ مقۆو وتیان: چی پاڵی بە موحەممەدو هاوەڵانیەوە نا، کە رۆگەی خۆیان لە بەیتولەقدیسەوە بگۆڕن بۆ لای کەعبە؟! وتیان: دیارە موحەممەد بیری زێدی خۆی کردۆتەوە، زۆری پێ ناچێ دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئایینی خۆی!

سەرەتای ئایەتەکە رەتدانەوەی رەخنەی جولەکەو دووڕووەکانە کە هێشتا رەخنەکەیان نەگرتبوو! ئەمە موعجیزەیەك بوو بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پەروەردگار دەرسی داداو فێری بەڵگەهێنانەوەی کرد، بۆ ئەوەی ئامادەباشی تێدابێ بۆ وەڵامدانەوەو فەرمووی: ﴿سَيَقُولُ السُّفَهَاء مِنَ النَّاسِ مَا وَلاَّهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ الَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَا﴾ ئەو ئادەمیزادانەی کە تێ نەگەیشتوونو بێ عەقڵو نەفامنو کوێرانە شوێن خەڵك کەوتوونو هیچ تێفکرینیان نیە کە بریتین لە دووڕووەکانو جولەکەو گاورەکان، دەڵێن: چ شتێك رووی‌دا موسوڵمانەکان ئاوا گۆزو گومەت روویان لە (بیت المقدس) وەرگێڕا کە لەوە پێش قیبلەیان بوو، قیبلەی پێغەمبەرانی رابوردوش بوو، ئاوا روویان کردە کەعبە؟!

﴿قُل لِّلّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ يَهْدِي مَن يَشَاء إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ ئەی (محمد!) وەڵامیان بدەرەوەو پێیان بڵێ: هەموو لایەك، رۆژهەڵاتو خۆرئاوا، باشوورو باکور، سەرو خوارو هەمووی هی خودایەو موڵکی خۆیەتی، هەرکەسێ ئارەزووی لێ بێ دەیخاتە سەر رێگای راستو دروست. بەردی (بەیتولمقدیس) لە بوونی خۆیدا لە بەردێکی تر پیرۆزتر نیە، هیچ زێدەو سوودو قازانجێکی وای تێدا نیە کە لە بەردەکانی تردا نەبێ! هەروەها دارو بەردی کەعبەش لە خودی خۆیا لە دارو بەردی شوێنی تر زێدەتر نینو ئەم رێزو پیرۆزیەی کە دراوە پێیان بە هۆی فەرمانی خوداوە کە کردوونی بە قیبلەی خوداپەرستانو فەرمانی پێ کردوون: کە لە کاتی نوێژکردندا رووی تێبکەن تا لە کاتی خوداپەرستیدا یەکیەتی بخاتە نێو ئادەمیزادەوە.. بەڵام ئەو

بێ عەقڵانە پێیان وایە قیبلە بناغەی ئایینە، بەردێك خانوویەك، خۆی لە خۆیدا زێدەو فەضلو ڕێزی هەیە، تەنانەت کار گەیشتە ئەوە کە جولەکەکان بە پێغەمبەریان گوت: رووبکەرەوە قیبلەی ئێمە تا شوێنت بکەوین، مەبەستیشیان تاقیکردنەوەی پێغەمبەرو هەڵخەڵەتاندنی بوو.

سەرجەم ریوایەتەکانی تایبەت بەم رووداوی قیبلە گۆڕانە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە موسوڵمانان لەسەرەتای واجب بوونی نوێژدا روویان کردۆتە کابە دوای کۆچکردنی پێغەمبەرو هاوەڵانی بۆ مەدینە روویان کردۆتە بەیتول مەقدیس.. ئەمجار بەم فەرمانە قورئانیە موسوڵمانان رۆیان کردۆتەوە کابە. بەهەر حاڵ روو تێکردنی موسوڵمانان بۆ بەیتول مەقدیس کە قیبلەی جولەکەو مەسیحیەکانە هۆکارێکی بەهێزبووە کە جولەکەکان بیکەنە هۆی لە خۆبایی بوونو موسوڵمان نەبوونیان، چونکە بەو رووتێکردنە گەزافیان کێشاو لە مەدینەدا دەستیان کرد بە پڕۆپاگەندە، دەیانگوت: رووتێکردنی (محمد)و هاوەڵانی بۆ بەیتول مەقدیس بەڵگەی ئەومیە کە ئایینەکەمان (ئایینی جولەکە) راستەو قیبلەکەمان راستە، ئێمە سەرچاوەی ئایینەکانین، کە وابێو وا چاکە بۆ پێغەمبەرو ئەوانەی لەگەڵیدان بێنە سەر ئایینی ئەمان نەك بە پێچەوانەوە، پێغەمبەر ئەوان بانگ بکا بۆ چوونە ناو ئیسلام..

لەلایەکی ترەوە عەرەبە موسوڵمانەکان لەسەر شانیان گران بوو کە ئەوان لەسەردەمی نەزانیدا ئەو هەموو ڕێزەی کەعبەیان دەگرتو کەچی لەسەردەمی ئیسلامیدا رووی تێنەکەن، سەرباری ئەوەش ئەو فشەفشەی جولەکەکان بەسەریاندا دەکردنو دەیان بەڵگەی موسوڵمان نەبوونیان دەهێنایەوە، پێغەمبەریش هەستی بەم ئازارە دەروونیەی هاوەڵانیو موسوڵمانان دەکرد، دەستی بەرز دەکردەوەو رووی لە ئاسمان دەکردو چاوەڕوانی تەوجیهی خودایی بوو،جا ئەم ئایەتە نازڵ بوو کە دەفەرموێ: ﴿قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاء فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوِهَكُمْ شَطْرَهُ - البقرة/١٤٤﴾، ئیتر لەمەوە پڕوپاگەندەی جولەکەکان پەرەی سەندو چونکە پێیان ناخۆش بوو، کە پێغەمبەرو

هاوەڵانی روو لە قیبلەی ئەوان وەرگێڕنو ئەو بەڵگەیەی لەوەپێش پشتیان پێ بەستبوو بە دەستیانەوە نەمێنێ، ئیتر دەستیان کرد بە پروپاگەندەی جۆراو جۆر بۆ دڵەڕاوکە خستنە نێو کۆمەڵی موسوڵمانو گومان پەیداکردن لە ناویاندا دەربارەی سەرکردایەتیو بیروباوەڕیان، ئەوە بوو جولەکەکان بە موسوڵمانەکانیان دەگوت: ئەگەر لەوەپێش روتێکردنتان لە بەیتولمەقدیس بە تاڵ بووبێ ئەوە دیارە ئەو هەموو نوێژو خواپەرستیەی لەوەپێشتان بەتاڵە، خۆ ئەگەر رووتێکردن لە بەیتولمەقدیس راست بووبێ ئەوە بێگومان ئێستا رووتێکردنتان لە کابە گومڕاییەو هەر نوێژێك بەرەو کەعبە بکەن بەتاڵە،...

گۆڕانی قیبلە لە بەیتولمەقدیسەوە بۆ کەعبە رووداوێکی گەورە بوو لە مێژووی گرۆهی موسوڵماندا، رەنگدانەوەیەکی گەورەشی لە ژیاندا پەیدا کرد! گۆڕانی قیبلە لەسەرەتاوە لە کەعبەوە بۆ بەیتولمەقدیس لەبەر حیکمەتێکی پەروەردە ئامێز بووە، ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنتَ عَلَيْهَا إِلاَّ لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَى عَقِبَيْهِ﴾ جا چونکە عەرەبەکان کەعبەیان بە گەورە دەزانیو بە پێناسەی رێزو خانەدانی خۆیانیان حسێب دەکرد، ئایینی ئیسلامیش مەبەستی سەرەکی ئەوەیە کە ئادەمیزادەکان قاڵ بکا بۆ خواپەرستی راستو دروست، لە هەموو پەیوەندیەکی دەرەکی روتیان بکاتەوە، هەموو نەژادپەرستیو دەمارگیریو چینایەتی لە دڵو دەروونیان دەربهاوێ! بۆیە رووی پێ لە کەعبە وەرگێڕانو رووی پێکردنە بەیتولمەقدیس، تا دڵو دەروونیان لە خڵتەی نەفامیەتیو سەردەمی نەزانی پاك بکاتەوە، بۆ خاتری ئەوەی دەربکەوێ کێ فەرمانبەردارەو راستاڵانە گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگارەو بە دڵێکی پڕ بیروباوەڕەوە پابەندی فەرمانی خودا دەبن! لەو کاتانەدا کە موسوڵمانەکان پابەندبوونو روویان کردە ئەو قیبلەیەی کە پێغەمبەر رووی پێ تێکردوونو ئا لەو کاتەدا جولەکەکان ئەمەیان کردە بیانۆی ئەوەی کە پێویست ناکا موسوڵمان بن، بەڵکوو دەبێ موسوڵمانەکان بێنە سەر ئایینی ئەمان چونکە موسوڵمانەکان روویان کردۆتە قیبلەی ئەوان، ئەمجار کە فەرمانی ئیلاهی دەرچوو

بەوەی کە موسوڵمان روو بکەنە کەعبەو روو لە بەیتولمەقدیس وەرگێرن ئیتر دڵی موسوڵمانەکان بە راستیەکی ترەوە پەیوەست بوو، کە ئەویش پوختەی ئایینی ئیسلامە، پوختەی ئەوەی کە ئەم خانووی کەعبەیە ئیبراهیمو ئیسماعیل دروستیان کردووە بۆ ئەوەی کردەوەکەیان تەنها بۆ خودا بێ، بۆ ئەوەی ببێتە کەلەپوور بۆ گەلی موسوڵمان، ئەو گەلەی کە بە دوعاو نزای ئیبراهیم هاتەکایەوە، بە دوعای ئەو، پەروەردگار پێغەمبەری لە خۆیان بۆ ناردن...

بێگومان قسەکردن لە مەسجیدول حەرامو دروستکردنو ئاوەدان کردنەوەیو کێشەو بەرامبەری کردن لەگەڵ جولەکەو مەسیحیەکاندا دەربارەی ئیبراهیمو نەوەکانی، دەربارەی ئایینو قیبلەکەی، دەربارەی عەهدو پەیمانی لەگەڵ خودادا، وەسیەتنامەو ئامۆژگاری کردنەکەی بۆ رۆڵەکانی ئەمانە هەموویان رێخۆشکەرە بوون بۆ گۆڕانی قیبلە لە مەسجیدول ئەقصاوە بۆ مەسجیدول حەرام ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا﴾ بەو شێوە ئێمە ئێوەمان کردووە بە گەلێکی میانەڕەو هەرگیزاو هەرگیز زێدە ڕەوی ناکەنو توندڕەو نین لە هەموو کاروبارێکدا لایەنی گیانیو لایەنی ماددی تێبینی دەکەن.

ئادەمیزاد بەگشتی پێش هاتنی ئیسلام دوو جۆر بوون: جۆرێکیان مادەپەرست بوون هیچ غەمو نارەحەتیان نەبوو جگە لە دابین کردنی پێداویستی مادده بۆ خۆیان، ئەم دیاردەیە لەناو جولەکەو موشریکەکان دا بە زەقی بەدی دەکرا: جۆرێکی تریان بە تەواوی لە دونیا دابڕا بوون، ژیانێکی رەبەنیو دێرنشینیان بۆ خۆیان هەڵبژاردبوو هیچ گرنگییان بە لایەنی جیسمانی نەدەدا وەکوو مەسیحیەکانو صابیئەکانو هەندێ گرووپی بتپەرستی هیندی کە هەمیشە خەریکی خۆ برسی کردنو ئازاردانی جەستەی خۆیان بوون..

کە ئیسلام هات هەر دوو لایەنی بەرچاوگرتن، لایەنی جیسمی، لایەنی گیانی، مافی هەردوو لایەنی پاراست، حەقیدا بە موسوڵمان کە مرۆڤانە بژی، ئەوەی پێ راگەیاندن کە مرۆڤ لە گیانو مادە پێك هاتووە دەبێ هەردوو لا هاوکێشە بکرێنو

پێکەوە بە خێو بکرێن، ئادەمیزاد لایەنی حەیوانیو لایەنی فریشتەیی تێدایە، کاتێک ئادەمیزادی تەواو دەبێ، کە هەردوو لایەنەکەی بەرچاو بگیرێ، پەیامی خودایە، کە دەفەرموێ: ئێمە کە ئێوەمان ئاوا بە میانڕەوی هێناوەتە کایەوە بەبێ هووودە نیە بەڵکوو ﴿لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ﴾ بۆ ئەوەی ببنە شایەت بەسەر ئەو جۆرە کەسانەی کە لایەنی خوداپەرستیو خوداناسیان پاش گوێ خستووە، هەر خەریکی خواردنو خواردنەوەنو خۆیان لە لایەنی گیانی بێ بەری کردووە، دەڵێن: ﴿إن هي إلا حياتنا الدنيا﴾ ژیان هەر ژیانی دونیایەو هیچی تر نیە، هەروەها ببنە شایەتو گەواهی دەر بەسەر ئەو کەسانەدا کە زیادەڕۆییان لە ئایندا کردووە، خۆیان لە هەموو خۆشیو لەززەتێکی جسمانی دوور خستۆتەوە، لە ڕێگای میانڕەوی لایان داوەو ستەم لە جەستەی خۆیان دەکەن، ببنە شایەت بەسەر هەموو لایەکیانداو ببنە پێشەوایان لە میانەڕەویو کار دروستیدا، ئاشکراشە کە میانەڕەویی ئەوپەڕی مرۆڤایەتیەو هەڵوێستێکە بۆ هەموو شتێک مافی خۆی دەداتێ، حەقی پەروەردگار جێبەجێ دەکا، پێداویستی جەستەی خۆی پاش گوێ ناخا، لایەنی رۆحی ئیهمال ناکا، حەقی خزمو کەسو کارو دەرو دراوسێ دەدا، مافی هەموو کەس بە ئەندازەی پێویست دیاری دەکا.

﴿وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾ پێغەمبەریش ببێتە شایەت بەسەرتانەوە چونکە پێغەمبەر بۆ خۆی نموونەی هەرە بەرزی میانەڕەویە، موسوڵمانان کاتێک شیاوی ئەو وەصفو سەنایانەن کە پەیڕەوی شەریعەتی پێغەمبەر بکەن، لە ڕێبازی پیرۆزی ئەو لانەدەن ﴿وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنتَ عَلَيْهَا إِلاَّ لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَى عَقِبَيْهِ﴾ ئێمە کە ئەم ئاڵوگۆڕەمان پێ کردی، ئەو قیبلەی لەوەپێش رووت تێ دەکرد کە (بيت المقدس) بوو، گۆڕیمان بە (مەسجیدول حەرام) بۆ ئەوەبوو دەری بخەین کێ لەسەر ئایین بەردەوامەو، ناگۆڕێ، کێ دڵەڕاوکێی پێ دەکەوێو ڕاڕاو زەبوونو بڕوا لاوازە! جا ئەوانەی لە ئایین حاڵی بوون لە ناوەڕۆکی تێگەیشتوون بەم جۆرە تاقیکردنەوانە زیاتر بیروباوەڕیان پتەو دەبێو پتر نهێنیو حیکمەتەکانی خودایان بۆ دەردەکەوێ، کەسێکیش کوێرانە شوێن خەڵک کەوتبێ ئیمان لە دڵو

دەروونیدا جێگیر نەبووبێ ئەوە دڵو دەروون لاوازەو شكو گومان یاری بە هەستو شعوری دەكەنو هەر رۆژە لە هەوایەكو هەر دەمە بیروڕایەك وەردەگرێ ﴿وَإِنهَا كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلاّ عَلَى الّذِينَ هَدَى اللّهُ﴾ بێگومان ئەم قیبلە گۆڕانە لەسەر شانی ئەوانە گران بوو كە بە قیبلەی یەكەمەوە راهاتبوونو خوویان پێوە گرتبوو، چونكە ئادەمی كە وەگری شتێك بوو خووی پێوەگرت واز لێ هێنانی لەسەرشان قورس دەبێ، مەگەر ئەوانە نەبێ كەخوا بیرو باوەڕی پتەو كردوونو شارەزای حوكمی ئایینی كردوونو نهێنی شەریعەتی تێگەیاندون، گەیشتوونە ئەو قەناعەتەی كە خودا پەرستیو رووكردنە قیبلە كاتێك سوودی هەیە كە بەگوێرەی فەرمانی خودا ئەنجام بدرێ، حیكمەتی هەڵبژاردنی قیبلەیەكیش بۆ خودا پەرستان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مەبەستەی كە بریتییە لە یەكیەتی گەلو كۆبوونەوەیان لەسەر یەك هەڵوێست ﴿وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ﴾ حیكمەتو رەحمەتی خوداش وانیە كە كردارو خودا پەرستی ئێوە بەفیڕۆ بدا، هەرگیز ئەو ئیمانەی كە ئێوەی هەڵناوە بۆ شوێن كەوتنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەفیڕۆ ناچێ، خۆ ئەگەر گۆڕانی قیبلە ببوایە بە هۆكاری ئەوەی كە خودا پەرستی پێشووتان پووچ بكاتەوە قیبلەی نەدەگۆڕی، ئەمە مژدەیەكی خۆشە بۆ موسوڵمانان كە پەروەردگار پاداشی تەواو دەداتەوە بەرێڕەوانی رێبازی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حیسابیان بۆ دەكاو هیچ لە كردەوەی چاكیان كەم ناكاتەوە: ﴿إِنَّ اللّهَ بِالنَّاسِ لَرَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگار زۆر لەگەڵ بەندەكانیدا بە رەحمو بە بەزەییە، هیچ كردارێكی باشی ئەوان هون ناكا، بەڵكوو بەرەحمەتی خۆی زیادەشیان دەداتێ.

## گۆڕانی رۆگە (قیبلە)

﴿ قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةٗ تَرۡضَىٰهَاۚ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ لَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعۡمَلُونَ ﴿١٤٤﴾ وَلَئِنۡ أَتَيۡتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٖ مَّا تَبِعُواْ قِبۡلَتَكَۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٖ قِبۡلَتَهُمۡۚ وَمَا بَعۡضُهُم بِتَابِعٖ قِبۡلَةَ بَعۡضٖۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ إِنَّكَ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٥﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡۖ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنۡهُمۡ لَيَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴿١٤٧﴾ ﴾.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاواتە خوازی گۆڕانی قیبلە بوو لە (بیت المقدس)ەوە بۆ (کەعبە) چونکە کەعبە رۆگەی بابە گەورەی خۆی، حەزرەتی ئیبراهیم بووە، هەروەها رووکردنە کەعبە هاندەرێکی بەهێزبوو بۆ موسوڵمان بوونی عەرەبەکان ئەمەش لەوکاتەدا گرنگییەکی تایبەتی خۆی هەبوو بۆ بڵاوبوونەوەی ئایین....

لەلایەکی ترەوە جولەکەکان دەیانگوت: موحەممەد دژی ئایینەکەمانەو روو دەکاتە قیبلەکەمان!! ئەگەر ئایینی ئێمە نەبووایە ئەو هەر نەیدەزانی لەکوێوە رووبکاتە قیبلە. هەموو ئەم هۆکارانە وایان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کرد: کە پێی ناخۆش بێ رووبکاتە قیبلەی جولەکەکانو ئاواتە خوازی ئەوەبوو پەروەردگار رووی پێ بکاتە رۆگەیەك جیاوازبێ لە قیبلەی جولەکەکان.

ئەبو حەیان دەڵێ: لەبەرئەوەی لەسەرەتاوە هەر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاواتە خوازی گۆڕانی رۆگەبوو، بۆیە قورئان یەکەمجار فەرمانی بەخودی پێغەمبەر کرد: کە لە (بیت المقدس)ەوە رووبکاتە کەعبە، ئەمجار دوای فەرمان بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی بە موسوڵمانانیش کرد کە رووبکەنە کەعبە، تا واهەست نەکرێ کە رووکردنە کەعبە تایبەتە بە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ)و موسوڵمانان ناگرێتەوە ئەوەتا دەفەرموێ: ﴿قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ﴾ زۆرجار بینیومانە ئەی (محمد!) کەتۆ چاوت دەبڕیە ئاسمانو ئارەزۆی ئەوەت بوو: کە قیبلە لە بەیتول مەقدیسەوە بگۆڕێ بۆ (مسجد الحرام) کە یەکەم خانوێکە لەسەر زەوی دروستکراوە، بۆ خودا پەرستی ﴿فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا﴾ دڵنیابە رووت پێ دەکەینە قیبلەیەك کە خۆشت دەوێ‌و پێی رازی دەبی، ئەویش ئەو کەعبەیەیە کە قیبلەو رۆگەی ئیبراهیمی باپیرە گەورەتە ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ لەئێستا بەولاوە لەنوێژدا رووبکەرە کەعبەو بەرەو لای ئەو خانووە پیرۆزە نوێژبکەو فەرمان بە موسوڵمانان بکە ئەوانیش وابکەن ﴿وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ﴾ لەهەر شوێنێك بوون ئەی موسوڵمانان! لەنوێژدا رووبکەنە لای کەعبە، بە پێچەوانەی گاورەکان کە هەر روودەکەنە خۆرهەلات، جولەکەکانیش روودەکەنە خۆرئاوا. ئێوە لەهەر جێیەك بن رووبکەنە کەعبە، ئاوا بەو جۆرە لەهەموو لایەکی سەر رووی زەوی موسوڵمانان روودەکەنە یەك قیبلەو یەك رۆگە، کە هەموو موسوڵمانان کۆدەکاتەوە هەرچەندە ولاتو شوێنیان جیاوازبێ، نژادو زمانو

رەنگیان جوێ بێ، لە خۆرهەڵاتو خۆرئاواوە لە باکورو باشوورەوە رووەدەکەنە کەعبەو واهەست دەکەن یەك جەستەو یەك دڵو یەك گیانن، هەموویان یەك خودا دەپەرستن، لەسەر رێبازی یەك پێغەمبەرنو رووەدەکەنە یەك قیبلەو هەموویان لەبیرو باوەڕدا یەکن!! دەی با بزانین جولەکەو گاورەکان دەربارەی ئەم قیبلە گۆڕانە رایان چییە ﴿وَإِنَّ الَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ جولەکەو گاورەکان دەزاننو لێیان روونە کە کەعبە یەکەم پەرستگای سەر زەوییەو ئیبراهیم بناغەی داناوەو دیوارەکانی بەرزکردۆتەوە، دەزانن کە فەرمان بە روو وەرگێڕان لە بەیتول مەقدیسو رووکردنە کەعبە فەرمانی خودایەو شكو گومانی تێدا نییە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بە پێچەوانەی ئەم زانینو دڵنیابوونەی خۆیان دەجوڵێنەوە، خودا خۆی دەزانێو دەتوانێ چۆن فێڵو فرتەکانیان پووچەڵ دەکاتەوە ﴿وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ﴾ پەروەردگار بێ ئاگا نیە لەو کردارو گوفتارانەی ئەنجامیان دەدەن، سزایان لێ دەستێنێو هەروا بە هەوانتە بۆی دەرناچن!! بێ گومان ئەمە هەڕەشەیەکی سامناکی تێدایە بۆ جولەکەکان کە واز لە کەللە رەقی خۆیان ناهێننو هەر خەریکی هەڵگیرساندنی ئاگری فیتنەو ئاشووبن...

﴿وَلَئِنْ أَتَيْتَ الَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ بِكُلِّ آيَةٍ مَّا تَبِعُواْ قِبْلَتَكَ﴾ ئەی (محمد!) دڵنیابە هەرچی بەڵگەو دەلیل هەیە بیهێنیتەوە بۆ جولەکەو گاورەکان دەربارەی راستیو حەقی گۆڕانی قیبلەو بتەوێ پێیان بسەلمێنی، کە ئەو قیبلە گۆڕانە بە فەرمانی خودایەو پەیڕەوی کردنی پێویستە، ئەوان نایەنە سەر رێبازی تۆو روو ناکەنە قیبلەکەت، هەر بە ئەنقەست رقەبەرایەتیت دەکەنو ملهوڕو کەللە رەقو سەرپێچی کارن، ئەگینا هیچ بەڵگەو دەلیلێکیان بەدەستەوە نییە...

لەلایەکی ترەوە ﴿وَمَا أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ﴾ ئەتۆش بەهیچ جۆرێك روو ناکەیتە قیبلەی ئەوان، واتە: نەکەی رووبکەیتە قیبلەی ئەوانو واز لە قیبلەی خۆت بێنی کە (مسجد الحرام)ە چونکە قیبلەی تۆ قیبلەی ئیبراهیمە کە باوکی پێغەمبەرانەو هەموو لایەك رێزی لێ دەگرن، جا کەئەوان لەگەڵ ئەوەشدا روونەکەنە قیبلەی ئیبراهیمو هەر

سواری گای هار بووبن‌و کوێرانە شوێن خەیاڵات کەوتبن، دەمارگیری‌و نەفامییان بەو جۆرە بێ!! ئەی دەبێ چ بەڵگەو نیشانەیەك هەبێ ئەوان لەو سەرپێچییە بگێڕێتەوە؟ یان چ سوودو قازانجێك هەیە لەوەدا کەتۆ روو بکەیتە قیبلەی ئەوان؟! بەکورتی ئەو جولەکەو گاورانە روو ناکەنە قیبلەی ئێوەو واز لە قیبلەی خۆیان ناهێنن، ئێوەش بەهیچ جۆرێك رووناکەنە قیبلەی ئەوان ﴿وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ﴾ تەنانەت جولەکەو گاورەکانیش لەناو خۆیاندا هیچیان روو ناکەنە قیبلەی ئەوی تریان، واتە جولەکە واز لە قیبلەی خۆیان ناهێنن‌و روو ناکەنە خۆرئاوا، گاورەکانیش واز لە قیبلەی خۆیان ناهێنن‌و رووناکەنە خۆرهەڵات. هەریەکەیان لەسەر بیرو بۆچوونی خۆی سوورەو گوێ نادەنە بەڵگەو دەلیل‌و کوێرانە رەفتار دەکەن‌و هیچ کردارێکیان لەرووی توێژینەوەو لێکۆڵینەوە نیە! هەموو ئیشێکیان لاسایی کردنەوەی کوێرانەیە ﴿وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءهُم مِّن بَعْدِ مَا جَاءكَ مِنَ الْعِلْمِ إِنَّكَ إِذاً لَّمِنَ الظَّالِمِينَ﴾ بێگومان ئەگەر تۆ ئەی (محمد!) شوێن هەواو ئارەزۆی ئەوان بکەوی – بەتایبەتی دوای ئەوەی کە زانیاری تەواوت بۆ هاتووە، پەروەردگار فەرمانی پێکردووی، نیگای بۆ کردووی ئەوە تۆ لەریزی ستەمکارانی‌و شیاوی ئەوە دەبی سزای توند بدرێی، دیارە هەرگیز شتی وا لەتۆ ناوەشێتەوەو قەت هەڵوێستی ئاوا ستەمکارانە لەتۆ نابیندرێ.

بێگومان ئەمە لەو پەندە پێشینانە دەچێ کە دەڵێ: (بوکێ لەگەڵ تۆمەو خەسوو گوێت لێ بێ) مەبەست ئەوەیە: نابێ هیچ موسوڵمانێك بیر لەوە بکاتەوە کە شوێن هەواو هەوەسی ناموسوڵمانان بکەوێ‌و بەمەبەستی دڵ راگرتنیان هەڵوێستی خۆی بدۆڕێنێ، چونکە ئایینی ئیسلام بۆ خۆی حەق‌و راستەو بەهێزە، هەرکەسێك لێی لاداو بۆ دڵ راگرتن‌و لێ رازی بوونی ناموسوڵمانان، یان بۆ خۆپاراستن لە زەرەرو زیان لە هەڵوێستی ئایینی خۆی دابەزێ ئەوە ستەمکارەو غەدرە لەخودی خۆی دەکا، زاڵم‌و ستەمکارانیش سزای سەختیان بۆ ئامادەکراوە، جا کە بەم شێوە هەڕەشەی خودایی ئاراستەی گەورەترین ئادەمیزاد بکرێ: کە حەزرەتی (محمد)، ئەگەر لەسەر حیسابی ئایین‌و هەڵوێستی موسوڵمانانە نەرمی بەرامبەر ناموسوڵمانان پیشان بدا!

ئەی دەبێ بۆ یەکێکی تر چۆن بێ؟ کەوابێ پێویستە بزانن: کە شوێن کەوتنی هەواو ئارەزۆی ناموسوڵمانان با بۆ مەبەستێکی رەواش بێ – ئەوە ستەمکارییەو پێویستە خۆیانی لێ دوور بگرنو خۆی لێ بپارێزن.. هەر ئەم هەڕەشە سامناکەش کە ئاراستەی گەورەترین ئادەمیزاد کراوە ئەوە دەخوازێ کە موسوڵمانان بە وردی بیربکەنەوەو ژیرانە سەیری ئەو بارو دۆخەی ئێستایان بکەنو بڕوانن چۆن بڕێ لە مەلاکانیان هاوشان لەگەڵ رەشە خەڵکەکە تووشی سەر لێ شێواوی بوون زۆربەی کردارو گوفتاریان لەگەڵ ئاییندا ناگونجێ، بەناو نوێنەری ئایینن کەچی زۆر لە ئایین دوورن، ئەم هەڕەشەو ئینزارانەی قورئان کە کێو دەلەرزێنێ هیچ کاریان تێ ناکا، لەوەش خراپتر شوێن کەوتنو پابەندبوونیانە بە ویستی پادشاو کاربەدەستی ناموسوڵمانو ستەمکار؟! تەنانەت بۆ رەزامەندی ئەوان جۆرەها حیلەو فێڵو فرت دەکەنو فتوای ناڕەوا دەردەکەن، لەژێر پەردەی ئاییندا دنیا دەخۆن!!

﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءهُمْ﴾ ئەم ئایەتە وەکوو بەڵگە وایە لەسەر ئەوەی کە لەوەپێش فەرمووی: ﴿لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ واتە: بەڵگەی ئەوەی کە ئەوان دەزانن، گۆڕانی قیبلە حەقەو فەرمانی خودایە، ئەوەیە کە ئەم گاورو جولەکانەی تەوراتو ئینجیلمان بۆ ناردوون باش باش پێغەمبەر دەناسن، چونکە نیشانەو رەوشتەکانی پێغەمبەر لەکتێبەکانی ئەواندا جوان روون کراوەتەوە، تەنانەت عەبدوڵلای کوڕی سەلام – کە یەکێکە لە مالەکانیانو دوایی موسوڵمان بوو – وتی: من پێغەمبەر لەکوڕی خۆم باشتر دەناسم، حەزرەتی عومەر پێی گوت: چۆن لە کوڕەکەی خۆتی باشتر دەناسی؟! وتی: چونکە من هیچ گومانم لەوەدا نییە کە (محمد) پێغەمبەرەو نێردراوی خودایە، بەڵام دەربارەی کوڕەکەم ئەوەندە دڵنیانیم چونکە کێ دەڵێ خێزانم داوێن پیسی نەکردووە!!

﴿وَإِنَّ فَرِيقاً مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ کۆمەڵێك لەو جولەکەو گاورانەی کە لە کتێبەکانیاندا نیشانەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر روون کراوەتەوە ئەم راستییە بەژێر لێو دەخەنو دەیشارنەوە، ناهێڵن نەخوێندەوارەکانیان بیزانن، بۆ خۆشیان پاش

گوێی دەخەنو کاری پێ ناکەن ﴿الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ﴾ شتی حەقو راستو بڕوا پێکراو ئەوەیە کە لەخوداوە بۆ تۆ هاتووە نەك ئەوەی کە جولەکەو گاورەکان دەیڵێنو بڵاوی دەکەنەوە، ئەو قیبلەیەی کەتۆ ئێستا رووی تێدەکەی ئەوە قیبلەی حەقەو خودا پێی رازییەو فەرمانی پێ کردووی، کاتی خۆیشی ئیبراهیم رووی تێکردووە، کەوابێ بە گوێرەی ویستی خودا تۆ هەڵسو کەوت بکەو چی پێ فەرمووی ئەنجامی بدە، ئاوڕ لە شاتە شاتی ئەوان مەدەرەوەو گوێ بۆ بیرو بۆچوونی ئەو سەرپێچیکەرانە مەگرەو لە حەقو راستی دوور مەکەوەرەوە!!

لێرەشدا هەرچەندە خیطاب لەگەڵ پێغەمبەرە، بەڵام لەڕاستیدا مەبەست ئەو موسوڵمانانەیە کە ئیمان لەدڵیاندا رەگی دانەکوتاوەو بڕوایان قایم نەبووە.

## جیاوازیی ئادەمیزادان لە قیبلەو گۆڕانی قیبلەدا

﴿ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ أَيْنَ مَا تَكُونُوا يَأْتِ بِكُمُ اللَّهُ جَمِيعًا إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (١٤٨) وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِنَّهُ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ (١٤٩) وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا الَّذِينَ

ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِى وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِى عَلَيْكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٠﴾ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ ﴾.

لەوەپێش پەروەردگار باسی ئەو قیبلەیەی کرد کە فەرمانی بە موسوڵمانان کردووە رووی تێ بکەن، ئەویش بریتییە لە کەعبە، ئەوەشی باس کرد کە نەتەوەی ئیسرائیل سوورن لەسەر ئەوە کە روونەکەنە ئەو رۆگەیە! لێرەدا ئەوە فێری پێغەمبەر دەکا کە ئەو کارانە هەموو بەدەست خودایەو خودا وای داناوەو بۆ هەر گەلو نەتەوەیەك رۆگەیەکی دیاری کردووە، پێویستە موسوڵمانان شوکرانە ژمێری خودا بکەن کە کەعبەی بۆ کردوون بە رۆگەو هیدایەتی داون بۆ پابەندبوون بە فەرمانی خوداو روو دەکەنە ئەو قیبلەیە! ئیتر ئایەتەکان بەردەوام دەبن لە پشتگیری کردنی هەڵوێستی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کە رووی کردۆتە کەعبەو بەڵگەو شاتە شاتی سەرپێچیکاران پووچەڵ دەکەنەوە، ئەوە باس دەکەن هەموو نەتەوەیەك قیبلەی خۆی بۆ دیاری کراوە، جولەکە رۆگەی خۆی هەیە، نەصرانییەکان قیبلەی خۆیان هەیە، موسوڵمانانیش قیبلەی خۆیان هەیە. ئەوەش دووپات دەکاتەوە کە قیبلە بنەمای ئایین نییە، گرنگ ئەوەیە ئادەمیزادان پێشبڕکێ بکەن لە ئەنجامدانی کاری چاکەدا، خودا پاداشو سزای هەموو کەسێك بەگوێرەی کردەوەکانی دەداتەوە! ئیمانو کردەوەی چاك بنەمای ئایینو تەرازووی راستەقینەنو دەفەرموێ: ﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ

مُوَلِّيهَا﴾ بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەك قیبلەیەك هەیە، هەركەسە ڕوودەكاتە قیبلەی خۆی. ﴿فَاسْتَبِقُواْ الْخَيْرَاتِ﴾ كەوابوو ئەی كۆمەڵی موسوڵمانان! خێرایی بكەن لەكردنی كاری خێرا، هیچ كاتێ لە ئەنجامدانی كاری خێردا سڵ مەكەنەوە. ﴿أَيْنَ مَا تَكُونُواْ يَأْتِ بِكُمُ اللّهُ جَمِيعًا﴾ هەموو وڵاتو شوێنو جێگایەك هی خودایەو لەهەر شوێنێك بن كۆتاندەكاتەوە بۆ حیسابو لێكۆڵینەوە ﴿إِنَّ اللّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بێگومان پەروەردگار بەسەر هەموو شتێكدا توانای هەیەو هیچ شتێكی لێ عاسی نابێ. ﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ لەهەر جێگایەك چوویتە دەرەوەو لەهەر شوێنێك نیشتەجێ بوویو كاتی نوێژ هات، لەنوێژدا ڕووبكەرە لای كەعبە، لەهەموو جێگایەك ڕووبكەنە كەعبەو بەرەو ئەو ڕۆگەیە نوێژ بكەن.

﴿وَإِنَّهُ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ بێگومان ڕووكردنە كەعبە هەقو چەسپاوە لەلایەن خوداوە بەرژەوەندیو حیكمەتی تێدایە. ﴿وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ پەروەردگار بێ ئاگا نییە لەكردەوەكانی ئێوە دەزانێ كێ بەباشی شوێن پێغەمبەر دەكەوێ، بە ئیخلاصو لێبوردەییەوە فەرمانەكانی ئەنجام دەدا، دڵنیابن خودا پاداشتی كردەوەكانتان دەداتەوە، ئەمە موژدەدانە بە موسوڵمانان بەوەی كە پاداشتیان دەداتەوە. ﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ لەهەرشوێنێك ڕۆشتیتە دەرەوە بۆ سەفەرو كاتی نوێژ هات، ڕووبكەرە لای كەعبە، ئەمە سێیەم فەرمانە كە پەروەردگار ئاڕاستەی پێغەمبەرو موسوڵمانانی دەكا كە لەنوێژا ڕووبكەنە كەعبە، مەبەستیش لەم دووبارە كردنەوەیە ئەوەیە دەڵێن: گۆڕانی قیبلە یەكەم ئەحكامی شەرعی بووە كە نەسخ بۆتەوە، كەوابێ پێویستە دووبارە كردنەوە تێیدا بۆ چەسپاندنو لابردنی شكو گومان ﴿وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ﴾ لەهەر شوێنێك بوونو ویستتان نوێژ بكەن ڕووبكەنە لای كەعبەو بیكەنە ڕۆگەی خۆتان. ﴿لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ﴾ پەروەردگار چۆنیەتی ڕوكردنە قیبلەی فێركردن بۆئەوە جولەكەكان بەڵگە لەدژتان نەهێننەوەو بڵێن: (محمد)و هاوەڵانی دژی

ئایینەکەمانن کەچی رووەکەنە قیبلەکەمان، ئەمە بکەن بە بەڵگە لەسەر راستی ئایینەکەیان، هەروەها موشریکەکان بڵێن: (محمد) ئیدیعای ئایینی ئیبراهیم دەکاو کەچی روونانەکاتە قیبلەکەی. ئیتر ئەو خەڵکە ئەوکاتە ناتوانن بەڵگەتان لەسەر بێننەوە، لەترسی ئەوەی بۆریان بدەن بێدەنگ دەبن ﴿إِلاَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْهُمْ فَلاَ تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِي﴾ مەگەر ئەو کۆمەڵە ستەمکارانەی کە بە بەڵگە بێدەنگ نابن‌و بەهیچ شتێك ئەوان لە چەقە چەقی خۆیان ناکەون، هیچ پاساوو بەڵگەیەك وەرناگرن، دەی با موسوڵمانان گوێیان پێ نەدەن، لێیان مەترسن‌و هیچ گرنگییەك بە شاتە شاتی ئەوان مەدەن، تەنها لەمن بترسن، من شیاوی ئەوەم لێم بترسێن، لەدونیاو قیامەتدا جڵەوتان بەدەستی قودرەتی منەوەیە، بەهەموو جۆرێك دەسەڵاتم بەسەرتاندا هەیە ﴿وَلأُتِمَّ نِعْمَتِي عَلَيْكُمْ﴾ ئێمە کە قیبلەمان بۆ گۆرین‌و فەرمانمان پێکردن کە رووبکەنە لای کەعبە بۆ ئەوەیە کە نیعمەتی ئیسلامەتیتان بۆ تەواو بکەین، چونکە ئێوە کە قیبلەی تایبەتیتان نەبێ بە ئوممەتی پاشکەوتوو ئایین ناکامڵ حسێب دەکرێن ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ بەڵکوو بەهۆی ئەم نیعمەتە ئیسلامیەوە رەزامەندی خودا بەدەست بهێنن، ئەمەش گەیشتن بە ئاواتی پیرۆزە ﴿كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِّنكُمْ﴾ واتە نیعمەتی رووکردنی قیبلەی سەربەخۆتان کە (مسجد الحرام)ە یەکێکە لە نیعمەتە یەك بەدوای یەکەکانی پەروەردگارتان. کە نیعمەتێکی تری فرە گەورەی پێشکەوتووە، ئەویش رەوانەکردنی پێغەمبەرێك لە نەژادو رشتەی خۆتان، ﴿يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا﴾ کە ئایەتی ئێمەتان بەسەردا دەخوێنێتەوە، هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدا کە ئێوە لە نەفامی‌و نەزانی رزگار بکا، ئامۆژگاری‌و رێنموونیتان دەکات، تەمێ‌و تەربیەتان فێردەکا، فەرمانی خوداتان پێ رادەگەیەنێ ﴿وَيُزَكِّيكُمْ﴾ دڵ‌و دەروونتان لە هاوبەش پەیداکردن بۆ خوداو کرداری خراپ پاك دەکاتەوە ﴿وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ ئەحکامی قورئانی پیرۆزتان فێردەکا. حەدیثەکانی خۆی لەژێر رۆشنایی قورئاندا گوتوونی فێرتان دەکا ﴿وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ﴾ هەروەها زۆر شتی بەسوودو قازانج بۆ کاری

دونیایی‌و قیامەتتان فێردەکا: کە لەوەپێش نەتان زانیوەو پەیتان پێ نەبردووە! ئەگەر هاتنی پێغەمبەر نەبووایە ئێوە ئەو شتانەتان نەدەزانی: ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ﴾ بەخودا پەرستی‌و فەرمان بەرداری یادم بکەن، بەخودام بزانن ئەمنیش بە پاداش‌و لێ خۆشبوون‌و دابینکردنی ژیانی بەختەوەری لەهەردوو دونیا یادتان دەکەم‌و چاوم لێتانە ﴿وَاشْكُرُواْ لِي وَلاَ تَكْفُرُونِ﴾ ئەی گرۆهی موسوڵمانان بە کردارو گوفتار سوپاس گوزاری ئەم هەموو نیعمەتانەم بکەن: کەپێم بەخشیوون. هەموو شتێك لەشوێنی خۆیدا بەکاربێنن‌و بزانن بۆچی دروست کراوە لەوشتەدا بەکاری بێنن کەبۆی دروست کراوە، بەدڵ‌و بە زوبان‌و بە ئەندام‌و جەستەتان شوکرانە بژێری من بن، دان بە چاکەو بەخششی مندا بنێن‌و نکوڵی لێ مەکەن، ماڵ‌و دارایی‌و ئەندام‌و جەستەتان لەکاری بێ شەرعیدا بەفیڕۆ مەدەن: چونکە ئەمە کوفرانی نیعمەتەو ئاکامی پەشیمانی‌و سەرگەردانییە، ئەمە هەڕەشەیەکی پەروەردگارە بۆ گەلی موسوڵمان هەتا ئەو نەدامەتیەی بەسەر گەلەکانی رابوردوودا هات لەدەرەنجامی کوفرانی نیعمەتەوە بەسەر ئەمانیشدا نەیەت. بێگومان موسوڵمانان ماوەیەك پابەندی فەرمانەکانی خودا بوون‌و بەگوێرەی شەرعی خودا رەفتاریان دەکرد بەلام دوایی وردە وردە پاشگەز بوونەوەو ئیتر لەسەرەنجامی ئەو پاشگەزبوونەوەیان تووشی ئەو هەموو دەردە سەری‌و نەهامەتییە بوون‌و هەتا نەشگەڕێنەوە بۆسەر حاڵی پێشوویان خۆشبەختی ژیان‌و سەروەری‌و باڵا دەستییان بۆ ناگەڕێتەوە.

## خۆڕاگرتن لەسەر بەڵاو موصیبەت

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾ وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقْتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتُۢۚ بَلْ

أَحۡيَآءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشۡعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴿١٥٧﴾.

گۆڕینی قیبلە تاقیکردنەوەی ئادەمیزادەکان بووا جودا کەرەوەی موسوڵمان بوو لە دووڕووی درۆزن، هەڵبەتە ئەوە نیعمەتی پەروەردگار بوو رژاندی بەسەر موسوڵمانانەدا خەشمو قار نەبووا بەڵام نەفامو داخ لەدڵەکانی جولەکەو گاور ئەم رووداوە گەورەیان قۆزتەوە، کۆمەڵێك درۆو بوختانیان هەڵبەستن خەڵکیان هاندا دژی موسوڵمانان هەڵوێست وەربگرن، پەروەردگار دەیزانی کە بەشوێن ئەم دژایەتیکردنو پڕوپاگەندەیەدا کۆمەڵێك ئاستەنگ بۆ موسوڵمانان وەدی دێنو لە ئاکاما سەردەکێشێ بۆ رووبەڕوو بوونەوەو شەڕو جەنگ لەنێوان موسوڵمانانو دوژمنانیاندا!

ئاشکراشە دوا بەدوای گۆڕینی قیبلە زنجیرەیەك شەڕو هەرای دژوار رووبەڕووی موسوڵمانان بووەوە!

لەم ئایەتانەدا پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە کە نازو نیعمەتی دونیا جار جار بەبێ ماندوو بوونو تێکۆشانو تووشبوونی بەڵاو موسیبەت دەستەبەر نابن. هەڵبەتە چەکی کاریگەر بۆ بەرەنگاری کردنی بەڵاو موسیبەتو بەربەرەکانی دوژمنانی ئایینی پیرۆز خۆڕاگریو بە جێهێنانی نوێژە، چونکە بە صەبرو خۆڕاگری ئیرادە بەهێز دەبێو وره بەرز دەبێتەوە. نوێژیش پەیوەندی کردنی راستەوخۆیە بە زاتی

پەروەردگارەوەو لێپاڕانەوەو خۆخستنە قەلاَی پەروەردگارەو دامرکاندنی هەڵچوونی دڵو دەروونو خەمو خەفەت بە بادانە، بۆیە پەروەردگار دوابەدوای فەرمان بە شوکرو سوپاسگوزاری فەرمانی بە موسوڵمانان کرد: کە خۆڕاگر بن لە بەرامبەر ئاستەنگو بەلاَداو پشت بە صەبرو نوێژکردنی تەواو بەستنو فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ ئەی کۆمەڵی بڕواداران! ئێوە لە پێناو بلاَوکردنەوەی ئایینی ئیسلامدا، لەئەنجامی بەرهەڵستکاریتانو داکۆکی کردنتان لە ئایین! تووشی جۆرەها بەلاَو دەردی سەریی دەبن، پێویستیتان بە پاڵپشتو کۆمەکیکارو سەنگەری قایمو قۆڵ هەیە، کەواتە بۆ بەهێز کردنی دڵو دەروونتان، بۆ ورە بەرزیو خۆڕاگریتان، پەنا ببەنە بەر صەبرو ئارامیو نوێژکردن، ئەم دوو ڕەوشتە چەکی بەکاری موسوڵمانن بۆ بەر پەرچدانەوەی هەموو کارێکی دوژمن کە دژی ئێوە ئەنجام دەدرێ چونکە (صەبر) خۆڕاگریی قورسترین کردەوەی هەستی ناوەوەی مرۆڤە، نوێژیش قورسترین کردەوەی بەدیاریەتی، بە صەبرو خۆڕاگری مەلەکەی بەردەوام بوونو سوور بوون لەسەر هەڵوێستو بارقوڵیو تەحەمولی ناڕەحەتی وەدەست دەهێنرێ، بەهۆی صەبرەوە مرۆڤ دەتوانێ بەرنگاری بیروباوەڕی پڕوپووچو بەتاڵ ببێتەوە، هەروەکوو چۆن نوێژ سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ بەهێزکردنی ورەو هیوای سەرکەوتن بەسەر تەنگو چەڵەمەدا.

لە حەدیثدا هاتووە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) هەرکاتێ تووشی ئاستەنگێك بووبێو کارێکی قورسی هاتبێتە پێش خێرا پەنای بۆ نوێژ کردن بردووەو ئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ بێگومان خودا یارمەتیدەری خۆڕاگرانە، کەسێکیش خودا یارمەتیدەری بێ، کەس نایوێرێتیو هیچ کەس دەرەقەتی نایە! پەروەردگاریش لە بوونەوەردا سوننەتی خۆی وا دامەزراندوە کە بەجێهێنانی کاری گرنگو سەرکەوتن بەسەر تەنگو چەڵەمەدا بەبێ وزەی صەبرو خۆڕاگری نابێ، هەر صەبرو خۆڕاگریە کاری قورس سووك دەکا، دەروی گوشاد دەخاتە دیواری بەندیخانەی بەلاَو موسیبەتەوە.

﴿وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ يُقْتَلُ فِي سَبيلِ اللّهِ أَمْوَاتٌ بَلْ أَحْيَاء وَلَكِن لاَّ تَشْعُرُونَ﴾ ئێوە دەربارەی ئەوانەی کە لە پێناو ئایینی خودادا کوژراون، پێیان مەڵێن: مردوون، ئەوانە نە مردوون، بەڵکوو ئەوان لە جیهانێکی تردان: کە جیاوازە لە جیهانی ئێوە، لە ژیانێکدان کە لە ژیانی دنیایی ئێوە ناچێ، بەڵام ئێوە هەست بەو ژیانەی ئەوان ناکەن، چونکە ژیانەکەیان لە سنووری هەستی ئێوەدا نیە، بەڵکوو ژیانێکی نهێنیەو تایبەتە بە گیانی شەهیدانەوە، لەززەتو خۆشی وەردەگرن، بە شێوەیەك کە ئێوە چۆنیەتەکەی نازانن، ڕزقو ڕۆژییان دەدرێتێ، بەڵام ئێمەی مرۆڤ نازانین ئەو ڕزقو ڕۆژییە چیەو چۆنە، دەشێ قسەی لێ نەکەینو چۆنیەتەکەی حەواڵەی زانستی خودا بکەین، چونکە لە غالەمی غەیبدایەو ئێمە پەی پێ نابەین.

ئەو پاداشە، بەخششێکی خودایە کە بۆ ئەوانەی داناوە کە بە پیر بانگەوازییەکەیەوە چوون، لە پێناو ئایینی پیرۆزیا گیانی خۆیان بەخت کردووە، بەسەربەستیو ئازایانە بە ڕووی ستەمکارو ملهوڕاندا هەڵتەقیونەوە، دژی ناهەقیکاران جەنگاون، لەپێناو ڕەزامەندیی خودادا گیانیان بەخت کردووە. ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوفْ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الأَمَوَالِ وَالأنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ﴾ سوێندم خواردبێ، ئێمە ئێوە تاقیدەکەینەوە بە کەمێك ترسان لە دوژمنانو برێ بەڵاو موسیبەتی عادەتی ژیان، وەکوو برسییایەتیو گرانیو فەوتانی بەروبوومو لەناو چوونی موڵكو دارایيتان، مردنو لە ناو چوونی کوڕو کچو خاو خێزانو خزمو کەسو کارتان، نارەحەتیو نەخۆشی، واتە وامەزانن موسوڵمان بوونو چوونە ناو ئیسلامتان دبێ ببێتە هۆی دەوڵەمەندیو زۆر بوونی ڕزقو ڕۆژیو فراوان بوونی سامانتان، چاوەڕوانی ئەوەمەبن موسوڵمان بوونتان هۆکارێك دەبێ بۆ بڵاو بووونەوەی دەسەڵاتو فەرمانڕەواییتان، بۆ نەمانی ترسو برسایەتیو نەخۆشی لەناوتاندا، بەڵکوو ئەمانە ڕوو دەدەن بە گوێرەی دابو نەریتێك کە خودا لە بوونەوەردا بۆ دروستکروانی خۆی دایناون، هەرکاتێ بەڵاو موسیبەت هۆکاری تایبەتی خۆیان پەیدا بوو ڕوو دەدەنو دێنە ئاراوە.

﴿وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ﴾ مزگێنی بدە بەوانەی خاوەن صەبرنو لە کاتی تەنگانەو هاتنی بەلاو موسیبەتدا خۆگرن، مزدەیان بدەری بە باغەکانی بەهەشت، کە خودا وادەی پێداونو بۆی ئامادە کردوون.

ئەمجار با بزانین مەبەست بە ﴿الصَّابِرِينَ﴾ کێن؟ ﴿الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ﴾ صابیرو خۆڕاگر ئەوانەن کە بەلایەك یەخەیان دەگریو تووشی ناخۆشیەك دەبن، خۆشەویستێکیان لەکیس دەچێ دادو فیغان ناکەن، بەلکوو ﴿قَالُواْ إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ﴾ بەدڵێکی پڕ لە ئیمانەوە، بە بڕوایەکی قایمو قوڵەوە، دەڵێن: ئێمە هەمووومان بەندەی خوداینو هەمووومان بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە، چی بوێ لەگەڵمان دەکاو هیچ کەس ناتوانێ بەرنگاریی بکا ﴿أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ﴾ ئەوانە کە ئەوە هەڵوێستیانە، ئەوە ڕەوشتو هەڵسوکەوتیانە لەکاتی بەلاو موصیبەتدا ئاوا ڕەفتار دەکەن، ڕەحمەتو بەزەییو بەخششو ڕەزامەندی خودایان لەسەرە، دەکەونە ناو بەحری ڕەحمەتی پەروەردگارەوە، هەر ئەوان ڕێگای سەرفرازییان گرتووەو لایەنی خۆشبەختیو کامەرانییان دۆزیوەتەوە.

## هاتو چۆی نێوان صەفاو مەروەو سزای ئەوانەی ئایەتی خودا دەشارنەوە

﴿ ۞ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ

ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَبَيَّنُوا۟ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٦١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿١٦٢﴾ ﴾.

وەکوو گوتمان گۆڕینی قیبلە – کە لە ئایەتەکانی پێشوودا باس کرا، نیعمەتێکی گەورەو مەزن بوو بۆ موسوڵمانان، چونکە ئەم قیبلە گۆڕانە سەربەخۆیی بۆ دەستەبەر کردن، وای لێکردن بتوانن چاودێریی کەعبە بکەنو دەستیان بەسەریا بڕواو لەبتو بتپەرستی پاکی بکەنەوە، موسوڵمانان لە نوێژدا رووی تێبکەنو لە دڵیاندا جێگای رێزو پیرۆزی بێ.

جا کە لە ئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار مەدحی موسوڵمانە خۆڕاگرو خاوەن صەبرو ورە بەرزەکانی کرد، حەج: کە ئەنجامدانی پێویستی بە نارەحەتیو ماڵ خەرجکردن هەیە، گونجاو بوو کە لێرەدا باسی بڕێ لە شەعائیرو کردارە نارەحەتییەکانی بکرێ کە ئەویش گورگە لۆقەی نێوان دوو گردۆڵکەی صەفاو مەروەیە – کە نەرمە راکردنی موسوڵمانان لەنێوانیاندا نیشانەی بالاّ دەستیو سەرپەرشتیکارییانە بۆ کەعبە – وەبیر هێنانەوەی گرنگی ئەو شوێنە پیرۆزەیە بۆ موسوڵمانانو جێبەجێ کردنی کارەکانی حەجەو زیندوو کردنەوەی ئایینی ئیبراهیمە (علیه السلام)، ئیتر هیچ بڕو بیانوویەك بۆ ئەهلی کیتابو موشریکەکانی عەرەب نامێنێ دەربارەی گۆڕانی قیبلەو فەرمووی: ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ﴾

بێگومان (صەفا) و (مەروە): کەدوو شوێنن لەنزیك کەعبە، نیشانەی ئایینی خودان، ئەو رۆیشتنو گورگە لۆقەی لەنێوانیاندا ئەنجام دەدرێ، ئەوانیش ئایینی خودان، چونکە ئەنجامدانیانو بڕوا پێ بوونیان نیشانەی گەردن کەچییە بۆ پەروەردگارو خودا پەرستیو تەسلیم بوونە..

**پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆئەوە بکرێ: کە ئەحکامی شەرعی دوو جۆرن:**

١- جۆرێکیان پێیان دەگوترێ: (شعائر) وەکوو ئەو عیبادەتانەی کە پەروەردگار فەرمانی پێ کردووین بە ئەنجامدانیان شێوەی کردنەکانیان دیاری کراوە وەکوو نوێژ کردنو رووکردنە قیبلەو کاروباری حەجو چۆنیەتی ئەنجامدانیان، حیکمەتو نهێنیو سوودی کردنەکەیان بەوجۆرە لای ئێمە ئاشکرا نییە. ئەم جۆرە عیبادەتانە چۆن فەرمانمان پێکراوە پێویستە بێ زیادو کەم بەجێیان بهێنین، چونکە ئەگەر زیادو کەمیان تێدا بکرێ راستو ناڕاستو فەرمان پێکراو زیادکراومان لێ تێکەڵاو دەبێ، وەکوو گاورەکانمان لێ بەسەر دێ کە خودا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ﴾.

٢- جۆری دووەممان پێی ناگوترێ: (شعائر) وەکوو ئەحکامی کڕینو فرۆشتنو بەکرێ دانو رەهن، ئەم جۆرە شتانە کەبۆ بەرژەوەندی ئادەمیزاد دانراونو بەئاسانی حیکمەتەکەیان دەزانرێ.

﴿فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ کەسێك حەجی کرد، یان عومرەی کرد گوناهی نییە ئەگەر هاتووچۆی نێوان صەفاو مەروە ئەنجام بداو تەوافی بەینیان بکا! هەرچەندە موشریکەکانیش ئەم هاتو چۆیەیان دەکرد! جیاوازی نێوان هاتو چۆی ئێوەو موشریکەکان لەنێوان صەفاو مەروەدا ئەوەیە ئەوان بەکافری هاتو چۆکەیان ئەنجام دەدەن، بەڵام ئێوە بە بیرو باوەڕەوە هاتوچۆو تەوافەکە دەکەنو فەرمانبەرداری پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی دەبن.

﴿وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللَّـهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ﴾ کەسێك زیاد لەئەندازەی واجبەکە طاعەتی خودا بکا، ئەوە پەروەردگار پاداشتی چاکە بەچاکە دەداتەوە، زاناو دانایە،

دەزانێ کێ شیاوی ئەو پاداشەیە ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ﴾ ئەو جولەکەو گاورانەی کە زانیاری ناو کتێبەکانیان دەربارەی ئایینی ئیسلامو هاتنی پێغەمبەری ئاخر زەمان کە (محمد)ە (درووودی خوای لەسەر بێ) دەشارنەوەو پەردەی بەسەردا دەدەن، یان لەشوێن ئەو زانیاریە شتی تر دەردەخەن، راستییەکە ژێر لێو دەدەن، لەشوێنی ئەو راستییە درۆیەك دەخەنە روو لەکاتێکا ئەو زانیارییە لەلای خۆیان لە تەوراتو ئینجیلدا نووسراوەو بێ پێچو پەنا نیشانەکانی پێغەمبەرو هاتنی ئایینی ئیسلام تێیاندا روون کراوەتەوە ﴿أُولَئِكَ يَلعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ﴾ ئەوانە شیاوی ئەوەن فریشتەو ئادەمیزاد لێیان هەڵنوزنو داوابکەن خودا لە رەحمەتی خۆی دووریان بخاتەوە!

جا وەنەبێ حوکمی ئەم ئایەتە تایبەت بێ بە مالو قەشەکانی جولەکەو گاور، بەڵکوو هەموو کەسێك دەگرێتەوە کە زانیارییەکی وای لابێت کەخودا پێویستی کردبێ بگەیەنرێ بە خەڵكو ئەو بیشارێتەوە، پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: هەرکەسێ زانیارییەکی لابێو داوای لێ بکرێ بە خەڵکی بڵێو ئەو نکووڵی لێ بکا خودای پەروەردگار رۆژی قیامەت لغاوی ئاگرینی لەدەم دەکا. ﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ وَأَصْلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ مەگەر ئەو کەسانە نەبێ کە پەشیمان بوونەوە، لەو کردارو گوفتارانەی کردوویانن، تۆبە دەکەن، ئەو ئاژاوەو فیتنەیەی بەزانیاری شاردنەوە کە بەرپایان کردووە راستی دەکەنەوەو لە درۆو دەلەسەکانیان پاشگەز دەبنەوەو راستیو حەقیقەتی ئەوەی کەخودا ناردوویەتی بەخەڵکی رادەگەیەنن! ئەوانە تۆبەیان لێ وەردەگیرێو رەحمەتی خودا دەیان گرێتەوە، ئەوانە من بەزوویی تۆبەیان لێ وەردەگرم، رەحمەتو بەزەییو لێبوردنم بۆ بەندەکانم زۆرو زەبەندەیە، لەو خراپەو سەرپێچیکردنەیان خۆش دەبم، بەمەرجێك تۆبەکەیان راستاڵانە بێ، لە کردارو گوفتاریاندا رەنگ بداتەوە، ئیعلانی حەق بکاو دان بەراستییەتی ئیسلامدا بنێ.

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَمَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ بێگومان ئەوانەی کافر بوون‌و وازیان لە کوفرو گومڕایی خۆیان نەهێنا، هەر سوور بوون لەسەر بێ دینی خۆیان تاوەکوو مردن یەخەی پێ گرتن‌و سەرنگوون بوون بەکافری دنیایان جێهێشت، ئەوانە نەفرەتی خوداو فریشتەو ئادەمیزادیان لەسەرە، تەنانەت ڕۆژی قیامەت کافرەکان خۆشیان هەندێکیان نەفرەت لەهەندێکیان دەکەن، ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ هەتا هەتایە لەناو ئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە، یان لەناو نەفرەت لێکردندا دەمێننەوە ﴿لاَ يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ﴾ سزای بەئێشیان لەناو دۆزەخدا بەردەوامەو ساتە وەختێکیش ئەو سزایەیان لەکۆڵ ناکەوێ‌و بۆیان سووک ناکرێ ﴿وَلاَ هُمْ يُنظَرُونَ﴾ ئەوانە مۆڵەتیان نادرێتێ سزاکەیان بۆ دواناخرێ‌و ڕێگەیان نادرێتێ تا عوزرو بەهانە بهێننەوە، بەڵکوو سزای دیاریکراو هەر بە لەدنیا دەرچوونیان یەخەیان دەگرێ هەتا هەتایە بەردەوام دەبێ!!

بەڕاستی (خودا پەنامان بدات) ئەو سزا ئاماژە بۆکراوە سزایەکە لەهەموو سزایەك سەختترە، سزای تڕۆ کردن‌و دەرکردن، سینگێکی فراوان لەخۆیان ناگرێ، کەس بەچاوی بەزەیی‌و ڕەزامەندیی سەیرییان ناکا، هیچ زوبانێك سڵاویان لێ ناکا، ئەوانە نەفرەت لێکراوو دەرکراوو قێز لێکراون، پەروەردگار نەفرەتیان لێدەکا، فریشتە نەفرەتیان لێدەکا، ئادەمیزاد نەفرەتیان لێدەکەن.

## تاك‌و تەنهایی خوداو ڕەحمەت‌و بەزەیی‌و دیاردەکانی دەسەڵاتی

﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ (١٦٣) إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ

ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾ ﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار لە ئایەتەکانی پێشوودا حاڵو چۆنیەتی کافرو ئەوانەی ئینکاری ئایاتی خودا دەکەنو ئەوانەی ئایاتی خودا دەشارنەوە دیاری کردو سزایانی دەست نیشان کرد، کە نەفرین لێکردنو دوور خستنەوەیان لە رەحمەتی خوداو سووتاندنیانە بە ئاگری دۆزەخ بۆ هەتا هەتایە، هەروەها هۆکاری کوفر کەشیرکە دیاریی کرد، ئەمجار پەروەردگار دەیەوێ چارەسەری کوفرەکەیان بکا! ئەویش بە چەسپاندنی تاکو تەنهایی خودا بە بەڵگەو نیشانەوە، هەروەها بە ژماردنی دیاردەی رەحمەتو بەڵگەی دەسەڵاتو توانای بێ سنوری زاتی بێ چوونی، چەسپاندنی ئەوە کە هەموو خێرو خۆشیەك لە خوداوەیەو فەرمووی: ﴿وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ خودای ئێوە کە شایەنی پەرستنە خودایەکی تاكو تەنیایە، هیچ شتێك نیە لە وێنەی ئەو بێ، تاكو تەنیایەکی رەهایە (مطلق)ە کەس نیە لەو بکا نە لە زاتدا نە لە رەوشتدا نە لە گوفتارو لە کرداردا ﴿لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ﴾ هیچ خودایەکی حەق نیە جگە لە ئەو زاتە بێچونە، کەس رایەی ناکەوێ ببێتە خودا جگە لە خۆی، هەرچی نیعمەتو بەخشش هەیە، هەمووی هی ئەو زاتە بێ وێنەیەو هەر خۆی سەرچاوەی هەموو چاکەو بەخششێکە.

دەگێڕنەوە کاتێك ئەم ئایەتە نازڵ بوو، کافرەکان بە دەوری کەعبەدا سێ سەدوشەست بتیان هەبوو: کە ئەم ئایەتەیان بیست سەرسام مانو وتیان: ئەی (محمد!) ئەگەر راست دەکەی نیشانەیەکمان بۆ بێنە راستگۆییت بچەسپێنێ! ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ لە دروست کردنی

ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەی تێیان دایە ئەو ئاسمانە فراوان‌و مانگ‌و ڕۆژو ئەستێرە کاکەشانە، ئەو جیهانە زانراوو نەزانراوە، ئەم ڕێك‌و پێکییەی کە لە تەوەرەی ئەستێرەکان داو لە کۆمەڵەی ڕۆژیی‌و کۆمەڵە ئەستێرەکانی تردا هەیە، ئەو هاتوچۆو هەڵسوڕان‌و خولانەوەی کە ئەنجامی دەدەن‌و سەرسوڕدێنن ﴿وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾ گۆڕانی شەو ڕۆژو هاتنی یەك بەدوای یەکیاندا، شەو دێ‌و رادەبرێ ڕۆژ دێتە شوێنی، ڕۆژ دەڕواو شەو جێگای دەگرێتەوە، ڕۆژ درێژ دەبێ‌و شەو کورت دەبێ یان بە پێچەوانەوە، ئەم ئاڵ‌و گۆڕییەی تاریکی‌و رووناکی خۆرهەڵاتن‌و تاریکی داهاتن، سپێدەی بەرەبەیان‌و تاریکی دوا خۆرئاوابوون.. ئەمانە هەموویان گرنگ‌و سەرسوڕهێنەرن بەڵام دووبارە بووونەوەو چەند بارە بوونەوەیان وای کردووە کە ئادەمیزاد بەلایەوە شتێکی ئاسایی بن‌و لە ئاستیانا سەری سوڕ نەمێنێ ﴿وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ﴾ ئەو کەشتی‌و گەمییانەی کە لە دەریادا هاتوچۆ دەکەن، ئەو هەموو شتومەك‌و کاڵایەیان پێ دەگوێزرێتەوە، کە سوودو قازانجی بۆ ئادەمیزاد هەیەو لێی بەهەرمەند دەبێ ﴿وَمَا أَنزَلَ اللّهُ مِنَ السَّمَاء مِن مَّاء﴾ هەروەها ئەو ئاوی بارانەی کە خودا لە بەرزایی ڕا بۆ ئێوەی دەڕژێنێتە خوارێ.

پەروەردگار لە ئایەتێکی تردا، شێوەو هۆکارو چۆنیەتی باران بارینی روونکردۆتەوەو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاء كَيْفَ يَشَاء وَيَجْعَلُهُ كِسَفًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ – الروم/ ٤٨﴾ خودایەکی وەهایە با هەڵ دەکاو هەور راپێچ دەکاو چۆنی بوێ لە ئاسماندا بڵاوی دەکاتەوەو دەیانکاتە پارچەپارچەو پەڵە پەڵە، ئەمجار دەبینێ دڵۆپە بارانی لێ دێتە خوارێ!

ئەم وەصف‌و چۆنیەتی دروست بوونەی باران کە قورئان باسی دەکا، دەق ئەو زانیارییەیە کە زانایان دەڵێن: باران لە بەرز بوونەوەی بوخاری ئاو بەهۆی گەرمی هەواوە پەیدا دەبێ، کە ئەو هەڵمە لە ئاوی دەریادا بەهۆی لێك کەوتنی زەڕاتەکان‌و لێخشانی هەوا، بە ڕووبەری دەریا پەیدا دەبێ‌و کۆ دەبێتەوە، هەور دروست دەبێ‌و بارانی لێ دەبارێ!

﴿فَأَحْيَا بِهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ بەو بارانە پەروەردگار زەوی مردووی زیندوو کردەوە، گیاو گژو رووەکی تێدا رواند، هەر بە هۆی ئەو ئاوو گیاوگژەوە گیانلەبەران – ئادەمیزاد – ئاژەڵ – دەتوانن درێژە بە ژیان بدەن ﴿وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ﴾ لە ناو زەویدا لە هەموو جۆرە گیانلەبەرێکی بڵاو کردۆتەوە، هەر وڵاتێك بارانی لێ نەبارێ‌و جۆگا ئاوی پیا نەڕوا، نە گیاو گژی تێدا سەوز دەبێ، نە ژیانی تێدا دەگونجێ، باران بارین بەو شێوەی کە دەبینرێ هەروەها بوونی بە هۆکاری ژیانداری ئادەمیزادو گیانلەبەرانی تر لەسەر زەوی، گەورەترین بەڵگەیە لەسەر تاك‌و تەنیایی خودا، لەلایەکی ترەوە رەحمەت‌و بەزەیی فراوانی خودا دەچەسپێنێ ﴿وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ﴾ هەروەها گۆڕانی با بەرەو خۆرهەڵات‌و خۆرئاوا بەرەو باکورو باشوور، جارێك گەرم‌و چاخێك سارد، دەمێك بە هێزو کاتێك بێ هێز، تاوێك گێژەڵوکەو زریان، ماوەیەك شەماڵ‌و نەسیم‌و لەسەرەخۆ. جارێك تەلقیح‌و تۆم پرژاندن ئەنجام دەدا کاتێك نەزۆك‌و بای وەشتی یە، ﴿وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاء وَالأَرْضِ﴾ ئەو هەورەی گەردنکەچ لە نێوان بەرزایی ئاسمان‌و زەویدا وەستاوە بۆ ئەوەی بەسەر وڵاتاندا باران ببارێنێ، لەم شوێن بۆ ئەو شوێن (با) راپێچی دەکاو پەروەردگار چۆنی بوێ ئاوا باران دەبارێنێ.. ئەم دیاردە سروشتیانەی باس کران ﴿لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ هەموویان بەڵگەن لەسەر هەبوون‌و بە توانایی خودایەکی بەدیهێنەرو چاودێریکارو راگرو زاناو کار دروست.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمویەتی (هاوار بۆ ئەو کەسانەی ئەم ئایەتە دەخوێننەوەو گوێی پێ نادەن‌و کاریان تێ ناکا!).

هەندێ لە زانایان دەڵێن: پەروەردگار دوو جۆر کتێبی هەیە، کتێبێکی دروستکراو کە بوونەوەرە: کتێبێکی نێردراو کە قورئانە، ئەمیان شارەزامان دەکا بۆ رێبازی زانستی دەربارەی ئەویان، جا کەسێك لە هەردووکیان ورد بووەو بەوە سەرفرازە، کەسێکیش گوێی پێ نەدان خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت دەبێ.

## حاڵو چۆنیەتی موشریکەکان لەگەڵ خواکانیاندا

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾ إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا ۗ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ ۖ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٦٧﴾ ﴾.

پەروەردگار لە ئایەتەکانی پێشوودا بەڵگەی لەسەر تاکو تەنهایی خۆیو سۆزو بەزەیی بەرفراوانی هێنایەوە، لێرەدا حاڵو چۆنیەتی ئەوانەی کە ئەو بەڵگانە هەزم ناکەنو شەریك بۆ خودا دادەنێن دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللّهِ أَندَاداً﴾ بڕێ ئادەمیزاد هەن نەزانیو نەفامییان گەیشتۆتە ئاستێك: کە لە جیاتی خودای پەروەردگار، چەند بتو صەنەمێك، یان ئەستێرە، فریشتە، شەیاتینی، ئەم جۆرە شتانەیان کردووە بە خوداو دەیانپەرستن گەردنکەچیو گوێڕایەڵییان بۆ ئەنجام دەدەن ﴿يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللّهِ﴾ موسوڵمانان چەند خودایان خۆش دەوێ ئەوانیش ئەوەندە ئەو بتانەیان خۆش دەوێنو دەیانپەرستنو بە ملکەچی لە ئاستیاندا هەڵدەنوزنو بەندایەتییان دەکەن، وەلێ ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلّهِ﴾ ئەوانەی

موسـوڵمانی سـاغن‌و خـاوەن بـاوەڕن زۆر زیـاتر خـودای خۆیـان خۆشـدەوێ، چـونکە موسوڵمانان واز لەخودای خۆیان ناهێنن بچن خودای تر بپەرستن!! بەڵام موشریکەکان کە تینیان بۆهات واز لە بتپەرستی دەهێنن‌و دەست دەکەن بەخودا پەرستی‌و ملکەچی دەبن، خـودا درۆزنـەکانیان دەکەنـە واسیتە بـۆلای خـودا، ماوەیـەك بتێك دەپەرستن‌و دوایی واز لەودەهێنـن روودەکەنە بتێکی تر، یـان دەیخـۆن وەکوو: چـۆن هـۆزی (باهلـة) ساڵێکی گرانی خوداکەیان کە لەخورمابوو خواردیان!!!

﴿وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ أَنَّ الْقُوَّةَ لِلّهِ جَمِيعاً وَأَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ﴾

ئەو ستەمکارانەی هاوبەش بـۆ خـودا دادەنـێن، لـەجیاتی خـودا بـەردو دار دەپەرستن، بەوکارانەشیان ستەم لەحەق دەکەن، ستەم لەخودی خۆشیان دەکەن، ئا ئەمانـە ئەگـەر بەوردی بڕواننە ئەو رۆژەی کە لەبـەردەم خـودای تـاك‌و تـەنیا بـە ملکەچی دەوەستن، ئەگەر بیرێك لەو رۆژە بکەنەوە: کە چاویان دەکەوێ بەو سزا سامناکەی: کە دانراوە بۆ ستەمکاران، ئەوەیان بۆ روون دەبێتەوە کە هەموو هێزو توانایەك هی خودایـەو بـەس! کەس رایەی ناکەوێ ببێتە هاوبەشی خودا، کەس ناتوانێ خۆ بـەخودا بزانـێ، هـەروەها ئەوەشیان لا روون دەبێتەوە کە بەڕاستی سـزای بەئێـشی هەیـە بـۆ سەرپێچیکاران، بـۆ ستەمکاران.. بەڵێ ئەوانە ئەگەر ئەو فلیمانە ببیننە پێش چاوی خۆیـان، شـتی سـامناك دەبینن، بەلای گەورەیان چاو پێدەکەوێ، تەنگ‌و چەڵەمەی وایان چاو پێدەکەوێ زمـان توانای گوتنی نییەو بەهیچ شێوەیەك باس نـاکرێ ﴿إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُواْ مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الأَسْبَابُ﴾ ئەگەر ئاگاداربێ ئەوکاتەی سـەرۆك‌و لێپرسـراوان خۆیان لەشوێنکەوتووانی خۆیان بەری دەکەن‌و دەڵێن: ئەوانە شوێنکەوتووی ئێمە نین، ئێمە پێمان نەگوتوون شوێنمان بکەون!!

ئـەمجار سـزای سـەختی ئامادەکراویـان چـاو پێدەکـەوێ لـە عەیبـەتا هـەموو پەیوەندی‌و عەلاقاتێکی کە لەگەڵ یەکتردا هـەیان بـووە دەپـچڕێ‌و هەرکەسـە سـەرقاڵی حـاڵی خـۆی دەبـێ سـەرۆکی‌و لێپرسـراوی، مـسکێنی‌و ئاغـایی‌و بەگایـەتی نامێنـێ سەرۆکەکان ناتوانن پارێزگاری لەخۆیان بکەن چ جای لەشوێنکەوتوانیان، حەقیقـەتی

خودایەتی خوایان بۆ ئاشکرا دەبێ، بۆیان روون دەبێتەوە ئەم فس فس پاڵەوانانە چەند زەعیفو لاوازو زەبوونن لەبەردەم بارەگای خودای پەروەردگاردا، چەند بێ دەسەڵاتن لەئاست ئەو سزایەی بۆیان تەرخان کراوە، چەند بێ بەرگریین لەئاست ئەو بڕیارانەی بۆیان دەدرێ ﴿وَقَالَ الَّذِينَ اتَّبَعُواْ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّؤُواْ مِنَّا﴾ ئەوانەی شوێن ئەو فێڵبازانە کەوتوون ئەوەندە رقیان هەڵدەستێ ئەوەندە تینیان پێدەگا ئاواتەخوازی ئەوەن رێگایان پێ بدرێ تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، داخوازی ئەوە دەکەن دەڵێن: خۆزگە بیان گێڕاینایەوە بۆ دونیا، بۆئەوەی ئێمەش پاکانەی خۆمانمان لێ بکردنایە، وەکوو چۆن ئەوان ئێستا پاکانەیان لە ئێمە کرد، هەموو داخوازییان ئەوەیە بگەڕێنەوە بۆسەر زەوی، شوێن رێبازی حەق بکەوتنایەو یەکتا پەرستییان ئەنجام بدایەو بەگوێرەی کیتابی خواو رەوشتی پێغەمبەر رەفتاریان بکردایە، ئەمجار بمردنایەو بهێندرانایە بۆ حیسابو لێکۆڵینەوە، بۆخاتری ئەوەی پاکانەی خۆیان لەو سەرکردایەتیە فێڵبازەو زەعیفە زەبوونە چەواشەیە بکردایەو تۆڵەی خۆیانیان لێ بکردنایەوە ﴿كَذَلِكَ يُرِيهِمُ اللّهُ أَعْمَالَهُمْ حَسَرَاتٍ عَلَيْهِمْ﴾ وەکوو چۆن پەروەردگار سزای بەئێشیان پیشان دەداو بێ دەسەڵاتیو زەبوونی گەورەکانی خۆیان دەبینن، ئا بەوجۆرەش کردەوەکانی دنیایان کەبۆ خۆیان دڵیان پێ خۆش بوون دەبێتە غەمو نارەحەتی، خودا پیشانیان دەدات کە کردارەکانی دونیایان هیچ قازانجو سوودێکی نییەو لێیان پەشیمان دەبنەوە، پەشیمانیش تازە دادیان ناداو راپێچ دەکرێن بۆ ناو دۆزەخ ﴿وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنَ النَّارِ﴾ ئەوان لەو ئاگرەدا دەمێننەوەو لێی دەرناچنو ناگەڕێندرێنەوە بۆ دونیاو تا ئیمان بێننو تۆڵە لە گەورەکانی خۆیان بکەنەوە.

## حەڵاڵكردنی شتە پاكەكانو سەرچاوەی حەرامكردنی شتە یاساغەكان

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ إِنَّمَا يَأۡمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلۡفَحۡشَآءِ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿١٦٩﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَآ أَلۡفَيۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَهۡتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ ٱلَّذِي يَنۡعِقُ بِمَا لَا يَسۡمَعُ إِلَّا دُعَآءٗ وَنِدَآءٗۚ صُمُّۢ بُكۡمٌ عُمۡيٞ فَهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿١٧١﴾ ﴾.

ئەمجار پەروەردگار دوای ئەوەی كە حاڵی بێدینانو بتپەرستانی روون كردەوە، مشتو مڕی نێوان پێشەواو شوێنكەوتوانیانی هێنایە سەر شاشەكەو ئاكامی كردەوەكانیانی خستەڕوو، روو دەكاتە كۆمەڵی ئادەمیزاد بەگشتیو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي الأَرْضِ حَلاَلاً طَيِّباً﴾ ئەی خەڵكینە! لەو بەروبوومەی لەزەویدا هەیە بڕێ لە خواردەمەنییەكانی بخۆن كە لەناویاندا هەندێ لەو خواردەمەنییانەن بۆ خۆتان بەختو خۆڕایی لەخۆتان حەرام كردووەو حەرام بوونەكەیشتان داوەتە پاڵ خوداو گوایە خودا لێی حەرام كردوون.

ئیبنو عەباس دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی هۆزی ثەقیفو بەنی عامیرو خوزاعەو خێڵی مودلیج نازڵ بووە كە بەبێ بەڵگە چەند شتێكیان لەخۆ حەرام كردبوو، وەكوو لەمە بەولاوە قورئان لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (١٠٣)دا باسیان دەكاو

دەفەرموێ: ﴿مَا جَعَلَ اللّهُ مِن بَحِيرَةٍ وَلاَ سَآئِبَةٍ وَلاَ وَصِيلَةٍ وَلاَ حَامٍ وَلَكِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ يَفْتَرُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ﴾ خودای پەروەردگار ئەو شتانەی کە خواردنیان حەرامە بەم ئایەتە دیاری کردوون کە دەفەرموێ: ﴿قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ – الأنعام/ ١٤٥﴾.

**جگە لەم جۆرە خواردەمەنییانە ئەوانی تر حەلاڵن بە مەرجێك پاك بن‌و حەقی خەڵکی پێوە نەبێ، چونکە حەرام دوو جۆرە:**

١- هەیە بۆ خۆی حەرامە، لەبەر پێویستی‌و ئاتاجی نەبێ خواردنی حەرامە.

٢- هەیە بۆ خۆی حەرام نیە بەهۆی شتێکی لاوەکی حەرام دەبێ وەکوو ئەو ماڵ‌و دارایی‌و خواردنانەی کە بەگوێرەی شەرع وەدەست نەهێنراون، وەکوو ماڵی دزی‌و سوودو داگیر کراو بەرتیل‌و فێڵ‌و تەڵەکەبازی.

﴿وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ ئێوە شوێن ڕەوشتی شەیتان مەکەون، چاو لە هەنگاوەکانی مەکەن، وەکوو ئەو ڕێگا لە خەڵکی گوم مەکەن‌و مەردوم گومڕا مەکەن، چونکە ئەو دوژمنی ئێوەیە، دژایەتی ئەو لەگەڵ ئێوەدا ئاشکراو نمایانە.

شەیتان سەرچاوەی بیرو بۆچوونی پڕوپووچ‌و گومڕاییە، هەمیشە خەریکی هەڵخەڵەتاندن‌و لە خلیسك بردنی ئادەمیزادە، بەردەوام خەڵکی هەڵدەنێ بۆ خراپەکاری‌و تاوانباری‌و گومڕایی. بەچەند جۆرێك دەیەوێ لە ڕێگەی ڕاست لاتان بدا. دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَأْمُرُكُمْ بِالسُّوءِ وَالْفَحْشَاء﴾ شەیتان هەمیشە فەرمانتان پێ دەکا بە ئەنجامدانی کردارێك کە زیانی دونیاو قیامەتتانی تێدا بێ. بە نهێنی‌و ئاشکرا خراپەو خراپەکاری بکەن ﴿وَأَن تَقُولُواْ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ هەروەها فەرمانتان پێ دەکاو هەڵتان دەنێ: کە بە ناوی خوداوە شتی وا بڵێن: کە خودا فەرمانی پێ نەکردوون، ڕێنموییتان دەکا کە شتی وا بخەنە ناو ئایینەکەیەوە: کە نازانن ئاخۆ ئاینە یان نا؟ یان شتی حەرامتان بە حەلاڵ دەخاتە بەرچاو بە پێچەوانەشەوە شتی حەلاڵتان بە حەرام بۆ دیاری دەکات، هەموو ئەمانە زیادەڕەوییەو کاری ناڕەوایەو تێپەڕاندنە لە سنوری

خوداو دەست درێژییە بۆ سەر خودایەتی خوداو سوڵتەی تەشریعی پەروەردگار، ئەم جۆرە شتانە خراپترین ئەو فەرمانانەن کە شەیتان فەرمان بە ئادەمیزاد دەکا، چونکە ئەم شتانە بناغەی روخاندنی ئەخلاق و رەوشتن و گۆڕانکارییە لە شەرعدا.

هەر لەم بیرو بۆچوونانەیە کە بڕێ لە قسەڕۆیشتوو کاربەدەستان پێیان وایە خودا پێویستی بە واسیتەیەو هە ئیشێکت پێی بوو دەبێ تکاکارێ پەیداکەی ئەمجار ئیشەکەت بۆ جێبەجێ دەکاو هیچ شتێك بێ واسیتە ئەنجام نادا. ئیتر دڵی رەشە خەڵکەکەیان لە سوننەتی خودا لاداوەو روویان پێ کردۆتە چەند گۆڕو ئارامگای ئەم و ئەو، یان کردویانن بە شوێنکەوتووی چەند بەندەیەکی زەبوون و لاواز کە ناتوانن هیچ زەرەرو قازانجێك بەخۆیان بگەیەنن، ئەمەیان ناوناوە وەسیلەو تکاکار! حاشا خودا شتی وا قبوڵ بکا، بەشتی وا رازی بێ! ئەمەش گومڕایی یەکە ئەو مەردوومگەلە تێی کەوتووەو کوێرانە ئەنجامی دەدەن.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا﴾ ئەگەر بەو کافرانەی کە شوێن شەیتان کەوتوون و رێبازی ئەویان گرتووە – بگوترێ: وەرن، گوێ لە قورئان بگرن و شوێن پێغەمبەر بکەون و ئیمان بێنن و جگە لەخودا کەسی تر بەخودا مەزانن، دەڵێن ئێمە نازانین.. ئێمە شوێن باوك و باپیری خۆمان دەکەوین ئەوان چۆن رەفتاریان کردووە ئێمەش وادەکەین، پیاو ماقوڵ و لێپرسراوی خۆمان چۆنیان کردووە ئێمە شوێن ئەوان دەکەوین، ئەمجار پەروەردگار بەرپەرچییان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ شَيْئاً وَلاَ يَهْتَدُونَ﴾ ئەوانە ئەوەندە نەفامن تەنانەت ئەگەر باوك و باپیریان نەزان و نەفام و گێژو وێژیش بن ئەوان هەر شوێنیان دەکەون؟! ئەگەر عەقڵ و هۆشیان نەبێ و دڵ وشیارو زیرەکیش نەبن، ئەوان واز لەرێبازەکەیان ناهێنن؟! پرسیارەکە بۆ نارەزامەندییەو بۆ لۆمەو گلەییە.

﴿وَمَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ الَّذِي يَنْعِقُ بِمَا لاَ يَسْمَعُ إِلاَّ دُعَاء وَنِدَاء﴾ حاڵ و چۆنیەتی ئەو کافرانەی ئەهلی کیتاب لەوەدا کە سوود لەو قورئانە نابینن و بەڵگە

پرشنگدارەکانی کاریان تێناکا، حاڵی ئەو کەسەش کە بانگیان دەکا بۆ ئیمان هێنان وەکوو شوانێك وایە کە دەنگی مەڕو بزنەکانی دەدا رایان دەدا لێرە بۆ ئەوێ‌و لەوێوە بۆ ئێرە، مەڕو بزنەکانی دەنگەکە دەبیسن بەڵام هیچ تێناگەن، ئەو کافرانەش وەکوو ئەو ئاژەڵە لەوەڕ خۆرانە وان، هیچ لەو بانگەوازییە حاڵی نابن‌و تێناگەن، گوێیان لە قورئانە کەچی گوێچکەی خۆیان دەهاخنن وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾ ئەوانە لەهەڵس‌و کەوت‌و بیرو بۆچووندا وەکوو ئاژەڵ وان، بەڵکوو گومڕاترن‌و سەر لێشێواو ترن ﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ﴾ کەڕو گوێ گرانن حەق‌و راستی نابیستن لاڵن لەقسەو ناتوانن ئاخاوتنی ئاقڵانە ئەنجام بدەن‌و قسەی حەق‌و راست بکەن. لەبەر پاراستنی بەرژەوەندی تەسکی خۆیان‌و خۆپەرستییان دڵیان بڕوا نادا ددان بەو فەرمانانەدا بێنن کەخودا لەسەری پێویست کردوون، ناتوانن ئەوەی کەخودا دەربارەی (محمد) (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی پێکردوون کەبۆ خەڵکی روونی بکەنەوە ئەنجامی بدەن. کوێرو نابینان‌و رێگەی حەق نادۆزنەوە، کەوابوو ئەوان هیچ حاڵی نابن لەو ئامۆژگاریانەی کە ئاڕاستەیان دەکرێ چونکە ئەوان وەکوو ئاژەڵیان لێهاتووەو لەگومڕایی خۆیاندا نوغرۆ بوون.

## باسی خواردەمەنی حەڵاڵ‌و حەرام

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ وَٱشْكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ

ٱللَّهِۖ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار خیطابی ئاراستەی ئادەمیزاد کرد بەگشتی کە لەبەروبوومی زەوی بخۆن، ئەمجار حاڵو چۆنیەتی کافرە لاسایی کەرەوەکانی روون کردەوە، نەفامیو نەزانینیانی دەست نیشان کرد، بە ئاژەڵی حلێب کردنو بە گومراتریش لە ئاژەڵ حسابی کردن، ئەمجار لێرەدا خیطابێکی تایبەتی ئاراستەی موسوڵمانان کرد، چونکە ئەوان تێگەیشتوو هۆشمەندن، خواردنی رزقو رۆزیی زەوی بۆ حەلاڵ کردنو فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمانتان هەیە بخۆنو بخۆنەوە لەو رزقو رۆزییە پاكو خاوێنەی کە پێمان بەخشیونو بۆمان حەلاڵ کردوون، لەو خواردنانەی کە لەخۆتانەوە لەخۆتان حەرام کردوون ئێمە لێمان حەرام نەکردوون بە ئارەزووی خۆتانو بەگوێرەوی پێویست بخۆنو بخۆنەوە ﴿وَاشْكُرُواْ لِلّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ سوپاسگوزاری خودابن لەپای ئەو نیعمەتو خۆشیانەی کەپێتان دراوە ئەگەر راست دەکەن ئێوە هەر خودا دەپەرستنو جگە لەئەو کەسی تر بەخودا نازانن!!!

﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ﴾ ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان بەخوداو پێغەمبەری خودا هێناوە، شتێك لەخۆتان حەرام مەکەن کەمن لێم حەرام نەکردوون، نەچن وەکوو سەردەمی پێش هاتنی ئیسلام کە لەخۆیانەوە وشتری بەحیرەو صائیبەو شتی تریان لەخۆیان حەرام کرد ئێوەش ئاوا بکەن، هیچ خواردەمەنییەك لەئێوە حەرام نەکراوە، جگە لەخواردنی مردارەوەبوو چونکە مردارەوە بوونەکەی یان بە نەخۆشییەکی درێژ خایەن بووە، یان بە رووداوێکی کوتو پڕی، هەردووکیان ترسی زیانیان لێ دەکرێ... زیاد لەوەش زەوقی ساغ بێزی لێ دەکا ﴿وَالدَّمَ﴾ هەروەها خوێنی رژاو، چونکە ئەویش وەکوو مردارەوەبوو، زیانی هەیەو بێزی لێ دەکرێ ﴿وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ﴾ گۆشتی بەراز،

چونکە بەتاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە زیانی جۆراو جۆری هەیە، بەتایبەتی لە ولاتێکی گەرمێندا ﴿وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللّهِ﴾ هەر کوشتییەك لەکاتی سەربڕینیدا ناوی غەیری خودای لەسەر هاتبێ، چونکە ئەمەش جۆرە بت پەرستییەکە، تەنانەت زانایانی ئیسلام فەرموویانە هەر کوشتییەك لەگەڵ ناوی خودادا ناوی شێخێك پێغەمبەرێکیشی لەسەر ببرێ، هەر حەرامە، کەوابوو کەسێك لەکاتی سەربڕینی کوشتیدا بڵێ: (بسم الله) لەگەڵ ئەوەدا ناوی (شێخ عەبدلقادر)ی گەیلانی یان کاك ئەحمەدی شێخ یان هەر شێخێکی تر بێنێ گۆشتەکەی حەرام دەبێ.. ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ کەسێك ناچاربوو برسی بوو ترسا لەوەی کە ئەگەر لەو گۆشتە حەرامە نەخوا تووشی زیان دەبێ، ئەوە بۆی حەلاڵە بەئەندازەی پێویستی لێیان بخوا. چونکە لە نەخواردنیاندا لەناوچوونی خۆی تێدایەو تووشی هیلاکەت و فەلاکەت دەبێ، خودایش فەرمانی پێکردووین کەخۆمان نەخەینە تەهلووکەوە ئەمجار کە دەفەرموێ: ﴿غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ﴾ مەبەست ئەوەیە کە خەڵکی لەخۆیانەوەو بەئارەزووی خۆیان نەچن ئەندازەی پێویستی و ئاتاجی دیاری بکەن هەرکەمێك پێویستیان بوو خێرا پەلاماری حەرامەکە بدەن و بڵێن: ئیحتیاجی حەرام حەلاڵ دەکا ﴿إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان خودا لێخۆش بووە بۆ کەسێك لە ئەندازە گرتنی ئاتاجییەکەیدا بەهەڵەچوو، بە عەقڵی خۆی ئەو حاڵەتەی تێی کەوتووە پلەیەکە حەرامی بۆ حەلاڵ دەکا ﴿رَّحِيمٌ﴾ بە رەحم و بەزەییە کە رێگای ئادەمیزادانی داوە لەکاتی پێویستیدا پەنا بۆ شتی حەرام بەرن، حەرامیان بۆ حەلاڵ دەکا.

## شاردنەوەی نیگای پەروەردگار لەلایەن ئەهلی کیتابەوە

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَشۡتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ مَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ إِلَّا

ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٤﴾ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُاْ ٱلضَّلَـٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ وَٱلْعَذَابَ بِٱلْمَغْفِرَةِ ۚ فَمَآ أَصْبَرَهُمْ عَلَى ٱلنَّارِ ﴿١٧٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُواْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿١٧٦﴾ ﴾.

**ئایەتەکان بەردەوامن لەدەرخستنی هەڵوێستی ئەهلی کیتاب بەرامبەر قورئانو پێغەمبەر حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ).**

**لە ئایەتەکانی پێشوودا ئەوەی روونکردەوە کەمالمو قەشەکانی ئەهلی کیتاب برێ شتی حەڵاڵیان یاساغ کردبوو، لە خۆیانەوە چەند شتێکیان خستبووە ناو ئایینەکەیانەوە، رەبەنیو زبرە ژیانیان لە خواردنو خواردنەوەدا داهێنا بوو! لێرەدا ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە ئەو تاوانبارانە چی زانیاریو نیشانە هەیە لە کتێبەکانیاندا دەربارەی پێغەمبەری ئیسلام هەموویان شاردۆتەوە، گۆڕیویانە راستیەکانی نیگایان شاردۆتەوە، ئایینە بە تاڵو پوچە دەسکردەکەی خۆیان رانواندووە، بازرگانیو مامەڵەیان بە ئایینەوە کردووە، ئایینیان کردووە بە هۆکاری ژیان. وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا – الأنعام/٩١﴾.**

**طەبەری لە عیکریمەوە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ئەم ئایەتە ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ....﴾ لەگەڵ ئایەتی ال عمران ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ...﴾ هەموویان دەربارەی جولەکەو مالەکانیان هاتوونە خوارێ، کە لە رِشە خەڵکەکەو بۆرە پیاوەکانیان بەرتیلو دیارییان وەردەگرت، جا کە پەروەردگار حەزرەتی**

موحەممەدی کرد بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ترسان نانیان ببڕێ، هەموو نیشانەو باسی پێغەمبەر کە لە تەوراتدا بوو گۆڕیانو بە دەست لێ دراوی بە خەڵکەکەیان راگەیاندو بڵاویان کردەوە ئیتر یەزدانی مەزن ئەم ئایەتەی نارده خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلَ اللَّـهُ مِنَ الْكِتَابِ وَيَشْتَرُونَ بِهِ ثَمَنًا قَلِيلاً﴾ ئەوانەی کە فەرمانی خودا دەشێرنەوە، ئەو نیگایەی خودا بۆ پێغەمبەری خۆی ناردووە بۆ خەڵکەکەی روون ناکەنەوە، یان ماناکەی دەگۆڕنو لە مەبەستی خۆی لای دەدەن، یان دەقەکەی دەشێوێنن، یان لە شوێنی خۆیدا بەکاری ناهێننو بە گوێرەی هەواو ئارەزوی خۆیان راڤەی دەکەن بۆ ئەوەی لە پاساوی ئەمەدا بەهایەکی کەمیان دەست بکەوێ، وەکوو: بەرتیل وەرگرتن، یان فتوا دەرکردن بە شێوەیەکی نارەواو نا شەرعی بۆ رەزامەندی لێپرسراوان، یان بۆ وەرگرتنی پارەو پوڵێکی کەم لە فتوا بۆ دراوەکە، جا ئەو پارەیەی کە لە پێناو شاردنەوەی فەرمانی خوداو نیگای خودا بۆ پێغەمبەران وەردەگیرێ چەند زۆر بێ بە کەم حسێب دەکرێ، چونکە ئەو پارەو دەستکەوتەی وەری دەگرێ چەندێك زۆر بێ لە بەرامبەر ئەوەی کە لە کیسی دەچێ زۆر زۆر کەمە.

﴿أُولَئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلاَّ النَّارَ﴾ ئەوانە کە نووسراوی ناو کتێبی خودا دەشارنەوە یان بازرگانی بە ئاینەوە دەکەن. بۆ دەستکەوتی دنیایی گۆڕانکاری لە دەقەکانی ئایندا دەکەن، ئەوەی کە دەستیان دەکەوێ دەیخۆنو دەبێتە هۆکاری چوونە ناو دۆزەخیانو وانەزانن ئەوە خواردەمەنی ئاساییە، ئەوە ئاگر خواردنە.

یان مانای بەم جۆرەیە: هیچ شتێك ورگی ئەوان تێر ناکا مەگەر ئاگری دۆزەخ تەماعی ئەوان دابین بکا، ئەو کاتە چاویان تێر ببێ، وەکوو لە حەدیثی پێغەمبەردا هاتووە دەفەرموێ: «وَلاَ يَمْلأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلاَّ التُّرَابُ» گڵ نەبێ ورگی ئادەمیزاد پڕ ناکا.

حوکمی ئەم ئایەتە گشتییە بۆ موسوڵمانانو نا موسوڵمان، سونەتی خودا وهایە یارمەتیدەری حەقە، ریسواکەری بەتاڵە! ﴿وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّـهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ ئەوان خودا رۆژی قیامەت نایاندوێنێو رووی رەحمەتیان لێ ناکاو رقی لێیانە ﴿وَلاَ يُزَكِّيهِمْ﴾ لە

گوناهو تاوان پاکیان ناکاتەوەو لێیان خۆش نابێ بە مەرجێك بە کافری بمرن! ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ سزای بە ئێش‌و ئازاریان بۆ ئامادە کراوە. ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُاْ الضَّلاَلَةَ بِالْهُدَى﴾ ئەو خودا نەناس‌و فێڵبازانەی کە ئاوا نیگای خودا دەشێوێنن‌و گۆڕانکاری لە کەلامی خودا دەکەن‌و خوداش سزای بە ئێشی بۆ داناون رووی رەحمەتیان تێ ناکا ئەوانەن: کە رێبازی راستیان نەگرتووە، ئەو پەیامە پیرۆزەی پێغەمبەر هەڵنابژێرن، شوێن هەواو هەوەسی فێڵبازو خوانەناسان دەکەون گومڕاییان هەڵبژاردووە ﴿وَالْعَذَابَ بِالْمَغْفِرَةِ﴾ شیاوی سزای دۆزەخن، لێبوردنیان بۆ نیە، چونکە بۆ خۆیان ئەو رێگایەیان پەسەند کردووەو ستەمیان لە خۆیان کردووە ﴿فَمَآ أَصْبَرَهُمْ عَلَى النَّارِ﴾ واتە: پێکێشییان لەو کردارە نارەوایەیان کە دەبێتە هۆی چوونە ناو ئاگریانەوە شوێنی سەرسوڕمانە! بەردەوام بوونیان لەسەر ئەو رێبازە سامناکەی کە دەیانباتە ناو دۆزەخەوەو گوێ پێ نەدانیان بە ئاکامی ئەو کردارە خراپانەیان ئەوە دەگەیەنێ کە لە ئاگر ناترسن‌و خۆی بۆ رادەگرن، ئەمە شتێکی وایە دەبێ جێگای سەرسوڕمان بێ، دەبێ چی بێ وای لێ کردبن: کە خۆیان بۆ ئاگری دۆزەخ رابگرن!! لەوەش سەرسوڕهێنەرتر ئەوەیە کە ئادەمیزادی هۆشمەند ئەو ئاگرە بۆخۆی رەوا ببینێ‌و رازی بێ بیکاتە ماڵی خۆی. ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ نَزَّلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ﴾ ئەو سزایەی باس کراو بۆ ئەو خوانەناسانە تەرخان کراوە بەهۆی ئەوەوەیە کە خودا تەوراتی ناردووە بۆ ئەوەی ئەو حەق‌و راستییەی تێیدایە بڵاوبکرێتەوە کەچی ئەوانە دەیشارنەوەو گۆڕانکاری تێدا دەکەن ﴿وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِي الْكِتَابِ﴾ ئەوانەی کێشەیان هەیە لە ماناو گۆڕانکاری لە تەوراتدا ﴿لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ﴾ لە بەرەبەرکانیەکی دوور لە راستی‌و حەقخوازیدان‌و شیاوی سەختترین سزان!

## دیاردەکانی کرداری چاك

﴿ ۞ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَـٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَـٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّـٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ ﴾.

گۆڕانی قیبلە لە (بیت المقدس)ەوە بۆ کەعبە ئاژاوەیەکی گەورەی لە نێوان شوێنکەوتوانی ئایینەکاندا نایەوە، هەر تاقمەو گرۆهێك پێی وابوو: کە نوێژ بەبێ ڕووکردنە قیبلەی ئەوان دروست نییە، دژایەتیو ڕووبەڕوو بوونەوە لەنێوان موسوڵمانانو ئەهلی کیتابدا گەیشتە ئەوپەڕی، خاوەن نامەکان پێیان وابوو پێویستە نوێژ بەرەو قیبلەی ئەوان ئەنجام بدرێ، کە قیبلەی بڕێ لە پێغەمبەران بووە!! موسوڵمانەکانیش پێیان وابوو کە نوێژ قبووڵ نابێو خودا وەری ناگرێ ئەگەر بەرەو کەعبە نەکرێ کە قیبلەی باوکی پێغەمبەران حەزرەتی ئیبراهیمە!

ئیتر پەروەردگار لەم ئایەتانەدا ئەوەی بۆ هەموو ئادەمیزاد ڕوون کردەوە کە تەنیا ڕووکردنە لای خۆرهەڵات یان خۆرئاوا بەچاکەکار حلێب ناکرێو ئەو چاکەیە نیە کە خودا مەبەستیەتی، بەڵکوو چاکەی ڕاستی بریتییە لە بڕوا بەخوداو

پێغەمبەرانو نامە ئاسمانییەکانو فریشتەکانو رۆژی دوایی و زیندوو بوونەوە، بڕوایەکی چەسپاوە لە دەروونیدا لەگەڵ کردەوەی چاكو خواپەسەند.

(عبدالرزاق) لە قەتادەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: جولەکەکان لەنوێژدا روویان دەکردە لای خۆرئاوا مەسیحییەکان روویان دەکردە لای خۆرهەڵات.. ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ: کە دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ﴾ کرداری چاكو کرداری باش بریتی نییە لەوەی کە لەنوێژدا رووبکەنە لای رۆژهەڵات یان خۆرئاوا ﴿وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلآئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ﴾ بەڵکوو کرداری چاکی راستو باش هەبوونی بیرو باوەڕە بەخوداو بەرۆژی دوایی و بە فریشتەو بە کتێبە ئاسمانییەکانو بە پێغەمبەران ﴿وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى﴾ ماڵو دارایی خۆی هەرچەندە خۆشەویستیش بێ لای بیدا بەخزمە هەژارەکانی چونکە ئەوان لەپێشترن بۆ چاکە لەگەڵ کردن ﴿وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّآئِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ﴾ هەروەها یارمەتی هەتیوانو هەژارو نەدارایانو رێبوارانی دوورە وڵاتو سوالکەرو موحتاجان بدا، هەروەها ماڵ بدا بۆ رزگارکردنی کۆیلەو دیلەکان ﴿وَأَقَامَ الصَّلاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ﴾ لەگەڵ ئەوانەشدا گرنگترین روکنی ئیسلام کە نوێژکردنو زەکات دانە، ئەنجامیان بدا ﴿وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُواْ﴾ ئەوانەی کە پابەندی بەڵێنو پەیمانەکانی خۆیانو کە بەڵێنێکیان دا ئەنجامی دەدەن ﴿وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاء والضَّرَّاء وَحِينَ الْبَأْسِ﴾ ئەوانەی خۆگرو خۆڕاگرن بۆ زاڵبوون بەسەر تەنگانەدا هەروەها لەکاتی شەڕکردن لەپێناو ئاییندا نەبەزو خۆڕاگرن ورە بەرزو چاونەترسن ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ﴾ ئەو ئادەمیزادانەی کە رەوشتیان ئاوایە، ئەوانە راستگۆن لەبیرو باوەڕدا چوستو چالاکن لەتەقواو خودا پەرستیدا.

## کوشتنەوەی بکوژو حیکمەتی ئەو تۆڵە سەندنەوەیە

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَىۖ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰۚ فَمَنۡ عُفِيَ لَهُۥ مِنۡ أَخِيهِ شَيۡءٞ فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖۗ ذَٰلِكَ تَخۡفِيفٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَرَحۡمَةٞۗ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٧٨﴾ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾.

کوشتنەوەی بکوژ لەئایینی جولەکەدا باوبوو، هەرکەسێك کەسێکی بکوشتایە بەگوێرەی فەرمانی تەورات کابرای بکوژ دەکوژرایەوە، لەئایینی (مەسیح)یشدا خوێن وەردەگیرا، عەرەبەکانیش لەمبارەوە بەگوێرەی هێزو توانای هۆزەکان هەڵس و کەوتیان دەکرد، زۆرجار وادەبوو هۆزی لێکوژراو بکوژیان دەکوشتەوە، بەڵکوو هەوڵیان دەدا سەرەك خێڵ بکوژنەوە، جاری واش دەبوو لەجیاتی کوژراوێك داوای کوشتنەوەی (١٠) دە کەسیان دەکرد، یان لەجیاتی ئافرەت پیاویان دەکوشتەوە لەجیاتی کۆیلە پیاوی ئازاد (حور)یان دەکوشتەوە، جا ئەگەر خزم و کەس و کاری کوژراو داواکەیان بۆ جێبەجێ بکرایە ئەوە صوڵح دەکراو خوێنەکەیان دەبەست، ئەگینا شەڕیان لەگەڵ خێڵی بکوژ دەکردو خوێنێکی زۆر دەڕژاو دوژمنایەتی پەرەی دەسەندو ستەمکارییەکی زۆر دەکراو زۆر کەس بەخت و خۆڕایی تێدادەچوو!! کەوابوو تەنها کوشتنەوەی بکوژ دادوەرانەیەو بەس! کوشتنەوەی غەیری بکوژ زوڵم و ستەمە! بەڵام برێ جار وا رێدەکەوێ کوشتنەوەی بکوژ زیانبەخشەو نەکوشتنەوەی سوودی گشتی تێدایە، وەك ئەوە کابرایەك لەئەنجامی رق هەڵسانێکی کتوپڕی برای خۆی بەدەست بکوژرێ،

لەهەمان کاتا ئەم بکوژە بەخێوکەرو کاسبکاری ئەو خێزانەبێ جا ئەگەر لێرەدا ئەم بکوژە بکوژرێتەوە ئەوە ئەو خێزانە بێ سەرپەرشتیار دەبێ؛ یان جاری وادەبێ لە کوشتنەوەی بکوژدا گێرەو کێشەی لاوەکی پەیدا دەبێو نەکوشتنەوەی باشترە لە کوشتنەوە، ئادەمیزاد لەم کاتەدا خوێنگری کوژراوەکە (ولی المقتول) ئەگەر واز لەکوشتنەوەکە بێنێو خوێن وەربگرێو بەرژەوەندی گشتی بەرچاو بگرێ باشترە، خۆ ئەگەر بکوژ عەفوو بکا خوێنەکەشی لێ نەستێنێ ئەوەش پیاوەتییەکی ترە، ئایینی ئیسلام پەسەندی دەکا.

وێدەچێ یەکێك بڵێ: - بە تایبەتی لە رۆژگاری ئێمەدا – سزای کوشتنەوە تۆڵەیەکە دادوەرانە نیەو دڵرەقی تێدایە. لایەنی پەروەردەکردنی تێدا نیە! پێویستە دامودەزگای میریی هەوڵبداو لە جەماوەر بگەیەنێ کە ئەوانەی تاوانی کوشتن ئەنجام دەدەن لە راستیدا نەخۆشی دەروونیان هەیەو پێویستە نەکوژرێنەوە، بەڵکوو بخرێنە خەستەخانەوە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانیان!!

لە راستیدا ئەم جۆرە بۆچوونانە – هەرچەندە بۆ برێ رووداو وێ چووەو یاسای خۆی هەیە – بەڵام ئەگەر ئێمە بە وردی سەرنجی بدەینێ دەبینین کە ئەم جۆرە تەشریعە بۆ کۆمەڵگایەك گونجاوە کە زۆر پێشکەوتوو بێ، دانیشتوەکانی زۆر بە ئەخلاقو رەوشت بەرز بن، لەبەر ئەوە ناکرێ جۆری ئەو بۆچوونە بکرێتە تەشریعێکی گشتی، بەڵکوو تۆڵە سەندنەوەی دادوەرانەو یەکسانی شتێکی گونجاوەو شیاوی هەموو کۆمەڵگایەکە، هەر تۆڵەسەندنەوەی شەرعییە کە دەتوانێ پەروەردەی کۆڕو کۆمەڵ بکا، وازهێنان لە تۆڵەستاندنەوە شەقاوەو تاوانخوازان هەڵدەنی خوێن بە ناحەق برێژن. ئەوەش سەلمێندراوە: کە بەندیخانە نابێتە هۆی تەمێ کردنی زۆر لە تاوانباران، بەڵکوو برێ جار تاوانبار بەندیخانەی پێ لە ماڵی خۆی باشترە. بۆیە پەروەردگار روودەکاتە موسوڵمانان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى﴾ ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوەو موسوڵمان بوون! پێویستە لەسەرتان دادوەرانەو یەکسانی تۆڵەی کوشتن بسێننەوە بکوژ کێیە بچن ئەو بکوژنەوە،

نەچن لەشوێنی بکوژ سەرەك خێڵ بکوژنەوە، یان بچن لەجیاتی یەك کوژراو چەند کەسێك بکوژنەوە! بەڵکوو کەویستتان تۆڵە بسێننەوە ﴿الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى﴾ ئەگەر ئادەمیزادێکی ئازاد ئادەمیزادێکی ئازادی کوشت، ئەوە دەکوژرێتەوە، هەروەها کۆیلە لەشوێنی کۆیلە دەکوژرێتەوە، ئافرەت لەشوێنی ئافرەت دەکوژرێتەوە، بەشێوەیەکی چوون یەك‌و یەکسان، کێ بکوژە ئەو دەکوژرێتەوە نەك سەرەك خێڵ یان لەجیاتی بکوژ زیاد لەیەکێك بکوژنەوە چونکە ئەوە تۆڵەو (قصاص) نییە بەڵکوو ستەم‌و زیادەڕەوییە.. کەواتە مەبەستی سەرەکی ئایەتەکە پوچەڵ کردنەوەی ئەو یاساو داب‌و نەریتە بوو: کە عەرەبەکان پابەندی بوون‌و پەیڕەوییان دەکرد. ئەوە ناگەیەنێ ئەگەر پیاوێك ژنێك بکوژێ پیاوەکە ناکوژرێتەوە، چونکە کوژراوەکە ئافرەتەو بکوژەکە پیاوە، یان ئەوە ناگەیەنێ کەپیاوی ئازاد لە تۆڵەی بەندەدا ناکوژرێتەوە، بەڵکوو ئەم جۆرە حوکمانە بەگوێرەی بەڵگەو بۆچوونی پێشەواکانی ئیسلام کە لە قورئان‌و حەدیث دەریان هێناوە دیاری دەکرێن.

بەگوێرەی مەزهەب‌و ڕێبازی ئیمامی شافیعی پیاو لەخوێنی ژندا دەکوژرێتەوە، ئەگەر زیاد لەپیاوێك گەلە کۆمەکیان لەپیاوێك کردو بەهەموانیان کوشتیان ئەوە هەموویان لەخوێنی ئەو تاقە کوژراوەدا دەکوژرێنەوە..

دوای ئەوەی کە باسی تۆڵە سەندنەوەی کرد ئەمجارە دێتەوە سەر باسی لێ خۆشبوون‌و خوێن لێ وەرگرتن، دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ﴾ ئەگەر بکوژێك بەخشرا، لەلایەن برای ئایینی خۆیەوە لەهەندێ لەخوێنەکە یان لەهەمووی لێی خۆشبوون، واتە: ئەگەر کوژراوەکە پێش گیان دەرچوونی — بکوژەکە ئازادبکا، یان یەکێك لەخزمی کوژراو بکوژی ئازاد کردبوو، لەبەشە خوێنەکەی خۆی خۆشبوو ئیتر بکوژ نابێ بکوژرێتەوە، بەڵکوو دەبێ بەپێی داب‌و نەریتی خۆیان خوێن بەست بکەن، کەسوکاری کوژراو خوێن وەربگرن‌و ڕێك بکەون، ئیتر ئەوکاتە ﴿فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ﴾ پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە عەفووەکە دەکا — کە خزمی کوژراوەکەیە — بەپیاوانەو بە نوصوڵ هەڵس‌و کەوت بکاو بەگوێرەی داب‌و نەریتی ئەو وڵاتە خوێن

وەربگرێ ﴿وَأَدَاء إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ﴾ لەسەر بکوژیش پێویستە بەرێكو پێكیو پیاوانە خوێنەکە بدا بەخاوەن خوێنو دوای نەخا، یان لێی کەم نەکاتەوە ﴿ذَلِكَ﴾ ئەو خۆشبوونو خوێن وەرگرتنە کە پەروەردگار رێی بۆ داناون ﴿تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ بار سووککردنو ئاسانکردنە لەلایەن خودای پەروەردگارتانەوە ﴿وَرَحْمَةٌ﴾ میهرەبانییە ﴿فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ جا هەرکەسێك دوای ئەم لێ خۆشبوونو خوێن وەرگرتنە پابەندی رێکەوتنەکە نەبوو، دەست درێژی کرد ئەوە سزای بەئێش دەدرێ!

واتە: ئەگەر دوای خوێن وەرگرتنەکە خزمێکی کوژراوەکە بکوژەکە بکوژێتەوە، ئەوە دەست درێژییەو ستەمی کردووە، دەبێ بکوژرێتەوە، لەرۆژی قیامەتیشا سزای سەخت دەدرێ.

یان ئەگەر خوێندەرەکە خوێنەکەی نەداو سەرپێچی کرد ئەوە لەلایەن خوداوە رۆژی قیامەت سزای توند دەدرێ..

لەم ئایەتە ئەوە وەردەگیرێ ئەگەر کوژراو (۱۰) دە خزمی هەبوون یەکێك لەم دە کەسە بکوژی لەکوشتنەوە ئازاد کرد پێویستە ئەوانی تر بەخوێن وەرگرتن رازی بن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ خودای میهرەبان ئازادکردنی بکوژی لەکوشتنەوە لا خۆشترە!

ئەمجار دوای ئەوەی باسی لێ خۆشبوون لەکوشتنەوەی کردو موسوڵمانانی هەڵنا بۆئەوەی پەیرەوی بکەن، هەڕەشەی لەوانە کرد کەدوای لێ خۆشبوونو خوێن وەرگرتن بکوژ دەکوژنەوە، یان بکوژ پەیمانی خۆی دەشکێنێو خوێنەکە بەپیاوانە ناداتە کەسوکاری کوژراو، ئەمجار دێتەسەر باسی حیکمەتی تۆڵە ستاندنەوەو کوشتنەوەی بکوژ بۆئەوەی حوکمەکە بەباشی بچێتە دڵی موسوڵمانانەوەو جێگیر ببێ دەفەرموێ: ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ﴾ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! لەپای کوشتنەوەی بکوژدا ژیانی ئاسوودەییو کامەرانیی بۆ ئێوە دێتە کایەوە، ماڵو گیانی دانیشتوان دەپارێزێ، کەس دەست درێژی ناکاتە سەر کەس! چونکە کەسێك بزانێ ئەگەر یەکێك بکوژێ، دەکوژرێتەوە، خۆ لەکوشتنی خەڵك دەپارێزێ، بەمەش گیانی خۆیو گیانی ئەو کەسەی کە دەیەوێ بیکوژێ پارێزراو دەبێ، ماڵ وەرگرتن لەبکوژ هەموو کەسێك

لەکوشتن ناگێڕێتەوە، تەنانەت هی وا هەیە ماڵو دارایيەکی زۆر سەرف دەکا بۆئـەوەی دوژمنەکـەی لەناوبـەرێ.. بەتایبـەتی کەسێك خـاوەنی مـاڵو دارایـی زۆر بـێ بەلایـەوە گرنگ نییە ناحەزانی خۆی بکوژێو خوێن بدا..

رەوان بێژو قسە زانانی عەرەب زۆر هـەوڵیان داوە بەچەند وشـەیەك مانـای ئـەم ئایەتـە بگەیـەنن‌و بتـوانن بەربـەرەکانی رەوان بێـژی قورئـانی پـێ بکـەن بـۆ نموونـە لەشوێنی ئەم ئایەتە ئەم رستەیەیان هێناوە (القتل أنفى للقتل) یان (قتل البعض أحياء للجميع) یان (اكثروا القتل ليقل القتل) بـەلام بـەڵێ وردبوونەوەیـەکی کـەم دەردەکـەوێ کە ئایەتەکە لەگەڵ کورت بڕییەکەیـدا چـەند مانـاو مەبەسـتی گرنگـی گەیانـدووە کـە قسە کارتۆنیەکەی ئەمان پەیان پێ نەبردووە، بۆ نموونە (القتل أنفى للقتل) مانایـەکی هەڵە دەبەخشێ، چونکە کوشتنی نـاڕەوا نابێتـە هـۆی لابردنـی کوشـتن. بـەڵکوو زیـادی دەکاو ئەو کوشتنەی کە کوشتن بنبڕدەکا کوشتنەوەی تۆڵەو (القصاص)ە...

﴿يَا أُولِيْ الأَلْبَابِ﴾ ئـەی هۆشمەنـدان‌و خـاوەن بـیرو فـام‌و تێگەیـشتووەکان! ئێـوە بیربکەنـەوە بـزانن (قیـصاص) تۆڵـە چـەند بەرژەوەنـدی تێدایـە، چەند یاسایەکی پـڕ حیکمەت‌و تەواوە ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ بەڵکوو ئێوە شوێن ئەم یاسایە بکەون، دەست درێژی نەکەنـە سـەر خـەڵك‌و واز لـە کوشـتن‌و بـڕین بێـنن، چـونکە کەسێك عـاقڵ بـێ خـۆ لەکوشتنی خەڵك‌و کوشتنی خۆی دەپارێزێ.

## راسپێری‌و وەسێتکردن

﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ فَمَنْ بَدَّلَهُ بَعْدَ مَا سَمِعَهُ فَإِنَّمَا إِثْمُهُ عَلَى الَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُ إِنَّ اللَّهَ

سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٨١﴾ فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨٢﴾ ﴾.

لەم ئایەتانەی پێشوودا باسی تۆڵەستاندنەوەی کوشتن کرا، کە خۆی جۆرێکە لە جۆرەکانی مردن، کەوابوو گونجاوە کە دوا بە دوای ئەوە باسی شتێك بکرێ کە پەیوەندی بە مردنەوە هەبێ، ئەویش وەسیەتکردنی کەسێکە کە بزانێ مردنی نزیك بۆتەوە وەسییەت بکا بۆ دوا خۆی بەم جۆرە کە بڕێ لە ماڵو دارایی خۆی تەرخان بکا بۆ هەندێ لە میراتگران، یان بۆ داموو دەزگایەکی تایبەتی، یان بۆ چەند کەسێکی تایبەتی، فەرمووی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾ نووسراوەو پێویست کراوە لەسەر ئێوە ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! هەرکاتێك مردنتان نزیك بووەوە نیشانەکانی مردنتان تێدا دەرکەوت تووشی نەخۆشی سامناكو کوشندە بوونو ماڵو داراییەکی زۆرتان بەجێ دەهێشت پێویستە کەمێك لەو ماڵو داراییە - بە وەسییەتنامە تەرخان بکەن بۆ باوكو دایکتان بۆ خزمو کەس‌وکارتان بۆ ئەوانەی کە دەزانن پێویستیان بە زێدە یارمەتی هەیە، بەمەرجێك ئەوەی بە وەسییەت تەرخانی دەکەن ئەندازەیەکی مامناوەندیی نە بە زۆر حسێب بکرێ نە بە کەم، ئەو ئەندازەیەی کە بە وەسییەتنامە تەرخانی دەکا نابێ لە سێیەکی ماڵ تێپەڕبێ...

بڕێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ڕایان وایە کە وەسییەتکردن بۆ میراتگر نابێ، کەسێك وەسییەتی بۆ دەکرێ کە میرات لە مردووەکە نەگرێ بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ: « إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ فَلاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ » دڵنیابن پەروەردگار بە هەموو خاوەن مافێ مافی خۆی داوەتێ، ئاگاداربنو بزانن کە میراتگر وەسییەتی بۆ ناکرێ، بەڵام بڕێ لە زانایانی ئیسلام - دیارە بەڵگەو دەلیلیشیان هەیە - ڕێگایان داوە کە وەسییەت بۆ میراتگر بکرێ؛ بەم

جۆرە برێ لە میراتگران نەداربن برێکیان دەوڵەمەند بن، یان هەندی لە میراتگران کەم ئەندام بن یان دەستو پی سپی بن، ئەوە ئەو کاتە بەرژەوەندی خێرو چاکە وا دەخوازێ کە یەکسانی لە نێوان هەژارو دەوڵەمەندا نەکرێ، ئەوەی کە پێویستی پێی هەیە زیاد لە بەشە میرات بەهۆی وەسییەت بۆ کردنەوە شتێکی تری بدرێتێ ﴿حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾ ئەم وەسێتکردنە ئەم فەرمانە بە پێویست لەسەر ئێوە دانراوە ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان، ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بە کتێبی من هەیە. ﴿فَمَن بَدَّلَهُ بَعْدَمَا سَمِعَهُ فَإِنَّمَا إِثْمُهُ عَلَى الَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُ﴾ هەرکەسێك - شاهید بێ یا سەرپەرشتیکار بێ - دوای ئەوەی ئاگای لە وەسییەتنامەکە بێو گۆڕانکاری تێدا بکا ئەوە گوناهەکەی لە ئەستۆی ئەو کەسەدایە کە گۆڕانکاری تێدا دەکا، کابرای وەسییەتکەر لای خوا خێری خۆی بۆ دەنووسرێ..

گۆڕانکاری لە وەسییەتدا بەم جۆرە ئینکاری بکا یان دان بە وەسییەتەکەدا نەنێ، یان کەمو زۆری تێدا بکا ﴿إِنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ دڵنیابن کە خودا قسەو دەمەقاڵێی هەڵگێڕەرەوەکانو سەرپەرشتیکاران (الموصين) دەبیستێ ئاگادارو زانایە بە مەبەستەکانیانو بەو پێیە سزایان لێ دەستێنێ!!

بەراستی ئەمە هەڕەشەیەکی توندو سامناکە بۆ ئەو کەسانەی کە گۆڕانکاری لە وەسییەتنامەکە دەکەن، وەکوو خۆی بە گوێرەی پێویست ئەنجامی نادەن؛؛

وەسییەتکردن بە ڕای برێ لە زانایانی سەلەفی صالح پێویستەو جەختی لەسەر کراوە، بەڵگەشیان ئەم ئایەتەیەو حەدیسێکی پێغەمبەریشە کە دەفەرموێ: «مَا حَقُّ امْرِءٍ مُسْلِمٍ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ وَلَهُ شَيْءٌ يريد أَنْ يُوصِي بِهِ إِلاَّ وَصِيَّتُهُ عِنْدَ رَأْسِهِ» ڕەوا نیە بۆ موسوڵمان دوو شەوی بەسەردا بڕواو شتێکی لابێ پێویست بێ وەسێتی پێ بکا نەیکا؛ پێویستە وەسێتنامەکەی بە نووسراوی لە ژوور سەریەوە بێ..

بەڵام بە ڕای زۆربەی زانایانی ئیسلام وەسییەتکردن سوونەتە نەك واجبو پێویست. ﴿فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ ئەگەر وا

ڕێکەوت کابرای وەسێتکەر لە وەسیەتەکەیدا زیادەڕەوی کردبوو – بە هەڵە یان بە ئەنقەست – لە یاسای وەسێتکردن لای دا، دوایی وەسییەت بۆ کراوەکان کێشەیان تێکەوت، یان لەگەڵ میراتگرەکاندا کەوتنە کێشەوە، خێر خوایەك ئاگای لە چۆنیەتی وەسییەتکردنەکە بوو ئەمجار هات گۆڕانکاری تێدا کردو بە گوێرەی شەرع ڕێکی خستەوە ئەوە گوناهی گۆڕانکاریەکەی ناگاتێ‌چونکە ئەو شتی خوار ڕاست دەکاتەوەو خراپ باش دەکا ﴿إِنَّ اللَّـهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان خودا لێخۆشبووەو ئەو جۆرە گۆڕانکارییە بە تاوان دانانێ‌و پاداشی دەداتەوەو میهرەبانە.

## ڕۆژوو فەرزو پێویستە

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۚ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ ۚ وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٤﴾ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ

مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾ ﴾.

پەروەردگار ڕۆژوی لەسەر ئێمە واجب کردووە، هەروەکو چۆن لەسەر نەتەوەکانی پێش ئێمەی واجب کردووە، چونکە ڕۆژو گەورەترین و کاریگەرترین هۆکارە بۆ پاڵفتەکردنی دەروون، بەهێزترین عیبادەتێکە بۆ جڵەوگرتنەوەی شەهوەت و ئارەزوو، لەبەر ئەوە لەناو هەموو گەل و نەتەوەیەکدا ڕۆژوو باو بووە، تەنانەت لای بتپەرستەکانیش ڕۆژوو هەبووە، ئەوەتا یۆنانیەکان و ڕۆمانەکان، هیندیە بتپەرستەکانیش تا ئەمڕۆ ڕۆژو دەگرن، تەوراتیش ئەوەی تێدا نیە کە ڕۆژوو فەرز بێ، بەڵکوو هەر ئەوەندەی تێدایە کە ڕۆژوو شتێکی باشە، ئەوەش چەسپاوە کە حەزرەتی مووسا چل ڕۆژ بەڕۆژوو بووە، لە (ئینجیل)یشدا ئەوەی تێدا نیە کە ڕۆژوو فەرزبێ، بەس ئەوەی تێدایە کە ڕۆژو عیبادەتە، مەدحی ڕۆژووەوانانی تێدایە، بەناوبانگترین ڕۆژووی گاورەکان و کۆنترینیان ڕۆژووی جەژنی (فوصحە)یە ئەو ڕۆژووەی کە مووسا گرتوویەتی و دوایی عیساو حەواریەکانیش گرتوویانە، دوایی لێپرسراوانی کەنیشتە چەند جۆرە ڕۆژووی جیا جیایان داهێناوە.. لە ئایینی ئیسلامدا ڕۆژوو گرنگییەکی زۆری پێدراوە، یەکێکە لەپایەکانی ئایین و بەشێکە لەبنەما سەرەکییەکانی ئیسلام و دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هەیە و موسوڵمان بوون ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ﴾ ڕۆژوو لەسەر ئێوە نووسراوە و فەرزکراوە و ئەرکی سەرشانتانە جێبەجێی بکەن ﴿كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ وەکوو چۆن

لەسەر گەلو نەتەوە پێشینەکان نووسراوەو فەرزبوو، کەوابوو رۆژوو عیبادەتێکی گشتییەو ئەرکی سەرشانی هەموو کەسە، بەمەش دڵ ئارامییەك بۆ رۆژووەوانان پەیدا دەبێ، چونکە هەرچەندە رۆژوو ئەرکێکی قورسەو عیبادەتێکی فرە گرانە، بەلاّم لەبەرئەوەی لەسەر گەلو نەتەوەکانی پێشووش واجب بووە، مرۆڤ هەست بەسووکی قورساییەکەی دەکاو لەسەر شانی گران نییە...

ئەمجار حیکمەتو سوودی رۆژوو بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ واتە رۆژووی لەسەر ئێوە فەرز کردووە بۆئەوەی ئێوە خۆتان قاڵ بکەن بۆ خودا پەرستی، ورە بدەنە خۆتان، تەنانەت لەچەند کاتێکی دیاریکراودا واز لە شەهوەتو هەواو هەوەسی رەوای خۆشتان بێنن، پابەندی فەرمانەکانی خودابن هومێدی پاداشی باشتان پێی هەبێ، خۆتان بەورە بەرزیو خۆگری رام بێنن!

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «الصِّيَامُ نِصْفُ الصَّبْرِ» رۆژوو نیوەی صەبرو خۆگرییە.. کەوابوو رۆژوو کە فەرزکراوە بۆ سوودو قازانجی ئێمەیە، سوودی ماددیو مەعنەوی لێ دەکەین، رۆڵی رۆژوو لەئامادەکردنی ئادەمیزادا بۆ تەقواو خودا پەرستی لەچەند روویەکەوە هەستی پێدەکرێ.

١- ئادەمیزاد والێدەکا بەنهێنیو بەئاشکرا لە پەروەردگاری خۆی بترسێ چونکە رۆژووەوان کەس چاودێری نییە بۆخۆی چاودێری خۆیەتی. جا کە ئادەمیزاد خۆی لەخواردنو خواردنەوەی خۆش دەگرێتەوەو زمانی لە غەیبەتو بوختان دەپارێزێ، خۆی لەخێزانی حەلاّلی خۆی دوور دەخاتەوە لەبەر خاتری خوداو رەزامەندی ئەو، مانگێکی سەرلەبەر بەم شێوە هەڵسو کەوتی دەبێ، ئەگەر لەبەر خاتری خودا نەبوایە خۆی نەدەگرتو ئەو نازو نیعمەتەی لەخۆی قەدەغە نەدەکرد، جا بەدووبارە بوونەوەو سێ بارە بوونەوەی ئەو حاڵەتە مەلەکەیەکی نەفسی بۆ پەیدادەبێو شەرم لەخودا دەکاو هەست بەپابەندبوونی خۆی بەرامبەر فەرمانو نەهییەکانی دەکا، کەسێکیش ئەم رەوشتانەی لا پەروەردەبێ موسوڵمانێکی راستاڵی لێ پەیدادەبێو لایەنی

فـرتو فـێڵو غەشـی تێـدا نامێنـێ‌و مـاڵی خـەڵك نـاخوا زەكـات مـەنع ناكـا، تـاوانی لێ ڕوونادەن.

بۆیە پێغەمبەر دەفـەرموێ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَـهُ مَـا تَقَـدَّمَ مِـنْ ذَنْبِهِ» كەسێك ڕەمەزان بـەڕۆژوو بێـت بڕواداربـێ دوایـی داوای پاداشـی ڕۆژووەكـەی بكـا پـەروەردگار لـەتاوانی بچووكی خـۆش دەبـێ‌و ئەگـەر تۆبـە بكـا، لـە گونـاهی گەورەشـی خۆشدەبێ...

لە حەدیثی قودسیدا دەفـەرموێ: «كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ ، إِلاَّ الصَّوْمَ فَإِنَّهُ لِـي ، وَأَنَـا أَجْـزِي بِـهِ» هـەموو كردەوەیـەكی ئـادەمیزاد بـۆ خۆیـەتی‌و بەئەنـدازەی كردەوەكـەی پاداشـتی دەدرێتـەوە، جگـە لـەڕۆژوو ئـەوە بـۆ منـەو خـۆم دەزانم چـەندی پـاداش دەدەمەوە.

٢- ڕۆژوو شەهوەت‌و ئارەزووی ئادەمیزاد دەشكێنێ‌و نەفسی سەركەشی جڵەوكێش دەكا. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «يَا مَعْشَرَ الـشَّبَابِ مَـنِ اسْـتَطَاعَ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ ، فَإِنَّهُ لَـهُ وِجَـاءٌ» ئـەی كۆمـەڵی لاوان! هەركەسـێ لـەئێوە دەسـەڵاتی ژنهێنـانی هەیـە بـازوو ژن مارەبكا، چونكە ژنهێنـان دەتپـارێزێ لەتاوانی سـەیركردنی ئافرەتی بێگانـەو لـەداوێن پیسی، كەسـێكیش دەسـەڵاتی ژنهێنـانی نییـە ئـەوە بـا بـەڕۆژوو بـێ چـونكە ڕۆژوو شەهوەت‌و ئارەزوو كەمدەكاتەوە.

٣- ڕۆژوو ئـادەمیزاد لەسـەر دڵ نـەرمی‌و بـەزەیی هاتنـەوە بەخەڵكدا ڕام دێنـێ‌و خێرو بەخششی ماڵ‌و دارایـی لـەلا شـیرین دەكا، ئەوكاتـەی برسـیی دەبـێ هەسـت دەكا بەئێش‌و ئازاری هەژارو بێ نەوایان‌و بەزەیی پێیاندا دێتەوە.

٤- یەكسانی لەنێوان پاشاو گەدادا، لـەنێوان دەوڵەمەنـدو هـەژاردا بـۆ ئەنجامـدانی واجبێكی ئایینی.

٥- ڕاهێنانی موسوڵمانان لەسەر یاسای نانخواردن لەكاتی دیاریكراودا.

٦- رۆژوو هۆکارێکی گرنگە بۆ تواندنەوەی ئەو بەزو چەورایییەی کەلەناو ورگی ئینساندا کۆدەبێتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی کە هەمیشە خواردەمەنی خۆش‌و چەوریان هەیە، کارو کاسبی واناکەن کەزۆر پێویستی بەجوولەو هات‌وچۆ هەبێ.. رۆژوو هۆکارێکی گرنگە بۆ وشك کردنەوەی تەڕایی زیانبەخش لەناو سکدا، ریخۆڵە لەو ماددە ژەهراوییانە پاك دەکاتەوە کەبەهۆی ورگنییەوە پەیدادەبن، ئەو بەزو کۆلسترۆڵەی کە خەتەرن لەسەر دڵ قەلاچۆیان دەکا، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (صُومُوا تَصِحُّوا) بەڕۆژووبن لەش ساغ دەبن.

بڕێ لە زانایانی ئەوروپا دەڵێن: بەڕۆژوو بوونی مانگێك دەبێتە هۆی قەلاچۆکردنی خڵتەو پڵتەی نامۆ، لەناو لەشی مرۆڤ بۆماوەی ساڵێك!! دەی کوا لای زۆربەی موسوڵمانانی ئەمڕۆ ئەم کاریگەریانەی هەن! کوا ئەو خۆگری‌و لەسەرخۆیەی خۆی دەگەیەنێ! زۆربەی رۆژووەوان لە رەمەزاندا خەریکی شەڕو هەراو غەیبەت‌و ناخۆشین، هەرئەوەندە هەیە خۆیان لەخواردن‌و خواردنەوە مەنع کردووە، هیچ گیانێکی رۆژوانەتییان تێدا نییە، ئەو مانایانەی رۆژووی بۆی دانراوە ئەوان هیچیان پەیڕەو ناکەن، تا بۆیان بکرێ بەربانگ‌و پارشێوان خواردەمەنی خۆش‌و بەلەزەت ئامادە دەکەن! تا دەتوانن ورگی خۆیان دەئاخنن‌و زۆربەی کاتیش بەدانیشتن‌و نوستن بەسەردەبەن.. ئەو تاوەی بەئاگایشن بەشتی پڕوپووچ کات بەسەر دەبەن کەی ئەوە پێی دەڵێن رەمەزان؟ دەبینی خەڵك بەهەموو شێوەیەك خۆ ئامادە دەکا بۆ خواردن‌و خواردنەوە، هەروەها دەڵێی رەمەزان کاتی خواردن‌و خواردنەوەیانە خۆبرسیی کردنی رۆژیان بۆ مەبەستی زۆر خواردنی شەویانە! بەڕاستی ئەوە کارێکی سەیرو سەمەرەیە ئەو هەموو زیادە رەوییەی رۆژوەوان لەخواردندا دەیکا هیچ لەگەڵ حیکمەتی فەرزکردنی رۆژوودا ناگونجێ ﴿أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ﴾ رۆژانی رەمەزان کە فەرزکراوە تێیاندا بەڕۆژوو بن، چەند رۆژێکی دیاری کراون، ژمارەیان دەزاندرێ، پەروەردگار بەڕەحم‌و بەزەیی خۆی هەموو رۆژەکانی ساڵ، یان زۆربەی رۆژەکانی لەسەر واجب نەکردووین بۆئەوەی بتوانین فەرمانەکەی جێبەجێ بکەین.

﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ ئەگەر یەکێك لەئێوە لەمانگی رەمەزاندا نەخۆش بوو، یان لەسەفەردا بوو، نەیتوانی بەڕۆژوو بێ‌و رۆژووی شکاند، ئەوە پێویستە دوای چاکبوونەوەو گەڕانەوە بۆ ماڵەوە بەئەندازەی رۆژووە خوراوەکان رۆژوو بگرێتەوە، نەخۆشی‌و سەفەر دەبن بەعوزرو بۆئەوەی موسوڵمان تێیاندا بەڕۆژوو نەبێ، چونکە هەردووکیان بارگرانی رۆژوو گرتنیان تێدا چاوەڕوان دەکرێ! زۆربەی زانایان دەڵێن: کاتێك نەخۆشی دەبێتە عوزری رۆژوو شکاندن، کە نەخۆشییەکە بەجۆرێك بێ رۆژوو گرتن لەگەڵیدا زەحمەت بێ.. چونکە خودا لەمبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾ کۆمەڵێکی تر لەزانایان لەوانە ئیمامی عطاو ئیبنو سیرین‌و بوخاری دەفەرموون: هەموو نەخۆشییەك دەبێتە عوزر بۆ رۆژوو شکاندن، چونکە زۆر نەخۆشی هەیە رۆژووەوان پێی سەخڵەت نابێ بەڵام دەگونجێ رۆژووەکە زیان بەنەخۆشەکە بگەیەنێ‌و هەستی پێ نەکا، یان ببێتە هۆی ئەوە کە درەنگ چاك بێتەوە، مەگەر پزیشکێکی شارەزاو ئەمین رێگای بەڕۆژوو بوونی بۆبدا..

ئەو سەفەرەی کەڕۆژوو شکاندنی تێدا دروستە، دەبێ سەفەرێك بێ کورت کردنەوەی نوێژی تێدا دروست بێ، ئیمامی ئەحمەدو موسلیم‌و ئەبو داوود لە ئەنەسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) (هەرکاتێ سەفەرێکی بکردایە سێ میل دوور بووایە یان سێ فرسەخ بوایە، نوێژی کورت دەکردەوە)، تەنانەت ئەگەر ئەو مەودایە بەچەند دەقیقەیەکیش ببڕێ، هەر دەبێتە عوزری رۆژوو شکاندن، چونکە مەرج بڕینی مەوداکەیە نەك چەندێتی کاتەکە.

جا کەسێك بەنەخۆشی یان لەسەفەردا مانگی رەمەزان بەڕۆژوو بوو، ئەوە واجبەکەی لەکۆڵ دەکەوێ، ئەگەر شکاندیشی دەبێ دوایی بیگرێتەوە. پێغەمبەرو هاوەڵانی بەم شێوەیان کردووە، لە حەدیثی صەحیحدا هاتووە کە هاوەڵانی لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) لە رەمەزاندا سەفەریان دەکرد هەیانبوو بەڕۆژوو دەبوو، هەیان بوو دەیشکاند، کەسیان رەخنەی لەوی تریان نەدەگرت،

هەرکاتێکیش رۆژووەوانەکان تێنیان بۆ بهاتایە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی پێ دەکردن هەموویان بیشکێنن، ئیمامی ئەحمەدو ئیمامی موسلیم لە ئەبو سەعیدەوە دەگێڕنەوە دەڵێن: (سَافَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى مَكَّةَ وَنَحْنُ صِيَامٌ فَنَزَلْنَا مَنْزِلاً فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): «إِنَّكُمْ قَدْ دَنَوْتُمْ مِنْ عَدُوِّكُمْ وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ» لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) سەفەرمان کرد بۆ مەککەو بەرۆژوو بووین، گەیشتینە شوێنێك پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئێوە لە دوژمنتان نزیك بوونەوە ئەگەر رۆژووەکانتان بشکێنن باشترە، چونکە هێزو تواناتان زیاددەکا). ئەمە بوو بە روخسەت بۆ ئێمە هەمانبوو نەیشکاندوو هەر بەرۆژوو بوو، هەشمان بوو شکاندی، دوای ماوەیەکی تر رۆیشتین‌و گەیشتینە قۆناغێکی تر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّكُمْ مُصَبِّحُو عَدُوِّكُمْ وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ » ئێوە لەدوژمن نزیکن بەیانی زوو هێرش دەکەنە سەر دوژمن، بەرۆژوو نەبوونتان باشترە، چونکە هێزو تواناتان زیاتر دەبێ، ئەمەش بوو بە (عزیمە) بۆمان‌و هەموومان شکاندمان..

لە حەزرەتی عائیشەوە دەگێڕنەوە: کە حەمزەی ئەسلەمی کەزۆر رۆژووی دەگرت – عەرزی پێغەمبەری کرد، وتی: قوربان! ئەرێ لەسەفەردا رۆژوو بگرم؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە وەڵامدا فەرمووی: کەیفی خۆتە، حەزت لێبوو بەرۆژووبە، حەزت لێبوو بیشکێنە، ئیمامی موسلیم ئاوای گێڕاوەتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەوەڵامدا فەرمووی: رۆژوو شکاندن لەسەفەردا روخسەتێکی خوداییە، کەسێك پابەندی بێ باشە، کەسێکیش بیەوێ بەرۆژوو بێ گوناهی ناگاتێ.

زۆربەی پێشەوایانی ئیسلام وەکوو ئیمامی مالیك‌و ئەبو حەنیفەو شافیعی لەسەر ئەوەن کە کەسێك بەتوانابێ‌و زیانی پێ نەگا رۆژوو گرتنەکە باشترە لەشکاندنی، ئیمامی ئەوزاعی‌و ئیمامی ئەحمەد پێیان وایە شکاندنەکەی باشترە لەگرتنی، چونکە خودا روخسەتی پێداوین بۆیە پێی داوین کەکاری پێ بکەین.

﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾ پێویستە لەسەر ئەوانەی کە ڕۆژوو گرتن تینیان بۆ دێنیّو زۆر بە زەحمەتە لەسەریان فیدیە بدەن. ئەوانەی کە ڕۆژوویان بەزەحمەت بۆ بگیرێ وەکوو پیرو لاوازو لەرزۆك، ئەوانەی کە ئومێدی چاکبوونەوەیان نییە...

هەروەها ئەوانەی کە ژیانیان لەسەر کارکردنی کاری قورس بەندە وەکوو کرێکارانی کانە خەڵوزو ئاسن توانەوەو ئەو کارگانەی کە ئیش کردن تیایاندا گرانەو پێویستی بە خەرجدانی هێزو توانای زۆر هەیە. یان ئەو تاوانبارانەی لە بەندیخانەدا لەگەڵ بەندکردنەکەیاندا ئیشو کاری قورسیشیان دەخرێتە ئەستۆ، هەروەها ئافرەتی دووگیانو ئافرەتی شیردەر ئەگەر ترسی منداڵەکانیان هەبوو کە زیانیان پێ بگا. ئەمانە هەموویان دەتوانن لە ڕەمەزاندا بەڕۆژوو نەبنو فیدیە بدەنو دوایی ڕۆژووەکە بگرنەوە. [1] فیدیەش بریتییە لە تێرکردنی هەژارێك لە خواردنێکی مام ناوەندی کە خۆیو خێزانی دەیخۆن، بۆ هەر ڕۆژەی نان خواردنێك، بەکورتی موسوڵمانان لە حوکمی ڕۆژوو گرتندا سێ جۆرن.

١- موسوڵمانێك لەش ساغ بێو لەماڵ بێو بتوانێ بێ زەحمەت کێشانی زۆر بەڕۆژوو بێ ئەم جۆرەیان پێویستە بەڕۆژووبن ئەگەر نەیگرن تاوانی گەورە دەکەن.

٢- نەخۆشو سەفەریی دەتوانن بەڕۆژوو نەبن دوایی بیگرنەوە، ئەگەر دڵنیابوون کە ڕۆژوو گرتن زیانیان پێ دەگەیەنێ ئەوە پێویستە بیشکێنن.

٣- کەسێك ڕۆژوو گرتنی بۆ زەحمەت بێ، ئەگەر بیگرێ زۆر ناڕەحەت بێ؛ وەکوو پیرو لاواز لەرزۆكو نەخۆشی درێژخایەنی وا کە ئومێدی چاکبوونەوەی لێ نەکرێ، ئەمانە هەموویان دەتوانن بیشکێنن بۆ هەر ڕۆژێك خواردنێکی مامناوەندی بۆ

[1]- ئافرەتی دووگیانو ژنی مناڵ بەبەرو شیردەر ئەگەر لەترسی گیانی خۆیان یان لەترسی نەخۆش کەوتنیان ڕۆژوویان نەگرت پێویستە قەزای ڕۆژووەکەی بکەنەوەو فیدیەیان لەسەر نییە. دەق وەك نەخۆش وان. بەڵام ئەگەر لەترسی منداڵەکەیان ڕۆژوویان نەگرت؛ ترسا سکەکەی لەباربچێ یان شیرەکەی کەمبکا ئەوە گێڕانەوەو فیدیەیان لەسەرە.

هەژارێك دابین بكەن، ﴿فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ﴾ كەسێك لە فیدیەكە زیاتر بدا ئەوە باشترەو پاداشی چاكەكەی بۆ خۆی دەگەڕێتەوە.

ئەم زیادكردنە بۆ هەرسێك جۆرەكانی دەبێ، بەم جۆرە نانی زیاد لە هەژارێك بدەی یان هەژارەكە لەجیاتی ژەمێك دوو ژەم یان زیاتری بدەیتێ، یان فیدیەش بداو ڕۆژووەكەش بگرێ، ﴿وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەگەر ڕۆژووەكان بگرن لەفیدیەدان باشترە، چونكە ڕۆژوو وەرزشی لەشو لارو پراوەكردنی نەفسە، ئەبو ئومامە دەڵێ: عەرزی پێغەمبەرم كرد وتم: قوربان شتێكم پێ بفەرموو بەگوێت بكەم، فەرمووی: «عَلَيْكَ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لاَ مِثْلَ لَهُ» ئاگاداری ڕۆژووبەو ڕۆژوو بگرە هیچ شتێكی ناگاتێ ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە بزانن خێرو بێری ڕۆژوو چەند زۆرەو چەند لەبەرژەوەندی ڕۆژووەوانەكانە.. هەرگیز فەرامۆشی ناكەنو وەكوو پێویست ئەنجامی دەدەن.

ئەمجار دێتە سەر باسی ئەوە كە ئەندازەی ڕۆژە دیاریكراو ژمێردراوەكان كە پێویستە تێیاندا بەڕۆژووبین بۆمان سنووردار بكا دەفەرموێ: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ﴾ ئەو ڕۆژە ژمێردراوو دیاریكراوانەی ڕۆژوویان تێدا فەرزكراوەو پێویستە موسوڵمانان تێیاندا بەڕۆژوو بن مانگی ڕەمەزانە، ئەو مانگەی كە سەرەتای قورئانی تێدا هاتۆتە خوارێ، بۆئەوەی ڕێنومایی خەڵك بكا بۆ ڕێگای ڕاستو دروستی خوداو بیانخاتە سەر بەرنامەیەكی حەق، بۆیە ئەركی سەرشانی موسوڵمانانە كە لەیادو بیرەوەری ئەو ڕەحمەتەی یەزداندا هەموو ساڵێ لەم مانگەدا زیاتر چاكی خوداپەرستی لێ هەڵبكەنو بیكەنە مەوسیمی عیبادەت كردنو خوداپەرستی بەڕۆژ بەڕۆژووبنو بەشەو خەریكی نوێژی تەراویحو قورئانخوێندنو شەونوێژبن ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ هەركەسێ لەئێوە لەماڵ بوو، بینینی مانگی یەك شەوەی ڕەمەزانی لەلا چەسپاو خۆی بینی، یان خەڵكانی تر بینیانو ئەم بڕوای پێ كردن — ئەوە دەبی بەڕۆژوو بێ، لەم بارەوە حەدیثی پێغەمبەر (درووەی خودای لەسە بێ) زۆرو زەبەندەنو هەر لە سەردەمی سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە تا

ئەمڕۆ کاریان پێ کراوە. ئەو وڵاتانەی کە ناکرێ مانگی تێدا ببیندرێ وەکوو وڵاتە قوطبیەکان کە شەش مانگ هەر شەوە لەقوطبی شیمالو شەش مانگ هەر ڕۆژە لەقوطبی جنوبیو وە بەپێچەوانەشەوە.

دانیشتووی ئەم وڵاتانە دەبێ بۆخۆیان ئەندازەی مانگی ڕەمەزان مەزندە بکەن، مەزندەنکردنەکەشیان بەگوێرەی وڵاتە مامناوەندییەکان بێ، ئەو وڵاتانەی تەشریعی ئیسلامی تێدا هاتووەتە خوارێ، وەکوو مەککەو مەدینە. واتە: دەبێ بەگوێرەی ڕەمەزانی مەککە، یان مەدینە ڕۆژوو بگرنو بیشکێنن...

ئێستاش بەهۆی ئامێری پەیوەندییەوە وەکوو ئێستگەو تەلەفزیۆنو تەلەفونو تەلەکس...هتد. زانینی سەرەتای ڕەمەزانو کاتی پارشێوو ڕۆژوو شکاندن ئاسان بووە. بڕێ لەزانایانی ئیسلام دەڵێن: دانیشتوانی ئەو وڵاتە قوطبیانە ڕەمەزانەکەیان بەگوێرەی نزیکترین وڵاتی مامناوەندی لێیانەوە مەزندە دەکەن. ﴿وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ هەرکەسێ لەئێوە لەمانگی ڕەمەزاندا نەخۆش کەوت یان لەسەفەردا بوو دەتوانێ بەرۆژوو نەبێو دوایی کە لەنەخۆشییەکەی چاك بووەوە یان لە سەفەرەکەی گەڕایەوە لەجیاتی ئەم ڕۆژووە خوراوانە لەمانگەکانی تردا بەئەندازەی ئەو ڕۆژانە ڕۆژوو بگرێتەوە ﴿يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ﴾ پەروەردگار دەیەوێ ئیش بۆ ئێوە ئاسان بکات ڕۆژوو گرتنو خوداپەرستیتان لەسەر سووك بکات.

﴿وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾ نایەوێ شتتان لەسەر گران بکا ئەمەیش یاسایەکی سەرەکیو بنەڕەتییە لەئایینی ئیسلامدا هەمیشە ئاسانخوازە، نایەوێ شت قورس بکات، هەمیشە دەیەوێ ئەندامەکانی بەمۆرکی ئاسانکارییو لێبوردویی دروشمدار بکات، هەستی ئەوەشیان تێدا دروست بکا کەچاوەڕوانی ڕەحمەتی خودا بن ﴿وَلِتُكْمِلُواْ الْعِدَّةَ﴾ بۆیە ڕێگە دراوە بەوانەی نەخۆشن یان لەسەفەردان کە دوایی ڕۆژووەکانیان بگرنەوە بۆ ئەوەی ژمارەی ڕۆژەکان تەواو بکەن، کەوابوو ئەرکی سەرشانی موسوڵمانانە کە لەپای ئەم جۆرە ڕۆژوو گرتنەدا سوپاسی خودا بکەنو خودا بەگەورە ناوبەرن

﴿وَلِتُكَبِّرُواْ اللّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ ئەمە ئەوپەڕی جێبەجێ کردنی فەرمانی خودایە کە موسوڵمان هەست بکا بەنرخی ڕێنومایی خوداو یارمەتیدانی بۆ گەیشتن بەمرازی خۆی، ئەمجارە لەپای ئەم ڕێنوماییەدا (الله اکبر) بکەن‌و خودا بەگەورە بزانن، لەسەر ئەوەی ڕێنومایی کردوون بۆ بەڕۆژوو بوون‌و یارمەتیداون بۆ ئەنجامدانی، هەر بۆیەشە شەوو ڕۆژی جەژن موسوڵمانان (الله اکبر) بکەن.

## بڕێ حوکم‌و یاسای ڕۆژوو

﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ اللّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُواْ مَا كَتَبَ اللّهُ لَكُمْ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّليْلِ وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ تِلْكَ

﴿حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾﴾.

له ئایەتی پێشوودا پەروەردگار فەرمانی بە بەندەکانی کرد بە سوپاس کردن، ئەمجار پێش ئەوەی بچێتە سەر باسی ئەحکامی ئەوشتانەی لە رۆژووەوان قەدەغەیەو ئەوەی رێگای پێدراوە، ئاوڕدانەوەیەکی خۆش‌و مژدەیەکی پیرۆز بە بەندەکانی رادەگەیەنێ‌و دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾ ئەی پێغەمبەر هەرکاتێ دەربارەی من، بەندەکانم پرسیارت لێ بکەن تۆ پێیان رابگەیەنەو بۆیان روون بکەرەوە: کە پێویستە لە هەموو طاعەت‌و خوداپەرستییەکدا ئیخلاص‌و دڵسۆزییان هەبێ، رووی نزاو پاڕانەوە با بە تەنیا ئاراستەی من بکەن، کەس نەکەن بە هاوبەش‌و بەرامبەرم، پێیان رابگەیەنە کە من لێیانەوە نزیکم، لە نێوان من‌و ئەواندا پەردە نیە، هیچ پیاو چاک‌و شەفاعەتکارێك پێویست نیە دوعاو نزاکانیان بە من بگەیەنێ، من بۆخۆم ئاگام لە هەموو کردارێکیان هەیە، هەموو دوعاو نزاو پاڕانەوەو سرتەو ورتەی لێویان دەبیسم، کەس رایەی ناکەوێ جگە لە خۆم وەڵامیان بداتەوە، یان پاداشیان بۆ دیاریی بکا، من بۆخۆم وەڵامی بانگ‌و نزای ئەوانە دەدەمەوە کە هاوارم لێ دەکەن‌و لێم دەپاڕێنەوە بەبێ ئەوەی پێویستم بە ناوەندێك هەبێ، من بەندەی خۆم دروست کردووەو دەزانم چی لە دڵدایەو شایانی چ پاداش‌و بەخششێکە.

دەڵێن: هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوەبووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) گوێی لێ بوو موسوڵمانان لە غەزای خەیبەردا بەدەنگی بەرز لە خودا دەپاڕانەوە ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «يَاأَيُّهَا النَّاسُ أَرْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِباً إِنَّكُمْ تَدْعُونَ سَمِيعاً قَرِيباً وهو معكم» ئەی خەڵکینە! تۆزێك بەخۆتاندا وەرنەوە، ئەوەندە دەنگ بەرز مەکەنەوە، خۆ ئێوە بانگ لە کەڕ ناکەن، بانگ لە کەسێکی دوورو بێئاگا لە ئێوە ناکەن، ئێوە لە خودایەك

دەپاڕێنەوە گوێی لێتانەو هەمیشە لەگەڵتاندایە، لەمەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە لە کاتی پاڕانەوەو نزا کردندا لە کاتی نوێژ کردن‌و طەواف کردندا پێویست ناکا زیاد لەو ئەندازەیەی شەرع داینـاوە دەنـگ بـەرز بکەینـەوە، واتـە: دەبـێ ئەوەنـدە دەنـگ بـەرز بکەینەوە کە ئەوەی لە نزیکمانە گوێی لێ بێ، هـەر کەسـێکیش بـە ئەنقەسـت زیـاد لـە پێویست دەنگ بەرز بکاتەوە ئەوە سەرپێچی فەرمانی خوداو پێغەمبەری کردووە. هەر کەسێکیش عاقڵ‌و هۆشمەند بێ، شارەزای شەریعەت‌و سوننەتی خودابێ لـە بوونـەوەردا کە دەپاڕێتەوە لە خودا داوای رەخساندنی ئـەو هۆیانـە دەکـات کـە بیگەیەنێتـە مـرازو ئارەزووی خۆی، موسوڵمانی عاقڵ ئەگەر ویستی داوا بکات لە خـوا کـە رزق‌و رۆزی زۆر بێت نابێت داوای ئەوە بکات کە خودا زێڕو زیوی بۆ ببارێنێت، یـان دینـارو دۆلاری بـە بادا بـۆ بنێرێـت، بـەڵکوو دەبێـت داوای ئـەوە بکـات کـە خـودا تـەوفیقی بـدات هۆکـاری تایبەتی بۆ برەخسێنێ بۆ ئەوەی بتوانێت کاسبی بکات‌و دەوڵەمەند بێت.

ئەگـەر نەخۆشـێکی هـەبوو نابـێ داوای چـاك بوونـەوەی نەخۆشـەکە بکـا بەشێوەیەکی نائاسایی، دەبێ داوای ئەوە بکا بڵێ: خودایـە! پارمـەتیمان بـدە دەرمانێـك بدۆزینـەوە ببێتـە چارەسـەر بـۆ نەخۆشـییەکە، کەسـێك پـاڵی لێ بداتـەوە، داوای دەوڵەمەنـدی بکـا ئـەوە نەزانـە. هـەروەها نەخۆشـێك دەرمـان نـەخواو بـەگوێرەی ئامۆژگـاری پزیـشك هەڵـسوکەوت نـەکاو لـەخوداش بپاڕێتـەوەو بڵـێ: خودایـە چـاکم بکەرەوە، ئەوە مانای ئەوەیە بڕوای بەسوننەتی خودا نییە لەبوونەوەردا.

پاڕانـەوە لـەخودا دەبـێ بەقـسەبێ‌و دڵـیش وشـیار بـێ‌و بزانـێ چـی دەڵـێ، دەبـێ لەپاڕانەوەکەدا وا هەست بکا کەپێویستی بە یارمەتی خودا هەیە، بەجۆرێك بپاڕێتـەوە گەورەیی‌و پیرۆزی خـودا لەپاڕانەوەکەیـدا دیـار بـێ، بۆیـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پاڕانەوەو دوعاکردن کاکڵەی خوداپەرستییە ﴿فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي﴾ واتە: کـەمن لێیـان نزیـك بم‌و وەڵامـی نـزاو پاڕانـەوەیان بدەمـەوە، دەیبـا ئەوانیش بەدەنگ منەوە بێن‌و کارێك بکەن شایانی وەڵام دانەوە بن. چ فـەرمانێکم پـێ کـردوون بـەئیمان هێنـان‌و تاعـەت کـردن جێبـەجێی بکـەن، وەکـوو مـن خودایـەکی

میهرەبان‌و بەڕەحمم بۆیان، با ئـەوانیش بەنـدەی ڕاسـتاڵ‌و بەئـەدەب‌و گوێڕایـەڵ بـن، پابەندی فەرمانەکانم بن ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾ بـەڵکوو ئـەوانیش شـارەزایی ڕێگـەی ڕاسـت بـن‌و بـزانن خوداپەرسـتی بەڕاسـتی چـۆنە، چـونکە کـردەوە هـەرکاتێ لـەگیانێکی ئیمانداریيەوە هەڵقوڵاو دڵسۆزی تێدا بەدی دەکرا ئەوە دەبێتە هۆی ئـەوە خاوەنەکـەی ڕێبازی ڕاستی ژیان بدۆزێتەوە.

لەوەپێش باسی ئەوە کرا کەڕۆژوو لەسەر ئێمە بەپێویست دانـراوە، وەکوو چـۆن لەسەر گەل‌و نەتەوەکانی تری پێشوو واجب کراوە، ئـەمجار باسـی ئـەو عوزرانـەی کـرد کە دەبنە بیـانوو بـۆ ئـەوەی موسوڵمان بـەڕۆژوو نـەبێ‌و لەرەمەزانـدا ڕۆژوو بـشکێنێ. دێتە سەر ئەوە کەباقی ماندەی حوکمـەکانی ڕۆژوو روون بکاتـەوە، دەفـەرموێ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ﴾ ئەی کۆمـەڵی موسـوڵمانان! ڕێگـە دراوە بـەئێوە کـە شەوانی ڕەمەزان لەخێزانتان نزیك ببنەوە ئەوەی دەتانەوێ‌و حەزتان لێیەتی ئەنجامی بدەن.

خوێنەری هێـژا! بڕوانـە، قورئـانی پـیرۆز چـۆن بـەم تـەعبیرە ناسکە ئـەم جـۆرە مەبەستە کەبریتییە لەجووت بوونی پیاو لەگەڵ خێزانی خۆیـدا دەری دەبـڕێ، ئـەوەتا لەشوێنێکا دەفەرموێ ﴿أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاءَ﴾ یان دەفـەرموێ: ﴿أَفْضَى بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ﴾ یان دەفەرموێ: ﴿دَخَلْتُم بِهِنَّ﴾ یان دەفـەرموێ: ﴿فَلَمَّا تَغَشَّاهَا حَمَلَتْ﴾ بەڕاسـتی ئـەم تەعبیرو ئاخاوتنە هەر لە قورئان دێ؟!

ئـەمجار دێتـە سـەر ئـەوەی کـەهۆی حـوکمی حـەڵاڵ بوونەکـە روون بکاتـەوە دەفـەرموێ: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾ پـەروەردگار ڕێگـەی داون کـە شـەوانی ڕەمـەزان لەخێزانـەکانتان نزیـك ببنـەوە، چـونکە ئـەوان بـۆ ئێـوە وەکـوو پۆشـاکن‌و ئێـوەیش بـۆ ئـەوان پۆشـاکن، هەمیـشە لەگـەڵ یـەکتری دان‌و تێکـەڵاوی یـەکترن، زۆر زەحمەتـە بتـوانن خۆتانیـان لێ بپارێزن، لەبەرامبەریانـدا خـۆبگرن‌و خیانـەت نەکـەن، ئایینی ئیسلامیش ئاسانخوازەو ئەرکی لەسەرشان قورسی تێدا نییـە ﴿عَلِمَ اللّهُ أَنَّكُمْ

كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ﴾ خودا ئاگادارەو دەزانێ کەئێوە خیانەت لەخودی خۆتان دەکەن بڕواتان بەشتێك هەیە کەناتوانن کاری پێ بکەن، چونکە وەکوو دەگێڕنەوە هاوڕێکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە بەربانگیان بکردایەوە ڕێگەیان هەبوو بخۆن و بخۆنەوە تا خەویان لێ دەکەوت لەگەڵ خێزانی خۆیاندا دروست دەبوون، بەلام کە خەویان لێ بکەوتایەو خەبەریان ببوایەوە با چەند سەعاتێکیش شەو بمایە ئیتر چی لەرۆژدا لەرۆژووەوان قەدەغە بوو لەوانیش قەدەغە دەبوو، جا هی وایان هەبوو پابەندی ئەوە نەدەبوو، ئەو سنوورەی دەشکاندو لەخێزانەکانیان نزیك دەبوونەوە بەبیرو بۆچوونی خۆیان تاوانیان کردووە، چونکە ئەوان لە رستەی ﴿كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ ئەوەیان وەرگرتبوو کە خاوەن نامەکان دابو دەستووری بەرۆژووبوونیان وایەو ئەوان وا بە رۆژوو بوون، کەوابوو بۆ ئەمانیش وایە، ئەمە بیروباوەڕی خۆیان بوو، کەچی کەسانێك هەبوون شەوگاری رەمەزان دوای خەبەر بوونەوە لە ژنی خۆیان نزیك دەبوونەوەو بە بڕوای خۆیان تاوانیان کرد، ﴿فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ﴾ خودا تۆبەو ژێوانبوونەوەتانی قبووڵ کردو لێتان خۆش بوو، واتە: خۆش بوو لەو گوناهەی کە بۆ خۆتان پێتان گوناه بوو بە تێگەیشتنی خۆتان لە ئایەتی ﴿كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ وەرتان گرتبوو ﴿فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ﴾ لە ئێستا بەولاوە بچنە لای خێزانەکانتان لە شەوانی رەمەزان لێیان نزیك ببنەوە ﴿وَابْتَغُواْ مَا كَتَبَ اللّهُ لَكُمْ﴾ بە دڵ بخوازن و داوا بکەن ئەوەی کە خودا بۆی داناون لە زانستی خۆیدا بۆی دیاری کردوون، واتە: بۆ ئەوە بچنە لای ژنەکانتان کە وەچەو نەوەی موسوڵمان زیاد بکەن و داوێنپاکی بۆ خۆتان و خێزانەکانتان دەستەبەر بکەن، هەر بۆیەشە پێغەمبەر فەرموویەتی: ﴿بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ. قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيَأْتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ فَقَالَ أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي الْحَرَامِ أَلَيْسَ كَانَ يَكُونُ عَلَيْهِ وِزْرٌ أَوِ الْوِزْرُ. قَالُوا بَلَى. قَالَ فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلاَلِ يَكُونُ لَهُ الأَجْرُ﴾ واتە: ئێوە کە دەچنە لای خێزانی خۆتان چاکەتان بۆ دەنووسرێ! هاوەڵان عەرزیان کرد ئەی

پێغەمبەری خودا: بۆچی یەکێ لە ئێمە بچێ ئارەزوی خۆی بەجێ بێنێ خێری دەگاتێ؟! پێغەمبەر فەرمووی بەڵێ، ئەدی ئێوە نابینن ئەگەر ئەو کابرایە ئارەزووی خۆی لە حەرامدا خەرج کردایە ئایا گوناهی نەدەگەیشتێ؟! وتیان: بەڵێ گوناهی دەگاتێ، پێغەمبەر فەرمووی: دەی ئەمەش وایە کە لە حەلاڵدا خەرجی بکا خێری دەگاتێ.. ﴿وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ﴾ بخۆنو بخۆنەوە هەر لە ئێوارێوە هەتا هێڵی رەشو سپی لەبەربەیاندا لێك جیا دەکەنەوە، واتە: حەلاڵە بۆتان خواردنو خواردنەوەو نزیك کەوتنەوە لە ژنەکانتان لە شەوگاری رەمەزاندا هەر لە کاتی بەربانگەوە هەتا هێڵی سپیایەتی رۆژ لە هێڵی رەشی شەو لە کاتی شەبەقدا لێك جودا دەکرێتەوە، ئەویش بە ئاشکرا بوونی ئەو هێڵە سپییەی کە بە کەناری ئاسماندا بلاو دەبێتەوەو پێی دەڵێن: (الفجر الصادق) زانایانی ئیسلامو شەرع زانەکان لە ژێر رۆشنایی ئەم ئایەتەدا فەرموویانە: کەسێك بە لەش پیسی رۆژی لێ ببێتەوە رۆژوەکەی دروستە، چونکە بە گوێرەی مانای ئایەتەکە کابرا بۆی هەیە هەر لە ئێوارەوە تا پەیدابوونی بەرەبەریان لەگەڵ ژنەکەی جووت بێ، دەی خۆ ئاشکراشە خۆشتنەکەی دەکەوێتە دوا رۆژوەبوونو پەیدا بوونی سپیایی بەرەبەیان، هەروەها کەسێك خەریکی خواردنو خواردنەوە بوو، سپیایی بەرەبەیان پەیدا بوو، ئەویش یەکسەر وازی هێناو دەستی کێشایەوە رۆژووەکەی دروستە، هەروەها کەسێك پێی وابوو هێشتا رۆژ نەبۆتەوە پارشێوی کرد رۆژووەکەی دروستە..

ئەمجار دوای ئەوەی لە رستەی پێشوودا سەرەتای رۆژووی دیاریی کرد کە دەرکەوتنی سپیایی شەبەقە..؛ دێ کۆتاییشی دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّليْلِ﴾ ئەمجار بەردەوام بن لە بەرۆژووبوونو خۆگرتنەوە لەو شتانەی کە رۆژوو دەشکێنێ تا سەرەتای شەوی داهاتوو کە بە ئاوابوونی بازنەی خۆرو نەمانی تیشكو رووناکاییەکەی دەست پێ دەکا، دوایی شەو دادێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: « إِذَا أَدْبَرَ النَّهَارُ وأَقْبَلَ الَّلْيلُ وَغَرَبَتِ الشَّمْسُ ، فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ » . هەر کاتێ رۆژ تەواوبوو شەو داهاتو خۆرئاوابوو ئەوە رۆژووەوان رۆژووی دەشکێنێ،،

ئەو حوکمەی کە لە رستەی ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ﴾ وەردەگیرێ حوکمێکی گشتییە، ئەوە دەگەیەنێ کە لە شەوگاری رەمەزاندا دروستە پیاو لە خێزانی خۆی نزیك ببێتەوە، ئەم ئایەتەی کە دێ ئەو حوکمە گشتی یە تایبەت دەکاتەوەو بەو شێوە گشتییە نایهێڵێتەوە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ﴾ نزیك خێزانی خۆتان نەکەونەوە لەوحاڵەتەدا کەئێوە لەمزگەوتدا ئیعتیکافتان کردووەو نییەتی مانەوەتان هێناوە، چونکە نزیکبوونەوە لەئافرەت ئیعتیکاف بەتاڵ دەکاتەوە، وەکوو چۆن خواردنو خواردنەوە رۆژوو دەشکێنێ ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَقْرَبُوهَا﴾ ئەو حوکمو یاسایانەی گوتران: سنورانی خودانو ئاگاداربن لێیان نزیك مەبنەوە!! چونکە لەبرێ شوێندا نزیکبوونەوە لەسنور سەردەکێشێ بۆ تێپەڕاندنی، چاك وایە لێی نزیك نەبێتەوە نەبادا بکەونە حەرامەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (إن لكل ملك حمى وحمى الله محارمه فمن وقع حول الحمى يوشك أن يقع فيه) هەموو پاشایەك پاوانێکی هەیە، پاوانی خودا ئەوشتانەن کەحەرامی کردوون، کەسێك مەڕ لەنزیك پاوان بلەوەڕێنێ نزیکە مەڕەکانی سنور ببەزێنن!! ئەم هەڕەشەو ترساندنانەی ئەم ئایەتە لەهەڕەشەی ئایەتی ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا﴾ بەهێزترە! پەروەردگار لەهیچ شوێنێکا نەهی لەنزیك کەوتنەوەی سنور نەکردووە مەگەر لێرەداو لەباسی زیناداو لەباسی ماڵو دارایی هەتیواندا.

﴿كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ ئا بەوجۆرە پەروەردگار حوکمو چۆنیەتی رۆژووگرتنو فەرمانی خۆی بۆ مەردووم روووندەکاتەوە بەڵکوو لەسەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خۆبپارێزن، خەڵکی تێدەگەیەنێ فێریان دەکا بۆئەوەی خۆیان ئامادەبکەن، بۆ پەرستشو خودا بەیەك ناسینو جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی، هەروەها بۆئەوەی دووریان بخاتەوە لەشوێنکەوتنی هەواو هەوەس.

## ماڵ خواردنی یەکتری بەناڕەوا

﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٨﴾ ﴾

لەئایەتی پێشوودا باسی ڕۆژوو یاسای ڕۆژووگرتن کرا، ئەوەی تێدابوو کەمەردوم لەکاتی ڕۆژوودا دەبێ جڵەوگیریی لەخواردنی ماڵی خۆی بکا کەوابێ گونجاوە کە دوابەدوای ئەو باسە باسی جڵەوگیریی بکا لەخواردنی ماڵی خەڵك لەهەموو کاتێکدا، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَأْكُلُوآْ أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ﴾ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان ماڵی یەکتری لەناو خۆتاندا بەناڕەوا مەخۆن، کەستان ماڵی کەستان بەخۆڕایی نەخوا، کەس ماڵی کەس داگیرنەکا، ئایەتەکە بۆیە وشەی (أَمْوَالَكُم)ی کە بەمانا (ماڵی خۆتان)ە بەکارهێناوەو مەبەستیش خواردنی ماڵی خەڵکە تا ئاماژەبێ بۆئەوەی کە موسوڵمانان هەموویان یەك جەستەن‌و ئیسلام یەکی خستوون‌و بەیەکیەوە بەستوونەوە، واتە: ئەگەر کەسێك بەناڕەوا ماڵی یەکێکی تر بخوا وەکوو ئەوە وایە بەناڕەوا زیانی لەخودی خۆی دابێ، ماڵی خۆی وێران کردبێ، هەروەها بۆ ئاگادارکردنەوەی ئەوەیە کە ڕێزگرتن‌و پارێزگاری کردن لەماڵی خەڵك وەکوو ڕێزگرتن‌و ئاگاداریکردنی ماڵی خۆت وایە، دەست درێژی کردن بۆسەر ماڵی خەڵك دەست درێژی کردنە بۆسەر ماڵی گەل کەخۆی یەکێکە لەئەندامەکانی، کەوابێ هەر زیانێك لەکۆمەڵ بکەوێ ئەویش بەشێکی بەردەکەوێ، خواردنی ماڵی خەڵك بەناڕەوا زۆر جۆری هەیە، لەوانە:

١- سوو خواردن، چونکە ئەو زیادەیەی وەردەگیرێ لەبەرامبەر هیچدا نییە.

٢- ئەو پارەیەی دەدرێ بەکاربەدەستان بەشێوەی بەرتیل.

٣- خێرکردن بەکەسێ بتوانێ کاسبی بکاو خۆی بژێنێ.

٤- سەرقەڵەمانەو کرێی خەتم کە لە بەرامبەر نووسینی نوشتەیەك یان خوێندنی ئایەتێك لە قورئان یان زیاتر بسێنرێ، بەڵام ئەگەر بەبێ مامەڵە دوایی کابرا شتێکیدا بە نوشتە نووسەکە یان قورئانخوێنەکە ئەوە قەیدی نیە.

٥- بێگار کردنو چەوساندنەوەی بەبێ کرێ یان بەکەم کردنەوەی کرێکەیان.

٦- کرێ وەرگرتن لەسەر کردنەوەو گێڕانەوەی نوێژو گرتنەوەی ڕۆژوو بۆ مردوو، چونکە خوداپەرستی بەبێ نییەت نابێ، نییەتیش هی ئەو کەسەیە کە عیبادەتەکە دەکا، هەرکاتێ ئەم نییەتە شتێکی دونیایی تێکەوت لە عیبادەت دەردەچێ، چونکە خودا عیبادەتێك وەردەگرێ خاص بۆ خاتری ئەو ئەنجام بدرێ، کەوابێ ئەوەی پارە دەدا پارەکەی لێ خەسار دەبێ، ئەوەی پارەکە وەردەگرێ ماڵی ئەو دونیای لەکیس دەچێ.

٧- جۆرەکانی فێڵو غەشکردنو هەڵخەڵەتاندنو چاوو ڕاوو لەخەڵك کردن بۆ کڕینی کاڵایەك یان بۆ فرۆشتنی شتومەکێك، لە خشتە بردنی فرۆشیار یان کڕیار..

بەکورتی هەر پارەو قازانجێك لەم ڕێگایانەوە پەیدا بکرێ حەرامە، دەبێ مەردووم هەوڵبدا بە کاسبی حەڵاڵو کاری پیرۆزو لە ڕێگای شەرعیدا ژیانی خۆی مسۆگەر بکا، زیان بەکەس نەگەیەنێو بەرژەوەندی کەس پێشێل نەکا، هەر کەسێك زانیاریو ئاین بە کرێ بەخەڵك بلێ ئەوە وەکوو کرێکارێك وایەو خێری ناگاتێ، بەڵکوو ئەگەر بە دڵسۆزیی کارەکەی ئەنجام بدا، پاداشی دڵسۆزیەکەی دەدرێتەوە.

نابێ کرێ لەسەر وەڵامدانەوەی پرسیاری ئایینیو فتوای شەرعیی وەربگری، چونکە وەڵامدانەوەکە واجبەو شاردنەوەی زانیاری حەرامە. ﴿وَتُدْلُواْ بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ﴾ واتە: وا مەکەن ماڵو دارایی خۆتان پێشکەش بە دادوەرو لێپرسراوان بکەنو بیکەنە بەرتیل ﴿لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ بۆ ئەوەی بەشێك لە ماڵو دارایی خەڵك بە ناحەق – بەهۆی ئەو بەرتێل دانەوە – وەدەست بێننو بخۆن، واسیتەو تکاکار پەیدا بکەن، شایەتی بەدرۆ ئامادە بکەن، سوێندی بەدرۆ بخۆن، ...هتد... ستەمکاریو ناهەقیکاریو تاوانباری خۆتان پەردەپۆش بکەن! چونکە

ئاشکرایە پەنا بردنە بەر دادوەرو لێپرسراوان بۆ خواردنو داگیرکردنیماڵو دارایی خەڵك بە ناهەق تاوانێکی گەورەیەو کارێکی حەرامە. چونکە بڕیاری دادوەرو قازیی هیچ لە راستیەکە ناگۆڕێو ماڵە حەرامەکە حەڵاڵ ناکا، بڕیاری قازیو دادوەر شتێکی رواڵەتکارییەو بە رواڵەت ئەو ماڵە دەکاتە ماڵی تۆ بەڵام لە راستیدا نابێتە ماڵی تۆ! کەوابوو ئەگەر قازیی بڕیاریدا کەفلانە ئافرەت خێزانی فلانە کەسە بە شایەتی بە درۆو چاوبەست ئەو ژنو پیاوە نابن بە ژنو مێردی شەرعی. نابێ تەنیا بە بڕیاری قازیی بەبێ مارەکردنی شەرعیی ئەو ژنو پیاوە لێك نزیك ببنەوە. هەر بەو جۆرە بۆ هەموو سەوداو مامەڵەیەك فتوای قازیو بڕیاری دادوەر ناتوانێ هیچ حەرامێك حەڵاڵ بکا هیچ ناهەقێك بکا بە هەق!!

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کاتێك دوو کەس هاتنە خزمەتی دەربارەی کێشەیەکی ناو خۆیان ویستیان رێکیان بخا پێی فەرموون: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، وَأَقْضِيَ لَهُ عَلَى نَحْوِ مَا أَسْمَعُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا، فَلاَ يَأْخُذْ، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ» من ئادەمیزادێکم وەکوو ئێوە. ئێوە کێشەو نیزاعی خۆتان دێننە لام، وادەبێ یەکێکتان لەوی تریان قسەزان ترە، لە بەڵگە هێنانەوەو روونکردنەوەی باسەکەو راکێشان بەلای خۆیدا زمان لووسو قسە بەجێ بێ، منیش لەسەر ئەو قسە بیستراوانە بڕیار دەدەم، جا کەسێك بەو بڕیار بۆ دانەی من، هەندێك لە ماڵی برا موسوڵمانەکەی پێدرا، ئەوە بابزانێ کە پارچە ئاگرێکی دۆزەخم داوەتێ، ئیتر کابراکان کە ئەمەیان لە پێغەمبەر بیست، هەردووکیان دەستیان کرد بەگریانو هەریەکەیان دەیگوت: من نامەوێ با بۆ براکەم بێ! ئەمجار پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (إذهبا فتوخيا ثم استهما ثم ليحلل كل واحد صاحبه) بڕۆن جوان لێی بکۆڵنەوە ئەگەر زانیتانو بۆتان دەرکەوت هی کامتانە ئەوە باشە، ئەگینا پشك بهاونو قورعە بکەنو هەریەکەتان گەردنی ئەوی ترتان ئازاد بکا. ئەم ئایەتو حەدیثەیە ئەوە دەگەیەنێ کەپێویستە پارێزەری موسوڵمانان ئەو داوایە وەرنەگرێ کەلێی روونە خاوەنەکەی تێیدا خاوەن

هەق نییە، نەچن بەدەم درێژیو قسەزانیو، ناهەقی بکەن بەهەقو بەناڕەوا ماڵی ئەم بۆ ئەو ببچڕن، هەرکەسێك ئەمڕۆ سەیری ومزعو حاڵی موسوڵمانان بکات، لەم هەموو بەیەکدا چوونو کێشەو نیزاعو بەربەرەکانییەی کە لەناویاندا هەیە وردبێتەوە، ئەو هاتوچوو بێنەو بەرەی دادگاو بەرتیلو بەرتیلکاری بۆ دادوەرو قازیو پارێزەرو لێپرسراوانو هەوڵدان بۆ تۆڵە سەندنەوەو ئەزیەتدانی یەکتریو داونانەوە بۆ پێلان گێڕان دژی یەکتری ئەوەی بۆ روون دەبێتەوە کە موسوڵمانان زۆر لەئایین دوورکەوتوونەتەوە کەم پەیڕەوی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەکەنو شەریعەتی خودایان پاشگوێ خستووەو فەرامۆشیان کردووە، بۆیە کەوتوونەتە تەنگو چەڵەمەوە، ماڵو داراییان هەموو بەفیڕۆ چوو، ماڵو حاڵیان وێران بوو، کۆمەڵو یەکیەتیان بووبە دووبەرەکیو لێك جیابوونەوە، هەر کۆمەڵەو دژی ئەوی تریان دەجەنگێو دەدوێ، ئەم لەو دەخوێنو ئەو لەم دەخوێنێ!!

خۆ ئەگەر بهاتنایە پابەندی فەرمانی قورئانەکەیان بوونایە پەیڕەوی پەیامی پێغەمبەریان بکردایە بێگومان ئاوا مافیان پێشێل نەدەکراو کۆمەڵگایان ئاوا لێك نەدەترازا، خۆشەویستیو برایەتیو تەبایی دەکەوتە ناویانەوە، دەبوونە کۆمەڵگایەکی نموونەییو جیهان ئاواتەخوازیان دەبوو! بەڵام بەداخەوە موسوڵمانان کاریان گەیشتۆتە رێژمیەك پێیان وایە کە ئەوان پێویستیان بەرێنومایی ئایین نییەو چاوی خۆیان لەئاست رووداوەکاندا نوقاندووە، شانی خۆیان کۆم کردووەو بوون بەداردەستی بێگانەو ژێردەستی داگیرکەران. خۆ تاوەکوو نەگەڕێنەوە بۆ ژێر ئاڵا پیرۆزەکەی ئیسلامو قورئان نەکەنەوە بەبەرنامەی ژیانیان حاڵیان هەروا دەمێنێتەوە.

## کات دیاریکردن بەمانگو حەقیقەتی چاکە

﴿ ۞ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِۖ قُلۡ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلۡحَجِّۗ وَلَيۡسَ ٱلۡبِرُّ بِأَن تَأۡتُواْ ٱلۡبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰۗ وَأۡتُواْ ٱلۡبُيُوتَ مِنۡ أَبۡوَٰبِهَاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٨٩ ﴾

لەپێشەوە باسی مانگی ڕەمەزانو حوکمی ڕۆژووی کرد کەوابوو گونجاوو مناسیبە کە دوابەدوایی ئەوە باسی مانگ بکا، چونکە بەڕۆژووبوونو شکاندنی ڕۆژوو پەیوەندی بەدیتنی مانگی یەکشەوەی ڕەمەزانو شەشەڵانەوە هەیە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (صوموا لرؤيته وافطروا لرؤيته) واتە: کەمانگی یەکشەوەی ڕەمەزانتان بینی بەرۆژوو بنو بیکەن بە ڕەمەزان، کە مانگی یەکشەوەی شەشەڵانتان بینی بیشکێننو بیکەن بەجەژن. ئەبو نەعیمو ئیبنو عەساکیر لە ئەبو صاڵحو ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێن: موعازی کوڕی جەبەلو ثەعلەبەی کوڕی غونەیمە عەرزی پێغەمبەریان کرد (درودی خودای لەسەر بێ) وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە هۆی چییە مانگ ئەو هەموو گۆڕانکارییەی بەسەردا دێ؟ ڕۆژێك باریکە دەڵێی هەودا دەزووە، دوایی زیاد دەکا تا زل دەبێو خڕ دەبێ، ئەمجار وردە وردە بچووك دەبێتەوە تاوەکوو وەك پێشووی لێ دێتەوە، هیچ کاتێ لەسەر شێوەیەك نامێنێتەوە؟ ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو. ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ﴾ ئەی محمد! پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی هۆی گۆڕانی مانگ کە لەسەرەتادا وەکوو داوە دەزوو باریکەو وردە وردە زل دەبێ تا دەبێتە مانگی چواردە شەوە ئەمجار وردە وردە لاواز دەبێتەوە تا دەگاتە حاڵی پێشووی‌و وەکوو لاسکە خورمای چرچی لێ

دێتەوە، دەڵێن: هۆی چیە ئاوا گۆڕانی بەسەردا دێ؟ وەڵامیان بدەرەوە پێیان بڵێ: ئەوە نیشانەی کاتە بۆ ئادەمیزادو کاروبارو سەوداو مامەڵەو سەفەرو هاتوچۆی خۆیانی پێ ئەندازەدار دەکەن. بە هۆی گۆڕانی مانگەوە کاتی کشتوکاڵو بازرگانیو کاتی قەرزو قۆڵەیان دیاری دەکەن، ماوەی شیر پێدانی منداڵو عیددەی ئافرەتو رەسیدبوونی کوڕو کچی پێ دیاری دەکەن، هەروەها نیشانەیە بۆ دیاری کردنی کاتی ئەو عیبادەتانەی کە (کاتی)نو لەکاتی تایبەتیدا نەبن ئەنجام نادرێن، ئیتر بەهۆی گۆڕانی مانگەوە ئادەمیزاد کاتەکانی خوداپەرستی دەزانن کاتی بەرۆژووبوونیانو رۆژووشکاندنیان دەزانن، بەتایبەتی (حەج) کە لە کاتی دیاریکراوی تەسکدا جێبەجێ دەکرێ. جا ئەگەر مانگ لەسەر یەك شێوە بمایەوە بە ئاسانی کاتەکان نەدەزاندران و ئادەمیزاد سەریان لێ تێك دەچوو!!

دیاری کردنی کات بە هۆی مانگەوە بۆ خوێندەوارو نەخوێندەوار ئاسانە دانیشتووی شارو لادێ لێی حاڵی دەبن، بەڵام کات دیاری کردن بە گوێرەی خۆر (التوقيت الشمسي) بۆ حیساب گەر نەبێ ناگونجێ، تەنانەت ئەو حیسابگەرانەش تا زانیاری ئاسمان شوناسی پێش نەکەوت نەیانتوانی سوودی لێ وەربگرن. پرسیارەکە لەهۆی گۆڕانی مانگە، وەڵامەکە باسی حیکمەتو سوودی گۆڕانەکە دەکات، ئەمەش رێنومایی کردنە بۆ ئەوەی کە دەبوایە ئەوان پرسیارەکەیان ئاوا بکردایە.

## ئەو زانستو زانیارییەی کە ئادەمیزاد پێویستی پێیان هەیە چەند جۆرێکن:

١-زانیارییەك کە بەبێ مامۆستا بزانرێ وەکوو ئەو شتانەی بەهەست یا بە ویژدان دەزاندرێن.

٢- زانیارییەك کە مامۆستای دەست ناکەوێو کەس نیە بیزانێ، وەکوو زانینی چۆنیەتی دروست بوونی یەکەم (الخلق الأول) چونکە پزیشك دەتوانێ بزانێ گیاندار چۆن لە دایك دەبێو چۆن پلەکانی ژیان دەبڕێ، دەتوانێ بزانێ مرۆڤ هەر لەو کاتەوە

کە لە رەحمی دایکیا دڵۆپە ئاوێك بووە تا ئەو کاتەی دەبێتە مرۆڤێکی تەواو چۆن ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەردا دێ. رووەك ناس دەتوانێ بزانێ رووەك چۆن پەروەردە دەبێ‌و چۆن گەشە دەکات، بەڵام نە پزیشك‌و نە رووەك ناس ناتوانن بزانن ئەمانە لەسەرەتادا چۆن هاتوونە کایەوە، مومکین نییە حەقیقەتی دروستبوون‌و بەدیهێنانیان بزانرێ هەروەکوو چۆن ناگونجێ حەقیقەت‌و چۆنیەتی زاتی خودا بزانرێ.

٣- زانیارییەکی تر هەیە دەشێ خەڵك بەبەلگەو تێفکرین‌و لێکۆڵینەوە فێری ببن، وەکوو زانیاری سروشت‌و ماتماتیك‌و کشتوکاڵ‌و ئاسماننناسی‌و گۆڕانی مانگ‌و هات‌وچۆی ئەستێرەکان‌و....هتد راگەیاندنی ئەم جۆرە زانیاریانە ئیشی پێغەمبەران نییەو ئەوان بەرپرسیارنین بۆ خەڵکی روون بکەنەوەو نابێ داوای شتی وا لە پێغەمبەران بکرێ، هەرکاتێکیش داوای شتی وایان لێکرا ئەوە نیشانەی تێنەگەیشتنە لەچۆنیەتی ئەرکی ئەوان، لەهەمان کاتدا پاش گوێ خستنە بۆ ئەو هێزو توانایەی خودا داویەتی بە ئادەمیزاد بەنچەر کردن‌و لەکارخستنی هەستەکانیەتی، خۆئەگەر وابوایە دەبوایە هەموو شتێك لەوان وەربگیرایە، دەبوایە ژمارەی پێغەمبەران لەهەموو گەل‌و نەتەوەیەکدا گەلێك زۆر بوونایە بۆئەوەی بیانتوانیایە هەموو تاکەکانی کۆمەڵ فێری هەموو شتێکی ژیان بکەن.

بەڵێ: پێغەمبەران (دروودی خوایان لەسەر بێ) گەل‌و نەتەوەکانیان هەڵناوە کە لەهەموو کات‌و ساتێکدا هەست‌و شعوری خۆیان بەکاربێنن‌و لەکاروباری دونیاییدا بەگوێرەی عەقڵ‌و هۆشی خۆیان هەڵس‌و کەوت بکەن، ئەوەتا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە خەڵکی مەدینەی مەنع کرد لەوەی کە دارخورماکانیان تەلقیح بکەن‌و ئەوساڵە بەروبوومی خورما باش نەبوو، خاوەن بێستانە خورماکان چوونە خزمەتی سکاڵای خۆیان کرد، فەرمووی: (أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمُوْرِ دُنْيَاكُمْ ) ئێوە باشتر ئیش‌و کاری دونیایی دەزانن. ئەگەر بگوترێ: دەی باشە خۆ مێژوو زانیارییەکە مرۆڤ دەتوانێ بەئاسانی بینوسێتەوەو پێویست ناکا بەنیگای خودایی باسی لێ بکرێ لەوەڵامدا دەڵێین: ئەو مێژوو بەسەرهاتانەی قورئان دەیانگێڕێتەوە لەراستی دا بەمەبەستی

زانینـی مێـژوو نـەهێنراون، بـەڵكوو بەمەبەسـتی پەنـد لێ وەرگـرتن‌و دیـاریكردنی سوننەتەكانی خودا لەبونەوەردا هێنراون، بۆ هەڕەشـەكردن لـەكافرەكان‌و ترسـاندنیان لەئاكامی سەرپێچیكردنی پەیامی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاراستە كراون، ئـەو مێـژووە دوورو درێـژەی لـە تەوراتـدا دەربـارەی دروسـتكردنی ئـادەم هێنـراوەتـەوە لەڕاسـتیدا تـەورات نییـە. دوای لـەدنیا دەرچـوونی حـەزرەتی مووسـاو گەڕانـەوەی جولەكەكان لە وڵاتی بابل، بەتەوراتەوە لێكندراوەو تێكەڵی كراوە!

٤- جۆرە زانیارییـەكی تـر هەیـە پێویـستە ئێمـە بەرامبـەر بەدیهێنـەری خۆمـان بیـزانین: دەبـێ بـزانین: چـۆن بەندایـەتی بكـەین‌و چـۆن بیپەرسـتین، حیكمـەتی ئـەو بەندایەتی كردنە چییەو بۆچییە، كە مردین چیمان لێ دێ‌و سەرەنجاممان چییە؟ ئـەم جۆرە زانیاریە بە هەوڵدان‌و لێكۆڵینەوە وەدەست نایە، توێژینەوە تێیدا كۆڵەوارەوە.

زۆر جـار گـەل‌و نەتـەوەكان لـەزانین‌و سـنورداركردنی پەیوەنـدی نێـوان بەنـدەو بەدیهێنەردا كەوتوونە هەڵەوەو سەریان لێ شێواوە، بۆیە كۆمەڵگای ئادەمیزاد پێویستی بەڕەهنومایێكەر هەیە، ئاتاجی پێغەمبەرە كە ڕێگای ڕاستییان پـێ بڵـێ‌و ئیمـان‌و بـیرو باوەڕی ڕاستییان تێبگەیەنێ.

٥- هەندێ زانیـاری هەیـە عـەقڵی ئـادەمیزاد دەركـی پێدەكات دەتوانـێ وەدەسـتی بێنـێ بـەڵام جـاری وادەبـێ هەڵـەی تێدەكـەوێ هـەواو ئـارەزوو دەوری تێـدا دەبیـنن‌و پەردەپۆشی دەكەن‌و ناهێڵن عەقڵ بگاتە حەقیقەت، یان حـەق‌و بـەتاڵ تێكـەڵاو دەبـن، یان سوودو زیان لێك دەناڵێن، بۆ نموونـە زیـانی مـەی‌و تلیـاك لای ئـادەمیزاد ئاشـكرایە كەچی هـەواو هـەوەس زاڵ دەبـێ‌و كـاری وای تێدەكـەن ئالوودەیـان بێـت‌و بیانخواتـەوە، حوكمی خۆشـییە كاتییەكـەی زاڵ دەبـێ بەسـەر زانیـاری عەقڵدا، لەبەرئـەوە پێویـستە سەرچـاوەیەكی تـر بـۆ زانیارییەكـە هـەبێ، پاڵپـشتی عـەقڵ بكـاو جڵـەوی نەفـسی چەمووشی بگرێتەوە.

دوای ئـەوە كـە باسـی كـاتی حـەج كردنـی كـرد، باسـی كردارەكـانی حـەج دەكـاو دەفەرموێ: ﴿وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوْا الْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا﴾ لەسەردەمی نەزانیدا یاریدەدەران

(الأنصار)و هەندێ لە عەرەبەکان لەکاتی حەجدا کە ئیحرامیان دەبەستو دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە لەدەرگای سەرەکییەوە نەدەچوونە خانووەوە، بەلایانەوە حەرام بوو، بەڵکوو لەپاشەوەڕا خۆیان فڕێ دەدایە ناو خانووەوە..

ئیبنو جەریر لە زوهرییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: هۆی ئەمە ئەوەبوو خۆیان دەپاراست کە بە پۆشاکی ئیحرامەوە لەدەرگاوە بچنە ماڵەوە، چونکە پێیان وابوو کە سەردەرانی دەرگاکە دەبێتە پەردە لەنێوان ئەوانو ئاسماندا!! ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمووی: ﴿وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوْاْ الْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا﴾ ئەی خەڵکینە چاکە ئەوە نییە کە لەکاتی ئیحرامدا لەپاشەوەڕا خۆتان فڕێدەنە ناو خانووەکانتانەوە ﴿وَلكِنَّ البِرَّ مَنِ اتقَى﴾ بەڵکوو چاکەو کاری باش ئەوەیە تەقوای خودا بکەنو پابەندی فەرمانەکانی بن، واز لەتاوان بێننو خۆ لەکاری خراپ دوور بخەنەوە، بەکرداری جوان خۆتان ئارایشت بدەن، شوێن حەقو راستی بکەون ﴿وَأْتُواْ الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا﴾ لە دەرگاوە بچنە ناو خانووەکانتانەوە ﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ لە خودا بترسنو خۆتان لە سزای بە ئێشی بپارێزن، ئەوەی نەهی لێکردووە توخنی مەکەون، ئەوەی فەرمانی پێکردووە بە تەواوی‌و رێكو پێکی ئەنجامی بدەن، بەڵکوو لە ژیانی دونیاتاند بەسەربەرزیی بژینو لە کارو فەرمانتاندا سەرکەوتووبنو بە ئاوات بگەن، سەرفرازی ئەو دونیاش بن، ئەوە بزانن کە چوونە ناو خانوو لە پاشەوەڕا هیچ چاکەیەکی تێدا نیە، لە هەر شوێنێکەوە بچنە ناو خانووەوە دروستە، مەگەر لە خۆڕا ئەو بڕوایەتان هەبێ کە چوونە ژوورەوە لە دەرگای سەرەکیەوە حەرامە، ئەمە کارێکی خراپەو مەیکەن.

## یاساو دابو نەریتی جەنگ لە پێناو ئایینی خودادا

﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡ

وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ وَلَا تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ كَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ ﴿١٩١﴾ فَإِنِ انتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٢﴾ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ فَإِنِ انتَهَوْا فَلَا عُدْوَانَ إِلَّا عَلَى الظَّالِمِينَ ﴿١٩٣﴾ الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾ وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ ﴾.

لەئایەتی پێشوودا باسی ئەوەی کرد کە مانگ نیشانەی کاتەکانە. ئادەمیزاد کاتەکانی بازرگانیو سەوداو مامەڵەو قەرزو قۆڵەو خواپەرستیو شیرخواردنی منداڵو عیددەی ئافرەتو ئەم جۆرە شتانەی پێ دیاری دەکا، بە تایبەت (حەج) کە بە گوێرەی مانگ کاتەکەی دیاری دەکرێو شەڕو هەراش لەو مانگانە کە پێیان دەگوترێ (أشهر الحرام) حەرامەو ئەو مانگەی حەجی تێدا دەکرێ یەکێکە لەو مانگانەی شەڕی تێدا قەدەغەیە، لێرەدا ئەوە روون دەکاتەوە کە شەڕ کردن بە مەبەستی بەرگری کردن لە ئاینو تەمبێ کردنی ئەوانەی فیتنەو ئاشووب بەرپا دەکەنو پەیمانو بەڵێن هەڵدەوەشێننەوە کارێکی رەوایە، چ خراپەیەکی تێدا نیە، عەبدوڵڵای کوڕی عەباس

دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی سوڵحی (حديبية) هاتۆتە خوارێ: کە ساڵی شەشەمی کۆچی پێغەمبەر لەگەڵ (١٤٠٠) لە هاوەڵانی ئیحرامیان بە عەمرە بەستو بەرەو مەککە کەوتنەڕێ تا گەیشتنە حودەیبیە – کە بیرێکە نزیك مەککە – لەوێ خستیان، کافرەکانی مەککە جوابیان بۆ ناردن کە نابێ بێنە ناو شاری مەککەوە ئەوەبوو نەیانهێشت داخڵی مەککە ببن، لەپاشا سوڵحیان کرد لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە ئەو ساڵە پێغەمبەرو هاوەڵانی بگەڕێنەوە، ساڵی داهاتوو سێ ڕۆژ مەککەییەکان شاریان بۆ چۆڵ بکەن پێغەمبەرو هاوەڵانی بە ئارەزۆی خۆیان چی تیا دەکەن بیکەن..

لەسەر ئەم بڕیارە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) ئیحرامی شکاندو ئەمجار هاوەڵانیشی ئیحرامیان شکاندو گەڕانەوە. کە ساڵی داهاتوو تێوەرسووڕایەوە پێغەمبەرو هاوەڵانی بەپێی پەیمانی ساڵی ڕابوردوو خۆیان ئامادە کرد بۆ گێڕانەوەی عەمرە (عمرة القضاء) ترسی ئەوەشیان هەبوو کە قوڕەیشیەکان پابەندی بەڵێنو پەیمانەکەیان نەبن، ئەم ساڵیش نەهێڵن موسوڵمانەکان بچنە ناو کەعبەوەو شەڕیان لەگەڵدا بکەن، شەڕکردنەکەیشیان پێ ناخۆش بوو چونکە دەکەوتە کاتو شوێنێك کە شەڕیان تێدا حەرامە، کاتەکە مانگی ناو جەژنان (ذیلقە عیدە)و شوێنەکەش بەیتول حەرامو دەوروبەری بوو، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ﴾ ئەی موسوڵمانینە! ئەی ئەوانەی ترسی ئەوەتان هەیە قوڕەیشیەکان نەهێڵن بچنە ناو کەعبەوەو نەهێڵن عەمرەکەتان بگێڕنەوە پەیمانی ڕابوردوویان هەڵوەشێننەوەو شەڕتان لەگەڵ بکەنو تووشی فیتنەییو ئاشووبتان بکەن پێشتان ناخۆشە بەرگری لەخۆتان بکەن چونکە کاتی شەڕەکە مانگی (أشهر الحرام)ە شوێنی شەڕەکەش (بەیتول حەرام)ە شەڕی تێدا ناکرێ.

ئەوا ئێمە ڕێگەمان پێدان کە شەڕیان لەگەڵ بکەنو بەرگریی لەخۆتانو ئاینتان بکەن، مەبەستان لەم شەڕکردنە بڵاوکردنەوەی ئایینی خودابێو بەرزکردنەوەی ڕستەی (لا إله إلا الله) بێ. نەك شوێن کەوتنی هەواو هەوەسی خۆتانو حەزی خوێن ڕشتنو پیاو کوشتن بێ، ﴿وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ﴾ دەست درێژیی مەکەن!

بەوە ئێوە سەرەتا شەڕ هەڵگیرسێنن، کە شەڕیش هەڵگیرسا دەستدرێژی مەکەن بەوە کە کەسانێك بکوژن کە شەڕکەر نین وەکوو منداڵو ژنو پیرەمێردو پەککەوتەو ئەوانەی چەك فڕێ دەدەن شەڕ ناکەن، ئەوانەی خۆیان تەسلیم بەئێوە دەکەن هەروەها زیادەڕەوی مەکەنو دەست درێژی مەکەن بەوە کە وێرانکاریی ئەنجام بدەن خانوو بڕوخێنن، دارو درەخت ببڕن، بیرو کانیاو پڕبکەنەوە، ئەمانە هەموویان دەست درێژیو حەرامن بەتایبەتی لەکاتی ئیحرامداو لە بەیتول حەرامدا ﴿وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ﴾ کە شەڕیش هەڵگیرسا لەنێوان ئەوانو ئێوەدا ئیتر دەستیان لێ مەپارێزن، لەهەر شوێنێك بنو بۆتان هەڵکەوتن، شەڕیان لەگەڵدا بکەنو بیانکوژن، لەمانگی ناو جەژناندا (ذیلقەعیدە = حرام)دا بێ، یان لەناو (بیت الحرام)دا بێ، لەهەر شوێنێك بنو بەهەر شێوەیەك بێ ﴿وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ﴾ دەریان بکەن لەوشارەی کە ئەوان ئێوەیان لێ دەرکردووە، کە شاری مەککەیە، چونکە کافرەکان تینیان بۆ پێغەمبەرو هاوەڵانی هێنا لە مەککە وەدەریان نان بەوە کەوایان لێکردن مانەوەیان زەحمەت بێ، یان ببێتە هۆی لەدەستدانی ئایینەکەیانو ناچاربوون کۆچیان کرد بۆ مەدینە، ئەمجار ڕێگای ئەوەشیان لێ گرتن کە ساڵانە بێنەوە لەکاتی حەجدا پێویستی حەجو عەمرە بەئەنجام بگەیەنن لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەرو موسوڵمانەکان ڕازی بوون بەڕێك کەوتنێك کە ڕێکەوتننامەی حودەیبییەی پێ دەگوترێ، ئەوساڵە بگەڕێنەوە، ساڵی داهاتوو بێنەوە سێ ڕۆژ شاری مەککەیان بۆ چۆڵ بکرێ، عەمرەکەیان بگێڕنەوە، کە ساڵ تێوەرسوڕایەوە لەمانگی ناوجەژنان (ذیلقەعیدة)دا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەخۆییو ئەوانەی لەساڵی ڕابوردوودا ڕێگەی عەمرەیان لێ گیرابوو گەڕابوونەوە، کەوتنە خۆ ئامادەکردنو بەمەبەستی بەجێهێنانی عەمرە بە (قضاء) بەرەو مەککە کەوتنە ڕێو ژمارەیان لەساڵی پێشوو زۆرتر بوو، ئیتر بەوپەڕی سەربەرزییەوە عەمرەکەیان ئەنجامدا، ئەمجار سەریان تاشیو ئیحرامیان شکاند، لەڕۆژی دواییدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چووە ناو کەعبەوە – کە پڕبوو لەبت – کاتی نیوەڕۆ فەرمانی دا بە (بلال) کە بانگبدا، ئەویش چووە سەربانی

کەعبەو ئاوازی (لا إله إلا الله محمد رسول الله ألله أكبر ألله أكبر) بەناو دەشتو دۆڵو کونو کەلەبەری ئەو وڵاتەدا بڵاوکردەوە، نیشانەی روخاندنی بتپەرستی دیاریدا، ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هات بەرنوێژیی بۆ دوو هەزار کەس کردو نوێژیان بەجەماعەت لەکەعبەدا ئەنجامدا، بەم شێوەیە موسوڵمانەکان سێ رۆژ لەمەککەدا مانەوە، کافرەکان مەککەیان چۆڵ کردبوو، ئەمجار پەروەردگار هۆی رێگە پێدانی شەڕ بۆ موسوڵمانەکان باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ﴾ ئەگەر کافرەکان شەڕیان هەڵگیرساندو دەست پێشخەری لەوانەوە بوو، ئێوە کۆ لەوە مەکەن کە کاتەکە شەڕی تێدا قەدەغەیەو مانگی حەرامە، یان شوێنەکە بەیتول حەرامەو شەڕی تێدا قەدەغە کراوە، هیچ گوێ بەوە مەدەن، ئەگەر شەڕیان لەگەڵدا کردن ئێوەش یەکسەر پەلامار بدەنو شەڕ بکەن، چونکە گرو گێچەڵو برو بیانوو ئەزیەتدانو سوکایەتی پێکردنو فیتنەو ئاشووب گێڕانو دەرکردنو راوەدوو نانو پێشگیری کردن لەئایین زۆر لەکوشتن گەورەترو کاریگەرترە، نابێ قبوڵی بکەنو لێی بێدەنگ بن، لەهەر شوێنێك بۆتان هەڵکەوتو دەرفەتتان دەسکەوت هەل لەکیس خۆتان مەدەن، بەڵام ﴿وَلاَ تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّى يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ﴾ هەرکەسێك لەوکافرانە خۆی خستە ناو کەعبەوە ئەمین دەبێ، مەگەر ئەو کەسە خۆی لەوێ حورمەتی کەعبە بشکێنێو شەڕی تێدا بکا، ئەوکاتە ئێوەش دەستی لێ مەپارێزن، ﴿فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ﴾ ئەگەر لەکەعبەدا شەڕیان لەگەڵ کردن، ئێوەش شەڕیان لەگەڵدا بکەنو بیانکوژن، چونکە خەتا لەدەست پێشخەرو بکەرەو ئەو ستەمکارە ﴿كَذَلِكَ جَزَاء الْكَافِرِينَ﴾ سوننەتی خودا وایە ئاوا بەوجۆرە سزای دەست درێژی کاران بداتەوەو بەوجۆرە تۆڵەیان لێ بسێنێ، چونکە ئەوان سنووریان بەزاندووەوە، حورمەتی کەعبەیان شکاندووەو ستەمیان لەئێوەو لەخۆیان کردووە، دەبێ سزای ستەمکاریی خۆیان وەربگرنەوە ﴿فَإِنِ انتَهَوْاْ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەگەر وازیان لەشەڕ هێنا، یان موسوڵمان بوونو وازیان لە کوفر هێنا، ئەوە پەروەردگار لێخۆشبووەو کردەوەی باشیان

لێ وەردەگرێو لە تاوانیان دەبورێ. ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾ شەڕیان لەگەڵدا بکەن بۆئەوەی چاوترسێنیان بکەنو ورەیان بڕوخێننو نەتوانن ببنە لەمپەڕ لەبەردەم ئاییداو واز لە ئازارو راوەدونانتان بێنو دەربەدەرتان نەکەن ﴿وَيَكُونَ الدِّينُ لِلّهِ﴾ ئایینی هەموو کەسێكو بەندایەتی کردنی بۆ خودابێ، لەخودا نەبێ لەکەسی تر نەترسێ، کەس نەتوانێ موسوڵمانان لەسەر خودا پەرستی دەربەدەر بکاو ئازاریان بدا، کەس چاوەڕوانی ئەوە نەکا موسوڵمانان لە ترساندا ماستاوی بۆ بکەنو مەرایی بۆ بکەن...

بێگومان ئەو کاتەی ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارێ موسوڵمانان کەمو بێ هێزبوون، کافرەکان زۆرو خاوەن دەسەڵاتو هێزو توانا بوون، شاری مەککە کانگای بتپەرستی بوو، کەعبە پڕبوو لەجۆرەها بتی بچووكو گەورە، خوا نەناسان تێیدا ئازادو خودا پەرستان دەست بەسەرو ژێردەستە بوون!! بەڵام پەروەردگار ویستی نووری ئیسلام مەشخەڵ دار بێ، دونیا رووناك بکاتەوە یارمەتی موسوڵمانەکانی دا بۆئەوەی قەڵاچۆی بتپەرستی بکەن، کردیشیان لە ئاکاما سەرفرازیو سەرکەوتن بۆ موسوڵمانەکان بوو!!

﴿فَإِنِ انتَهَواْ فَلاَ عُدْوَانَ إِلاَّ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ جا ئەگەر کافرەکان وازیان لەدەستدرێژی کردنو شەڕ هەڵگیرسانو فیتنەیی هێناو موسوڵمان بوون، ئەوە دەست درێژییان مەکەنە سەرو لەگەڵیاندا بەئارامی بژین. چونکە سزاو بەرپەرچدانەوە بۆ تەمێ کردنی ستەمکارانە، بۆئەوەی واز لەستەمکاری خۆیان بێنن.

وەکوو گوترا: ساڵی شەشەمی کۆچی پێغەمبەرو هاوەڵانی بەمەبەستی عەمرەکردن ئیحرامیان بەستو بەرەو مەککە کەوتنەڕێ، کە گەیشتنە بیری (حودیبیە) لەنزیك مەککە کافرەکان پێشیان پێگرتنو شەڕە شیرو شەڕە بەردیشیان لەگەڵدا کردن، دوایی رێککەوتن کە ئەو ساڵە موسوڵمانەکان بگەڕێنەوەو ساڵی داهاتوو بێنەوە.

جا کە موسوڵمانەکان ساڵی داهاتوو هاتنەوە بۆ عەمرە گێڕانەوە (عمرة القضاء) لەوە دەترسان کە کافرەکان ئەمساڵیش پابەندی بەڵێنەکەیان نەبنو رێگایان نەدەن

عەمرەکەیان بەجێ بێنن، لەهەمان کاتدا پێشیان ناخۆش بوو کەشەڕیان لەگەڵدا بکەن چونکە کاتەکە مانگی ناوجەژنان بوو شوێنەکەش بەیتول حەرام بوو هەردووکیشیان شەڕیان تێدا قەدەغەیە!! وەکوو لەوەپێش باسکرا.

ئیتر پەروەردگار لەم ئایەتەی دواییدا ئەومیان بۆ ڕووندەکاتەوە کە شەڕو دەست پێکردنی حەرامو یاساغە نەك بەرگری لەخۆکردن، کەوابوو ﴿الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ﴾ ئەم مانگە ناوجەژنانەی کە عەمرەکەتانی تێدا دەگێڕنەوە لەبری ئەو مانگە ناوجەژنانەی پارە، کە ڕێگایان لێ گرتنو شەڕیان لەگەڵدا کردنو نەیان هێشت عەمرەکەتان ئەنجام بدەن، جا ئەگەر ئەوان دەست پێشخەرییان کردو شەڕیان لەگەڵدا کردنو بەگژتاندا هاتنو حورمەتی مانگی حەرامیان نەگرت، ئەوە ئێوەش بێ سێو دوو شەڕیان لەگەڵدا بکەنو بەرپەرچییان بدەنەوە. ئەوان تاوانبارنو حورمەتی مانگی حەرامیان شکاندووە نەك ئێوە!!

یان مانایەکی تریشی لێ وەردەگیرێ ئەویش ئەوەیە، دەڵێ: لەکاتێکدا پیرۆزیی مانگی ناوجەژنان کافرەکان لەبت پەرستیو کرداری خراپ نەگێڕایەوە، ئەوکارە ناشیرینانەی تێدا ئەنجام دەدەن، دەبێ پیرۆزیی ئەو مانگە ببێتە بەربەستو موسوڵمانەکان مەنع بکا لەوە کە بەرگریی لەخۆتان بکەن، شەڕو زیان لەخۆیان دوور بخەنەوە، وێرانکاری ئەوان ئاوەدان بکەنەوە.!؟).

﴿وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ﴾ هەرکەسێك ڕێزی خەڵکی بشکێنێ تۆڵەی لێ دەکرێتەوەو حورمەتی دەشکێندرێ!! مەبەست ئەوەیە مادام کافرەکان لەمانگی حەرامدا لە بەیتول حەرامدا لەکاتی ئیحرامدا شەڕیان لەگەڵ کردن ئێوە لەچوار چێوەی تۆڵە ستاندنەوەو بەرگریی لەخۆ کردندا شەڕیان لەگەڵ بکەن، ئەمجار ئەم مەعنایەی دووبارە کردەوەو فەرمووی: ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾ هەرکەسێك دەست درێژی کردنە سەر، ئێوەش بەئەندازەی دەست درێژیی کردنەکە تۆڵەی لێ وەربگرنەوە، واتە: دەست درێژییەك حەرامە لەسەرەتاوە بێ، ئەگەر لە چوارچێوەی تۆڵە ستاندنەوەبێ ئەوە هیچ حەرامییەکی تێدا نییەو بەدەست درێژی ناژمێردرێ!!

لەژێر رۆشنایی ئەم ئایەتەدا ئیمامی شافیعی (رەزای خودای لێ بێ) فەرموویەتی: ئەبێ بکوژ بەو شتە بکوژرێتەوە کە بەکاری هێناوە، بۆ کوشتنی کوژراوەکەی، ئەگەر ئەو خەڵکی سەربڕی بوو، دەبێ سەری ببڕنەوە، خەڵکی خنکاندبوو دەبێ بخنکێندرێتەوە. ئایەتەکە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ: کە شەڕکردن لەگەڵ دوژمندا وەکوو تۆڵە ستاندنەوە لە تاوانباران وایە. بە چ چەکێك لێت دەدەن دەبێ تۆش بەو چەکە لێیان بدەیەوە، کەسێك شەڕی لەگەڵ موسوڵمانەکان بەچەکی ئاگراوی‌و کیمیاوی‌و بایەلۆجی....هتد بکا پێویستە موسوڵمانانیش بەهەمان چەك شەڕیان لەگەڵدا بکەن، بۆئەوەی ستەمکارو ملهوڕان‌و دیکتاتۆرو هیتلەرەکان تەمێ بکرێن، واز لەستەمکاری خۆیان بهێنن!! ﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ لەخودا بترسن، نەخەڵەتابن دەست درێژی بکەن، بەجۆرێك کە رێگەتان پێ نەدرابێ، بزانن کە هەمیشە پەروەردگار لەگەڵ ئەوانەدایە کە دەست درێژی ناکەن‌و پابەندی فەرمانی خودان هەمیشە یارمەتیدەریانەو بەسەر دوژمنیاندا سەریان دەخا.

ئەمجار دوای فەرمانکردن بە جیهاد بە گیان‌و بەخوێن‌و خۆبەخت کردن فەرمان دەکا بەجیهاد کردن بە ماڵ‌و دارایی‌و دەفەرموێ: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ ماڵ‌و دارایی خۆتان لەپێناو پاراستنی قەوارەی ئاییندا خەرج بکەن، چەك‌و جبەخانە بکڕن سەربازو شەڕکەر ئامادە بکەن، هەموو کاتێ هەوڵ بدەن چەك‌و جبەخانەو هێزی سەربازییتان لەهی دوژمن ئەگەر زیاتر نەبێ کەمتر نەبێ، هەرگیز نەهێڵن دوژمن لەهیچ شتێکدا بەسەرتاندا باڵا دەست بێ‌و بەسەرتاندا زاڵ بێ. ﴿وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ نەکەن بەدەستی خۆتان خۆتان بخەنە ناو بارودۆخی نالەبارو تیاداچوونەوە.

چونکە ئەگەر ئێوە لەپێناو پارێزگاری لە ئایین ماڵ‌و دارایی خەرج نەکەن‌و خۆتان بەهێز نەکەن، ئەوە مانای ئەوەیە بەدەستی خۆتان خۆتان دەخەنە ناو تیاچوونەوە.

پوختەی قسە ئەوەیە، خوانەناسان زۆرن‌و هەمیشە لەکەمیندان، زۆرو پڕچەك‌و بەهێزن، ئەگەر موسوڵمانان پاڵی لێ بدەنەوەو خۆیان بۆ جیهادو بەرگری کردن ئامادە

نەکەن، دوژمنانیان زەفەریان لێ دەبینن و قەلاچۆیان دەکەن، ئیتر ئەوکاتە وەکوو ئەوە وایە بەدەستی خۆیان خۆیان بخەنە ناو توونی فەوتانەوە ﴿وَأَحْسِنُوَاْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ لەهەموو ئیش و کارێکتاندا بە سەلیقەو وردو کارزان بن. هیچ شتێکی باش پاشگوێ مەخەن، خۆبەخت کردن و ماڵ و دارایی سەرفکردن لەپێناو بڵاوکردنەوەی ئاییندا دەچێتە چوارچێوەی ئەم فەرمانە خودایییەوە.

## حوکمەکانی حەج و عەمرە

﴿ وَأَتِمُّواْ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِۚ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِۖ وَلَا تَحْلِقُواْ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْهَدْيُ مَحِلَّهُۥۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍۚ فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلْعُمْرَةِ إِلَى ٱلْحَجِّ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِۚ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِي ٱلْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْۗ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌۗ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِي ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١٩٦﴾ ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلْحَجِّۗ وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ

ٱللَّهُۗ وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰۚ وَٱتَّقُونِ يَـٰٓأُوْلِي ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٩٧﴾

لەسەرەتای پەیدابوونی ئایینی ئیسلامدا پێغەمبەرو هاوەڵانی لەگەڵ دوژمنانی ئاییندا دەجەنگان بە مەبەستی بەرگریکردن لە ئایینو حەقو حەقخوازانو بڵاوکردنەوەی ئایین!! لەسەرەتاوە بانگەوازییەکەیان بە قسەو بانگ کردنو بەڵگە هێنانەوەو وتو وێژ دەستی پێکرد، موسوڵمانان ئاشتیخواز بوون هەتا بە وتو وێژو بانگەوازی کردن خەڵک موسوڵمان بووبێ هەرگیز پەلاماری چەکیان نەداوە، هەر کاتێ موسوڵمان نەبوونایەو هەڕەشەیان لە بانگەوازی کەر بکردایە، یان بیان کوشتایەو شەڕیان لەگەڵ بکردایە موسوڵمانەکانیش شەڕیان لەگەڵ دەکردنو بە مەبەستی بەرگریکردنو پاراستنی بڵاوکەرەوانی ئایینو بڵاوکردنەوەی ئایین، نەك بە زۆر موسوڵمان کردنی خەڵك،چونکە بە زۆر موسوڵمان کردن بە گوێرەی دەقی قورئان یاساغە ﴿أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾ ئایا تۆ ئەی موحەممەد! دەتەوێ بەزۆر ئەو خەڵکە موسوڵمان بن؟ واتە: وا مەکە.

جا ئەگەر کەس نەبوو بەرەبەرەکانی بانگەوازیی ئیسلامی بکاو هەڕەشە لە هەڵگرانی بانگەوازیەکە بکاو دەستدرێژی بکاتە سەر موسوڵمانان. ئەوە ئەو کاتە جیهاد بۆ خوێن رشتنو پیاو کوشتنو تاڵان بردن دەبێ ئەویش حەرامە، بە کورتی شەڕ کردن لە ئیسلامدا دانراوە بۆ بەرگریکردن لە حەقو حەقخوازانو پاراستنی بانگەوازی ئیسلامیو بڵاوبوونەوەی بەناو ئادەمیزادا. کەوابوو پێویستە لەسەر ئەو کاربەدەستانەی ئیدیعای ئەوە دەکەن کە شەڕ لەسەر ئایین دەکەن، بانگەوازیی ئیسلامیی زیندوو بکەنەوە پێداویستیەکانی دابین بکەن، زانستو زانیاری بە گوێرەی رۆژگار بڵاوبکەنەوە، هەموو کاتێکیش ئامادە باش بن بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر دەستدرێژییەك کە بکرێتە سەر وڵاتی موسوڵمانان.

پێغەمبەریش دەفەرموێ: جیهاد تا رۆژی قیامەت بەردەوامە، بەڵام جیهاد تەنها بریتی نییە لە شەڕو لێکدانو کوشتنو بڕین، بەڵکوو بە گوێرەی کاتو شوێنو هەڵسوڕانو بەرژەوەندیی گشتیو تایبەتی دەگۆڕێ..

﴿وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ لە دوای روونکردنەوەی حوکمی رۆژوو باسی حوکمی حەجی کرد، چونکە ئەو مانگانەی خۆیان تێدا ئامادە دەکرێ بۆ حەجو حەجیان تێدا دەکرێدەکەونە دوای مانگی رەمەزان. ئەمجار باسی چۆنیەتی شەڕو حوکمی شەڕ کردن لە مانگەکانی حەرامدا بۆ کردین، ئەمجار گەڕایەوە سەر تەواوکردنی ئەحکامی حەجو دەفەرموێ: ﴿وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ کردارو گوفتارە پێویستیەکانی حەجو عەمرە بە تەواوی ئەنجام بدەنو لە دڵیشدا بە کردنی حەجو عەمرە مەبەستتان خوداپەرستیو رەزامەندی پەروەردگار بێ، نەك مەبەستتان کاسبیو بازرگانیو ریابازیو ناوو شۆرەت بێ، هەرچەندە کاسبیو بازرگانی نابنە کۆسپ لەبەردەم ئیخلاص بۆ خودادا چونکە قورئان دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلاً مِّن رَّبِّكُمْ﴾ بەڵام کەسێك بۆیە حەج بکا تا پێی بگوترێ: حاجی فلانو ناوو شۆرەت دەربکا، ئەوە حەجکردنەکەی خوداپەرستی نیەو گوناهبارییە، تەنانەت کەسێ بچێ بۆ حەجو مەبەستی سەرەکی زیارەتی پێغەمبەر بێ، یان گەشتو گوزار بێ، ئەوە حەجکردنەکەی خوداپەرستی نیە...

بێگومان حەجکردن هەر لە رۆژگاری حەزرەتی ئیبراهیمو ئیسماعیلەوە باوبووە. عەرەبەکانیش لەسەردەمی نەزانیدا، پێش هاتنی ئیسلام حەجیان دەکرد، کە ئیسلام هات هەندێ گۆڕانکاریی لە چۆنیەتی کردنەکەیدا کردو هێشتیەوە، بڕێ شتی لابردو بڕێ شتی لێ زیاد کرد..

حەج کردن یەکێکە لە پێنج روکنەکەی ئایینی ئیسلامو کەسێك دەسەڵاتی داراییو بەدەنی چوونو هاتنەوەی هەبێ، دەبێ حەج بکا، خودا دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً﴾ یەکەم حەجێك کە موسوڵمانان بە کۆمەڵیو بە ئاشکرا کردیان، ئەو حەجە بوو: کە ساڵی نۆیەمی کۆچی بە سەرۆکایەتی ئەبوبەکر

(رَضيَ اللهُ عنهُ) موسوڵمانان ئەنجامیان دا، کە وەکوو ڕێخۆشکەریەك وابوو بۆ حەجی ماڵئاوایی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە ساڵی دوایی،واتە ساڵی دەیەمی کۆچی ئەنجام درا، هەر لەو یەکەم حەجەدا ئەبوبەکر بە کافرەکانی ڕاگەیاند کە ئیتر چیتر بتپەرستو خوانەناس نابێ نزیك کەعبە ببنەوەو نابێ بە دەوری کەعبەدا بسوڕێنەوە، ئەم ئایەتەش هاتە خوارێ: کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلاَ يَقْرَبُواْ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا﴾.

## وەکوو گوترا حەج روکنی پێنجەمی ئیسلامەو بۆ خۆشی پێنج روکنی هەیە:

١- ئیحرام بەستن لە شوێنی ئیحرام بەستن.

٢- ڕاوەستانو مانەوە لە کێوی عەرەفە.

٣- سوڕانەوە بە دەوری کەعبەدا.

٤- هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە.

٥- ئیحرام شکاندن بەسەر تاشین یان بە کورت کردنەوەی مووی سەری.

﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ ئەگەر ئێوە مەنع کرانو گیرتان خواردو نەتانـدەتوانی کردارەکانی حەج تەواو بکەنو لە ئیحرامیشدا بوون، جا هۆی ئەو گیرخواردنە دوژمن بوو یان نەخۆشیو قاچ شکانو شتی وا بوو، ویستتان ئیحرام بشکێنن، ئەوە پێویستە کوشتیەك سەر ببڕن، بە گوێرەی بۆ هەڵسوڕانو دەسکەوتن وشتر بێ یان ڕەشەوڵاخ یان مەڕو بزن بێ،مەڕو بزن بۆ یەك کەسو وشترو ڕەشەوڵاخ بۆ حەوت کەس دەبێ، سەربڕینەکەش لەو شوێنە دەبێ کە لەمپەرەکەی تێدا پەیدا بووە، جا ئەو شوێنە ئەرزی حەرەم بێ یان دەرەوەی ئەرزی حەرەم بێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ساڵی شەشەمی کۆچی لە (حدیبیة) مەنع کرا هەر لەوێ کوشتیەکەی سەربڕیو ئیحرامەکەی شکاند، ئەو شوێنەش دەرەوەی ئەرزی حەرەم بوو، ﴿وَلاَ تَحْلِقُواْ رُؤُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ﴾ پەروەردگار ئیحرام بەستنی

داناوە بە نیشانەی چوونە ناو حەجو سەرتاشین، یان كورت كردنـەوەی مـووی سـەری داناوە بە نیشانەی رزگاربوون لە كاروباری حەج، كەواتە: مانای ئایەتەكە بەم جۆرەیە: ئیحـرام مەشـكێنن‌و لـە كاروبـاری حـەج دەرمەچـن هـەتاوەكوو كوشـتی سـەرنەبڕن‌و نەگەنە شوێنی خۆی، واتە: لەو شوێنەی گیرتـان خـوارد قوربانیەكـە سـەرببڕن، ئـەمجار ئیحرام بشكێنن ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾ ئەگەر یەكێك لە ئێوە لە حەجدا نەخۆش كەوت نەخۆشیەكەی وابوو پێویستی بە سەرتاشین بوو، یان سەری بریندار بوو، یان ئەسپێی تێدا بوو، یان توشی سەرئێشە بوو، ئەوە دەتوانێ سەری بتاشێ‌و فیدیە بدا كە بریتیە لەوە: یان سێ رۆژ بەرۆژوو بێ، یان خۆراكی شەش هەژار بداىیان بە گوێرەی بۆ هەڵسوڕان مەڕێك یان بزنێك سەرببڕێ ﴿فَإِذَا أَمِنتُمْ﴾ ئەگەر دڵنیابوون‌و ترسی دوژمنتان نـەما، یان لـە نەخۆشـیەكە چاك بوونەوە، ئەو لەمپەرەی رێگای تـەواوكردنی حـەجی لێ گرتبـوون نـەما، ئـەوە بـا هـەر یەكێ لە ئێوە ئاوا رەفتار بكا. ﴿فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ﴾ كەسێك ئیحرامی بە عـەمرە بەست‌و كارەكانی ئـەنجام دان ئـەمجار ئیحرامی شكاندو بـەبێ ئیحـرام رایبـوارد ﴿إِلَى الْحَجِّ﴾ تا كاتی حەج‌و ئەوجار بـەجیا ئیحرامی بـە حـەج بەسـت، هـەر لـە مەككەشـدا ئیحرامی بەست‌و نەچوو بۆ میقات[1] ئەوە ﴿فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ پێویستە چی بۆ هەڵسوڕا مەڕێك یان بزنێك بكاتە قوربانی‌و رۆژی جەژن سەری ببڕێ.

خۆ ئەگەر چوو بۆ میقات لەوێ ئیحرامی بەست ئـەوە بریتـی (فدیـة)ی لەسـەر نییە ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ﴾ كەسێك كوشـتی دەست نەكەوت، یان پارەی نـەبوو بیكـڕێ، ئـەوە دەبـێ (دە) رۆژ بـەرۆژوو بـێ سـێ رۆژیـان لـە حەج، كاتەكەشی تا رۆژی جەژن ماوەی هەیـە، حـەوت رۆژیـشیان كـە گەڕایـەوە ماڵـەوە بەرۆژوو دەبێ، دەتوانی لە گەڕانەوەشدا لە رێگا بەرۆژوو بێ ﴿تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ﴾ ئەوە

[1] - میقات چەند شوێنێكی دیاری كراون لـە دەوروبـەری مەككە هەركەسێ لـە لاوە بـچێتە مەككـەوە دەبێ لە یەكێ لەو شوێنانە ئیحرام ببەستێ

کردیه ده ڕۆژی تەواو، ئەوەندە هەیە دانیشتوانی مەککە چونکە هەر لەناو مەککەدا ئیحرام دەبەستن بە حەجو عەمرەو لەگەڵ حەجدا کاروباری عەمرەکەشیان جێبەجێ دەکەن ئەوان تەموتعوعیان بۆ نیەو (فیدیة) نادەن، بۆیە قورئان ئەم لایەنە ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو شێوە حەج کردنەو عەمرە کردنو قوربانی سەربڕینو فیدیە دانە ﴿لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ بۆ یەکێکە لە دانیشتووی دەرەوەی مەککە بێ، چونکە دانیشتوانی مەککە تەمەتووعو قیرانیان بۆ نیە ﴿وَاتَّقُواْ اللَّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ لە خودا بترسنو پابەندی فەرمانەکانی بن لە سنوور تێ مەپەڕن! بزانن: کە خودا سزای بە ئێشی هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە سنوور دەبەزێنن.

﴿الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ﴾ بۆ کاتی ئەنجامدانی حەج چەند مانگێکی تایبەت بۆ ئادەمیزاد دیاری کراونو دەیانزانن: کە مانگی (شەشەڵانو ذیلقە عیددەو ذیلحجە)ن هەر لەڕۆژگاری ئیبراهیمو ئیسماعیلەوە (سڵاوی خودایان لێ بێ) ئەم مانگانە بە مانگی حەج کردن زانراون، پێش هاتنی ئیسلام عەرەبەکان لەم مانگەدا خۆیان بۆ حەج ئامادە دەکردو حەجیان تێدا دەکرد: کە ئیسلام هات ئەوەی چەسپاندو پێی ڕازی بوو، کات دیاری کردنی حەج لەم مانگەدا ئاماژەیە بۆ ئەوە کە کردارەکانی حەج لەم مانگەدا نەبێ دروست نین. هەرچەندە ئیحرام بەستن بە حەج پێش هاتنی ئەم مانگەش دروستە وەکوو چۆن دروستە کە دەست نوێژ گرتن بۆ نوێژ پێش وەخت ﴿فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ﴾ کەسێك لەم مانگەدا حەجی لەسەر خۆی واجب کرد، بەوە کە ئیحرام ببەستێ یان قوربانی ڕاپێچ بکا لەگەڵ خۆیدا، یان دەست بکا بە گووتنی (لبیك اللهم لبیك)....هتد چونکە حەج عیبادەتێکە چوونە ناوو لێ دەرچوونی هەیە بەتەنها بەنیەت جێبەجێ نابێ، کەوابێ لەگەڵ نیەتەکەیدا دەبێ کردەوەیەك لەو کردارانەی لەگەڵدا بێ. جا کە دەستی بە کردارەکانی حەج کرد ﴿فَلاَ رَفَثَ﴾ نابێ لەگەڵ خێزانی خۆی جووت ببێ ﴿وَلاَ فُسُوقَ﴾ نابێ قسەو ناوو ناتۆرەی ناشیرین بەخەڵك بڵێ،

هەروەها نابێ لەو سنوورە دەرچێ کە شەرع بۆ ئیحرام بەستو داینـاوە. واتـە: نابـێ راو بکا، پۆشاکی دوراو لەبەر بکا، بۆنی خۆش لە خۆی بـدا ﴿وَلاَ جِـدَالَ فِـي الْحَـجِّ﴾ نابـێ کێشەو دەمەدەمێ‌و شەڕو تێك گیران لەگەڵ هاوەڵ‌و خـزم‌و خزمـەتکارو خـەڵکی تـردا بکا، دەبێ واز لەم جۆرە کردارانە بێنێ، چونکە رووی کردۆتـە پـەروەردگار بـە رواڵـەت میوانی خودایەو دەیەوێ رەزامەنـدی ئـەو بەدەست بێنـێ. دەبـێ واز لـە داب‌و نـەریتی رابوردووی لەززەت‌و خۆش رابواردنی دونیایی بێنێ، خۆ لـەو شـتانە دوور بخاتـەوە کـە هۆی خۆهەڵنانەوەو لە خۆبایی بوونن، بە جۆرێك کـە شـاو گـەدا، هـەژارو دەوڵەمەنـد پیرو جوان یەك پۆشاك لەبەر بکەن، ئەویش پۆشاکی ئیحرامـە، بەمـەش دڵ‌و دەروون خاوێن دەبنەوە، نیشانەی بەندایەتی بۆ خودا رادەگەیەنن.

ئیمامی موسلیم‌و بوخـاری لـە ئـەبو هـورەیرەوە حـەدیثێکیـان ریوایـوت کـردووە دەفـەرموێ: «مَنْ حَجَّ الْبَيْتَ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ خَرَجَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّـهُ». زیـاد لەوەش ئەم جۆرە هەڵس‌و کەوتە رێزگرتنی ماڵی خودای پێوە دیارەو تاوانکردن تێیـدا گوناهی گەورەترە: چونکە ئادەمی لەو کاتەدا کە عیبادەت دەکاو لـە خـودا دەپاڕێتـەوە، دەبی لەو پەڕی ئەدەب‌و حیشمەتدا بێ‌و لە ئامادەباشـیدا بـێ، چـونکە ئـادەمیزاد دەبـێ لـەناو کـۆڕو کۆبونـەوەدا ئـەدەب‌و حیـشمەتێك نیـشان بـدا کـە لـە کـاتی تـەنهایی‌و پەناگیریدا پێویست ناکا، ئەو ئەدەب‌و هەڵس‌و کەوتەی کە لـە کۆڕی پاشادا دەینوێنـێ لەگەڵ برادەرو هاوەڵانیدا زۆر پێویست نییە ﴿وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْـرٍ يَعْلَمْـهُ اللّـهُ﴾ واز لـە کێشەو جنێودان‌و لە خۆبایی بوون‌و راوکردن‌و خۆبۆن خـۆش کـردن بێـنن، بـۆ ئـەوەی دڵ‌و دەروونتان لـە پەڵـەو هەڵـەی دونیـایی پـاك ببێتـەوە. ئامـادە بـن بـۆ کـاری خێـرو چاکەو گەردنکەچ بـن بـۆ پابەنـدبوون بـە فـەرمانی شـەرع، خـودا بۆخـۆی ئاگـادارە بـە کردەو گوفتارتان‌و پاداشی چاکەو سزای خراپەتان دەداتـەوە ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَـإِنَّ خَيْـرَ الـزَّادِ التَّقْـوَى﴾ خوداپەرسـتی بکـەن بـە تێـشووی قیامـەتتان چـونکە چـاکترین تێـشوو خوداپەرستییە ﴿وَاتَّقُونِ يَا أُوْلِي الأَلْبَابِ﴾ راستاڵانە بەندایەتیم بکەن، ئەوەی لەسـەرم

پێویست کردوون بە رێكو پێکی ئەنجامی بدەن، ئەوەی لێم قەدەغە کردوون توخنی مەکەون، بەوە رزگارتان دەبێ لە رقو غەزەبی منو تووشی سزای من نابن، رەزامەندیو رەحمەتی منتان دەست دەکەوێ.

## پاشبەندییەك بۆ حوكمەكانی حەج

﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ۚ فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَٰتٍ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ ۖ وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿١٩٨﴾ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٩﴾ فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ۗ فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ﴿٢٠٠﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ

مِّمَّا كَسَبُواْ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾ ۞ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٍ مَّعْدُودَٰتٍ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ لِمَنِ ٱتَّقَىٰ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ ﴾.

ئەمجار وێ دەچێ لە ڕەوتی دەقەکانی پێشوودا وا گومان ببرێ کە بازرگانی لە حەجدا قەدەغەبێ، بۆیە بۆ ڕەواندنەوەی ئەو گومانە فەرمووی: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلاً مِّن رَّبِّكُمْ﴾ هیچ تاوانو لۆمەیەکتان نایەتە سەر ئەگەر لە ڕۆژانی حەج کردندا بازرگانی بکەنو خەریکی کاسبی بنو پارە پەیدا بکەن، بەمەرجێك مەبەستی سەرەکیتان لە چوونە حەج بازرگانی نەبێ، چونکە کاسبی کردن لەگەڵ نییەت باشیداو لەگەڵ بەبەرچاوگرتنی ئەوە کە نان پەیدا کردن نیعمەتێکی خودایییە، دەبێتە جۆرێك لە جۆرەکانی خوداپەرستی، بەڵام خۆ تەرخان کردن بۆ جێبەجێ کردنی کردارەکانی حەج لەو کاتانەدا لە کاسبی لەگەڵدا کردن باشترە..

﴿فَإِذَا أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَاتٍ فَاذْكُرُواْ اللّهَ عِندَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ﴾ کە لە کێوی عەرەفات هەڵڕژانە خوارێو داگەڕان بۆ موزدەلیفە (کێوی قوزەح) ئەوە ذیکری خودا بکەنو خەریکی شوکرو سوپاسی بن (لبیك اللهم لبیك..) بڵێنو لە ذیکرو یادکردنی مەوەستێنەوەو بەردەوام بن لەسەری ﴿وَاذْكُرُوهُ كَمَا هَدَاكُمْ﴾ یادی خودا بکەنو بە جوانی ناوی ببەن، وەکوو چۆن ئەو ڕێنمونی کردوونو ڕێگای ئیسلامیەتی فێر کردوون، بەو شێوەیەی فێری کردوون یادی بکەن، واتە: بەلالانەوەو شێوە پاڕانەوە هاواری لێ بکەن، ترستان لە سزاو تەماعتان لە بەخشیشیا هەبێ، نەچن وەکوو سەردەمی نەزانی هاوبەشی بۆ دابنێن ناوەندێ لە بەینی خۆتان ئەودا دیاری بکەنو

دڵتان بە ئەوەوە پەیوەند نەبێ... لەسەردەمی نەزانیدا دەیانگوت: (لبیك لاشریك لك إلا شریكا هي لك تملكه وما ملك) پەروەردگار ئەم جۆرە وتنەی لێ قەدەغە کردن. ﴿وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِ لَمِنَ الضَّآلِّينَ﴾ بێگومان ئێوە پێش ئەو رێنموویی کردنە گومڕاو سەرلێ شێواو بوون، بیروباوەڕتان شێواو کردارتان بتپەرستی بوو، هەمیشە ناوندو واسیتەتان لە نێوان خۆتانو خودادا دادەنا...

لەسەردەمی نەزانیدا قورەیشیەکان خۆیان بە زل دەزانیو هەرگیز لەگەڵ خەڵکەکەی تردا حەجیان نەدەکرد. عەرەبەکان لە عەرەفات ڕادەوەستانو قورەیشیەکان لە موزدەلیفە رادەوەستان، خۆیان لەوە بە گەورەتر دەزانی بچن لەگەڵ عەرەبەکانی تر لە عەرەفە بوەستن!! ئیتر ئیسلام بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە ئادەمیزاد هەموویان یەکسانن‌و رەچەڵەك‌و زمان‌و رەنگ جیاوازی ناخاتە ناویانەوە، کێ زیاتر خودا بپەرستێ ئەوە لای خودا رێزدارترو خۆشەویست ترە، بۆیە پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کرد کە بچێ لە عەرەفە لەگەڵ خەڵکەکە بوەستێ‌و دوایی لەگەڵ ئەواندا بێتە خوارێ بۆ موزدەلیفە، فەرمووی: ﴿ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ﴾ واتە: بچنە عەرەفە، لەگەڵ خەڵکەکە بوەستن‌و ئەمجار بە کۆمەڵ لە وێوە بڕژێنە خوارێ بۆ موزدەلیفە، ئەو خۆ بەزل زانیەی قورەیشیەکان قەڵاچۆ بکەن‌و ئەو دابە ناشیرینە بنبڕ بکەن ﴿وَاسْتَغْفِرُواْ اللّهَ﴾ داوای لێخۆشبوون لە خودا بکەن بۆ ئەوەی لێتان خۆش ببێ لەو گۆڕانکارییەی کە دوای ئیبراهیم‌و ئیسماعیل لە کاروباری حەجدا داتان هێناوەو شەریکتان تێیدا پەیداکردووە. ﴿إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگار دەرگای رەحمەت‌و لێخۆشبوونی فراوانەو کەسێك بگەڕێتەوە بۆلای‌و تۆبە بکا بە لێخۆشبوونی خۆی خەڵاتی دەکا.

لەسەردەمی نەزانیدا عەرەبەکان دوای تەواوبوونی حەج لە میندا کۆدەبوونەوەو دەستیان دەکرد بە خۆ هەڵکێشان‌و خۆهەڵنانەوە، هەریەکە لە عاست خۆیەوە باسی سەروەریەکانی باوك‌و باپیری خۆی دەکردو شانازی پێوە دەکردن‌و خۆی بەسەر

یەکێکی تردا رادەوەشاند! ئیتر پەروەردگار ئەم دابە ناشیرینەی قەدەغە کردووو فەرمانی بە موسوڵمانان کرد لە جیاتی ئەوە ذیکری خودا بکەن ﴿فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُواْ اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا﴾ کە لە ئیش‌و کاری حەج بوونەوە، یادی خودا بکەن، وەکوو چۆن لەوە پێش یادی باوك‌و باپیرانتان دەکردو بە شان‌و باڵتاندا هەڵدەگوتن. بەڵکوو هەوڵ بدەن لەوە زیاتریش ذیکری خودا بکەن.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە کە ئەوانەی ذیکری خودا دەکەن‌و لێی دەپارێنەوە دوو جۆرن:

١- ﴿فَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا وَمَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ﴾ ئەو موسوڵمانانەی ئامادەی حەج دەبن‌و بە باشی ئایین لە دڵیاندا جێگیر نەبووەو دەروونیان بە نووری ئایین رەوشەن نەبۆتەوە هەموو هەوڵ‌و تەقەڵلا و پاڕانەوەیەکیان بۆ دەوڵەمەندی‌و وەدەستهێنانی پلەو پایەو سەرکەوتن‌و گەیشتن بە مەرامی دونیایە. ئەوانە لە قیامەتدا لەو پاداش‌و نازو نیعمەتەی دەدری بە خوداپەرستان بەشیان نادرێ چونکە ئەوان هەموو هەوڵ‌و تەقەڵلایەکیان بۆ وەدەستهێنانی شتی دونیاییە، جا جاری وا هەیە بە ئاسانی دەستیان دەکەوێ وەکوو خودا لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاء لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُ جَهَنَّمَ يَصْلاهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا، وَمَنْ أَرَادَ الآخِرَةَ وَسَعَى لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا – الإسراء/ ١٨– ١٩﴾.

٢- ﴿وِمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً﴾ کۆمەڵێکی تر لە موسوڵمانان ذیکری خودا دەکەن‌و دەڵێن: پەروەردگار! لە دونیادا ژیانێکی بەختەوەرو خۆشمان بدەرێ... لە قیامەتیشدا ژیانێکی بەختەوەرو سەرفرازی وامان بدەرێ لێی رازی بین، ئاشکراشە داوا کردنی ژیانی خۆش لە دونیادا بەوە دەبێ کە داوا لە خودا بکەین هۆیەکانمان بۆ دابین بکاو هیدایەتمان بدا بۆ پەیرەو کردنی ئەو یاسایانەی کە پابەندبوون پێیانەوە دەبنە هۆی خۆش بەختی‌و کامەرانی ژیانی دونیا، داواکردنی

ژیانی بەختەوەریش لە قیامەتدا بەوە دەبێ کە بڕوامان بە خودا پتەو بێ، کرداری چاك بکەین، پابەندی ڕەوشتی بەرزو پیرۆز بین ﴿وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ پەروەردگار! بمانپارێزە لە ئارەزۆبازیو تاوانکردن؛ کە ئاکامەکەی چوونە ناو دۆزەخە.. ئەویش بە دوور کەوتنەوە لە گوناهو ئارەزۆی حەرام.

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەشی تێدایە کە زیادەڕەوی لە ئایینـدا پەسەند نیەو لە چوارچێوەی یاسای سروشتی دەچێتە دەرێ ﴿أُولَئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُواْ﴾ ئەوانەی کە لە خودا داوای ژیانی خۆشو کامەرانی هەردوو جیهان دەکەن بە گوێرەی هەوڵو تێکۆشانی خۆیان بەشیان دەدرێو ستەمیان لێ ناکرێ.

﴿وَاللّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾ خودا دادگایی کردنی بەندەکانی زۆر خێرایەو هەموو کەسێك پاداشو سزای کردەوەکانی خۆی وەردەگرێتەوە، سوننەتی خودا وەهایە دوای کردەوە پاداش یان سزا دەداتەوە بە ئادەمیزاد، خێرایی حیسابو لێکۆڵینەوەش بەوە دەبێ هەموو کەسێك کرداری خۆی ببینێو بزانێ چی کردووەو چی نەکردووە، ئەمەش هەمووی لە ماوەیەکی زۆر کورت دا ئەنجام دەدا، لە فەرمودەیەکی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هاتووە دەفەرموێ: (پەروەردگار هەموو بەندەکانی خۆی لە ماوەی کەمتر لە نیو ڕۆژدا دادگایی دەکا).

قسەش هەیە دەڵێ: دوای ئەوەی پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانەکان کرد کە ذیکری بکەن لەلای (مشعر الحرام) کە لەوە پێش عەرەبەکان ناوی خودایان لێ دەهێنا، ئەمجار فەرمانی پێ کردن: کە لەدوای تەواوکردنی کردارەکانی حەج لە مینا لە جیاتی خۆهەڵکێشانو بەخۆ نازینو پیاهەڵدانی باوكو باپیرانیان، یادی خودا بکەنو دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرُواْ اللّهَ فِي أَيَّامٍ مَّعْدُودَاتٍ﴾ ذیکری خودا بکەن لەچەند ڕۆژێکی دیاریکراوو ژمێراودا. واتە: لە ڕۆژانی مانەوەتان لە مینا کە ڕۆژی یانزەی (ذي الحجة) دەست پێ دەکات تا ڕۆژی سیانزەی ئەو مانگە واتە: سێ ڕۆژەی دوای جەژن کە پێشیان

دەگوترێ (أيام التشريق) لەو رۆژانەشدا حاجیەکان قوربانی سەردەبڕن بەردەبارانی شەیتان دەکەن..

ذیکر کردنی خودا لە رۆژی عەرەفەو جەژندا بۆ کەسێك لە حەج نەبێ (الله أكبر) کردنە بۆ حاجیش (الله أكبر) کردنو (لبيك) کردنە.

دەقی (الله أكبر) کردن وەکوو لە پێغەمبەرەوە گێڕدراوەتەوە ئاوایە: (الله أكبر ... لآ إله إلآ الله ألله أكبر ولله الحمد) دەقی (لبيك) کردنیش بەم جۆرەیە (لبيك أللهم لبيك لآ شريك لك لبيك إن الحمد والنعمة لك والملك لآ شريك لك) ئەمجار دەفەرموێ: ﴿فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ کەسێك پەلەبکا بیەوێ تەنیا دوای جەژن دوو رۆژ بمێنێتەوە دوو جار بەردبارانی شەیتان بکا.. واتە: یانزەو دوانزەی مانگ لەوێ بێ رۆژی سیانزەهەم پێش ئەوەی خۆر ئاوا بێ دەبێ مینا بەجێ بێڵێ.

ئەگینا ئەگەر مایەوە تا رۆژ ئاوا بوو ئەوە دەبێ بمێنێتەوەو رۆژی سێیەمیش شەیتان رەجم بکا، جا پێش نیوەڕۆ بیکا یان دوای نیوەڕۆ هیچ گوناهی تێا نیە، ئەم تەخیرو سەرپشکی کردنەو گوناه نەبوونەی بۆ کەسێکە عەجەلە دەکات، یان لە مینا دەمێنێتەوە بۆ رۆژی سێیەم ﴿لِمَنِ اتَّقَى﴾ بۆ کەسێکە تەقوای خودا بکاو خۆی دوور بگرێ لەو شتانەی کە نەیی لێ کردووە، چونکە تەقواکەر حاجی راستەقینەیەو مەبەستیش لە هەموو خوداپەرستییەك تەقوا کردنە، تەقواش بەوە دەبێ هەموو کاتێ بەدڵ خودات لەبیر بێ، بە زوبانیش شوکرو سوپاسی بکەی ﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ تەقوای خودا بکەن لە کاتی بەجێهێنانی کاروباری حەجو لە هەموو شوێنێکی تردا، بزانن ئێوە لای پەروەردگار کۆ دەکرێنەوەو رۆژی قیامەت بۆ حیسابو لێکۆڵینەوە زیندوو دەکرێنەوە، سەرنجامیش بۆ خوداپەرستانەو هەر ئەوان سەرفراز دەبن، پەروەردگار ئەوەندە وشەی ذیکرو تەقوای دووبارە کردەوە بۆ ئەوەی پلەیان دیاری بکاو تێمان بگەیەنێ کە گرنگترین شت لە عیبادەتا ذیکری خودایە کە نەفسی

ئادەمی رام دەکاو دڵو دەروون بۆ کاری خێر هەڵدەنێو لە شەڕو خراپەکاری دووریان دەخاتەوە، هەرکەسێکیش ئاوا بکا دبێتە تەقواکار.

## ئادەمیزاد دوو جۆرن یا دوو ڕوو خوانەناسن، یان موسوڵمانو راستاڵن

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِۚ فَحَسۡبُهُۥ جَهَنَّمُۖ وَلَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿٢٠٦﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٢٠٧﴾ ﴾.

پەروەردگار لە ئایەتەکانی پێشوودا ئەوەی روونکردەوە کە ئادەمیزاد لەکاتی حەجکردن دا دوو جۆرن، هی وایان هەیە لەخودا دەپاڕێتەوە: کە ژیانی دونیای بۆ خۆش بکا، هی وایشیان هەیە لەخودا دەپاڕێتەوە لە قیامەتدا بەختەوەری بکا! ئەوەشی روون کردەوە کە مەبەست لەهەموو خودا پەرستیو عیبادەتێك تەقواکردنو لەخودا ترسانە.

ئەمجار لێرەدا دوو جۆرە ئادەمی تر باس دەکاو بە تەرازووی تەقوا دەیانکێشێ‌و دەست نیشانیان دەکا. ئەم دوو جۆرەش؛ دووڕوو موسوڵمانن، دووڕوو ئەوەیە شتێك بەدەردەخا جوداوازە لەوەی کە لەناو دڵیدایە! موسوڵمانیش ئەو کەسەیە ڕاستاڵ‌و خودا پەرستەو بەکارو کردەوەی مەبەستی ڕەزامەندی خودایە!

ئیبنو جەریر لە (السدی)یەوە دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٢٠٤ ٢٠٦) دەڵێ: ئەخنەسی کوڕی شورەیقی (الثقفي) هاتە خزمەت پێغەمبەر (درووی خوای لەسەر بێ) بەڕواڵەت موسوڵمان بوو، دوایی ڕۆیی، لەکاتی گەڕانەوەیدا بۆ شوێنی خۆی بەلای زەوی‌و زارو کشت‌و کاڵی موسوڵمانان‌و مێگەلە حوشترێکیاندا تێپەڕی ئاگری لە کشت‌و کاڵەکە بەرداو وشترەکانیشی سەربڕین، ئیتر ئەم ئایەتانە هاتنە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ هەندێ ئادەمیزاد هەن بەقسە هیچیان نەهێشتۆتەوە، کە گوێ لە گوفت‌و گۆی دەگری سەرت لێ سوڕدەمێنێ، چونکە واخۆی پیشان دەدا کە یارمەتیدەری حەق‌و ڕاستییەو حەزی لە ئاشتی‌و کامەرانییەو دەیەوێ کۆمەڵگای بەختەوەر بژین، جار جارەش بۆئەوەی پێی باوەڕ بکرێ ﴿وَيُشْهِدُ اللَّهَ عَلَى مَا فِي قَلْبِهِ﴾ سوێند بەخودا دەخوا لەسەرئەوە چی بەدەم دەیڵێ بەدڵیش هەر هەمان ڕای هەیە، بەڵام لەڕاستیدا ﴿وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ﴾ ئەو خوا نەناسەو لەهەموو کەس زیاتر دوژمنی گەل‌و کۆمەڵە ﴿وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ﴾ هەر لەگەڵ پشتی هەڵکردو لەبەرچاوی کۆمەڵ هوون بوو چووەوە لای هەوادارانی خۆی یان لێپرسراوییەکی پێ سپێردراو دەسەڵاتی درایە، هیچ هەوڵ‌و کۆشش بۆ ئاشتی‌و ئارامی نادا، بەڵکوو هەر خەریکی تێکدانی وڵات‌و کۆمەڵە، هەر خەریکی چاندنی تۆوی دووبەرەکی‌و قەڵاچۆکردنی کشتوکاڵ‌و بەروبووم‌و چەوسانەوەیە ﴿وَاللَّهُ لاَ يُحِبُّ الفَسَادَ﴾ بێگومان خودا فەسادو ئاژاوەو تێکدانی سیستەمی ژیانی پێ ناخۆشە. ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللَّهَ﴾ جا ئەگەر یەکێك بەرپەرچی بداتەوە، بڵێ: کابرا لەخودا بترسە چی دی ئەم گەل‌و وڵاتە ئاوارەو بەربادو

ویران مەکە، یان یەکێك لێی بگاتە ئێسقانو بەرەو رووی ئەم زلحۆرتە لە خۆڕازیو لەخۆ رادیوە ببێتەوە، فەرمانی پێبکا بەچاکەو نەهی لێ بکا لەخراپە ﴿أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالإِثْمِ﴾ خێرا رقی هەڵدەستێو هەڵدەچێو بەلایەوە گرانو نەنگییە یەکێك پێی بڵێ: وابکەو وامەکە، چونکە پێی وایە ئەو زۆر لەوە بەرزترە یەکێك زاتی بێنێ ئامۆژگاری بکا، هێندە لووتبەرزو لەخۆڕادیوە، نایەوێ کەس دەست بەر دەستی بێنێ. ﴿فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾ ئەم گێرە شێوێنە دوا خانووی ئاگری دۆزەخەو سزای کردەوەکانی خۆی وەردەگرێت. ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاء مَرْضَاتِ اللّهِ﴾ هەندێ ئادەمیزادی تر هەن پێچەوانەی کۆمەڵی رابردوو، ئەمانە کۆمەڵێکن لەپێناو بەدەستهێنانی رەزامەندی پەروەردگاردا خۆیان بەخت دەکەن، هەمیشە لەڕێگای خودادا خەریکی تێکۆشانن بۆ چەسپاندنی حەقو دادپەروەریی، فەرمان دەکەن بەچاکەو نەهی دەکەن لەخراپە. هەردەم خەریکی ئیشو کاری چاکەو قسەی خێرو باشن، راستگۆو راستاڵن لە کردارو گوفتاردا، دوو زمانو دووڕوو نین بریقو زەرقی دونیایی لەکاری قیامەتو رازی کردنی خودایان غافڵ ناکا، ﴿وَاللّهُ رَؤُوفٌ بِالْعِبَادِ﴾ خوداش پاداشیان بە نیعمەتو خۆشی هەتا هەتایی بەهەشت لەبەرامبەر کردەوەی کەمیاندا دەداتەوەو زیاد لە وزەو توانای خۆیانیان لێ داواناکا، رەحمەتو بەزەیی خۆی دەبارێنێ بەسەریاندا، ئەگەر رەحمەتی فراوانو بەزەیی ئەو نەبوایە خراپەکاریی خراپەکارو ئاشووب گێڕانی کۆمەڵی یەکەم زاڵ دەبوو کۆمەڵگایان ویران دەکردو دونیا خراپ دەبوو.

## بانگەوازی یەزدان بۆ ئادەمیزادان کەبێنە ژێر ئاڵای ئیسلامەوەو شوێن ئەحکامەکانی بکەون

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدْخُلُواْ فِى ٱلسِّلْمِ كَآفَّةً وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ

﴿٢٠٨﴾ فَإِن زَلَلْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْكُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٠٩﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٢١٠﴾ سَلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍ ۗ وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢١١﴾ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ۘ وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢١٢﴾

له ئایەتەكانی پێشوودا ئەوەی روون كردەوە كە ئادەمیزاد لە چاكەو خراپەدا دوو جۆرن: كۆمەڵێك فەساد بڵاودەكەنەوەو ئاوەدانی كوێر دەكەنەوە، كۆمەڵێكیش هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەن خودا لەخۆیان رازی بكەن‌و كرداری چاك ئەنجام بدەن.

ئەمجار لەم ئایەتەدا ئەوە دەچەسپێنێ: كە پێویستە موسوڵمانان یەك هەڵوێستو یەك ریزبن، تەباو هاودەمو پشتیوانی یەكتریی بن، بۆیە داوای لەهەموو بەرەی ئادەمیزاد كردو فەرمووی:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ادْخُلُواْ فِي السِّلْمِ كَآفَّةً﴾ دەڵێن: ئەو ئایەتە دەربارەی عەبدوڵڵای كوڕی سەلامو هاوەڵانی جولەكەی هاتۆتە خوارێ. كە موسوڵمان بوون‌و

ئیمانیان بە شەریعەتی (محمد) هێناو شەریعەتی موساشیان پەیڕەو دەکرد. ڕۆژی شەممەیان بەلاوە بەڕێز بوو، شەممەیان دەگرتەوە، بێزیان لەگۆشتی وشتر بوو، شیرەکەیان نەدەخواردەوە، موسوڵمانان گلەییان لێ کردن ئەوانیش وتیان: ئێوە حەقتان چیە؟ ئێمە ئەمەش دەکەین‌و ئەوەش دەکەین، بە پێغەمبەریان گوت: تەورات نامەی ئاسمانییەو لێمان گەڕێ با پەیڕەوی بکەین، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ‌و فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ادْخُلُواْ فِي السِّلْمِ كَآفَّةً﴾ ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوەو لەوەپێش لەسەر ئایینی جولەکە بوون. بەردەوام بن لەسەر ئیسلام هەمووتان گەردنکەچی فەرمانی خوداین‌و لەهەموو شتێکدا هەمووتان بەدڵ‌و بەگیان بچنە ژێر ئالای ئیسلامەوە، لەهەموو ڕوویەکەوە ئیسلام وەربگرن‌و شتی تری تێکەڵاو مەکەن، هەرچی ئیسلام فەرمانی پێ کردوون بە ئوصول‌و فروعەوە ئەنجامی بدەن، چاودێریی ئیسلام‌و یەکیەتی موسوڵمانان بکەن. ﴿وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ﴾ شوێن هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون‌و بەڕێبازی ئەودا مەڕۆن‌و پارچە پارچەو کۆمەڵ کۆمەڵ مەبن، دووبەرەکیی‌و جوداوازیی لە ئاییندا بەرپا مەکەن، ئاگاتان لەخۆتان بێ، شەیتان هەڵتان نەخەڵەتێنێ، چونکە بە حیلەو فێڵبازیی ڕێگای خراپتان بۆ جوان دەکا، خراپەتان لەپێش چاو شیرین دەکا، ئادەمیزاد لە ڕێبازی ڕاست لادەدا، دوو بەرەکی دەخاتە ناو کۆمەڵەوە، وەکوو ئەو حاڵە تاڵەی جولەکەتان بەسەر دێ کاتێك لەفەرمانی خودا دەرچوون‌و دەستکاری تەوراتیان کرد، هەندێکیان لێ زیادکردو هەندێکیان لێ لابردو هەڵەو گێڕیان لە حوکمەکانیدا کردو سەرەنجام پارچە پارچە بوون‌و کێشەیان تێ کەوت‌و یەکیەتییان لێك ترازاو دوژمنیان بەسەردا زاڵ بوو، خودا پەرتەوازەی ناو جیهانی کردن ﴿إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ بێگومان شەیتان دوژمنی ڕاستەقینەو سەرسەختی ئێوەیە.

ئەمجار بۆئەوەی موسوڵمانانیش وەکوو جولەکەکانیان لێ نەیەو بەدەردی ئەوان نەچن، لەم ئایەتەی دواییدا ئەم هەڕەشە قورسەیان لێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَإِن زَلَلْتُمْ مِّن بَعْدِ مَا جَاءتْكُمُ الْبَيِّنَاتُ﴾ ئەی گرۆهی موسوڵمانان! ئێوەش ئەگەر لەڕێگەی ڕاست

لابدەن‌و حەق پاش گوێ بخەن‌و لە ڕێبازی خودا کە ئیسلامییەتە دوور بکەونەوە، دوای ئەوەی کە قورئانتان بۆ هات‌و نیشانەی زۆرو زەبەندەتان لەخوداوە لەسەر ڕاستی‌و دروستی ئەو ڕێبازە بۆ روون کرایەوە، کەچی ڕێبازی شەیتان بگرن کە ڕێگای کێشەو دووبەرەکی‌و جوداوازییە ﴿فَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ ئەوە باش بزانن: کەخودا بەتواناو دەسەڵاتە، کەس نییە بتوانێ بەربەرەکانی بکاو لەژێر دەستی دەربچێ، دەتانگرێ‌و تۆڵەتان لێ دەستێنێ (حکیم) هەموو کارێکی پڕ حیکمەتەو هەموو شتێك لەشوێنی خۆیدا ئەنجام دەدا، گوناهبار پاش گوێ ناخا، بەڵکوو دەیگرێ‌و لەدونیاو قیامەتا سزای دەدا. ئەمجار پەروەردگار لە هەڕەشەکردنەکەی زیاد دەکاو بە تەوسەوە بەو بەناو موسوڵمانانە دەڵێ: کە ڕێگای یەکیەتی‌و تەبایی‌و برایەتی ناگرنە بەرو هەمیشە جەنگ‌و ئاژاوە دەنێنەوە، هەروەها ئەوانەی کە بانگەوازی ئیسلامیی بەدرۆ دەخەنەوەو پاش ئەو هەموو بەڵگەو دەلیلانەی کە ڕاستی بانگەوازی (محمد) دەچەسپێنن، ئەوانەی لە فەرمانی خودا دەرچوون بەتەوسەوە پێیان دەڵێ: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ﴾ ئەوە ئەوانە چاوەڕوانی چی دەکەن بەتەمای چین؟! ﴿إِلاَّ أَن يَأْتِيَهُمُ اللّهُ﴾ مەگەر بەتەمای ئەوەبن‌و چاوەڕوانی ئەوەبن‌و چاوەڕوانی بکەن کە سزای خودایان بۆ بێ ﴿فِي ظُلَلٍ مِّنَ الْغَمَامِ﴾ لەناو چەند پەڵە هەورێکی سپی کە بەڕواڵەت بارانـاوین‌و چاوەڕوانی خێرو بەرەکەتیان لێ دەکرێ ﴿وَالْمَلآئِكَةُ﴾ فریشتەی سزایان بێتە سەرو ئەوەی خودا لەچارەی نووسیون بەسەریاندا ئەنجام بدەن‌و کار لەکار بترازێ‌و پەشێمان بوونەوە سوودی نەمێنێ، قیامەت هەڵسێ ﴿وَإِلَى اللّهِ تُرْجَعُ الأُمُورُ﴾ لەکۆتاییدا هەموو شتێك بۆ لای پەروەردگار دەگەڕێتەوە، ڕۆژی قیامەت هەرکەسە بە پاداش‌و سزای خۆی دەگا، خودا هیچی لێ ون نابێ‌و هەموو شتێك دەخاتە ئەو شوێنەی بۆی دیاری کردووە، چونکە خۆی لەسەرەتادا بەدیهێنەرەو لە کۆتاییشدا هەر خۆی کارسازو کار دروستە.

﴿سَلْ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَمْ آتَيْنَاهُم مِّنْ آيَةٍ بَيِّنَةٍ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! پرسیار لەو ئەوە ئیسرائیلییە هاوچەرخانەت بکە دەربارەی ئەو هەموو نیشانەو بەڵگانەی

دابوومانــە بــاوك‌و بــاپیران‌و پێـشینانیان ئـەو هــەموو پێغەمبەرانــەمان بــە بەلگـەی ئاشکراوە بۆ سەر ناردن، بـە باشـی ئـەو پەیامـەی ئێمـەیان پـێ راگەیانـدن‌و لێـی حـاڵی بوون، کەچی پابەندی ئامۆژگاری‌و پەیامەکانیان نـەبوون، سەرپێچییان کـردو ئێمـەش بەهۆی ئەو گوناهانەیانەوە گرتمـانن‌و سـزای شیاوی خۆیانیـان وەرگـرت‌و چارە رەشـی دونیاو قیامەت بـوون. ئایـا ئـەم نەوانـەی ئێستایان کـە هاوچەرخی ئێوەن بیریـان لـە سـەرەنجامی ئـەو رابوردوانـەی خۆیـان کردۆتـەوەو پەنـدیان لێ وەرگرتـوون‌و وازیـان هێناوە لەو سەر سەختی‌و بوغرایی‌و سەرپێچیکردنەی ئەوان لەسەری بوون؟ ئایا کـاری وادەکەن بۆئەوەی چی بەسەر ئەوان هاتووە بەسەر ئەمان نەیە؟! واتە: با ئەمان وەکوو ئەوان نەکەن‌و گەردن کەچی فەرمانی خودا بن، تا بەختەوەری دونیاو قیامەت بن!!

ئەمجار هەڕەشە لەوانـە دەکا کـە دەیانـەوێ دژ بـە ویـستی خـودا رەفتـار بکـەن‌و نیشانەکانی خودا کە ناردوونی ببنە رێنومایی کەر بیانگۆڕن، دەفەرموێ: ﴿وَمَـن يُبَـدِّلْ نِعْمَةَ اللَّهِ مِن بَعْدِ مَا جَاءَتْهُ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ هەرکەسێك نیشانەو بەهرەی خودا کە ئیمان‌و ئاشتییە بگۆڕێ بە گومرایی‌و جـەنگ، لـەجیاتی ئـەوە ئـەو بەهرانـە بـڕوای بـە خـودا پتـەو بکـەن‌و ئاشـتی لـە دڵیـدا بـڕوێنن، زیـاتر پێیـان گـومڕا دەبـێ‌و لایـەنی شەڕەنگێزیی لە دڵ‌و دەروونیاندا کڵپە دەستێنێ!!

هەرکەسێك دوای ئەوەی بەلگەی ئاشکراو نیشانەی راستی بۆ هـات، ئـەمجار پـشت هەڵکاو گـەردن کـەچ نـەبێ، ئـەوە بێگومـان دسـتی تۆڵـەو سـزای پـەروەردگار دەیگاتـێ‌و رزگاری نابێ.

ئایەتەکە هەڕەشە لە موسوڵمانانی سەردەم دەکا، ئەوانەی قورئانیـان بـۆ هـاتووە، داوا لـە ئەوانـە دەکـا، کـە بـەهرەی خـودا نـەگۆڕن، چـونکە ئەگـەر بیگـۆڕن بـە دەردی جولەکەکان دەچن، ئێستاش کە دەبینین موسوڵمانان رۆژ بە رۆژ لە کزی دان‌و وڵاتیـان داگـیر دەکـرێ‌و دەسـەڵاتیان لێ دەسـتێندرێ‌و ئـەومیان بەسـەر هـاتووە کـە بەسـەریان هاتووە،، هەمووی سەرەنجامی ئەومیە کە پـەیامی ئیـسلامیان پـاش گـوێ خـستووەو لـە قورئان دوور کەوتوونەوە، ئەو بەهرەیـەی کـە خـودا بـۆی دیـاری کـردوون گۆڕیویانـەو

گوێ بیستی ئایەتی ﴿وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ وَاذْكُرُواْ نِعْمَةَ اللّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاء فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا﴾ نەبوون، پەیڕەوی ئەم فەرمانە ناکەن.

﴿زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا﴾ سروشتی ئەو خوانەناسە سەرسەختانە وەهایە کە زۆر دونیایان خۆش دەوێ‌و لە پێش چاوانیان جوانە، خۆشەویستیەکەی لە دڵیاندا جێگیر بووە، بە جۆرێك خۆی بۆ بەخت دەکەن،لە هەموو شتێکیان بەلاوە گرنگترە، تەنانەت لە بەهەشت‌و خۆشیەکانی ئەو دونیاشیان بەلاوە لەپێش ترە، چونکە بڕوای تەواویان بە ڕۆژی دوایی نیە، بۆیە شوێن بیرو بۆچوونی نادروست‌و خەیاڵ‌و ئومێدی پڕوپووچ کەوتوون ﴿وَيَسْخَرُونَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ قەشمەری بە بڕواداران دەکەن‌و گاڵتەیان بەو موسوڵمانە هەژارانەی وەکوو عەبدوڵلای کوڕی مەسعودو عەممارو صوهەیب دێ، کەوا خۆشی دونیاییان بەلاوە ناوەو خۆیان بۆ خوداپەرستی ماندو دەکەن، دەوڵەمەندە موسوڵمانەکانیشیان بەلاوە سەیرە کە بە خۆشی ڕانابوێرن هەر خەریکی خۆ ئامادە کردن‌و توێشوو ناردنن بۆ پاش مردنیان، بیرو باوەڕیان بە خودا بەهێز دەکەن، کرداری باش ئەنجام دەدەن پابەندی ڕەوشت‌و ئەخلاقی بەرزن ﴿وَالَّذِينَ اتَّقَواْ فَوْقَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ ئەوانەی خوداپەرست‌و تەقواکارن‌و ڕۆژی قیامەت پلەو پایەیان لە زوور کافرو خودا نەناسەکانە.

جا ئەگەر برێ لەو کافرانە بە ڕواڵەت‌و بۆ ماوەیەکی کەم دەست ڕۆیشتوو ترو دەوڵەمەندتر بن، یا پلەو پایەیان بەرزتر بێ، دۆست‌و برادەریان زۆرتر بن، ئەوە شتێکی کاتییەو ماوە کورتەو پایەدار نیە.

موسوڵمانانی تەقواکارو خودا پەرست ڕۆژی قیامەت پلەو پایەیان زۆر لەزوور ئەو کافرانەوە دەبێ‌و لای خودای خۆیان زۆر ڕێزیان لێ دەگیرێ؛ ئەوان لەزوور (علـیین)ن کە شوێنێکی زۆر خۆشی بەهەشتەو کافرەکان لەچاڵی ناهەمواری دۆزەخدان؛ ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ اتَّقَواْ﴾ نەی فەرمووە: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ﴾

ئاماژەیە بۆئەوە کە ئەو پلەو پایەیە بۆ ئیماندارانی تەقواکارو خودا پەرستە، واتە: ئیمان بەتەنیا هیچ نییە دەبێ کردەوەی تەقوای لەگەڵدابێ، دەبێ بیرو باوەڕیان لەخودا پەرستییەکەیاندا رەنگ بداتەوە، هەروەها ئاماژەشە بۆئەوەی کە ئەوانەی شێت‌و شەیدای زەرق‌و بەرقی دونیان‌و لافی ئیمانداری لێ دەدەن‌و خۆیان بەخاوەن بیرو باوەڕ دەزانن، چونکە لەناو کۆمەڵێکدا پێگەیشتوون پێیان دەڵێن خاوەن کیتاب (أهل الکتاب) ئەوانە رۆژی قیامەت بیرو باوەڕەکەیان هیچ ئیعتبارێکی پێ ناکرێ ﴿وَاللّهُ یَرْزُقُ مَن یَشَاء بِغَیْرِ حِسَابٍ﴾ پەروەردگار لەدونیاو لەقیامەتدا رزق‌و رۆزیی دەدا بەهەرکەسێك ئارەزۆی بێ بەبێ حیساب، واتە: بێ لێ پرسینەوە کەس نییە بڵێ: بۆ دەیدەیە؟ یان بۆ ئەوەندەی دەدەیە؟! یان خودا رزق‌و رۆزیی بێ شمار دەدا بەوکەسانەی ئارەزۆی لێ بێ لەدونیاو قیامەتدا.

## پێویستی ئادەمیزاد بۆ پێغەمبەران‌و ئەو گیرو گرفتانەی تووشی خۆیان‌و شوێنکەوتوانیان دەبن

﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۚ وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَـٰتُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ

مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢١٣﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار فەرمانی بەو ئادەمیزادانە کرد کە ئیمانیان بە پێغەمبەر هێناوە کە هەموویان بە دڵو بە ئیخلاصو بێ منجەمنج لە هەموو روویەکەوە بچنە ژێر ئاڵای ئیسلامەوەو هەموویان یەك هەڵوێستو یەك ریزو یەك مەبەست بن، چونکە کەسێك لە خوداوە رێنمونیی بۆ بێ، پێویستە کردەوەیەك نەکا کەسەر بکێشێ بۆ دووبەرەکیو نیزاع، بەڵکوو ئەرکی سەرشانیەتی: کە بە گوێرەی پەیامی خودای خۆی رەفتار بکاو هەڵسوکەوت بنوێنێ!

ئەمجار باسی ئەوەی کرد کە سەرپێچیکەران لە ژیاندا هەموو کردەوەیەکیان بۆ دابین کردنی خۆشیە کاتیەکەیانەو کەسێکیش ئەمە حاڵی بێ هەمیشە دووچاری کێشەو نیزاع دەبێ، ئەمجار دێتە سەر ئەوە: کە شوێنکەوتنی پێغەمبەرانو پەیڕەو کردنی پەیامەکەیان پێویستیەکی گرنگی ئادەمیزادە، چونکە خودا بڕیاری داوە کە ئادەمیزاد بە کۆمەڵیی بژینو هاریکاری یەکتری بکەنو فەرمووی: ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾ ئادەمیزاد لە حاڵێکدا بوون پێویستیان بە رێنومایی خودا هەبوو، پەروەردگاریش پێغەمبەرانی یەك لە دوای یەك بۆ ناردن، موژدەدەرو ترسێنەر بوون، بۆ ئەوەی لە تاریکی نەزانیو سەرگەردانی رزگاریان بکەنو کێشیان بکەن بۆ رۆشنایی ئایین!! ئەم پێغەمبەرانەشی بۆیە ناردوون تا ئادەمیزادان بەهانەیان نەمێنێو نەڵێن: ئێمە هیچمان پێ نەگەیشتووە! هەندێ لەو پێغەمبەرانە کتێبی ئاسمانیشمان بۆ

ناردوون بۆ ئەوەی بە پێی ئەو پەیامە خەڵکەکە شارەزای ئایین بکەن.. دەی دەبێ ئەو حاڵەی پێش هاتنی پێغەمبەران ئادەمیزاد تیایدا بوون چۆن حاڵەتێك بووبێ؟؟ هەڵسوکەتیان چۆن بووبێ؟!

زۆربەی راڤەکەرانی قورئان دەڵێن ئادەمیزاد لەسەرتادا یەك ئایینو یەك یاساو یەك بیروباوەڕی قایمو پتەویان هەبووە، ئەویش ئایینی ئیسلام بوو، دوایی ئادەمیزادەکان کێشەیان تێکەوت، ئەمجار پەروەردگار پێغەمبەرانی ناردن؛ مزگێنی بدەن بە بڕوادارو چاکەکاران لە هەمان کاتدا سەرلێ شێواوو گومڕایان لە سزای خۆی بترسێنێ..

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە دەگێڕنەوە: کە فەرموویەتی: لە نێوان رۆژگاری نوحو ئادەمدا دە سەدە بووە هەموو ئادەمیزادەکانی ئەو چەرخانە لەسەر یاسای حەقو خوداویست بوون، دوایی کێشەیان تێکەوتو خودا پێغەمبەرانی بۆسەر ناردن؛ تا موژدە بدەن بە چاکەکارانو خراپەکاران بترسێنن.

لە قیرائەتی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوددا رستەکە بەم جۆرەیە ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فاختلفوا﴾ ئەم قیرائەتە بەڵگەیە لەسەر ئەم بۆچوونەیە! بەڵگەیەکی تریشیان هەیە دەڵێن: ئادەم پێغەمبەر بووە، منداڵەکانی لەسەر رێو شوێنی ئەو بوون تا بەخیلیو حەسوودی کەوتە نێوان قابیلو هابیلەوە.

برێکی تر لە راڤەکەرانی قورئان — عەبدوڵڵای کوڕی عەباسو عەطاوحەسەنی بەصری — دەڵێن: مانای ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾ یانی ئادەمیزادەکان هەموویان گومڕاو سەرلێ شێواو بوونو رێبازی حەقو راستییان نەدەزانی، کردارەکانیان بە گوێرەی شەریعەتی خودا ئەنجام نەدەدا، حاڵەتو چۆنیەتی ئەوان ئەوەی دەخواست کە پەروەردگار پێغەمبەرانیان بۆ سەر بنێرێ، تا بیانخاتە سەر رێبازی راستو ئەو کێشەو دووبەرەکییەی کە لەسەرنجامی بێباوەڕیو شوێن کەوتنی هەواو هەوەسو ئارەزۆی گومڕا ئامێز سەریان هەڵدابوو بۆیان حەل بکەن، چونکە ئەگەر وانەبووبن ئەدی پێغەمبەریان بۆچی بوون؟؟

ئـەبو موسـليمی ئەصـفەهانیو قـازی ئەبوبـەکری بـاقلانی دەفـەرموون: مانـای رسـتەی ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِـدَةً﴾ بـەم جۆرەیـە: دەفـەرموێ ئـادەمیزاد لەسـەر ڕێبـازی سروشت بە گوێرەی عەقڵو بـیری خۆیـان خوداپەرسـتیان کـردووە بـەڵام شـوێنکەوتنی عەقڵ بەبێ ڕەهنومایيەکی خودایی سەردەکێشێ بۆ کێشەو نیزاعو دووبەرەکی، چونکە زۆرجار خەیاڵو بیروباوەڕی پڕوپووچ بوون بە لەمپەڕ لەبەردەم گەیشتن بە عەقیدەو حوکمی ڕاستو دروست.

خاوەنی تەفسیری (المنار) دەفەرموێ: پەروەردگار ئادەمیزادی وا دروست کـردووە کە بە کۆمەڵیی بژین، قازانجو بەرژەوەندییان بەیەکەوە پەیوەست بێ، هەریەکەیان لە ژیانا پێویستی بەوی تر هەیە، ناتوانن بەبێ یەك هەڵکەن، دەبـێ هەنـدێکیان یارمـەتی هەندێکیان بدەن، ناگونجێ بڕێکیان پێویستی بـە بڕەکـەی تریـان نـەبێ، هەریـەکێکیش لە ژیان دا کارێکی بۆخـۆی ڕەچاو کـردووە، ئـەو کـارە بۆتـە سەرچاوەی بژێویو پێـی دەژیـن، بـەڵام هێـزی دەروونـیو جەسـتەیی هەریـەکێك لـە ئەنـدامانی کۆمـەڵ لـەوە لاوازترە بتوانێ هەموو پێویستیەکانی بەدەست بێنێ، کەوابوو پێویستە هێزی تر ببنـە پاڵپـشتیو یارمـەتی بـدەن تـا پێویـستیەکانی ژیـان دابـین بکـا، بۆیـە ئـادەمیزاد بـۆ دابینکردنی بڕێ پێویستی خۆی هانا بۆ ئادەمیزادانی تـر دەبا، وەکـوو چۆن ئـەوانیش بۆ بڕێ کار هانا بۆ ئـەم دێـنن، ئـەم بەیەکاچـوونو بەرژەوەنـدی تێکـەڵاو بوونەیـە کـە دەڵێن: ئـادەمیزاد بـە سروشـت شارسـتانییە (الأنـسان مـدني بـالطبع) مەبەسـت ئەوەیـە ئادەمیزاد هەریەکەیان ئەوەندە تواناو دەسەڵاتی ئەدراوەتێ خۆی بەس بـێو پێویـستی بە یارمەتی کەسی تر نەبێ، بەڵکوو خودا وای دروست کردووە کە پلەی هەر یەکێك لە ناو کۆمەڵدا وەکوو پلەی ئەندامێك بێ لە جەستەدا، واتە: چۆن جەسـتە ناتوانـێ پـەرە بە ژیان بدا مەگەر بە هاریکاری هەموو ئەندامەکانیو ئەندامـەکانیش نـاتوانن ئـەرکی خۆیـان ئـەنجام بـدەن مەگـەر کاتێـك کـە جەسـتە ساغو سـەلامەت بـێ، ئـادەمیزادیش وەهانو بەبێ یەکتری ژیانیان بۆ دەستەبەر نابێ، جا کە ئادەمی وەها بێو بـە گـوێرەی سروشت دەبێ بەکۆمەڵی بژین هەڵبەتە لە ژیاندا هەریەکە بـە گـوێرەی بیروبۆچـوونی

خۆی رەفتـار دەكـاو لـە كـردارو گوفتاریـدا بەرژەوەنـدی خـۆی بەرچـاو دەگـرێ، هـیچ كامێكیـشیان ئەوەنـدە هێـزی ئیلهامو نیگـای نـەدراوەتێ بۆخـۆی بتوانـێ بـە تـەواوی بەرژەوەندی خۆیو غەیری خۆی بپارێزێ، سوودی تەواو بۆخۆیو هاوەڵانی دەستەبەر كا، كە وابێ شتێكی سروشتیە كە كێشەو دووبـەرەكیان تـێ بكـەوێ، هـەر كەسـە بـەلای خۆیدا رایكێشێ، كەوابوو رەحمەتی خودایـە كـە پێغەمبـەرانی نـاردوون بـۆ رێكخستنی ژیانیـانو رێنمـوی كردنیـان بـۆ رێگـای راسـتو ژیـانی بەختـەوەری دونیـاو قیامـەتو مـوژدەدەرو ترسـێنەر بۆیـان ﴿فَبَعَـثَ اللّـهُ النَّبِـيِّينَ مُبَـشِّرِينَ وَمُنـذِرِينَ﴾ پـەروەردگار پێغەمبەرانی یەك بە دوای یەكدا ناردنە سەر ئادەمیزاد بۆ ئەوەی رێگای راستی ژیـانو سەرفرازی قیامەتیان نیشان بدەن، خەڵكی لەسەر خوداپەرستی رام بكەنو یاسای خودا لەسەر زەوی جێگیر بكەن، گەلەكانیان لە خـەوی خامۆشـی بێـدار بكەنـەوە، لـە ئاكـامی سەرپێچیو سەرسەختی بیانترسێنن.

جـا كـە زەمینـەی كۆمەڵایـەتییان بـۆ خـۆش بـوو، دڵو دەروونیـان ئامـادەی وەرگرتنی پەیامو شەریعەت بـوون ﴿وَأَنزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ﴾ بـە گـوێرەی پێویـست كتێبـی بـۆ پێغەمبـەرەكان نـاردووە، كتێبـی حـەقانی، یاسـا دروسـتو دەسـتوور رەوان ﴿لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُواْ فِيهِ﴾ بۆ ئەوەی ئەو پێغەمبەرانە لەبەر رۆشنایی كتێبە ئاسمانیەكەیان دا فەرمانڕەوایی كۆمەڵ بكەن تەمو مژی كێشەو نیـزاعو دووبـەرەكییان لەسەر بڕەوێنەوە، كۆمەڵگای نموزەجیو میثالیان لێ پێك بێنن!!

ئایەتەكە ئاماژەی ئـەوەی تێدایـە كـە پـەروەردگار لەگـەڵ هـەموو پێغەمبەرێكدا پـەڕاوێكی نـاردووە، جـا ئـەو كتێبـە مـوعجیزە بووبـێ یـان مـوعجیزە نـەبووبێ، كورت بووبێ یان درێژ بووبێ، نووسرابێتەوەو لەبەر كرابێ یان نا!! ﴿وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلاَّ الَّذِينَ أُوتُوهُ﴾ ئەوانـەی تێیـدا كەوتنـە كێشەو دووبـەرەكیو نیزاعیـان لـەو كتێبانـەدا كەوتـە نـاوەوە پیـاوە گـەورەو ماڵـەكان بـوون، زانـاو رۆشـنبیرو لێپرسـراوانو پیـاوانی ئـایینی بـوون؛ ئەوانـەی ئـەو كتێبانـەیان درابوویـە بـۆ ئـەوەی بـە گـوێرە دەقـەكانیان هـەڵسو

کەوت بکەن، ئەوانیش لێی لادەدەن ﴿مِن بَعْدِ مَا جَاءتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ﴾ دوای ئەوەی کە بەڵگەی زۆرو بەهێز لەسەر راستیو بێ خەوشی ئەو کتێبانەیان پێدراو تێیان گەیەندرا کە ئەو کتێبانە بۆیە نێردراون کە ببنە هۆی یەکیەتیو تەبایی، نەك هۆی ناکۆکیو دووبەرەکی، تێگەیشتن کە ئەو کتێبانە بۆیە هاتوون کە خۆشبەختیو کامەرانی بە ناو خەڵکدا بڵاو بکەنەوەو ریزەکانی کۆمەڵ یەك بخەن! کەچی ئەوان پەندیان لێ وەرنەگرتو نەهاتنە سەر خەتو پابەندی فەرموودەکانیان نەبوون، لەم هەڵوێستەیاندا هیچ بەڵگەو سەرچاوەیەکیان بەدەستەوە نیە، جگە لە ستەمکاریو سەر رەقی خۆیان نەبێ، جگە لە بەزاندنی ئەو سنوورانە نەبێ کە ئایین کردوونی بە پەردە لە نێوان حەقو بەتاڵ دا.

ئاشکرایە هەموو ئایینێك لەسەرتادا خەریکی رێکخستنی ریزەکانی کۆمەڵو قەلاچۆکردنی هۆکارەکانی دووبەرەکیو چاندنی تۆوی برایەتیو تەبایی بوو؛ بە جۆرێك کە برایەتی ئایینی زۆر لە برایەتی دایكو باوکی کاریگەرتر بووە، زۆرجار هەڵوێستو رووداوی مێژوویی وا هەن کە برای ئایینی لە پێناو برای ئاییندا هەڵوێستی وای نواندوە گیانی خۆی لە پێناویدا بەخت کردووە، هەرگیز برای باوكو دایکی شتی وای لێ چاوەڕوان ناکرێ.

ئاشکراشە تا ئایین بە باشی لە دڵی پەیڕەوکەرانیدا جێگیر بووبێ، خەڵکی وەکوو پێویست لە ناوەڕۆکی ئایین گەیشتوون، شارەزایانی ئایین وەکوو خۆی ئایینەکەیان بە خەڵکەکە رادەگەیاند، زانایان بە نووری ئایین هەڵسوکەوتیان دەکرد، دووبەرەکیو جیاوازیی لە کۆمەڵدا دەربارەی ئایین نەبوو، بەڵام سەد مەخابن رۆژگار هاتنو رۆیشتن، کۆمەڵێك ماڵئاواییان لە ژیان کردو کۆمەڵێکی تر هاتنە شوێنیانو هیچ کۆیان لە تەئویلو پێچو پەنا لە دەقەکانی ئەو کتێبانەدا نەکرد، بە هەموو جۆرێك بیروبۆچوونی خۆیانیان تێدا بەکارهێنا، هەموو مەبەستێکیشیان دابین کردنی تەماعو ئارەزۆبازیی خۆیان بۆ پشتگیری کردن لە داپڵۆسینو سەرکوتکردنی جەماوەر بوو، چییان بەسەر ئەوەوە نەبوو ئاخۆ ئەحکامی خودا تەنفیز دەکرێن یان پاش گوێ

دەخرێن، ڕێبازەکە خوار دەکەن یان ڕاستی دەکەن، لەگەڵ ناوەڕۆکی ئایین دەگونجێ یان نا؟

ئەمجار دوای ئەم کۆمەڵە کۆمەڵە سەرلێ شێواوێکی تر پەیدا دەبن کە دەبینن تۆزێك ڕێگایان بۆ خۆش کراوە، دەست دەکەن بە گۆڕانکاریو تەئویل کردن، دەیانەوێ ئەوانەی پێش ئەوان چییان لە پێش خۆیان کردووە، ئەمانیش ئاوا لە پێش خۆیان بکەن. ئیتر کێشەو نیزاعو دووبەرەکیو ململانێ بە ناوی ئایینەوە پەیدا دەبێ، هەریەکەیان لە عاست خۆیەوە خۆ بە پارێزگارو داکۆکیکار لە ئایین دەزانێ، چەند شەڕو ئاژاوە لە نێوان موسوڵمانانەدا بەرپا بوو، چەند خوێن ڕژاو،ماڵو دارایی بە فیڕۆچوو، پشتی موسوڵمانانی شکاندو ورەو هیوای تێك رووخاندن، بانگەشەو داواکاری هەموو لایەکیشیان بە قسەی خۆیان پاراستنی ئایین بوو!؟!

بێگومان جولەکەو نەصارا لەم بوارانەدا دەست پێشکەرییان هەیەو هەتا ئەمڕۆش ئەم سیاسەتە پەیڕەو دەکەنو ساتەوەختێك لێی پاشگەز نەبوونەوە، موسوڵمانیش بست بە بست لەم بارەوە شوێن پێیان کەوتوونو ئەوان چییان بەسەر گەلو وڵاتو ئایینی خۆیان هێنا، موسوڵمانە لادەرەکانیش دەیانەوێ ئەوە بەسەر ئایینی پاکی ئیسلام بێنن، بەڵام ئیسلام قورئان بەرنامەیەتی، قورئانیش نێردراوی خودایەو خۆی ناردویەتە خوارێو هەر خۆیشی چاودێری دەکاو پارێزگاریەتی:

ئەمجار پەروەردگار ئەوە ڕادەگەیەنێ کە بیروباوەڕی ڕاست خەڵك ڕێنموویی دەکا بۆ حەقو ڕاستیو بەختەوەری ژیانی هەردوو دونیا دەستەبەر دەکاو قەڵاچۆی دووبەرەکیو ناکۆکی دەکا. ﴿فَهَدَى اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ لِمَا اخْتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ﴾ ئەمجار پەروەردگار ڕێنموویی بڕوادارانی کرد بۆ پەیڕەو کردنی ئەو ڕێگا ڕاستەی کە دووبەرەکییان تێدا پەیدا کردووە، بۆ ئەوەی کە بەرەزامەندی پەروەردگار حەقیقەتی ڕاستی بدۆزنەوەو پابەندی بن. ﴿وَاللَّهُ يَهْدِي مَن يَشَاء إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ هەرکەسێك خودا حەزی لێ بێ شارەزایی دەکا بۆ ڕێگای ڕاستو دروست، چونکە بیروباوەڕی ڕاستو پتەو لەگەڵ مەبەستی ساغ ئادەمیزاد دەگەیەنێ بە حەقو ڕاستیو دووبەرەکی قەڵاچۆ

دەكا، موسوڵمانانی راستەقینە ئەوانەن كە ئەو رێبازە راستەی خەڵك تێیدا كەوتوونە دووبەرەكیەوە دەیدۆزنەوە، ئەو رێبازەی خودا لێی رازییە پێیدا دەڕۆن!!

بیروباوەڕی راست نوورێكی هەیە رۆشنایی دەدا بە عەقڵو هۆشو لە تاریكایی گومان رەهای دەكاو بەرەو حەقو راستی دەیبا، رێگای بۆ روونـاك دەكاتـەوەو ناهێڵێ شتی بۆشو پڕوپووچ تێكەڵاوی بیروبۆچوونی ببێ، هەموو لەمپەڕو پەردەو كەندو چاڵ لەبەردەم دا تەختو خۆش دەكا؟!

بیروباوەڕی راست رێگە نادا خاوەنەكەی هیچ هەڵوێستێك وەربگرێ تا چاك لێی وردنەبێتەوەو نەی پشكنێو بەڵگەی راستو دروستی كارەكەی بۆ دینو دونیا لا پەیدا نەبێ.

بیروباوەڕی راست دەبێتە چاودێرو جاسووس بەسەر خاوەنەكەیەوە، لە هەموو هەنگاوێكیا لە هەموو خەیاڵو خەتەرەیەكدا كە بە دڵیدا دێ لە هەموو تەماشا كردنێكی چاویدا هەموو كردارو گوفتارێكی راستو دروست دەبێو سەرەنجامی چاك بەدەست دێنێ، هەموو كاتێك دڵ ئارامو ورە بەرزو بەرچاو روونو گەشبینە، چونكە ئەو سەرچاوەی هەموو هێزو توانایەكە لە هەموو كارو كردەوەیەكی هەر لە پەروەردگاری خاوەن دەسەڵاتەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ، كەسێكیش خودا پشتو پەنای بێ بێگومان دەبێ ئاوا بێ!

﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ﴾ دوای ئەوەی پەروەردگار فەرمانی كرد بە ئادەمیزاد كە هەموویان بچنەژێر ئاڵای ئاشتیەوە، ئەوەشی تێگەیاندن كە ئادەمیزاد هەریەكەیان لە عاست خۆیەوە پێویستی بەوی تر هەیە، ئەگەر دووبەرەكیو كێشەیەك لە نێوانیان دا پەیدا بوو پێویستە پەنا بەرنە بەر پەیامی پێغەمبەرو بە گوێری فەرمانی خودا حەلی دووبەرەكی خۆیان بكەن، ئەوانەی دەیانەوێ لە چوارچێوەی خیلافو دووبەرەكی رزگاریان بێ، دەبنە نیشانە بۆ تانووتو بوختانی جودایی خوازن، هەرچەندە ئەمان مەبەستیان خێرو چاكە بێ گێرەشێوێنان بە پێچەوانەوە لێكی دەدەنەوە.

ئـەمجار دێ موسـوڵمانان هەڵدەنێ بـۆ خـۆراگری‌و بـە ئـارامی لـە بەرامبـەر ئـەو ئەزیـەت‌و ناخۆشـییەی لـە کافرەکانـەوە تووشـیان دەبـێ، دەفـەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم﴾ ئەم خیطابە لەگەڵ ئەوانەیە کە لە سـەرەتای هـاتنی ئیـسلامدا خـودا هیدایـەتی دابـوون‌و موسـوڵمان بـوون‌و لـە تاریکـایی نـەزانی‌و نـەفامی رزگاریـان بـوو، شـوێن پـەیامی پێغەمبـەر کـەوتون، ئـەوانیش چینی یەکەمی موسوڵمانان بوون، پەنـدو ئامۆژگاریـشە بـۆ موسـوڵمانانی دوای ئـەوان‌و پێیـان دەفەرموێ: ئەوە پێتـان وایـە تـەنیا بـە موسـوڵمان بوونتـان‌و نوێـژکردن‌و عیبـادەتێکی رواڵـەتیتان دەچـنە بەهەشـتەوە، ئایـا هەرکـە بەرواڵـەت لـە ریـزی موسـوڵمانان حـسێب کـران، ئـیتر ئەمـە کیفایەتـە بـۆ چـوونە بەهەشـت‌و گەیـشتن بـە مـراز؟؟ ئایـا نـازانن سوونـنەتی خودا بۆ هەڵگرانی ئاڵای (لآ إله إلا الله) هەر لەو رۆژەوە کە هێناونیـە گـۆڕی خەباتەوە وەهایە کە دەبێ جۆرەها نارەحەتی بچێژن؟؟

دەبـێ لـە پێنـاو شـارەزایی خـەڵك بـۆ رێگـای حـەق‌و راسـت هـەموو ئـازارو ئەشکەنجیەکیان تـووش ببـێ! وەکوو چۆن پێغەمبـەرانی رابوردوو ئەوانـەی لەگـەڵیان بـوون تووشـی چـەندەها گیروگرفـت‌و ناخۆشـی بـوون‌و لـە کۆتـایی دا سـەرکەوتنیان بەدەست هێناوە.

بە کورتی دەفەرموێ: لە پێش ئێوەوە زۆر گەل‌و نەتـەوە هەبوون پێغەمبـەریان بۆ سەر رەوانە کراوە، کتێبیان بـۆ نێـردراوە، بانگەوازی خـەڵکیان کـردووە بـۆ حـەق‌و راستی‌و خوداپەرستی، لە پاداشی بانگ کردن‌و خەبات کردنیانـدا خەڵکەکە لـە جیـاتی ئـەوە بـە پـیر بانگەوازەکەیانـەوە بـێن سزاشـیان داون‌و تووشـی گیروگرفتیـان کـردوون، ئـەوانیش خـۆراگرو وره بـەرزو دڵ قـایم‌و مـەردو نەبـەرد بـوون، ئایـا ئێـوەش وەکوو ئـەوان خـۆراگر دەبـن،؟؟ لـە بەرامبـەر تـەنگ‌و چـەڵەمەو نارەحەتیـدا نەبـەزو مـەرد دەبن؟!

ئایـا پێتـان وایـە دەچـنە بەهەشـتەوەو رەزامەنـدی خـودا بەدەسـت دێـنن هـەر بەوەندە کە دەڵێن: ئێمە موسوڵمانین ﴿وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم﴾ لـە

کاتێکدا هێشتا وێنەی ئەو ئێش‌و ئازارەی لە پێناو ئاییندا بەسەر ئەو پێغەمبەرو موسوڵمانانەی پێش ئێوەدا هاتووە نەهاتۆتە ڕێتان‌و تووشی نەهاتوون!!

جا وەك یەکێك پرسیار بکاو بڵێ: بۆ ئەو گەل‌و نەتەوانە چییان بەسەر هاتووە؟؟ لە وەڵامدا دەفەرموێ: ﴿مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاء وَالضَّرَّاء وَزُلْزِلُواْ حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللّهِ﴾ ئەو گەل‌و نەتەوانەی پێش ئێوە تووشی گیروگرفت‌و کێشمەکێشم بوون، زەرەرو زیانیان پێ گەیی، ئازاردران، کەوتنە حاڵەتی زۆر ناخۆش‌و کوشندەو سامناکەوە، لە هەموو لایەکەوە دوژمن دەوری دان‌و تینیان بۆ هات، تەنانەت گەیشتنە حاڵەتێك کە پێیان وابێ ئەو یارمەتی‌و کۆمەکیەی کە خودا بەڵێنی پێداون دواکەوتووەو لێی بەپەلە بوون‌و دەیانگوت ﴿مَتَى نَصْرُ اللّهِ﴾ کەی کۆمەکی خودامان بۆ دێ‌و لەم مەینەتیە رزگارمان دەبێ؟؟

ئەمجار پەروەردگار وەڵامی دانەوەو فەرمووی: ﴿أَلا إِنَّ نَصْرَ اللّهِ قَرِيبٌ﴾ ئاگاداربن‌و بزانن هاتنی کۆمەکی خودا نزیکەو هیچ وەختێك لە کاتی خۆی دوانەکەوتووە، دڵنیا بن بەسەر دوژمندا سەرتان دەخاو شەڕو گروگێچەڵی ئەو خوانەناسانەتان لێ دوور دەخاتەوە پشتگیری بانگەوازییەکەتان دەکاو دروشمی ئێوە سەردەخاو دروشمی خوانەناسان ژێر دەخا!!

دەی خۆ موسوڵمانانی ئەمڕۆ نەگەیشتوونە ئەو حاڵەتەی کە ئەو پێغەمبەرانەی پێشوو هاوەڵانیان تێی کەوتوون، لەوەپێش هەندێ پێغەمبەرو پەیڕەوکەرانیان شەهید کرد، جۆرەها سزای سامناك‌و ئەشکەنجەیان دان، تەنانەت دەڵێن هەندێکیان بە زیندوویی بە مشار شەق کردن، هەندێکیان بە زیندووی خستە ناو ئاگرەوەو سوتاندیانن، وەکوو ئەو سوتان‌و داخ کردن‌و ئازاردانەی کە دەرحەق بە ﴿أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ﴾ یان کرد کە چاڵیان بۆ هەڵکەندن‌و ئاگریان تێدا کردنەوەو کۆمەڵ کۆمەڵ ئیماندارانیان تێ فڕێ دەدا! قورئانی پیرۆز دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَن يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾.

دەی با موسوڵمانانی ئەمڕۆ تێ بفکرن‌و وردببنەوە، پەندو ئامۆژگاری لە مانای ئەم ئایەتانە وەربگرن کە ئاڕاستەی هاوەڵانی پێغەمبەر کراوە، کە لەگەڵ ئەو هەموو فیداکاری‌و خۆبەخت کردنەدا کە هەیان بووە، لەگەڵ ئەو هەموو ڕێزو نرخەی کە بۆیان دانراوە، کەچی ئەم لۆمە بەهێزەیان ئاڕاستە کراوە، هەر ئەوەندە وا گومانیان بردووە کە بەبێ نارەحەتی چەشتن! هەر بەئەوەندە موسوڵمان ببن دەچنە بەهەشتەوە!! دەی کە وابێ موسوڵمانانی ئەمڕۆ بۆ گلەیی لە خۆیان ناکەن، لە کاتێکا دەزانن ئەوان زۆر لە خوار هاوەڵانی پێغەمبەرەوەن لە خوداپەرستیدا، لە خۆڕاگریدا لە خەبات‌و تێکۆشاندا، لەگەڵ ئەوەشا ئایین بۆ دونیا دەفرۆشن هەر هەڵپەیانە بۆ وەدەستهێنانی ماڵ‌و دارایی، با لە ڕێگەی ڕەواشەوە نەبێ، هەر خەریکی دەست درێژی کردنن بۆ سەر خەڵك‌و ئاژاوە نانەوە لەسەر زەوی!

بە کورتی بیروباوەڕ ماف‌و ئەرکی هەیە، پەیڕەوکردنیان ئادەمیزاد دەگەیەنێتە خۆشبەختی‌و کامەرانی هەردوو دونیا، کەسێکیش پاش گوێیان بخات بێبەری دەبێ لەو نازونیعمەتەی کە خودا دایناوە بۆ پەیڕەوکەرانی پێغەمبەرانی!

## ئەندازەی خێری سوننەت‌و ئەوانەی پێیان دەبەخشرێ

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢١٥﴾ ﴾.

لەوە پێش ئەوەی گەیاند کە خۆشەویستی دونیا سەر دەکێشێ بۆ گیروگرفت‌و دووبەرەکی، ئەوانەی خوداپەرستی بەراستین لە پێناو بیرباوەڕەکەیان داو بۆ ڕەزامەندی خودا هەموو ناخۆشی‌و ئێش‌و ئازارێك دەچێژن، کەوابێ شتێکی گونجاوە

کە باسی ئەو شتانە بکا کە لەو ڕێبازەدا دەیبەخشێ، چونکە ماڵ بەخشین لە پێناو بیروباوەڕدا وەکوو گیان بەخشین وایە، هەردووکیان نیشانەی بەهێزی ڕاستی بیروباوەڕن، هەرچەندە پێویست ناکا موناسەبە لە نێوان هەر ئایەتو ئایەتێکی تردا هەبێ، بە تایبەتی کە ئایەتەکان ئایەتی ئەحکام بنو بۆ وەڵامی پرسیار هاتبن!

﴿يَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)! هاوەڵانت پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ئەندازەی ئەو ماڵو دارایییەی کە دەیکەن بە خێرو دەیبەخشن، هەروەها دەربارەی ئەو لایەنەی پارەو شتومەکیان بۆ خەرج دەکرێو بەشیان دەدەرێ ﴿قُلْ مَا أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَالِدَيْنِ﴾ وەڵامیان بدەرەوەو پێیان بڵێ: ئەندازەی ئەو ماڵو دارایییەی دەیبەخشن کەم بێ یان زۆر بێ، پەیوەندی بە خۆتانەوە هەیەو پاداشەکەی بۆ خۆتانە، ئەو لایەنەی کە ئێوە خێریان لەگەڵ دەکەن ئەمانەن: باوکو دایک ﴿وَالأَقْرَبِينَ﴾ خزمو کەسوکارە ﴿وَالْيَتَامَى﴾ هەتیوو چەتیو: ئەو منداڵانەی بێ باوکو دایکن، چونکە ئەمانە زۆربەیان بێ دەسەڵاتنو هەژارن، ئەمجار ﴿وَالْمَسَاكِينِ﴾ هەژارو نەداران ئەوانەی ناتوانن کاسبی بکەن، ئەمجار ﴿وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ ئەو ڕێبوارانەی لە وڵاتی خۆیان دوور دەکەونەوەو پارەیان لێ دەبڕێ، ئەوانە ئەوەندەیان دەدرێتێ کە پێی بگەنەوە وڵاتی خۆیان. تەنانەت ئەگەر لە شوێنی خۆی دەوڵەمەندیش بێ هەر دەیدرێتێ! بەڵام ئەگەر دەوڵەمەند بوو چاک وایە پارە بەقەرز وەربگرێ!

﴿وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللّهَ بِهِ عَلِيمٌ﴾ هەر ماڵو دارایییەک بی بەخشن لە ڕێگای خێرو چاکەدا دڵنیابن خودا پاداشتان دەداتەوەو فەرامۆشی ناکات، چونکە خودا ئاگادارە بە هەموو شتێکو هیچ شتێکی لێ ون نابێو پاداشی چاکەی کردارتانی لە بیر ناچێتەوە.

**پێویستبوونی جەنگان دژی دوژمنان تەنانەت لە مانگەکانی حەرامیشدا!**

﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَـٰعُوا۟ ۚ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَجَـٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أُو۟لَـٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢١٨﴾ ﴾.

لەوەپێش باسی ماڵ بەخشینی کرد لە ڕێگای خودادا بۆ یارمەتیدانی هەژاران بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی هاریکاری لە نێوان موسوڵماناندا، ئەمجار بەشوێن ئەو باسەدا باسی شەڕو جەنگو خۆبەخت کردنی هێنایە پێشەوە! باسی شەڕێك دەکا کە لە پێناو بەرزکردنەوەی وشەی (لا إله إلا الله)دا بێ، بۆ بڵاوکردنەوەی نووری ئایینی ئیسلام بێ. ئاشکرایشە ماڵو دارایی وەکوو گیان خۆشەویستەو پەیوەندییان پێکەوە هەیە، بۆیە دوا بەدوای باسی ماڵ خەرج کردن، فەرمووی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ﴾ نووسراوە لە سەرتانو پێویستە لەسەرتان کۆمەڵێکتان شەڕ لەگەڵ کافرو خوانەناسان بکەن، واتە: شەڕ کردن لەگەڵ کافراندا فەرزی کیفایەیە: کە کۆمەڵێك پێی هەڵسان لەسەر ئەوانی تر لادەچێ، ئەگەر دوژمن بێتە ناو وڵاتەوەو خاکی ئیسلام داگیر بکا، ئەو کاتە لەسەر هەموو موسوڵمان پێویستە شەڕ بکەن، ئەمە لە حاڵێکدا ﴿وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ﴾ شەڕتان بەلاوە ناخۆشەو لەسەر شانتان گرانە، چونکە شەڕ خەرجکردنی ماڵو دارایی و ترسی گیان بەختکردنیشی تێدایە، جا وەنەبێ ئەم پێناخۆش بوونە سروشتییە لەگەڵ ڕەزامەندی بە بەجێهێنانی ئەرکەکە دژایەتییان هەبێ! موسوڵمان شەڕکردنی پێ ناخۆشە بەڵام وەکوو تەکلیفێکی خودایی بە دڵنیاییو ڕەزامەندییەوە ئەنجامی دەدا، وەکوو چۆن کابرای نەخۆش دەرمانی تاڵو تفت دەخواتەوە بە ئومێدی ئەوەی لە نەخۆشیەکەی چاك ببێتەوە.

ئەم ئایەتە یەکەم ئایەتە کە دەربارەی پێویستبوونی شەڕکردن لەگەڵ کافراندا هاتۆتە خوارێ، ئەویش لە ساڵی دووەمی کۆچیدا بووە، ئەو ماوەیەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە مەککە بوو شەڕکردنی لێ قەدەغە بوو، کە کۆچی کرد بۆ مەدینە ڕێگەی ئەوەی پێدرا کە شەڕ لەگەڵ کافرو هاوبەش پەیداکراندا بکا بە گشتی ، ئەمجار جیهادی لەسەر فەرزکرا.

﴿وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ﴾ زۆر جار وا دەبێ ئێوە شتێکتان پێ ناخۆشە کەچی ئاکامەکەی دەبێتە خێر بۆتانو سوودی لێ دەبینن. زۆر جاریش وا دەبێ ئێوە شتێکتان پێ خۆشە، بەلاتانەوە سوود بەخشە

کەچی سەرنجامی دەبێتە شەڕو نەگبەتی بۆ ئێوەوزەرەرو زیانی لێ دەبینن... ئەوەتا زۆرجار وا دەبێ مرۆڤ ئەزیەتو نارەحەتی سەفەر دەچێژێ بۆ وەدەست هێنانی قازانج لە بازرگانیدا، تاڵو سوێری دەچێژێ، لە ماڵو کەسو کاری دوور دەکەوێتەوە بۆ وەدەستهێنانی زانستو زانیاری، هەر بەو جۆرە شتی وا هەیە تەبیعەتی ئادەمیزاد پێی خۆشەو زیانی تێدا نابینێ! بەڵام ئاکامەکەی دەبێتە نەگبەتیو ئێشو ئازار بۆ خۆیو گەلو نەتەوەی! بۆ نمونە وازهێنان لە جیهادو پاڵدانەوەو تەمبەڵیو خۆپەنادان بە ڕواڵەت ماڵو دارایی لە خەرج کردن دەپارێزێ، گیانی خۆی لە کوشتن دوور دەخاتەوە بەڵام ئاکامەکەی نەگبەتیو ژێردەستەییو پێشێل کردنی مافی گەلو نەتەوەیەو داگیرکردنی وڵات لەلایەن خوانەناسانو کافرەوە بە تاڵان بردنی ماڵو داراییو لە ناو بردنی گەلو نەتەوەو ئەتك کردنی ناموسو شوێنە پیرۆزەکانە! ﴿وَاللَّـهُ يَعْلَـمُ﴾ خودا دەزانێ چی چاکە بۆ ئێوەو چی خراپە، چی سوودی ئێوەی تێدایەو چی زیانی ئێوەی تێدایە ﴿وَأَنـتُمْ لاَ تَعْلَمُـونَ﴾ ئێوە نازانن، کە وابێ خودا فەرمانی چی پێ کردوون پابەندی بنو جێبەجێی بکەن، هەرچەندە بە تەبیعەتی خۆتان پێتان ناخۆش بێ، خەریکی خوداپەرستی بنو شوێن هەواو ئارەزۆی خۆتان مەکەون!

ئەمجار دوای ئەوە باسی ئەوەی کرد: کە شەڕکردن لەگەڵ کافران لەسەر موسوڵمانان پێویستە، باسێکی تر روون دەکاتەوە، ئەویش باسی شەڕکردنە لەو مانگانەی کە شەڕی تێدا قەدەغەیە، فەرمووی: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَـالٌ فِيـهِ كَـبِيرٌ﴾ پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی شەڕکردن لەگەڵ کافران لە مانگی حەرامدا، چونکە لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت: لەوانەیە فەرمانکردنی خودا بە شەڕ لە ئایەتی ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ...﴾دا لە غەیری مانگەکانی (اشهر الحرام) بێو نابێ لە ناوچەی حەرامی کەعبەش بێ. لەسەر ئەوە لە پێغەمبەریان پرسی ئایا شەڕکردن لەم کاتو شوێنانە دروستە یان نا؟

ئەوەی کە پشتگیری ئەم رایە دەکا ئەو سەرگوزەشتەیەیە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە ساڵی دووەمی کۆچی لە مانگی (جمادي الآخرة)دا پێش غەزای بەدر بە دوو مانگ عەبدوڵلای کوڕی جەحشی لەگەڵ کۆمەڵێ لە کۆچکەران (مهاجرين)دا نارد، نامەیەکی دایە فەرمووی: (هەڵی مەپچڕەو سەیری مەکە هەتا دوو ڕۆژ ڕێگا دەبڕی، ئەمجار بیکەرەوە: کە کردتەوە زۆر لە کەس مەکە هەرکەسێ بۆخۆی ئارەزۆی نەبوو مەیبە، کە ڕۆیشتو نامەکەی لە شوێنی دیاریکراودا هەڵپچڕی تیایدا نووسراو بوو کە سەیری ئەم نامەیەت کرد بڕۆ تا دەگەیە (نەخلە) کە شوێنێکە لە نێوان مەککەو طائیف دا، لەوێ چاودێری قوڕەیش بکەو هەواڵیان بزانە بۆمان، ئەویش هاوڕێکانی تێگەیاند کە گەیشتنە نەخلە لەوێدا کاروانێکی قوڕەیشیەکان بە سەرۆکایەتی (عمرو الحضرمی) تێپەڕی، ئەو ڕۆژەش یەکەم ڕۆژی مانگی ڕەجەب بوو کە یەکێکە لەو مانگانەی شەڕی تێدا قەدەغە کراوە، ئەوانیش پێیان وابوو کۆتایی مانگی (جمادي الآخرة)یە لەوێدا (عمرو الحضرمی)یان کوشتو دوو کەسیان لێ بەدیل گرتنو کاروانەکەیان هێنا بۆ مەدینەو هاتنە خزمەت پێغەمبەرو ڕووداوەکەیان بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: من پێم نەگوتن لە مانگی قەدەغە کراودا شەڕ بکەن، کاروانەکەو دیلەکانی ڕاگرتنو هیچ تەسەڕوفێکی تێدا نەکردن، ئیتر عەبدوڵلا و هاوڕێکانی لە کردەوەکەیان پەشیمان بوونەوە. پێیان وابوو تاوانیان کردووە، قوڕەیشیەکان ئەمەیان بەهەل زانیو کەوتنە پڕوپاگەندەو بانگەشە کردن لە هەموو شوێنێك دەیانگووت: موحەممەدو هاوەڵانی لە مانگی حەرام دا شەڕیان بەرپاکردووەو پیاویان تێدا کوشتووە، تاڵانیان تێدا کردووە، دیلیان تێدا گرتووە؟! ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێو دەمکوتی کافرەکانی کرد، بەوە موسوڵمانەکان کەیف خۆش بوونو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کاروانو دیلەکانی وەرگرتو پێنج یەکی لێ جیاکردەوەو ئەوی تری لە نێوان مەفرەزەکەدا دابەش کردو دیلەکەشی گۆڕیەوە بە دوو هاوەڵی عەبدوڵلا حەضرەمی: کە سەعدی کوڕی وەقاصو عەتبەی کوڕی غەزوان بوون کە لەسەرەتای گەیشتنیان بە ناوچەی (نەخلە) وشتریان لێ

هونبوو، ئەوانیش لە کاتێکا کەلە ووشترەکەیان دەگەڕان قوڕەیشیەکان پێیان زانین‌و بە دیلیان گرتن.

جا لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا ﴿قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ﴾ بڵێ: هەر شەڕێك بکرێ لە مانگی حەڕام دا شەڕی گەورە یان بچوك تاوانێکی گەورەیە، بەڵام ئەوەی عەبدوڵڵای کوڕی جەحش‌و هاوەڵانی کردوویانە یان لەوە دوا موسوڵمانەکان دەیکەن لەوە کە شەڕ لە مانگی حەڕام دا بکەن ئەوە دەکەوێتە بەر قاعیدەو یاسای ئەنجامدانی سووکترین تاوان لە نێوان دواندا (إرتكاب أخف الضررين) کاتێك ناچار ببی یەکێکیان بکەی.

شەڕ کردن لە مانگی حەرامدا خۆی لە خۆیدا تاوانێکی گەورەیە، بەڵام کە ناچار بوون بۆ لابردنی تاوانێکی گەورەتر ئەوە قەیناکە وەکوو ئەوەی کە ئایەتەکە روونی کردۆتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ﴾ رێگەگرتن لە بڵاوبوونەوەی ئایین‌و خوداپەرستی ﴿وَكُفْرٌ بِهِ﴾ بێ بڕوایی بە خوداو مەنع کردنی خەڵك لە بڕواهێنان بە ئایینەکەی ﴿وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ قەدەغە کردنی خەڵك لە چوونە ناو کەعبەو تەواف کردنی‌و خوداپەرستی تێیدا ﴿وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ اللَّهِ﴾ دەرکردنی دانیشتوانی کە پێغەمبەرو هاوەڵانی بوون، کە ئازاریان دان‌و تەنگیان پێ هەڵچنین‌و لە مەککە وەدەریان نان، هەر تاوانێك لەم تاوانانەی کە بێ بڕوایان ئەنجامیان داوە، لە لای خودا زۆر گەورەتر لە شەڕکردن لە مانگی حەرامدا، دەی کەسێك کە هەموو ئەو تاوانانەی ئەنجام دابن تۆ چی دەربارەی دەڵێی؟ بێگومان تاوانی شەڕکردن لە مانگی حەرامدا زۆر لەو تاوانە بچوکترە؟!

ئەمجار پەروەردگار هۆی ئەوە روون دەکاتەوە کە لە پێناویا شەڕ بە ڕەوا دەبینرێ‌و دەفەرموێ: ﴿وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ﴾ بەرپاکردنی فیتنەیی لە ئایینی موسوڵماناناداو گومان خستنە دڵیانەوەو ئەزیەتدان‌و سوکایەتی پێکردنیان لەشەڕو کوشتار دژوارترە، وەکوو ئەوەی لەگەڵ عەمماری کوڕی یاسرو بیلال‌و خەبابی کوڕی ئەرەتیان کرد، عەمماریان بە ئاگر داخ کرد، بۆ ئەوەی لە ئایین پەشیمان بێتەوە باوك‌و

براو دایکیشی بەوپەڕی دوڕندەیی سزا دەدران، ڕۆژێك لە کاتی سزادانیاندا پێغەمبەر بەلایاندا ڕەت بوو، فەرمووی: ئەی بنەماڵەی یاسر! خۆڕاگرو ئارام بن، شوێنی ئێوە بەهەشتە!

بەڵێ یاسر لەژێر ئەشکەنجەو سزاداندا گیانی پاکی بەرزەفڕی بەخشی، دایکیشی بەسەرەنێزە شەهید کرا!..

ئومەییەی کوڕی خەڵەف بیلالی بە برسی کردنو تێنوکردن سزا دەدا، شەوو ڕۆژێك خواردنو خوادنەوەی لێ قەدەغە دەکرد، ئەمجار دەیبرد لە گەرمای هاویندا لەناو لمبەلاّندا لەسەر پشت رای دەکێشاو بەردێکی گەورەی دەخستە سەر سنگیو پێی دەگوت: یان لە ئیسلام پەشیمان ببەوە، یان تا دەمری بەو شێوەیە بە بەلاّم بیلال باکی نەبوو، ئەم ئازارو ئەشکەنجەیەی لە پێناو ئاییندا بەلاوە شتێکی ئاسایی بوو! تەنانەت پێغەمبەر خۆیشی لە سزادانو سووکایەتی پێکردنی ئەو خودانەناسە قورەیشیانە رزگاری نەبوو، ئەوەبوو لە کاتی نوێژ کردندا کە دەچووە سوجدە ورگو ریخۆڵە بۆگەنی پڕ شیاکەی ئاژەڵیان دەخستە سەر پشتی موبارەکیو جۆرەها ئەزیەتی تریشیان دەدا. ﴿وَلاَ يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ﴾ ئەو کافرانە بەردەوام شەڕتان لەگەڵ دەکەنو دژتان دەوەستن ﴿حَتَّىَ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ﴾ تاوەکو لە ئایین ژێوانتان بکەنەوەو پەشیمان ببنەوە ﴿إِنِ اسْتَطَاعُواْ﴾ ئەگەر بتوانو بۆیان بکرێ، بەلاّم بەراستی گێلو نەفامن، چونکە ئەوان دوای کلاّوی بابردوو کەوتوون چونکە کەسێك لە ئیسلام حاڵی بووبێ چۆن جارێکی تر کافر دەبێتەوە؟!

واتە: ئەو خوا نەناسانە هیچ مەبەستێکی تریان نیە جگە لەوە کە ئایین قەدەغە بکەنو بەرپەرچی بدەنەوەو نەهێڵن گەشە بکا، دژایەتیو دوژمنایەتیان بۆ ئێوە ئەوەندە قووڵ بۆتەوە نەك هەر ئیمان ناهێنن! بەڵکوو ئەوان بەتەمای ئەوەن ئێوە بگەڕێنەوە سەر ئایینی ئەوان!

ئایینی ئیسلام ئایینێکی بێ خەوشە، یاسای رەساو دەستووری رێكو پێکن، جا هەرکەسێك لە ئیسلام شارەزا بوو، فێری ئەحکامو رێبازی بوو ئەمجار هەڵبگەڕێتەوەو

ژیوان ببێتەوە، ئەوە دیارە تاوانی لە تاوانی کافری ئەسڵی گەورەترە، بۆیە پەروەردگار هەڕەشە لە موسوڵمانان دەکاو، لە هەڵگەڕانەوەیان دەیانترسێنێو، دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ کەسێك هەڵبگەڕێتەوەو کافر ببێتەوە، بە کافریی بمرێ هەموو کردەوەیەکی باشی لەوەپێشی پوچەڵ دەکرێتەوە، هەروەکوو هیچ کرداری باشی نەکردبێ وەهایەو زەرەرمەندی دونیاو قیامەت دەبێ؛ لە دونیادا خوێنی بە فیڕۆ دەڕوات، هەرکاتێ بەردەست بکەوێ دەکوژرێ، ئەگەر ژنی هەبێ ژنەکەی لێ دەستێنرێتەوە، تەڵاقی نامێنێ برادەرو خۆشەویستی موسوڵمانانی لە کیس دەچێ! لە میرات بێ بەری دەبێ، زەرەرمەندی رۆژی قیامەتیشی ئەوە مانەوەیەتی لە ناو دۆزەخدا بۆ هەتا هەتایە.

هەڵگەڕانەوە لە ئایین بە گوفتار دەبێ، وەکوو ئەوە ئینکاری شتێکی ئایینی وا بکا کە رۆشنو ئاشکرا بێو لە ئاییندا پێویست بێ بۆ نموونە بڵێ نوێژ واجب نیە.، هەروەها بە کرداریش دەبێ وەکوو ئەوە کردارێك بکا گاڵتەکردنی بە ئایین تێدا بێ بەم جۆرە سوجدە بۆ خۆر بەرێ گاڵتە بە قورئان بکا!!

بە گوێرەی ئایەتەکە هەڵگەڕانەوە لە ئایین ئەگەر کابرای هەڵگەڕاوە بە وەرگەڕاوەییو کافریی نەمرێ کردەوەکانی پوچەڵ نابنەوە، لەم رووەوە ئیمامی شافیعی (رەزای خودای لێ بێ) پێی وایە تەنیا وەرگەڕان لە ئایین نابێتە هۆی پووچەڵ بوونەوەی کردەوە، بەڵام ئەبو حەنیفەو مالیك (رەزای خودایان لێ بێ) پێیان وایە وەرگەڕانو مورتەد بوونەوە یەکسەر هەموو کردەوەیەکی لەناو دەباو پووچەڵی دەکاتەوە، تەنانەت ئەگەر دوای هەڵگەڕانەوەکەشی موسوڵمان ببێتەوە کردەوەکانی پێشووی بە فیڕۆ دەچن، بەڵگەشیان لەسەر ئەم رایەیان ئایەتی ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ – الزمر/٦٥﴾ واتە: ئەگەر هاوبەش بۆ خودا پەیدابکەی هەموو کردەوەکانت بە فیڕۆ دەچن.

یان دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ – الأنعام/٨٨﴾ واتە: ئەگەر هاوبەش بۆ خودا پەیدا بکەن کردەوەکانیان پووچەڵ دەکرێتەوە.

سوودو قازانجی ئەم جیاوازییەی نێوان ئەم رایانە کاتێك دەردەکەوێ کە کەسێك حەج بکاو دوایی مورتەد ببێتەوە ئەمجار موسوڵمان ببێتەوە، ئیمامی مالیكو ئەبو حەنیفە دەڵێن: دەبێ حەج بکاتەوەو حەجی لەسەرە، چونکە کافربوونەکەی حەجەکەی پێشووی هەڵوەشاندۆتەوە، ئیمامی شافیعی دەڵێ: حەجی لەسەر نیە چونکە لەوە پێش حەجی کردووەو هەڵگەڕانەوە لە ئایین حەجەکەی بەتاڵ ناکاتەوە بەمەرجێك بە کافری نەمرێ!

ئەمجار پەروەردگار دڵخۆشی ئەو هەشت کەسانە دەداتەوە، کە مەفرەزە بوونو چوون بۆسەر رێگای کاروانەکەو لە مانگی حەرامدا تووشی شەڕ هاتنو (عمرو الحضرمي)یان کوشتو دوو کەسیان لێ بەدیل گرتن، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ ئەو کەسانەی بڕوایان بە ئایینی ئیسلام هێناوەو موسوڵمان بوون، ﴿وَالَّذِينَ هَاجَرُواْ﴾ ئەوانەی لە رێگای خوادا کۆچیان کردووەو ماڵو زێدی خۆیان بە جێهێشتو وازیان لە خانوو بەرژەوەندی خۆیان هێنا. ﴿وَجَاهَدُواْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ لە پێناو ئایینی ئیسلامدا کۆششیان کردووەو گیانی خۆیان خستۆتە خەتەرەوە، ﴿أُوْلَـئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ اللَّهِ﴾ ئەوانە هەموو هیواو ئاواتیان بەدەستهێنانی رەحمەتی خودایەو رازی کردنی خودایە لە خۆیان، واتە: ئیمان هێنانیانو کۆچکردنیانو کۆشش کردنیان لەبەر خاتری رەزامەندی خودایە!

﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ خوداش لێخۆش بووەو رەحمیان پێ دەکا، سزایان نادا لەسەر ئەو هەڵەیەی کە کردیانو لە مانگی حەرام دا شەڕیان کرد.

## قۆناغی دووەم لە قۆناغەکانی یاساغکردنی عەرەق و قومار

﴿ ۞ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَـٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٠﴾ ﴾.

ئایەتی ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ﴾ دەربارەی عومەری کوڕی خەتتاب و مەعازی کوڕی جەبەل و کۆمەڵێك لە یارمەتیدەران کە هاتنە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وتیان: ئەی پێغەمبەر! دەربارەی خواردنەوەی عەرەق و قومارکردن فتوامان بۆ بدە، هەردووکیان عەقڵ دەبەن و ماڵ و سامان بەرباد دەکەن ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ:

ئیمامی ئەحمەد لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، دانیشتوانی عەرەقیان دەخواردەوەو قوماریان دەکرد، پرسیاریان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کرد دەربارەی خواردنەوەی عەرەق و قومارکردن، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ﴾

ئەی پێغەمبەر! پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی خواردنەوەی عەرەق‌و قومار کردن؛ ئایا حەلاڵن یان حەرامن؟؟ هەروەها کڕین‌و فرۆشتن‌و وەکالەت تێداکردن‌و ئەم جۆرە شتانە، ﴿قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾ وەلامیان بدەرەوەو پێیان بڵێ: خواردنەوەی عەرەق‌و قومار کردن تاوانی گەورەن، چونکە زیانی گەورەی ماڵی‌و بەدەنی‌و کۆمەلایەتییان تێدایە، عەرەق خواردنەوە زیان بە جەستەو عەقڵ‌و هۆش‌و ماڵ‌و دارایی دەگەیەنێ، پەیوەندی خزمایەتی‌و کۆمەلایەتی تێك دەدا، هەندێ لەو زیانانە کە زانایان‌و زانستی تازە دەریان خستووە ئەمانەن:

١- **زیانی تەندروستی**: مەعیدە تێك دەدا ئارەزۆی خواردن ناهێڵێ، پێڵووی چاو ئەستوور دەکا، ورگ پان‌و زل دەکا، رەنگ دەگۆڕێ، جەرگ‌و سی‌و میزڵدان نەخۆش دەخا، نەخۆشی سیل بلاودەکاتەوە، هۆکارێکی بەهێزە بۆ زوو پیر بوون، تەنانەت برێ لە زانایانی ئەڵمانی وتوویانە: عەرەقخۆریی چل ساڵە خانەکانی لەشی وەکوو خانەی لەشی مرۆڤێکی شەست ساڵ وایە!! هەندێکی تر دەڵێن: عەرەق خواردن زۆر لە ئەندامانی لەش پەك دەخا، یان لاوازیان دەکا، هەستی چەشتن لاواز دەکا، ئیلتهابی قورگ پەیدا دەکا، قورحەی ریخۆڵەو کشانی جەرگ دروست دەکاو بەزو چەوری لە دەوروبەر کۆدەکاتەوە، هێزی ئیش کردن لاواز دەکا، بەربەستی هەڵسوڕانی خوێن دەکاو زۆرجار وا دەبێ سەرخۆش کتوپڕ دڵی دەوەستێ‌و دەمرێ، هەروەکوو چۆن بۆریەکانی خوێن لەسەر حاڵەتی ئاسایی خۆیان ناهێڵن‌و لێك دەکشێن‌و گەورە دەبن‌و تێك دەچن، بەوەش خوێنەکە لە هەندێ ئەندامی دا خراپ دەبێ‌و تووشی نەخۆشی (غرغرينا) دبێ، کە نەخۆشیەکە لەهەر ئەندامێك پەیدا ببێ، پێویستە ئەو ئەندامە ببڕدرێتەوە، تا تەشەنە نەکاو هەموو جەستەی دانەگرێ‌و بیکوژێ، هەروەها دەبێتە هۆی لاواز بوونی تۆم‌و نەوەوگەرا، یان بن بڕبوونی بە تەواوی، زۆرجار وا دەبێ عەرەق خۆر منداڵی لاوازو بێ عەقڵ دەردەچێ!

٢- **زیانی بۆ عەقڵ**: عەرەق خواردنەوە هێزو توانای عەقڵ کەم دەکاتەوەو کاردەکاتە سەر جومگەی عەصەبی‌و جاری وا دەبێ سەردەکێشێ بۆ شێتی!

٣- **زیانی بۆ ماڵو دارایی**: عەرەق خواردنەوە ماڵو سامان بە فیڕۆ دەداو سەردەکێشێ بۆ پاش گوێ خستنی بژێوی ماڵو منداڵ.

٤- **زیانی کۆمەڵایەتی**: زۆرجار عەرەق خواردنەوە سەردەکێشێ بۆ بەرپا بوونی ناکۆکی لە نێوان سەرخۆشان خۆیاندا، لەگەڵ خەڵکی تردا، تەنانەت وادەبێ رووداوی کوشتنو برینداربوونو لێدان لەنێو سەرخۆشەکاندا روودەداتو کێشەو دووبەرەکی بۆ کۆمەڵ پەیدا دەبێ.

٥- **زیانی کەسایەتیو ئەدەبی**: زۆرجار وادەبێ سەرخۆش بە چاوی سووکو زەلیلو بێ رێز سەیر دەکرێ، دەبێتە شوێنی گاڵتە پێکردنو پێکەنین، چونکە سەنتەری قسەکردنو گوفتوگۆی نامێنێ، سەرخۆش زۆرجار دەست دەکا بە بوختانو جنێودانو داوێن پیسیو پیاوکوشتن، بۆیە بە عەرەق دەڵێن: (ماکی هەموو تاوانێك).

٦- **زیانی گشتی**: بلاوبوونەوەی نهێنی؛ زۆرجار هەواڵی نهێنیو گرنگی دەوڵەتی لەسەر مێزی عەرەق خواردنەوە دزە دەکا بۆ ناو دوژمن.

٧- **زیانی ئایینی**: سەرخۆش ناتوانێ خوداپەرستی خۆی بە رێكو پێکی ئەنجام بدا، بە تایبەتی نوێژ کە کۆڵەکەی ئایینە، عەرەق خواردنەوە ئادەمیزاد لە خوداپەرستیو یادکردنی خودا دوور دەخاتەوە، چونکە عەرەق خۆر هیچ هیوایەکی تری نیە جگە لە پێك هەڵدانو گەردن کەچی بۆ هەواو ئارەزووی کاتی خۆی، ئیرادەی زەبوون دەبێو تەمبەڵ دەبێ بەڵکوو ناتوانێ بەئاسانی واز لەمەی خواردنەوە بێنێ!

لەبەرئەوە کوحولی عەرەقەکە تێکەڵاو بە خوێن بووە، عەرەق خۆرەکە وای لێ دێ ئەوەندە تینوی عەرەق دەبێ بەبێ ئیختیار قومی لێ دەداو ناتوانێ وازی لێ بێنێ چونکە ئیرادەو کەسایەتی لە کیس چووە، بووەتە بەندەی هەواو هەوەس.

بە کورتی عەرەقو هەموو جۆرە خواردنەوەیەك یا خواردنێك کە ئادەمیزاد سەرخۆش بکا، سەرچاوەی هەموو تاوانو کردارێکی ناپەسەندە... نەسائی لە ئیمامی عوسمانەوە فەرموودەیەك دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: (اجْتَنِبُوا الْخَمْرَ فَإِنَّهُ أُمُّ الْخَبَائِثِ) خۆ بپارێزن لە عەرەق چونکە ئەو کانی هەموو تاوانێکە، ئەمجار درێژە بە فەرموودەکە

دەداو دەڵێ: (دەگێڕنەوە پیاوێکی خواناس هەبووەو، ئافرەتێکی بێ ڕەوشت حەزی لێ کردووە، ڕۆژێك کارەکەرێکی خۆی دەنێرێ بۆلای کابرا دەڵێ: وەرە ببە بەشایەت بۆ فلان کار، ئەویش لەگەڵ کارەکەرەکەدا دێ، کە دەگەنە ماڵەوە، هەر کابرا دەگاتە ژوورەوە، کارەکەرەکە دەرگاکانی لەسەر دادەخا، هەتا دەگاتە ژوورێك کە ئافرەتێکی زۆر جوانی لێ دەبێ، منداڵێکی لادەبێ لەگەڵ بتڵە عارەقێك، ئافرەتەکە پێی دەڵێ: ئێمە بۆ شایەتی بانگمان نەکردووی: یان دەبێ لەگەڵ مندا دەست تێکەڵاو بکەی، یان دەبێ ئەو منداڵە بکوژی، یان ئەو قاپە عەرەقە بخۆرەوە، کابرا کە ناچاربوو لەم سێ شتە دەبێ یەکێکیان بکات! وتی قاپە عارەقەکەم بدەنێ کەخواردیەوە وتی: هی تریشم بۆ بێنە دوایی کە سەرخۆش بوو سواری ئافرەتەکەش بوو منداڵەکەشی کوشت!! ئەمجار دەفەرموێ: خۆ بپارێزن لە عەرەق، سوێند بەخوا بیرو باوەڕ بەخوداو بەردەوام بوون لەسەر عەرەق خواردنەوە بەیەکەوە کۆنابنەوە؛ یەکیان دەبێ بۆئەوی تریان جێگا چۆڵ بکات!! مەبەستی ئەوەیە کەسێك عەرەق بخواتەوە موسوڵمان نییە.

## زەرەرو زیانی قوماریش زۆرو زەبەندن‌و لە زەرەرو زیانی عەرەق کەمتر نین لەوانە:

١- دەبێتە هۆی فیتنەیی‌و بەرپابوونی شەڕو ئاشووب لەنێوان یاریکەرەکانی قومارەکەو زۆرجار وادەبێ سەرو گوێلاکی یەکتری دەهێننە خوارەوە!

٢- یادی خودا لەبیر دەباتەوە بەتایبەتی نوێژکردن.

٣- ڕەوشتی ئادەمیزاد تێکدەداو خەڵکی فێری تەمبەڵی‌و تەوەزەلی دەکاو چاوەڕوانی ئەوە دەبن لەڕێگای خەیاڵییەوە ڕزق‌و ڕۆژییان بۆبێ، واز لەکارو کاسبی حەلاڵ دێنن‌و خۆ خەریکی بازرگانی‌و پیشەسازی‌و کشتوکاڵ ناکەن!

٤- ماڵ وێرانی لەناکاو خانەخراپی‌و ماڵ‌و دارایی بەفیڕۆچوون، زۆرجار بینراوە کە خانەوادەو خێزانی خاوەن ماڵ‌و دارایی زۆر لەچاو لێکنانێکدا هەژار کەوتوون‌و

مایە پووچ بوونو رووتو رەجاڵ کەوتوون، بەهۆی قومارکردنی یەکێك لە ئەندامانی خێزانو پارە دۆڕانەوە!

**سوودو قازانجی عەرەق ئەمانەن:**

۱- بازرگانی پێوەکردنی، بێگومان هەر لەکۆنەوە عەرەق باشترین کاڵایە بۆ دەوڵەمەندبوونو زۆربوونی پارە.

۲- جاری واهەیە دەبێتە دەرمان بۆ هەندێ دەرد، ئەگەر بەکەمی بخورێتەوەو ئەوەندە نەبێ سەرخۆشی بکا!

۳- خەم رەوێنو دڵ خۆشکەرەیەکی کاتییە.

٤- غیرەت زۆردەکاو ترس ناهێڵێ، ئەمە لەلای عەرەبەکان گەورەترین سوودی عەرەق خواردنەوە بووە، هەرچەندە ئێستا ئەمەش زەرەرو زیانی هەیە.

۵- مرۆڤی چرووكو باخەڵ قووڵ، دڵ فراوان دەکاو سەخی سرووشتی پەیدادەکا.

**سوودی قوماریش ئەمانەن:**

۱- کۆمەکی کردن بە هەژارانو دڵدانەوەیان وەکوو لەپارەی (یانصیب) خەستەخانەو قوتابخانەو پردو رێگاو بانو ئەوجۆرە شتانە چاك دەکرێ.

۲- دڵ خۆشبوونی ئەوکەسەی یارییەکە دەباتەوە.

۳- هەژار پێی دەوڵەمەند دەبێو بێ ماندوو بوون دەبێتە خاوەنی پارەو پوول.

﴿وَإِثۡمُهُمَآ أَكۡبَرُ مِن نَّفۡعِهِمَا﴾ تاوانەکەیان لەسوودەکەیان زیاترە. زانایانی ئیسلام لەمبارەیەوە قاعیدەیەکی زۆر تۆکمەو کەم وێنەیان دەرهێناوە کە دەڵێن: (لابردنی خراپەکان لەپێشترە لە دەستەبەر کردنی بەرژەوەندییەکان) وەکوو بەندێکی یاسایی لە عیلمی ئوصوولدا چەسپاندوویانەو دەڵێن: (درأ المفاسد مقدم على جلب المصالح) یان ئەم قاعیدەیە کە دەڵێ: (ارتكاب أخف الضررين إذا كان لابد من أحدهما).

جا لەبەرئەوەی ئایەتەکە بەڕاستو رەوانیو بێ پێچو پەنا عەرەق خواردنەوەی حەرام نەکردووەو نەبووەتە شەریعەتو یاسایەکی گشتی، بەڵکوو هەرکەسە بەپێی

بۆچوونی خۆی پەیڕەوی ئایەتەکەی کردووە، ئەوەی مانای تەحریمی لێ دەرهێناوە لێی دوور کەوتۆتەوە، ئەوەی کە ئەو مانایەی لێ دەرنەهێناوە بەلایەوە خواردنەوەی حەلاڵ بووە، هەر بۆیە هاوەڵانی پێغەمبەر هەریەکەیان رایەکی هەیەو دەربارەی عەرەقو پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) لێیان بێ دەنگ بوو، ئیمامی عومەریش هەردەم دەپاڕایەوە کە بەبێ پێچو پەنا ئایەتێکی قورئان لەمبارەیەوە بنێردرێتە خوارێ هەتا ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ......﴾ لە سوورەتی مائیدەدا هاتە خوارێ ئیتر موسوڵمانان سەرجەم وازیان لە عەرەق کڕینو فرۆشتنو خواردنەوەی هێنا!

جا چونکە عەرەق زیانی زۆرە، لەپێش هاتنی ئیسلامدا زۆر لە عەرەبەکان نەیان دەخواردەوە، یەکێ لەوانە عەبباسی کوڕی مەرداس بوو کاتێك پێیان وت: بۆ عەرەق ناخۆیەوە هەتا هەندێ جەستەت گەرم دابێ، وتی من ناچم بێ عەقڵیو نەفامی بێنم بەدەستی خۆم بیخەمە ناو جەستەی خۆمەوە! هەرگیز رازی نابم پیاو ماقوڵی خێڵ بمو ببمە گاڵتەچی خێڵو بێ عەقڵو نەفام ببم!

بێگومان ئێستا لە خۆرئاواو وڵاتە پێشکەوتووەکان چەندەها یانەو گروپو کۆڕو کۆمەڵ دروست بوونو لە هەوڵو تێکۆشاندان بۆ قەدەغەکردنی عارەق. هەندێ وڵات سزای گەورەی داناوە بۆ عەرەق فرۆشەکان!

ئێستایش کە ساڵ دوای ساڵ رۆژگارو زانست زیاتر زەرەرو زیانی عەرەقو قومار دەردەخەن. فەرموودەکەی قورئان کە دەفەرموێ: ﴿وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا﴾ بەڕوونی وەکوو حەقیقەتێکی زانستی دەدرەوشێتەوە!! بەڵام هەواو هەوەس چاوی زۆر کەسی لەو بەناو پێشکەوتن خوازانە لەڕاستی ئەم حەقیقەتە کوێر کردووەو زۆر زیادە ڕەوییان لەخواردنەوەیدا کردووە، هەتا بەتەواوی چینی گەنجی داگرتووە، خۆشی دونیای لێ بڕیونو گەلو نەتەوەش سودو قازانجیان لێ نابینێ، باوكو دایكو خزمو کەسو کاریشیان خۆشییان لێ نابینن، لەکاتێکا وڵات زۆر پێویستی بە هەوڵو تێکۆشانی ئەم گەنجانە هەیە.

بێگومـــان فیتنـــەو شـــەڕو شـــۆڕی عـــەرەق خواردنـــەوە لـــەناو دەوڵەمەنـــدو ساماندارەکاندا سەری هەڵداو، ئەمجار تەشەنەی کرد بۆ چینی مووچە خۆرو مامۆستاو ئەمجار بۆ کرێکارو وەرزێر، جگە لەمـەش نەخۆشی سامناکی تـر بلاوبوونـەوە، وەکوو نەخۆشی ئایدزو سوفلیو شێرپەنجەو چەند نەخۆشی تریش، ئێستا واخەریکە چەند نەخۆشـی سـامناکترو دابو نـەریتی روخێنـەرتر بلاودەبنـەوە وەکـوو دەرزی مـۆرفین لەخۆدانو بۆنکردنو هەڵمژینی کۆکایینو هیرۆیـینو تلیاك کێشانو ئـەمجۆرە شـتانە زەرەرو زیانی ئەمانە زۆر لەهی عارەقو قومار خراپترو سامناکترە!!

﴿وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ﴾ پرسـیارت لێ دەکـەن چ بەشـێك لـە ماڵو داراییان ببەخشنو چ بەشێکی بهێڵنەوە کە پێیان بگوترێ پابەندی فەرمانی خودان کە دەفەرموێ: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ تۆ ئەی پێغەمبەر! لە وەلامدا پێیان بڵێ: ئەوەی لە خەرجیو گوزەرانی خۆتـانو مـاڵو منـداڵتان زیـاد بـوو خـەرجی کـەن بـۆ پەککەوتـەو داماوانو بۆ بەرژەوەندی گشتی وەك دروست کردنی پردو قوتابخانـەو خەستەخانە.... هتد.

قورئانی پیرۆز ئەندازەی ئەم ماڵ بەخشینەی دیاری نەکردووە، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك بـە ویـژدانو دڵو دەروونـی خـۆی ئەنـدازەداری بکـا، مەبەسـتیش لـەم مـاڵ بەخشینە جگـە لـە زەکـاتو سـەرفیترەی شـەرعییە، ئـەم جۆرە مـاڵ بەخـشینە خێـرو چاکەیە، کە خاوەن ماڵ بە ئـارەزووی خـۆی خـەرجی دەکـا بـۆ هـەژارانو لێقـەوماوانو بەرژەوەندی گشتی وەکوو پردو خەسـتەخانەو قوتابخانـەو چاککردنی رێگاوبـانو ئـەو جۆرە شتانە:

حیکمـەتی پـەروەردگار وابـوو: کـە لەسـەرەتای هـاتنی ئیـسلامدا ئەنـدازەی مـاڵ بەخـشین بـە شـێوەیەکی رەهـاو بـەرفراوان بـێ، مـەتحو ثـەنـای ئەوانـەی کـردووە کـە بەرژەوەنـدی موسـوڵمانانیان پـێش بەرژەوەنـدی خۆیـان خـستووە، چـونکە ئـەو کاتـە موسوڵمان کۆمەڵێکی کەم بوونو هـەموو گـەلو نەتەوەیـەکی جیهان ناحـەزیان بـوون. سـەرو ماڵیـان لـە پێنـاو لەناوچـوونی ئەوانـدا بـەخت دەکـرد، بۆیـە پێویـست بـوو

موسوڵمانان یەك مەبەستو یەك هەڵوێست بنو ماڵو دارایی خۆیان خەرج بکەن لە پێناو بەرژەوەندی گشتیدا، ئەمەش سوننەتی خودایە لە هەموو ئاینێکدا پێویستەو دەبێ پەیڕەوکارانی لەسەرتادا ئاوا خۆنەویستو خەبات گێڕو لێبوردوو بن، ئەمجار ئەگەر زۆر بوونو بەهێز بوون ئەوکاتە ئیتر بە ئارەزووی خۆیان چییان لێ زیاد بوو دەیبەخشن بۆ بەرژەوەندی گشتیو داڵدەی هەژاران!

بوخاریو موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە حەدیثێکیان گێڕاوەتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (خَيْرُ الصَّدَقَةِ مَا كَانَ عَنْ ظَهْرِ غِنًى ، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ) باشترین خێرو دەستگیرۆیی کردنی هەژاران ئەوەیە کە بە دەوڵەمەندی بیکەی، کە خێریشت کرد لەو کەسەوە دەست پێ بکەی کە بژێویان لەسەرتەو یارمەتیدانی ئەوانت لە ئەستۆیە.

ئیبنو خوزەیمە فەرموودەیەکی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێ: (خَيْرُ الصَّدَقَةِ مَا أُنْفقت غِنًى، وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ، تقول المرأة أنفق علي أو طلقني، ويقول مملوكك أنفق علي أو بعني، ويقول ولدك إلى من تكلني؟).

ئیبنو سەعد لە جابیرەوە حەدیثێکی ریوایەت کردووە: دەفەرموێ: ئەبولحوصەینی (السلمی) هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە ئەندازەی هێلکە کۆترێکی زێڕ پێ بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمەم لەکانێك دەرهێناوە، دەیکەم بەخێر، لێم وەربگرە هەر ئەوەندەشم هەیە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) رووی لێ وەرگێڕاو لێی وەرنەگرت: ئەمجار لەلای راستەوە هاتەوە خزمەتیو بەهەمان شێوە ئاخاوتنی لەگەڵدا کردەوە ئەویش رووی لێ وەرگێڕایەوە، ئەمجار لەلای چەپەوە سەرەی گرتەوەو هاتەوە خزمەتیو بەهەمان شێوە عەرزی کردەوە ئەویش دووبارە رووی لێ وەرگێڕایەوە ئەمجار لەپاشەوەڕا هاتەوە خزمەتیو بەهەمان شێوە عەرزی کردەوە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لێی وەرگرتو تێی گرتەوە، ئەگەر بەری بکەوتایە بەبێ شك ئێشی پێ دەگەیاند یان برینداری دەکرد، ئەمجار فەرمووی: چۆن وادەبێ؟؟ یەکێك لەئێوە چی ماڵو دارایەك

شك دەبا دەیهێنێ دەیكا بـەخێر!! ئـەمجار هیچی نامێنـێو فـەقیر دەكـەوێو دەسـتدەكا بەسوالكردن! بزانن باشترین خێرو ماڵ بەخشین ئەوەیە كە بەدەوڵەمەندیی بیكەی، تـا ماڵو خێزانت پێویسیان بێ خێر بەكەس مەكە، لەپێشەوە چاكە لەگـەڵ ئەوانـەدا بكـە كە بژێوییان لەسەرتە:

وێدەچـێ بگـوترێ: حیكمـەت چـییە!! قورئـان لـە ئایەتێكـدا دوو پرسـیاری كۆكردۆتەوە؟؟ پرسیار لە عارەق‌و قومارو پرسیار لەماڵ بەخشین. لـە وەڵامـدا دەڵێین: بـۆ بەرامبـەری‌و هاوكێشەكردن لـەنێوان حـاڵو چۆنیەتی‌و هەڵوێـستی دوو كۆمـەڵ، كۆمـەڵێكیان بـەبێ حیساب‌و كیتـاب مـاڵو دارایـی خـەرج دەكـەن لـەگوناهو شـتی بـێ شەرعیدا، بەس بۆ خۆهەڵكێشان‌و خۆبادان‌و شتێك كەهیچ خێروبێرێكی تێدانییە. یان بۆ وەدەست هێنانی خۆشییەكی كاتیی با ئاكامەكەشی خراپ بـێ، كۆمەڵێكیـشیان مـاڵو دارایی خۆیان دەبەخشن لەرێگەی خوادا بۆ دابینكردنـی پێویـستیاتی هـەژاران، یـان بـۆ بەرزكردنـەوەی شـان‌و شـكۆی گـەل‌و نیـشتمانەكەی‌و چـاككردنی رێگـەو بـان‌و دروسـت كردنی خەستەخانەو قوتابخانەو ئەم جۆرە شتانە ﴿كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الآيَاتِ﴾ ئـاوا بـەوجۆرە پـەروەردگار ئـەحكامی خۆیتـان بـۆ روون دەكاتـەوە، هەریاسـاو نیظـامێـك بەرژەوەندیی ئێوەی تێدابێ‌و عـەقڵو هۆشـتان بكاتـەوە زەرەرو زیانتـان پـێ نیـشانبدا، بۆتان شیدەكاتەوە، بۆچی؟ ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ﴾ بـەڵكوو ئێـوە بـیر لەبەرژەوەنـدیی دونیـاو قیامـەتی خۆتـان بكەنـەوە، چـاكەو خراپـەی خۆتـان لێـك جیابكەنەوە، پێداویستی تەن‌و گیان هـاو تـەرازوو بكـەن‌و بـبن بـە گـەل‌و نەتەوەیـەكی مامناوەنـدی، وەكـوو ئەوانـەتان لێ نەیـە كـە پێیـان وابـوو دەسـتكەوتی قیامـەت بـێ وازهێنان لەبەرژەوەندی دونیا دەستەبەر نابێ، ئیتر دونیاو قیامـەتیان لەدەست چوو!! یان وەكوو ئەوانەی كەخۆیان خزاندۆتە خۆشی‌و لەززەتەكانی دونیاوە، رەوشتی خۆیان تێكداو چوونە ریزی ئاژەڵانەوە، بەتەواوی خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت بوون.

ئەم ئایەتەو وێنەی ئەم ئایەتە ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە ئایینی ئیسلام هەمیشە هەوڵدەدا بـۆ فراوانكردنـی بازنـەی فیكـرو بۆچوون‌و بـەكارهێنانی عـەقڵو ئـاوەز بـۆ

دەستەبەرکردنی بەرژەوەندیی هەردوو دونیا. هەر لەڕوانگەی مانای ئەم ئایەتانەوە زانایانی ئیسلام فەرموویانە هەموو فەنن و پیشەسازییەك کەبۆ مرۆڤ پێویست بێ، بەئەرکێکی ئایینی دەژمێردرێ، پێویستە کۆمەڵێك لە موسوڵمانان پێی هەڵسن و ئەنجامی بدەن، خۆ ئەگەر پاشگوێیان خست و ئیشەکە راوەستا، ئەوە هەموو کۆمەڵگا تاوانبار دەبێ و بەسەرپێچیکەری فەرمانی یەزدان حسێب دەکرێن.

لەسەر ئەم داب و دەستووورە موسوڵمانان لەسەدەکانی یەکەم و دووەم و سێیەم و چوارەمدا رەفتاریان دەکردن، هەرکاتێ گەل و نەتەوە پێویستییان بەشتێکی پێویستی ئاوەدانی ببوایە، کارکردنیان لەوشتەدا بەواجبێکی ئایینی دەزانی، بۆیە وا پێشکەوتوو سەرکەوتوو بوون، بەڵام سەد مەخابن کاتێك کۆمەڵێك زیادەڕۆییان لەئاییندا کردو بەرژەوەندی دونیاییان پاشگوێ خست و پێیان وابوو کۆڵ هەڵنەگرتن بەکاروباری دونیاییەوە، ناوەڕۆکی ئایینە، سەرەنجام شەریعەت ئیهمال کراو گەل و نەتەوەیەك نەمایەوە سەد دەرسەد پەیڕەوی فەرمانی خودا بکا، موسوڵمانان کەسێکی وایان تێدا نەمایەوە بۆ حوکم کردن بگونجێ و بتوانێ پێشەوایەتی موسوڵمانان بکاو رۆژگاری زێڕینیان بۆ بگێڕێتەوە، بۆیە بەو دەردە چووین کەوادیارە: وڵاتمان هەموو کرا بەسەنگەر – هێزی ئیستعمار لێی خستووە لەنگەر!

﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْيَتَامَى﴾ ئەی پێغەمبەر! پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی هەتیوو، چۆن هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا بکرێ؟ چۆن ماڵ و داراییان رەدام بهێنرێ، چۆن سەرپەرشتی بکرێن و بەخێو بکرێن؟

ئەبو داوودو نەسائی و حاکم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەفەرموێ: کاتێك ئایەتی ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ و ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى﴾ هاتنە خوارێ، هەر موسوڵمانێك هەتیوی لابوو خواردن و خواردنەوەیان بۆ جیاکردنەوە، لە ماڵ و دارایی خۆیان خواردنیان بۆ دروست دەکردن و هەڵیان دەگرت تا دەیخوارد یان بۆگەنی دەکردو فڕێ دەدرا، ئیتر ئەمەیان بەلاوە گران

بوو، چوونە خزمەتی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ)و لەمبارەوە پرسیاریان لێکرد ئیتر ئایەتی ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْيَتَامَى﴾ هاتە خوارێ.

گەورەترین هەڕەشەیەك کە لەقورئاندا دەربارەی چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ هەتیودا هاتبێتە خوارێ ئایەتی ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا﴾ بێگومان موسوڵمانانی پێشوو پارێزگاری سنوورەکانی خودایان دەکردو فەرمان و ئامۆژگارییەکانی قورئانیان بەرێك و پێکی ئەنجام دەدا، بۆیە ئەم ئایەتانە بەتەواوی سەرو دڵی موسوڵمانانی گرت و خستنیە سەرسامییەوەو نەیان دەزانی چۆن هەڵس و کەوت لەگەڵ ماڵ و دارایی هەتیواندا بکەن، لەوە دەترسان کە بەشێك لەماڵی ئەوان تێکەڵاوی ماڵیان ببێ و تووشی زوڵم و ستەم ببن، هاوەڵانی پێغەمبەر دەترسان لەوە: کە هەتیو لەخۆ بگرن و لەگەڵ خۆیاندا دایان بنێن.

هەیانبوو بەهیچ جۆرێك هەتیووی لەخۆ نەدەگرت، هەیانبوو لەخۆی دەگرت بەڵام لەخاوو خێزانی خۆی جیای دەکردەوە، تەنانەت خواردنیشیان بەجیا بۆ دروست دەکردن، ئەمجار پاش ماوەیەك هەستیان بەتەنگژەی ئەم حاڵەتە کرد، زیاد لەوەش چ بەرژەوەندییەکیان بۆ هەتیوەکە تێدا بەدی نەدەکرد بەڵکوو زیانی بۆ هەتیوەکان هەبوو، زیانی بۆ بەخێوکردنەکەیان هەبوو، ماڵ و دارایشیان بەفیڕۆ دەچوو؛ مامەڵە کردن لەگەڵیاندا بەوجۆرە زیاتر دەشوبهایە مامەڵەکردن لەگەڵ ئاژەڵ و سەگ و پشیلە، لەبەرئەوە هاوەڵانی پێغەمبەر کەوتنە پرسیارکردن لەوە کەچی بکەن بەرژەوەندی هەردوو لای تێدابێ شتێك بێ مافی هەتیوەکان و بەخێوکەرەکانیان لەخۆ بگرێ و پارێزراوبێ، هەتیوەکان بەڕێزەوە لەماڵی بەخێوکەرەکەیان وەکوو یەکێ لە ئەندامانی ماڵ و بەمندالی ئەو خێزانە حسێب بکرێ و هەڵس و کەوتی لەگەڵدا بکرێ، بەخێوکەریش پارێزراوبێ و نەکەوێتە ئەو هەڵەوە بەناحەق شتێك لەماڵی هەتیوەکەی بەلاوە بچێ، ئیتر بەم ئایەتەی دوایی وەڵامیان درایەوە: کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ وَإِنْ تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر بەو کەسانە بڵێ: کە پرسیارت لێ دەکەن و دەڵێن: ئایا بەرژەوەندی هەتیوو لەوەدایە گۆشەگیری بکەی و لەخێزان دووری

بخەیەوە، یان لەگەڵ منداڵو خێزاندا وەکوو یەکێ لە منداڵەکانی ئەو خێزانە بەخێو بکرێ؟! بڵێ: هەر جۆرێك بۆ هەتیوەکان باش بێ ئەوە باشە، پێویستە ئێوە بەخێویان بکەن، پەروەردەیان بکەن، ماڵو داراییان بخەنە گەڕو ئیشیان بۆ پێ بکرێ، ئەگەر دووکانو خانووبەرەیان هەبوو بەکرێ بدرێ ئەگەر پارەیان هەبوو بخرێتە بازرگانیەوە، خۆیانو ماڵو داراییان پاش گوێ نەخرێ، ئەگەر لە پۆشاكو نانخواردنو بەخێوکردندا وەکوو منداڵی خۆتان هەڵسو کەوتیان لەگەڵ بکەن، هیچ تاوانێکی تێدا نیەو ئەوان کوڕو برای ئایینی ئێوەن، کوڕو براش دەبێ بەیەکەوە بژینو پەروەردە بکرێن، هەتیو لە ماڵدا وەکوو برای بچووك سەیری دەکرێو بەرژەوەندی دەپارێزرێ ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ الْمُفْسِدَ مِنَ الْمُصْلِحِ﴾ خودا ئاگادارو زانایە، دەزانێ دڵی ئادەمیزاد چی تێدایەو لە کردارەکانیدا چ مەبەستێکی هەیە، رۆژی قیامەت لێکۆڵینەوەو حیسابتان لەگەڵدا دەکا، لەسەر بچووكو گەورە پاداشو سزای هەیەو هیچی لێ هون نابێ!

پەروەردگار بۆیە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد؛ کە ئاگاداری مەبەستی ناو دڵی ئادەمیزادە، بۆ ئەوەی لە هەموو شتێکدا ئەوە بەرچاو بگیرێ، چاوەڕوانی سزا یان پاداش بێ، لەسەر ئەو کارەی ئەنجامی دەدا، تاوەکوو لە هەڵەکردن دوور بێو لە شوێنی شوبهە دوور بکەوێتەوە، چونکە تەماعو تەماعکاری رۆڵی گرنگیان هەیە لەسەر کردەوەی ئادەمیزاد، زۆرجار تەماع ئادەمیزاد لە خشتە دەباتو وای لێ دێ دەم دەژەنێتە ماڵی هەتیو، هەروەکوو زۆرجار برای گەورە هیچ کۆ لە خواردنی ماڵی برای بچوك ناکاو بەرژەوەندی ئارەزوی خۆی لێ رادەهاوێ، دیارە هەست کردن بەو چاودێری کردنەو ترسان لە خودا، دەبێتە لەمپەڕ ناهێڵێ کابرای بەخێوکەر دەست درێژی بکا بۆ ماڵی هەتیو، خۆ ئەگەر ئەو هەست کردنە نەبوو، کابرا لە ناخەوە لە خودا نەترسا، ئەوە ستەم دەکاو ماڵی هەتیو دەخواو خۆی ماڵوێران دەکاو ماڵی دونیاو قیامەتی دەشێوێنێ! بۆیە دەبینین زۆر لە سەرپەرشتیکەرانی هەتیو بەرواڵەت خۆیان بەدەست پاكو بێ تەماع دەردەخەن لە ئاستی ماڵی هەتیودا بەڵام لە راستیدا چونکە ئەو

وازیعە ئایینیەو ترسانە نهێنییەیان لە خودا لەدڵدا نیە، دەست درێژی دەکەنە سەر ماڵی هەتیوانو خۆیان بەو پارە حەرامە دەوڵەمەند دەکەن!

﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لأعْنَتَكُمْ﴾ ئەگەر خودا بیویستایە ئەرکێك بخاتە سەرشانتان: کە نەتوانن ئەنجامی بدەن، داوای ئەوەی لێ بکردنایە کە نابێ ئەو هەتیوانە تێکەڵاو بەئێوەبنو ماڵو سامانیشیان سەرپەرشتی بکرێو بۆخۆیان بەخێوبکرێنو بەگۆشەگیری هەڵسو کەوتیان لەگەڵدا بکرێ، ئەوە ئەو ئەرکەی دەخستە سەرشانتان بەڵام خودا لەبەر فراوانی رەحمەتو بەزەیی شتێکی وای داوا لێ نەکردوون کە ئەنجامدانی زەحمەت بێ، ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ لە ئاییندا ئەرکێکی وای نەخستۆتە سەرشانتان: کە بۆتان هەڵنەسورێ، ئەوەتا رێگەی بەئێوە داوە کە هەتیو تێکەڵ بەمنداڵو خێزانی خۆتان بکەن، مامەڵەی کورو کچو خوشکی خۆتانیان بۆ بکەن! ﴿إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ بێگومان خودا خاوەن دەسەڵاتە، ئەگەر بیویستایە ئێوە ماندوبکا کەس نەیدەتوانی بەرگری ئەوە بکا، بەڵام سوننەتی خودا وا جاری بووە: کە شەریعەتو یاسای وابێ بەرژەوەندی ئادەمیزادی تێدا بێ، بەگشتی گونجاو بێ لەگەڵ بنچینەی سروشتی مامناوەندی ئادەمیدا!!

حیکمەت لە وێکڕاهێنانی پرسیار لە چۆنیەتی رەفتار کردن لەگەڵ هەتیواندا و لکاندنی بەپرسیار لە چۆنیەتو چەندییەتی ماڵ بەخشینو حوکمی عەرەقخواردنەوەو مامەڵەپێکردنیو قومارکردن، ئەوەیە کە پرسیاری یەکەمو دووەم حاڵو چۆنیەتی دوو کۆمەڵ خەڵکی روون کردەوە، لە ماڵبەخشینو ماڵ خەرج کردندا.

هەروەها گونجاوە کە دوابەدوای ئەوە پرسیارێك بێنێ دەربارەی ئەوەی کێ شیاوترە کە چاکەی لەگەڵدا بکرێو پارەو پوولی بەخێر بدرێتێو ماڵو دارایی لە پێناو بەخێوکردنیدا خەرج بکرێ؛ کە ئەوانیش کۆمەڵی هەتیوانن، واتە: پەروەردگار لە ئەوەمان ئاگادار دەکاتەوە کە ئێمە کاتێك هەتیو لەخۆ دەگرینو بەخێوی دەکەین، پێویستە کە مەسرەفەکە لە ماڵی خۆمان بێ چونکە ئەوان لەو جۆرە کەسانەن کە

پێویستە لە زێدە ماڵی خۆمان بەشیان بدەین و یارمەتییان بدەین نەك بەپێچەوانەوە، ئێمە تەماع لە ماڵی ئەوان بکەین و ماڵ و داراییان بخۆین.

## موسوڵمان نابێ ئافرەتی موشریك مارە بكا

﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَـٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا۟ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ ۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٢١﴾ ﴾.

ئیبنو لمونذیرو ئیبنو ئەبو حاتەم و واحیدی لە موقاتیلەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی ئیبنو ئەبی میرثەدی ئەلغەنەوی هاتۆتە خوارێ: کە داوای لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کرد ڕێگای بدا (عەناق) مارە بکا، ئەم ئافرەتە ئافرەتێکی جوان و شۆخ و شەنگ بوو، بتپەرست و خوانەناس بوو! لەم بارەوە ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارێ و ئەم جۆرە ژن مارەکردنەی قەدەغە کرد.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) میرثەدی کوڕی ئەبو میرثەدی نارد بۆ مەککە بۆ ئەوەی هەندێ موسوڵمان لەوێوە بێنێ بۆ مەدینە، ئەم کابرایە پێش موسوڵمان بوونی حەزی لە ئافرەتێك بوو ناوی (عەناق) بوو، کە لە مەککە میرثەدی بینی ویستی لەگەڵی رابوێرێ بەڵام میرثەد وتی: من موسوڵمان بووم و ئایین ئەوەی لێ یاساغ کردووم! وتی: دە باشە مارەم بکە، وتی: باشە

پێویستە لە زێدە ماڵی خۆمان بەشیان بدەین‌و یارمەتییان بدەین نەك بەپێچەوانەوە، ئێمە تەماع لە ماڵی ئەوان بکەین‌و ماڵ‌و داراییان بخۆین.

## موسوڵمان نابێ ئافرەتی موشریك مارە بکا

﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَـٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا۟ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ ۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٢١﴾﴾.

ئیبنو لمونذیرو ئیبنو ئەبو حاتەم‌و واحیدی لە موقاتیلەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی ئیبنو ئەبی میرثەدی ئەلغەنەوی هاتۆتە خوارێ: کە داوای لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کرد ڕێگای بدا (عەناق) مارە بکا، ئەم ئافرەتە ئافرەتێکی جوان‌و شۆخ‌و شەنگ بوو، بتپەرست‌و خوانەناس بوو! لەم بارەوە ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارێ‌و ئەم جۆرە ژن مارەکردنەی قەدەغە کرد.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) میرثەدی کوڕی ئەبو میرثەدی نارد بۆ مەککە بۆ ئەوەی هەندێ موسوڵمان لەوێوە بێنێ بۆ مەدینە، ئەم کابرایە پێش موسوڵمان بوونی حەزی لە ئافرەتێك بوو ناوی (عەناق) بوو، کە لە مەککە میرثەدی بینی ویستی لەگەڵی رابوێرێ بەڵام میرثەد وتی: من موسوڵمان بووم‌و ئایین ئەوەی لێ یاساغ کردووم! وتی: دە باشە مارەم بکە، وتی: باشە

بەڵام با بچمەوە بۆ مەدینەو پرسو ڕا بە پێغەمبەر بکەم، بزانم ڕێگا دەدا، کە پرسی پێ کرد ئەم ئایەتە هاتە خوارێو فەرمووی: ﴿وَلاَ تَنكِحُواْ الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ﴾ ئافرەتانی بتپەرستو ئەوانەی هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن مارەیان مەکەن، تا بڕوا نەهێنن، مەیانکەن بە هاوسەری خۆتان ﴿وَلأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ﴾ ئافرەتە کۆیلەیەکی موسوڵمان – هەرچەندە پلەی نزمە زۆر باشترە لە ئافرەتێکی ئازادی بتپەرستو هاوبەش پەیداکەر هەرچەندە ڕیزی ئازادی هەیە – با جوانیو ساماندارێ ئەو ئافرەتە سەرنجی ئێوە رابکێشێو کەمەندکێشتان بکاو حەزتان لێی بێ! چونکە باوەڕ تەواوکەری ئایینە، ماڵو دارایی تەواوکەری دونیایە، لەبەرچاو گرتنی ئایین پێش لەبەرچاو گرتنی دونیایە. ﴿وَلاَ تُنكِحُواْ الْمُشِرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُواْ﴾ ئافرەتە موسوڵمانەکانی خۆتان لە بتپەرستەکان مارە مەکەن تا ئیمان نەهێنن بە تاکو تەنیایی خوداو پێغەمبەرایەتی (محمد)و نەیەنە ڕیزی پیرۆزی موسوڵمانانەوە، ئەوکاتەی واز لە بتپەرستیو بێ بڕوایی دێنن، ئەوکاتە دەبنە هاوشانی ئافرەتانی موسوڵمان دەشێ ببنە هاوسەریان. ﴿وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ﴾ کوڕە کۆیلەیەکی موسوڵمان – هەرچەندە کۆیلایەتی پلە نزمییە – باشترە لە کوڕێکی بتپەرستی هاوبەش پەیداکەر با بنەماڵەو خانەدانو دەوڵەمەندو خاوەن کەسو کار بێ.

پوختەی مانای ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە نابێ موسوڵمان پەیوەندی زاواو خەزووری لەگەڵ کافرو هاوبەش پەیداکەراندا ببەستێ، نابێ کچیان بداتێو بیانکا بەزاوای خۆی، هەروەها نابێ ئافرەتیان لێ بخوازێو بیانکا بەخەسوو خەزووری خۆی، چونکە ژنو مێردایەتی ژیانێکە هاوبەشو هاریکارییە.

ئافرەت لە ژیانی خێزانیدا جێگای متمانەی پیاوە، ئەمینداری ماڵو منداڵیەتی، شوێنی رازو نیازو نهێنییەتی، شۆخیو ڕوخسار جوانی ئەم ڕەوشتە گرنگە بۆ ئافرەت دەستەبەر ناکا؛ چونکە هابەش پەیداکەر پابەندی ئایینێك نیە خیانەتکاری لێ قەدەغە

بکاو لە خراپەکاری بیگێڕێتەوە، وا دەبێ خیانەت لە مێردەکەی دەکاو بیروباوەڕی مندالّەکانی تێك دەدا!!

بەلاّم ئافرەتی مەسیحیو جولەکە، ئەوە قورئان بەئاشکرا مارەکردنی حەلاّلّ کردوونو دەفەرموێ: ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ واتە: حەلاّلە بۆ ئێوە کە ئەو ئافرەتانەی بڕوایان بە نامە ئاسمانیەکانی پێشوو هەیەو پێش ئێوە نامەیان بۆ نێردراوە مارەیان بکەنو بیانکەن بەهاسەری خۆتان.

حیکمەتی ئەم وەگری بوونە لەگەلّ خاوەن نامەکاندا ئەوەیە: تا هەست بەجوان رەوشتیو هەلّوێستی رێكو پێکی موسولّمانان بکەنو بزانن شەریعەتەکەیان چەند ئاسان خوازە؛ پیاو لە خێزاندا سەروکارو بەرپرسیارو سەرپەرشتیکارە، جا کە لەگەلّ ئەو دەسەلاّتەی کە هەیەتی هەلّسو کەوتی لەگەلّ خێزانی جوان بێ، دەبێتە بەلّگەیەکی بە هێز کە ئاینەکەمان ئاینێکی پیرۆزو دادپەروەرە، هەلّگرانی سنگ فراوانو چاوپۆشیکەرن، گیانی دیموکراتیو تەباییو مرۆڤایەتییان تێدایە! بەلاّم شوو کردنی ئافرەتی موسولّمان بە کوڕێکی مەسیحی یان جولەکە، بەگوێرەی فەرموودەی پێغەمبەرو بڕیاری کۆمەلّی موسولّمانان (أجماع الأمة) حەرامە، حیکمەتو پەنامەکییەکەی لەوەدایە کە ئافرەت ئەو دەسەلاّتەی پیاوی نیەو ئەو مەبەستانەی کە لە مارەکردنی ئافرەتی مەسیحیو جولەکە بۆ کوڕی موسولّماندا هەیە لە شوو کردنی ئافرەتی موسولّمان بە کوڕی مەسیحی یان جولەکەدا نایەتە جێ.

وێ دەچێ پیاوەکە بەهۆی دەسەلاّتەکەیەوە کار لە ئافرەتە موسولّمانەکە بکاو لە بیروباوەڕی ئیسلامی دووری بخاتەوە..!

پەروەردگار هۆی قەدەغەکردنی شووکردنی ئافرەتی موسولّمانی بە پیاوی هاوبەشپەیداکەرو خواستنی ئافرەتی هاوبەشپەیداکەری روون کردۆتەوەو دەفەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ﴾ ئەوانەی کافرو خوانەناسن چ ژن بن چ پیاو، بانگەوازی خەلّکە دەکەن بۆ بیروباوەڕو کردارو گوفتارێك کە دەبنە هۆی چوونە ناو دۆزەخ! دەی خۆ پەیوەندی نێوان ژنو مێرد زۆر بەهێزەو چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکرێ کە ژنە

هاوبەشپەیداکەرەکە، یان پیاوە کافرەکە، لە پەنای ژنو مێردایەتیدا، کاربکەنە سەر بیروباوەڕی موسوڵمانەکانو لە ئایین وەریان گێڕن! ﴿وَاللَّهُ يَدْعُوَ إِلَى الْجَنَّةِ وَالْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِ﴾ بانگەوازی خودا کە موسوڵمانان هەلگرو بانگەواز بۆکەرینی. هەر ئەو بانگەوازییەیە کە ئادەمیزادان دەگەیەنێ بەبەهەشتو لێخۆشبوونی خودا دەستەبەر دەکا.

بانگەوازی خودا بەپێچەوانەی بانگەوازی هاوبەشپەیداکەرانە، کە سەردەکێشێ بۆ چوونە ناو ئاگر، چونکە بانگەوازی ئەوان بۆ بەدڕەفتارییەو بۆ خراپەکارییە. موسوڵمانان هەتا پابەندی فەرمانەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)بوونو ئەخلاقو رەوشتی ئیسلامی لە دڵو دەروونیاندا چەسپابوو، لە کردارو گوفتارو هەڵوێستیاندا رەنگی دەدایەوە، کۆمەڵگایەکی بەختەوەریان هەبوو، بەڵام کاتێك پشتیان لە یاساو شەریعەتە پیرۆزە بێ وێنەکەیان هەڵکردو ئامۆژگاری کافرانیان کردە ڕێ نیشاندەری خۆیان، ئافرەتی بێ بڕواو خوانەناسیان کردنە هاوسەری خۆیانو کچی موسوڵمان شووی بە کافرو هابەشپەیداکەر کرد، ئیتر جڵەو لەدەست دەرچوو حەیا تکاو رەوشتو ئەخلاقی بەرزو پیرۆزی ئیسلامی نەماو قەڵاچۆ کرا!!

کوفر توانی بێچوە گورگی وا لە رۆڵەی - بەڕواڵەت موسوڵمان - دروست بکا کە زۆر لە خودی خۆیان دڵسۆزترە بۆ کوفرو دوژمن ترە بۆ ئیسلام، ئەو خزمەتەی کە ئەم ئەخلاق روخاوانە بەکوفری دەکەن، هەرگیز کافرەکان خۆیان ناتوانن بۆ خۆیان ئەنجامی بدەن!!

﴿وَيُبَيِّنُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ پەروەردگار حیکمەتو بەڵگەی حوکمە شەرعیەکانی خۆی بۆ بەندەکانی روون دەکاتەوە، هەر حوکمێك بفەرموێ: حیکمەتەکەی لە پاڵدا دیاری دەکاو سوودو قازانجەکانی ئاشکرا دەکا، بەڵکوو عیبرەت وەربگرنو پەندی لێ فێر ببن، لە دڵیاندا بچەسپێو بەرەزامەندیو سنگ فراوانییەوە وەری بگرن کاری پێ بکەن..

## بێ نوێژی ئافرەتو حوکمەکانی

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ (٢٢٢) نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ وَقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُمْ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ (٢٢٣) ﴾.

ئیمامی موسلیمو تیرمیذی لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە: کە دابو نەریتی جولەکەکان وابوو هەرکاتێ ئافرەتیان بێ نوێژ بوایە نانیان لەگەڵ نەدەخواردو سەرجێییان لەگەڵ نەدەکردن، هاوەڵان لەم بارەوە لە پێغەمبەریان پرسی ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ..﴾ ناردەخوارێ.

لەلایەکی ترەوە شەیخانو ئەبوداودو تیرمیذی لە جابیرەوە دەگێڕنەوە دەفەرموێ: جولەکەکان دەیانگوت: ئەگەر پیاو لە دواوە بچێتە لای ژنەکەی منداڵەکانیان خێل دەردەچن: ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ﴾ی ناردە خوارێ.

﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ﴾ ئەمە سێیەم پرسیارە کە بەشوێن یەکدا هێنراونو بە (واوی عەطف) سەریەك خراونەوەو پەیوەندییان بەحوکمە تایبەتییەکانی تایبەت بە ئافرەتانەوە هەیە.

ئەم پرسیارانە دەکران و پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە مەدینە بوو، بەشێکی دانیشتوانی شاری مەدینەو دەوروبەری جولەکە بوون، تێکەڵاوی تەواو لە نێوان عەرەبەکان و جولەکەکاندا هەبوو، جولەکەکانیش لەبارەی بێ نوێژی ئافرەت زۆر زیادەڕەوییان دکردو سنووریان تێپەڕاند بوو، وەکوو لەبەشی پانزەی تەوراتدا هاتووە دەڵێ: ((هەرکەسێك دەست بدا لە ژنێکی بێ نوێژ پیس دەبێت، هەرکەسێك دەست بدا لە پۆشاك و نوێنی دەبێ پۆشاکەکانی بشواو حەمام بکا، لەگەڵ ئەوەشا ئەو ڕۆژە تا ئێوارە هەر بەپیسی دەمێنێتەوە! هەرکەسێك دەست بدا لەو شت و مەکانەی کە ئافرەتە بێ نوێژەکە لەسەری دادەنیشێ دەبێ پۆشاکەکانی بشواو حەمام بکا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ بەپیسی دەمێنێتەوە، خۆ ئەگەر یەکێك لەگەڵ ئافرەتە بێ نوێژەکە رابکشێ و دەستەملانی بێ بێ نوێژی ئافرەتەکە دەکەوێتە سەر ئەو کابرایەش کە لە گەڵیدا نوستووە: حەوت ڕۆژ پیسیەکەی لە کۆڵ نابێتەوە، هەر جێگاو بەڕەو مافوورێك ئافرەتی بێ نوێژ لەسەری دادەنیشێ پیس دەبێ، ئیتر بەو جۆرە هەر پیاوێك ئەگەر خوێنی لێ بهاتایە هەر بەو جۆرە حوکمی پیسیان دەدا)).

عەرەبەکانیش لە پێش هاتنی ئیسلام دا کە ئافرەت بێ نوێژ بوایە جیایان دەکردەوەو نان و ئاویان لەگەڵ نەدەخوارد! مەسیحیەکان لەم بارەوە زۆر سادە بوون و لە بێ نوێژی ئافرەتدا چاوپۆشیان دەکرد..

ئەم هەڵس و کەوتانە بەتێکڕاو ئەم بیروبۆچوونە جیاجیانەی کۆمەڵگای ئەو سەردەمە، زەمینە خۆشکەر بوون بۆ پرسیار کردن لە حوکمی بێ نوێژی ئافرەت و چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵیدا، ئەوەبوو بۆ هەتا هەتایە قورئانی پیرۆز حوکمی ڕاست و ڕەوانی خۆی ڕاگەیاندو فەرمووی: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ﴾ ئەی پێغەمبەر! پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی تێکەڵاو بوون و حوکمی هەڵسان و دانیشتن لەگەڵ ئافرەت لەکاتی بێ نوێژیدا ﴿قُلْ هُوَ أَذًى﴾ بڵێ بێ نوێژی (حەیز) ئازارو ئەرکێکی سروشتیە بۆ ژنان و تێیدا تووشی ئازارو ئەشکەنجە دەبن، هەروەك ئەزیەت و ناخۆشیشە بۆ پیاوەکانیان، ئەگەر لەکاتی حەیزدا بچنە لایان هەردوو لایان تووشی

ئەزیەت دەبن! کەوابێ لەو کاتانەدا کە ئافرەت بێ نوێژە، مەچنە لایان و لەگەڵیاندا جووت مەبن!!

ئەنەس دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: جولەکەکان کە ژنەکانیان بێ نوێژ دەبوون، نان و ئاویان لێ جیا دەکردنەوەو نانیان لەگەڵ نەدەخواردن، لەماڵەوە لەگەڵیاندا جووت نەدەبوون و لێیان نزیك نەدەبوونەوە.

هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەم بارەوە پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد، پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى.... الآية﴾ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: « اصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ إِلاَّ الْجِمَاعَ » لە کاتی بێ نوێژی ئافرەتدا هەموو شتێکی لەگەڵدا بکەن جگە لە جووت بوونی تەواو نەبێ. ئیمامی ئەحمەدو ئیمامی موسلیم هی تریش گێڕاویانەتەوە.. حەکیمی کوڕی حیزام دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر کرد (دروودی خوای لەسەر بێ) وتم: قوربان! ئەگەر ژنەکەم کەوتە حەیزەوە چیم بۆ ڕەوایە لەگەڵیدا بیکەم لەکاتی بێ نوێژیەکەیدا؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لە ناوکی بەرەو ژوور! ئایەتەکە لەسەرەتاوە هۆی یاساغ کردنەکەی بەیان کرد، ئەمجار یاساغ کردنەکەی چەسپاند، تا بەدڵنیاییەوە موسوڵمانان پەیڕەوی بکەن و وەری بگرن، بۆ ئەوەی بشزانرێ کە ئەو جۆرە حوکمانە بۆ بەرژەوەندی ئادەمیزاد دانراون، نەك کارێکی تەعەببودییە، بەکورتی بەگوێرەی ئایەتەکە پێویستە لەکاتی بێ نوێژیدا جووت بوون لەگەڵ ئافرەت نەکرێ، چونکە دەبێتە هۆی ئەزیەت و زیان هەم بۆ ئافرەتەکەو هەم بۆ پیاوەکە...!

**زانستی پزیشکی تازەش ئەوەی سەلماندووە: کە جووت بوون لەگەڵ ئافرەتدا لەکاتی بێ نوێژیدا ئەم زەرەرو زیانانەی لێ دەکەوێتەوە:**

١- ئێش و ئازاری کۆئەندامی زاووزێی ئافرەت، جاری واش دەبێ منداڵدانی ئافرەت هێلکەدانی هەو دەکاو زیان بە تەندروستی ئافرەت دەگەیەنێ، تەنانەت جاری وا دەبێ هێلکەدانی دەفەوتێنێ و نەزۆکی دەکا.

٢- داخلْ بوونى برێ مادەى حەيز بۆ ناو ئەندامى زاووزێى پياو هەوى كيمياوى (التهاب صديدي) دروست دەكا: كە نەخۆشيەكى سامناكە، جارى وا هەيە دەتەنێتەوە بۆ هێلكە گونو زيانيان پێ دەگەيەنێو نەزۆكى لە پياودا دروست دەكا، جارى وا دەبێ نەخۆشى ئايدز لە پياودا دروست دەكا، ئەگەر ميكرۆبەكانى لە خوێنى ئافرەتەكەدا هەبێ! بە كورتىو پوختى نزيك بوونەوەى پياو لە ئافرەت لە كاتى بێ نوێژيدا دەبێتە هۆى نەخۆشى لە پياوو ژنداو ئامێرەكانى زاووزێ تووشى هەو كردن (التهاب) دەكاو تەندروستى تێك دەداو ئەمەش زيانێكى گەورەيەو پێويستە پارێزى لێ بكرێ.

هەر بۆيەشە، پزيشكانى سەردەم شارەزايانى تەندروستى رايان وايە: كە پێويستە پياو لە كاتى بێنوێژى ئافرەتدا توخنى نەكەوێ وەكوو چۆن قورئان فەرمانى پێكردووين: ﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ﴾ ئەگەر لە بێ نوێژى پاك بوونەوەو خۆيان شت، بچنە لايان لەو شوێنەوە كە نەفس ئارەزوى دەكاو وەچەو نەوەى لێ دەكەوێتەوە بەرقەرار بوونو درێژەدان بەژيانى ئادەميزادى لێ دەستەبەر دەبێ!!

ئەم ئايەتە ئاماژە بۆ ئەوە دەكا: كە شەريعەتى ئيسلامى داواى ژن هێنانو شووكردن دەكاو رەبەنى بەلاوە ناپەسەندە؛؛ حەرامە بۆ موسوڵمانو دروست نيە كە واز لە ژن هێنانو شوو كردن بێنێ، بەو هيوايە كە ئەمە كارێكى خوداپەرستييەو لاى خودا پەسەندە! چونكە پەروەردگار منەتبارمان دەكا بەوە كە لە رەگەزى خۆمان ژنى بۆ دروست كردووينو دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾.

داواى لێ كردووين كە لە بارەگاى پەروەردگار بپاڕێينەوە كە خودا لە ژياندا سەركەوتوومان بكا، لە خێزانى بەڕەوشتو داوێنپاك دا مندالْى چاوفێنك كەرەوەو دڵخۆشكەرمان بداتێ، كاتێك پێغەمبەر فەرمووى: (وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ». كە يەكێك لە ئێوە دەچێتە لاى خێزانى خۆى خێرى دەگاتێ. عەرزى پێغەمبەريان كرد، وتيان: ئەى پێغەمبەرى خودا! ئايا يەكێ لە ئێمە بچێتە لاى خێزانى خۆىو ئارەزووى

خۆی دابین بکا خێری دەگاتێ؟! پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئایا ئەگەر یەکێك لە ئێوە بچێ ئارەزووی خۆی لەحەرامدا ئەنجام بداو داوێنپیسی بکا گوناهی ناگاتێ؟؟ دیارە گوناهی دەگاتێ.

پوختەی قسە ئەوەیە؛ کە ئایینی ئیسلام ئازاردانی نەفس‌و جەستەی نەکردووە بەبەشێك لە خوداپەرستی، خۆگرتنەوە لە لەززەت‌و خۆشی حەلاڵ‌و زولاڵی داناوە بەسەرپێچیکردنی رێبازی سروشت‌و بەگوێ نەکردنی فەرمانەکانی خودای مەزن. ﴿إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ﴾ بێگومان پەروەردگار ئەو بەندانەی خۆش دەوێن کە بۆلای ئەو دەگەڕێنەوەو لەسەر خراپەکاری بەردەوام نابن‌و ناهێڵن دەسەڵاتی شەهوەت‌و ئارەزووی بەسەر سروشت‌و رەوشتیان دا زاڵ ببێ‌و ناچن لەکاتی بێ نوێژی سواری ژنەکانیان ببن یان لە پاشەوە بچنە لایان‌و لە کۆمیانەوە ئارەزووی خۆیان دابین بکەن!! ﴿وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾ هەرکەسێك خۆی لە پیس‌و پۆخەڵی پاك بکاتەوەو خۆ لەسەرپێچی کردنی تاوان دوور بخاتەوە لای خودا خۆشەویستەو رێزدارە. دیارە ئەمانە خۆشەویسترن لەو کەسانەی کە دەکەونە زلکاوی بێ دینی‌و تووشی تاوان کردن دەبن‌و دوایی تەوبە دەکەن!

﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ﴾ ژنەکانتان جێگای کشت‌وکاڵ کردنتانن، چۆن زەوی پاك‌و خاوێن‌و بەپیت تۆوی پێوە دەکەی بەروبووم دەدا بژێویتان لێ دەست دەکەوێ ژنەکانیشتان کە تۆویان تێ دەکەن‌و لەگەڵیان جووت دەبن منداڵتان بۆ بەرهەم دێنن! ئەو منداڵانە دەبنە هۆی درێژەدان بە ژیانی ئادەمیزادو زنجیرەی رەچەڵەك‌و ژیان بەردەوام دەبێ، ئافرەتیش سەرچاوەو هۆی هەرە گرنگی درێژە پێدانی ژیانە، ئەرکی پیرۆزی سەرشانی ئافرەت منداڵ بوون‌و پەروەردە کردنی منداڵە. کەوابێ ﴿فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾ بچنە لای ژنەکانتان لەو شوێنەوە کە هیوای منداڵبوونی لێ دەکرێ.

هیچ تاوانی تێدا نیە کە بچنە لای خێزانەکانتان بەهەر شێوەیەك حەزتان لێ بێ‌و لەو شوێنەوە کە منداڵی لێ دەبێ بەمەرجێ ئەو ئافرەتە لە بێ نوێژیدا نەبێ!!

پەروەردگار نایەوێ لەززەتو خۆشی لە ئێوە قەدەغە بکات، بەڵکوو خێرو سوودی بۆ ئێوە دەوێ. نایەوێ ئێوە تۆمی خۆتان بخەنە شوێنێکەوە کە شوێنی نیە. یا لە کاتێکدا تۆمەکەی تێبکەن کە شوێنەکە ئامادە نەبێ بۆ وەرگرتنو پەروەردە کردن.

پەروەردگار لەم ئایەتەدا حیکمەتی پێکەوە جووت بوونی ئافرەتو پیاو روون کردەوە. کە ئەویش درێژەدان بە ژیانو بەردەوام بوونی رەچەڵەکی ئادەمیزادە لەسەر زەوی. وەکوو چۆن دانەوێڵەو بەروبووم بە کێڵانو کشتوکاڵ کردن بەردەوام دەبێ ئاواش زنجیرەی ئادەمیزاد بە ژنو ژنخوازیو زاووزێو نزیکبوونەوەی پیاوو ئافرەت لەیەکتریو جووت بوونیان لە کاتی شیاوو گونجادا دەبێتەهۆی مانەوەی رەگەزی ئادەمیزاد لەسەر زەوی. لەبەر ئەوە رەوا نیەو ناشێ ئێوە لەکاتی بێ نوێژیدا لە ژنەکانتان نزیك ببنەوە، چونکە لەو کاتەدا منداڵانی ئافرەتەکە (کێڵگەکە) ئامادەیی تێدا نیە بۆ وەرگرتنو چاندنو شین بوون.

﴿وَقَدِّمُواْ لأَنفُسِكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ﴾ شتی بەقیمەتو بەسوود بۆ خۆتان پێشکەش بکەنو پەزمەندەی بکەن، هیچ شتێکیش بۆ ئینسان لەوە باشترو بەسوود تر نیە کە بۆ کاتی پیر بوونو دوامردنی منداڵێکی صاڵحو راستاڵ بخاتەوە سوودی دینو دونیای پێ بگەیەنێ.

وەکوو لە فەرموودەیەکی پێغەمبەدا (درووودی خوای لەسەر بێ) هاتووە دەفەرموێ: (إن الولد الصالح من عمل المرأ الذي ينفعه بعد موته) منداڵی صاڵحو راستاڵ لەبەرهەمی کردەوەی پیاوە دوای مردنیشی سوودی پێ دەگەیەنێ، دەی خۆ منداڵ سوودبەخش نابێ ئەگەر دایكو باوك بەشێوەیەکی رێكو پێك پەروەردەی نەکەنو رەوشتی جوانی تێدا نەروێنن. ئەمەش داخوازیی ئەوە دەکات کە پیاو تا بۆی بکرێ ئافرەتی رەوشت جوانی خۆشەویست مارە بکا، هی وا کە منداڵی ببێو یارمەتی مێردەکەی بدا بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانیان، مامۆستایەکی پێشکەوتوو بێو رەوشتی جوانو کرداری چاك فێری منداڵەکانی بکاو پەروەردەی موسوڵمانانەیان بکات، چونکە کە منداڵ چاو دەکاتەوەو خۆی دەناسێ هەڵسوکەوتی دایکی دەبینێو ئەو

کردارو گوفتارەی لە مێشکیدا نەخش دەبەستێو کاری تێدەکا، ئیتر ئەو منداڵە کە لە باوەشی دایکێکی وادا پەروەردە بوو، بەڕەوشت بەرزی پێ دەگاو گەشە دەکاو چاو دەکاتەوە!!

﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ﴾ پابەندی فەرمانەکانی خودا بنو ئاگادار بن نەچن لە کاتی بێ نوێژیدا لەگەڵ ئافرەتدا جووت ببنو تۆمو گەرای خۆتان بە فیڕۆ بدەنو لە کاتی حەیزدا بچنە لای خێزانەکانتان، یان لە پاشەوەڕا بچنە لایانو تۆماوی خۆتان ئاراستەی شوێنێك بکەن کە جێگای منداڵ بوون نیە.. یان خۆتان بپارێزن لەوە کە ئافرەتی خراپ بۆ هاوسەری خۆتان هەڵبژێرنو خیانەت لە خۆتان بکاو منداڵتان خراپ پەروەردە بکا، ژیانی دونیاتان لێ تاڵ بکاو پاشەڕۆژیشتان لەکیس بچێ.

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشە لەو کەسانە دەکا کە سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەنو دەفەرموێ: ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّكُم مُّلاَقُوهُ﴾ باش بزاننو دڵنیابن کە ئێوە هەمووتان رۆژی قیامەت دەچنەوە لای پەروەردگارتانو حیسابتان لەگەڵ دەکاو سزای سەرپێچیکردنتان دەداو لە سۆنگەی ملهوڕیو گوێ پێنەدانتان سزای بەئێش دەچێژن. ﴿وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ مزگێنی بدە بەو موسوڵمانانەی کە سنووربەزێنی ناکەنو لە چوارچێوەی ئایین دەرناچنو شوێن ئامۆژگاریەکانی قورئان دەکەونو بە گوێرەی قورئانو حەدیث هەڵسوکەوت لەگەڵ خێزانو منداڵەکانیان دەکەن، خۆشبەختیو کامەرانی هەردوو دونیا بەدەست دێنن! چونکە کەسێك هاوسەری راستاڵو داوێن پاكو موسوڵمان بۆخۆی هەڵبژێرێو جوانو رێكوپێك پەروەردەی منداڵی خودا پێداوی بکا، کامەرانو چاوفێنكو دڵخۆشو تەڕدەماخ ژیان بەسەر دەباو هەمیشە کەیف خۆش دەبێ: کە دەبینێ خاوو خێزانی ئاوا بەڕەوشتو کەیف خۆشن!!

بەپێچەوانەوە کەسێك شەهوەتو ئارەزووی سەربکاو لە چوارچێوەی ئەو یاسایە بچێتە دەرێ: کە خودا بۆ بەندەکانی خۆی داناوە، ئەوە تووشی جۆرەها ئاستەنگو تەنگو چەڵەمەو چەرمەسەری دەبێ، لە قیامەتیشدا تووشی جۆرەها ناخۆشیو دەردی سەری دەبێ، لە تاو ئازاری ئەوێ، ئازارو ناخۆشی دونیای لەبیر نامێنێ.

خۆشبەختیو کامەرانی تەواو ئەوەیە: ئینسان هەوڵ بدا بیروباوەڕی راستو رەوشتی جوانو بەرزو دڵنیایی پێکەوە جۆش بداو لەکاتی خۆشیو ناخۆشیدا بیانکاتە سەنگەری پۆلاینی خۆیو ئیشوکارو چارەنووسی خۆیشی بە پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات بسپێرێ پشتی خۆی پێ ببەستێ.

## سوێندخواردن بە خوداو سوێندی لەغوو

﴿ وَلَا تَجۡعَلُواْ ٱللَّهَ عُرۡضَةٗ لِّأَيۡمَٰنِكُمۡ أَن تَبَرُّواْ وَتَتَّقُواْ وَتُصۡلِحُواْ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ (٢٢٤) لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتۡ قُلُوبُكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ (٢٢٥) ﴾.

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار لە ئایەتی پێشوودا فەرمانی پێ کردین: کە تەقوای خودا بکەینو خۆمان بپارێزین لە سنوور بەزێنی، ئەوەمان پێ ڕادەگەیەنێ کە بەشێك لەو شتانەی کە پێویستە خۆمانی لێ بپارێزین: ئەوەیە: کە نەچین سوێند خواردن بە خودا بکەین بە لەمپەڕ لەبەردەم کاری خێرو چاکەداو دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَجْعَلُواْ اللّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَانِكُمْ أَن تَبَرُّواْ وَتَتَّقُواْ وَتُصْلِحُواْ بَيْنَ النَّاسِ﴾ نەچن ئێوە سوێند خواردن بە خودا بکەنە بەهانەو لەمپەڕ، بڵێن: چونکە سوێندم بە خودا خواردووە تازە من ئەو کارە باشە ناکەم ئیتر وازی لێ بێنن، لەبەر ڕێزی سوێندەکە کاری خێر لەخۆتان قەدەغە بکەن، هەرگیز خودا رازی نیە، ناوە پیرۆزەکانی ببنە لەمپەڕو ڕێگر لەبەردەم کاری چاکەدا... زۆرجار وارێدەکەوێ ئادەمیزاد پەلە دەکا، سوێند دەخوا فلانە ئیش ناکا، خودی ئیشەکەش کاری خێرە، یان سوێند دەخوا کە فلانە ئیش بکا

ئیشەکە کاری شەڕە، ئیتر پەروەردگار نەهی لێ کردووین لەوەو فەرمانی پێ کردووین کە وردبینەوە، بزانین خێرو سوود لەچی دایە، ئەوە ئەنجام بدەین‌و سوێندەکە لەخۆمان بخەین‌و کەفارەتەکەی بدەین ﴿وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ پەروەردگار بیسەرە بۆ ئەو قسەیەی کە بەسەر دەمتاندا دێ، ئاگاداری مەبەست‌و نیازتانەو دەزانێ چی لە دڵتانایە: کەوابێ بەئاشکراو بەنهێنی پابەندی ئامۆژگارییەکانی بن‌و چاودێری شەریعەتەکەی بن‌و سنووربەزێنی نەکەن تا بچنە ریزی ڕزگاربوان‌و سەرفرازی دونیاو قیامەت بن.

ئیبنو جەریر دەڵێ: هۆی نازڵ بوونی ئەم ئایەتە ئەوە بوو کە ئەبوبەکر سوێندی خوارد: کە ئیتر لەوە بەولاوە کۆمەکی بە (مسطح) نەکا، چونکە ئەم کابرایە هەرچەندە خزمی نزیکی ئەبوبەکر بوو، ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە سازکردنی بوختان بۆ خاتو عائیشە.

ئەم ئایەتەش کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُوْلِي الْقُرْبَى – النـور/٢٢﴾. هەر دەربارەی حەزرەتی ئەبوبەکرو مسطح نازڵ بووە، کە ئەبوبەکر کۆمەکی‌و یارمەتیدانی لە مسطح بڕی.. کەلەبی دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە نازڵ بوو.

﴿لاَّ يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِيَ أَيْمَانِكُمْ﴾ خودا تاوانبارتان ناکاو سزاتان نادا لە سۆنگەی ئەو سوێنە ئاساییانەی کە بەسەردەمتاندا دێ لەکاتی قسەکردندا بێ مەبەست دەکەونە ریزی قسەتانەوە، ئەوە هیچ کەفارەت‌و بریتی دانتان لەسەر نییە ﴿وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ﴾ تاوانبارتان دەکاو سزاتان دەدا ئەگەر لە دڵەوە سوێندەکە بخۆن‌و مەبەستی تایبەتیشتان لەو سوێندخواردنە هەبێ، ئەوە دەبێ کەفارەتەکەی بدەن یا سزای سوێنخواردنەکەتان دەکەوێتە سەرو بۆ دوا ڕۆژتان دەبێتە کۆڵ گرانی‌و قورسایی تەرازووی گوناهتان!!

﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ پەروەردگار لێ بوردووەو لە تاوانی بەندەکانی – ئەگەر مەیلی لێ بێ – خۆش دەبێ‌و بەحەوسەڵەو بارقووڵە، مۆڵەتی بەندە گوناهکارەکانی

دەداو خێراو دەستبەجێ تۆڵەیان لێ ناسێنێ؛ شتێکیان داوا لێ ناکا کە لە توانایانـدا نـەبێ، هەرشـتێکیش دەسـەڵاتی خۆیـان تێیـدا نـەبێو بـەدڵو مەبەسـتەوە نەیکـەن لەسەریان حساب ناکا.

## حوکمی سوێندخواردنی پیاو لە خێزانی خۆی

﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٧﴾ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِى ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوٓا۟ إِصْلَٰحًا وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٨﴾ ﴾.

دوای روونکردنـەوەی حوکمـەکانی سـوێندخواردن بەگشتی، دەچینـە سـەر باسـی سوێندێکی تایبەتی ئـەویش سـوێندخواردنی مێـردە لـە ژنـی خـۆی؛ کـە سـوێند دەخـوا نەچـێتە لای. نەتـەڵاقی دەداو، نـە موعاشـەرەی ژنو مێردایـەتی لەگـەڵ دەکـا.

دەفـەرموێ: ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ﴾ ئەوانـەی سـوێند لـە ژنـەکانیان دەخـۆن ئەهـد دەکـەن؛ کـە لێیـان نزیـك نەبنـەوەو موعاشـەرەی ژنو مێدایەتیشیان لەگەڵدا نەکەن، ئەوانە تا چوار مانگ مۆڵەت دەدرێـن بـۆ ئـەوەی بیر لـە داهاتوو وەزعی خۆیانو ژنەکانیان بکەنەوە، ئەم جۆرە سوێند خواردنـە کارێکـە خـودا

پێی رازی نیە، چونکە خۆشەویستی نێوان ژن و مێرد ناهێڵێ، پەیوەندی و هاوکاری و سۆزیان بۆ یەکتری دەپچڕێنێ.

هەروەها ژن و مێردەکەو منداڵ و خزمیان تووشی نارەحەتی دەکا. مافی ئافرەتەکەش پێشێل دەکرێ و سوکایەتی پێ دەکرێ.

یەکێك لە داب و نەریتە ناشیرینەکانی سەردەمی نەزانی ئەوەبوو ئەگەر پیاوێك ژنەکەی بەدڵ نەبوایەو نەشی ویستایە پیاوێکی تر مارەی بکاتەوە سوێندی لێ دەخوارد کە هەرگیز نزیکی نەکەوێتەوە. ئیتر ئەم ئافرەتە وێڵ و سەرگەردان دەبوو نەبە بێوەژن حساب دەکرا تا رێگای ببێ شوبکاتەوە، نە خاوەن مێردیش دەبوو! کە ئایینی ئیسلام هات ئەم داب و نەریتە بەردەوام بوو موسوڵمانانیش ئەمەیان لەگەڵ ژنەکانیان دەکرد، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو سنوورێکی بۆ مێرد داناو رێگەی نەدا چی تر مافی ئافرەت پێشێل بکرێ.

ماوەیەکی دیاریکراوی بۆ مێردەکە دانا، بۆ ئەوەی لەو ماوەیەدا بیر لە وەزعی خۆی و خێزانەکەی بکاتەوە، یان کەفارەتی سوێندەکەی بداو ژنەکە بەرێتەوە لای خۆی و موعاشەرەی ژن و مێردایەتی لەگەڵدا ئەنجام بدا، یان تەڵاقی بداو لێی جودا بێتەوە، بۆ ئەوەی ژنەکە بتوانێ بۆخۆی شوو بکاتەوە.

﴿فَإِنْ فَآؤُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ جا ئەگەر پێش تەواوبوونی چوار مانگەکە، یان لە کاتی تەواو بوونیدا بگەڕێنەوە بۆلای ژنەکانیان و سوێندەکە لە خۆیان بخەن و کەفارەتەکەی بدەن و موعاشەرەی ژن و مێردایەتیان لەگەڵدا بکەن، ئەوە پەروەردگار بەرەحمەتی بێ پایانی خۆی لە گوناهی سوێندەکەیان خۆش دەبێ و لێیان دەبوورێ.

﴿وَإِنْ عَزَمُواْ الطَّلاَقَ﴾ ئەگەر لەسەر ئەوە سوور بوون: کە نەچنە لای ژنەکانیان و ویستیان تەڵاقیان بدەن، لەماوەی دیاریکراوو دوا ماوەکەش نەچوونەوە لایان ئەوە بەپێی رێبازی ئیمامی حەنەفی تەڵاقەکەی دەکەوێ، بەپێی رێبازی شافیعی و مەزهەبەکانی تر دەبێ قازی حوکم بکا بەکەوتنی تەڵاقەکە.

﴿فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومـان خـودا ژنەوایـەو بیـسەرە بـۆ سـوێندەکەش‌و بـۆ تەڵاقەکەش زانایە بەمەبەست‌و نیەتیان‌و ئاگادارە، جا ئەگەر بـەو سـوێند لێ خـواردن‌و تەڵاقدانە، مەبەستیان زیان گەیانـدن بـێ بەژنـەکانیان ئـەوە بـابزانن خـودا تۆڵـەیان لێ دەستێنێ‌و سزایان دەدا، ئەگەر بیانویەکی شەرعیشیان هەبێ ئەوە خودا لێخۆش بـووەو لێیان دەبووڕێ.

بەکورتی‌و پوختی ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد کە نەچێتە لای ژنەکـەی بـۆی ڕەوا نیە زیاتر لە چوارمانگ پەڕە بەم کارەی بدا، جا ئەگەر پێش تـەواوبوونی ماوەکـە پەشیمان بووەوە سوێندەکەی لە خۆ خست‌و چووەوە لای ژنەکـەی ئـەوە هـیچ گونـاهی لەسەر نیە.

ئەگـەر ماوەکـە تـەواوبوو، پیاوەکـە دوو ڕێگـەی لەبەردەمدایـە، یـان پەشـیمان بوونەوەو تۆبەکردن‌و گەڕانـەوە بـۆلای ژنەکەو دەست کردنـەوە بـە موعاشـەرەی ژن‌و مێردایەتی. یان تەڵاقدانی ئێجگارەکی. پێویستە لایەنی خودا بەرچاو بگرێ لەو ڕێگەی هەڵی دەبژێرێ، خۆ ئەگەر بەدەم تەڵاقی نەدا ئەوە بەکردەوە تەڵاقەکە کـەوتووە واتـە: دوای تـەواوبوونی چـوار مانگەکـە پیاوەکـە بیـەوێ‌و نەیـەوێ تەڵاقەکـە خودبەسـەری دەکەوێ.

بێگومان لە ئایەتەکەدا ئاماژە بۆ ئـەوە کـراوە کـە لای خـودا پەشـیمان بوونـەوەو گەڕانـەوە بـۆلای ژنەکـە پەسـەندترە لـە تەڵاقدانەکـە. چـونکە پاداشـی پەشـیمان بوونەوەکەی بە ڕەحمەت‌و لێخۆشبوونی خودا داناوە، بەڵام بۆ تەڵاقدانەکە دەفەرموێ خودا ژنەوایە چی دەڵێن‌و دەزانێ دڵیان چی تێدایە!! ئەمەئەگەر کـابرا سوێندەکەی وا خوارد کە هەتایە یان زیاد لە چوار مانگ نەچێتە لای خێزانەکـەی. بـەڵام ئەگـەر ماوەیەکی کەمتر لە چوار مانگی دیاری کرد ئەوە ئەگەر تـەواوی کـرد هیـچی ناکەوێتـە سەر.

لـە ئایـەتی پێـشوودا پـەروەردگار حـوکمی پیـاوی سـوێندخواردوو (مـولی) روون کردەوە: کە یان دەبێ پەشـیمان بێتـەوەو بـچێتەوە لای خێزانەکـەی، یـان تـەڵاقی بـداو

لەیەکتر جیا ببنەوە. کەوابێ گونجاوە دوا بەدوای ئەوە بڕێ حوکمو چۆنیەتی تەلاق باس بکاو بیکاتە تەواوکەری ئەوەی پێشوو!!

لە ئایەتی پێشوودا حوکمی سوێندخۆری بەیان کرد کە پیاوە. بابزانین حوکمی ژنەکە چیە ئەگەر تەلاق درا، یان دادگا تەلاقی خست. ئایا پێویستە ژنەکە عیددە بگرێ، یان پێویست ناکا؟!

جا بۆ وەلامو روون کردنەوەی ئەم حوکمانە بەتێکراپی، فەرمووی: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ﴾ ئەو ژنانەی تەلاق دەدرێنو سەرو عوزر شۆرنو حەیزیان پیادێ واتە: لە حەیز نەوەستاونەوە لەبەر پیری، یان نەخۆشی، یان منداڵ نینو نەکەوتبنە حەیزەوە؛ دان بەخۆیانا دەگرنو چاوەڕوانی دەکەن؛ تا سێ جار دەکەونە حەیزەوەو پاك دەبنەوە، تا دڵنیا بن کە سکیان نیەو منداڵدانیان خاڵییە لە کۆرپەلە، ئەمجار دەتوانن شووبکەنەوەو خۆیان لە مێردێکی دیکە مارە بکەن، وشەی ﴿بِأَنفُسِهِنَّ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کەئەو ژنانە پێویستە لەسەریان حەزو ئارەزووی شوکردنەوەیان لغاو بکەن، تا ئەو ماوە تێپەڕ نەکا، ئەم جڵەوە بەرەڵلا نەکەن؛ ئەمەش کارێکە ئافرەتان دەتوانن ئەنجامی بدەنو ئەو ماوەیە دان بەخۆیاندا بگرن ﴿وَلاَ يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ﴾ دروست نیە بۆ ئەو ژنە تەلاق دراوانە کە ئەو کۆرپەلەی خودا لە منالّدانیاندا دروستی کردووە بیشارنەوە! پێویستە لەسەریان کە هەستیان کرد بەوە کە سکیان هەیە بیدرکێننو دەری بخەن. هەروا حەرامە بێ نوێژیشیان بشارنەوە. وا رێ دەکەوێ ئافرەت شەو مێردەکەی دەچێتە لای سکی دەبێ بەیانی تەلاق دەدرێ ئیتر ئەم ئافرەتە دەزانێ کە سکی هەیە بەلام سکەکەی دەشارێتەوەو پاش ماوەیەك شوو بەپیاوێکی تر-دەکاتەوەو ئیتر سکەکەی دەخاتە پال مێردی تازەی‌و لەهی مێردی پێشوو دەپچڕێ!!

بەمەش رێگا لەمێردە تازەکەی دەگرێ کە پەشیمان بێتەوە، یان تەلاقی بدا، ئەم دابو نەریتە لەسەردەمی نەزانیدا باوبوو، کە ئایینی ئیسلام هات: قەدەغەی کرد، چونکە ئەمە جۆرێکە لە بوختانو غەشو پچڕاندنی منداڵە لە باوکی خۆی‌و نیسبەت

دانیەتی بۆ لای یەکێ تر، یان وا ڕێدەکەوێ؛ ئافرەتێك تەڵاق دەدرێ لە دادگا بڕێوی عیدەی بۆ دەبڕدرێتەوە، ئیتر چۆنیەتی بێ نوێژیو پاك بوونەوەکەی دەشارێتەوە، عیدەی تەواو بووە، دەڵێ هێشتا پاك نەبوومەوە بۆ ئەوەی بڕێوی مانگێک زیاتر وەربگرێ، ئەمەش کارێکی نادروستەو ئەوەی وەری ئەگرێ لەو ماوە زیادەدا حەرامە.

جا چونکە دادگا وا حوکم دەکا کە ئافرەتی تەڵاق دراو تا لە عیدەدا بێ نەفەقەی لەسەر مێردە تەڵاقدەرەکەیەتی، ئیتر ئەو ئافرەتە تەڵاقدراوانەی کە شویان دەست ناکەوێتەوە هەموو فرتو فێڵێك دەخەنە کار بۆ ئەوەی ئەو نەفەقەیە درێژە پێ بدەن.

بۆیە ئێستا لە هەندێ وڵاتدا دادگا وا حوکم دەکا کە ئەوپەڕی ماوەی عیددە ساڵێکی قەمەری بێو لەوە تێپەڕ نەکا، ئەمەش بەگوێرەی رای ئیمام مالیکە (رەحمەتی خوا لەسەری).

### پێویستە ئافرەتان زۆر بەوردی گوێ بیستی ئەم ئامۆژگارییانە بن:

﴿إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ ئەگەر بەراستی بڕوایان بەو خودایە هەیە کە ئەحکامی حەڵاڵو حەرامی ناردۆتە خوارێ، هەروەها بڕوایان بەرۆژی قیامەت هەیە کە هەموو کردەوەیەك پاداشو سزای خۆی هەیەو هیچ شتێك ون نابێ، هەرگیز ئەوەی لە سکیاندایە نایشارنەوە، چونکە کەسێك بڕوای هەبێ بەوە کە پابەندبوون بەم ئامۆژگاریانە پاداشو رەزامەندی خودای تێدایەو گوێ پێ نەدانیان دەبێتە بەدبەختیو زەرەرمەندی، دەبێ زۆر بەدڵسۆزیەوە پابەندییان بێ، دیارە ئەم ئایەتە هەڕەشەیەکی توندی لەخۆ گرتووە.

﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُواْ إِصْلاَحًا﴾ جا ئەگەر لەماوەی ئەم عیددەیەدا، ژنو مێردەکە بیروبۆچوونیان گۆڕاو هەڵوێستی خۆیان گۆڕیو ژیوان بوونەوە، هێشتا عیددەکە بەسەر نەچووبوو، ئەوە مێردەکە شایستەیە، بە گێڕانەوەی ئافرەتەکە بۆ ژێر نیکاحی خۆی، واتە: هەر بەوەندە پیاوەکە بڵێ وا فلانم هێنایەوە ژێر نیکاحی خۆم، دەبێتەوە بەخێزانی، بەمەرجێ پیاوەکە نیەتی ئاشتبوونەوەو

حوسنى موعاشەرەى هەبێ، بەڵام ئەگەر مەبەستى لە گەڕانەوەكە ئەزيەتدانى ئافرەتەكە بێ، بيەوێ ڕێگاى شووكردنەوە بەپياوێكى ترى لێ بگرێو نە بۆخۆى موعاشەرەى ژنو مێردايەتى لەگەڵدا بكا نە ڕێگاشى بدا شوو بكاتەوە بەپياوێكى تر؛ ئەوە بێگومان تاوانبار دەبێو ستەمكارە. بەكورتى ئەگەر پياو لە گێڕانەوەى ئافرەتەكە بۆ ژێر نيكاحى خۆى مەبەستى حوسنى موعاشەرەو ڕێككەوتنەوە نەبوو، ئەوە بۆى دروست نيە ژنەكە بگێڕێتەوە بۆ ژێر نيكاحى خۆى، تەنانەت ئەگەر بەمەستى ئەزيەتدان ريجعەشى بكاتەوە، ريجعەكردنەوەكەى دانابەسترێ.

بۆيەش پياوەكە شايستەيە بەگێڕانەوەى ئافرەتەكە، چونكە ئەو ئافرەتە دواى ئەوەى تەڵاق درا هەموو كەسێكى تر مارەى ناكاتەوە، واش دەبێ پياوەكە لە تەڵاقدانەوەكە پەشيمان دەبێتەوەو حەزى لێيە كە بيخاتەوە ژێر نيكاحى خۆى، بەتايبەتى ئەگەر منداڵيان لەبەيندا بێ سۆزى دوارۆژى ئەو منداڵانەو پەروەردەكردنيان زاڵ دەبێ بەسەر تووڕەبوونو تەڵاقدانێكى كاتىو ناسروشتى. ئەمە كاتێك مافى ئەوەى هەيە ئاوا سەربەخۆو بەبێ ڕەزامەندى ئافرەتەكە ژنەكە بخاتەوە ژێرنيكاحى خۆى كە ئافرەتەكە عيددەى تێپەڕ نەبووبێ. ئەگەر عيدەى تەواو بووبێ ئەوە دەبێ بەرەزامەندى ئافرەتەكەو بەمارەييەكى تازەو بەمارەكردنێكى تازە ئەمجار ئافرەتەكە دەبێتەوە بەخێزانى شەرعى.

جا لەبەر ئەوەى كە ڕێكخستنو ڕێكوپێك كردنەوەى نێوان ژنو مێرد كاتێك دەستەبەر دەبێ كە هەريەكێ لە ژنو مێردەكە مافى ئەوەى تريانى لەبەرچاو بێ، چونكە دەبێ هەريەكەيان بەرامبەر ئەوەى تريان مافو ئەركى خۆى بزانێ، واتە: يەكسانى نێوان ژنو پياو لە هەموو شتێكدا جگە لە پلەى لێپرسراوىو بەڕێوەبردنى خێزان، كە ئەمەيان تايبەتە بە پياوەوە!! جا بۆ چەسپاندنى ئەم دستووره پيرۆزە، فەرمووى: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ واتە: هەيە بۆ پياو بەسەر ئافرەتەوە چەند مافێكو لەبەرامبەر ئەوەش چەند ئەركێكى لەسەرشانە. ئافرەتيش بەهەمان شێوە مافى بەسەر پياوەكەوە هەيە، ئەركو ئوركى خۆيشى

لەسەرشانە، چەندیەتو چۆنیەتی ئەو مافو ئەرکەش دابو نەریتی ئەو کۆمەڵگایەو شەریعەتو یاسایان سنووررداری دەکاو دیاری دەکا. ئەگر پیاو داوای شتێکی لە ئافرەتەکە کرد لەبەرامبەر ئەو داواکردنەدا ئەرکێکی دەکەوێتە سەرشان، بۆیە ئیبنو عەبباس دەڵێ: من بە گوێرەی مانای ئەم ئایەتە خۆم بۆ خێزانەکەم فۆزدەکەم وەکوو چۆن ئەو خۆی بۆمن ئارایش دەدا!!

مەبەست ئەوەیە پیاوو ژن مافو ئەرکیان لەسەر یەکتری بەرامبەرو یەکسانە، هەر کردەوەیەك ئافرەت بۆ پیاوی دەکا لەبەرامبەردا پیاویش کردەوەیەکی بۆ ئەو ئافرەتە لەئەستۆدایە. هەردووکیان هاو تەرازوون لە مافو بەشدا، یەکسانن لەهەستو شعوورو هۆشو ئاوەزدا، کەواتە: دادوەری نییە لایەکیان ببێتە دیکتاتۆر بەسەرلایەکەی تریانداو بیچەوسێنێتەوە!؛ چونکە ژیانی هاوبەشیان خۆشو کامەرانی نابێ ئەگەر هەریەکەیان وەکوو پێویست رێزی یەکتری نەگرنو ئەرکو مافی یەکتریان لەبەرچاو نەبێ. ئەمە شتێکە نکۆڵی لێ ناکرێو سروشت چەسپاندوویەتی، هەریەکە لە ژنو پیاو بۆ کارێك لەبارو گونجاوە، بەگوێرەی سروشت ئەرکی ئافرەت بەرێوەبردنی ئەرکو ئورکی ناو ماڵەو ئەنجامدانی پێویستیاتی هەرشتێك کە پەیوەندی بەکاری ماڵو خێزانەوە بێ؛ لەسەر پیاویش پێویستە کارو کاسبیو پەیداکردنی بژێوی بۆ خۆیو خێزنەکەی. ئەمەش مانای وانیە هەرچی ئیشی ناوماڵە هەردەبێ ئافرەت بیکا، هەرچی ئیشوکاری دەرەوەش هەیە، هەردەبێ پیاو بیکا، بەڵکوو هەریەکەیان – ئەگەر هەبوو بوو – یامەتیدەرو خزمەتکارو کارەکەرو کرێکار بۆخۆی دابین بکا. هەروەکوو چۆن رێگا لەوەش ناگیرێ کە هەریەکەیان یارمەتی ئەوی تریان بداو لەکاتی پێویستدا کۆمەکی بەیەکتری بکەن. بەڵگەشمان لەسەر ئەم بۆچوونە ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ هاریکاری یەکتری بکەن لە کاری چاکەو خوداپەرستیدا، هەرگیز لە کاری خراپەو ستەمکاریدا کۆمەکی بەیەکتری مەکەن.

بەکورتیو پوختی ئاینی ئیسلام ئەوەندە پلەی ئافرەتی بەرزکردۆتەوەو ڕێزی لێناوە، هیچ ئایینو یاسایەك نەلە کۆنو نە لەسەردەمدا نەیتوانیوە وەکوو ئیسلام ڕێزی لێ بنێ!! تەنانەت وڵاتە پێشکەوتووەکانی سەردەمیش هەر نەیانتوانیوە ئەو پلەوپایەیەی بدەنێ؛؛ ئەوەتا هەرچەندە ئەو یاساو تەشریعاتە سەردەمانە زیادەڕەوی دەکەن لە ڕێزلێنانی ئافرەتو فێرکردنی هەموو جۆرە زانستو فەنو پیشەیەك بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قانوونو یاسای بڕێ لەو وڵاتانە ڕێگا نادەن ژن بەبێ پرسی مێردەکەی سەوداو مامەڵە بەماڵی خۆیەوە بکا!!

دەی ئەوە ئایینی ئیسلام پێش چواردە سەدە هەموو ئەو جۆرە حەقو مافانەی بۆ چەسپاندووەو قانوونو یاسای بۆ داناوە، بەڵام تا سەد ساڵێکیش پێش ئێستا لە خۆرئاوا مامەڵەی نامرۆڤانە لەگەڵ ئافرەت دەکراو، وەکوو سەردەمی پێش ئیسلام بەچاوی بەندایەتیو کۆیلەیی سەیری دەکرا؛ بەڵکوو خراپتریش!! سەیر ئەوەیە خۆرئاواییەکان شەریعەتو یاساو شارەستانییان دەربارەی ئافرەت ناگاتە شەریعەتی ئیسلام، کەچی شانازیمان بەسەرەوە دەکەنو بەنەفامو تێنەگەیشتوو ناومان دێننو پێیان وایە: ئەوە ڕەنگدانەوەی تەعلیماتی ئایینەکەمانە، دیارە عوزریشیان هەیە لەوەدا کە ئێمە بەگوێرەی دابو نەرێتی عەشائیریو نەزانی لە ئایین دوور کەوتوینەتەوەو دوور کەوتنەوەشمان لە ئایین وای لێ کردوین کە هەڵوێستی ناشیرین لەگەڵ ئافرەت بنوێنین؛ ئەگینا کەی ئایینی ئیسلامو شەریعەتی ئیسلام هەڵوێستی نارەوای بەرامبەر بەئافرەت هەڵگرتووە؟ کەی لەسەردەمی پێغەمبەرو جێنشینەکانیدا بەو چاوە کەم ڕێزییە سەیری ئافرەت کراوە؟! پێویستە هەموو کاتێ ئەم ڕاستییە بەرچاو بگیرێ کە هەڵەو تاوانی موسوڵمانان نابێ بکرێن بەنیشانەی ناکامڵی شەریعەتو ناکرێتە لەکەو کەلەبەر بۆ یاساو شەریعەتی ئیسلام، یاساو شەریعەتی خوا کامڵەو تۆکمەو بێ غەلو غەشن، هیچ ستەمکاریو خواریو خێچی یەکیان لەخۆ نەگرتووە، ئەم یاسا باشانە هەر نووسراوو قسەی باش نین، بەڵکوو شیاوی جێبەجێ کردنو ئەنجام دانن، لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەرو جێنشینەکانیدا هەروەها لە ڕۆژگاری زێڕینی ئیسلام دا بەتەواوی

تەنفیذکراون، هیچ گیروگرفتێکی جێبەجێکردنیان بەخۆوە نەدیوە، خۆ هەر یاسایەك جارێك قبووڵی تەنفیذکردنی کرد دەشێ چەند جارێکی دیکەش تەنفیذ کردنەکەی دووبارە ببێتەوە!!

بەڵام ئەو پلەیەی کە شەریعەت داینــاوە بۆ پیــاوان کە دەفەرموێ: ﴿وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ ئەوە پلەی سەرۆکیەتیو پێڕاگەیشتنە بەسەر کاروبارو بەرژەوەندی خێزانــدا وەکوو چۆن لە ئایەتێکی تـردا راڤەی ئەم ئایەتەی کردووەو دەفەرموێ: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ﴾ پیاوان سەروکارن بەسەر ئافرەتانەوەو ئەرکی بەرێوەبردنو بەخێو کردنیان لەسەر شانە، چونکە پەروەردگار ئەم زێدە توانایەی پێ بەخشیوونو دەتوانن ئەم ئەرکە جێبەجێ بکەن، هەروەها چونکە لەماڵی خۆیان بژێوی خاوخێزان دابین دەکەن.

ژیانی ژنو مێردایەتی ژیانێکی کۆمەڵایەتیە، دەبێ سەرۆكو لێپرسراوێکی تێدا بێ، کاتێك راو بۆچوونو حەزو ئارەزووەکانی ئەندامانی خێزانەکە جیاجیابوو ئەو بڕیاری پێویست بداو نەهێڵێ هەریەکەیان پەرتەوازە ببنو هەریەکە لە ئاوازێك لێبدا، خۆ ئاشکراشە پیاو شیاوترە بۆ ئەم سەرۆکایەتیە، چونکە ئەو باشتر بەرژەوەندی خێزانەکە دەزانێو بەهۆی هێزی بازو ماڵو داراییەوە بەتواناترە بۆ جێبەجێ کردنی پێداویستیەکانی خێزانو پارێزگاری لە ئافرەتو بەخێو کردنی!! لەبەرامبەر ئەوەشدا ئافرەت داوای لێ دەکرێ کە بەقسەی مێردەکەی بکا، بەمەرجێ ئەو بەقسە کردنە نەبێتە هۆی حەرام کردنی حەلاڵ یان حەلاڵ کردنی حەرام، جا ئەگەر پیاوەکە لەلایەن خۆیەوە ئەرکی سەرشانی ئەنجام داو بەڵام ئافرەتەکە سەرپێچی کردوو ناشیزەبوو گوێ بیستی فەرمانی مێردەکەی نەبوو، ئەوکاتە پیاوەکە مافی ئەوەی هەیە تەمبێی بکا، بە ئامۆژگاری، بەلەگەڵ نەنووستنو پشت تێکردنو لێدانێکی سووكو ئازارنەدەر، کە بەعەرەبی پێی دەگوترێ (ضرب غير مبرح) بەڵام دەست درێژی کردنە سەر ئافرەت بەلێدانێکی بەزەختو ئێشو ئازاراوی بەمەبەستی کوڵ پێ ڕشتنو رق

نیشتنەوە یان بۆ خۆچەسپاندنو سەیتەرەکردن بەسەریدا ئەوە ستەمەو ئایین پەسەندی ناکاو پێی نارازییەو بەتاوانی دەزانێ!!

چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، الإِمَامُ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ فِي أَهْلِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا» هەمووتان لێپرسراونو هەریەکەتان کارێکی پێ سپێردراوە بەرپرسیارە لە ئەنجامدانیدا!!

سەرۆكو پێشەوای موسوڵمانان لێپرسراوەو بەرپرسیارە لەو کارانەی سەرشانی، پیاو لەناو خێزانی خۆیدا لێپرسراوەو لەبەڕێوەبردنی ئیشو کاری خێزانەکەی. ئافرەت لێپرسراوە لەماڵی مێردەکەیداو بەرپرسیارە لەو ئەركو کارانەی پێی سپێردراوە.

بێگومان ئەو سەرۆکایەتیە کە پیاو هەیەتی بەسەر ئافرەتدا تەکلیفو ئەرکە خراوەتە سەشانی نەك ڕێزلێنان بێ، بەشێکیش لەو ئەرکەی لەسەرشانیەتی بەرامبەر ئافرەت ئەوەیە. فێری ئەوەی بکا: چۆن ئەرکی سەرشانی خۆی وەکوو ئافرەت ئەنجام بداو بزانێ چی لەسەرە بیکاو چی پێویستە بۆی بکرێ، هەروەها پێویستە فێری بیروباوەڕی ئیسلامی بکرێنو ئادابی ئیسلام فێر ببنو بزانن چۆن منداڵی خۆیان پەروەردە دەکەنو چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی تردا دەکەن.

فێرکردنو فێربوونی ئەو جۆرە شتانە بەگوێری شوێنو کاتو بارو زروف دەگۆڕێ بۆ نموونە برین پێچێتی (التمريض) لە کۆندا کارێکی ئاساییو سەرەتایی بوو، بەڵام ئێستا پێویستی بە زانینو خوێندنو نووسین هەیەو قوتابخانەو فێرگەی بۆ کراوەتەوە.

دەی باشە بە گوێرەی ئایینو عەقڵ کام ڕێگا لەم دوو ڕێگایە پەسەندە!! ئایا ئافرەت مێردی خۆی دەرمان بکا، یان ئافرەتێکی برین پێچی بێگانە بێت دەرمانی بکاو شوێنی نادروستی پیاوەکە ببینێ؟! یان ئافرەت کوا دەتوانێ برین پێچیو پزیشکی بکا؛ ئەگەر ئاگاداری زانستی برین پێچی نۆژداری نەبێ؟! ئایا دایکی نەزانو نەخوێندەوار

دەتوانێ پێش ئەوەی منداڵەکانی بچنە قوتابخانە شتێکی بەسوودیان فێر بکا؟! یان مێشکیان دەهاخنێ بە جۆرەها شتی پڕوپووچو بێ کەڵك؟!! کە لە داهاتووی ژیانیشیانا کاریگەری سەلبی خۆی دەبێ‌و ناتوانن خۆی لێ دەرباز بکەن؟؟

حافظ ئیبراهیم زۆر جوانی گوتووە کە دەڵێ (الأم مدرسة اذا أعددتها — أعددت شعبا طيب الأعراق) دایك قوتابخانەیە ئەگەر بە ڕێك‌وپێکی پەروەردەو ئامادەت کرد گەلێکی ڕەسەنت پێك هێناوەو ئامادەتکردووە.

﴿وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ پەروەردگار بەتواناو کارزان‌و دانایە، بەشێك لە کارزانی‌و دانایی ئەوەیە: کە وەکوو پیاو مافی داوە بەئافرەت‌و دوای ئەوەی کە لەلای گەلەکانی پێش ئیسلام ئافرەت وەکوو کاڵا سەیری دەکرا پلەو پایەی دایەو ڕێزی لێنا، خستیە هاوتەرازووی پیاو.. ئەمجار بۆ ئەوەی کاروباری خێزان پشێوی تێ نەکەوێ‌و نەبێتە هەرچی‌و پەرچی؛ ئەرکی لێپرسراوی خێزانی خستە سەرشانی پیاو، هەرکەسێکیش بەم حوکمە ڕازی نەبێ مانای وایە: بەربەرکانی حوکمی خودا دەکاو دژی دەسەڵاتی خودا دەوەستێ، ئینکاری حیکمەت‌و دانایی خودا دەکا، ئاشکراشە پەروەردگار چ هەڕەشەیەکی لەوکەسانە کردووە کە ئەوە هەڵوێستیان بێ.

## ژمارەی تەڵاق‌و حوکمەکانی

﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ بِهِۦۗ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعۡتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ

هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۗ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٢٣٠﴾ ﴾.

له پێش هاتنی ئیسلامدا عەرەبەکان دابو نەریتی تەڵاقو عیدەیان هەبوو بەڵام ئەندازەیەکی دیاریکراوو ژمارەیەکی تایبەتی نەبوو، جا ئەگەر تەڵاقدانەکە بەهۆی رق هەڵسانێکی کاتی بوایە، ئەوە پیاوەکە دوای ماوەیەك ئافرەتەکەی ریجعە دەکردەوەو دەیگێڕایەوە ژێر نیکاحی خۆی. بەڵام ئەگەر تەڵاقدانەکە بەهۆی رق هەڵسانێکی بنەڕەتی بوایەو مەبەست زیان گەیاندن بە ئافرەتەکە بوایە، ئەوە پێش ئەوەی ژنەکە عیددەی تەواو بوایە ریجعەی دەکردەوە، ئەمجار پاش ماوەیەك تەڵاقی دەدایەوە، هەر بەو جۆرە تا بیویستایە ژنەکەی دەهێنایەوە ژێر نیکاحی خۆیو دووبارە تەڵاقی دەدایەوە تا رقەکەی دەنیشتەوە، یان پەشیمان دەبووەوە، ئابەو جۆرە ئافرەت یاری پێ دەکراو مافی پێشێل دەکراو دەچەوسێنرایەوە، هەر لە رێگەی تەڵاقەوە پیاو دەیتوانی ئەوپەڕی ئازارو زیانی پێ بگەیەنێ؟!!

کە ئایینی ئیسلام هات یاساو نیزامی دانا بۆ تەڵاقو پەیوەندی نێوان ژنو مێردی رێکخست، سنووری بۆ ژمارەی تەڵاقو ریجعە دیاری کردوو فەرمووی: ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ﴾ ئەو تەڵاقدانەی کە خودا دایناوەو شەرع پەسەندی دەکاو پیاوەکە دەتوانێ ئافرەتەکەی تێدا ریجعە بکاتەوە دووجارەو هەرجارەی تەڵاقەکە دەداو ئافرەتەکە دەکەوێتە عیدەوەو پێش تەواوبوونی عیدەکە دەتوانێ ئافرەتەکە بگێڕێتەوە بۆ ژێر نیکاحی خۆی، واتە: پیاو دەتوانێ تا دووجار هەرجارەی تەڵاقێکی ژنەکەی بداو پێش تەواوبوونی عیددە بیگێڕێتەوە بۆ ژێر نیکاحی خۆی.

خستنی دوو تەڵاق بەجارێك یان سێ تەڵاق بەجارێك حەرامە، كۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەوانە: عومەرو عوسمانو عەلیو عەبدوڵڵای كوڕی مەسعودو ئەبو موسای ئەلئەشعەری ئەم رایەیان هەیە، فەرمودەیەكی پێغەمبەریش هەیە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر دەیگێڕێتەوەو پشتیوانی ئەم رایە دەكا. عەبدوڵڵا دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: :«إنما السُّنَّةُ أَنْ تَسْتَقْبِلَ استقبالا الطُّهْرَ فَتُطَلِّقَ لِكُلِّ قَرْءٍ طَلْقَةً» كەواتە: ئەو تەڵاقەی كە بۆ پیاو هەیە تیایدا ژنەكەی ریجعە بكاتەوە دوو تەڵاقە. دوای ئەو دوو تەڵاقە لەگەڵ كردی بە سێ ژنەكەی لێ حەرام دەبێ، هەتا ئەو ژنە بەویستی خۆی شوو بەكابرایەكی تر نەكاو نەی گوێزێتەوە دوایی ئەو مێردە تەڵاقی نەداتەوەو عیددەی نەڕوا، دروست نیە مێردی پێشووی مارەی بكاتەوە! ئەوەشمان لەبیر نەچێ شووكردنەوەكەی بەمێردی دووەمی نابێ هەربۆ ئەوە مارەی بكاو بچێتەلایو تەڵاقی بداتەوە بۆ ئەوەی بۆ مێردی یەكەمی رەوا بێ مارەی بكاتەوە، ئەگەر ئەم مەبەستەی تێدا بوو دەبێتە مارە بەجاشو ئەوەش كارێكی حەرامەو فێڵە شەرعەو خودا پێی ناخۆشەو دروست نیە.

﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ واتە: دوای ئەوەی: كە دووجار ژنی خۆت تەڵاق داو ریجعەت كردەوە ئەمجار یەكێ لەم دوو رێگایەتان لەبەردەمدایە: یان یەكگرتنەوەو رێك كەوتنەوەو نیازپاكیو هیوای ژیانێكی خۆشو كامەرانیو هەڵكردن بەیەكەوە، یان دەس لێك بەردانو لێك جیابوونەوە بەشێوەیەكی شەرعیو رێكوپێك. ئەوەی پشتگیری ئەم راڤە كردنە دەكا: ئەو فەرمودەیەیە كە ئەبو داودو هی تریش لایان پەسەندەو ئەبو روزمینی ئەسەدی گێڕاوتیەوە، دەڵێ: كاتێ ئایەتی ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ﴾م بیست عەرزی پێغەمبەرم كردو وتم قوربان! ئەی تەڵاقی سێیەم كامەیە؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەوەڵامدا فەرمووی: ﴿أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾.

جا ئەگەر پیاوەكە دوای ئەوەی دوو تەڵاقەی ژنەكەی داو ریجعەی كردەوە؛ هەر زانییان پێكەوە هەڵناكەنو ژیانیان بەیەكەوە بۆ ناچێتە سەرو ئیتر پیاوەكە دەست لێك بەردانی هەڵبژاردوو تەڵاقی سێیەمی دا، لێی جیابووەوە ئەوە ئەو ئافرەتە بەهیچ

شێوەیەك پەیوەندی لەگەڵ ئەو پیاوەدا نامێنیٚ‌و تا شوویەکی تر نەکاتەوەو پیاوێکی تر نەچێتە لایو تەڵاقی نەداتەوە عیدەی نەڕواو ئەم مارەی نەکاتەوە نابێتەوە بەژنی!! بەکورتی پیاو ئەگەر دوای گواستنەوەی ژنی خۆی تەڵاقدا تەڵاقێك یان دووان دەتوانیٚ ریجعەی بکاتەوە بەمەرجێك عیددەی تێپەڕ نەبیٚ!! ئەگەر لەماوەی عیدەدا ریجعەی نەکردەوە یان تەڵاق دانەکەی پێش گواستنەوە بوو ئەوە ناتوانیٚ سەربەخۆ ریجعەی بکاتەوە، بەڵکوو دەبیٚ بە ئیزن‌و ڕەزامەندیی ئافرەتەکەو بەمارە کردنێکی تازە ببنەوە بەژن‌و مێردی یەکتری.. خۆ ئەگەر سیٚ تەڵاقەی دا، ئەوە تا پیاوێکی تر مارەی نەکاتەوەو نەچێتە لایو تەڵاقی نەداتەوە مێردی پێشوو ناتوانیٚ مارەی بکاتەوە.

حیکمەت‌و نهێنی لە هەبوونی مافی ریجعە کردنەوە بۆ پیاو ئەوەیە مرۆڤ زۆرجار هەست بەگرنگی‌و کاریگەری نیعمەت ناکا هەتا ئەو نیعمەتەی لەکیس نەچیٚ. زۆرجار وا دەبیٚ پیاوەکە دوای لێك جیابوونەوەو تەڵاق دان، خێزانەکەی لا خۆشەویست دەبیٚ، یان بۆی دەردەکەویٚ چەند پێویستی بەو ئافرەتە هەیە، دوور کەوتنەوە لێی چەند کارێکی ئەستەمە، بیٚ خێزانی چەند ناخۆشە، ئەو کاتە پەشیمان دەبێتەوەو دڵی دەگۆڕیٚ‌و هەست بەخراپەی خۆی دەکاو لە کرداری خۆی ژێوان دەبێتەوە!

یان وا ریٚ دەکەویٚ ئافرەتەکە خۆ بەزلزان‌و نازو نووزکەرو بیٚ موبالات‌و دەست بڵاوو پیس‌و پۆخەڵ‌و سەرپێچیکەرە، ئەوەی کە پێویستە بۆ مێردەکەی بیکا نایکاو لە پیاوەکەی دەبێتە دوپشکی حەوسەرو ژیانی لیٚ تاڵ دەکا، کە تەڵاق درا بیر لە ئاکامی هەڵەی خۆی دەکاتەوە، هەست بەهەڵس‌وکەوتی نالەباری خۆی – لەبواری ژن‌و مێردایەتیدا دەکا لە ناخەوە بڕیاری ئەوە دەدا کە ئیتر لەمە بەدوا هەڵەکانی خۆی راست بکاتەوە ئافرەتێکی عال‌و سال‌و گوێڕادێر بیٚ، جا کە ریجعەکرایەوەو گەڕایەوە بۆناو لانەی ژن‌و مێردایەتی‌و لەگەڵ مێردەکەی پێك گەیشتنەوە، ئەو هەڵەی بۆ

هەڵدەکەوێتەوە کە هەڵوێستی خۆی بگۆڕێو ئەوی لە ڕابوردوودا لەکیسی چووە، وەدەستی بێنێتەوەو رووەو پاشەڕۆژێکی بەختەوەر هەنگاو بنێ...

وا ڕێ دەکەوێ دوای ئەم ئاشت بوونەوەو بەیەك گەیشتنەوەیە، پیاوەکە دووبارە دەست دەکاتەوە بە شەڕو ئاژاوە لەگەڵ خێزانەکەیدا، سەرلەنوێ ناکۆکی دروست دەبێتەوە، یان وا دەبێ ئافرەتەکە عاری نەناوە، هەر لەسەر رەوشتی رابوردوویەتیو هەڵسوکەوتی نەگۆڕیوە، دووبارە پیاوەکە لەکاتی رق هەڵسانو بۆ رزگار بوون لە دۆزەخی ئەو ژنو مێردایەتییە ئافرەتەکە تەڵاق دەداتەوە، بۆ جارێکی تر لانەی ژنو مێردایەتی دەشێوێتەوەو ژنو مێردەکە لێك جیا دەبنەوە، لەیەکتری دوور دەکەونەوە، ئەمجار هەریەکەیان لە عاست خۆیەوە بیردەکاتەوەو تێ دەفکرێ! پیاوەکە هەست بەهەڵەی خۆی دەکاتەوەو بۆی دەردەکەوێ کە ژیانی بەبێ ئەو ئافرەتە ئەستەمەو ماڵو منداڵی بێ ئەو ئافرەتەو چاودێری کردنی بۆیان ناگونجێ، هەرچی بیر دەکاتەوە ناتوانێ دەستبەرداری ئەو ژنەی ببێو ماڵو منداڵی بخاتە ژێر دەستی ئافرەتێکی تر، یان ئافرەتەکە ئەمجارەیان بە تەواوەتی ژێوان دەبێتەوەو لە ناخی دەروونەوە هەڵسوکەوتی خۆی دەگۆڕێو هیوادارە سەرلەنوێ بچێتەوە لانەی ژنو مێردایەتی!! بۆیە ڕێگا دراوە جارێکی تریش پێش تێپەڕ بوونی عیددە پیاوەکە ژنەکەی ریجعە بکاتەوە، جا ئەگەر پاش ئەم جارەش دووبارە نێوان ژنو مێردەکە تێکچووەوەو شەڕو ئاژاوەیان لە نێواندا دروست بووەوە، ئەمە مانای وایە ئەم ژنو مێردە ناتوانن بەیەکەوە بژینو دیارە هۆکارەکانی لێك جیابوونەوە زۆر بەهێزترن؛ لە هۆکاری بەیەکەوە مانەوە، تەنانەت بەیەکەوە مانەوەیان رووداوی سامناكو پاشەڕۆژێکی زیان بەخشی لێ چاوەڕوان دەکرێ. واتە: کێشەی نێوانیان دەگاتە ئاستێك کە بێ چارەسەر دەمێنێتەوەو جگە لە چارەسەری تەڵاقو لێك جیابوونەوەی یەکجاری چارەسەری تر نامێنێ، کەوابێ چار هەر ئەوەیە تەڵاقی سێیەمی بداو بەیەکجاری دەست لێك بەردەن، چی مارەیو بژێویو حەقو مافێکی لەسەر یەکتریان هەیە، جێبەجێی بکەن، بەشێوەیەکی شەرعی هەریەکەیان بۆخۆی هاوسەرێکی تر هەڵبژێرێو دوا رۆژی خۆی

دەست نیشان بکا، بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە کە نابێ دوای لێك جیابوونەوە کە، نە پیاوەکە بەخراپی باسی ژنەکە بکاو نە ژنەکە بەخراپی باسی پیاوەکە بکا، نابێ بەهیچ شێوەیەك نهێنیو عەیبو عاری یەکتری بۆ خەڵك باس بکەن.. بەراستی یاساو نیظامی دەست لێك بەردانی ژنو پیاو بەوشێوەی باسکرا ئەوپەڕی کامەرانیو لێزانیو بەرژەوەندی لەخۆ گرتووە، زۆر زانایانەو دانایانە ئەم کێشە کۆمەڵایەتییەی حەل کردووە، کە بەرژەوەندی دوا رۆژی منداڵو خێزانی تێدا بەرچاو گیراوە، هەموو هەوڵو تەقەڵلایەکی تێدا بەکارهاتووە، بۆ راست کردنەوەی خوارو بۆ پڕکردنەوەی کەلەبەرو بۆ بەرگری کردن، لە تێك نەچوونی لانەی خێزانو پەروەردە کردنی منداڵ لە باوەشی دایكو باوکدا!!

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار بەپێویستی دانا لەسەر ئەو کەسەی کە ژنەکەی تەڵاق دەدا کە دەبێ تەڵاق دانەکەی بەشێوەیەکی شەرعی بێو کارێك نەکا زیان بەئافرەتەکە بگا، ئەوەشی لە پیاوان حەرام کرد کە ماڵو دارایی لە ئافرەتەکە بسێنێو ئەو مارەییو دیاریانەی کاتی خۆی داویەتی لێی بسێنێتەوەو فەرمووی: ﴿وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا﴾ واتە: بۆتان نیە کە ئەوەی داوتانە بەو ژنانە لێیان بسێننەوە جا ئەو ماڵە مارەیی بێ، یان دیاری بێ، یان شتی تر. بەڵکوو پێویستە لەسەرتان کە شتێکی زیادەشیان بدەنێ بەم جۆرەش پابەندی فەرمانی پەروەردگار دەبن کە دەفەرموێ: ﴿فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا﴾ دڵخۆشیان بکەن بەپێدانی بەشێك لەماڵی خۆتانو زیاد لە مافی خۆیان؛ ئەمجار بەشێوەیەکی ئاساییو یاسایی دەستیان لێ بەردەنو تەڵاقیان بدەن.

ئەو حوکمە هی کاتێکە کە پیاوەکە داواکاری تەڵاق بێو جوودابوونەوە هەڵبژێرێ، بەڵام ئەگەر ژنەکە داواکاری تەڵاق بوو دەیەویست لەدەست مێردەکەی رزگاری بێ، ناشیزەبوونیشی هەر بۆ ئەوە بوو کە پیاوەکە ناچار بکا تەڵاقی بداو ئەوکاتە ئەگەر پیاوەکە لەبەهای تەڵاق دانەکە پارەیەك وەربگرێ رەوایەو حەڵاڵە. چونکە هەرگیز داوا لە پیاو ناکرێ ژنەکەشی لەدەست بچێو زیانی ماڵیشی لێ بکەوێ

بەبێ ئەوەی تاوانێکی کردبێ. هەر ئەم مەبەستەشە کە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ أَن يَخَافَا أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ﴾ مەگەر بترسێن کە پابەندی ئەحکامی خودا نەبن، کە دەربارەی پەیوەندی ژن و مێردایەتی دایناوە، وەکوو تەبایی و ڕێزگرتنی یەکتری و بەرامبەرییان لە ماف و ئەرکدا لەئاست یەکتری، چەسپاندنی سەرۆکایەتی پیاو لەناو ماڵداو بەرپرسیاری لە خێزان و هاریکاری کردنیان بۆ پێکەوەنانی خێزان و پەروەردەکردنی منداڵ و بەرچاوگرتنی بەرژەوەندی دین و دونیایان.. ئەگەر ترسیان هەبوو لەوەی کە ناتوانن موراعاتی یاسای ژن و مێردایەتی بکەن؛ بەم جۆرە ژنەکە ترسی ئەوەی هەبوو کە نەتوانێ نیعمەتی پێکەوە ژیان پەرە پێ بداو پیاوەکە ترسی ئەوەی هەبوو کە زوڵم لە ژنەکەی بکا زیاد لەوەی خودا بۆی داناوە سزای ژنە سەرپێچیکەرەکەی بدا، ئەوە حوکمەکە ئەومیە کە ئەم ئایەتە ڕوونی دەکاتەوە کە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! ئەگەر ئێوە ترسی ئەوەتان هەبوو کە ژن و مێردێك ناتوانن پابەندی ئەو یاسایە بن کە خودا دایناوە بۆ ڕاگرتنی پەیمانی ژن و مێردایەتی و لەوانەیە ئەگەر بەیەکەوە بمێننەوە خیانەتی ژن و مێردایەتیان لێ ڕووبداو ئاکامی ژیانیان ناشیرین بوەستێ؛ ئەوکاتە هیچ تاوانێکی تێدا نیە، کە ئافرەتەکە خۆی بکڕێتەوەو بەپارە تەڵاق لە مێردەکەی وەربگرێ؛ چونکە ئافرەتەکە بەڕەزامەندی خۆی دەیداتێ و هیچ زۆرەملێیەکی پیاوەکەی تێدا نیەو بەڵکوو لەسەر داخوازی ژنەکەیە.

بوخاری و ئیبنو ماجەو نەسائی لە ئیبنو عەبباسەوە حەدیثێکیان گێڕاوەتەوە دەفەرموێ: جەمیلەی خوشکی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول خێزانی ثابیتی کوڕی قەیس هاتە خزمەت حەزرەت و عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا!! من هیچ گلەییم لە بارەی دین و ڕەوشتەوە لە ثابیت نیە، بەڵام بەدەست خۆم نیە ناچێتە دڵمەوەو خۆشم ناوێ و ڕقم لێیەتی، پێشم ناخۆشە دوای موسوڵمان بوونم خۆم کافر بکەمەوەو خیانەتی ژن و مێردایەتی لێ بکەم، پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو باغەی کاتی خۆی کردوویەتی بەمارەیی بۆت بۆی دەگێڕیتەوە ئەگەر

تەڵاقت بدا؟ وتی: بەڵێ باغەکەی بۆ ڕەت دەکەمەوە، ئەمجار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بەثابیتی فەرموو: باغەکە وەربگرەو یەك تەڵاقی بدە.. ئەم لێك جیابوونەوە کە ئافرەتەکە بەماڵ تەڵاق وەربگرێ پێی دەگوترێ (خولع)و عیددەی وەکوو عیددەی ژنی تەڵاق دراوە.

ئەمجار پەروەردگار کۆتایی ئایەتەکە دێنێ بەهەڕەشە کردن لەو کەسانەی کە پابەندی ئەم ئەحکامانە نابن‌و دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا﴾ ئەو فەرمان‌و نەهییانەی کە گوتران: حوکم‌و یاسای پەروەردگارن دەربارەی پەیوەندی ژن‌و مێردایەتی، سنوور بەزێنی مەکەن ئەوەی بۆتان حەڵاڵ کراوە پابەندی بن‌و پەلاماری حەرامەکە مەدەن، ئەوەی فەرمانتان پێکراوە بیکەن‌و توخنی ئەوە مەکەون کە لێتان قەدەغە کراوە.

چونکە ﴿وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللّهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ ئەوانەی لە سنووری خودا دەردەچن‌و سنووربەزێنی دەکەن، کارەکەیان گەل‌و نەتەوە لەناو دەبا، بەتایبەتی زوڵمی مێرد لە ژنی یان زوڵمی ژن لەمێردی چونکە پەیوەندی نێوان ژن‌و مێرد بەهێزترین پەیوەندییە جا کە گەل‌و نەتەوە گەیشتە ئەو ئاستە کەئەو پەیوەندییە تۆکمەیە ئاوا لەرزۆك بێ، دیارە پەیوەندییەکانی تری کۆمەڵ هەموویان لێك هەڵوەشاوەن.

بۆیە ئێستا ئێمە بەچاوی خۆمان دیاردەی وا دەبینین کە خوێناو لە دڵ دێنێ! بنەماکانی کۆمەڵ بەتەواوی لە گرێژنە چوون‌و دیاردەیەکی سامناك لەناو کۆمەڵدا دەبینرێ کە تا ئێستا لە هیچ چاخێکی ڕۆژگاری موسوڵمانانداا نەبینراوە، ئەوەتا ئافرەت پەچەی فڕێ داوە، خۆی ڕووت کردووەو زۆربەی جەستەی دیارەو، بێ سڵەمینەوەو تەریق بوونەوە، لە کۆڵان‌و ڕێگاوبان‌و فەرمانگەو شوێنی تریشدا لەگەڵ نامەحرەمدا چاوەچاویەتی، دیاردەی سنوور بەزێنی‌و بەرەڵایی ئافرەت دیاردەیەکی سامناکەو نەخۆشیەکی کوشندەیەو کێشەی ئافرەت‌و خێزان بووتە تەنگ‌و چەڵەمەیەکی گەورە، ژن تەڵاقدان زۆر بووەو ژن مارە کردن کەم بووە، لەهەموو لایەکەوە دەنگی نارەزایی لەبەرامبەر بەرەڵایی ئافرەت بەرز دەبێتەوە، پیاوانی خاوەن

بیروهۆش هەستیان بەخەتەری ئەم بەرەڵلاییە کردووە؛ بەڵام دیارە جڵەویان لەدەست بەربووەو وا بەئاسانی ناتوانرێ ڕەو ڕەوەی کۆمەڵ بێننەوە تایەو کاتێك پەشیمان بوونەوە کە پەشیمان بوونەوە داد نادا.

ئەوەمان لەیاد نەچێ کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەموو کاتێ ژن‌و مێردی هەڵناوە کە تا بۆیان بکرێ بەعەقڵ‌و هۆش چارەسەری کێشەی ناو خۆیان بکەن‌و پەنا نەبەنە بەر تەڵاق. یەکێ لەو هەڵنانە حەدیثەکەی ئەوبانە کە ئەحمەدو تیرمذي‌و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەر ئافرەتێك بەبێ هۆکاری پێویست داوای تەڵاق لە مێردەکەی بکا ئەوە بۆنی بەهەشتی لێ قەدەغە دەبێ.. لە فەرموودەیەکی تردا فەرموویەتی «الْمُخْتَلِعَاتُ هُنَّ الْمُنَافِقَاتُ» ئەو ئافرەتانەی کە بەپارە تەڵاقی خۆیان دەکڕنەوە ئەوە دوو ڕوو مونافیقن ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ﴾ ئەگەر دوای دوو جارەکە، کەلەڕستەی ﴿الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ﴾دا ئاماژەی بۆ کراوە تەڵاقێکی تریدا کە سێیەم جارەو بە ڕستەی ﴿أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ ئاماژەی بۆ کراوە ئیتر ئەو ئافرەتە لەژێر دەسەڵاتی پیاوەکەدا نامێنێ‌و ناتوانێ بەهیچ شێوەیەك لە هیچ کاتێکدا ریجعەی بکاتەوە مەگەر ئافرەتەکە شووبکاتەوە بەپیاوێکی ترو بەشێوەیەکی شەرعی‌و نیکاحێکی صەحیح بگوێزێتەوەو بچێتە لای‌و پێکەوە جووت ببن. بەڵگە لەسەر ئەوە دەقی ئایەتەکەو ئەو حەدیثەیە کە ئیمامی شافیعی‌و ئەحمەدو بوخاری‌و موسلیم لە عائیشەیان گێڕاوەتەوە دەفەرموێ: خێزانی روفاعەی قورەظی هاتە خزمەت پێغەمبەرو عەرزی کرد وتی: قوربان! من لای روفاعە بووم‌و ژنی بووم تەڵاقی داوم‌و تەڵاقەکەی کەوت (عبدالرحمن)ی کوڕی زوبەیر مارەی کردمەوە بەڵام پیاوەتی نەماوەو ئەوەی پێووەیەتی دەڵێی پەڕۆیە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) زەردەخەنەیەکی هاتێ‌و فەرمووی دەتەوێ بگەڕێیەوە بۆلای روفاعە؟ ئەوە نابێ‌و

ناگونجێ هەتا ئەو تامی شیرنایی تۆ نەکاو لەززەت لەیەکتری نەکەن‌و دوایی تەلاقت بدا ناتوانی بچیتەوە بۆلای روفاعە.

حیکمەتی ئەم مەرجە ئەوەیە پیاو هەرکاتێ زانی ئەگەر ژنەکەی سێیەم جار تەلاق دا ئیتر تا پیاوێکی تر مارەی نەکاتەوەو بەتەواوی نەچێتە لای‌و دوایی تەلاقی نەداتەوە، مێردی پێشووی ناتوانێ مارەی بکاتەوە، ئیتر لەوانەیە لە تەلاقدان بسڵەمێتەوە. چونکە پیاو زۆر لەشانی گرانە ژنەکەی یەکێکی تر مارەی بکاتەوە! ئایەتەکە بەروونی ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو مارە کردنەی کە ژنی تەلاقدراوی سێ بەسێی پێ مارە دەکرێتەوە لە مێردی دووەم دەبی مارەکردنێک بێ مەبەست تێیدا بەردەوامی ژن‌و مێردایەتی بێ. کاتیی نەبێ، واتە: مارەکردنەکە بۆ ئەوە نەبێ فێڵە شەرع بێ بۆ ئەوەی مێردی یەکەم مارەی بکاتەوە!

هەرکەسێك ئافرەتی تەلاق دراو مارە بکات بەمەبەستی ئەوە: کە تەلاقی بداتەوە بۆ مێردی پێشووی حەلاڵ بێتەوە، ئەوە مارەکردنەکەی دروست نیەو ئەگەر تەلاقیشی بداتەوە بۆ مێردی یەکەمی حەلاڵ نابێ مارەی بکاتەوە، بەکوردی خۆمان ئەم جۆرە ژن مارەکردنە پێی دەگوترێ (مارە بە جاش)و دیاردەیەکی دزێوو گوناحێکی گەورەیەو شەرع نەفرەتی لێ دەکا. ئیمامی مالیك‌و ئەحمەدو ئەوری زۆر بەتوندی دژی ئەم جۆرە ژن مارەکردنەوەیەن‌و بەلایانەوە دروست نیە، کۆمەڵێك لە عولەما دەڵێن: بەمەرجێك لەکاتی مارەکردنی لە مێردی دووەم باسی تەلاقدانەوەکە نەکەن نیکاحەکە راستەو دادەبەسترێ بەڵام کەراهەتی هەیە.

ئیمامی ئەحمەدو نەسائی لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە حەدیثێك دگێڕنەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەهاوەڵانی فەرموو: ئایا پێتان نەڵێم نێری خوازراو کێیە؟

وتیان: بەڵێ پێمان بڵێ: فەرمووی: (مارە بە جاشە) پەروەردگار نەفرەتی کردووە لەو کەسەی دەبێتە جاش‌و لەو کەسەی بۆی دەبێتە جاش، واتە (ژن‌و پیاوەکەو مێردە کۆنەکە).

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کرا دەربارەی مارە بە جاش فەرمووی نەخێر نابێ مارە کردن دەبێ بەحەزو ویست بێو فێڵو گاڵتە پێکردنی تێدا نەبێ بەنامەی خوا، دەبێ لەززەتو خۆشیش لەیەکتری وەربگرن.

لە ئیمامی عومەر دەگێڕنەوە فەرموویەتی: هەرکاتێك ژنو مێردێکی (مارە بە جاش)م بهێننە لا بەردەبارانیان دەکەم، کوڕەکەی لێی پرسیو وتی: بۆچی بەردەبارانیان دەکەی، فەرمووی: چونکە هەردووکیان زینایان کردووە.

پیاوێك لە عەبدوڵلای کوڕی عومەری پرسی وتی: تۆ رات چیە: دەربارەی ئافرەتێك تەڵاق درابێو تەڵاقەکەی کەوتبێ منیش مارەی بکەمەوە بۆ ئەوەی دوایی تەڵاقی بدەمەوەو بۆ مێردی پێشووی حەڵاڵ بێتەوە بەمەرجێك مێردەکەی بەم مەبەستەی من نەزانێو داواشی لێ نەکردبم؟! عەبدوڵلا لەوەڵامدا وتی: نەخەیر نابێ، ژن مارە کردن دەبێ بە حەزو ئارەزو بێو مەبەست پێکەوە ژیان بێ، دوایی ئەگەر بەدڵت بوو درێژە بەپەیوەندیەکە بدەو ئەگەر بەدڵیشت نەبوو تەڵاقی بدە، هەرچەندە ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) ئەمانەمان بەلاوە وەکوو تاوانی خوێن رشتن وابوو.

لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسییان پرسی دەربارەی کەسێك سێ تەڵاقەی ژنەکەی دەداو دوایی پەشیمان دەبێتەوە چار چیە؟ فەرمووی ئەوە پیاوێکە لە خودا یاخی بووەو بەپێچەوانەی فەرمانی خودا ژنەکەی تەڵاق داوە خودا ژێوانی کردۆتەوە، بەگوێی شەیتانی کردووەو هیچ رێگا چارەیەکی بۆ نەهێشتۆتەوە، وتیان: ئەی ئەگەر کابرایەك بۆی حەڵاڵ بکاتەوە بەم نەوعە ژنەکە لەخۆی مارە بکاو بچێتە لایو دوایی تەڵاقی بداتەوە؟! فەرمووی کەسێك فێڵ لە خودا بکا خودا سزای فێڵەکەی دەداتەوە.

لەم ریوایەتانەوە بۆمان دەردەکەوێ حوکمی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ)و رای هاوەڵە گەورەکانی پێغەمبەرو تابعینو موجتەهیدانی موسوڵمان ئەوەیە کە ئەو کەسەی مارە بەجاش دەکاو ژنو پیاوەکە نەفرەت لێکراون! بەڵام بەداخەوە ئەم

دیاردە ناشیرینە لەبڕێ ناوچەی ولاتی موسوڵمانانندا بڵاوبۆتەوە، لەلای کۆمەڵێك نەزانو نەخوێندەوار بووەتە دابو نەریتو شەرعیان کردووە بەئامێری گاڵتەو بوونە لە کەو عار بەسەر ئیسلامەوە.

﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا﴾ ئەگەر مێردی دووەم لەبەر هۆیەکی تایبەتی ئافرەتەکەی تەڵاقدا تەڵاقەکەی کەوتو عیددەی رۆیی ئەوکاتە هیچ خراپەیەکی تێدانیە: کە مێردی یەکەم مارەی بکاتەوە بەنیکاحێکی تازە بەڵام بەمەرجێ ئەو مەرجەی کەخودا داینـاوە بێتەجێ کە دەفەرموێ: ﴿إِن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ﴾ هەردووکیان پێیان وابوو کە دەتوانن رێزی یەکتری بگرنو هەریەکەیان بەرامبەر ئەوی تر ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام دەدا. ئەگەر ترسی ئەوەیان هەبوو دوایی دەکەونەوە کێشەوەو ئافرەتەکە دووبارە بەلەسە دەبێتەوە یان پیاوەکە زیانی پێ دەگەیەنێ، ئەوە مارەکردنەوەکە لەلای خودا پەسەند نییەو نەیکەن باشە.

﴿وَتِلْكَ حُدُودُ اللّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ ئەم ئەحکامانەی روونکرانەوە حوکمی پەروەردگارن، لەسەر زمانی پێغەمبەر بەئێوەی رادەگەیەنێو روونی دەکاتەوە، بۆ کەسانێك کە سوودو قازانجی پەیڕەوکردنیان بزانن، هەست بەبەرژەوەندییان بکەن، پەیڕەویان بکەن بەشێوەیەك تا سوودبەخش بن، ئەم حوکمانە نانێرێ بۆ کەسانێك کە نەزانبن، بەهیچ شێوەیەك نیازی پاکیان نەبێ، بۆیە ژنەکەی ریجعە دەکاتەوە تا زیانی پێ بگەیەنێو خەشی دڵی خۆی پێ برێژێ!!

## چۆنیەتی ژن تەڵاقدانو ماوەی عیددەی تەڵاقدراو

﴿ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍۚ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُواْۚ وَمَن يَفْعَلْ

ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ۚ وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٣١﴾ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْا۟ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۗ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٢﴾ ﴾.

ئەمجار پاش ئەوەی لە ئایەتی پێشوودا ژمارەو چۆنیەتی تەڵاقی ڕەوای بۆ روون کردینەوە، دێتە سەرباسی ئەوە چۆن هەڵس و کەوت لەگەڵ ئافرەتی تەڵاقدراو بکەین و دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ﴾ ئەگەر ئافرەتتان تەڵاق دان و ﴿فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾ نزیک بەتەواوبوونی عیددە بوونەوە؛ بەیەکێ لەم دوو شێوەیە ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن ﴿فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾ یان ڕیجعەیان بکەنەوەو بەتەبایی و ئاشتی ژیانیان لەگەڵدا بەسەربەرن یان مەرەخەسیان بکەن و لێیان بگەڕێن با تەڵاقەکەیان بکەوێ و بۆ خۆیان ژیانی داهاتووی خۆیان دیاری بکەن. بۆیەش ڕستەی ﴿فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾مان بەنزیک بوونەوە لەتەواوبوونی عیددە ماناکرد، چونکە ئەگەر عیددەکە تەواو بوو، ئیتر پیاوەکە ناتوانێ ڕیجعەی بکاتەوە پەیوەندی ژن و مێردایەتیان بەتەواوەتی لێک دەپچڕێ و لەژێر ڕکێفی پیاوەکەدا نامێنێ.

ئـەمجار جـەختی لەسـەرئەوە کـردەوە کـە نابـێ ڕیجعەکردنەوەکـە بـۆ زیـان پێگەیاندنیان بـێ؛ فـەرمووی: ﴿وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُواْ﴾ ڕیجعـەیان مەکەنـەوە بۆئەوەی بیانخەنەوە ژێردەستی خۆتانو زیانیان پێ بگەیەنن‌و تەنگیان پێ هەڵبچنن‌و عیددەکەیان پێ درێژکەنەوە، تا ناچاریان بکەن بەپارە تەڵاقەکانیان بکڕنـەوەو خۆیـان ڕزگار بکەن.

ئیبنو جەریر لە عەبـدوڵڵای کوڕی عەبباسـەوە دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: پیـاو هـەبوو ژنەکـەی خۆی تـەڵاق دەدا، ئـەمجار پـێش تـەواوبوونی عیددەکـەی ڕیجعـەی دەکـردەوە، ئەمجار تەڵاقی دەدایەوە، دووبـارە ڕیجعـەی دەکـردەوە.. بۆئـەوەی زیـانی پـێ بگەیـەنێ، ئیتر پـەروەردگار ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارێ کە دەفـەرموێ: ﴿وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُواْ﴾.

ئیمامی سوودی دەڵێ: ئەم ئایەتە دەرهەق بـەپیاوێکی ئەنـصاری هاتۆتـە خـوارێ پێیان دەگوت ثابیتی کوڕی یەسار.. ئەم پیاوە ژنەکەی خۆی تەڵاق دابوو دوو سێ ڕۆژی مابوو عیددەکەی بڕوا، ڕیجعەی کردبووەوە، ئەمجار دووبارە تەڵاقی دابووەوە، ئیتر ئـەم ئایەتە هاتە خوارێ ﴿وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُواْ﴾ ئیبنو جەریری طەبەری لـە ئیبنـو عەباسـەوە دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: پیـاوی وا هـەبوو ژنەکـەی تـەڵاق دەدا، دوایـی پـێش تەواوبوونی عیددەکەی ڕیجعەی دەکردەوە، پاشان تەڵاقی دەدایەوە؛! بەمجۆرە زیانی پێ دەگەیاندو ئەزیەتی دەدا!

﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ﴾ کەسێك ئاوا بەوجۆرە ژنەکـەی ڕیجعـە بکاتـەوە ئازاری بداو ستەمی لێ بکا، ئەوە بێگومان ستەمی لەخودی خۆی کردووە لەژیاندا، بەوە کە ڕێگای شەڕو شەڕەنگێزی گرتووە، ضەمیری خۆی ناڕەحەت دەکاو خزم‌و کەسوکاری ژنەکەی لەخۆ دەکا بەدوژمن‌و، خۆی لـەپێش چاوی خـەڵکی بەویـژدان ناشیرین دەکا. هەر وەکوو چۆن لەقیامەتیشدا ستەمی لەخۆی کردووە، بەوە کە سەرپێچی لەفـەرمانی خوای کردووە ناڕەزامەندی پەروەردگاری بەدەست هێناوە..!!

﴿وَلاَ تَتَّخِـذُوَاْ آيَـاتِ اللّـهِ هُـزُوًا﴾ فـەرمانی خـوداو حـوکمو سـنورەکانی بەگاڵتـە مـەگرنو شـوێن دابو نـەریتی سـەردەمی نـەزانی مەکـەون: وریـابن سـنوور بـەزێنی مەکەن: بەڕاستی ئەمـە هەڕەشـەیەکی تونـدە، ئاڕاسـتەی ئەوکەسانە کـراوە کـە سـنوور بـەزێنی دەکـەن. لەهـەمان کاتـدا موسـوڵمانانیش هەڵـدەنێ کـەڕێزی پەیوەنـدی ژنو مێردایەتی بگرنو واز لەدابو نەریتی سەردەمی نەزانی بهێنن، کە گاڵتـەیان بەتـەڵاقو نیکاح دەکرد.

ئیبنو مەردەویهی لەئـەبو دەرداوە دەگێڕێتـەوە دەڵێ: پیـاو هـەبوو لەسـەردەمی نەزانیدا ژنەکەی تەڵاق دەداو دوایی دەیگوت: بەگاڵتەم بوو، کۆیلەی خۆی ئازاد دەکـرد، پاشان دەیگوت: شۆخیم کردووە، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ ﴿وَلاَ تَتَّخِذُوَاْ آيَـاتِ اللّـهِ هُـزُوًا﴾ ئـیتر پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) بـۆ هـاوەڵانی خوێنـدەوە ئـەمجار فەرمووی: ﴿ثَلاَثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ الطَّلاَقُ وَالنِّكَاحُ وَالرَّجْعَةُ﴾ سێ شت شـۆخییان تێدا ناکرێ راستیان راستییەو گاڵتەیان راستییە: تەڵاقو مارەکردنو ريجعە).

لە ریوایەتێکی تردا لەجیاتی (ريجعە) ئازادکردنی بەندە هاتووە،، لە ریوایـەتێکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: ﴿من طَلَّقَ لاعبـا أو اعتق لاعبا فقد جاز عليه﴾ چونکە ئەمانە کاری گرنگنو گاڵتەبازییان تێدا ناکرێ.

﴿وَاذْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ﴾ یادی نیعمەتی خودا بکەنەوە بەسەرتانەوە کە بڕێ لـەو نیعمەتـە؛ خۆشەویـستی نێـوان ژنو مێـردە بـۆ یـەکتری کـە پـەروەردگار منـەتمان بەسەردا دەکاو دەفـەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُـسِكُمْ أَزْوَاجًـا لِّتَـسْكُنُوا إِلَيْهَـا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَـةً – الـروم/٢١﴾ هـەر لەنیعمـەتی خودایـە کـە یاسای نیکاحو تەڵاقی بەوشێوە رێكو پێکە بۆ داناوینو رێگەی بەپیاوان داوە لەکاتی پێویستیدا زیـاد لەئافرەتێك مارەبکـەن، هـەروا رێگـەی داوە ئـافرەت کـە تـەڵاق درا، یـان مێـردی مـرد، شووبکاتەوە ﴿وَمَا أَنزَلَ عَلَيْكُمْ مِّنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِ﴾ هەروەها یـادی نیعمـەتی ئەوە بکەنەوە کەچەند ئایەتی پیرۆزیی دەربارەی یاسای ژنو مێردایـەتی بـۆ ناردوونـە

خوارێ؛ کە خۆشبەختی ژیانی دونیاو قیامەتی تێدایە، بەشێکیشە لە حیکمەتی خـودا. لەحیکمەتی پەروەردگارە کە لەگەڵ دانانی تەشریعدا مەبەستە سەرەکییەکەیشی بۆ روون کردوونـەوە، سـوودو بەرژەوەندییـەکانی بـۆ دیـاری کـردوون، دیـارە زانینـی حیکمەتو مەبەستەکەی پێکەوە دەبنە هەڵنەر بۆ پابەندبوون پێیانەوە.

بۆیە زۆرجار پەروەردگار باسی نیعمەتی خۆیمان بۆدەکا کە بەخشیونی پێمان، وەکوو پەیوەندیو خۆشەویستی نێوان ژنو مێرد، دانانی یاسای ژنو مێـردو خێـزان، بەوپەڕی رێكو پێکیو گونجاوی، هەروا کە شارەزای ئایینی پاكو خاوێنی کردووین، بۆ هەموو شتێك سنووری بۆ داناوینو ئەحکامی بۆ ناردووینو نهێنـی حوکمەکانیـشی بـۆ دیاری کردووین.

بـەڵام بەداخـەوە خـەڵکی لـەم رۆژگـارەدا بـیر لـەم نیعمەتانـە ناکەنـەوەو گـوێ بەفـەرمانو یاسـاکانی پـەروەردگار نـادەنو ئـەو پەیوەندییـە موقەدەسـانەی نێـوان خۆیانیان تێکداوە!؛ خۆشەویستیو رێزی نێوان خێـزان کرمـۆڵ بـووە، پیـاوان بـەهێزو بازووماڵو سامان دەنازنو ماندوو بوونو نارەحەتی ئافرەتیـان لەبەرچـاو نییـە، ژنـان هەست بەگرنگی پیاو ناکەن کە وەکوو قەڵغانن بۆیان، هەمیشە کـوفرانی ئـەو نیعمەتـە دەکـەنو هەمیـشە غەیبـەتو سـەرکۆنەی پیاوانیـان دەکـەنو نابنـە پاڵپـشت بۆیـان، لەتەنگو چەڵەمەی ژیاندا یارمەتییان نادەن، لەم دابو نەریتە دزێوەشدا خـەڵکی چاو لەیەکتری دەکەنو گرێژنەی خێزان خەریکە تێك بچێ.

﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ﴾ لـەخودا بترسـنو پابەنـدی فـەرمانو نەهییـەکانی بـن هەڵوێـستو رەفتارتان بەرامبەر بەپەیوەندی نێوان ژنو مێرد بەگوێرەی شەریعەتی خـودا بـێ، واز لەو دابو نەرێـتە بهێنن کە لـەوەپێش بارتـان پێـوە گرتبـوو؛ کە بریتیـی بـوو لـەگوێ پێنـەدان بەپەیوەنـدی ژنو مێردایـەتیو پێتـان وابـوو عەقـدی ژن مـارەکردن وەکـوو عەقدی کڕینو بەئیجارە گرتنو کۆیلە کڕین وایە: بەڵکوو پێیان وابـوو عەقـدی زیـواج لەوانەش پڕوپووچ ترە!؛ ئەوەبوو لەبەر هۆیەکی پڕو پـووچ ژنیـان تـەڵاق دەداو دوایـی ریجعـەیان دەکـردەوە، مەبەسـتیان ئـەوەبوو زیـان بـەئافرەت بگەیـەنو سـوکایەتی پـێ

بکەن، ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ بزانن پەروەردگار ئاگاداری هەموو شتێکەو ئاشکراو پەنهان هیچی لێ ون نابێ؛ فەرمانیشی بە بەندەکانی کردووە کە پابەندی سنوورەکانی بن‌و بەگوێرەی حوکم‌و شەریعەتەکەی رەفتار بکەن، نیاز پاك‌و دڵسۆزبن، هەموو کاتێ وابزانن خودا چاوی لێتانەو ئاگاداری دڵ‌و دەروون‌و رواڵەتتانە نە لەئەرزو نە لەئاسمان هیچی لێ گوم نابێ!!؟!

﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾ ئەی خاوەن بڕواو ئیمانداران! هەرکاتێ ژنتان تەڵاقدان‌و عیددەیان بەسەرچوو مێردەکانیان یان پیاوی تر ویستیان مارەیان بکەن‌و ئافرەتەکانیش بۆ خۆیان داخوازی ئەمە بوون‌و دەیانویست شووبکەنەوە ﴿فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ﴾ رێگەیان لێ مەگرن‌و مەبنە بەربەست لەبەردەم شووکردنەکەیاندا، مادام ئەو پیاوو ئافرەتە بەیەکتری رازین‌و هیچ مانیعێکی شەرعی‌و عادەتی نییەو هیچ سوکایەتی پێ کردن‌و عەیب‌و عار بەبنەماڵە ناگەیەنێ‌و رێزی ئافرەتەکەی تێدایە، لێیان بگەڕێن با شووبکەنەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا تَرَاضَوْاْ بَيْنَهُم﴾ واتە: لەبەینی خۆیاندا بەیەکتری رازی بوون؛ بەڵگەیە لەسەرئەوە کەهیچ مانیعێك نییە پیاوەکە راستەوخۆ لە ئافرەتەکە خۆی خوازبێنی بکاو لەگەڵیدا رێك بکەوێ. ئەوکاتە بۆ باوك‌و براو کەسوکاری دروست نییە رێگە لەئافرەتەکە بگرن‌و نەهێڵن شووبکاتەوە، ﴿بِالْمَعْرُوفِ﴾ بەمەرجێك رێککەوتنەکەیان پەسەندبێ‌و ئەو پیاوەی ئافرەتەکە هەڵی بژاردووە هاوشانی خۆی بێ‌و سووکایەتی پێکردنی تێدانەبێ بۆ خزم‌و کەسوکاری ئافرەتەکە، ئەگەر وابوو ئەوە کەسوکارەکانی دەتوانن مەنعی بکەن‌و نەهێڵن شوو بەئەو پیاوە خوێڕییە بکا.

بەڵام دەبێ نەهێشتنەکەیان بەشێوەی ئامۆژگاری‌و وت‌و وێژبێ، نەك بەهەڕەشەو جنێوو خۆ لێ سوور کردنەوە.. بڕێ لەزانایانی ئیسلام پێیان وایە: ئەگەر مێردەکە هەژاربوو نەیدەتوانی مارەیی هاوشان بدا، ئەوە بۆ کەسوکاری ئافرەتەکە هەیە کە نەهێڵن شووی پێبکا بەڵام ئەمە رایەکی لاوازەو زۆربەی عولەمای ئیسلام رایان وایە

ئەگەر پیاوەکە رەوشت پاك بوو، وای هیوا لیٚ دەکرا کەبۆ موعاشەرەی ژن‌و مێردایەتی بگونجیٚ، نابیٚ رێگە لەئافرەتەکە بگیریٚ!!

واتە: دەست کورتی‌و هەژاریی چ رۆڵێکیان لە کەفائەت‌و هاوشانیدا نییە. پێوەری هاوشانی (الكفاءة) داب‌و نەرێتی ئەو گەل‌و هۆزەیە کەتێیدا دەژین، نەك داب‌و نەریتی چەند بنەماڵەیەکی لووت بەرزو خۆ بەزلزان!! ئەوەی کۆمەڵ‌و دەوروبەر بەلایانەوە سوکایەتی بیٚ ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە کەسوکار بتوانیٚ بەرپەرچی ئافرەتەکە بدەنەوە.

هەروەها دروست نییە زۆر لەئافرەت بکریٚ بۆئەوەی شووبکا بەکەسێك کە خۆشی ناویٚ، چونکە ئەو زۆر لێکردنە ئاکامی باش نابیٚ.

ئایەتەکە خیتابەکەی لەگەڵ تێکرای کۆمەڵی موسوڵمانانە، چونکە موسوڵمانان هەموویان یەك هەڵوێست‌و یەك پارچەن، لەبەرامبەر بەرژەوەندی گشتیدا ئەمەش بۆ ئەوەیە موسوڵمانان بزانن: ئەرکی سەرشانی هەریەکیٚ لەوانە کە هەستیان کرد بە پێشێل کردنی مافی ئافرەتێك لەلایەن کەسوکارییەوە یان لەلایەن کەسانی ترەوە پێویستە بەرەنگاری بکەن‌و نەهێڵن ستەمی لیٚ بکریٚ. تەنانەت ئەگەر ئەوانە لێی بێدەنگ بوون‌و دژی نەوەستان، هەر هەموو موسوڵمانانی ئەو ناوچەیە گوناهبار دەبن!!!

چونکە زۆرجار وادەبیٚ کەسوکاری ئافرەت حەزو هەوەسی خۆیان‌و بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان پێش بەرژەوەندی ئافرەتەکە دەخەن!! ئەمجار خەڵکانی تریش چاویان لیٚ دەکەن‌و شەڕو ئاژاوە دروست دەبیٚ‌و گێرەو کێشە سەر هەڵدەداو دەبێتە هۆکاری لەناوچوونی وڵات.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا خودا دەفەرمویٚ: ﴿لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ﴾ بێگومان داب‌و نەریتی سەردەمی نەزانی وابوو کە پیاوان زەبر بەدەست بن لە بەشوودانی ئافرەتدا، ئافرەت نەیدەتوانی خۆی شووبکا، یان رای خۆی دەربڕیٚ، هەر کەسوکاری بەشوویان دەدا،

زۆرجاریش وادەبوو دەیاندا بەکەسێك کە حەزی لێی نەبوو، یان مەنعیان دەکرد لە کەسێك کە حەزی لێ بوو!!

ئیمامی بوخاریو چەند کەسانێکی دیکەش لە مەعقیلی کوڕی یەسارەوە حەدیثێك دەگێڕنەوە دەڵێ: خوشکێکم هەبوو ئامۆزایەکم هاتە خوازبێنیو دامانێ، دوایی وا رێکەوت تەڵاقێکی داو ریجعەی نەکردەوە تا عیددەی بەسەرچوو، پاشان ئامۆزاکەم پەشیمان بۆوەو پەرۆشی بوو خۆشەویستی لەنێوانیاندا پەرەی سەندو ئەو ئەمی خۆش دەویستو ئەویش ئەمی خۆشدەویست، خوازبێنی لێ کردینەوەو داوای کرد کە سەرلەنوێ خوشکەکەمانی پێ بدەینەوەو لێی مارە بکەینەوە، منیش خۆم لێ تووڕە کرد پێم وت خوێڕی! رێزمان لێ گرتی خوشکەکەمان لێ مارەکردی، دوایی لەجیاتی پیاوەتیت تەڵاقتدا، ئێستا هاتوویەوە داوای دەکەیەوە!؛ سوێند بەخوا ناتدەینەوەو لێت مارە ناکەینەوە، لەڕاستیشدا پیاوەکە مرۆڤێکی باش بوو ئافرەتەکەش دەیەویست بچێتەوە بۆلای، پەروەردگاریش ئاگاداربوو بەوە کە هەردووکیان بۆ یەکتری بە پەرۆش بوون، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ. مەعقیل دەیگوت: ئەم ئایەتە دەرهەق بەمن نازڵ بووە، لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە دەڵێ: کە مەعقیل ئەم ئایەتەی بیست وتی سەرم لەبەردا خوشکەکەم لە ئامۆزاکەم مارەکردەوەو فەرمانی پەروەردگارم بەجێ دێنم!

﴿ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ ئەو حوکمو یاسایەی کە لەوەپێش بۆمان باسکردن لەگەڵ تەماع بەرنانو ترساندن، ئەوە ئامۆژگاری کۆمەڵی ئیماندارانی پێ دەکەین؛ ئەوانەی بڕوایان بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەیە، چونکە هەر ئەوان ئەمجۆرە ئامۆژگارییانە وەردەگرنو کاری پێ دەکەن، دڵو دەروونیان پێ رادەچڵەکیو دەیانەوێ بەوردی ناوەڕۆکەکەی جێبەجێ بکەن، بەهیوای پاداش وەرگرتنەوە لەهەردوو جیهاندا.

ئایەتەکە صەریحە لەوەدا کە پێویستە هەرکەسێك موسوڵمانی راست بێ پەند لەئەم ئامۆژگارییە وەربگرێ، ئەوەی پەندی لێ وەرنەگریو پابەندی نەبێ بە

موسوڵمان حسێب ناکرێ، بەڵکوو ئەوانە بەسەرزاری موسوڵمانن و بەدڵ موسوڵمان نین چونکە ئەوانە بنەماو پوختەی ئاینییان بە بەڵگەوە وەرنەگرتووە، ئایین کاری لەدڵ و دەروونیان نەکردووە، ئامۆژگاری کردنیان خۆ ماندوو کردنێکی بێ سوودە، چونکە ئەوان هەر شوێن هەواو هەوەسیان دەکەون و کوێرانە بەرێ و شوێنی باوك و باپیرانی خۆیاندا دەڕۆن.

﴿ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ﴾ ئەو رێگە نەگرتنە لە ئافرەت کە بەدڵی خۆی شووبکاتەوەو بەو مەرجانەی باسکران، سوود بەخشەو بەرەکەتی تێدایە بۆ ئەوانەی کە پەیڕەوی دەکەن، ناموس و شەرەفیان دەپارێزێ، نەسەب و رەچەڵەکیان لەکەدار نابێ، زۆرجار وابووە، مەنع کردنی ئافرەت لەشووکردن بەدڵی خۆی ئاکامی ناشیرینی لێ پەیدابووە، ئەخلاق و رەوشتی تێکداوەو یاسای کۆمەڵ و خێزانی تێکداوەو منداڵی سەرگەردان کردووە.

جا وەکوو ئامـاژەی بۆکرا بەهۆی نەزانی و نەفامی ئادەمیزادەوە دەربارەی بەرزەوەندی کۆمەڵایەتی، هیچ رێزێکیان بۆ ئافرەت دانەدەنا. نەیاندەزانی کە پشێوی کۆمەڵ و خێزان هۆی سەرەکی لەبەرچاو نەگرتنی رۆڵی ئافرەتە تێیدا. کە ئیسلام هات پەیامێکی پیرۆزی پێ بوو بۆ ئافرەت، رێزی بۆ داناو گرنگی پێداو کۆمەڵگای فێری ئەوەکرد: کە مامەڵەی جوان لەگەڵ ئافرەتدا بکرێ و لەسەرخۆو بەهێدیەتی لەگەڵیاندا بجوڵێنەوە. پەیامی ئەوەی پێبوو کە بەگوێرەی ئایەتی ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ﴾ سەیریان بکرێ و رەفتاریان لەگەڵدا بکرێ.

بەڵام سەد مەخابن زۆری پێ نەچوو موسوڵمانان ئەم پەیامە پیرۆزەیان لەبیر چۆوە، بایان دایەوە بۆسەر داب و نەریتی سەردەمی نەفامی و سەرلەنوێ دەستیان کردەوە بە چەوساندنەوەی ئافرەت، ئەمەش رەنگدانەوەیەکی خراپی هەبوو لەسەر کۆمەڵ و خێزان، رەوڕەوەی کۆمەڵایەتی لەسەنتەر لایداو خەڵکی تووشی گێرەو کێشەی جۆراوجۆر بوون. ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ پەروەردگار دەزانێ خێرو سوودو بەرژەوەندی لەچیدایە، نهێنی و حیکمەتی حوکمەکانی خۆی دەزانێ، ئاگادارە بەسەر

سوودو بەرژەوەندی پەیڕەوکردنی فەرمانو دوور کەوتنەوە لەوشتانەی نەهی لێ کردوون، ئێوە بەتەواوی‌و دەست لەسەر دانراوی سوودو بەرژەوەندییەکان نازانن. ئادەمیزاد بەگشتی لەگەڵ ئەو هەموو ئەزموونو تاقیکردنەوانە کە لە رۆژگاردا بەسەریدا تێپەڕیوە نەیتوانی نهێنی ئەو حوکمانە بدۆزێتەوە، بەڵکوو حیکمەتەکەی لەدڵو دەروونی زۆر کەسدا سڕاوەتەوە، تەنانەت کە ئاینیش ئەم پەیامەی هێناوەو داوای بەر قەراربوونی دەکا، کەچی خەڵکی پاش گوێی دەخەنو کاری پێ ناکەن لەکاتێکا ئەرکی سەرشانیان بوو کە پابەندیان بنو بەموو لێیان لانەدەن.

## باسی شیردان بە منداڵ بەکرێ‌و شیر خواردنو بژێوی منداڵ

﴿ ۞ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةٌۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦ ۚ وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ ۗ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا ۗ وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢٣٣) ﴾ .

پاش ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشوودا ئەحکامی نیکاحو تەڵاقی روون کردەوە، باسی حوکمی ئەو شتانە دەکا کە لە ئاکامی نیکاح پەیدا دەبن..

ئافرەت کە تەڵاق دەدرێ، وا رێدەکەوێ منداڵی شیرەخۆرەی هەیە، ئەو منداڵە بێ دەسەڵاتە دەبێتە قوربانی کێشەی نێوان ئەو دایكو باوکە پێکەوە نەگونجاوەو لەوانەیە بەرژەوەندی بفەوتێو مافی پێشێل بکرێ؛ لەوانەیە دایکەکەی لە رقی باوکەکەی شیری نەداتێ، بۆیە یەزدانی مەزن لێرەدا ئامۆژگاری بۆ دایکان دەکا کە شیر بدەن بە منداڵەکانیان، ماوەی شیر خواردنی منداڵی بەدوو ساڵ دیاری کردووە بەمەرجێ باوكو دایك بیانەوێ ماوەی شیر خواردن تەواو بکەن.

هەروەها لەسەر باوکی پێویست کردووە لەماوەی شیرپێدانی منداڵدا بژێوو پۆشاکی دایکەکە دابین بکا بەگوێرەی توانای خۆی.

نەهی کردووە لەوەی کە یەکێ لە باوكو دایك منداڵەکە بکا بەهۆی تەنگ پێ هەڵچنینی ئەوی تر،بەم جۆرە دایکەکە بەمەبەستی زیان گەیاندن بەباوکەکە منداڵەکە بەخێو نەکا، یان داوای بژێوی زۆر بکا، یان باوکەکە منداڵەکە لە دایکەکە بستێنێو نەهێڵێ بەخێوی بکا...

جابۆ روون کردنەوەی ئەم حوکمانەو هی تریش فەرمووی: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ﴾ پێویستە دایکان تەڵاقدراو بن یان لەژێر نیکاحی مێردەکانیان بن، دوو ساڵی تەواو شیر بدەن بەمنداڵەکانیان، ماوەی شیر پێدانەکە لەو ماوە دیاری کراوە تێپەڕ نەکات. ﴿لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ﴾ ئەگەر بەلایانەوە باش بوو بەرژەوەندی منداڵەکەی تێدا بوو باوكو دایکەکەش نەدارا بوون نەیان دەتوانی خواردنی ئاوی میوەو محەلەبیو نەرمەقووت بۆ زاروکەکەیان دابین بکەن، ئەوە دەبێ دایك ماوەی دوو ساڵەکە شیری خۆی بدا بە منداڵەکە، ئەگەر باوکەکە دەیتوانی ئەو جۆرە خواردنانە بۆ منداڵەکە دابین بکا، ئەوە باوكو دایکەکە دەتوانن پێش تەواوبوونی دوو ساڵەکە منداڵەکانیان لە شیر ببڕنەوە.

زانستی پزیشکی دەری خستووە کە شیری دایك باشترین خواردەمەنیو بژێوە بۆ منداڵ؛ بۆیە پێویستو ئەرکی سەرشانی دایکە: کە بە گوێرەی پێویست شیر بدا بە منداڵەساواکەیو بەشیری مەمکەکانی منداڵەکەی پەروەردە بکا.

منداڵ ئەوکاتەی لە سکی دایکیدایە بە خوێنی دایکی گەشە دەکاتو پێ دەگات، کاتێك دێتە سەر دنیاو لە دایك دەبێ خوێنێ کەلەوە پێش پێی دەژیا دەگۆڕێو دەبێتە شیرێکی پاڵفتەکراوی سافی بێ غەشو گونجاو لەگەڵ تەمەنی منداڵەکەدا، چونکە تا منداڵەکە گەورەتر بێ شیرەکەی دایکی خەست تر دەبێتەوە، ترسی نەخۆشیشی لێ ناکرێ چونکە ئەو منداڵە لە خوێنی ئەو دایکە پێك هاتووەو دووایی کە خوێنەکە گۆڕاو بوەتە شیر لەگەڵ جیسمی منداڵەکەدا گونجاوترین بژێوەو هیچ ترسی لێ ناکرێ، کەوابوو ئەگەر منداڵ درایە دایەن پێویستە زۆر تێبینی ئەوە بکرێ ئاخۆ دایکەکە تەندروستی باشە یان نا، ئایا شیرەکەی گونجاوە بۆ تەمەنی ئەم منداڵە یان نا، وەیان ئەم دایکە کە دەبێتە دایەن بۆ ئەم منداڵە رەوشتی چۆنە؟ چونکە شیری دایكو دایەن کاردەکەنە سەر جەستەو رەوشتو ئادابی ئەو منداڵە، چونکە ئەو شیرە لە بنەڕەتدا خوێنی ئافرەتەکەیەو منداڵەکە دەیمژێو دەبێتە خوێنو گۆشتو ئێسقان، کەواتە شیر کاریگەرە لە جەستەو رەوشتی منداڵ دا..

تێبینی ئەوەش کراوە کە کاردانەوەی شیری دایك لەسەر شیرەخۆر لە رووی دەروونیو عەقڵییەوە بەهێزترە لەکاردانەوەی ئەو شیرەیە لەبارەی جەستەو لەشو لارەوە، تەنانەت زۆر دەنگو سەدای دایك کار لە دەنگو سەدای منداڵەکە دەکا، کەوابوو کاردانەوەی شیری دایك لە عەقڵو هۆشو هەستو سیفاتە دەروونییەکاندا شتێکی بەڵگە نەویستە.

زانایانی پەروەردەو کۆمەڵناسی لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا هەستیان بە گرنگی شیری دایك کردووە بۆ منداڵی ساواو زۆر جەختیان لەسەر کردووە، تەنانەت شاژنی روسیای قەیسەری کە منداڵی دەبوو لە مەمکی خۆی شیری دەدا بە منداڵەکەیو نەیدەهێشت دایەنی بۆ بگیرێ.

دەی ئەمە لە کوێ‌و هەڵوێستی ئەمڕۆی ئافرەتانی موسوڵمان لەکوێ!! ئەوەتا: زۆر لەو دایکانەی کە دەوڵەمەندن یان بێزیان نایە یان بەتەمای ئەوەی کە زوو منداڵی تریان ببێ، یان بە هیوای ئەوەی کە جوانی‌و شۆخییان بەردەوام بێ، منداڵەکانیان لە شیری پاکی خۆیان نائومێد دەکەن‌و شیری قوتوو شتی تریان دەرخوارد دەدەن، هەر زوو وشکایی بەمەمکی خۆیان دەهێنن، ئەمەش دەبێتە هۆی تێکچوونی خێزان‌و خراپ پەروەردە کردنی منداڵ‌و بەرەنگار بوونەوەی سروشت!!

بێگومان رۆژگارێك هەبوو موسوڵمانان لەناخەوە پابەندی ئایین بوون‌و، بەخێو کردن‌و پەروەردە کردنی منداڵیان بەگوێرەی ئایین ئەنجام دەدا، منداڵی موسوڵمانان بە شیری خاوێنی دایك‌و ئەخلاقی ئیسلامیانە گەشەی دەکردو پەروەردە دەکرا.. لە مێژووشدا نەبینراوە هیچ ئایینێك وەکوو ئایینی ئیسلام گرنگی دابێ بە پەروەردە کردنی منداڵ‌و چاودێری کردنی!! ماوەتەوە بزانین ئایا لە رووی شەرعەوە دایك واجبە شیر بدا بە منداڵ یان نا؟!

کۆمەڵێك لە زانایانی ئیسلام رایان وایە کە دایك لەسەری واجب نیە شیر بدا بەمنداڵەکەی، مەگەر منداڵەکە جگە لەمەمکی ئەو، مەمکی کەسی تر نەگرێ یان باوکەکە نەدارا بوو نەیدەتوانی دایەنی بۆ بگرێ، یان باوکەکە توانای ئەوەی هەبوو دایەنی بۆ بگرێ بەڵام دەستی نەکەوت.

حیکمەتی ئەندازەدار کردنی ماوەی شیرخواردن بە دوو ساڵ، بەرچاوگرتنی بەرژەوەندی منداڵەکەیە.. چونکە لەو ماوەدا شیری دایك گونجاوترین خواردەمەنیە بۆ منداڵ، هەروەکوو چۆن پێویستی بەجۆرە بەخێوکردن‌و پەروەردە کردنێك هەیە، دایك نەبێ کەسی تر ناتوانێ بۆی فەراهەم بێنێ. جا ئەگەر باوك‌و دایك بەباشیان زانی پێش تەواو بوونی دووساڵ لێی ببڕنەوە دەتوانن لێی ببڕنەوە بە تایبەتی منداڵی وا هەیە بەخواردنی نەرمەقووت‌و گونجاو بۆ جەستەو تەندروستی پێویستی بە شیری دایك نیە.

زانایانی ئیسلام له ئایەتی ﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا﴾ ئەوەیان دەرهێناوە کە ماوەی سك پڕی نابێ لە شەش مانگ کەمتر بێ.

﴿وَعلَـى الْمَوْلُـودِ لَـهُ رِزْقُهُـنَّ وَكِـسْوَتُهُنَّ بِـالْمَعْرُوفِ﴾ لەسـەر بـاوك پێویـستە پێویـستیاتی دایکـە شـیردەرەکە دابـین بکـا، نـشینگەو بـژێوو پۆشـاکی پێویـستی بـۆ دەستەبەر بکا، بـۆ ئـەوەی ئافرەتەکە بتوانـێ منداڵەکە بـەخێو بکاو پارێزگـاری بکـا، ئایەتەکە لە جیاتی وشەی (الوالد) کە بەمانای باوکە وشەی (المولود له)ی بەکار هێنـاوە بۆ ئەوەی ئاماژە بێ بۆ ئەوە کە (منداڵ هی باوکەو پاڵ ئەو دەدرێ) دایك وەکوو کارگە وایەو لە منداڵدانیدا ئـەو کۆرپەڵەیـە هەڵدەپێچێو گەشـەی پـێ دەکا تـاوەکو چـاو بـە جیهان هەڵدێنێ.

بەکورتیو پوختی دایـك سـك بـۆ بـاوك هەڵدەگرێ، شـیر بـۆ بـاوك دەدا، کـەوابێ ئەرکی سەرشانی باوکە کە بژێویو پۆشاکی پێویستی بۆ دابین بکا، تا بتوانێ خزمـەتی زارۆکەکـەی بکـا، چـاودێری بکـاو پـەروەردەی بکـا، چـەندییەتو چـۆنیەتی نەفەقـە پێدانەکە بە گوێری دابو نەریتی ئەو دەوروبەرەیە کە ئافرەتەکەی تێـدا دەژیـا دیـاری دەکرێ! ﴿لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ هیـچ کەسـێك زیـاد لـە توانـاو هێـزی خـۆی ئـەرکی ناخرێتە سەر؛ نابێ نەفەقەو بژێویەکی وای داوا لێ بکرێ کە نەتوانێ بیدا. جـارێکی تـر نموونەی ئەم ئایەتە لە سوورەتی (الطـلاق)دا روونکراوەتەوە کە دەفـەرموێ: ﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّـهُ لَـا يُكَلِّـفُ اللَّـهُ نَفْـسًا إِلَّـا مَـا آتَاهَـا سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا﴾.

ئەمجار دێ هۆی دانانی حوکمەکانی پێشوو شی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿لاَ تُضَآرَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلاَ مَوْلُودٌ لَّـهُ بِوَلَـدِهِ﴾ مەبەست لەئـەم تەشـریعەی کـە باسـکرا بەربەست کردنی زەرەرو زیانە لە باوكو دایك بۆ ئەوەی هیچیان بەهۆی منداڵەکانیانەوە تووشی زیان نەبن، دروست نیە دایك شیری خۆی لە منداڵەکەی بگرێتەوەو واز لە شیر پێـدانی بێنێ، بۆ ئەوەی باوکەکە ناچار بکا دایەنێ بۆ زارۆکەکە بگرێ، هەروەها بـۆی ڕەوا نیـە

زیاد لەنەفەقەی عادەتی داوا بکاو زیاد لە توانای پیاوەکە پێکێشی بکا، یان کەمتر خەمی بکا، لە شیرپێدانو بەخێوکردنی منداڵەکەو دیقەدیقەی پیاوەکە بداو...... هتد.

هەروەها بۆ پیاوەکەش ڕەوا نیە کە دایکەکە مەنع بکا لە شیرپێدانی منداڵەکە، یان نەفەقەو بژێوی پێویستی بۆ دابین نەکا، یان مەنعی بینینی منداڵەکە بکاو نەهێڵێ دایکەکە چاوی پێی بکەوێ. تەنانەت ئەگەر منداڵەکە لەتەمەنی شیرەخۆرییو حەضانەش تێپەڕی بوو باوکەکە بۆی نیە مەنعی بینینی بکا.

﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾ ئەگەر باوكو دایکی نەمابوون پێویستە میراتگری منداڵەکە – کە خزمی نزیکیەتی بەجۆرێك کە یەکیان نێر بێو یەکیان مێ بێ لێك مارە کردنیان دروست نەبێ چی لەسەر باوك یان دایك پێویست بوو لەسەر میراتگرەکە پێویستە.

﴿فَإِنْ أَرَادَا فِصَالاً عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا﴾ واتە: باوكو دایك کە هەردووکیان بەشیان بە منداڵەکەوە هەیە دەیانەوێ بەرێكوپێکی بەخێوی بکەن، جەستەو عەقڵو هۆشی بەباشی گەشە بکا، دەتوانن بە ڕەزامەندی هەردووکیان پێش تەواوبوونی دوو ساڵەکە، یان دوای تەواوبوونی دووساڵەکە منداڵەکە لە شیر ببڕنەوە.

چونکە دیاریکردنی ئەو ماوەیە کە دوو ساڵە بۆ بەرگری کردن لە زیان گەیشتن بە منداڵەکەیە، هەرکاتێ رایان هاتە سەر ئەوە کە کەمتر لە دوو ساڵ یان زیاتر لەو ماوە لە شیری ببڕنەوە، دەتوانن کارەکەیان ئەنجام بدەن. بەڵام ئەگەر یەکێکیان ویستی زیان بە منداڵەکە بگەیەنێو پێش وەخت لەشیری ببڕنەوە، وەکوو ئەوە دایکەکە لە شیرپێدانی وەڕزبێ، یان باوکەکە پەیمانی خۆی نەباتە سەرو بژێوو پۆشاکی پێویست بۆ دایکە شیردەرەکە دابین نەکا، بۆ ئەوەی دایکەکە واز لە شیرپێدانی بێنێ، ئەوە دروست نیەو پەروەردگار نەهی لێ کردووە، زۆربەی کاتیش لەم بارەوە قسەی دایك وەردەگیرێ، چونکە سۆزو عەطفی زۆرترەو هەموو کاتێ هەوڵی ئەوەیەتی بەرژەوەندی منداڵەکە دابین بکا.

خوێنەری هێژا! بەچاوێکی کراوەوە سەیر بکەو ئەمجار تێبفکرە قورئانی پیرۆز کە بەرنامەی ئیسلامە چۆن گرنگی داوە بە راوەرگرتن‌و مەشۆرەتکردن لەشتی بچووکی وەکوو بەخێوکردن‌و شیرپێدانی منداڵ، رێگەی نەداوە یەکێکیان ملهوڕی تێدا بکاو سەربەخۆ بڕیار بداو رای ئەوی تر بە هیچ نەزانێ!!

دەی تۆ چی دەڵێی دەربارەی کاری گرنگی وڵات‌و هەڵوێستی وا کە بەرژەوەندی گەل‌و نیشتمانی پێوە بەند بێ!؟ ئایا ئەرکی سەرشانی سەرۆك‌و لێپرسراوو کاربەدەستانی باڵای وڵات ئەوە نیە کە لە هەڵسوڕانی کاروباری وڵات‌و بەخێوکردن‌و بەڕێوەبردنی گەل‌و نەتەوەکانیاندا را وەربگرن‌و ئیشیان بە مەشۆرەت بێ؟! ئایا رەوایەو دروستە سەرۆك یان کاربەدەستی باڵا بە ملهوڕی سواری گای هار ببێ‌و خودبەسەری لە رووداوە گرنگەکانی وڵاتدا هەڵوێست وەربگرێ‌و رای کەس بەهیچ نەزانێ؟! هاوڵاتیان تووشی جۆرەها دەردو مەینەتی بکا؟! بێگومان ئایینی ئیسلام وای بەباش زانیوەو دەزانێ کە موسوڵمانان هەر لە کارێکی بچووکی وەکوو لە شیربڕینەوەی منداڵ تا دەگاتە کاری هەرە گرنگی وڵات وەکوو بڕیاردانی شەڕو ئاشتی، گۆڕینی دراوو پوچەڵ کردنەوەی، خۆماڵی کردنی نەوت‌و ئەو جۆرە شتانە دەبێ بە پێی را وەرگرتن‌و مەشۆرەت هەڵوێستی تێدا وەربگرێ ئەوەتا قورئانی پیرۆز فەرمان بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾ ئەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەکاری گرنگدا مەشۆرەت بە هاوەڵانت بکەو رایان وەربگرە. یان مەدحی موسوڵمانان بەوە دەکا کە کاروباری خۆیان بە مەشورەت بەڕێوە دەبەن‌و دەفەرموێ: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾.

﴿وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُواْ أَوْلاَدَكُمْ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ ئەگەر ویستتان دایەن بگرن‌و بۆ منداڵەکانتان ئافرەتی بێگانە بەکرێ بگرن بۆ بەخێوکردن‌و شیرپێدانی زارۆکەکانتان، ئەوە هیچ خراپەیەکی تێدا نیەو گوناهتان ناگا ﴿إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ آتَيْتُم بِالْمَعْرُوفِ﴾ ئەگەر ئەو کرێیە بۆتان بڕیار داون بیان دەنێ کە دەچن بۆ سەردانیان دیارییان بۆ بەرن‌و قسەی خۆشیان لەگەڵدا بکەن‌و رێزیان لێ بگرن، چونکە ئەوە

بەرژەوەنـدی شـیردەرو شـیرخۆرو باوکەکەشـی تێدایـە، ئاشکراشـە ئەگـەر شـیردەرەکە هەڵس‌وکەوتی جوانی لەگەڵدا نەکرێ‌و قسەی خۆشیشی نەکرێتـە سـەربار زۆر خـۆ بـە بەخێوکردنی منداڵەکەوە هەڵەوگیر ناکاو مـەیل ناداتـە منداڵەکەو بـە پـاك‌و خـاوێنی رای ناگرێ، گرنگی بە گەشەکردنی نادا، خۆ ئەگەر شیردەرەکە لەم بارەوە تووشـی زیـان بوو؛ ئەوە شیرەکەی دەگۆڕێ‌و دەبێتە زوخاو لـە جیـاتی گۆشـت‌و خـوێنی پـێ زیـاد بکـا پێی دەپوکێتەوە! ئەمەش دەبێتە هۆی نارەحـەتی‌و دڵ ناخۆشـی باوکەکـە کـە دەبینـێ جگەرگۆشەکەی شوێنی ناخۆشـەو لـە باوەشـی سـۆزو عـەطفدا گـەورە نابـێ!! ﴿وَاتَّقُـواْ اللّهَ﴾ لـە خـودا بترسـن زیـادەڕەوی لـە جێبـەجێ کردنـی ئـەم حوکمانـە مەکـەن هـەوڵ بدەن‌و بزانن بەرژەوەندی ئەم حوکمانە چیەو چی نیـە، بـزانن‌و ئامـادە بـاش بـن بـۆ پابەنـدبوون پێیانـەوە! ﴿وَاعْلَمُـواْ أَنَّ اللّـهَ بِمَـا تَعْمَلُـونَ بَـصِيرٌ﴾ بـزانن کـە پـەروەردگار کردەوەکانتـان دەبینـێ‌و ئاگاداریانـە پـاداش‌و سـزاتان دەداتـەوە لەسـەریان، ئەگـەر پێداویـستی بـەخێوکردنی منداڵـەکانتان بـە تـەبایی‌و مەشـوەرەت جێبـەجێ کـردو، بـەگوێری شـەرع‌و ئـایین هـەڵس‌و کـەوتان دەربارەیـان کـردووو کـارێکی واتـان نـەکرد زیانیان پێ بگەیەنن ئەو منداڵانە لە جیهاندا دەبنە فێنکایی چاوتان‌و خێـرو خۆشـیان لێ دەبینن‌و لە قیامەتیشدا بۆتان دەبنە مایەی چاکەو پاداشتان دەدرێتەوە!

خۆ ئەگەر شوێن هەواو هەوەسی خۆتـان بکـەون‌و پابەنـدی حـوکمی خـودا نـەبن هەر یەکە لـە ژن‌و پیاوەکـە بیـەوێ زیـان بـەوی تریـان بگەیـەنێ‌و پاشـقوول لـەوی تـر بگرێ، بێگومان منداڵەکەش زیانی پێ دەگا، ئەو منداڵانە دەبنە هۆی گیروگرفت بۆتان، لـە جیهانـدا خـەم‌و خەفـەتیان لێ دەخـۆن‌و لـە قیامەتیـشا سـزاو ئازارتـان دەدرێ لەسەریان‌و شیاوی چوونە ناو دۆزەخ دەبن.

بەراستی ئەمە هەڕەشەیەکی توندو سامناکە ئاراستەی ئەوانە کـراوە کـە کـارێکی ناپەسەند دەکەن، چونکە کەمتەرخەمی دەکەن لە پـەروەردەکردنی منداڵـەکانیان، ئـەو ژن‌و مێردە یان ئەو باوك‌و شیردەرەی کەلە پـاڵ بـەخێوکردنی منداڵـدا دەیانـەوێ زیـان

بەیەکتری بگەیەنن، یەکتری نارەحەت بکەن، کە ئەمە دەبێتە هۆی لەبەریەك هەڵوەشانی خێزانو پەرتەوازە بوونی منداڵو لەئاکاما شێوانی کۆمەڵو کۆمەڵگا.

دەی با موسوڵمانان بیربکەنەوەو هۆشیان بێتەوەو نەچن کەمتەرخەمی لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیان بکەنو بەرەڵای ڕێکەوتو چارەنووسی نادیاریان بکەن.

## ماوەی گۆشەنشینی ئافرەتی مێرد مردوو

﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ۖ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٣٤﴾ ﴾.

لەمەو پێش باسی تەڵاقو چۆنیەتیو مافی ئەوەی کە مێرد مافی ڕیجعە کردنەوەو بەرەڵڵاکردنی یەکجاری هەیە کردوو ڕوونی کردەوە، دوایی باسی حوکمی شیرپێدانی منداڵو ماوەی شیرخواردنو چۆنیەتی لێبڕینەوەو دابین کردنی خۆراكو پۆشاك بۆ شیردەرەکەی شی کردەوە، ئەمجار دێتە سەرباسی حوکمی ئەو ئافرەتانەی کە مێردەکانیان دەمرن، چی بکەنو هەڵوێستیان چۆن بێ؟! دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾ ئەو پیاوانەی کە دەمرنو ژنیان لەپاش بەجێ دەمێننو بەتەمای ئەوەن شووبکەنەوەو، پێویستە لەسەریان کە تا تێپەڕبوونی چوارمانگو دە شەو لە تازیەدا بن، شتێك نەکەن ببێتە هۆی خوازبێنی لێ کردنو لە ماڵ دەربچن، مەگەر ئیشێکی زەروورو شەرعییان هەبێ. تەنانەت نابی وادە بە پیاوی تر بدەن بۆ شوو کردن پێیان، وەکوو ئەوە بڵێن: ئەگەر عیددەم تەواو بوو شووت پێ دەکەم! شایەنی باسە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تازیە گرتنی

بۆ مردوو لە سێ ڕۆژ زیاتر یاساغ کردووە تەنها ژنی مێرد مردوو دەبێ تا چوار مانگو دە ڕۆژ تازیە بگرێ.

ئەم حوکمەی کە باس کرا هی ئافرەتێکی مێرد مردووە؛ کە سکی پڕ نەبێ ئەگەر ئافرەتەکە سکی هەبوو مێردەکەی مرد، کە منداڵەکەی لێ بووەوە عیددەکەی تەواو دەبێ، تەنانەت ئەگەر دوای مردنی مێردەکەی بەساتێك منداڵی بوو ئیتر عیددەکەی تەواو دەبێ وەکوو قورئان دەفەرموێ: ﴿وأولات الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ ئافرەتی دووگیانو سك پڕ مێردی مرد یان تەڵاق بدرێ کە منداڵەکەی بوو عیددەکەی تەواو دەبێ.

ئەبو داوود حەدیثیکی گێراوەتەوە دەڵێ: سوبەیعییەی ئەلئەسلەمی گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فتوای بۆ دام دوای منداڵ بوونەکەم کە شوو بکەمەوە پانزە ڕۆژ بوو مێردەکەم مردبوو کە منداڵەکەم بوو.

پێویستیش ناکا خۆمان بە دەرخستنی حیکمەتو مەبەستی ئەم ماوە دیاری کراوە خەریك بکەین، دەتوانین بڵێین: ئەوە شتێکی (تعبد)یەو وەکوو ژمارەی ڕکاتی نوێژو شەشیەكو دەیەكو ئەندازەی زەکات لێدەرکردن واجب بوونیەتی.

بەڵام هەندێ لە زانایانی ئیسلام وتوویانە پاکبوونەوەی ڕەحم پێویستی بەسێ حەیز یان شەست ڕۆژ هەیە، چونکە مێرد مردن کارەساتێکی گەورەیەو ڕوداوێکی پشت شکێنە بۆ ئافرەتەکە. زیاد لەمەش خێرا کردن لە شووکردنەوە، خزمو کەسو کاری مێردەکە دڵتەنگ دەکاو لێی دەکەونە گلەییو تانەو تەشەر لێدانی تاوانباری دەکەن بەوە کە وەفای بۆ مێردەکەی نەبووەو ڕێزی لێ نەگرتووە. لەلایەکی تریشەوە لای عەرەبەکان باوبوو: کە ژن چوارمانگ بی مێرد دەتوانێ خۆ بگرێو بێتاقەتی ناکا، تەنانەت ئیمامی عومەر پاش ئەوەی کەلەم بارەوە پرسیاری لە ماڵو خێزانی خۆی کرد فەرمانی بەجەنگاوەرانی ئیسلام کرد کە نابێ ئەوانەی کە خێزانیان هەیە زیاد لە چوارمانگ لە ژنەکانیان دوورکەونەوە!! جا ئەگەر ئەم بۆچوونە بنەمای ئەم مەسەلەیە بێ، ئەوە دە شەوە زیادەکە بۆ زێدە ئیحتیاتە... ئەندازەدار کردنی ئەم

ماوەیــە بــۆ عیــددەی مێــرد مــردوو، بــۆ ئــافرەتی تەمــەن بــچووك‌و تەمــەن گەورەیــە، هەروەها ئافرەتی ئازادو کۆیلەو عوزر شۆرو لەحەیز وەستاوە دەگرێتەوە.

﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ هەرکاتێ عیددەی دیاریکراویان تەواو بوو، ماوەی چاوەڕوانییان بەسەرچوو، ئەوە ئێوە گوناحتان ناگاتێ کە ئەگەر ئەوان ئەوەی لێیان قەدەغە بوو ئەنجامی بدەن، وەکوو خۆ ئارایشتدان‌و هەوڵدان بۆ شووکردن‌و چوونەدەر لە ماڵ‌و سەردانی خزم‌و کەس‌و کارو دراوسێ، بەشێوەیەکی شەرعی‌و بەگوێرەی داب‌و نەریتی ئەو کۆمەڵ‌و کۆمەڵگایە.

ئەگەر پێش تەواوبوونی عیددەکە یەکێ لەم کارانە بکەن ئەوە تاوانەو پێویستە لەسەر کەس‌و کاریان، لەسەر کاربەدەستانی موسوڵمان ڕێگەیان لێ بگرن‌و نەهێڵن کاری وا بێ شەرعی ئەنجام بدەن.

ئافرەت لەسەردەمی نەزانیدا تازیەی بۆ مێردەکەی دەگرت بەشێوەیەکی نائاسایی‌و زیادەڕەوی تێدا دەکرد، ساڵێکی تەواو لەژوورەوە دەخزاو دەرنەدەچوو بۆنی خۆشی لەخۆ نەدەداو خۆی ئارایش نەدەداو تێکەڵاوی کۆمەڵ نەدەبوو، کە عیددەکەشی تەواو دەبوو ئەمجار چەند داب‌و نەریتێکی پڕو پووچ هەبوو دەبوایە ئەنجامی بدایە.

کە ئایینی ئیسلام هات ماوەی عیددەکەی کەم کردەوە، تا ئەندازەی سێیەك، تەنها خۆ جوانکردن‌و بۆنی خۆش لەخۆدان‌و خۆپیشاندانی داخوازی کەران‌و هەوڵدان بۆ شووکردنەوەیان لێ قەدەغەکرا، پاك‌و خاوێنی‌و دانیشتن لەگەڵ هاوسێ‌و خزم‌و کەس‌و کارو پیاواندا بەمەرجێك بێگانە نەبن بۆیان ڕەوایەو چ خراپەیەکی تێدا نییە.

بەڵام سەد مەخابن ژنانی موسوڵمانی ئەمڕۆ وازیان لەڕێ‌و ڕەسمی ئیسلام دەربارەی تازیە هێناوەو هەریەکەیان بۆ خۆی بەجۆرێك هەڵوێست دەنوێنێ؛ هی وایان هەیە زیادەڕەوی لە تازیەگرتندا دەکا، قوڕ لەسەرو چاوی خۆی دەگرێ، شین‌و شەپۆڕو وایەشێرەی بۆ دەکاو، لە سنووری ڕێ‌و ڕەسمی حیداد دەردەچێ‌و لە داب‌و نەریتی

ژنــەکانی ســەردەمی نــەزانی تێدەپــەڕێنن، ئــەوەی کــە شــەرع داینــاوە بــۆ مێــردە مردووەکانیان بیکەن نایکەن!!

بەڵکوو هی وایان هەیە دوو ساڵو زیاتر تازیە بۆ کوڕو برایان دەگرن، هی واشیان هەیە دوای چل ڕۆژ تازیەی مێردی مردووی دەشکێنێو هەوڵی شووکردنەوە دەدا!!

بەڕاستی سوودو قازانج لەوەدایە کە موسوڵمانان ئەم عادەتو دابو نەرێتەیان بگۆڕنو شەرعییانە هەڵسو کەوت بکەن، چونکە هیچ سوودێك لە پۆشاك گۆڕینو کەلو پەل گۆڕینی ناو ماڵو قاپو قاچاخ گۆڕیندا نیە، جگە لە ماڵو دارایی بەفیڕۆدان هیچ سوودێکی تری تێدا نیە.

هـیچ ڕێگـا چـارەیەك نییـە جگـە لەگەڕانـەوە بـۆ ئیسلامو بـۆ پابەنـدبوون بـە حوکمی شەرع، کە ڕێگە نادا تازیە گرتن بۆ خزم لەسێ ڕۆژ زیاتر بێ، بۆ مێـردیش لـە چوار مانگو دە ڕۆژ زیاتر بێ، تازیە گرتنەکەش بریتیـە لـە وازهێنـان لـەخۆ ئارایشت دانو خۆ جوان کردنو بۆنی خۆش لەخۆدانو دەرچوون لەماڵ مەگەر بۆ زەرورەت.

﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ پەروەردگار ئاگاداری هەموو کردەوەیەکتانە، جا ئەگـەر خێزانەکانتان وا پەروەردە کرد کە بەگوێرەی شەرع ڕەفتـار بکـەن ئـەوە حاڵتـان بـاشو ژیانتان خۆش دەبێ. دەنا تووشی گیروگرفتی دنیاو سزای قیامەت دەبن.

## خوازبێنی ئافرەتی مێرد مردووو مارەکردنی

﴿ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ۚ وَلَا تَعْزِمُوا۟

عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ فَٱحْذَرُوهُ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٣٥﴾ لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا۟ لَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى ٱلْمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلْمُقْتِرِ قَدَرُهُۥ مَتَٰعًۢا بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٣٦﴾ وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّآ أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَا۟ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ ۚ وَأَن تَعْفُوٓا۟ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۚ وَلَا تَنسَوُا۟ ٱلْفَضْلَ بَيْنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٧﴾

لەوەپێش ئەحكامی تەڵاق‌و ریجعەو شیردان‌و مافی ژن‌و مێرد بەسەر یەكتریی‌یەوەو مافی منداڵ‌و ئەركی سەرشانی باوك لە دابینكردنی بژێوو نشینگەو پۆشاك بۆ ئافرەتی شیردەرو هەمموو ئەوانەی كە بژێویان لەسەریەتی روون كردەوە هەروا باسی ئەوەی كرد كە پێویستە ئافرەتی مێرد مردوو بۆ ماوەیەك تازیە بگرێ.

ئەمجار لێرەدا باسی ئەوە دەكا كە دروستە بەشێوەیەی ناراستەوخۆ خوازبێنی ئافرەتی مێرد مردوو لە ماوەی تازیە گرتنی دا بكرێ، بەم نەوعە پێی بگوترێ ئەتۆ

پەکت ناکەویٚ زۆر کەس هەن کە دوای تەواوبوونی عیددەت مارەت بکەنـەوە، یـان پێـی بلێن تۆ پەکت ناکەویٚ...

بۆ روون کردنەوەی ئەم حوکمە پەروەردگار فەرمووی: ﴿وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاءِ﴾ گوناحتـان ناگاتـیٚو چ خراپەیـەکی تێـدا نیـە ئەگـەر درکـە لەگەڵ ئەو ژنانەدا بکەن کە لە عیددەی مێرد مردنـدان یـان تـەلاق دراونو تەلاقەکـەی جۆرێکە رێگای ریجعەکردنەوەی تێـدا نـەماوە.. ئـەم جـۆرە ئافرەتانـە ئەگـەر بـە درکـە (کینایـە) قـسەی ئـەوەیان بـە گوێـچکەدا بـدەن کـە دەتانـەویٚ دوای عیـددە تـەواوبوون بیانخوازنو مارەیان بکەن هیچی تێدا نیە.

خـەڵکیش دەزانـن بـۆ ئـەم جـۆرە قـسانە چـۆن رەفتـار بکـەنو وشـەو رسـتەی تایبەتیان هەیە: وەکوو ئەوە بڵێی من دەمەویٚ ئافرەتێکی واو وام بـە نـسیب ببـیٚ، یـان بڵێی: داوا دەکەم لە خودا ئافرەتێکی رەوشت جوانم بەنسیب بکا، یان بڵێی: من رەوشت بـەرزو دڵ فـراوانو سـەخی تەبیعـەتم، هەڵسوکـەوتم لەگـەڵ ئافرەتـدا بـەرزەو دڵ فـراوانو سـەخی تەبیعـەتم، هـەڵسو کـەوتم لەگـەڵ ئافرەتـدا موسـوڵمانانە دەبـیٚ ﴿أَوْ أَكْنَنتُمْ فِي أَنفُسِكُمْ﴾ هەروەها گوناحتان ناگاتیٚ کە لـە دڵـی خۆتانـدا بـەهیوای ئـەوە بـن دوای تـەواوبوونی عیـددە مارەیـان بکـەن، چـونکە ئـەم جـۆرە هیـواو حـەز لێبوونـە ناتوانریٚ خۆی لیٚ بپـارێزریٚ، لەبەرئـەوە پـەروەردگار لـەرێی رێگەپێـدانو روخـسەتەوە دەفەرمویٚ: ﴿عَلِمَ اللّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ﴾ پەروەردگار دەزانیٚ ئێوە لە دڵی خۆتاندا ئـەم هیوایـە شـین دەکـەنو دژووار دەبـیٚ کـە ئێـوە ئـەم هیـواو بەتەمابوونـەتان بـشارنەوەو رەغبەتی خۆتانیان پیٚ رانەگەیەننو ئەوەی لەدڵتانـدایە پێیان نەڵێن.

بۆیـە رێگـەی پێـدان بـە کینایـەو درکـە حـەزی خۆتانیـان ئاراسـتە بکـەن، بـەلاّم کینایە نەك سەراحەتو راستەوخۆ؛ کەوابوو پێویستە لە سنووری ئەوە تێپـەڕ نەکـەن، لەو ئەنـدازەدا بووەسـتن. ﴿وَلَكِن لاَّ تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا﴾ نەچـن بـە نهێنـیو سرتەو بـە دزییەوە بە لێنی مارەکردنیان پیٚ بدەن! چونکە ئەوە دەبێتە شوێن گومانی ئـەمو ئـەو شتی تری لیٚ دەبێتەوە، بەلاّم کە لەلای خەڵكو بە کینایە بیٚ عەیبی تێدا نیە.

زۆربەی راڤەکەرانی قورئان پێیان وایە کە مانای ﴿لاَّ تُوَاعِدُوهُنَّ سِرّاً﴾ وادەی مارەکردنەکە بە صەریحی ﴿إِلاَّ أَن تَقُولُواْ قَوْلاً مَّعْرُوفاً﴾. وادەیان مەدەنێ بە قسەی بێ نەزاکەت وادەیان بدەنێ بە وتەیەك کە لای خەڵکی کردنی عەیب نەبێ، وەکوو ئەوە بڵێی من سنگ فراوانم بۆ ئافرەتو بار قوڵم؛ پوختەی قسە ئەوەیە دروست نیە بۆ پیاو کە بەنهێنی لەگەڵ ئافرەتی عیددەدار باسی خوازبێنیو ژن مارەکردنیان لەگەڵدا بکەنو وادەی تەواوو صەریحیان پێ بدەن، بەڵام ڕێگەیان پێدراوە کە بە کینایەو لە چوارچێوەی ئەدەبو حیشمەتدا رەغبەتی دڵی خۆیان بۆ بکەنەوە، بۆ ئەوەی کە تازییەکەیان تەواو بوو عیددەکەیان بەسەر چوو بزانن کێ داخوازیانەو کێ دەیەوێن.

﴿وَلاَ تَعْزِمُواْ عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّىَ يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ﴾ بڕیاری مارەکردنو گواستنەوە مەدەن تا عیددەی ژنە مێرد مردووەکە تەواو دەبێ، واتە: مارەکردنی حەرامەو خوازبێنی حەرامەو تەنانەت ئەگەر مارەشی بکا مارەیی نایەو عەقدەکە دانابەسترێ. ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ﴾ بزانن خودا دەزانێ چی لەدڵتاندایەو ئاگادارە، کە دەتانەوێ پرکێشی شتێك بکەن کە لێتان قەدەغەیە، بترسن لەوەی کە بڕیار لەسەر شتێك بدەن کە لێتان قەدەغە کراوە جا چ قسە بێ یان کرداربێ.

﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ بزانن کە هەریەکێ لە ئێوە کە سنووری بەزاندووە دوایی ژێوان بووە تۆبەی کرد، خودا تۆبەی لێ وەردەگرێ. چونکە پەروەردگار خودایەکی لێخۆشبوو خاوەن حیلمە، زوو سزای بەندەکانی نادا، بەڵکوو مۆڵەتیان دەدا بۆ ئەوەی بەخۆیاندا بچنەوەو واز لە تاوانو گوناه بێننو پابەندی فەرمانی خودای خۆیان بن، ژیانی کورتی دونیایان بە هەلو فرسەت بزاننو بە فیڕۆی نەدەن، تا دوایی پەشیمان نەبنەوە.

﴿لاَّ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاء مَا لَمْ تَمَسُّوهُنُّ أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً﴾ هیچ مارەییتان ناکەوێتە سەر ئەگەر ژنتان تەڵاق دان بەمەرجێك نەتان گواستبنەوەو نەچووبنە لایان، مەگەر مارەییتان بۆ دیاری کردبن، ئەوکاتە ئەگەر گواستبتاننەوە ئەمجار تەڵاقتان دابن، ئەوە هەموو مارەییەکەیان دەکەوێ، ئەگەر نەتانگواسبنەوە ئەوە

نیوەی مارەییان دەکەوێ، ئەگەر گواسترابنەوەو ماریی دیاری نەکرا بێ، ئەوە مارەیی هاوشانی (مهر المثل)ی خۆی دەکەوێ.. بەلام چونکە ئافرەتەکە بەو مارەکردنە ناوی زڕاوەو تووشی زیان بووە ﴿وَمَتِّعُوهُنَّ﴾ دەبێ لە جیاتی مارەیی شتێکی بدرێتێو بەهرەمەند بکرێ، ئەندازەی ئەو ماڵەی کە دەیدا بە ژنەکەدیاری نەکراوە بەڵکوو بە گوێرەی حاڵو گوزەرانی پیاوەکە ﴿عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ﴾ لەسەر دەوڵەمەند بە پێی خۆیو ﴿وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ﴾ لەسەر دەست کورتو هەژاریش بە ئەندازەی خۆی. جا هەرچەندە شەرع ئەندازەی دیاری نەکردووە، بەلام ئەوەی پەسەند کردووە کە تا دەتوانرێ دڵ فراوانی تێدا بەکار بێ، دڵدانەوەی ژنە تەلاق دراوەکەی تێدا بێ.

﴿مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾ ئەم ماڵ پێدانە پێی دەگوترێ موتعە ئەم موتعەیە واجبو پێویستە بدرێ بە ژنی تەلاق دراوی نەگواستراوەی مارەیی دیاری نەکراو، حیکمەتو مەبەستیش لە پێدانی ئەم موتعەیەئەمەیە کە ئافرەتەکە پێش گواستنەوە تەلاق بدرێ ناوی دەزڕێو خەڵکی واگومان دەبەن کە ئەم ئافرەتە لەسەر شتێك تەلاق دراوەو دیارە پیاوەکە رەوشتێکی ناشیرینی لێ بینیوە بۆیە تەلاقی داوە، جا کە ئەم موتعەیەی دایە ئەو گومانە دەرەوێتەوەو دەزانرێ کە سوچی تەلاقدانەکە لە پیاوەکەوەیە نەك لە ئافرەتەکە، خەڵکی دەڵێن: فلانە پیاو فلانە ئافرەتی تەلاق داوە ئەوەندە موتعەشی پێدا، دیارە تەلاقدانەکەی لەبەر هۆیەك بووە کە پەیوەندی بە خۆیەوە بووە نەك سوچی ئافرەتەکە بێ، ئیتر ئەم ماڵ پێدانە دەبێتە مەڵحەمێكو برینی تەلاق دانەکەی پێ سارێژ دەکرێ.

دەگێڕنەوە دەڵێن: ئیمامی حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی یەکێ لە ژنەکانی تەلاق داو دە هەزار دیرهەمی بە موتعە پێدا!! کە ژنەکە پارەکەی وەرگرت بە کوڵی گریانەوە وتی کالایەکی کەمو جودابوونەوە لە خۆشەویست!!

﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ﴾ ئەگەر ژنتان تەلاق دان، پێش گواستنەوەو چوونە لایان، لەوە پێشیش مارەییتان بۆ

دیاری کردبوون، ئەوە نیوەی مارەیی دیاری کراویان دەدرێتیو نیوەکەی تری دەگەڕێتەوە بۆ مێردەکە.

ئەمە ئەو دابو نەریتەیە کە باو بووەو لە کاتی مارەکردندا ئافرەت هەموو مارەییەکەی وەردەگرت نەك بەو دابو نەرێتەی کە ئێستا دایان هێناوە مارەیی دەکەنە دوو بەش یان زیاترو بەشێکی حازرو بەشێکی قەرزو زیادەڕەویش دەکەن لە مارەیی زۆرداو خۆی پێ هەڵدەنێنەوە!!

ئەگەر پێش گواستنەوە یەکێ لە ژنو مێرد مرد؛ ئەوە هەموو مارەیی دیارکراو، یان مارەیی هاوشانی (مهر المثل) دەچەسپێ، چونکە مردن وەکوو گواستنەوە وایەو هەموو مارەیی واجب دەکا.

﴿إِلاَّ أَن يَعْفُونَ﴾ مەگەر ئافرەتە تەڵاق دراوەکە گەردنی مێردەکەی ئازاد بکا، لە هەموو نیوە مارەییەکە، یان لە بەشێکی بەم جۆرە بڵێ ئەم پیاوە نەچووەمە لایو نە خزمەتم کردووە، نە سوودی لێ بینیوم، بۆچی شتی لێ وەربگرم! ئەوکاتە پیاوەکە لەو ئەنازمیەی کە ژنەکە ئازادی دەکا رزگاری دەبێ!! ئەمە کاتێك دەبێ کە ئافرەتەکە باڵغو عاقڵو خاوەن هۆش بێ.

﴿أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ﴾ یان ئەو کەسەی کە دامەزرانی مارە کردنەکەی بەدەستە: کە بریتیە لە وەلی ئافرەتەکە، ئەو مێردە عەفوو بکا، هەندێك پێیان وایە مەبەست بەو کەسەی کە دامەزرانی مارەکردنەکەی بەدەستە مێردەکەیە ئەوکاتە ماناکەی ئاوایە.

یان مێردەکە لەو نیوەی کە مافی خۆیەتی وەریگرێتەوە گەردنی ئافرەتەکە ئازاد بکاو پیاوەتی خۆی بنوێنێ، ئیتر ئەوکاتە ئافرەتەکە تەواوی مارەییەکە بۆخۆی دەبا. کە دەفەرموێ: ﴿بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە قفڵی نیکاحەکە بەدەستی پیاوەو ئەو ئافرەتەکەی بەخۆیەوە شەتەك داوە، کە وابێ شیاوی ئەوە نیە هەروا بەهەوانتەو بێ پێدانی ماڵو کاڵایەك وازی لێ بێنێو بەرەڵای بکا، بەڵکوو واجوانو لەبارە، کە دەستو دڵ فراوانی لەگەڵدا بەکار بێنێو چی داوەتێ لەمارەیی هیچی لێ

نەسێنێتەوە. بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَأَن تَعْفُواْ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى﴾ هەر یەکێك لەپیاوان یان ژنان لە مافی خۆی دەست هەڵگرێو گەردنی ئەویتر ئازاد بکا ئەوە تەقوای خوای کردووەو لەخواترسە، جا گەردن ئازاد کردنەکە جاری وادەبێ پیاوەکە نیوەی خۆی ناوێو هەموو مارەییەکە دەدا بە ژنەکە، جاری وایش دەبێ ژنەکە نیوە مارەییەکەی خۆی ناوێ چونکە وا رێدەکەوێ ئافرەتەکە هیچ خەتای نیە پیاوەکە بەبێ هۆیەکی مەعقوول تەڵاقی دەدا، جاری واش دەبێ ژنەکە پێکیشی لە پیاوەکە دەکا وا لە مێردەکەی دەکا تەڵاقی بدا!!!

مەبەست بە ﴿التقوى﴾ خوداپەرستیە لەهەموو کارێکا، یان مەبەست ئەومیە: کە وازهێنان لە مافی خۆتان گەردن ئازاد کردنی لە نیوە مارەییەکە دەبێتە هۆی خۆپاراستن لەو دژایەتیکردنەی کە لەئاکامی تەڵاقدانەکە پەیدا دەبێ؛ چونکە دەست هەڵگرتن لەو نیوە مارەییەو گەردن ئازاکردنو وازهێنان لەمافی خۆی، زۆر برینی دڵ کە بەهۆی تەڵاقدانەوە پەیدا دەبێ سارێژ دەبنو دژایەتی ناکەوێتە نێوان بنەماڵەی ژنو مێردەکە، ئەگەر شتێکیش لەو بارەوە سەرهەڵبدا زوو قەڵاچۆ دەکرێ. بۆیە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَنسَوُاْ الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ﴾ پێویستە کەسێك کە لەبنەماڵەیەك ئافرەتێك دەخوازێ، دوایی تەڵاقی دەدا پیاوەتیو خزمایەتی ئەو بنەماڵەیەی لەبیر نەچێتەوەو، وانەکا ژن تەڵاقدانەکە ببێتە کردنەوەی دەرگای دوژمنایەتی.

جا لەگەڵ ئەم پەیامە یەزدانیەدا بەداخەوە موسوڵمانان ئایینەکەی خۆیانیان لەبیر چۆتەوە، یان لەبیر خۆیانیان بردۆتەوە بە پێچەوانەی ئامۆژگارییەکانی قورئان رەفتار دەکەن، هەر بەلێکترازانی ژنو مێردەکەو جودا بوونەوەیان لەیەکتری، ئیتر دژایەتی دەکەوێتە نێوان هەردوو بنەماڵەی ژنو مێردەوە. جاری واش دەبێ پیاوەکە نەفەقەی ئافرەتەکە ناکێشێو ئافرەتەکە ناچار دەبێ لەش فرۆشی بکا، یان وادەبێ مێردەکە ئافرەتەکە بە موعەللەقی دەهێڵێتەوە: نە ئەومیە لای خۆی دایبنێو بەژنی خۆی حیساب بکاو موعاشەرەی لەگەڵ بکا، نە بەیەکجاری تەڵاقی دەداو وازی لێ دەهێنێ. ئافرەتی واش هەیە کە عیددەکەی بەپاکبوونەوەو حەیز پێدا هاتنە ساڵیان

بەسەردا تێپەڕ دەکا پێیان وایە عیددەکەیان ماوەتی‌و هێشتا تەواو نەبووە، مەبەستەکەشیان ئەوەیە کە ماوەی وەرگرتنی (نفقه) خۆراك‌و پۆشاك درێژ بکەنەوەو زیان بەمێردەکانیان بگەیەنن‌و تۆڵەیان لێ بکەنەوە!؛ ئەم جۆرە هەڵوێستانە چ هی پیاوەکە چ هی ئافرەتەکە هەردووکیان بێ شەرعین، بۆیە لەهەندێ دادگای وڵاتی ئیسلامیدا وایان بڕیار داوە: کە ماوەی نەفەقە پێدان بۆ ئەو ژنانەی کە عیددەیان بە حەیزو پاکبوونەوەیە، نابێ عیددەکەیان لە ساڵێکی مانگیی تێپەڕ بکا، واتە: نابێ ماوەکە لە (٣٥٤) رۆژ زیاتر بێ. ﴿إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بێگومان پەروەردگار بیناو زانایە بەو هەڵس‌و کەوتەی کە ژن‌و مێرد لەگەڵ یەکتریی دەیکەن. بۆیەش پەروەردگار بەم رستە پیرۆزە کۆتای بە ئایەتەکە هێنا، تا بیری ئەو ژن‌و مێردانە بخاتەوەو ئامۆژگارییان بکا بۆ ئەوەی واز لە کەللەڕەقی‌و سەرسەختیی خۆیان بێنن‌و وانەزانن ئەو هەڵوێستانەیان کەس پێی نازانێ‌و پرسینەوەیان لەسەر نیە!! نەهێڵن رووداوی تەلاق زیاد لە قاڵبی خۆی زل بکرێ، شەریعەتی ئیسلام چۆنی بۆ داناون پابەندی بن‌و رەفتاری پێ بکەن، نەچن ئەویان لە ڕقی ئەوی تر لەرێی خودا دەرچن‌و یاسای ئیسلام پێشێل بکەن‌و هەریەکەیان بۆ لای خۆیان تێنووسێ.

## ئاگاداری‌و بەجێهێنانی نوێژەکان

﴿ حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٩﴾ ﴾.

﴿حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ﴾ لەوەپێش چەند ئایەتێکی ئەحکامی هێنا، بڕێکیان دەربارەی خوداپەرستیو (العبادات)و هەندێکیان دەربارەی سەوداو مامەڵەو بەشێکیان دەربارەی ئەحواڵ شەخصیو چۆنیەتی ژن مارەکردنو تەڵاقدانو چۆنیەتیو چەندییەتی مارەیی بوو.. ئوسلووبی قورئانیش وایە دوا بەدوای هەموو حوکمێك فەرمان بەتەقوای خوداو ئامۆژگاری موسوڵمانان بکا بەوەی کە پەروەردگار زاناو داناو بینایەو هیچی لێ هون نابێو سزاو پاداشی ئادەمیزاد دەداتەوە لەسەر کردارەکانیان. ئەم جەخت کردنو دووبارە کردنەوە بۆ ئەوەیە کە هاندەرێکی ئایینی لەدڵیاندا دروست بکاو هەڵیان بنێ لەسەر راستاڵیو ئیخلاصو ملکەچی بۆ فەرمانو ئەحکامەکانی، جا لەبەر ئەوەی کە دڵو دەروونی ئادەمیزاد زۆر جاری وا هەیە بەهۆی تێکەڵاوی بە دونیاوە لەم ئامۆژگارییو فەرمانو نەهییانە بێ ئاگا دەبێو لەبیریان نامێنن و لەرێگە لادەدەنو پەرتەوازە دەبن؛ لەبەر ئەوە پێویستیان بە یادخەرەوەیەکی هەمیشەیی کاریگەر هەیە کە بەجیهانی رۆحییەوە بیانلکێنێو لە جیهانی مادەیان دابڕێو روویان پێ بکاتە چاوتێبڕینی ئەو بەدیهێنەرەی کە دروستی کردوون هەتا بەو ڕوتێکردنو چاوتێبڕینە، بەو یادو ذیکرو تێفکرینە لەچڵکی مادەو پەیوەندییە جیهانییەکان پاك ببنەوە، واز لەدەست درێژیو ستەمکاری بهێنن، چاكو چاکەخواز بن، دادوەرو راستاڵو خوداپەرست بن، ئەو یادخەرەوەیەش نوێژە ئەو نوێژەی کە مرۆڤ لە خراپەو خراپەکاری دوور دەخاتەوە، صەبرو ئارامی دەخاتە دڵانەوە، رژدو چروکان فێری دڵ فراوانیو سەخاوەت دەکا، لەبەر ئەم هۆیانەو هی تریش دوابەدوای ئەو حوکمانەی کە لە ئایەتەکانی پێشوودا باس کران!! پەروەردگار روو دەکاتە بەندەکانی دەفەرموێ: ﴿حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى﴾ بەردەوام بن لەسەر بەجێهێنانی نوێژەکان بەگشتیو نوێژی ناوەراست بەتایبەتی، چونکە نوێژ بریتییە لە سوپاس کردنو پەنا بردن بۆ بارەگای زاتی بێچوونی پەروەردگار وەکوو پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ

تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ» وا خوداپەرستی بکەو عیبادەت بکە وابزانە کە تۆ پەروەردگار دەبینی خۆ ئەگەر تۆ ئەوت نەبینی ئەو تۆ دەبینێ.

جا ئەگەر نوێژ بەو شێوەی ئایین فەرمانی پێ دەکاو پێویستە ئەنجام درا ئەوا دەبێتە بەربەست لەبەردەم تاوانو خراپەکاریو نەفس پاك دەکاتەوە لەشەڕو بەدکاری.

بەتایبەتی نوێژی عەسر کە دەکەوێتە کاتێکەوە کە ئادەمیزاد کردەوەی ڕۆژانەی بەرەو تەواوبوون دەڕواو خەریکە لە ئیشوکار دەستی بەرەڵلا دەبێ، ئادەمیزاد لەو کاتەدا رووبکاتە پەروەردگاریو شوکرو سوپاسی بکا کە یارمەتی داوە بۆ بەجێهێنانی خزمەتو پەیداکردنی بژێوی خۆیوماڵو منداڵی.

﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَانِتِينَ﴾ نوێژ بەجێ بهێنن بەشێوەیەك كە ترسو لەرزی تێدا بێو گەورەییو بێ هاوتایی پەروەردگاری تێدا بەدی بکرێ. ئاشکراشە نوێژ ئەم مانایانەی تێدا نابێ، ئەگەر ئامادە باشو خۆ حازرکردنی دڵو جەستەی تێدا نەبێ. دەبێ بەتەواویو بەدڵو بەگیان رووبکەیتە قاپی پەروەردگارو خەیاڵو خەتەرەی دوونیا لەدڵی خۆت دەربهاویو فکرو هۆشو هەستەکانت ئاراستەی زاتی بێچوونی بکەی!!

ئیمامی ئەحمەدو موسلیمو بوخاری حەدیسێك لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: ئێمە لە نوێژدا وا دەبوو لەگەڵ یەکتری قسەمان دەکرد کە ئایەتی ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَانِتِينَ﴾ هاتە خوارێ ئیتر فەرمانمان پێ کرا بەبێ دەنگیو قسەکردنی ناو نوێژمان لێ قەدەغە کرا. بەجێهێنانی نوێژو پارێزگاری کردنی نیشانەی بیروباوەڕی تەواوو مەرجی راستو دروستی موسوڵمانیەتیو برایەتیو راستاڵییە.

ئیمامی ئەحمەدو (أصحاب السنن) حەدیسێکیان لە بورەیدەوە ریوایەت کردووە دەڵێ: (لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: ئەو عەهدو پەیمانەی لە بەینی ئێمەو ئێوەدا هەیە؛ بریتییە لە نوێژ، هەرکەسێك وازی لێ هێنا، بێگومان کافر دەبێ!!

(تیرمذی) حەدیسێکی ریوایەت کردووە، کە دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەر واز لێهێنانی هیچ شتێکیان بەلاوە کوفر نەبوو جگە لە نوێژ.

جا کە نوێژ ئەوەندە گرنگ بێ، پێویستە ئەنجامدانی بە ئەوپەڕی لەسەرخۆیی‌و ئەدەب‌و وریایی دڵ‌و روتێکردنی راست‌و ئامادەباشی مێشك‌و هۆش‌و پاکی لیباس‌و جەستەوە بێ. پێویستە ئەم عیبادەتە لەشوێنی خاوێن‌و بەرەو قیبلەو بەشێوەی تایبەتی‌و ئەدەب‌و حورمەتەوە ئەنجام بدرێ.

﴿فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَانًا﴾ ئەگەر ترستان هەبوو لەوەی کە ئێوە بەو شێوە تایبەتییە نوێژەکانتان ئەنجام بدەن دوژمن فرسەتتان لێ بێنێ‌و غافڵ گیرتان بکا، یان ترسی دڕندەتان هەبوو، لەبەری هەڵدەهاتن یان راوتان دەنان، یان جۆرێکی تر لەم شێوانە بوو.

ئەوە چۆنتان بۆ دەگونجا: بەڕۆیشتنەوە بەسواری رووەو قیبلە یان روتان لە لایەکی تر، نوێژەکانتان بکەن‌و تەکانی نوێژ فاتیحەو تەحیات‌و (سبحان الله)کان بڵێن، بۆ رکوع‌و سوجدەیش ئیشارە بکەن.

ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە بەهیچ جۆرێك‌و هیچ کاتێك نوێژ لەسەر ئادەمیزاد لاناچێ، هیچ عوزرو بەهانەیەك نابێتە هۆی لەسەر لاچوونی نوێژ، هۆی لانەچوونەکەشی ئەوەیە: نوێژ کردارێکە دەسەڵاتی پەروەردگار بەسەر ئێمەو بوونەوەرمان بیر دەخاتەوە.

چونکە لە حەقیقەتدا کرداری رواڵەتی خۆیان لە خۆیاندا یاریدەدەری کرداری دڵ‌و دەروونن کە مەبەستن، ئادەمیزادیش داب‌و نەریتی وایە کە ویستی کردارێك تایبەت بەدڵ ئەنجام بدا پێویستی بە کۆکردنەوەی فکرو هۆش‌و ئامادەباشی دڵ هەیە کە ئەمانەش پێویستیان بەچەند کردارێکی جەستەیی‌و وتنی چەند وشەیەکی تایبەتی هەیە.

﴿فَإِذَا أَمِنتُمْ فَاذْكُرُواْ اللّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر ترسەکەتان نەماو دڵنیابوون، ئەوە یادی خودا بکەن، چونکە فێری کردوون چۆن عیبادەتی بکەن‌و لەکاتی ترس‌و بێمدا چۆن نوێژ دەکەن، یادی نیعمەتەکانی بکەن سوپاسی بکەن. ئەمە کاتێك مانای وا دەبێ کە کافی (کما علمکم) کافی تەعلیل - پاساودان بێ، بەڵام ئەگەر

بڵێین (کاف)ەکە کافی بەدەلییەتە ئەوە ماناکەی وادەبێ یادی خودا بکەن بەو شێوەیەی کە لەوەپێش فێری کردوون، واتە: نوێژەکانتان بەو شێوەیەی پێشوو بکەن کە لەکاتی ئاسایش و ئاسایی دا ئەنجامتان دەدا بەوەی کە راوەستان و رووکردنە رۆگەو رکوع و سجودو دانیشتنی تەحیات و مەرجەکانی تری ئەنجام بدەن!

## وەسیەت بۆ ژنی مێرد مردوو موتعەدان بە ژنی تەڵاقدراو

﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ ۚ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٤٠﴾ وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾ ﴾.

﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا﴾ ئەم ئایەتە تەواوکەری حوکمە تایبەتمەندەکانی ژن و مێردایەتین کە لەم سوورەتەدا هەن، فەرمان کردن بە ئاگادار بوون لەسەر نوێژەکان لەناو باسی ئەم حوکمانەدا لەم رووەوەیە: کە نوێژ کۆڵەکەی ئایینەو گرنگییەکی تایبەتی هەیەو پێویستە گرنگی پێ بدرێ، چونکە کەسێك چاودێری لەسەر نوێژەکان بکا، شایانی ئەوەیە: کە لە سنووری خودادا رابوەستێ و

بەشەریعەتی خودا کار بکاو سەرپێچیو بێ گوێیی پەروەردگار نەکا، هەر بۆیەشە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ﴾.

خاوەنی تەفسیری مەنار دەفەرموێ من لێرەدا بۆچوونێکی ترم هەیە، ئەویش ئەوەیە ئوسلووبی قورئان ئوسلووبێکی تایبەتییە لەوەدا زۆرجار بۆ تازەکردنەوەی نیشاتو رەوینەوەی وەڕزبوونو جاڕزی لە خوێنەرو بیسەر لەشوێنێکا مەبەستەکان یەك لەدوای یەك دەهێنێ، لەئایەتێکدا یا زیاتر باسی عەقیدەو حوکمو یاساو ئامۆژگاریو ئەحکامی تەعەبوودیو شارستانیو ....هتد دەکا.

﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ﴾ ئەو پیاوانەی نزیك مردن دەبنەوەو ژنیان لەپاش بەجێ دەمێنێ پێویستە وەصیەت بۆ خێزانەکانیان بکەن کە بۆماوەی ساڵێك لەماڵی مێردەکەیدا بمێنێتەوەو بژێوی بۆ دابین بکرێ، بۆ کەس نەبێ لەو ماڵە دەری بکا. دەی بابزانین ئەم فەرمانە فەرمانی واجبیو ئیلتیزامە یان فەرمانێکە سوونەت دەگەیەنێ؟!

## دوو ڕا هەیە:

١- ڕای یەکەم ڕای جەماوەری زانایانە، ئەوان دەڵێن: عیددەی ئافرەتی مێرد مردوو لەسەرەتای ئیسلامدا ساڵێکی تەواو بوو وەکوو پەیڕەوکردنێکی دابو نەریتی سەردەمی نەزانیو درێژەپێدانی ئەو عورفو عادەتە، دوایی ئەم یاسایە بە ئایەتی میرات لە سوورەتی (نساء) هەڵوەشایەوە هەروەها بە ئایەتی پێشووش ژمارە (٢٣٤) کە ماوەی عیددەی مێرد مردوو بە چوار مانگو دەشەو دیاری کرد، ئیتر عیددەی ئافرەتی مێرد مردوو لەجیاتی ساڵێك کرا بە چوار مانگو دەشەوو شوێنی حەوانەوەو بژێوی بۆ دابین بکرێ، بەشی خۆشی لەمیرات وەربگرێ کە لەوەپێش نەیدەدرایە!

ئیبنو جەریری طەبەری لە هومامی کوڕی یەحیاوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: دەربارەی ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا﴾ لە قەتادەی پرسی ئەویش فەرمووی پێش هاتنی ئەم ئایەتە ئافرەت ئەگەر مێردەکەی بمردایە بۆ ماوەی ساڵێکی تەواو شوێنی حەوانەوەو بژێوی بۆ دابین دەکرا لە ماڵو دارایی مێردەکەی بەمەرجێك

ئافرەتەکە لەو ماڵە دەرنەچێ، دوایی ئەم حوکمە بە ئایەتی میرات نەسخ کرایەوە، ئافرەت بەشی دیاری کراوی هەشت یەکە ئەگەر مێردەکەی منداڵی هەبوو چواریەك ئەگەر مێردەکەی منداڵی نەبوو بۆ دیاری دەکرا.

٢- رای ئیمامی موجاهیدو ئەبو موسلیمی ئیصفەهانی دەفەرموون: ئەم ئایەتە حوکمەکەی ثابیتەو نەسخ نەکراوەتەوە... ئیمامی رازیش لە تەفسیرەکەیدا ئەم رایەی پەسەند کردووە...

مەجاهید – وەکوو ئیبنو جەریر لێیەوە نەقڵ دەکا – دەڵێ دەربارەی عیددەی ئافرەتی مێرد مردوو دوو ئایەت هاتوونە خوارێ: یەکەمیان ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾ ئەم ئایەتە لەوەوپێش باسکرا.

دووەمیان ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ﴾ هەتا دەگاتە ﴿عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ واتە ئەم دوو ئایەتە دوو حاڵەت بۆ عیددەی ئافرەتی مێرد مردوو دیاری دەکەن ئەگەر ئافرەتەکە ئەوەی هەڵبژارد کە لەماڵی مێردە مردووەکەیدا بمێنێتەوە، بژێوی لە ماڵو دارایی ئەو وەربگرێ، ئەوە عیددەکەی ساڵێك دەبێ، ئەگینا عیددەکەی چوار مانگو دەشەوە، جا بەم پێیە عیددە دوو ماوەی دەبێ ماوەیەکی واجبو تۆکمە ئەویش ماوە کەمەکەیە کە چوار مانگو دەشەو ماوەیەکی تر کە ئافرەتەکە تێیدا سەر پشکە کە ئەویش ماوە زۆرەکەیانە کە ساڵەکەیە!

بەڵام ئەبوو موسلیم دەڵێ: مانای ئایەتەکە بەم جۆرەیە: ئەوانەی لەئێوە دونیا بەجێ دەهێڵن ژنیان لەدوا بەجێ دەمێنێو وەسیەتیان بۆ ژنەکانیان کردووە بە بژێوو حەوانەوەی ساڵێك، جا ﴿فَإِنْ خَرَجْنَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيَ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ﴾ ئەگەر پێش تەواوبوونی ماوەکە لە ماڵەکە دەرچوونو بە پێچەوانەی وەسیەتی مێردەکەیانەوە، واتە هەر چوار مانگو دەشەو مانەوە ئەوە هیچ خراپەیەك نیە لەو کردارەی کردوویانە ئەگەر بچن بەنیکاحێکی راستو دروستو شەرعی شووبکەنەوە. چونکە مانەوەیان بەگوێرەی ئەم وەسیەتە پێویست نییە، ئەمجار

ووتویەتی هۆی ئەم رایە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە عەرەبەکان لەسەردەمی نەزانیدا وەسیەتیان دەکرد بۆ ژنەکانیان بە بژێوو شوێنی حەوانەوە بۆ ماوەی ساڵێکی تەواو، پێویست بوو ئافرەتەکە ماوەی ساڵەکە لە عیددەدا بێ... ئیتر پەروەردگار بەم ئایەتە ئەوەی روون کردەوە: کە ئەوە شتێکی واجب نییە. کەوابوو بەم پێیە نەسخ لە ئایەتەکەدا نییە...

خاوەنی تەفسیری مەنار دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەو رای ئیمامی فەخری رازی هێناوە هەڵسەنگاندنەکەی تاوو توێ دەکاو رەخنەی لێ دەگرێ، ئەمجار دێ رای ئەبوو موسلیم پەسەند دەکاو دوو بەڵگەی بۆ دێنێتەوە یەکەمیان ئەوەیە: مانای ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ﴾ لەسەر مانای خۆی دەمێنێتەوە بەبێ ئیضمارو تەقدیر ماناکەی هەڵدەستێ، بەلام لەسەر رای جەماوەری راڤەکەرانی قورئان دەبێ مانای ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ﴾ بە ﴿الَّذِينَ تَحضرهم الوفاة﴾ مانا لێك بدەینەوە کە وەسیەت لەلای ئەوانەی پێیان واجبە پێویست نابێ مەگەر لەسەر کەسێك کە ئەجەلی نزیك بووبێتەوە.

دووەمیان ئەوەیە: کە عادەتی عەرەبەکان وابووە ئافرەتیان ناچار دەکرد کە بۆماوەی ساڵێکی تەواو لەماڵی مێردی مردوویدا بمێنێتەوە. جا کاتێك ئیسلام ماوەی عیددەکەی بەچوار مانگو دەشەو سنووردار کرد ئەوە چاوەڕوان دەکرا کە میراتگرەکان دوا تێپەڕبوونی چوار مانگو دەشەوەکە ئافرەتەکە لە ماڵەکە دەربکەن. جا ئەگەر ئافرەتەکە رەغبەتی شووکردنەوەی نەبوو ئەم دەرکردنەی بەلاوە قورس دەبێ، کەوابێ وا شیاوو چاوەڕوان کراوە لەمێردی بەوەفاو دڵسۆز کە وەسیەت بکا بۆ دوای خۆی کە تاماوەی ساڵێك ئەو ژنە لەو ماڵەدا بمێنێتەوەو دڵی بدرێتەوەو بژێوی بۆ دابین بکرێ بەمەرجێك لەو ماڵەدا بمێنێتەوە.

ئیتر لێرەدا پەروەردگار ئەوەی راگەیاند کە میراتگرانی مێردە مردووەکە گوناحیان ناگاتێ ئەگەر ئافرەتەکە بۆ خۆی لە ماڵەکە چووە دەرو شووی کردەوە یان

چووەوە لای خزمو کەسو کاری خۆی، چونکە ئەوکاتە کەفالەتو لەخۆگرتنیان بۆ ئەو ئافرەتە تەواو دەبێ، بەبێ ئەوەی ئەوان هیچ کەمتەرخەمێکیان کردبێ لەڕێزگرتنیدا!!

ئەم تەفسیرە لەگەڵ ڕاڤەکردنی مامۆستا (محمد عبده) ڕێک دەکەوێ کە دەفەرموێ: (وەسیەت کردن لێرەدا بۆ واجب بوون نییە بەڵکوو سوننەت دەگەیەنێ...

جا بەگوێرەی ڕاڤەکردنی وێ چوو تەفسیرەکە وا هەڵدەستێو بەم جۆرە دەبێ: ئەوانەی لەئێوە دەمرنو ژنیان لەپاش بەجێ دەمێنێ ئەوە خودا وەسیەت دەکا بۆ ژنەکانیان کە لەماڵی مێردەکانیان دەرنەچن تا ساڵێك، ئەگەر بە ئارەزووی خۆیانو ویستی خۆیان دەرچوون ئەوە ئەو کەسانەی وەسیەتەکە دەیانگرێتەوە لەئێوە هیچ گوناحتان ناگاتێ لەوەی کە ئەو ئافرەتانە دەیکەن لەکاری باشو شەرعیو یاساییو ئاسایی چونکە ئەوکاتە ئێوە هیچ سوڵتەیەکتان بەسەریانەوە نییە، ئەوان خاوەن بڕیارو هەڵوێستی خۆیانن و مەنع ناکرێن، مەگەر کاری ناشەرعی ئەنجام بدەن، کارێك بکەن کەهەموو مرۆڤێکی باڵغو عاقڵی لێ مەنع بکرێ. تەعبیری ئەوەش کە وەسییەت لەخوداوە بێ لە قورئاندا نموونەی هەیە ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ﴾ ﴿غَيْرَ مُضَارٍّ وَصِيَّةً مِّنَ اللَّهِ﴾ ئەم شێوە ڕاڤەکردنە ڕەوشەنترە لە بۆچوونەکەی ئەبو موسلیمو لەگەڵ ئایەتی سنوردارکردنی عیددەو ئایەتی میراتو حەدیثی (لا وصیة لوارث) بەرەنگاری ناکاو باسی نەسخ ئایەتە پێشەوە!!

بۆیەش دەڵێین فەرمانەکە بۆ واجب نییەو بەڵکوو سوننەت دەگەیەنێ چونکە کردار پێکردنی بڵاونەبوەتەوە وەکوو چۆن فەرمانی ئایەتی سوورەتی (نوور) دەربارەی پرس کردنو ڕوخصەت خوازیی منداڵ بۆ هاتنە ژوورەوە کارپێکردنی سەرتاسەری نەبوو. ﴿وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ خودا باڵادەستو بەتواناو دەستەڵاتدارو کاراماو کارسازە، دەتوانێ دابو نەریتی گەلو نەتەوە بگۆڕێ لەدابو نەریتی زیانەخرۆو زیان بەخش بۆ سوننەتو دابو نەریتی سوود بەخشو مرۆڤانە، وەکوو گۆڕینی ئەو عادەتەی عەرەبەکان هەیانبوو دەربارەی ژنی مێرد مردوو کە دەبوایە ماوەی ساڵێك گۆشەنشینو زەلیل بمێنێتەوەو ماوەی دەرچوونی نەبوو، ئەو عادەتەی گۆڕی بە عادەتێکی باشترو

گونجاوتر کە بریتی بوو لەرێزگرتنی ئافرەتەکە لەماڵی مێردەکەیداو رێگە لێ نەگرتنی ئەگەر ویستی دوای عیددەی چوار مانگو دەشەو کە لەماڵەکە دەربچێ بە مەبەستی کاری باشو کارکردن بۆ بەرژەوەندی خۆیو دوارۆژی خۆی. ئەم یاساو دابو نەریتە گونجاوە لەگەڵ بەرژەوەندی تاکو کۆمەڵ لەهەموو کاتو شوێنێکدا.

﴿وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾ هەیە بۆ ئەو ئافرەتانەی گواسترابنەوە یان نەگواسترابنەوە کە تەڵاق دەدرێن موتعەیەکی رێكو پێك...

موتعە: بریتییە لەو ماڵو داراییەی کە ژنو مێرد لەسەری رێك دەکەون یان قازی دیاری دەکا، پێدانی ئەم موتعەیە مافێکی چەسپاوو سەلمێندراوە... ئەوانەی لە خوداترسو خوداپەرستن نکووڵی تێداناکەن دەیاندەنێ! دیارە ئایەتەکە فەرمان دەکا بەپێدانی موتعە بە ژنی تەڵاقدراو، ئەمجار با بزانین ئاخۆ ئەم فەرمانە بۆ وجوبە یان بۆ نەدبو سووننەتە؟ رای جەماوەری زانایانی شەرع لەسەر ئەوەیە کە فەرمانەکە بۆ ئەدەبو سووننەتە.

ئیمامی شافیعی بەلایەوە فەرمانەکە بۆ (وجووبە) ئیبنو عەبباسو عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەنی بەصریو تابیعینی تریش هەر هەمان رایان بەلاوە پەسەندە..

فوقەهای مالیکی دەڵێن: فەرمانەکە بۆ هەموو تەڵاقدراوێك سوونەت دەگەیەنێ جگە لەئافرەتێك: کە نە گواسترابێتەوەو مارەییشی بۆ دیاری کرابێ!

شافیعیەکان دەڵێن: فەرمانەکە بۆ وجووبەو موتعە پێویستە ئافرەتەکە گواسترابێتەوە یان نەگواسترابێتەوە، بەڵام ئافرەتێك پێش گواستنەوە تەڵاق درابێو مارەییشی بۆ دیاری کرابێ ئەوە واجب نیە موتعەی بدرێتێ!

فوقەهای حەنەفیو حەنبەلی رایەکی مامناوەندییان هەیە دەڵێن: موتعە واجبە بۆ تەڵاقدراوێك کە نەگواسترابێتەوەو مارەییشی بۆ دیاری نەکرابێ، بۆ تەڵاقدراوی تریش سوونەتە بەڵام بۆ مێرد مردوو نابێ چونکە ئایەتەکە تایبەتە بە تەڵاقدراوەوە.

ماموّستا وەهبی ئەلزوحەیلی لە تەفسیرەکەیدا رای شافیعیو هەوادارانی پەسەند دەکا، دەڵێ چونکە ئایەتەکە بە ئاشکراو بە روونی موتعەی چەسپاندووە بۆ هەموو تەڵاقدراوێك گواستراوە بێ یان نەگواسترابێتەوە، لێرەدا حوکمەکەی گشتی کردوو بۆ هەموو تەڵاقدراوێك موتعەی دیاری کرد، کەوابێ ئەمە تەعمیمی دوا تەخصیصە.

ئیبنو جەریر لە ئیبنو زەیدەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: کە ئایەتی ﴿وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدْرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾ هاتە خوارێ، پیاوێك گوتی ئەگەر بەچاکم زانیو چاکەم کرد موتعەی دەدەمێ ئەگەر بەچاکیشم نەزانی نایدەمێ، ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو: ﴿وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾ کەواتە کەسێك بەستەمکاری ژنەکەی تەڵاقدا بەهۆی وەڕزبوونو پێش چاوکەوتنی خێزانی خۆی تەڵاقدا ئەوە بەگوێرەی ڕێبازی شافیعیو هەوادارانی، پێویستە لەسەری موتعە بدا بە ژنەکەیو حەقێکی شەرعیو قانونیەو لێی دەستێنرێ: ئەندازەی موتعەکەش بەگوێرەی دەوڵەمەندیو هەژاریی پیاوەکە دیاری دەکرێ.

### کەواتە ئافرەتی تەڵاقدراو چوار جۆرن:

١- تەڵاقدراوی گواستراوەی مارەیی بۆ دیاری کراو، ئەوەی بۆی دیاری کراوە دەبێ بیدرێتێ؛ چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿ وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا – البقرة/٢٢٩﴾ عیددەکەشی سێ پاکییە.

٢- تەڵاقدراوی نەگواستراوەی مارەیی بۆ دیاری نەکراو، ئەوە پێویستە بەگوێرەی دەوڵەمەندیو هەژاریی کابرا موتعەی بدرێتێو مارەیی نەدرێتێ، چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿لاَّ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاء مَا لَمْ تَمَسُّوهُنُّ – البقرة/٢٣٦﴾.

٣- تەڵاقدراوی نەگواستراوەی مارەیی بۆ دیاری کراو نیوەی مارەیی ناوبراوی دەدرێتێ، چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ – البقرة/٢٣٧﴾ عیددەشی لەسەر نیە.

٤- تەلاقدراوی گواستراوەی مارەیی بۆ دیاری نەکراو، ئەوە مارەیی هاوشانی خۆی وەردەگرێ، چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً – النساء/٢٤﴾ هەندێ وایان راڤەکردووە مارەییان بدەنێ بەئەندازەو تەخمین ئەگەر ناونەبرابوو.

﴿كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ واتە: وەکوو چۆن لەوە پێش پەروەردگار دەربارەی مافی ژنو مێرد – کەبەسەر یەکتریانەوە هەیە – حوکمو یاسای بۆ روون کردنەوە، هەربەو جۆرە لێرەدا پەروەردگار حوکمو یاسای تریشتان بەهۆی ئایاتی موحکەمەی قورئانەوە بۆ روون دەکاتەوە، لەتەك روون کردنەوەکەدا سوودو فائیدەی پەیرەو کردنی ئەو حوکمو یاسایانەش دەستنیشان دەکا، بەڵکوو ئێوە لەشتەکان وردببنەوەو هۆشتان بەخۆدا بێتەوەو حیکمەتو بەرژەوەندییەکانی ئەو حوکمانە بزانن و لە مەبەستی ئایەتەکان تێبگەن و عەقڵو هۆش پەیدا بکەن....

## ترس و بەخیلی نیشانەی مردنی گەل و هۆزە، ئازایەتی ماڵ بەخشین هۆکاری ژیانی کامەرانییە بۆ نەتەوە

﴿ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُواْ ثُمَّ أَحْيَـٰهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٢٤٣﴾ وَقَـٰتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٤﴾ مَّن

﴿مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضۡعَافٗا كَثِيرَةٗۚ وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٢٤٥﴾.

لەوەپێش پەروەردگار باسی ئەحکامی خێزانی کرد، شێوەی ڕێکخستن‌و چۆنیەتی پەیوەندی تاکەکانی خێزانی روون کردەوە، ئەمجار لێرەدا باسی ئەحکامی جیهادو تێکۆشان دەکا، باسی گرنگی بەرگری لە خاك‌و نەتەوەو بیروباوەڕ دەکا چونکە خێزان بەختیار نابێ ئەگەر کۆمەڵ بەختیارو سەربەرز نەبێ‌و فەرمووی:

﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ﴾ ئایا نەتزانیوەو ئاگادار نیت لەحاڵ‌و چۆنیەتی ئەو گەل‌و نەتەوەیەی لەترسی دوژمنیان لەماڵ‌و زێدو نیشتمانی خۆیان دەرچوون‌و کۆڕەویان کردو هەڵاتن، ئەوان کەم نەبوون نەتەوەیەکی بەژمارە زۆر بوون، نەتەوەیەکی بەنی ئیسرائیل بوون. ﴿وَهُمۡ أُلُوفٌ﴾ ئەوانە بە هەزاران کەس بوون، ئەوەندە زۆر بوون چاوەڕوانی ئەوەیان لێ دەکرا خۆڕاگرو ئازایانە بەرگری بکەن لە ماڵ‌و نامووس‌و وڵاتیان، کاتێك دوژمن بۆیان هات بەرگرییان نەکردو هەڵهاتن ﴿حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِ﴾ لەترسی مردن چونکە نەتەوەیەکی ترسنۆك‌و ژیان خۆشەویست‌و بێ هەڵوێست‌و کەم غیرەت‌و بێ ورەو دەروون رووخاو بوون، بڕوایان بەخوداو پێغەمبەران نەبوو، قورئانی پیرۆز ژمارەکەیانی روون نەکردۆتەوە هەروەکوو رەچەڵەك‌و نیشتمانەکەشی دیاری نەکردوون، چونکە لێرەدا مەبەست پەند وەرگرتنە مەبەست راستکردنەوەی بیرو بۆچوونە دەربارەی مردن‌و ژیان، دەربارەی هۆکارە رواڵەتییەکانیان حەقیقەتە نادیارەکەیان، بۆئەوەی ئادەمیزاد هەموو کاتێ ئەو شتانە حەواڵەی دەسەڵاتی خودا بکا، هەڵسێ بە هەڵگرتنی ئەرك‌و واجبات بەبێ ترس‌و دڵە راوکێ‌و ڕاڕایی، چونکە ئەوەی لای خودا دانراوە هەردەبێ ببێ، مردن‌و ژیان هەردووکیان بەدەستی پەروەردگارن، مەبەست ئەوەیە ترسان لەمردن سوودی نییە، دڵە ڕاوکێ‌و لەرزە لەرزو خۆ پەناگرتن ماوەی ژیان زیاد ناکەن‌و مەرگ دواناخەن‌و

قەزاو قەدەری خودا ناگێڕنەوە، هەروا خودا بەخشندەی ژیانەو وەرگرەوەی گیانیش هەر خۆیەتی.

هەروەکوو وتمان قورئان ژمارەو رەچەڵەك و نیشتمانی ئەو کۆمەڵەی دیاری نەکردووە چونکە مەبەست پەند وەرگرتنە، بەڵام کۆمەڵێك لە زانایانی سەلەف گوتوویانە: ئەوانە نەتەوەیەکی بەنو ئیسرائیل بوون، یان لەرۆژگاری بەنو ئیسرائیلییەکاندا بوون، ئەوانە دانیشتووی شارێك بوون، پێیان گوتووە (داوەردان) شارێك بووە فرسەخێك لە (واسیط)ەوە دوور بووە، یان دانیشتووی ئەزروعات بوون.

ئاشکرایە کۆبوونەوەی ئەو گەلە کە ژمارەیان بە هەزاران بووە، کۆڕەو کردنیان لە زێدو نیشتمانی خۆیان لەئاکامی پەیدابوونی ترس و لەرزێکی زۆر بووە یا لەهاتنی دوژمنێك یان هاتنی تاعوون و فەنایەك کە زۆر ترسناك بووە، دەی راکردن و هەڵهاتنیان لەدوژمن لەمردن رزگاری نەکردن، بۆ کوێ دەچن هەموو شوێنێك موڵکی خودایە.

﴿فَقَالَ لَهُمُ اللّهُ مُوتُواْ﴾ پەروەردگار مراندنی، ئەمجار ئەم مردنە چۆن بووەو بەچی مردن! هیچ شتێك لەم بارەوە لە قورئاندا نەهاتووە چونکە ئەوە مەبەست نییە، ئەوە مەبەستە کە پەند وەربگرن و تێ بگەن کە ترس و لەرزو دڵەڕاوکێ و هەڵهاتن و قوچاندن و خۆ حەشاردان هیچ لەمەوزوعەکە ناگۆڕێ و مردنیان لێ دوور ناخاتەوەو ئەوەی بۆیان دیاری کراوە دەبێ بیگەنێ و پێی بگەن.

دەبوایە ئەوانە خۆڕاگر بن و بەرەنگاری بکەن و پابەندی فەرمانی خودا بوونایە ﴿ثُمَّ أَحْيَاهُمْ﴾ دوایی زیندووی کردنەوە، جا چۆنی زیندوو کردنەوەو زیندوو کردنەوەکەیان بەچی شێوەیەك بوو ئەوەش قورئان باسی نەکردووەو نازانین چۆن بووە.

ئەوەندەی ئایەتەکە ئاماژەی بۆ کردووەو ئێمە تێی دەگەین ئەوەیە خودا گیانی پێدانەوەو بەبێ ئەوەی خۆیان هیچ دەستێکیان تێیدا بووبێ، ئەمە لەکاتێکدا کەخۆیان زۆریان هەوڵدا نەیانتوانی مردن لەخۆیان لادەن.

کەوابێ ترس‌و هەڵهاتن مردن ناگێڕێتەوە، ژیان بەدەستی خودایە بەبێ مانـدوو بـوون دەیـدا بـە بەنـدەکانی، دەی کـەوابێ ترسـنۆك‌و بـێ ورە داوەشـێن‌و عـەمریان نەمێنێ).

﴿إِنَّ اللّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَشْكُرُونَ﴾ بێگومان پەروەردگار خاوەن فەضل‌و نیعمەتی زۆرو هەمـەجۆرە بەسـەر ئادەمیزادەوە وەلێ زۆربـەی زۆریـان سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی نابن‌و سپڵەیی دەکەن.

﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! ئێوە ترسنۆك مەبن مەترسن، لەرێگـەی خـودادا جیهاد بکەن‌و هـەوڵ بـدەن، گیـان‌و مـاڵ‌و داراییتـان لـەپێناو ئـایینی پیرۆزی خودادا بەخت بکەن ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ئێوە باش بزانن‌و دڵنیا بـن: کەخودا بیسەرە، هەموو قسەو باسێك دەبیسێ‌و دەزانێ چی لـەخۆ گرتـووەو مەبەسـت بەو قسەیە چییە! یان خودا بیسەرەو وەڵام دەداتەوەو دەزانـێ چـی دڵ‌و دەروون چاك دەکا چی حاڵ‌و چۆنیەتی ژیان بەختەوەر دەکا.

ئاشکرایە جیهاد لەرێگـەی خـودادا بریتییـە لـەخۆ بـەخت کـردن‌و مـاڵ بەخـشین لەرێگەی خودادا لە قورئان دا زۆر جار لەگەڵ باسی شـەڕو جیهـاد باسـی مـاڵ بەخـشین دەهێنـرێ، چـونکە وادەبـێ موجاهیـد ئامادەباشـی هەیـە بـچێ بـۆ شـەڕو دژی دوژمنـی ئیسلام بجەنگێ بەڵام ماڵ‌و دارایی‌و تفاقی جەنگی بـۆ دابـین نـاکرێ کەوابوو پێویـستە هەمیشە موسوڵمانان هەڵبندرێن بۆ ماڵ بەخشین بۆ دابین کردنی تفاقی جـەنگاوەرانی ئیـسلام، بۆیـە لێـرەدا دوا بـەدوای فـەرمان بـە شـەڕو خۆبـەختکردن لەرێگـەی خـودادا بانگەوازی ماڵ بەخشین‌و تفاق ئامادەکردنی جەنگاوەرانی کردووەو فـەرمووی: ﴿مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافًا كَثِيرَةً﴾ کێیە ئەو کەسە کە مـاڵ‌و دارایـی خـۆی بەقـەرز دەدا بـەخودا بەشـێوەیەکی رێـك‌و پێـك واتـە مـاڵ‌و دارایـی خـۆی لەبـەر خاتری خودا دەبەخشێ، ئـەمجار خـودا ئـەو مـاڵ‌و داراییـەی بـۆ دوو چـەندانەو چـەند چەندانە دەکاتەوەو لەدونیادا ماڵەکەی زۆرتر دەکاو پیت‌و بەرەکەتی تێـدەخاو ئـارامی دەروونـی پـێ دەبەخـشێ‌و خۆشـی لـەژیان دەبینـێ لـە قیامەتیـشا پاداشـتی بەچـەند

چەندان دەدرێتەوە زیاد لەوەش ڕەزامەندی خودا لێیانو نزیکی خودایان بۆ دەکرێتە بارە قەڵا.

﴿وَاللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْسُطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ هەژاریو دەوڵەمەندی بەدەست پەروەردگارە بەخیلیو چروکی مرۆڤ دەوڵەمەند ناکا بەخشندەییو سەخاوەتیش فەقیری ناکا: لەئاکاما چاكو خراپ، هەژارو دەوڵەمەند، پیرو جوان بەهەموو ڕەنگو ڕەچەڵەكو کردارییانەوە هەر بۆلای خودا دەگەڕێنەوە، هەرکەسە بەمەرگی خۆی دەمرێو مەرگ پاشو پێش ناکا!! کەوابێ موسوڵمانان نابێ لەمردن بترسن، نابێ لەهەژاری بترسن ئەمانە بەدەست پەروەردگارن! ماڵو گیان بەخت بکەن، دڵنیابن تەمەن دیاریکراوە بژێوو ماڵو دارایی بڕدراوەتەوەو ئەندازەدار کراوە.

شایانی موسوڵمانە کە بەکەڵی بژیو ژیانێکی سەربەرزانەو ئازایانە بەسەر بەرێو لەخودا نەبێ لەکەس نەترسێ.

## چیرۆکی صمویل پێغەمبەرو مەلیك تالووت .. وازهێنانی بەنو ئیسرائیل لە جیهاد

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلْمَلَإِ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰٓ إِذْ قَالُوا۟ لِنَبِىٍّ لَّهُمُ ٱبْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُوا۟ ۖ قَالُوا۟ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبْنَآئِنَا ۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ تَوَلَّوْا۟ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۗ

وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٤٦﴾ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًاۚ قَالُوٓا۟ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِٱلْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ ٱلْمَالِۚ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُۥ بَسْطَةً فِى ٱلْعِلْمِ وَٱلْجِسْمِۖ وَٱللَّهُ يُؤْتِى مُلْكَهُۥ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٧﴾ ﴾.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلإِ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ مِن بَعْدِ مُوسَى﴾ ئایا چیرۆکی ئەو تاقمو کۆمەڵەی نەوەی ئیسرائیلت پێ نەگەیشتووە؟ کە دوای سەردەمی مووسا روویدا؟ بزانە کە پیاو ماقووڵو ریش سپیو دڵسۆزانیان لەگەڵ پێغەمبەرێکیان کۆبوونەوە ﴿إِذْ قَالُواْ لِنَبِيٍّ لَّهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ بە پێغەمبەرەکەی خۆیان گوت: سەرکردەیەکمان بۆ دەست نیشان بکە تا لەژێر سەرکردایەتی ئەودا لە رێگای خودادا جیهاد بکەین لە پێناو بیروباوەڕی خۆماندا بجەنگینو خۆمان بەخت بکەین، دیارە ئەم گەلو نەتەوەیە بڕوادارو دڵ زیندوو بوونو باوەڕیان بەخودا قایم بووەو هەستیان بەوە کردووە کە ئەوان خاوەنی بیروباوەڕنو لەسەر حەقن، دوژمنەکانیان لەسەر رێگای گومڕاییو سەرلێ شێواون.

ئەم هەستو شعوورەیان نیوەی سەرکەوتنیان بۆ دەستەبەر دەکا، پێغەمبەرەکەیان کە ئەم هەڵوێستەی لێ بینینو گوێی لە قسەکانیان گرتو ویستی دڵنیابێ لە راستگۆییانو لە نییەتی چاکیانو سوور بوونیان لەسەر خۆبەخت کردنو

جەنگان لە ڕێگای خودادا. ویستی بە تاقییان بکاتەوە بزانێ ئایا هەر قسەیان هەیە یان بەکردەوەش هەروا خاوەن هەڵوێستن ﴿قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلاَّ تُقَاتِلُواْ﴾ پێی گوتن ئایا چاوەڕوان ناکرێ لێتان ئەگەر شەڕتان لەسەر پێویست کراو فەرمانتان پێکرا بە جەنگ کردن پشت هەڵبکەن‌و پاشگەز ببنەوە؟ ئێستا ئێوە هیچتان لەسەر نیە، بەڵام ئەگەر سەرکردەم بۆ دیاری کردن‌و شەڕتان لەسەر پێویست کرا ئەو کاتە دەبێتە فەرزو پاشگەز بوونەوەتان بۆ ناکرێ، ئەگەر جیهادتان لەسەر فەرز کرا ئیتر ڕێگای ژێوان بوونەوەتان بۆ نیە. ئیتر بەم قسانە ئەوەندەی تر خەڵکەکە گەرم بوون‌و حەماسەتیان بەرز بووەوە ئامادە باشی خۆیان بۆ جەنگان‌و خۆبەخت کردن نیشاندا. ﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿وَمَا لَنَا أَلاَّ نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَارِنَا وَأَبْنَآئِنَا﴾ چی ڕێگەی ئەوەمان لێ دەگرێ کە لە پێناو ئایینی خودادا نەجەنگین؟ بۆ دەبێ پاشگەز ببینەوە؟ لە کاتێکدا ئێمە ستەم لێکراوین‌و لە زێدو نیشتمانی خۆمان دەرکراوین ماڵ‌و سامانمان داگیر کراوەو منداڵەکانمانیان لێ فڕاندوین!! شەڕکردنمان لەگەڵ ئەوانەدا پێویستەو حەقەو ڕاستە. هیچ ڕێگا چارەیەك‌و بەهانەیەکمان نیە بۆ پاشگەز بوونەوە ئەمە هەڵوێستمانەو هەرگیز لێی لانادەین.

بەڵام ئەم خوێن گەرمی‌و سوور بوونەیان بەردەوام نەبوو ئەم هەڵوێستەیان تاسەر نەبوو چونکە ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوْاْ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمْ﴾ کاتێك شەڕکردنیان لەگەڵ کافرەکاندا لەسەر پێویست کراو لە قسەی ڕووت دەرچوو دەبوایە بەکردەوە بیسەلمێنن کۆمەڵێکی کەمیان نەبێ ئەوانی تر پشتیان هەڵکردوو پەشیمان بوونەوە. ئەمەش دیاردەیەکی هەرمزەقی نەتەوەی ئیسرائیل بووە لەبارەی پەشیمان بوونەوەو پەیمان هەڵوەشاندنەوەو خۆ دەرباز کردن لە تاعەت‌و گەردنکەچی بۆ فەرمانی خودا. پاشگەز بوونەوە لە تەکلیف، ناتەبایی‌و پشت هەڵکردن لە حەق‌و ڕاستی! ئەمەش دیاردەی هەموو کۆمەڵێکی ئادەمیزادە کە چاك پەروەردەی ئیمانییان نەکرابێ، ئەمە دیاردەیەکی دیاری هەموو گەل‌و نەتەوەیەکە پەروەردەی ئیمانی بەرزو درێژخایەن نەبێ ناتوانێ ئەم دیاردەیان تێدا بگۆڕێ. هەر پەروەردەی ئیمانی دەتوانێ کۆمەڵی

خۆنەویست لێبوردوی خەباتکەرو شۆڕشگێڕ دروست بکا. بۆیە پێویستە هەموو کاتێك قیادەی ئیسلامی دووربینو چاوتیژو دامەزراوبێ، حیسابی خۆی بکاو بزانێ رێگای کۆششی پڕ لە چەقڵو بەردەڵانو کەندەڵانە، هەمیشە ئاگادارو لەسەر هەست بێو نەکەوێتە داوی پیلان گێڕانی دوژمنانیەوە.

﴿وَاللّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾ پەروەردگار ئاگادارو زاناو بینایە بەوانەی کە ستەم لە خۆیان دەکەن، ستەم لە پەیامبەرو بەرنامەی خودا دەکەن، ستەم لە حەقو راستی دەکەن؛ دەزانن کە ئەوە حەقەو خۆی لێ هەڵە دەکەنو لێی لادەدەن.

﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا﴾ پێغەمبەرەکەیان پێی راگەیاندن کە پەروەردگار طالووتی کردووە بە پاشاو سەرکردەیانو هەموویان بچنە ژێر فەرماندەیەوەو لەژێر سەرکردایەتی ئەودا بجەنگن! ئەمجار هەر بەنەوەندە نەوەستان کە خۆیان لەشەڕ پەنابگرنو نەچنە رووبەڕوو بوونەوەی دوژمنەکانیان! بەڵکوو دەنگی نارەزاییان بەرزکردەوەو ﴿قَالُوَاْ﴾ وتیان: ﴿أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا﴾ چۆن دەبێ طالووت بکرێ بە پاشاو سەرکردەی ئێمە؟؟ کەی ئەوە شیاوی ئەو پلەو پایەیە؟! ﴿نَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ﴾ ئێمە شیاوترین بۆ پاشایەتی ئێمە کوڕی پاشاینو طالووت کوڕە مسکێنە.

سەرباری ئەوەش ﴿وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ﴾ دەوڵەمەندو ساماندارێك نیە تەرازووی لاسەنگی بنەماڵەو خانەدانی بۆ بەرامبەر بکاتەوە!!

بەڕاستی ئەوە بیرو بۆچوونێکی پووچی خۆیان بوو کێشانەی رووداوی رۆژگاریان پێ دەکردو، تەرازووی کێشانەی رووداوو ئادەمیزادیان نەدەزانی چۆن دەبێ یان لەبەر دڵ پیسیو خواری خۆیان خۆیان لێ لادەدا!!

ئەمجار پێغەمبەرەکەیان کەسایەتی طالووتی بۆ روونکردنەوە لێهاتوویيو شیاوی ئەوی بۆ ئەو پلەیە شیکردەوە، حیکمەتی پەروەردگار دەربارەی هەڵبژاردنی طالووت بۆ پاشایەتی ئەوان دەست نیشانکرد! ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ﴾ پەروەردگار

ئـەوی بـۆ پاشـایەتی هەڵبـژاردووەو دەسـت نیـشانی بەدیهێنـەرە، ئەمـە لەلایەکـەوە، لەلایەکی تـرەوە ﴿وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ﴾ زانـاو خوێنـدەوارە، خـودا زانـستێکی باشی پێ بەخشیوە کە پێویستییەکی سەرەکییە بۆ سەرکردایەتی، وێڕای ئەوەش قـەدو باڵایەکی بەرزو بڵندو سەرو سیمایەکی جوانو لـەشو لارێکی ساغو سـەلیمو عـەقڵو هۆشێکی تەواوی پێدراوە؛ کە ئەمانەش پێویستییەکی سەرەکین بۆ پاشایەتی.

﴿وَاللّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ پـەروەردگار خـۆی خـاوەنی هـەموو بوونـەوەرەو بەویـستی خـۆی دەسـەڵاتو زانیـاریو نیعمـەتی تـری دەدا بەهەرکەسـێك مەیلی لێ بێ بیداتێ خودا بۆخۆی خاوەنی گەنجو خەزێنەی بێ بڕانەوەیە، دەزانێ کێ شیاوی ئەوەیە زانیاریو دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتی پێ ببەخشێ.

ئەمـە ئاماژەیـە بـۆ ئـەوە کـە جیهاد لەڕێگەی خودادا پێویـستی بـەئامادەکردنی نەفسیو پەروەردەیی زانستی هەیـە، پێویـستی بـە لێزانـیو شـارەزاییو کـار ڕەنگینـیو ئازایـەتیو چـاو نەترسـیو ورە بـەرزییو دڵ قـایمیو دڵـسۆزی بـۆ کارەکـەی هەیـە. پێویستی بەخۆ بەختکردنو خۆ ماندوو کردن لەپێناو مەبـدەئو عیـززەتو کەرامەتـدا هەیە، جیهاد بـەوە نـاکرێ هـەر هیـواو ئـاوات بـێو بـێ کـردەوە، بـەڵکوو بـە ئازایـەتیو ئیرادەی پۆڵایین ئەنجام دەدرێ، ئەمانەش لەهۆزی بەنو ئیـسرائیلدا نـەبوون لەبـەر دوو هـۆی سـەرەکی دڵو دەروون ناپـاکیو لاوازی بـیرو بـاوەڕو ژیـان خۆشەویـستی! بۆیـە نەوێران شەڕبکەنو بچنە گۆڕی مەیدانو بەشداری جەنگ بکەن.

هەروەها ئەوەش دەگەیەنێ کـە پاشـایەتیو سـەرکردایەتی بـە مـیراتو کەلـەپوور نادرێ بەکەسو هەروەها دەوڵەمەنـدی چ ڕۆڵێـك لـەوبارەدا نـاگیرێ، بـەڵکوو لێهاتوییو زانایيو شارەزاییو هێزی کەسایەتیو ئیرادەی پۆڵایین ڕۆڵی گرنگیـان هەیـە بـۆ دەسـت نیشانکردنی سەرکردایەتی.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەو ڕۆژگارە طالووت زاناترینی بەنو ئیـسرائیلییەکان بوو، قۆزترینو ڕەنگ پیاوترینیـان بـوو، بـاڵا بـەرزترینیانو بەهەیبـەت ترینیـان بـوو، دوژمنـان لێـی دەترسـان. پـەروەردگار لـە ئایەتەکـەدا هـۆی هەڵبـژاردنی طـالووتی بـۆ

پاشایەتی روونکردۆتەوە: کە بریتییە لە زۆرزانیو زانایی، ویڕای ڕێکو پێکی ئەندامی لەشو بالاّ بەرزیو سەرو سیمای جوان، لەشو لاری تەواو یارمەتیدەر بووە بۆ ئەنجامدانی کاری جەنگی ئەو رۆژگارە.

وەکوو دەڵێن: عەقڵی سەلیم لە لەشی سەلیمدایە.

ئایەتەکە ئەوەشی تێدایە کە پەروەردگار خاوەنی هەموو شتێکە چی لە بوونەوەردایەو بووەو دەبێ هەمووی هی خوایە موڵکو دارایی دەسەلاّتو سەڵتەنەت بەدەست خۆیەتی دەیدا بەکێ ئارەزووی خۆیەتی، دەسەلاّت دانو گەورەکردنو رێز پێدان بۆ ئادەمیزادێك بە ویستی زاتی بێچوونەو هەموو کارێکی خێرو بەرژەوەندی ئادەمیزادی تێدایە.

ئەوەشی تێدایە کە لەناو گەلو نەتەوەدا مرۆڤی راستاڵو خێرخوازو حەق پەرست دەمێننەوە. تەنانەت کە زۆربەی هەرە زۆری کۆمەڵیش پشت لە جیهاد هەڵ بکەن کەمێك خێرخواهوو پیاو چاك لەسەر حەق دەمێننەوە هەرچەندە کەمیش بن کاری گرنگ ئەنجام دەدەن، خوداش ئاگاداری هەوڵو تێکۆشانیانەو بەچاکە پاداشتیان دەداتەوە، لەهەمان کاتدا ئاگاداری کرداری ستەمکارانەو سزای پێویستیان دەداتەوە.

## شیاویی تالووت بۆ پاشایەتیو بەتاقیکردنەوەی شوێنکەوتووانی..

﴿ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ءَايَةَ مُلْكِهِۦٓ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ تَحْمِلُهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٤٨﴾ فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ

بِٱلْجُنُودِ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُۥ مِنِّيٓ إِلَّا مَنِ ٱغْتَرَفَ غُرْفَةًۢ بِيَدِهِۦ ۚ فَشَرِبُوا۟ مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ قَالُوا۟ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَـٰقُوا۟ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةًۢ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿٢٤٩﴾ وَلَمَّا بَرَزُوا۟ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُوا۟ رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى

ٱلۡعَـٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾ تِلۡكَ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۚ وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢٥٢﴾ ﴾.

﴿وَقَالَ لَهُمْ نِبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَن يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ نەتەوەی ئیسرائیل لەگەڵ پێغەمبەرەکانیاندا هەڵوێستی زیادەڕەوی هەڵچوون و داچوونیان هەبووە، یەکێ لەو هەڵوێستانەیان ئەم هەڵوێستەیان بوو کە زۆر رقەبەرییان لەگەڵ پێغەمبەرەکەیان دەکردوو زۆر گیرە گیرو سەرپێچییان کرد.

هەتا کار گەیشتە ئەوە کە پێغەمبەرەکەیان پێی گوتن: بەڵگەیەکی ماددی هەیە کە طالووت کراوەتە پادشای ئێوە، ئەویش گەڕانەوەی ئەو سندووقەیە، کە کاتی خۆی لای موسا بووە دوژمن لێی ستاندووە، ئەو سندووقە لەم رۆژانەی داهاتوودا دێتەوە بۆلاتان، ئەو سندووقە دەبێتە هۆی ئارامی بۆ ئێوە، چونکە پیرۆزیی هەیە، ﴿وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَى وَآلُ هَارُونَ﴾ هەندێ پاشماوەو کەلەپووری پیرۆزی خێڵی موساو هارونی تێدایە کە پاش خۆیان بەجێیان هێشتبوو وەکوو عەساو بەرگو بڕێ لەوحەی تەوراتو مێزەری هاورون و جل و لیباسی ئەویشی تێدایە،هەروەها هەندێ کەلەپووری ماڵەکانی ئایینی موساشی تێدایە.

﴿تَحْمِلُهُ الْمَلآئِكَةُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ فریشتە ئەو سندووقە لەدەست دوژمنەکانتان دەردەهێنن و دەیهێننەوە بۆلای طالووت و هاتنەوەی ئەو سندوقە بەڵگەیە کە خودا چاودێری ئێوە دەکاو طالووتی کردووە بەپاشای ئێو، تا ئیش و کارتان بەڕێوەبەرێ و بەسەر دوژمنەکانتاندا سەرتان بخا، پێویستی سەرشانی ئێوەشە کە پشتی بگرن و یارمەتی بدەن و رازی بن بە پاشایەتی ئەوو گەردنکەچی سەرۆکایەتیەکەی بن، ئەگەر راست دەکەن ئێوە بەراستی خودا پەرستن.

ئیتر ئەوە بوو خەڵك لەدەوری كۆبونەوە، ئەویش حەفتا یان هەشتا هەزار كوڕی گەنجی لێ هەڵبژاردن‌و ئامادەی كردن بۆ جەنگ‌و چوون بۆ شەڕ، كاتەكەش كاتی گەرما بوو، ویستی بە تاقییان بكاتەوە بزانێ تا چ ئەندازەیەك خۆڕاگرو وره بەرزن.

﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ﴾ كاتێك طالووت بە سوپاكەیەوە لەشار دەرچوو كۆبوونەوەیەكی سەربازی بە شەڕكەرەكانی كردوو وتارێكی بۆ دان‌و وتی: پەروەردگار بە چۆمێك بە تاقیتان دەكاتەوە، لەوە بەولاوە لەسەر ڕێگاماندا تووشی چۆمێك دەبین، ﴿فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي﴾ هەركەسێك لێی بخواتەوە ئەوە لە كۆمەڵی ئێمە نیەو یارمەتیدەرو سەربازی من نیە، كەسێك لێی نەخواتەوە ئەوە پارت‌و كۆمەڵی منە.

﴿إِلاَّ مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ﴾ مەگەر كەسێك لوێچێك ئاو هەڵگرێ‌و دەمی خۆی پێ تەڕ بكاو تۆزێ تینوایەتی خۆی پێ بشكێنێ.

لێرەدا ڕاستی حیكمەتی خودا دەردەكەوێ كە ئەم پیاوەی دەست نیشان كرد بۆ پاشایەتی ئەم نەتەوەیە، ئەم سەركردە قارەمانە لێ هاتووە شەڕێكی لە پێشە؛ سەركردایەتی سوپایەك دەكا كە پێك هاتووە لە ڕۆڵەی گەل‌و نەتەوەیەكی ژێر دەستەو لەشەڕدا تێك شكاو، لەوەپێش چەند جار لەشەڕدا تێك شكاون‌و تارو مار بوون، بەم سوپا لاوازە بێ هێزەوە دەچێ بۆ بەرەنگاری شەڕ لەگەڵ سوپایەكی پڕ چەكی بێ شوماری بەهەڵمەت!!

كەوابێ پێویستە دەبێ سوپاكەی هێزێكی تێدا بێ بتوانێ بەرەنگاری ئەو سوپا عیملاقە بكا، دەبێ ئیرادەو هێزێكی وایان تێدا بێ شەهوەت‌و ئارەزوویان لغاو بكا، خۆڕاگرو خۆگربن، وره بەرزو خۆنەویست بن، چەند جارێك تاقی بكرێنەوەو لە تاقی كردنەوە دەربچن. بۆیە پێویست بوو سەركردە چەندجار ئیرادەی سوپاكەی هەڵسەنگێنێ بزانێ تا چ رادەیەك خۆڕاگرو خۆگرن، خۆڕاگر بۆ برسیایەتی بۆ تینوایەتی...هتد. دەبوو بزانێ تا چ ئەندازەیەك ماندوونەناسن‌و وره بەرزو نەفەس درێژن! ئەمە لە كاتێكدا بوو كە كاتی گەرما بوو، ئەوانیش تینوویان بوو جا كە

گەیشتنە سەرچۆمەکەو لێیاندا ﴿فَشَرِبُواْ مِنْهُ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمْ﴾ زۆربەیان دەمیان پێوەناو تێریان لێ خواردەوە، ئەوان رێگەی ئەومیان پێدرابوو کە لویچێك ئاو هەڵگرنو دەمی خۆیانی پێ تەڕ بکەن نەك بچن خۆیان تێر ئاو بکەن، دیارە ئەوانەی کە وایان کردلە سوپای طالووت جیا بوونەوە چونکە لەوەپێش پێی گوتبوون هەرکەسێك لەو چۆمە بخواتەوە ئەوە لەمن نیە.

کەواتە ئەوانەی تێر ئاویان خواردەوە لە سوپاکە جیابوونەوە، چونکە شیاوی ئەوە نەبوون ئەو ئەرکە هەڵ بگرن، ئەو ئەرکەی کە خرابووە سەرشانی طالووتو سوپاکەی ئەمان نەیان دەتوانی هەڵی بگرن، کەوابوو جیابوونەومیان باشتر بوو لە مانەومیان، مانەومیان دەبووە تۆوی دووبەرەکیو دڵەراوکێو تێشکان، هیچ کاتێکیش سەرکەوتنی سوپا بە ژمارەی زۆر نیە، بەڵکوو بە ورەی بەرزو ئیرادەی پۆڵایینو بڕوای پتەوو خۆراگری، سەرکەوتن بەدەست دێنێ (نەك زۆر بێو بۆر بێ).

ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ نییەتی رووتی بێ کردەوە کەڵکی نیە بەڵکوو پێویستی بە تاقی کردنەوەی عەمەلی هەیەو بەرەنگار بوونەوەی واقع بکاو چ کۆسپو تەگەرەی دێتە رێگایان رای ماڵن.

ئەوەش دەگەیەنێ کە سەرکردەی سوپا پیاوێکی ورە بەرزو دڵ قایمو بڕوا پتەو بوو هەڵگەڕانەوەی زۆربەی زۆری سوپاکەی کاری تێ نەکردو سەرخۆی نەهێناو لە هەڵوێستی خۆی نەهێنایە خوارێ. کەوابوو لێرەدا سوپای طالووت تا ئەندازەیەك لە بێژینگ درا بەڵام هێشتا تاقی کردنەوەی تر ماوە دەبێ پێیدا تێپەڕن.

﴿فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ قَالُواْ لاَ طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنودِهِ﴾ بێگومان ئەوان لە چۆمەکە پەڕینەوە زۆربەی زۆری سوپا پاشگەز بوونەوەو جەنگاوەرانی طالووت کەم بوونەوە، چاویشیان بە دوژمنەکانیان کەوت کە لە ژێر سەرکردایەتی جالوتدا بوونو زۆر پڕ چەكو تفاق بوون، هەستیان بە کەمیو بێ هێزی خۆیان لەبەرامبەر سووپای جالوتدا کرد؛ هەرکە پەڕینەوەو وەزعەکەیان بەچاوی خۆیان بینی هاواریان لێ هەڵساو وتیان: ئێمە بەم سوپا کەمە کەم تفاقە ناوێرینە ئەو سوپا

زۆرەی جالوت كە هەموو پێویستییەكی جەنگی بۆ دابین كراوە؛ ئێمە ناتوانین بەم ژمارە كەمو بێ چەكو تفاقە لەگژ ئەو هێزە زەبەلاحە رابچین!! ئیتر لەم كاتەدا بڕوای پۆڵایینو باوەڕی تەواو رۆڵی خۆی گێڕاو دەوری بینی. كۆمەڵی بڕواداری پشت بەخودا بەستوو بەدیاركەوت.

﴿قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَاقُو اللَّـهِ﴾ ئەوانەی كە بڕوایان وابوو دەچنەوە بەر دیوانی خودا رۆژی قیامەت حیسابیان لەگەڵ دەكرێ بیروباوەڕیان بە زیندووبوونەوەو گەڕانەوە بۆلای پەروەردگار زۆر پتەوو دامەزراو بوو وتیان: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ سەركەوتن بەزۆری چەكو تفاق نیە سەركەتن بەدەست خودایەو یارمەتیدەر ئەوە لە زۆری ئەوان مەترسن زۆرجار كۆمەڵی كەم بەهۆی بڕوا بەخوداو ئیمان پتەویی بەسەر كۆمەڵی زۆرو پڕ چەكو تفاقدا سەركەوتوونو تێكیان شكاندوون ﴿وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ پەروەردگار هەمیشە یارمەتیدەرو پشت گیری خۆڕاگرو ورە بەرزانەو سەركەوتن بۆ ورە بەرزانو پشوو درێژانە!

﴿وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالُواْ رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا﴾ كاتێك طالووتو كۆمەڵە خواناسەكەی كە لەگەڵیدا بوون چوونە گۆڕەپانی جەنگەوەو خۆیان پیشانی جالوتو سوپاكەیدا، بەچاوی خۆیان هێزو چەكو تفاقی سوپای جالوتیان بینی دڵە لەرزەیان پێ نەكەوتو ورەیان نەڕوخا، بەڵكوو لەو كاتەدا پەنایان بۆ پەروەردگار بردو هاواریان لێ كردوو وتیان پەروەردگار! خۆگریو خۆڕاگریمان بەسەردا برژێنە، ورەو هێزو توانامان بدەرێ ﴿وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا﴾ قاچمان بەهێز بكەو لێنگە لەرزێمان پێ نەكەوێ، خۆگریو ئارامیمان بدەرێ، لەشەڕدا دڵو دەروونمان بەهێز بكە ﴿وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ یارمەتیدەرمان بە بۆ سەركەوتن بەسەر دوژمندا.. دوژمنێكی كافرو خوانەناسو دونیا خۆشەویستو باطل پەرست.. ﴿فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ اللَّـهِ وَقَتَلَ دَاوُودُ جَالُوتَ﴾ سوپای طالووت هەرچەندە كەمو كەم تفاقیش بوون بەڵام بەهۆی بیروباوەڕی

پتەوو خواناسیان بەسەر دوژمنی زۆرو بێ شوماری جالووتدا سەرکەوتن‌و تێکیان شکاند.

لێرەدا گەورەیی‌و بەدەسەلاتی خودا بەدیارکەوت، نیعمەت‌و پشتگیری کردنی بۆ خاوەن بڕوایان نمایان بوو؛ داود گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوو، ملهوڕی وەکوو جالووتی کوشت، بە قۆچەقانیی بەردێکی تێگرت‌و دای لەسەری‌و لە گۆڕەپاندا خستی، ئەمجار لێی نزیك بووەو بەشمشێر سەری بڕی‌و سەرەکەی هێنایەوە بەردەم طالووت‌و ئیتر سوپای جالووت بە کوشتنی سەرکردەکەیان ورەیان روخاو شکان‌و هەلاتن.

﴿وَآتَاهُ اللّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاءُ﴾ لە ئاکامی ئەم رووداوەدا داود ناوبانگی دەرکردوو دەسەلاتی بەنو ئیسرائیلی دەستکەوت‌و دوایی پەروەردگار کردی بە پێغەمبەرو کتێبی تەوراتی بۆ ناردو فێری زرێ دروست کردن بوو، فێری زمانی باڵندەکان بوو ئاخاوتنی لەگەڵ دەکردن، فێری زانستی ئایین بوو، لە یەکالاکردنەوەی کێشەی ئادەمیزاداندا لێهاتوویەکی تەواوی هەبوو، پاشایەتی‌و پێغەمبەرایەتی بەیەکەوە پێدرا، پێش ئەو ئەم پلەو پایە بۆ کەسی تر دەستەبەر نەبوون! چونکە پێش ئەو کاتە بەنو ئیسرائیلییەکان پێغەمبەرو پادشایان هەبوون: لەپێش داوددا شمویل (صمويل) پێغەمبەریان بوو طالووتیش پاشایان بوو: کە ئەمان کۆچی دواییان کرد پاشایەتی‌و پێغەمبەرایەتی پێکەوە دران بە داود.

﴿وَلَوْلاَ دَفْعُ اللّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الأَرْضُ﴾ لێرەدا پەروەردگار حیکمەتی شەڕو جەنگمان بۆ روون دەکاتەوە، حیکمەت‌و بەرژەوەندی لەبەیەکدا چوونی هێزو گرۆهەکانی ئادەمیزادو پێش برکێ‌و راپەڕین‌و هەوڵدان لە گۆڕەپانی ژیاندا کە بەدرێژایی رۆژگارو هەتا خەیاڵ برکا دەبینی گۆڕەپانی ژیان بە ئادەمیزاد شەپۆل دەدا، هەریەکە بۆلای خۆی رادەکێشێ‌و بۆ بەرژەوەندی خۆی هەوڵ دەدا، ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە لە پشتی پەردەوە دەستێکی بەهێزی کارساز هەیە سەرە دەزووەکانی پێکەوە گرتوون‌و ئەم کاروانی ژیانی ئادەمیزادە قەرەباڵغە دژ بەیەکانە بەرەو خێرو خۆشی دەجمێنێ لە کۆتاییدا دژایەتی‌و پێشبڕکێیان دەبێتە هۆی

پێشکەوتن‌و ئاوەدان کردنـەوەو خێـرو خۆشـی، چونکە شەڕو هەرا هـەروەکو زەرەرو زیانی هەیە سوودو قازانجی وەکوو روخان‌و وێرانکردنی لێ پەیدا دەبێ، دروست کردن‌و داهێنانیشی لێوە هەڵدەستێ.

کەواتە ئایەتەکە دەفەرموێ ئەگەر پەروەردگار گرۆهی شەڕنگێزو لەخودا یاخی دەمکووت نەکا بە تاقم‌و گرۆهی خاوەن بیروباوەڕ رەفتـار بـاش‌و خێرخـوازو کۆمـەڵێك بەسەر کۆمەڵێکدا سـەرنەخا؛ گـرۆهـو تـاقمی خراپـەکارو نـەیارو شـەڕەنگێز دەمکوت‌و سـەرکوت نـەکا، زەوی وێـران دەبـێ‌و ژیـانی تێـدا بەسـەر نـابرێ، خراپـەکاران‌و سەرپێچیکەران ژیان تێك دەدەن‌و جیهان دەکەن بە دۆزەخ ﴿وَلَكِنَّ اللَّـهَ ذُو فَـضْلٍ عَلَـى الْعَالَمِينَ﴾ وەلـێ پەروەردگار خاوەن فەضل‌و گـەورەیی‌و بەخششە بەسـەر بوونـەوەرداو (بـۆ هـەموو زاڵمێـك زەواڵێکـی نـاردووە) ئـەم چیرۆکە قورئانیـە چـەند شـتێکی لێ وەردەگیرێ:

١- هەسـت کـردن بـە زوڵـم‌و سـتەم‌و کۆیلایـەتی لای گـەل هەڵچوون‌و راپـەڕین دەخولقێنێ هەر گەلێك ستەمی لێ بکرێ رێگاچارەی رزگاربوونی ئەوەیە ریزەکانی رێك بخاو رابەرێکی ئازاو دادوەرو لێهاتوو بۆخۆی دیاری بکا لەژێر سایەیدا هەوڵ‌و تێکۆشان ئـەنجام بـداو بـەرەو ئاسـۆی رزگـاری هـەنگاو بنـێ: وەکـوو ئـەوەی کـە بـەنو ئیـسرائیل کردیان بۆ رزگاربوونیان لە فەلەستینییەکان.

٢- یەکـەم کەسـانێك کـە هەسـت بەخەتـەرو زیـانی گـەل‌و نەتـەوە دەکـەن رۆشنبیران‌و زانایان‌و بنەماڵەو خانەوادەکانن وەکوو ئەو پیاوماقووڵە ئیسرائیلییانە کە داوایان لە پێغەمبەرەکەیان کرد کە سەرکردەیەکیان بۆ دیاری بکا.

٣- بێ عەقڵ‌و نەفام پێیان وایە: کە شیاوترین کەس بە گەورەیی‌و سـەرکردایەتی دەرەبەگ‌و دەوڵەمەندەکانن.

٤- شتێکی ئاساییە گەل بکەوێتە کێشەو ململانێ دەربارەی دیاری کردنی سەرۆك، بۆیە پێویستە مەرجەعێك هەبێ ئەم ناکۆکییە لەناو بەرێ ئـەم مەرجـەع‌و بڕیـاردەرە لەناو بەنی ئیسرائیلیدا پێغەمبەرەکەیان بـوو، لـە ئـاینی ئیسلامیـشدا دوای لـە دونیـا

دەرچوونی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پیاوماقووڵو زاناکانن واتە: (أهل الحل والعقد).

٥- ئەو سەرۆکەی دیاری دەکرێ بۆ سەرکردایەتی دەبێ شایانترین کەسی ئەو گەلە بێ، لێهاتووترین مرۆڤ بێ جا ئەگەر وێڕای لێهاتوویی خۆی، بنەماڵەو خانەدانو خاوەن هۆزو خزمو کەسو کار بوو ئەوە باشترە.

٦- هەڵبژاردنی سەرۆك دەبێ لایەنی دادوەریو بەرژەوەندی گەلو نیشتمانی تێدا بەرچاو بگیرێ.

٧- هۆی سەرەکی بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمندا پابەندبوونی سەربازو سوپایە بۆ فەرماندەی گشتی.

٨- کۆمەڵی کەم بەهۆی ئیمانی پتەوو بڕوای پۆڵایینو صەبرو خۆڕاگرییو بەگوێکردنی فەرماندە بەسەر کۆمەڵی زۆردا کاتی تێك ڕژانو بەیەکدا چوون کاریگەری خۆی هەیە.

٩- ئایەتی ﴿وَلَوْلاَ دَفْعُ اللّهِ النَّاسَ...هتد﴾ ئاماژەی تەواوی تێدایە بۆ (تیۆری مانەوە بۆ گونجاو). (ألبقاء للأصلح).

کۆتایی ئەم چیرۆکە سەرسوڕهێنەرە بەوە دێنێ کە دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ آيَاتُ اللّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ ئەو ئایەتە قورئانیە بەرزو بە پێزانەت بەسەردا دەخوێنینەوە.. خودا دەفەرموێ ئێمە بەسەرتدا دەخوێنینەوە، کەلامی ئێمەیەو خۆمان بۆت دەنێرینە خوارێو بۆت دەخوێنینەوە بۆ ئەوەی ببێ بە قانوونو یاسا بۆ بەندەکانم، کەسی تر مافی ئەوەی نیە ئەم کارە بکا، هەرکەسێك یاسایەك دابنێ بۆ ئادەمیزاد جگە لە یاسای خودا، ئەوە مافی خودا پێشێل دەکا، ستەم لەخۆیو ئادەمیزادیش دەکا ئیددعای شتێك دەکا نیەتی؛ فاڵچیو پڕوپووچ خوازەو نابێ بەقسەی بکرێ.

﴿وَإِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ بێگومان تۆ ئەی موحەممەد! لەریزی پێغەمبەرانیو یەکێکی لە ئەوان بۆیە ئێمە ئایەتی قورئانت بەسەردا دەخوێنینەوە، تاقیکردنەوەی

ئـادەمیزادت بـۆ شـی دەکەینـەوە، بەسـەرهاتو رووداوی گەلـە پێـشینەکانت بـۆ دەگێڕینەوە، تاقیکردنەوەی کاروانی بیروباوەڕ لە هەموو قۆناغەکانداو ئاکامەکانیت بۆ روون دەکەینەوە میراتی هەموو پێغەمبەرانت پێ دەبەخشین.

**بەیارمەتی خودا جزمی دووەم لە تەفسیری رەوان... تەواوبوو. جزمی سێیەمی بە شوێنیدا دێ بە شیکردنەوەو راڤەکردنی ئایەتی (٢٥٢)ی سوورەتی (البقرە) دەست پێ دەکا. خودا پشتیوانمان بێ بۆ تەواوکردنی هەموو جزمەکان!**

## پلەو پایەی پێغەمبەران، حاڵو چۆنیەتی خەڵك لە شوێنکەوتوانیان

﴿ ۞ تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿٢٥٣﴾ ﴾.

ئەمجار پاش ئـەوەی باسـی چیرۆکی طالووتو جالووتو داوودی کـردو ئایـەتی ﴿تِلْكَ آيَاتُ اللّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ...﴾ی هێنـا بۆئـەوەی زانـینو ئاگاداربوون بەسـەر ئەو رووداوانەدا بکاتە بەڵگە لەسەر ئـەوەی کـە حـەزرەتی موحەممـەد (درووودی خـوای

لەسەر بێ) یەکێکە لەو پێغەمبەرانەی کە نیگایان بۆکراوە، ئەمجار باسی ئەوە دەکات؛ کە پێغەمبەرایەتی پلە پلەیە، هەندێ پێغەمبەر جیاوازییان هەیە لەگەڵ هەندێکی تریان، هەندێ ڕێزو خۆشەویستی پەروەردگار هەیە، دراوە بە بازێکیانو نەدراوە بەئەوانی تر، پلەو پایەی واهەیە دراوە بە ئەو پێغەمبەرو نەدراوە بە ئەم پێغەمبەر، ئادەمیزادیش بەگشتی لەشوێنکەوتنی ئەو پێغەمبەرانەدا وەکوو یەك نین، هەیانە ئیمانی پێهێناونو شوێنیان کەوتووە، هەیانە بەدرۆیان خستوونەوەو بڕوایان پێ نەکردوون، هەیە ئاشتی خوازو لاشەڕو لەسەر خۆیە، هەیە شەڕەنگێزو تووڕەو ناتەبایە، ئەمەش حیکمەتێکی خوداییەو سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ قەزاو قەدەری خوداو دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾ ئەو پێغەمبەرانە، ئەو کۆمەڵە تایبەتییە هەڵبژێراوەی کە خودا ئەرکی رابەرایەتیو ئادەمیزادی پێ سپاردوون، هەموویان لەیەك ئاستو پلەو پایەدا نین، بڕێکیان زێدە ڕێزیان بەسەر ئەوانی تردا هەیە، لەبەرئەوە هەندێ رەوشتو شتی تایبەتمەند هەن لەبڕێکیاندا هەبووەو، لەوانی تردا نەبووە، هەرچەندە هەموویان ئەرکی پێغەمبەرایەتیو رابەرییان خراوەتە سەرشان؛ هەموویان بانگەوازی ئادەمیزادیان کردووە بۆ بەدەستهێنانی خۆشبەختی دونیاو قیامەت، ئەم زێدە ڕێزو پلەو پایە لەئایەتی تریشدا باسکراون؛ بۆ نموونە: لە سوورەتی (الاسراء)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَى بَعْضٍ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا﴾.

یان دەفەرموێ: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا – النساء/١١٢﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ – الأعراف/١٤٣﴾.

هی واشیان هەیە پەروەردگار پلەو پایەی زۆر بەرزو بەڕێزی پێ داوە، وەکوو پێغەمبەری ئیسلام (دروودی خوای لەسەر بێ) کە پلەو پایەی تایبەتیو دەگمەنی پێ بەخشراون، ڕێزو پلەو پایەی بەچەند جۆرێك روون کراونەتەوە، وەکوو ئەوەی کە لە شەوی میعراجدا، هەموو پێغەمبەرانی چاو پێ کەوتو پلەو پایەی هەموویانی بینی،

هەروەها ئـەخلاق بـەرزیو رەوشـت جـوانی کـە لـەم رووەوە تاکـە نموونـەی ئـادەمیزادە وەکوو قورئان دەفەرمویٰ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ – القلم/٤﴾.

پلەو پایەیەکی تـری ئەوەیـە: کـە بەرنامەکـەی هـەتا هەتاییـە، تـا رۆژی قیامـەت بەردەوامـە ﴿إِنَّا نَحْـنُ نَزَّلْنَـا الـذِّكْرَ وَإِنَّـا لَـهُ لَحَـافِظُونَ – الحجـر/٩﴾ رێزلێنـانێکی تـری ئەوەیە: کە قورئانەکەی گەورەترین پەڕاوە ﴿إِنَّ هَـذَا الْقُـرْآنَ يِهْـدِي لِلَّتِـي هِـيَ أَقْـوَمُ – الإسراء/٩﴾. رێزلێنـانێکی تـری ئەوەیـە: کـە خـودا ئومەتەکـەی شـکۆدارو خـاوەن رێـز کردووە ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَـوْنَ عَـنِ الْمُنكَـرِ وَتُؤْمِنُـونَ بِاللّهِ – آل عمران/١١٠﴾.

هـەروەها نـاودار کردنـی گـەلو پـەیڕەوکارانی بـە گـەلو گرۆهێکـی میانـەڕەو میانەکار ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّـاسِ – البقـرة/١٤٣﴾. خـۆ ئەگەر هەر تـەنها قورئـانی پـیٰ بدرایـە بـە مـوعجیزە بـەس بـوو، هـەر بـەهۆی نـاردنی قورئـان بـۆی، فـەضـلو رێـزی بەسـەر هـەموو پێغەمبەرانـدا دەبـوو، چـونکە قورئـان موعجیزەیـەکی هـەتا هـەتاییو هەمیـشەییە، هـیچ کـاتو سـاتێك لەبـەرزی خـۆی دانابەزیٰو، کاریگەری لە ژیانی ئادەمیزادا هەر بەردەوامە.

موسلیمو تیرمذی فەرموودەیەکی پێغەمبەر دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: من بـە شەش پلەو پایە لە پێغەمبەرانی تر رێـزم لیٰ گـیراوە: قـسە رەوانـیو، وشـەی پـڕ مانـاو، حیکمـەت ئـامێزم پـیٰ بەحـشراوە، مانگـە رێیـەك دوژمـن لـێم دەترسـیٰ! گـەلو پـەلو دەستکەوتی جەنگم بۆ حەلاڵ کراوە، هـەموو زەویـم بـۆکراوە بـە پاکـەرەوەو مزگـەوت، دەتوانم بە خۆڵەکەی تەیموم بکەم، لەسەر عەردەکەی نوێژ بکـەم، پێغەمبەرایەتیەکـەم گشتییەو بۆ هەموو گرۆهی ئادەمیزاد نێـرراوم؛ زنجیرەی پێغەمبـەران بـە مـن کۆتـایی هاتووە..

﴿وَلَوْ شَاء اللّهُ مَا اقْتَتَلَ الَّذِينَ مِن بَعْدِهِم مِّن بَعْدِ مَا جَـاءتْهُمُ الْبَيِّنَـاتُ﴾ خـۆ ئەگـەر خودا بیویستایە هەرگیز ئەو گەلو نەتەوانـەی پـاش ئـەو پێغەمبەرانـە هـاتوون لـەناو

یەکدا بەشەڕ نەدەهاتن‌و بە ئاشتی‌و تەبایی ژیانیان بەسەر دەبردو، هەموویان بە کۆمەڵ یەکیان دەگرت‌و، خوداپەرست دەبوون. بە تایبەتی دوای ئەوەی کە ئەو پێغەمبەرانە بە بەڵگەی روون‌و ئاشکراو موعجیزەی بەهێزو چەسپێنەرەوە هاتوونە سەر گرۆهەکانی ئادەمیزادو بانگەوازیان کردوون بۆ خوداپەرستی! ئەگەر خودا بیویستایە دژایەتی لە نێوان ئادەمیزاد سەر هەڵ نەدا، سەری هەڵ نەدەدا؛ بە جۆرێك هەمووی وا رام دەکردن کە شوێن پێغەمبەران بکەون‌و قبووڵی حەق‌و راستی بکەن! بەڵام پەروەردگار ئەو ویستەی نەبووەو وای داناوە ئادەمیزاد بۆ خۆیان بیروڕایان ئازاد بێ‌و بەو عەقڵ‌و هۆشەی کە تێیدا دروست کردوون بۆ خۆیان رێگەی راست بگرن؛ رێگای خۆشبەختی‌و کامەرانی رەچاو بکەن، تا شیاوی وەرگرتنی پاداش‌و سزا بن.

﴿وَلَكِنِ اخْتَلَفُواْ﴾ بەڵام ئادەمیزادەکان هەموویان بەیەك عەقڵ‌و هۆش بیریان نەکردەوە، بەڵکوو کێشەیان تێکەوت‌و لە ئاستی وەرگرتنی ئاییندا رای جیا جیایان تێدا سەری هەڵدا، ﴿فَمِنْهُم مَّنْ آمَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ﴾ هەیانبوو یەکسەر باوەڕی بە پەیامی پێغەمبەرەکان کردووە، هەیانبوو بڕوای بە پەیامەکەیان نەکردووە..

جولەکە لە ناو خۆیاندا کێشەیان تێکەوت دەربارەی ئایینەکەیان شەڕیان لەگەڵ یەکتردا کردووە، هەروەها فەلەکان کێشەیان تێکەوت‌و بەش بەش بوون، ئیتر جولەکەو فەلە دابەشبوون بەسەر چەند گرۆهو تاقمدا هەر گرۆهە بیروبۆچوونی خۆی بەلاوە پەسەند بوو، لایەنەکەی تری بەلاوە تاوانبار بوو، ئارەزۆبازی‌و بەرژەوەند پەرستی، لێکی جیاکردنەوەو کردنی بەچەند گرۆهو تاقمێك.. شەڕو دژایەتییان لە نێواندا گەرم بوو ﴿وَلَوْ شَاء اللّهُ مَا اقْتَتَلُواْ وَلَكِنَّ اللّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ﴾ ئەگەر خودا مەیلی بکردایە شەڕیان نەدەبوو یەکتریان نەدەکوشت، بەڵام خودا چی بوێ دەیکاو،چی ویست ئەوە ئەنجام دەدرێ، هەموو شتێك بەقەزاو قەدەری خودا دەبێ، رەنگدانەوەی ئەم بیروباوەڕە جیا جیانە دیارە جیا جیا بووە جاری وا هەبووە بەکێشەی قسەی تانەو رەخنە بووە، جاری وایش بووە گرۆهەکان پەنایان بۆ شمشێرو خوێن رشتن بردووە.

پەروەردگار دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێك دا دەشكێ، هەموو كاروبارێك لەژێر دەستی قودرەتی ئەودایە، جا ئەگەر ویستی كەسێك بەختیار بكا ئەوە رامی دەكا بۆ ئیمان هێنانو خوداپەرستی، ئەگەر ویستی ریسوای بكا بڕوا بە خودا ناهێنێو، لێی یاخی دەبێ.. كەوابێ بەختیار كردنو ریسواكردن بە ویستو ئیرادەی خودایە، كارەكە هی بەندەیە.

## فەرمانكردن بە بەخشینی ماڵو سامان لە چاكەدا

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٌ لَّا بَيۡعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَٰعَةٌۗ وَٱلۡكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٢٥٤ ﴾.

لە ئایەتەكانی پێشوودا فەرمان كردنی تێدا بوو بە كۆشش كردنو خۆبەخت كردن لە پێناو ئایینو نیشتمانو سەربەستیو ئازادی!!

لەم ئایەتەی دواییدا فەرمانمان پێدەكا بە ماڵ بەخشینو خێرۆمەندیو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لاَّ بَيْعٌ فِيهِ وَلاَ خُلَّةٌ وَلاَ شَفَاعَةٌ وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾. ئەی ئەو كەسانەی بڕوای راستو ئیمانی پتەوتان هەیە! ببەخشن لەو ماڵو دارایییەی پێمان داوون، ماڵو سامان لە رێگەی خوادا، لە پێناو بەرژەوەندی ئایینی خودادا خەرج بكەن، یارمەتی فەقیرو هەژاری لێ بدەن، دەستی بێ نەوایانی پێ بگرن، تا لە جیهانداںو لە كۆڕی ژیانداںو زیندوون لە ماڵی خۆتان ببەخشن، دەست پێشخەری بكەن پێش ئەوەی رۆژێك بێتە رێتان كەس وەسەر كەسی ناپرژێ، كڕینو فرۆشتنی تێدا نیە. دۆستایەتیو خزمایەتی نامێنێ، شەفاعەتو بۆ پاڕانەوەو واسیتەو واسیتەكاری نابێو كەڵك ناگرێ، خەفەت خواردنو پەشیمان

بوونەوە هیچ سوودی نیە، ڕۆژی حیساب‌و کیتابە، ڕۆژی سزاو پاداشە، بەدەل‌و فیدیە، دۆستایەتی‌و خۆشەویستی، شەفاعەت‌و واسیتە، هیچ ڕۆڵێکیان نامێنێ، ڕۆژێکە ئەندازەو مەقاییسەکان جیاوازن لە مەقاییسی جیهان.

﴿وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ کافرەکان هەر ئەوان بۆخۆیان ستەمکارن، ستەمیان لەحەق کردووە، ستەمیان لەخۆیان کردووە، ماڵ‌و دارایی سەرف دەکەن لە شوێنی نەشیاوی خۆیاندا، شەڕ دەکەن لە پێناوی شتی پڕوپووچدا.

## ئایەتولکورسی

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾.

لەوەپێش باسی هەندێ ئەحکامی فیقهی‌و چیرۆك‌و بەسەرهاتی بەنو ئیسرائیلی کرد، ئەوەی روون کردەوە کە ئادەمیزادەکان کێشەیان تێکەوت‌و بڕ بڕ بوون، دوای هاتنی پێغەمبەران بۆ ناویان کێشەکەیان سەری کێشا بۆ شەڕ کردن‌و یەکتر کوشتن، ئیتر موناسیب بوو کە ئایەتێك بێ باسی تاك‌و تەنیایی خودا بکاو سیفەتی بەرزو پیرۆزی روون بکاتەوە! بۆیە فەرمووی: ﴿اللّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ ئەو زاتە پەروەردگارە بەدیهێنەرە خودایەکە ناوی (الله)یە، هیچ کەسی تر نیە، شیاوی پەرستن‌و

بەندایەتی بۆ کردن بێ، خودایەکە زیندووەو هەرگیز مردنی بەسەردا نایە، قەییومە؛ تەدبیرو نەخشەی بوونەوەر دەکێشێو مەخلوقاتی خۆی پارێزگاری دەکا ﴿لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ﴾ هەمیشە بە ئاگاو بەخەبەرە، نە هەنوێز دەیگرێو نە نوستنی عادەتی بەسەردا دێ: واتە: هەرگیز فەرامۆشی بەسەردا نایێ. هەموو کاتێ ئاگادارو چاودێری هەموو شتێکە، هەموو شتێك پەیوەندی بە زاتی ئەوەوە هەیە، راگرو هەڵسوڕێنەری بوونەوەرە. ﴿لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ چی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، هەمووی  موڵکی خۆیەتی بەبێ مەرجو ئەم لاو ئەولا، هیچ کەس لەگەڵیدا هاوبەش نیە، تاكو تەنیایە لە خودایەتیدا، لە موڵکداریدا، لە هەڵسوڕانو راگریو بەدیهێناندا، بوونەوەر هەڵدەسوڕێنێ بە ویستی خۆی، کەوابێ خاوەنیەتی حەقیقی، ملکداریێتی بەڕاستی لە بنەڕەتدا بۆ خودایەو بەس، ئادەمیزاد کە بەڕواڵەت خاوەنی فلانە گوندەو فلانە زەوییەو بەهی ئەو لە قەڵەم دەدرێ، ملکایەتی راستی نیەو بە ئەمانەتە خاوەنی ئەصڵی: کە پەروەردگارە پێی داوەو لە شەریعەتەکەی دا مەرجی ئەو ملکداریە بە ئەمانەتەی بۆ روون کردۆتەوە؛ دەبێ لە چوارچێوەی ئەو یاساو نیظامەدا سامانەکەی بەکار بێنێ؛ هەرکاتێ لەو چوارچێوە دەرچوو مەرجەکانی جێبەجێ نەکردن، لە ملکداری دەشۆرێو تەصەڕوف کردنی تێدا بەتاڵە.

﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾ ئەمە دیاری کردنی صیفەتێکی تری پەروەردگارە، کە سنووری خودایەتیو سنووری بەندایەتی دیاری دەکاو دەفەرموێ: (کێ رایەی دەکەوێ شەفاعەت بۆ خەڵك بکا، واتە: نزاو پاڕانەوە بکا بۆ رزگاربوونی خەڵك؟ کێ دەتوانێ لە سنووری بەندایەتی خۆی دەرچێو بەبێ ئیزن وەرگرتن لە زاتی پەروەردگار بەخۆیدا رابپەرموێ: شەفاعەت بۆ تاوانباران بکا؟؟ بەندەکان هەموویان لە خزمەت پەروەردگار رادەوەستن دەستەو نەزەرو ملکەچ؛ کەس لە سنووری خۆی تەجاوز ناکا، هەرهەموویان وەکوو بەندەی ملکەچو پابەند، هەستو خوست لە خۆیان دەبڕن، کەس پرکێشی شەفاعەتکردن ناکا لە حوزوریدا، مەگەر روخصەت بخوازێو رێی پێ بدرێ: جا هەرچەندە بەندەکان لە تەرازووی خوادا بەرزو

نزمیان هەیە، بەڵام هەموویان نابێ لە پلەی بەندایەتی خۆیان تێپەڕ بکەن. ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾ پەروەردگار دەزانێ بەندەکان چییان لە پێشدایەو چییان دێتە رێ، هەروەها دەشزانێ رابوردوویان چۆن بووەو چییان بەسەر هاتووە، نهێنی رابوردوویانو داهاتوویان ئاگادارە.

## لێرەدا دوو راستی دەچەسپێ:

**راستی یەکەم**: زانیاری پەروەردگار بۆ هەموو رابوردوو پاشەڕۆژی ئادەمیزاد ئەوەی دەیزاننو نایزانن لای پەروەردگار ئاشکراو نمایانە، هیچ کەس ناتوانێ هیچ شتێك لە یەزدان بشارێتەوە.

**راستی دووەم**: ئادەمیزاد هیچ شتێك نازانێ مەگەر خودا بیەوێ بیزانێ! هەر خودا زانینی گشتیو رەهای هەیە، لە هەموو شتێك دەزانێ! جا جاری وا هەیە بڕی لەو زانیاریانە بۆ بەندەکانی دەردەخاو نیشانەی گەورەییو خودایەتی خۆی نیشانی ئادەمیزاد دەدا، بەڵام ئەوان ئەم راستییەیان لەبیر دەچێتەوە، جاری وا دەبێ ئەو تۆزە زانیارییە کە پەروەردگار رێگە دەدا ئادەمیزادەکان فێری ببن لە جیاتی بڕواهێنان بە گەورەیی خودا تووشی سەرپێچی کردن دەبن،لە باتی یاد کردنی خوداو سوپاسکردنی، خودایان لەبیر خۆیان بردۆتەوە سپڵەیی دەکەن لەبەرامبەر نیعمەتەکانی!!

پەروەردگار لەو کاتەوە کە ئەرکی ئاوەدان کردنەوەو جێگریی لەسەر زەوی خستۆتە سەرشانی ئادەمیزاد، زانستو زانیاری پێ بەخشیوەو زانستی وای پێداوە کە نیشانەی خودایەتی خۆی لە بوونەوەرو خودی خۆشیاندا نیشان بدا، وادەی خۆشی بەجێ هێناوە، رۆژ لە دوای رۆژو چین لە دوای چین ئادەمیزاد لە پێشکەوتنی زانستیدایە، هەر رۆژەو لایەنێکی نهێنی بوونەوەرو نیشانەی خودایەتی خودا دەردەکەوێ، جا لە کاتێکدا کە لە لایەنێکدا بڕی عیلمو زانیارییان فێر دەکا. لە لایەنێکی تردا زانیاریان لێ دەشارێتەوە، چونکە ئەو جۆرە زانیارییە پێویست نیە بۆ جێنشینی لەسەر زەوی..

بۆ نموونە تا ئێستا ئادەمیزاد پەی بە نهێنی ژیان نابەن، نەیان توانیوە بزانن نهێنی ئەم ژیانە چیەو چی دەبێ، ئەمەنهێنیەکەو ڕێگای پەی پێ بردنی نیە؛ ئەو پەردەیەی بەسەریدا کێشراوە زۆر ئەستوورەو تۆکمەیە، ئینسان ناتوانێ لای بداو هەڵی بداتەوە، جاری وا دەبێ ڕووناکیەك لە پاش پەردەوە بۆ دڵێکی تایبەتو ناوازە دیاری دەدا، خودا ڕێگە دەدا تروسکاییەك لەو نهێنییە پرشنگ بداتەوەو دوایی پەردەکە دادەرێتەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا ئادەمیزاد بەم تۆزە زانستییەی کە پێی دراوە لە خۆی بایی دەبێو خۆی بە خودا دێتە پێش چاوو ئینکاری هەبوونی خودایەك بۆ ئەم بوونەوەرە دەکا!! هەرچەندە لەم سەدەی بیستەمەدا زاناکان گەڕانەوە بۆ دان پێدانان بەوەی کە زانیاریی کەمیان هەیەو ئەوەی فێری بوون شتێکی زۆر کەمو تەسكو تروسکە.

لەهەمان کاتدا نەزانو زڕە نەخوێندەوارەکان پێیان وایە زۆرزانن‌و زۆر زانست فێربوون.

﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا﴾ کورسی دەسەڵاتی هەموو ئاسمانو زەوی گرتۆتەوە، سەیری ئەم شێوە دەربڕینەی قورئانە کە نەخشەی دەسەڵاتی پەروەردگارمان بۆ دەکێشێ، چونکە ئەم جۆرە نەخشەکێشانە؛ ئەو حەقیقەتەی کە گەرەکە وێنەی بکێشرێ بۆ تێگەیشتنی دڵو هێزو توانایەکی تایبەتی پێ دەبەخشێ.

کورسی بە ڕواڵەت بە مانای دەسەڵات بەکار دەهێنرێ، کەوابوو کەسێك کورسییەکەی ئاسمانو زەوی بگرێتە خۆ، دیارە دەسەڵاتیشی دەیانگرێتە خۆ.

پارێزگاری کردنو ڕاگرتنو بەڕێوەبردنی ئاسمانەکانو زەوی تۆزقاڵێك پەروەردگار ماندو ناکەنو، ئەرکی ناخەنە سەر چونکە دەسەڵاتی خودا دەسەڵاتێکی سنووردار نیە، بەڵکوو دەسەڵاتی بێ پایانەو ڕەهایە.

بە پێویستیشی نازانین کە خۆ بخەینە نێو ئەو ڕاو بۆچوونانەی کە چۆنیەتیو چەندییەتی کورسیو عەرش دیاری دەکەن، چونکە تا ئێستا حەدیسێکی صەحیحو ڕاستو دروستم لەم بارەوە نەدیوە.. ﴿وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ هەر ئەو پەروەردگارو بەرزو

خاوەن شکۆو بڵندو بێ شەریکەو کەس لەبەندەکانی رایەی ناکەوێ بگاتە ئەو پلەو پایەیە، هەرکەسێك ئیدعای ئەو پلەیە بکا خودا دەیپرووێنێو ریسوای دەکاوو رۆژی قیامەتیش دەیخاتە ناو سزای بەئێشی دۆزەخەوە.

## زۆرە ملێ لەئاییندا نیە، خودا هیدایەتدەرە بۆ ئیمانهێنان

﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾ ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥٧﴾﴾.

کاتێك ئایەتەکە بەم شێوە بنەمای تەصەوری باوەڕ رون دەکاتەوە، پەیوەندی نێوان بەندەو پەروەردگار نەخشەکێش دەکا، ئەمجار دەگوێزێتەوە بۆ دیاری کردنی رێبازی موسوڵمانان؛ ئەوانەی کە هەڵدەستن بە بانگەوازی کردنی ئادەمیزادو پێشەوایەتی ئادەمیزاد دەکەنو دەیانەوێ لە زەلکاوی گومراییدا دەریان بهێنن، دەفەرموێ: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ بە گوێرەی یاسای ئیسلام بیروباوەڕ دەبێ بەهۆی بانگەوازیو روون کردنەوەو هەست کردنو قەناعەت وەربگیرێ! نەك بە زۆرەملێو داگیرکردنو مەجبوور کردن!! ئایینی ئیسلام هاتووە بۆ ئەوەی لەوەتەری هەرەناسکی ئادەمیزاد بدا، روو بکاتە هەستی ئادەمیزادو لەناخی بدا،

روو بکاتە عەقڵو هۆشی مرۆڤ، روو بکاتە ویژدانو سروشتی، روو بکاتە هەموو کیانو کەسایەتی ئینسان بەهەموو لایەنێکەوە، بەبێ چاو بەستەکیو هەڵخلیسکاندنو هەڵخەڵەتاندنو زۆری لێ کردن، بانگی حەقیان بەگوێدا بداو بانگەوازی ئایینی ئیسلامیان بۆ روون بکاتەوە، بۆ ئەوەی لەناخەوە ئادەمیزادەکە بگۆڕێو، بەقەناعەتەوە بێتە سەر ئایینی پیرۆزو بەحەزەوە بیروباوەڕی ئیسلامی وەربگرێ؛ بەحەماسەتەوە داکۆکی لێ بکاو پابەندی بێ!!

بێگومان ئایینی مەسیحی – کە پێش ئیسلام دوا ئایینە – بەزۆرە ملێ بڵاوبۆتەوە، بە ئاگرو ئاسن خەڵکیان دەخستە ژێر رکێفیەوە!! رژێمی رۆمانی هەر کە ئیمپراتۆر قوسطه نطین ئایینی مەسیحی وەرگرت، ئیتر بەئاگرو ئاسن کەوتە وێزەی رەشە خەڵکەکەو ئەوپەڕی درندەییو کاری نامرۆڤانەیان ئەنجامدا، بۆ بەمەسیحی کردنی خەڵك، هەروەکوو چۆن هەمان دەوڵەتو رژێم لەوەپێش ئەو کارە نامرۆڤانەیان دەرحەق بەئەو مەسیحییە کەمانەی کەبە قەناعەتەوە ئایینی مەسیحیان قبووڵ کردبوو – ئەنجامدا!! سزادانو بەکارهێنانی ئاگرو ئاسن هەر بۆ ئەو کەسانە نەبوو کە ئایینی مەسیحییان وەرنەگرت! بەڵکوو ئەوپەڕی درندەییش بەکارهێندرا تەنانەت بۆ ئەو مەسیحیانەش کە برێ ڕای جیاجیایان هەبوو دەربارەی چۆنیەتی مەسیح، رازی نەبوون ئەو مەسیحیەتە وەربگرن کە رژێمی رۆمانیا بانگەوازیی بۆ دەکردو چوارچێوەی دارشتبوو.

دەی ئیسلام هات، یەکەم شت کە بڵاوی کردەوەو کردی بە دروشمی سەرەکی بۆ بانگەوازییەکەی، ئەم راگەیاندنە پیرۆزە بوو: کە دەفەرموێ: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ لە ئاییندا زۆرەملێ هەر ئاسەواری نیە، هەرکەسە بۆخۆی ئازادە چ بیروباوەڕێك هەڵدەبژێرێ هەڵیبژێرێ، بێگومان رێگای سەرفرازیو حەقو راست، لە رێگای گومڕایی جیا کراوەتەوە!!

بەڕاستی ئەمە مەبدەئێکە بە ئاشکرا رێزگرتنی پەروەردگاری بۆ ئادەمیزاد تێدا دیاری دەدا، رێزی بیرو ویستو هەستو هۆشی دەگرێ، رێگەی دەدا دەربارەی

سەرفرازیو گومڕایی ڕەوتی خۆی دەست نیشان بکا. ئاکامی کردەوەکانی بخاتە ئەستۆیو حیسابو لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکا، ئەم ئازادی بیروباوەڕە، تایبەتمەندیی ترین دیاردەی ئازادیی مرۆڤە، ئەو ئازادییەی کە ئەمڕۆ لەسەدەی بیستەمدا بڕێ ڕێبازو پارتو گرۆهو کۆمەڵ هەن؛ بەڕەوای نابینن‌و ڕێگا نادەن ئینسان بەویستی خۆی بیروباوەڕی خۆی دیاری بکاو، بەرنامەی ژیانی خۆی دابڕێژێ! یان دەبێ بیروباوەڕێ هەڵبژێرێ کە ڕژێمەکەی دەیەوێ بڵاوببێتەوە، یان دەبێ خۆی ئامادە بکا بۆ مردن بەجۆرەها شێوەی لەناو بردنی نامرۆڤانە.

بێگومان ئازادیی بیروباوەڕ، مافێکی بنەڕەتی ئادەمیزادە، بێ دەستەبەر کردنی‌و هەبوونی ئەو مافە، ئادەمیزاد بە ئادەمیزاد حسێب ناکرێ.

ئەو کەسەی ئازادیی بیروباوەڕ لە ئادەمیزاد زەوت دەکا، ئەوە ئادەمیزادیو کەسایەتی لێ زەوت دەکا، جا کە بیروباوەڕ ئازاد بێ، دەبێ بانگەوازی کردنیش بۆ بیروباوەڕ ئازاد بێ، هیچ ترسو ڕاوەدونان‌و تیرۆرو گرو گێچەڵی نەبێ، کابرای بانگەوازیکەر لەمپەڕی بۆ دروست نەکرێ، ئەگینا ئەو ئازادییە هەر بەناو ئازادییەو چ مانایەکی لەناوەرۆکدا نیە.

ئایینی ئیسلام بەرزترین تێڕوانینی هەیە: بۆ بوون‌و ژیان، باشترین‌و بەهێزترین بەرنامەی بۆ ئادەمیزاد پێیە. یەکەم ئایینێکە بانگی هەڵداوە، کە ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ زۆرەملێ لە ئاییندا نیە.

ئەو ئایینە کە لە پێش هەموو کەسێکەوە، بە هەڵگرانی خۆی دەڵێ: بە زۆرەملێ کەس موسوڵمان مەکەن، ﴿قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ ڕێگای ڕاستو ڕێگای گومڕایی لێك جیا کراوەتەوەو، هەرکەسە بۆخۆی، ئازادە؛ کام ڕێگایە هەڵدەبژێرێ با هەڵیبژێرێ! دەی ئەمە لەکوێو هەڵسو کەوتی پارتو ڕێکخراوو حیزبو گرۆهی جیاجیای ئەمڕۆ لەکوێ، کە هەریەکەیان دەیەوێ بیروباوەڕی خۆی بەزۆر بسەپێنێ، ڕێگە نادەن بەوانەی هاوبیرو ڕایان نین هەوا هەڵمژن!

مێـژووی ئـادەمیزاد پـڕە لـە کارەسـاتی سـامناكو پێـشێل کردنـی مـافی مـرۆڤ لەسـەر بیروبـاوەڕی جیـا، بـە ئەوپـەڕی درنـدەیی کـاری نامرۆڤانـەیان دژ بەیـەك ئەنجامداوە!! ئێستاش لەهەموو ئاقارێکی سەر زەوی ئەم ڕەفتارە فاشییانە بەرقـەرارنو پێویست بە نموونە هێنانەوە ناکا!

ئیـسلام فـەرمان بـەرێرەوانی خـۆی دەکـا، کـە زۆرەملـێ لەکـەس نەکـەن بـۆ موسولمان بوون؛ چونکە بەلگەی راستو دروستی ئەوەندە ئاشکراو نمایانە، پێویست بە زۆرو زەخت کردن ناکا، هەروەها بیروباوەڕ بە قەناعەتکردنو بەلگەو دەلیل دەچێتە دڵەوە، بە زۆرو کوشتنو بڕین، ناچەسپێ، بە تایبەتی دوای ئەوەی ڕێگای راستو خوار، لێـك جیاکرانـەوە، ڕێگـای حـەقو بـەتاڵ دیـاری کـراون، دوای ئـەوە بـۆ هـەموو خـاوەن عەقلێك ئاشکرابوو: کە ئیسلام بەرنامەی بەختەوەریو کامـەرانی یـە، غـەیری ئیـسلام رێبازی گومڕاییو سـەر لێ شێوانە، کـەوابێ ئـادەمیزاد ئـازادن، کەسێ حـەزی لێ بـێ بـا ئیمان بێنێ،، کەسێکیش حەزی لێیە با بە کافریی بمێنێتەوە...

ئەم ئایەتە باشترین بەلگەیە کە ئیسلام بە شمشێر بلاو نەکراوەتـەوە، ئەوانـەی کـە ئـەم رایـە دەردەبـڕنو بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن؛ گوایـە ئیـسلام بـە شمـشێر بلاوکراوەتەوە، رایەکەیان هەڵەیەو بۆچوونەکانیان بێ بناغەیە..

موسـولمانان پـێش کـۆچ کـردن بـۆ مەدینـە دەسـەلاتی ئـەوەیان نـەبوو کـە بەرامبەریی کافرەکان بکەن، بەزۆرەملێ موسولمانیان بکەن؛ دواییش کە کۆچیان کـرد بـۆ مەدینـەو بـەهێز بـوون، بەدرێـژایی مێـژوو زۆرەملێیـان لەکـەس نـەکردووە بـۆ موسولمان بوون، وەکوو شوێن کـەوتوانی مەسـیحی کردوویانـە. ئایەتەکـەش سـەرەتای سـالی چـوارەمی کۆچـی هاتۆتـە خـوارێ، ئـەو کاتـەیش موسـولمانەکان بـەهێز بـوون، دەیانتوانی زەبرو زەنگ بنوێنن بەلام نەیانکردووە!!

مێژوو شایەتە: کـە هـەرگیز موسـولمانان پـەنایان بـۆ شـەڕو جیهـاد نـەبردووە مەگە بۆ بەرپەرچدانەوەی دەست درێژیو ڕێگە خۆشکردن بـۆ ئـازادیی بیروبـاوەڕ، بـۆ بەرهەلـستی کردنـی ڕژێمـە سـتەمکارەکان: کـە نـاهێلن موسـولمانان مـافی ڕەوای

بانگەوازیکردنی خۆیان ئەنجام بدەن، بۆ رامالینی ئەوانەی دەبنە لەمپەڕ بۆ بلاوبوونەوەی ئیسلام لەسەر زەوی، بەلگەشمان ئەوەیە: زۆرجار موسولمانان ئاگربەستیان لەگەل دوژمندا راگەیاندووەو بەسەرانە رازی بوون، دوژمنیان سەرپشك کردووە: لە نێوان موسولمان بوونو سەرانەدانو شەڕ لەگەلدا کردن. چونکە کەسێك خودا هیدایەتی بداو دلو دەروونی نوورانی بکا، بەبڕواو قەناعەتەوە موسولمان ببێ، ئەوە سوود لە بیروباوەڕەکەی وەردەگرێ.. کەسێکیش چاوی دلو دەروونی کوێر بووبێو چاوو گوێچکەی لەکارکەوتبنو مۆر کرابن، ئەگەر بە زۆرەملێ موسولمانیش ببێ، ئیمان هێنانەکەی سوودی نابێ. جا کەوابێ ﴿فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ﴾ کەسێك وازبێنێ لە پەرستنی بتو ئەو شتانەی شەیتان خۆشی دەوێن، بەندایەتی هەموو کەسێك – جگە لە خودا – رەت بکاتەوە، ئادەمیزادو جندۆکەو شەیتانو ئەستێرەو بتو صەنەم نەپەرستێ، تەنهاو تەنها بەندایەتی خودا بکاو ئەو بپەرستێ، شایەتی بدا؛ کە هیچ خودا نین جگە لە خودای مەزنو پەروەردگار، ئەوە ﴿فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا﴾ بێگومان دەستی گرتووە بە گوشێکی قایمو پتەو، کە هەرگیز پچڕانی بۆ نیە، واتە: پەروەردگار پابەندبوونی بە ئایینەوە چواندووە بە کەسێك کە دەست بگرێ بە گوریسێکی قایمی پتەوی وەها کە پچڕانی نەبێ.

﴿وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ پەروەردگار ئاگاداری قسەو کردەوەی ئادەمیزادە، دەزانێ تەصەورو بیروبۆچوونیان چۆنەو چۆن نیە، قسەی ئەوانەی کە کافرن بە طاغوتو بڕوایان بەخوا هەیە دەبیستێو زاناو ئاگادارە بەو بیروباوەڕەی لە دلیاندایەو شێردراوەتەوە.

پەروەردگار بیسەرو زانایە بە هەموو شتێکی ئاشکراو نادیار، چۆنیەتی هەموو حەقیقەتێك دەزانێ، هەموو بیروباوەڕو گوفتارو کردارێك ئاگادارە. ﴿اللّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّوُرِ﴾ پەروەردگار خۆی سەرپەرشتی کاروباری

موسوڵمانان دەکا، چاودێریان دەکا، شارەزاییان دەکا بۆ چاکەکاری. بەهۆی هەستو عەقڵو هۆشو ئامۆژگاری ئایینیەوە لە گومڕاییو شكو گومان، لە نەزانیو سەر لێ شێواوی کوفرو لادان رزگاریان دەکا بۆیە گۆڕەپانی خۆشبەختیو رووناکیی زانستو زانین، بۆ بڕوای راستو دڵنیابوون. بێگومان ئیمان نوورو رووناکیە، نوورێکی خودابیە لە سروشتو حەقیقەتدا یەك نووره، یەك رۆشنایيە.. بەلام کوفر چەند تاریکستانییەکی یەك لەسەر یەکە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾.

بیروباوەڕ رووناکییە، رۆشنایی دەدا بە بوون. موسوڵمان کە یەکەم شوعلەو بریسکەی ئایین لە دڵیدا پەیدا دەبێ گیانی پێ رووناك دەبێتەوە، روحی تەصفیە دەبێ، رۆشنایی دەدا بە دەوروبەری، ئیمان رووناکییەکە حەقیقەتی شتەکان دەردەخا، حەقیقەتی مەبدەءو تەصەوراتەکان دەردەخا، دڵی موسوڵمان بەبێ پەردەو بەبێ چڵكو پەڵە شتەکان دەبینێ! ئەو رووناکیە رێگای قانوونی بوونەوەر بۆ مرۆڤ دیاری دەکا، ئیتر ئەو کاتە موسوڵمان هەڵسو کەوتی خۆی بەگوێرەی قانوونە کەونیەکە رەها دەکاو، بەگوێرەی قانوونەکە رەفتار دەکا، بەرەو رێبازی خودا هەنگاو دەنێو هیچ لەمپەڕو کۆسپو کەندو لەند بەرگری ناکەنو، لەو رێبازە پیرۆزە لای نادەن.

ئیمان یەك رووناکیە ئادەمیزاد شارەزا دەکا بۆ یەك رێباز کە رێگای ئیسلامو خوداپەرستیە، بەلام کوفرو گومڕایی چەند تاریکاییەکە جۆێ جۆێن، تاریکایی حەزو ئارەزوو، تاریکایی تەرەبوونو سەر لێ شێوان، تاریکایی لووت بەرزییو لەخۆ بایی بوون، تاریکایی بێ هێزیو زەبوونی، تاریکایی ریاو دوو روویی، تاریکایی تەماعو هەڵپە کردن، تاریکایی شكو گومان، تاریکایی شوێن کەوتنی غەیری بەرنامەی خودا. پەنا بەخوا ئادەمیزاد هەر لەگەڵ وازی لە نووری خودا هێنا، دەکەوێتە ناو ئەو تاریکاییانەوە؛ کەواتە دوارۆژێکی سامناك چاوەڕوانی ئەوانە دەکا کە لە رێبازی خودا لادەدەن. ﴿أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئەوانە تاقمو کۆمەڵی دڕۆزنو شیاوی سزای دۆزەخنو تێیدا دەمێننەوە هەتا هەتایە!! کە ئەوان بە نووری ئیسلام

شارەزای ڕێگای ڕاست نەبن‌و نەیەنە سەر ڕێگای خوداپەرستی شیاوی ئەوەن کە بچنە ناو دۆزەخەوە هەتا هەتایی تێیدا بمێننەوە.

لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵدەدا، پرسیارەکەش ئەوەیە بڕێ دڵ پیس‌و دوژمنی ئیسلام دژایەتیەك پەیدا دەکەن لە نێوان ئایەتی ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾و ئایەتێکی تر کە لەوەو پێش ڕاڤەمان کردووە کە دەفەرموێ: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ﴾. دەڵێن: مانای ئەم ئایەتەو ئەو ئایەتە پێکەوە هەڵناکەن‌و دژایەتیان هەیە.

برێکی تر لە دوژمنانی ئیسلام بە ڕواڵەت وا خۆ پشیان دەدەن کە داکۆکی لە ئیسلام دەکەن‌و ئەم تۆمەتەی لێ دوور دەخەنەوە بەشێوەیەکی حیلەبازی، دەیانەوێ گیانی جیهاد لە هەستی موسوڵمانان کپ بکەن‌و ئەم کارە گرنگ‌و پیرۆزەیان لە بیرببەنەوە، هەمیشە هەوڵ دەدەن لە نرخ‌و ڕێزی جیهاد کەم بکەنەوە، ڕۆڵی گرنگی لە مێژووی ئیسلامدا بێ بایەخ بخەنە پێش چاو، واش پیشانی موسوڵمانان دەدەن کە ئەمرۆ چ پێویستیەك بە جیهاد نەماوە!! لەراستیدا ئەو دوو تاقمە هەردووکیان لە گرۆهی ڕۆژهەڵاتناسەکانن! لەسەنگەری دژ بە ئیسلامدا دەجەنگێن‌و دەیانەوێ بەرنامەکەی بشێوێنن.

مەبەستی سەرەکیشیان ئەوەیە ئەم گیانە لە موسوڵماناندا بمرێنن‌و، لە گۆڕەپاندا نەبێتە لەمپەڕ لەبەردەمیان، جا کە دڵنیابوون لەسەرکەوتنی کارەکەیان، ئەمجار جۆرەها ئامێریان بەکار هێنا بۆ زنجیر کردنی موسوڵمانان‌و بەبێ ڕەحمانە لێیان دان‌و لە هەموولایەکەوە هێرشیان کردۆتە سەریان. واشیان خستە دڵی موسوڵمانانەوە کە جەنگ لە نێوان داگیرکەران‌و خۆیاندا شەڕی بیروباوەڕ نیە، تا پێویستی بە جیهاد بێ، بەڵکوو ئەم شەڕە شەڕی ئابوورییەو، شەڕی بازرگانی‌و کان‌و بەروبوومە؛ کەوابو پێویست بە جیهاد ناکا!!

بەڵام پێویستە موسوڵمانان هەموویان ئەم ڕاستییە بزانن: کە بە درێژایی مێژوو موسوڵمانان شمشێریان لە کالان دەرکێشاوەو جیهادیان کردووە، نەك بۆ موسوڵمان کردنی خەڵك بە زۆرەملێ، بەڵکوو بۆ دابین کردنی چەند مەبەستێك کە هەموویان

پێویستیان بە جیهاد بووا!بەبێ جیهاد ئەو مەبەستانە دابین نەدەکران، واتە ئیسلام جیهادی بۆیە داناوە تا بەرگری لە موسوڵمانان بکا، ئەزیەتو فیتنەیان لێ دوورخاتەوە، بۆ ئەوەی ئاسایش بۆ خۆیانو ماڵو دارایی‌و بیروباوەڕیان دەستەبەر بکا، قورئان ئەو بنەما گەورەیەی دامەزراندووە کە دەفەرموێ: ﴿وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ﴾ دەست درێژی بۆ سەر عەقیدەو بیروباوەڕ گەورەترە لە دەست درێژی بۆسەر ژیان. کەوابێ بەپێی ئەم ئایەتە بیروباوەڕ بە نرخترە لە ژیان، دەبێ موسوڵمان ڕێگەی پێ بدرێ بجەنگێ بۆ ئەوەی بەرگری لە بیروباوەڕو ئایینی خۆی بکا، بێگومان موسوڵمان بەدرێژایی مێژوو تووشی فیتنەیی بوون، لە پێناو بەرگری کردن لە عەقیدەو بیروباوەڕی پیرۆزیاندا ئازارو ئەشکەنجەیان بینیوە، زۆرجار کەوتوونەتە بارودۆخی واوە کە هیچ چارەیان نەماوە جگە لە دیفاع کردن لە خۆیانو ماڵو دارایی‌و بیروباوەڕ.

ئەوەتا موسوڵمانانی ئەندەلووس تووشی سەخترین شێوەی سزاو ئازاردانو کوژرانی بە کۆمەڵ بوون!! بۆ ئەوەی موسوڵمانان لە ئایینی خۆیان پەشیمان ببنەوە نەك هەر لە ئەندەلووس بەڵکوو موسوڵمانان لە زۆر شوێنی دیکەو بەدرێژایی مێژوو، جۆرەها سزاو نارەحەتییان چەشتووە، هەتا ئێستاش لە جۆرەها وڵاتی شیوعی‌و صەهیۆنی‌و مەسیحی‌و بتپەرستیدا ئەم حاڵەتە هەر بەردەوامە. موسوڵمانان جۆرەها ئەشکەنجەو ئازار دەدرێن؛ کەوابێ ئێستاش جیهادیان لەسەرەو پێویستە بەرگری لە خۆیان بکەن؛ بە جیهاد کردن ئەو فیتنەییە لە خۆیان دوور بخەنەوە، ئەگەر ڕاست دەکەنو موسوڵمانی تەواون.

هەروەها ئیسلام جیهادی بە پێویست داناوە بۆ دابین کردنی ئازادیی بانگەوازی‌و داوای ئازادی بیروباوەڕ دەکا، بێگومان ئیسلام چاکترین بەرنامەو باشترین دیاری‌و یاساو قانوونی هێناوە بۆ جیهانو دەبێ بڵاو بکرێتەوەو بخرێتە گوێچکەی ئادەمیزادانەوە. جا دوای ڕوونکردنەوەو پێگەیاندنو تێگەیاندن، هەرکەسە ئازادە ئەوی حەز لێ بێ با موسوڵمان بێ، ئەوی ناشیەوێ با کافر بێ ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ بەڵام پێویستە پێش ئەوە، کۆسپو تەگەرە لە ڕێی بانگەوازییەکەدا لابېردرێ، بۆ ئەوەی ئایینەکە چۆن

هاتووە ئاوا بگەیەندرێ، ئەو پەردەو لەمپەڕانە رابدرێن: کە مەنعی بیستنی ئەم بانگەوازییە دەکەن، بۆ ئەوەی خەڵکی بانگەوازی ببیستن‌و شوێنی کەون‌و، بکەونە گەڵ کاروانی هیدایەت.

ئاشکراشە برێ لەو پەردەو لەمپەڕانە رژێمە ملهوڕو طاغووتەکانن، دەرەبەگ‌و خۆبەزل زانەکانن، پارت‌و گرۆهو حیزبە خوانەناسەکانن..

بەکورتی ئیسلام جیهادی داناوە بۆ تێکشکاندن‌و لێك هەڵوەشاندنی ئەو رژێمە ستەمکارە ملهوڕانەو دانانی نیزام‌و یاسایەکی دادوەرانەی ئیسلامیی کە رێگەی بانگەوازی کردن بۆ ئیسلام بە ئازادیی دەستەبەر بکا. ئاشکراشە تا ئێستا ئەم هەدەفە هەیەو جیهاد پێویستە لەسەر موسوڵمانان‌و ئەو شتانەی جیهادیان بۆ پێویست کراوە زۆرتر بوون،کەم نەبوونەتەوە.

ئیسلام جیهادی بە پێویست داناوە بۆ ئەوەی کە لەسەر زەوی یاسا تایبەتییەکەی خۆی بسەپێنێ‌و بیپارێزێ. چونکە هەر ئیسلام یاسایەو، بەرنامەیەکی وایە، کە ئازادی ئینسان بەرامبەر برای ئینسانی دەستەبەر دەکا، ئەوکاتە ئەوە دەسەلمێنێ کە تەنها یەك کەس هەیە بەندایەتی بۆ دەکرێ ئەویش زاتی پاکی پەروەردگارە، ئیتر هەموو بەندایەتیکردنێکی تر لەسەر زەوی بەهەموو جۆرو شێوەکانیەوە پوچەڵ دەکاتەوەو رێگە نادا هیچ کەس‌و گرۆهو تاقم‌و حیزبێك یاساو بەرنامە بۆ ئادەمیزاد دابنێن‌و لە رێگەی ئەو یاسایەوە کۆیلایەتیان بەسەردا بسەپێنن.

ئیسلام پێی وایە: تەنها یەك خودا هەیە، کە شایانی ئەوە بێ ئادەمیزادەکان بیپەرستن‌و، گەردنکەچی بن‌و، یاسایان بۆ دیاری بکا. کەوابوو لە یاسای ئیسلامدا بە گوێ کردنی ئادەمیزاد بۆ ئادەمیزاد نابێ لە سنووری یاسای خودا دەربچێ! ئەمەیە یاسای ئیسلام کە لەسەر بنەمای یاسایەکی ئەخلاقی وا دادەمەزرێ کە ئازادیی بۆ هەموو ئینسانێك دەستەبەر دەبێ. تەنانەت بۆ ئەو کەسانەش کە بڕوایان بە ئیسلام نییە، هەر لە ژێر یاسای ئیسلامدا حورمەتی هەموو کەسێك پارێزراوەو هەموو کەس هەست بە مرۆڤایەتی خۆی دەکا!

تەنانــەت ئەوانــەش کــە بڕوایــان بــە ئیــسلام نیــە. لــە نیــشتمانی ئیــسلامدا دەپارێزرێن، هەر بیروباوەڕێکیان هەبێ!!

ئیــسلام جیهــادی دانــاوە بــۆ ئــەوەی کــە ئــەم یاســا پــیرۆزو بــەرزە دابمــەزرێ، بیــچەسپێنێو بیــسەپێنێ، کــەوابێ مــافێکی رەوای موســوڵمانانە کــە جیهــاد بکــەن بــۆ تێکشکاندنی رژێمە دیکتاتۆریەکان کە لەسەر بنەمای ئیسلام شمشێریان هەڵنەگرتووە!! ئیسلام هەڵگرتنی شمشێری واجب نــەکردووە بــۆ ئــەوەی خــەڵك بــەزۆر موســوڵمان بکــا، هــەرگیز ئیــسلام بــە شمــشێر بــڵاو نەبۆتــەوە وەکــوو دوژمنــانی ئیــسلام شاتەشــاتی بــۆ دەکەنو دەیانەوێ بەوە تاوانباری بکەن، بــەڵکوو جیهادی پێویــست کــردووە بــۆ ئــەوەی یاســایەك دابنــێ لــەژێر ســایەیدا هــەموو بیروباوەڕێــك بتوانــێ بــە ئــازادی بــژیو لــە چوارچێوەی پابەندبوون بە یاســاکان خۆیــان بگــونجێنن، بــا بــڕواشــی پــێ نەکــەن. بــەڵێ ئیسلام هێزی پێویــست بــوو بــۆ پەرەپێــدان بــە هــەبوونی خــۆی بــۆ بڵاوبوونــەوەی، بــۆ دڵنیایی پەیڕەوکارانی لــە پاراســتنی بیروباوەڕەکــەیان، بــۆ دڵنیــایی ئەوانــەی موســوڵمان دەبن لە ژیانی خۆیان ئەمین بنو دڵنیابن کە دەست درێژی ناکرێتە سەریان.

بەڵێ ئیسلام پێویستی بە بەرنامەو یاسا هەیە، پێویستی بە هێــزو چــەكو ســوپا هەیە، پێویــستی بــە جیهــادو تێکۆشــانو خۆبــەخت کــردن هەیــە. بــەڵێ ﴿لاَ إِكْـرَاهَ فِـي الدِّينِ﴾ بــەڵام ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَـاطِ الْخَيْـلِ تُرْهِبُـونَ بِـهِ عَـدْوَّ اللّـهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللّهُ يَعْلَمُهُمْ ﴾.

پێویــستە موســوڵمانان حەقیقــەتی ئــایینی خۆیــان بــزانن، ئاگــاداری چــۆنیەتی مێژووی کەوناراوی خۆیان بن. لەکاتی موناقەشەو کێشەو بێنەو بەرەدا بە لێهاتوویيو چاونەترسانەوە بەرگری لەخۆیان بکەن.

نەچن وەکوو تاوانبارێکی لەرزۆك بەرگری لە خۆیان بکەن، بەڵکوو هەمیشە بە دڵنیاییو بە حەماسەتەوە دیفاع لە ئیسلام بکەن، ئەو راستیە بزانن کە ئەوان لەسەر حەقن، هەموو خەڵکی تر لەسەر بەتاڵن، یاسایان لە ژوور هەموو یاسایێکەوەیە، رێبازیان لە هەموو رێبازێك راست ترو رۆشنترە، بەڵکوو هە رێگای ئەوان راستەو رێگاکانی تر هەموو هەڵدێرو چەپرەوو بەردەڵانو کەندو لەندە.

## چیرۆکی نەمرووود

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِى رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحْىِۦ وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾ ﴾.

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی راگەیاند: کە خوای سەرپەرشتیکارو چاودێری موسوڵمانانە، ملهورەکانیش گەورەو خۆشەویستی خودانەناسەکانن، ئەمجار بە شوێن ئەوەدا دوو نموونەی هێنایەوە: نموونەیەك بۆ ئیمان، نموونەیەك بۆ یاخی بوون: بۆ چەسپاندنی ئەو راستییەی کە رایگەیاند، نموونەکانیش ئەوانەن: حەزرەتی ئیبراهیم خودا تۆفیقی دا بەڵگەی بە هێزی هێنایەوەو نەمرووودی بۆردا. نەمردوودیش رێگای راستی لێ هون بوو، نووری حەقی نەدۆزیەوە، بەڵگەو دەلیلەکانی لاوازو هیچو پووچ بوون، چیرۆکی ئەم دووانە بووەتە نموونەی موسوڵمانو کافر، وەکوو دەفەرموێ:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَآجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رِبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللّـهُ الْمُلْـكَ﴾ واتـه: ئـەوە چيرۆكى نەمردوود نازانى؟ ئـەو نـەمردوودەى كە پاشايەكى ديكتـاتۆرو ملهوڕو خـۆ بـەزل زان بوو، تەنانەت خۆى پێ خودا بوو، وەكوو وتراوە: ئـەم نـەمردووده كوڕى كۆڕش كوڕى كەنعان كوڕى سام كوڕى نووح بووە، دەڵێن چوار پاشا توانيويانـە هـەموو دونيـا بخەنـه ژێر دەسەڵاتى خۆيانەوە، هەر لەرۆژهەڵاتەوە تا رۆژئاوا دەستيان بڕوا؛ ئەو پاشايانەش چوار كەسن، دوو پاشاى خوداپەرست، دوو پاشـاى خودانـەناس، پاشـا خوداپەسـتەكان؛ سـلێمانى كـوڕى داودو ذولقـەرنين بـوون، دوو پاشـا خودانەناسـەكانيش نـەمروودو بەختونەصـر بـوون، ئـەم نـەمرووده پاشـاى سـەردەمى خـۆى بـوو، لەگـەڵ ئيبراهيمـدا كەوتە موناقەشەو دەمەدەمێ؛! ئينكارى هەبوونى خوداى نـەدەكرد، بـەڵكوو بـڕواى بـە تـاكو تـەنيايى خـودا نـەبوو، پێـى وانـەبوو كـە هـەر خـودا هەڵسوڕێنەرى بوونـەوەرە. هـەروەكوو چـۆن بـڕێ لەسەرلێشێواوى سـەردەمى نـەزانى پـێش ئيـسلام، بڕوايـان بـە هەبوونى خودا هەبوو بەڵام هاوەڵيان بۆ دادەنا.

هەروەها نەمروود پێى وانەبوو كە دەسەڵاتى تەواو هەر بۆ خودايە بەتەنها، پێى وانەبوو كە هەر ياساى خودا دەبێ پايەدار بێ، هەر دەبێ حوكمى ئەو كارى پێ بكرێ.

پـەروەردگار دەسـەڵاتو پاشـايەتى دابـوو بـە نـەمرود، كەچـى سەرپێـچى خـوداى كـردوو، خـۆى لێ بـوو بـەخوداو، پێـى وابـوو، ئـەو دەسـەڵاتە دەسـەڵاتێكى حـەقيقىو پايەدارە. لە باتى بەندايەتى كردن بـۆ خـودا خـۆى بـە خـودا زانـى، لـە جيـاتى شـوكرو سوپاسـگوزاريى كـوفرانى نيعمـەتى خـوداى كـرد، ئەبوايـە ئـەو ريـزو دەسـەڵات پێدانـە ببوايـە بـەهۆى ئـەوەى بەندايـەتى كـردن بـۆ خـودا ئـەنجام بـدا، كەچـى بـوو بـەهۆى ملهوڕىو سەر رەقىو خۆ بەخودا زانى!!

بۆيە پەروەردگار بەسەر سوڕمانەوە باسى ئەو طاغووتە دەكاو دەفەرموێ: ﴿أَلَـمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَآجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رِبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللّهُ الْمُلْكَ﴾ بەراستى جێگـاى سەرسـوڕمانە كـە نازو نيعمەتو دەسەڵاتو پاشايەتييەك كە پێى دراوە لـە جيـاتى ئـەوەى شـوكرى خـودا بكا، خۆى بەخودا بزانێ!!

جا کاتێك کە نەمردوود لـە نـاو موناقەشـەو دەمـەدەمێدا لـە ئیبراهیمی پرسـی: ئەو خودایە کێیە تۆ دەیپەرستیو پێت وایـە هـەر ئـەو حـاکمو یاسادانەرە؟! ئیبراهیم ویستی سیفەتێك بۆ خودا بەیان بکا کە هیچ کەس تێیدا هاوبەشی نیە.

﴿إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾ وتـی: ئـەو خوایـەی مـن دەیپەرستم، خودایـەکی وەهایـە ژیـانو مردنـی بەدەسـتە، مـردنو ژیـان بـەدی دێنـێ، بێگومـان تـا ئێستاش ئێمە هیچ شتێك لە حەقیقەتو چۆنیەتی مردنو ژیان نـازانین. هـەر ئەوەیـە دیاردەی ژیان لە زیندوو دیاردەی مردن لە مردوودا دەبینین!!

نەمردوودی ملهوڕو سەر ڕەق وتی: من گەورەو پاشای ئەم خەڵکەم بە ئـارەزووی خۆم کاروباریان هەڵدەسوڕێنم، کەوابێ خودامو پێویستە خـەڵك گەردنکەچی مـن بـێ ﴿قَـالَ أَنَـا أُحْيِـي وَأُمِيـتُ﴾ مـن خـەڵك دەژێنـمو خـەڵك دەمـرێنم، حـەزم لێ بـێ فـلان دەکوژمو فلان عەفوو دەکەمو نایکوژم!

دوو پیاوی هێنان، یەکێکیانی عەفوو کردو، ئەوی تریانیشی کوشت. وتـی: ئـەوەتا ژیانو مردنم بەدەستە، بە ئارەزۆی خۆم کێم بوێ دەیکوژمو کێم حەز لێ بـێ عـەفووی دەکەم.

چوار کەسی تریشی هێنان کردنیە ژورێکەوە خـواردنو خواردنـەوەی لێ قەدەغـە کـردن، پاشـان کـە گەیـشتنە ئەوپـەڕی برسـیایەتیو تینوایـەتی دوو کەسـیانی هێنـانو تێروپڕ خواردەمەنیو ئاوی پێدان، دوو کەسەکەی تریشی بـەبێ خـواردنو خواردنـەوە هێشتەوە تا مردن. وتی: ئەوەتا ئاوا مردنو ژیان بەدەست خۆمەو چیم بـوێ ئـەنجامی دەدەم.

بەراسـتی ئەمـە یەکـەم تێکشکانی نـەمردوود بـوو، کـە بـەم بەڵگـە نامەعقوولـە بەربەرکانی ئیبراهیمی کرد! چونکە مەبەستی ئیبراهیم بە دیهێنانی ژیانو ئەو شوعلە نهێنیە بوو، کە لە نەبوونەوە پەروەردگار بەدی دەهێنێ!! هەروەها نەمانی ژیانو تەفر توناکردنی ژیـانی هـەموو بوونـەوەرێکی زینـدوو بـوو، نـەك بـوون بـەهۆکاری مانـەوەی ژیـان بـۆ چـەند کەسـێك تاماوەیـەك، یـان بـوون بـە هۆکـاری مردنـی چـەند کەسـێك.

ئەمجار ئیبراهیم کە چەواشە کردنو موغالەتە کردنەکەی نەمردوودی بیستو دیدو بۆچوونی خۆی بەرامبەر ژیانو مردن ئاشکرا کرد، موناقەشەی گوێزایەوە بۆ هێلێکی تر، بۆ ئەوەی نەمردوود نەتوانێ موغاڵەتەی تێدا بکاو دەمکوتی بکاو بۆڕی بدا ﴿قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّ اللّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ﴾.

ئیبراهیم وتی: پەروەردگاری من رۆژ لە رۆژهەڵاتەوە کێش دەکا بەرەو خۆرئاوا!؛ ئەگەر راست دەکەی بەدەسەڵاتو توانای دە ئەتۆ لە خۆرئاواوە کێشی بکە بەرەو رۆژهەڵات. ئەوەتا خودای من هەموو رۆژێ لەکاتی خۆیدا بەبێ دواکەوتنو پێش کەوتن، بەشێوەیەکی ریکو پێک بەگوێرەی یاساو نیظامیکی فەلەکیی، خۆر لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێنێ، ئەتۆ ئازا بە! لە خۆرئاواوە هەڵی بێنە!! ئیتر لە جیاتی ئەوەی نەمردوود ئیمان بێنێو لە کەللەرەقی خۆی دابەزێو گەردنکەچی پەروەردگار ببێ کەچی ﴿فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ﴾ شڵەژاو سەرسام بوو، بۆڕی خواردو بێ دەنگ بوو، ئەو کافرە خوانەناسە دیکتاتۆرە ملهوڕە بۆڕی خواردو بەڵام بۆڕخواردنەکەی نەبوو بەهۆی ئیمان هێنانیو هیدایەتی وەرنەگرت.

## چیرۆکی عوزەیرو گوێ درێژەکەی

﴿ أَوْ كَالَّذِى مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُۥ ۖ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ۖ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۖ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِاْئَةَ عَامٍ فَٱنظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ۖ وَٱنظُرْ إِلَىٰ

﴿حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ ءَايَةً لِّلنَّاسِ وَٱنظُرْ إِلَى ٱلْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٥٩﴾﴾.

چیرۆکی پێشوو بۆ سەلماندنی هەبوونی پەروەردگار بوو، ئەم چیرۆکەو چیرۆکی دوای ئەویش، کە ئایەتی ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ... الاية﴾ دەگێڕێتەوە بۆ ئیثباتکردنی زیندوبوونەوەی دوای مردنو هەبوونی حەشرو نەشر، دەفەرموێ: ﴿أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَى قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا﴾ ئەی پێغەمبەر! بڕوانەو گوێ راگرە، وەکوو سەرگوزەشتەی ئەو کەسەی کە بەسواری ولاغێك بەلای شارێکدا تێپەڕی؛ شارێکی خاپوورو وێران، دیوارەکانی بەسەر هەڵاشەکەیدا کەوتبوو، ئاداری بەسەر پاداریەوە نەمابوو، بە جۆرێك کە خەیاڵی ئەوەی لێ نەدەکرا جارێکی تر دانیشتوانی ئەم شارە زیندوو ببنەوەو خانوو باڵەخانەکانی ئاوەدان بکرێنەوە، دیمەنەکەی ئەوەندە سامناكو سەرسوڕهێنەر بوو، بینەر سەری لێ سوڕماو سەرسام بوو، لەگەڵ ئەوەدا بڕوای بە هەبوونی پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات هەبوو، بەڵام دیمەنەکە ئەوەندە خستیە سەرسامییەوە، هەرچەندە تێی راما، بەخەیاڵیش پەی بەوە نەبرد کە جارێکی تر ئەم ئادەمیزادە پوڵکاوانەی ژێر ئەو دارو پەردووە تێك رووخاوە زیندوو بکرێنەوە، یان لە توانادا هەبێ ئەو شارە وەکوو خۆی ئاوەدان بکرێتەوە!

بۆیە بەسەرسامییەوە ﴿قَالَ أَنَّى يُحْيِي هَذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾؟ وتی: خودا چۆن ئەم ئێسکە رزیوو پوڵکاوانە (دوای ئەم مردنو پەرتو بڵاوبوونەو رزینە) زیندوو دەکاتەوە؟! چ هێزێك هەیە بتوانێ ئەم کارە ئەستەمە ئەنجام بدا؟ پێی وانەبوو جارێکی تر ئاوی حەیات بچێتەوە ناو جەستەی ئەو مردوانە.

زۆربەی ڕاڤەکەرانی قورئان پێیان وایە ئەو ڕێبوارە حەزرەتی عوزەیر بووە، ئیتر پەروەردگار نەهات بەشێوەی حیوار وەڵامی بداتەوەو تێی بگەیەنێ: کە چۆن ئەوانە زیندوو دەکاتەوە؛ بەڵکوو ویستی خودا وابوو بەشێوەیەکی واقعیو عەمەلی ئەو ڕاستییەی تێ بگەیەنێ، چونکە وادیارە سەرسوڕمانەکەی بەجۆرێك بووە بەبەڵگەی ئاوەزو مەنطیقو ویژدان نەڕەوێوەتەوە، بە ئامۆژگاری دیاردەی گشتی سەرسام بوونەکەی لانەدەچوو، بەڵکوو پێویستی بە چارەسەرێکی تایبەتیو شەخصی بووە، بۆیە یەکسەر دوای ئەم پرسیارە ﴿فَأَمَاتَهُ اللّهُ مِئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ﴾ پەروەردگار مراندیو گیانی کێشا، بۆ ماوەی سەد ساڵ بە مردوویی مایەوەو ئەمجار زیندووی کردەوەو هۆشو گۆشی پێ دایەوە، ﴿قَالَ: كَمْ لَبِثْتَ؟﴾ پێی فەرموو: ماوەی چەند بە مردووی ماویتەوە؟ ﴿قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾ کە سەیری دەوروبەری خۆی کردو لە دیاردەکانی دەوروبەری تێفکری، وتی: ماوەی مانەوەم لێرەدا بە مردوویی ڕۆژێك یان بەشێك لە ڕۆژێك بوو، چونکە وەکوو دەڵێن: ئەوکاتەی مرد تازە خۆرهەڵاتووە، کە زیندووش کراوەتەوە دەمەو ئێوارە بووە. ﴿قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِئَةَ عَامٍ﴾ پەروەردگار فەرمووی: نەخەیر وانیە، بەڵکوو تۆ سەد ساڵ مردوویيو لێرە بە مردوویی ماویتەوە.

مامۆستا سەید قوطب دەفەرموێ: بەگوێرەی تاقیکردنەوەی ئادەمیزاد ئەم تاقیکردنەوە حسییە واقعییە دەبێ لەو دەوروبەرە دیاردەی وا هەبووبن کە تێپەڕبوونی ئەو سەد ساڵە بسەپێنێ، ئەم دیاردانە لە خۆراكو ئاوی خواردنەوەکەیدا بەدی نەکراون، چونکە ئەوان هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا نەهاتبوو ﴿فَانظُرْ إِلَى طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ﴾ سەیری خواردەمەنيو ئاوی خواردنەوەکەی خۆت بکە هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا نەهاتووە.. کەوابوو دەبێ ئەو دیاردانە لە خودی عوزەیر خۆیدا یان وڵاغی سوارییەکەیدا هەبووبن، بۆیە فەرمووی: ﴿وَانظُرْ إِلَى حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ﴾ سەیری گوێدرێژەکەت بکە! چۆن لاشەی پوڵکاوەو ڕزیوە.. زیندووی دەکەینەوە بۆ ئەوەی ئەم بەسەرهاتەی تۆ کە لاشەکەت هیچ تێك نەچووەو وڵاغەکەشت هەر لە

پەنا تۆوە بووە ئەو ئاوا پوڵکاوە بیکەین بە نیشانەی بە دەسەڵاتی خۆمان ﴿وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا﴾ سەیری ئێسقانی ولاغەکەت بکە! چۆن کۆیان دەکەینەوەو رێکیان دەخەینەوە ئەمجار بە گۆشت دایان دەپۆشین!!

موعجیزەو ئایەتەکەش ئەوەیە کە بە فەرمانی پەروەردگار ئێسقانەکان چوونەوە پەنا یەکترو رێکخرانەوەو، بە گۆشت داپۆشرانەوەو گیانیان تێ چوونەوە لە پێش چاوی عوزەیر کە ئەو خۆی هەر لەپەنا گوێدرێژەکەیەوە بوو بوو، هیچ گۆڕان و رزین و پوڵکانی بەسەردا نەهاتبوو، خواردەمەنی و ئاوی خواردنەوەکەی هیچ نەگۆڕابوون، ئەمە لە کاتێکدا کە لاشەی ولاغەکەی و لاشەی خۆی و خواردن و خواردنەوەکەی لە ژێر کاریگەری یەك ئاو هەوادا بوون و، لەیەك شوێن بوون، کەوابێ ئەمەش نیشانەیەکی تری گەورەیی و بەدەسەڵاتی خودایەو، رەهایی و بێ پایانی دەسەڵاتی پەروەردگار دەگەیەنێ، بۆ ئەوەی بە عەمەلی عوزەیر پێغەمبەر تێ بگاو بزانێ: خودا چۆن مردوو زیندوو دەکاتەوە!.

ئیتر ئەم پیاوە ﴿فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ﴾ کە بەچاوی خۆی ئەم تاقیکردنەوەی بینی و، هەستی بەم دەسەڵاتەو توانا رەهایەی پەروەردگار کرد ﴿قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ وتی: دەزانم و بە چاوی خۆم دیتم کە پەروەردگار دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو هەرچی بیەوێ دەیکا!.

## حەزو ئارەزۆی دڵنیابوون لەناخی حەزرەتی ئیبراهیم دا

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ

فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾ ﴾.

ئەمجار دوای ڕانواندنی ئەم سەرگوزشتەو تاقیکردنەوەیە، سەرگوزشتەو تاقیکردنەوەیەکی ترمان بۆ ڕادەنوێنێ، ئەویش تاقیکردنەوەی ئیبراهیمەو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى﴾ ئەی موحەممەد! ئەی ڕەهبەر! ئەوە بۆ خەڵك بگێڕەوەو یادی ئەوە بکەرەوە: کە ئیبراهیم وتی: پەروەردگار! پیشانم بدە زاتی بێچوونتان چۆن مردووی پوڵکاوی ڕزیو زیندوو دەکاتەوە. بێگومان ئەم پرسیارەی ئیبراهیم لەبەر ئەوە نەبوو بڕوای بە زیندوو بوونەوە نەبێ، یان گومانی لە دەسەڵاتی خودادا هەبێ، بەڵکوو حەزو ئارەزۆیەکی دەروونی بوو شەوقێکی ڕۆحی بوو بۆ بە چاوبینینی ئەو نهێنیە خوداییە کە زیندوو کردنەوەیە، ئیبراهیم ویستی بەچاوی خۆی ببینێ دەستی قودرەتی خودا چۆن ئەو کارە گرنگە ئەنجام دەدا.

بۆ ئەوەی تامو خۆشی ئەو بینینە دڵ خۆشی بکاو ئارامی بە گیانی بداو ماوەیەك لەو کەش و هەوایە سەرسوڕهێنەرەدا هەناسە بداو خۆشی بینینی ئەو دیمەنە شادی بکا. ئەگینا ئیبراهیم لە پلەی هەرە بەرزی بیروبڕواو ئیمان پتەویدا بوو ﴿قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن﴾ پەروەردگار پێی فەرموو بۆچی بڕوات بە زیندوو کردنەوەی مردوان لە لایەن ئێمەوە نیە؟ ﴿قَالَ بَلَى وَلَكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾ ئیبراهیم وتی: پەروەردگار! بەڵێ: من بڕوای تەواو دامەزراوم بە ڕەهایی دەسەڵاتی ئێوە هەیە، ئیمانێکی تۆکمەو بەهێزم بە زیندوو بوونەوە هەیە، بەڵام حەزێکی گیانی و داخوازییەکی دڵ و دەروونمە بۆ ئەوەی ئارامی تەواو بە دڵ و گیانم بگا، پەردەم بۆ لەسەر ئەو نهێنییە بۆ لابەری و تامی ئەو خۆشییە بکەم.

پەروەردگار بە لوطف و کەرەمی خۆی ئەم ویست و داخوازییەی ئیبراهیمی پەسەند کردو ئەم ڕێزەی لێنا: کە بە چاوی خۆی تاقیکردنەوەی زیندوو کردنەوەکەی

پیشان بدا ﴿قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ﴾ پەروەردگار فەرمووی: چوار باڵندە بگرەو لە خۆتیان نزیك بكەرەوە چاك سەرنجیان بدەرێ، چاك شێوەو روخساریان ببینە تا دوایی بیانناسیتەوە ﴿ثُمَّ اجْعَلْ عَلَى كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا﴾ ئەمجار سەریان ببڕەو پارچە پارچەیان بكەو پارچەكانیان بە تێكەڵاوی لەسەر كێوەكانی دەوروبەرت دابنێ ﴿ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا﴾ ئەمجار بەناوی ئێمەوە بانگیان بكە، بڕوانە: چۆن ئەندامەكانیان جارێكی تر كۆدەبنەوەو دەچنەوە پەنا یەكتری‌و رێك دەخرێنەوەو گیانیان تێ دەچێتەوەو سەر لەنوێ زیندوو دەبنەوەو بەڕاكردن دێنەوە بۆ لات! سەرنجیان بدەرێ چۆن لە شێوەو روخساری خۆیاندا زیندوو كرانەوەو هیچ زیادو كەمیان تێدا نەكراوە ﴿وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ دڵنیابەو چاك بزانە كە پەروەردگار دەسەڵاتی رەهای هەیە لە بوونەوەرداو چی بوێ ئەنجامی دەدا. لە هەموو كاروبارێكیدا داناو زانایەو ئیشی بێ حیكمەت ناكا. ئیبراهیم بە چاوی خۆی نهێنی ژیانی بینی، باڵندەی بینین گیانیان تێدا نەمابوو جەستەیان هەنجن هەنجن كرابوو، هەر پارچەیەك لە لاشەیان فڕێ درابووە سەر لوتكەی شاخێك، كەچی بەفەرمانی خودا سەرلەنوێ گیانیان تێ چووەوە، بێگومان نهێنی گیان (روح) زانین‌و چۆنیەتەكەی شتێكی تایبەتمەندی پەروەردگارە ﴿قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾، جگە لە خودا كەس چۆنیەتەكەی نازانی‌و بۆ كەسانێك كە خۆی مەیلی لێ بێ سوچێكی ئەو نهێنییەیان بۆ دەردەخا.

لە ئایەتەكانی پێشوودا جەختی لەسەر زیندوو بووونەوە كردو ئەوەی چەسپاند كە ئادەمیزاد لە رۆژی قیامەتدا زیندوو دەكرێنەوە بۆ وەرگرتنەوەی سزاو پاداشتی خۆیان، ئیتر لێرە بەولاوە باسی گەورەیی ماڵ بەخشین لە رێگەی خودادا دەكا.. رێگەی خوداش زۆرن، وەكوو بڵاوكردنەوەی زانیاری‌و زانست‌و هەوڵدان بۆ قەڵاچۆكردنی نەزانی‌و هەژاری‌و نەخۆشی، گەورەترین رێگەیەكش كە ماڵی تێدا خەرج بكرێ جیهادو تێكۆشانە بۆ بەرزكردنەوەی وشەی (لا اله إلا الله)و بڵاوكردنەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

بێگومان قورئانی پیرۆز لەچەند شوێنێکا خەڵکی هەڵناوە بۆ ماڵ بەخشین چونکە ماڵ بەخشین ڕێگەو هۆکارە بۆ دەوڵەمەند بوون‌و چەسپاندنی خۆشگوزەرانی‌و کامەرانی بۆ گشت ئادەمیزاد، واسیتەو هۆکارێکی تایبەتییە بۆ پاراستنی عیززەت‌و کەرامەتی گەل‌و نەتەوەو تێکشکانی دوژمنانی، هەر گەل‌و هۆزێك بەخیلی بە ماڵ‌و دارایی بکاو لە جیهادا سەرفی نەکا، ئەوە بێگومان ژێردەستەی‌و کۆیلایەتی تەنگی پێ هەڵدەچنێ‌و لە هەموو لایەکەوە نەتەوەکانی تر گەلەکۆمەکێی لێ دەکەن، تێیان بەردەبن.

دەڵێن ئەم ئایەتە لە شانی عوسمانی کوڕی عەففان‌و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفدا هاتۆتە خوارێ.

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف هاتە حزمەت پێغەمبەرو چوار هەزار دیرهەمی بە خێرو کۆمەکیی بۆ جیهاد پێشکەش کردو وتی: ئەی ڕەهبەری خۆشەویست! هەشت هەزار دیرهەمم هەبوو، چوار هەزاریانم بۆ ماڵ‌و منداڵەکانم بەجێ هێشتووە، چوار هەزاریشم بەقەرز داوە بە پەروەردگار. ئیتر پێغەمبەر فەرمووی: خودا بەرەکەت بخاتە ناو ئەوەی بەجێت هێشتووەو ئەوەی بەخشیوتە.

عوسمانی کوڕی عەففانیش وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ)! منیش هەرکەسێك دەیەوێ بچێتە غەزای تەبووك‌و کەل‌و پەلی پێویستی نیە من بۆی دابین دەکەم، ئەوەبوو کۆمەکی بە موسوڵمانان کرد بە هەزار وشتر بە کەل‌و پەلەکانیانەوە هەزار دیناریشی خستە بەردەم پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ). ئیتر پێغەمبەر دەستی تێوەردان‌و دەفەرموێ: لەمرۆ بەولاوە عوسمان چی بکا زیانی پێ ناگا.

## پاداشتی ماڵبەخشین لە ڕێگەی خودادا

﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِى كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّا۟ئَةُ حَبَّةٍ ۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُوا۟ مَنًّا وَلَآ أَذًى ۙ لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٦٢﴾ ۞ قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى ۗ وَٱللَّهُ غَنِىٌّ حَلِيمٌ ﴿٢٦٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُبْطِلُوا۟ صَدَقَٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ كَٱلَّذِى يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا ۖ لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦٤﴾﴾.

لەوەپێش ئایەتەکانی قورئان، باسی زیندوو بوونەوەی ڕۆژی قیامەتیان کرد، ئەوەیان روون کردوە: کە ئادەمیزاد هەموویان ڕۆژی قیامەت زیندوو دەکرێنەوە،

پاداشی کردەوەکانی دونیایان وەردەگرنـەوە، ئـەمجار لێـرەدا باسـی فـەضل‌و گـەورەیی ماڵبەخشین لە ڕێگەی خودادا دەکا.

هەڵبەتـە ئـەو شـتانەی بـە ڕێگـەی خـودا (سـبیل الله) حلێـب دەکـرێن زۆرو هەمـەجۆرن، وەکـوو: بڵاوکردنـەوەی عـیلم‌و زانـست، قەڵاچـۆ کردنـی دەردی نـەزانی‌و نەخۆشـی‌و هـەژاری....هتـد. گـەورەترین ڕێبازێـك کـە مـاڵی تێـدا ببەخـشرێ؛ جیهـادو تێکۆشانە لە ڕێگەی خودادا، واتە: جەنگان لە دژی دوژمنانی ئـایین بـۆ بەرزکردنـەوەی ئالای ئیسلام.

قورئانی پیرۆز لە زۆر ئایەتـدا ئـادەمیزادانی هـەڵناون بـۆ ماڵبەخـشین، چونکە ماڵبەخـشین هۆکـارە بـۆ دابینکردنـی پێداویـستی هـەژاران‌و بـۆ پاراسـتنی نـامووس‌و کەرامەتی گەل‌و نەتەوەو تێکشکاندنی دوژمنانی سەرسەخت‌و دەستدرێژکار.

هەر گەل‌و نەتەوەیەك بەخیل‌و دەست قوچاو بێ، ماڵ‌و دارایی خۆیان لە ڕێگەی خوادا خەرج نەکەن، ژێردەستەیی‌و زەلیلی بەشیانە، خەڵك تەماعیان تێ دەکەن!

زانایان دەفەرموون: ئەم ئایەتە لە شانی حەزرەتی عوثماندا هاتۆتە خوارێ.

ئەبو سەعیدی خودری دەڵێ:بـە چـاوی خـۆم پێغەمبـەرم بینـی هـەردوو دەسـتی بەرز کردبووەو، نزای بۆ عوثمان دەکردو، دەیفەرموو: خودایە! مـن لـە عوثمـانی کـوڕی عەففان ڕازیم، خودایە! تۆش لێـی ڕازی بـە! بـەم شـێوە دەست بەرزکردنـەوە مایـەوە تـا شەبەقی بەیانیدا، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خـوارێ؛ کـە دەفـەرموێ: ﴿مَّثَـلُ الَّـذِينَ يُنفِقُـونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ نموونـەی ئەوانـەی کـە مـاڵ‌و دارایـی خۆیـان لـە ڕێگـەی خـودادا دەبەخشن ﴿كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّئَةُ حَبَّةٍ﴾ وەکوو نموونـەی دەنکە تۆوێك وایە: کەلە زەوییەکی بە پیت‌و بەرەکەتدا بـچێنرێ، حـەوت گوڵـە دانەوێڵەی لێ شین ببێ‌و، لە هەر گوڵە دانەوێڵەیەکیانـدا سـەد دنکـی تێـدا بـێ ﴿وَاللَّـهُ يُـضَاعِفُ لِمَـن يَشَاءُ﴾ پەروەردگار لەو ئەندازەیەش بۆ کەسـێك مـەیلی لێ بـێ بـۆی زیـاد دەکـا، وە ئـەو ڕێژەیـە دوو چـەندانەو چـەند چـەندانەی دەکاتـەوە ﴿وَاللَّـهُ وَاسِـعٌ عَلِـيمٌ﴾ گەنجینـەو

دارایی خودا بـەرفراوانو ڕەهایـە، چـەندێکی لێ ببەخـشێ لێـی کـەم نابێتـەوە، ئاگـادارو زانایە دەزانێ کێ شیاوی زیادە پێ بەخشینە..

ئەوانەی پسپۆڕن لە کشتو کاڵدا دەڵێن: دەنکە گەنمێك زیاتر لـە گوڵـە گـەنمێکی لێ شین دەبێ، وا دەبێ لە دەنکە گەنمێك یان لە دەنکە زوڕاتێك چل گوڵ بگـرە پـەنجاو شەسـت حەفتاشـی لێ پەیـدا دەبـێو جاری وا هەیـە، تـەنها گوڵـە گـەنمێك زیـاد لەسـەد دەنکی تێدا دەبێ.

لەم ئایەتەدا پەروەردگار حاڵو چۆنیەتی پاداش وەرگرتنەوەی ئەوانەی کە ماڵو دارایی خۆیان لە ڕێگەی خودادا خەرج دەکـەن شـوبهاندووە بـە زیـاد بـوونو زۆربـوونی ئەو دەنکە گەنمەی کە دەچێنرێو ئەو دەنکانەی لێ دەکەونەوە.

جا وەنەبێ وشەی ﴿فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ تایبەت بێ بە جیهادو جـەنگ کـردن لـە ڕێـی خودادا، بـەڵکوو هـەموو کارێکی بـە سـوودە بـۆ دیـنو دونیـای موسـوڵمانان دەگرێتـەوە وەکوو بڵاوکردنەوەی عیلمو زانستو دروسـتکردنو ئامـادەکردنی کەرەسـتەی جـەنگو حەج کردنو بەرگری کردن لە وڵات....هتد.

عیمرانـی کـوڕی حوصـەین لـە پێغەمبـەرەوە فەرموودەیـەك دەگێڕێتـەوە: کـە دەفەرموێ: « مَنْ أَرْسَلَ بِنَفَقَةٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَأَقَامَ فِي بَيْتِهِ فَلَهُ بِكُلِّ دِرْهَمٍ سَبْعُمِائَةِ دِرْهَمٍ وَمَنْ غَزَا بِنَفْسِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَأَنْفَقَ فِي وَجْهِ ذَلِكَ فَلَهُ بِكُلِّ دِرْهَمٍ سَبْعُمِائَةِ أَلْفِ دِرْهَمٍ ». ثُـمَّ تَـلاَ هَذِهِ الآيَةَ (وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ ). واتە: هەرکەسێك نەفەقەو تفاق بنێرێ بـۆ غـەزاو بـۆ خـۆی نەچـێو لـە ماڵـەوە بمێنێتـەوە ئـەوە لـە ڕۆژی قیامەتـدا لـە شـوێنی هـەر دیرهەمێك پاداشی حەوت سـەد دیرهـەمی دەدرێتـێ، کەسـێك لـە ڕێگـەی خـودادا غـەزا بکاو مـاڵو دارایـی تێـدا سـەرف بکـا، لـە شـوێنی هـەر دیرهـەمێك پاداشـی حـەوت سـەد دیرهەمی هەیە، ئەمجار حەزرەت بۆ زێدە دڵنیایی ئایەتی ﴿وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَن يَشَاءُ﴾ی خوێندەوە.. خودا بۆ کەسیك بیەوێ خێرو پاداشی بـۆ دووچـەندانەو چـەند چـەندانە دەکاتەوە!!

ئیمامی ئەحمەدیش لە ئەبو عوبەیدەوە فەرموودەیەك دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ: « مَنْ أَنْفَقَ نَفَقَةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبِسَبْعِمِائَةٍ وَمَنْ أَنْفَقَ عَلَى نَفْسِهِ وَأَهْلِهِ أَوْ عَادَ مَرِيضاً أَوْ مَازَ أَذًى فَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا وَالصَّوْمُ جُنَّةٌ مَا لَمْ يَخْرِقْهَا وَمَنِ ابْتَلاَهُ اللَّهُ بِبَلاَءٍ فِي جَسَدِهِ فَهُوَ لَهُ حِطَّةٌ ». وروى النسائي بعضه في الصوم.

ئەو ماڵبەخشینە: كە پاداشی دەدرێتەوەو لای خودا پەسەندە ئەوەیە: كە چەند مەرجێكی تێدا بێتە جێ، مەرجەكانیش ئەمانەن: نابێ منەتو شانازی بەسەر ماڵ پێ بەخشراوەكەدا بكاو، نابێ چاوەڕوانی پاداشی مادی لێ بكا! ئیتر ئەوانەی بەخشندەو خێرخوازنو منەت بەسەر چاكە لەگەڵ كراواندا ناكەنو بە چاویاندا نادەنەوە، پاداشتی تەواویان لەلای خودا بۆ ئامادە كراوە، پاداشتی زۆرو زەبەندو بێ ئەندازە، سەربەستو دڵخۆشن، ئەو رۆژەی كە خەڵك ترسیان لێ دەنیشێ ئەوان ترسیان نیە، ئەو رۆژەی خەڵك بەخیلو چرووك غەمناكو دڵ ناخۆشن ئەوان رووگەشو دڵ خۆشن.

بێگومان قسەی خۆشو ڕووبەڕوو بوونەوەی سواڵكەر بە روویەكی خۆشەوە زۆر خێرترە لە بەخشینێك كە منەتو شانازی بە دواوە بێ، چونكە صەدەقەو خێر كردنو بەخشین بۆیە دانراوە دەستی تەماعكاری فەقیرو هەژاران كەم بكرێتەوە، بۆ ئەوەی فەقیرو نەبوو چاوی تەماع نەبڕنە ماڵی دەوڵەمەندو رقیان لە خاوەن سامان نەبێتەوە، منەتنانو شانازی كردن بەسەر ماڵ پێ بەخشراودا ئەو مەبەستە پیرۆزە پێشێل دەكا.

پەروەردگار بێ ئاتاجە لە ماڵبەخشینو خێركردنی خاوەن سامان، بۆ خۆی دەتوانێ رزقو رۆزیی هەموو كەس بدا، بەڵام حیكمەتی خودا وایەو مەبەست تاقیكردنەوەو ئیمتیحانی خودا پێداوو سامانداره، ئاخۆ تا چ ئەندازەیەك دەستی دەچێتە ماڵی خۆیو لێی دەبەخشێ! هەروەها تاقیكردنەوەی هەژارە، ئاخۆ تا چ رادەیەك خۆگرو بەصەبرو ئارامە!!!

ئەمجار هەر بۆئەوەی پەروەردگار ماكی رەوشتی منەتكردنو شانازیكردن بەسەر ماڵ بەخشراودا لە بیخ دەربێنێ، وەصفی بەندە بەخشندەكانی دەكا بەوە كە منەت

بەسەر ماڵ پێ بەخشراوەكاندا ناكەن‌و دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ ئەو خودناسانەی ماڵ‌و دارایی خۆیان لە پێناو بەرژەوەندی ڕێگەی خودادا خەرج دەكەن، یارمەتی جەنگاوەرانی ئیسلام دەدەن، كۆمەكی بە شاگردانی زانستە پێویستەكانی ئیسلام دەكەن، پێداویستییان بۆ دابین دەكەن، یارمەتی هەژاران‌و بێ نەوایان دەدەن، ﴿ثُمَّ لاَ يُتْبِعُونَ مَا أَنفَقُواُ مَنًّا وَلاَ أَذًى﴾ لەگەڵ ئەوەشدا بە شوێن ئەو ماڵ بەخشین‌و یارمەتیدانەدا هیچ منەت‌و شانازی ناكەن، یارمەتی‌و ماڵ بەخشینەكانیان بە چاوی یارمەتی دراوەكاندا نادەنەوە، دڵیان بە منەت بەسەردا كردن‌و شانازی بەسەردا كردن ناخۆش ناكەن، ئەوانە ﴿لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ لای خودای گەورە پاداشی زۆر گەورەیان بۆ ئامادە كراوە، لەو ڕۆژەدا كە هەموو كەس ترسی لێ دەنیشێ‌و تینیان بۆ دێ، ئەوان هیچ ترسیان لەسەر نیەو تووشی غەم‌و نارەحەتی نابن، چونكە ئەوان لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگار ماڵ‌و دارایی خۆیان بەخشیوەو، بەشوێن ماڵبەخشینەكەیاندا هیچ منەت‌و شانازییەكیان بەسەر ماڵ پێ بەخشراوەكاندا نەكردووەو، وتەی نابەجێیان بەرامبەر نەكردوون، چونكە ﴿قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى﴾ تەنانەت وتەیەكی باش‌و ڕەتكردنەوەی داوای سوڵكەر بەشێوەیەكی جوان‌و چاوپۆشین لە هەڵەو ئیلحاحی داواكارو هەڵس‌و كەوتی، باشترە لە خێر پێكردن‌و یارمەتیدان‌و ماڵ بەخشینێك بە شوێنیدا منەت‌و شانازی بەسەردا بكرێ، یان جنێوی پێ بدرێ!! ﴿وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٌ﴾ پەروەردگار بێ ئاتاجە لە ماڵبەخشینی ئادەمیزادو چ پێویستیەكی بەوە نیە؛ بەڵكوو ئەوە تاقیكردنەوەیە بۆ خاوەن سامان‌و دەوڵەمەندان، بەصەبرو ئارامە كەوا زوو بە زوو سزای منەتكاران‌و شانازیكەران ناداو، مۆڵەتیان دەدا بۆ ماوەیەكی تر، یان بۆ ڕۆژی قیامەت!!

ئەمجار دوای ئەوەی كە پاداشی ئەوانەی دیاری كرد كە ماڵی خۆیان دەبەخشن‌و بە شوێن ماڵبەخشینەكەیاندا هیچ منەت‌و شانازی بەسەر خێرپێكراوەكاندا ناكەن‌و

ویــژدانیان دەگاتــە ئــەو ئاســتە بــەرزەو راســتاڵ دەبــن، ئــیتر رووی خیطـاب دەکاتـە موسوڵمانان؛ کە هـەرگیزاو هـەرگیز وا نـەکەن‌و خێـرو خێراتیـان پـووچ نەکەنـەوە بـە منەت‌و شانازی کردن‌و جنێودان، دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّـذِينَ آمَنُـواْ لاَ تُبْطِلُـواْ صَـدَقَاتِكُم بِالْمَنِّ وَالأذَى﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بە ئایینی ئیسلام کردووەو موسوڵمان بوون، هەرگیزاو هەرگیز نەکەن خێرو خێراتتان بەهۆی منەت کـردن‌و شـانازی‌و جنێـودان – پووچ بکەنەوە ﴿كَالَّذِي يُنفِقُ مَالَهُ رِئَاء النَّاسِ وَلاَ يُؤْمِنُ بِاللّـهِ وَالْيَـوْمِ الآخِـرِ﴾ وەکـوو ئـەو کەسەی ماڵ‌و سامانی خۆی دەبەخشێ بۆ ریابـازی‌و خۆهەڵکێشان‌و بڕواشـی بـە خـوداو رۆژی دوایە نیە. ئەوە ﴿فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْـهِ تُـرَابٌ﴾ نموونـەی ئـەم کابرایـەی کـە ماڵبەخـشینی بـۆ ریابازییـە، ئـەم دڵڕەقـەی کـە هـیچ ئیمـان‌و بڕوایـەکی لەدڵـدا نیـە، دڵڕەقێکـی لـە خودانەترسـی وا کـە بـە پـەردەی ریـیـاو روپامـایی دڵڕەقیەکـەی خـۆی داپۆشیوە، ئەوە وەکوو: بەردە لیسووکەیەکی ڕەق‌و تـەق وایـە، کـە هەنـدێ گڵ‌و خـۆڵی بەسەرەوە بێ‌و لە پێش چاو بەردەکە دیار نەبێ (واتە: وەکوو چۆن گڵ‌و خۆڵەکە رەقی بەردەکەی داپۆشیوەو وێ دەچێ کەسێك هەبێ تەماعی ئەوەی هـەبێ شـتی لێ بڕوێنـێ، دڵی ئەو کابرایەش ئاوا رەقەو پەردەی رییـا داپۆشـیوە، وێ دەچـێ کەسـانێك هـەبن وا بزانن ئەم کابرایە ماڵبەخشینەکەی لەبەر خاتری خودایە!)

﴿فَأَصَابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْدًا﴾ بارانێکی قەترە گەورەو لێزمە ئاسای لێ بدا، هەرچی گڵ‌و خۆڵی وا بەسەر بەردەکـەوە لای بـەرێ‌و رەقـی‌و بـێ کـەڵکی بەردەکـە دەربکـەوێ‌و بارانەکەش لـەو ئاسـتە نـەرووەکی پـێ شـین بـێ‌و نەمیوەیـەك پـێ بگەیـەنێ، ئـاواهیش خێرو خێراتی کـابرای رییابـاز بـێ خێـرەو شـیاوی پـاداش نیـەو رۆژی قیامـەت هیـچی دەسـت ناکـەوێ! ﴿لاَّ يَقْـدِرُونَ عَلَـى شَـيْءٍ مِّمَّـا كَـسَبُواْ﴾ ئـەو رییابازانـە نـاتوانن هـیچ سوودێك بەدەست بێنن لە پاداشی ئەو ماڵبەخشینەی کە بە رییـابـازی ئـەنجامیان داوە، ئەو رییاکارانە کردەوەکانیان کردەوەی کافرو خودانەناسەکانە ﴿وَاللّـهُ لاَ يَهْـدِي الْقَـوْمَ

الْكَافِرِينَ﴾ خودا گەلو گرۆی خودانەناسو کافر هیدایەت ناداو پشتگیریان ناکاو، لە ڕۆژی قیامەتدا مایە پووچیان دەکا.

## ماڵبەخشین لەبەر خاتری خوداو ماڵبەخشین لەبەر هۆی تر

﴿وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍۭ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٦٥﴾ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾﴾.

﴿وَمَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمُ ابْتِغَاء مَرْضَاتِ اللّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾ نموونەی ئەوانەی کە ماڵو سامانی خۆیان دەبەخشن لە پێناو ڕەزامەندی پەروەردگارداو، ڕاهێنانی نەفس لەسەر سەخاوەتو پاکردنەوەی لە چڵکی مادەو دامرکاندنی دڵو دەروونی خۆیاندا ماڵەکەیان دەبەخشن، بەدڵێکی پڕ لە ئیمانو ئیمانێکی قووڵو ڕەگ

داکوتـاو خێروخێـرات دەکـەن، بـڕوای پتەویـشیان بـە پاداشـی خـودا هەیـە، نموونـەی ئەمانـەن ﴿كَمَثَـلِ جَنَّـةٍ بِرَبْـوَةٍ﴾ وەکوو نموونـەی باخێـك وایـە بـە تەپۆڵکەیەکـەوە کـە زەوییەکەی بە پیتو بەرەکەت بێو نەرمانو گڵ زۆر بـێ ﴿أَصَـابَهَا وَابِـلٌ فَآتَـتْ أُكُلَهَـا ضِعْفَيْنِ﴾ بارانێکی قەترە گەورەی بەسەردا بباریو هەوایەکی صافو گەشو نماکەری لێ بـدا، ئـیتر ئـەو باخـە دووقـاتو دوو چـەندانەی خـۆی – لـە غـەیری ئـەو شـوێنەدا – بەرووبووم وەبەربێنێو خێرو خێراتی لێ بکەوێتـەوە ﴿فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِـلٌ فَطَـلٌّ﴾ خـۆ ئەگـەر بـڕێ کـات بـارانی تێـرو تەسـەلی لێ نـەبارێ، ئـەوە بـەهۆی جێگـەی لـەبارو هەواسازیو ڕشێنە باران، شەونمی لێ بباریو، بەرووبوومی خۆی بدا، خێروخێراتـی لێ دەستەبەر بکـرێ، ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَـصِيرٌ﴾ خـودا بـەکردەوەو کردارتـان بینـاو زانایـە، هیچی لێ هون نابێ...

﴿أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ لَهُ فِيهَا مِـن كُلِّ الثَّمَرَاتِ﴾ واتە: ئەی ئەو کەسەی ماڵو سامانی خۆت دەبەخشی بە ڕیابـازیو بـۆ ناوو شۆرەت! ئایا پێت خۆشە کە باخێکت هـەبێ دار خورمـاو مێـوو هـەنارو هـەرمێو جۆرەهـا داری بـەرداری تێـدا بـن، بـە ژێـر دارەکانیـدا جۆگـەو جۆبـار بکێـشنو دارو درەختەکانی ئاو بدا، هەموو هیواو تەمای دونیات هەر ئەو باخە بێ، بەتەمابی سوودو قـازانجی بـۆ خـۆتو بـۆ منداڵەکانیـشت هـەبێ؛ ﴿ وَلَـهُ ذُرِّيَّـةٌ ضُـعَفَاء﴾ چـەند زارۆكو خێزانی زۆرو ساواشت هەبێ، بـۆ خۆشـت پـیرو کەنـەفت بـوبیو توانـای کـارو کاسـبیت نەمابێو، منداڵەکانیشت پێ نەگەیشتبنو خۆیان پێ بەخێو نەکرێ چ جایی بژێوی تـۆ دابین بکەن، جگە لەو باخەش هیچ سەرچاوەیەکی بژێوی ترت نەبێ، جا ئەم باخە کـە بەم شێوە جێگای هیـواو ئاواتـت بـێ، لـەنکاوێك ﴿فَأَصَـابَهَا إِعْـصَارٌ فِيـهِ نَـارٌ فَاحْتَرَقَـتْ﴾ وەیشوومەو ڕەشەبای سەختو ئاگراوی لێـی بـداو بیـسوتێنێو وێـرانو تـارو مـار ببـێ، ئەمە وێنەی حاڵی تۆیە: کە بەڕیبا ماڵ ببەخـشی، یـان منـەتو شانازی بکـەی بـە مـاڵ بەخشینەکەت، کـە هـیچ سـوودو قازانجێکت دەسـت ناکـەوێو لـە ئاکـامی کردارەکانتـدا

جگە لە ئاخو ئۆفیشت لەدەست دەرچوون زیاتر هیچت دەست ناکەوێ. ئەمە لە کاتێکدا کە تۆ لە ڕۆژی قیامەتدا زۆر پێویستیت بە پاداشی کردەوەکانت هەیە، بەڵام هیچت بەدەستەوە نیە، چونکە ومیشوومەی زریانی ریابازیت هەموو کردارو کردەوەیەکی تۆی پووچ کردۆتەوە ﴿كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾ ئابەو شێوە روونو ئاشکرایە پەروەردگار نیشانەی گەورەیی خۆیو، بەڵگەی نهێنی شەریعەتو مەبەستو سوودەکانی بۆ ئێوە ئاشکرا دەکا، تاکوو ئێوە بە چاوێکی وردبینییەوە سەیری رووداوەکان بکەن، بە بیرو هۆشێکی تەواوەوە تێبفکرنو پەندو عیبرەت وەبگرنو لە مەبەستەکانی حاڵی ببن، ماڵبەخشینو کردارو چاکەو گوفتارتان بۆ ڕەزامەندی خودا بێو ریابازی تێدا نەکەن.

## بەخشینی ماڵی باش خێرە نەك ماڵی پیس

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿٢٦٧﴾﴾.

ئەمجار دوای ئەوەی لە ئایەتی پێشوودا باسی ئەوەی کرد: کە پێویستە ماڵبەخشین تەنها بۆ ڕەزامەندیی خودابێو مەبەست پاکردنەوەی نەفس بێ، ریابازی تێدا نەبێ، ئەوەشی بەیانکرد کە نابێ بە شوێن ماڵ بەخشینەکەدا منەتو شانازی بکا، نابێ قسەی سووكو جنێو بە ماڵبەخشراوەکە بداو هەڵوێستێك نەنوێنێ هەژارەکە دڵگران بێ، ئەوجا لێرەدا دێتە سەرباسێکی ترو لە ئایەتی داهاتوودا ئەوە روون

دەكاتــەوە كــە دەبــێ ماڵــە بەخــشراوەكە مــاڵێكی بــاش بــێ‌و نەوعییــەتی چــاك بــێ، دەفـەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ الأَرْضِ﴾ پێش ڕاڤەكردنەكە دەبێ ئەوە بزانین كە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتـە – وەكوو حاكم‌و تیرمذی‌و ئیبنو ماجە لەبـەڕائی كوڕی عازەبـەوە دەگێڕنــەوە دەڵێ: ئـەم ئایەتە دەربارەی ئێمەی ئەنصاری هاتۆتە خواری؛ ئێمـە خـاوەنی باخـە خورمـا بـووین، هی وامان هەبووە، بە گوێرەی كـەم‌و زۆری دارخورماكانی‌و ڕێـژەی دڵ فراوانـی خـۆی، خورمای بۆ مزگەوت دەهێنان، هەژارو نـەداری مزگـەوتی مەدینـە لێیـان دەخـوارد، جا هـی وا هـەبوو كـە حـەزی لـە خێركـردن نـەبوو، دەچـوو چـی هێـشووە خورمایـەكی وشكەڵەو شەرابردوو بێتام بوایە ئەوەی لێ دەكردەوەو دەیهێنا بە پەتێك لە نێـوان دوو كۆڵەكەی مزگەوتی پێغەمبەردا هەڵی دەواسی‌و پێی وابوو ئەمەی بـە خێـرو چاكە بـۆ دەنووسرێ، ئیتر ئەم ئایەتە لە شانی ئەوانـەدا هاتـە خـوارێ كـە دەفـەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَنفِقُواْ....الاية﴾.

ئەبو داودو نەسائی‌و حاكمیش لە سەهلی كوڕی حەنیفـەوە دەگێڕنـەوە دەڵێن: هەندێ لە موسوڵمانانی مەدینە دەچوون میوەو بەروبوومی خراپیان دەكرد بە خێرو بـە زەكـات دەیانـدا بـە هـەژاران، ئـیتر ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارێ كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَلاَ تَيَمَّمُواْ الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ.... الاية﴾.

حاكم ڕیوایـەتێكی تـری هەیـە لـە جابیرەوە دەگێڕنـەوە دەڵێ: پێغەمبـەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی پێكردین بە زەكاتـدانی سـەرفیترە، بـۆ هـەر سـەری خێزانـێ مەنێك خورما، پیاوێك خورمای خراپی هێنـا بـۆ زەكـاتی سـەرفیترە، ئـیتر ئـەم ئایەتـە هاتە خوارێ كە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ الأَرْضِ﴾ ئەی ئەو كەسانەی موسوڵمانن‌و بڕواتان هەیە، فەرمانتان پێ دەكـەین كە لە چاكترینی ماڵ‌و دارایی خۆتان ببەخشن، چ بـەروبوومێكتان بـاش‌و بـە نرخـە لـە

ئەوە خێرو خێرات‌و زەکات بدەن، جا ئەم ماڵ‌و داراییە پارە یان ئاژەڵ یان دانەوێڵەو میوەو کاڵای بازرگانی بێ یان کان‌و شتی دۆزراوەی ژێر زەوی بێ!

لە ئایەتێکی تردا خودا دەفەرموێ: ﴿لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ – آل عمران/٩٢﴾ پاداش‌و چاکەتان بۆ نانوسرێ‌و ناگەنە پلەی چاکەکاران هەتاکو لەو ماڵ‌و داراییە نەبەخشن کە خۆشتان دەوێ. ﴿وَلَسْتُم بِآخِذِيهِ إِلاَّ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ﴾ چۆن ئێوە شتی وادەکەن‌و دەچن لە ماڵی خراپ دەبەخشن، خۆ ئێوە بۆ خۆتان ئەگەر لەو ماڵە خراپەتان بدرێتێ دڵتان بڕوا نادا وەری بگرن مەگەر چاوی خۆتانی لێ بنوقێنن!

ئەگەر یەکێك لە ئێوە قەرزی لەسەر خەڵك بێ‌و لەو جۆرە ماڵە خراپە قەرزەکەی بۆ بێنێتەوە، بە حیسابی ماڵی باش وەری ناگرنەوە مەگەر لە نرخەکەی دابشکێنن! دەی چۆن رازی دەبن ئەوەی بۆخۆتان ناتانەوێ وەری بگرن بیدەن بە خودا؟!

مافی ئێمە لەسەرتان ئەوەیە کە چاکترین ماڵی خۆتان ببەخشن!! ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ئەوە بزانن کە خودا فەرمانتان پێ دەکا بە ماڵبەخشین‌و بە ماڵی باش بەخشینن – ئەو خۆی هیچ ئاتاجی بەو ماڵە نیەو خودا بێ ئاتاجە لە ماڵبەخشینتان‌و بێ ئاتاجە لە هەموو بوونەوەر، چونکە پەروەردگار کە فەرمانتان پێ دەکا بە ماڵبەخشین: بۆ سوودو قازانجی خۆتانەو بۆ دەستەبەر بوونی یەکسانی‌و، بەرامبەر بوونە لە نێوان دەوڵەمەندو هەژارداو، بۆ تاقیکردنەوەی ئێوەیە.

کەوابێ نابێ بەبەخشینی ماڵی خراپ‌و بێ نرخ: بەتەما بن لە خودا نزیك ببنەوە! لە لایەکی ترەوە خودا شیاوی هەموو شوکرو سوپاسێکە لەسەر کردارو گوفتاری، لەسەر بەدیهێنان‌و یاساو نیعمەت‌و قەزاوو قەدەری. دەی بەشێك لە سوپاس‌و حەمدی خودا ئەوەیە کە ماڵی باش‌و بەنرخ‌و خۆشەویست لە پێناو رەزامەندیی ئەودا ببەخشرێ.

## شەیتان ئادەمیزاد دەترسێنێ دەڵێ ماڵبەخشین هەژارت دەکا

﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾ يُؤْتِى ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾ ﴾.

﴿الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاء﴾ شەیتان دوژمنی ئێوەیە،ختوکەی دڵتان دەداو هەڵتان دەنێ بۆ رژدیو چروکیو دەتانترسێنێ لە هەژاریو نەدارایی، ئەوە دەخاتە دڵتانەوە کە ئەگەر ماڵو دارایی خۆتان ببەخشن، لە شتی باش بەشی هەژاران بدەن، خۆتان هەژار دەبن، وێڕای ئەوەش فەرمانتان پێ دەکا بە خراپەکاریی، ئەوەتان دەخاتە دڵەوە کە نەچن لە ترسی هەژاریو شتی تر کچ زیندەبەچاڵ بکەن، هەڵپە هەڵپی ماڵو سامان کۆکردنەوە بکەن، سوودو ریبا بخۆنو گوێ نەدەنە حەڵاڵو حەرامو هەر خەریکی سامان کۆکردنەوە بن، ترسی هەژاریتان هەبێ، ئەمانە هەموویان بە فاحیشە دەژمێردرێن!

لێرەدا پرسیارێك هەیە ئەویش ئەوەیە وشەی (يَعِدُكُمُ) واتە: وادەتان دەداتێ بە فەقیربوون، کاتێکیش وەعدە بەکار دەهێندرێ کە بەڵێندەر بتوانێ بەڵێنەکەی بێنێتەجێ، دەی خۆ شەیتان ناتوانێ خۆی ئادەمیزاد هەژار بکا، چونکە ئایەتەکە خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە شەیتان درۆ دەکا، هیچی بەدەست نیە، کەواتە: چۆن خودا تەئکید لەسەر ئەوە دەکا کە هەژاربوون بەدەست ئەو بێ؟؟ کەوابێ لێرەدا (يَعِدُكُمُ) بەمانا (يخوفكم)ە واتە: دەتانترسێنێ، بۆیەش لە جیاتی (يخوفكم) (يَعِدُكُمُ)ی بەکار

هێناوە بۆ زێدە موبالەغەو جەخت کردن لەسەر ئەوە تەخویفو هەڕەشەکردنەکەی شەیتان ئەوەندە موبالەغەی تێدایە وەك بڵێی هەژارکردنەکە بەدەستی خۆی بێ؟

جا لەکاتێکدا شەیتان دەتانترسێنێ لە هەژاریو فەرمانتان بە خراپەکاری پێ دەکا ئا لەو کاتەدا ﴿وَاللّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلاً﴾ پەروەردگار بەڵێنی لێخۆشبوونی خۆیتان – بەهۆی پێغەمبەرەوە – پێ را دەگەیەنێ، لەپاداشی ماڵبەخشینو چاکەکاریتاندا گوناهتان ڕەش دەکاتەوە، زیاد لەوەش لە دونیادا ماڵو دارایيتان بۆ زیاد دەکاو لە شوێنی ماڵە بەخشراوەکە هی ترتان دەداتێ ﴿وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ پەروەردگار خەزێنەی ڕەحمەتو بەزەیی فراوانە، چ بەڵێنێك بدا ئەنجامی دەدا، زاناو ئاگادارە بەو شتەی دەیبەخشنو پاداشی باشتان دەداتەوە.

ئیمامان بوخاریو موسلیم: حەدیثێکیان گێڕاوەتەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَا مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إِلاَّ مَلَكَانِ يَنْزِلاَنِ فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا. وَيَقُولُ الآخَرُ اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا». ریاض الصالحین ص ٢٠٧.

واتە: هەموو ڕۆژێ کە بەندەکان ڕۆژیان لێ دەبێتەوە، دووو فریشتە دێنە خوارەوە، یەکێکیان دەفەرموێ: خودایە! ئەوەی بەخشندەیە تۆڵەی بۆ بکەرەوە، ئەوی تریشیان دەفەرموێ: خودایە! ئەوەی ڕزدو چروکەو گیرە، تۆش لێی بگرەوە.

﴿يُؤتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاء وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ پەروەردگار حیکمەتو لێزانی دەدا بەو کەسانەی کە بییەوێ بیانداتێ، کەسێکیش حیکمەتی پێدرا، بێگومان خێرو بێرێکی زۆری دراوەتێ.

جەماوەری زانایانی ئیسلام پێیان وایە حیکمەت بریتیە لە زانستو تێگەیشتنو قورئان. حیکمەت تایبەتی پێغەمبەرایەتی نیە بەڵکوو گشتی ترەو هەرە ژووررووی حیکمەت پێغەمبەرایەتییە، بە حیکمەت دەتوانرێ حەقیقەتو وەهم لێك جیا بکرێتەوە، فەرقی نێوان ختوکە (وەسوەسە)و نیگا بکرێ، ئامێری حیکمەت: عەقڵو

ئاوەزە. کەسێك بزانێ قورئان چی حوکم‌و نهێنی تێدایە، بە عـەقڵ هەستی بـەوە کـرد کە ماڵ بەخشین چەند سوودو قازانجی هەیە بۆ گەل‌و نیشتمان‌و بـۆ خـودی خۆشـی، هەرگیز بە وەسوەسەی شەیتان هەڵناخەڵەتێ‌و کۆ لە ماڵبەخشین ناکاو چی بتوانـێ لـە رێگای خودادا سەرفی دەکا.

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود دەفـەرموێ: لـە پێغەمبـەرم بیـست دەیفـەرموو: «لاَ حَسَدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَـالاً فَـسُلِّطَ عَلَـى هَلَكَتِـهِ فِـي الْحَـقِّ، وَرَجُـلٌ آتَـاهُ اللَّـهُ الْحِكْمَةَ، فَهُوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا» رواه أحمد والبخاري والنسائي وابن ماجة.

واتـە: حەسـوودی‌و بـەخیلی بـاش نیـە مەگـەر لـە دوو شـتدا نـەبێ؛ یەکـەمیان پیاوێـك خـودا مـاڵ‌و سـامانێکی زۆری پـێ دابـێ‌و زاڵ بـێ بەسـەر بەخـشینی لـە کـاری خێردا، دووەمیان پیاوێك خودا حیکمەتی پێدابێ کاری پێ بکاو فێـری خـەڵکی تریـشی بکا.. کەوابوو کەسێك خودا یارمەتی دابێ بۆ فێربوونی زانستی بـە کـەڵك بـە تایبـەتی بۆ تێگەیشتنی قورئان‌و ئایین‌و شارەزایی بکا بـۆ شـوێنکەوتنی عـەقڵ‌و هۆش بێگومـان خێرو چاکەی دونیاو قیامەتی دراوەتێ‌و بەختەوەری هەردوو دونیایـە. ﴿وَمَا يَـذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُواْ الأَلْبَابِ﴾ سوود لە زانست وەرناگرێ‌و ئامۆژگاری کاری تێ ناکاو بە یـاد خـستنەوە سوودمەند نابێ، مەگەر خاوەن عەقڵێکی ساخ‌و سـەلیم کـە خیطابی شـەرعی تـێ بگـاو مانای کەلامی خودا بزانێ!

بەکورتی ئادەمیزاد دوو رێگای لەبەرە، سێیەمی نیە، رێگای خودا، رێگای شەیتان، یان دەبێ گوێ لە بەڵێنی خودا بگرێ‌و پەیڕەوی ئامۆژگاری ئەو بکا، یان دەبێ ملکەچی وەسوەسەو ترساندنی شەیتان بێ، ئاشکراشە کەسێك بە رێگای خودادا نـەڕواو گـوێ بـۆ بەڵێنی خودا نەگرێ، ئەوە بە رێگای شەیتاندا دەڕوا، چونکە تەنها یەك بەرنامە هەیـە حەق‌و راست بێ ئەویش ئەو بەرنامەیەیە کە خـودا دایڕشـتووە، جگـە لـەو بەرنامەیـە بەرنامەکانی تر، رێگاکانی تر، رێبازی شەیتانن.

قورئـانی پـیرۆز زۆر جـارو لـە زۆر شـوێن ئـەم حەقیقەتـە دووبـارە دەکاتـەوەو جەختی لەسەر دەکاو هەوڵی چەسپاندنی دەدا، هەتا بەڵگە نەمێنێ بۆ ئـەو گرۆهانـەی

کە دەیانەوێ لە ڕێبازی خودا لابدەن‌و لافی حەق پەرستیش لێ بدەن‌و پێیان وابێ کە ئەوان لەسەر حەقن، چونکە لێرەدا هیچ شك‌و گومانێك نیە کە تەنها دوو ڕێگە هەیە، ڕێگەی خوداو، ڕێگەی شەیتان، هەرکەسە بۆخۆی ئازادە کام لایەنە هەڵدەبژێرێ با هەڵیبژێرێ!

## خێرو ماڵبەخشینی نهێنی‌و ماڵبەخشینی ئاشکرا

﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ ۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٢٧٠﴾ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٧١﴾﴾.

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار ئادەمیزادی هەڵنا بۆ ماڵبەخشین لە ڕێگەی خودادا، ئەوە روون دەکاتەوە: کە زاتی حەق ئاگادارە بە چۆنیەتی هەموو ماڵبەخشینێك، دەزانێ ئەو ماڵە لە خوداپەرستیدا یان لە تاوانکاریدا خەرج کراوە، دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾ هەرچی خەرج بکەن لە ماڵ‌و دارایی‌و ببەخشن، نەزرو فۆتۆی بکەن، بۆ خودا بێ، یان بۆ ریابازی بێ، ئەوە بێگومان خودا پێی دەزانێ بە کێ دراوە، لە خێر سەرف کراوە یان لە شەڕدا خەرج کراوە پاداشی چاکە بە چاکە دەداتەوە، سزای توندو تیژیشی ئامادە کردووە بۆ تاوانکاران، ستەمکارانیش لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ پشت‌و پەنایەکیان

نیە، ئەو ستەمکارانەی کە رژدییان لەماڵبەخشیندا کردووە کەس نیە کۆمەکیان پێ بکا.

﴿إِن تُبْدُواْ الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاء فَهُوَ خَيْرٌ لُّكُمْ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّئَاتِكُمْ﴾ ئەگەر بە ئاشکرا ماڵ بەخشینو خێرو خێرات بکەن بەو مەبەستەی کە ببن بەسەر مەشقو خەڵکی تر چاوتان لێ بکا، شوێنتان بکەوێ ئەوە کارێکی باشەو پەسەندە، خۆ ئەگەر بە نهێنی ئەو کارە ئەنجام بدەنو جگە لە خودا کەسی تر ئاگای لە ماڵبەخشینەکەتان نەبێو بەشی هەژاران بدەن، ئەوە زۆر باشترە بۆ ئێوەو خودا برێ لە گوناهەکانتانی پێ رەش دەکاتەوەو لە تاوانەکانتان خۆش دەبێ ﴿وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ خودا ئاگادارو بینایە بە هەموو کردارێکتانو هەموو نهێنییەك دەزانێ، بگرە لە (نهێنی)یش نهێنی تر دەزانێو ئاگای لێیەتی، پاداشی کردەوەکانتان دەداتەوە، کەوابێ خۆتان لە ریابازیی بپارێزن، لە پێناو رەزامەندیی خودادا نەبێ ماڵو دارایی خۆتان مەبەخشن، چونکە نییەتتان لە خودا ون نابێ، چی لە دڵتاندایەو چ مەبەستێکیشتان هەبێ لای خودا ئاشکراو نمایانە.

لێرەدا زۆربەی راڤەکەرانی قورئان پێیان وایە: ئایەتی (٢٧١) لە شانی (صدقة التطوع)دا هاتۆتە خوارێو ئەوە دەگەیەنێ کە بە نهێنی بەخشین باشترە لە بەئاشکرا بەخشین، هەروەها هەموو عیبادەتێکی تر ئەگەر تەتەووع بوون (واتە: واجب نەبوون) ئەوە ئەنجامدانیان بە نهێنی باشترە لە ئاشکرا کردنیان، مەگەر لە ئاشکراکردنەکەیاندا بەرژەوەندیەك بەدی بکرێ، وەکوو ئەوە بیەوێ ببێتە سەرمەشقی خەڵکی ترو هی تر چاوی لێ بکەن، کەوابێ کەسێك ئەگەر ماڵی خۆی ببەخشێ بۆ بەرژەوەندییەکی گشتیو مەشروعێکی خەیری، ئەوە قەیناکا، ئەگەر خێرەکەی ئاشکرا بکاو ئەندازەی بەشداری کردنەکەی بدرکێنێ، بۆ ئەوەی خەڵکی تر چاوی لێ بکەنو پێشبڕکێی تێدا بکەن. بەڵام خێری واجب وەکوو زەکاتو سەرفیترە، ئەوە زۆربەی زانایانی ئیسلام پێیان وایە: بە ئاشکرا بدرێ لە نهێنی باشترە، چونکە کرداری فەرز ریابازیی کەمتر تێدایە.. بە پێچەوانەی کرداری سوننەت کە زۆرتر ریابازیی تێدا دەکرێ.

ئیمـامی مووسـلیم لـە صـەحیحەکەی خۆیـدا حـەدیثێکـی گێڕاوەتـەوە لـە پێغەمبەرەوە کە دەفـەرموێ: «أَفْضَلَ الصَّلاَةِ صَلاَةُ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةَ» باشـترین‌و گەرمترین نوێـژ، ئەوەیـە: ئـادەمیزاد لـە ماڵەوە بیکـا، جگـە لـە نوێـژە فـەرزەکان، هـەر بۆیەشە گوتراوە، نوێژی سوننەت کردنی بەتـەنیا باشـترە، نوێـژی فـەرز بـە جەماعـەت گەورەترە، تەنانەت بە ئاشکرا کردنی نوێژی فەرزو شتە پێویستیەکانی تـریش وەکوو حەج‌و عەمرەو زەکات‌و سەرفیترە جـەختی لەسـەر کـراوە.. چـونکە شـیعاری ئـایین‌و دەبێ بە ئاشکرا ئەنجام بدرێن!

جگە لە ماڵبەخشینی واجب – وەکوو زەکات‌و سەرفیترەو فۆتۆ (نـذر) – خێـرو خێراتـی تـر، دروسـتە بـدرێ بـە کـافرو موسـوڵمان، بـە بـاش‌و بـە خـراپ، بـە هـەژارو دەوڵەمەنـد، چـونکە ئایەتەکـە دەفـەرموێ: ﴿وَإِن تُخْفُوهَـا وَتُؤْتُوهَـا الْفُقَـرَاءَ﴾ وشـەی ﴿الْفُقَرَاءَ﴾ بە رەهایی‌و موطلەقی هێناوەو تایبەتی نەکردووە بە هەژاری موسوڵمانەوە، هەر ئەوەندە دەڵێ: (ئەگەر بدرێ بـە هـەژار باشـترە). لـە دەوڵەمەندەکانـیشی قەدەغـە نەکردووە. بەڵام زەکات‌و سەرفیترە دەبی بدرێن بە هەژارانی موسوڵمان، چـونکە خـودا دەفـەرموێ: ﴿إِنَّمَـا الـصَّدَقَاتُ لِلْفُقَـرَاءِ﴾ (موعـاذ)یـش کـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسەر بێ) ناردی بۆ یەمەن‌و کردی بە والی، فـەرمانی پێکـردوو پێـی فـەرموو: «تُؤْخَـذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ وَتُرَدُّ فِي فُقَرَائِهِمْ» بە کورتی‌و پوختی صەدەقەی واجب‌و پارە خـەرج کـردن لە بەرژەوەندی گشتیدا وەکوو دروستکردنی خوێندنگاو خەستەخانەو بانگەوازی کردن بۆ بڵاوبوونەوەی ئایین‌و جیهاد کردن، هـەروەها ماڵبەخـشینی تـەطەووع بەمەبەسـتی هەڵنانی خـەڵکی تـرو چاولێکردنی، ئـەوە پێویـستە بـە ئاشـکرا ئـەنجام بـدرێت، بـەڵام خێـرو صـەدەقەی سـوننەت بـەنهێنی ئـەنجام بـدرێت باشـترە..

## ئەوانەی ماڵیان پێ دەبەخشرێ

﴿ ۞ لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٢﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾ ﴾.

لە ئایەتی پێشوودا پەروەردگار ئەوەی ڕاگەیاندا کە دەشێ موسوڵمانان ماڵی خۆیان ببەخشن بە هەژاران بە گشتی، موسوڵمان بن یان ناموسوڵمان.

لەم ئایەتەی دوایشدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە دروستە صەدەقەی تەطەووع بدرێ بە نا موسوڵمان؛ موشریك بن یان فەلەو جولەکە بن. چونکە پێویستە

موسوڵمانان رەوشتیان خودایی بێ، ئەوەتا پەروەردگار رزق‌و رۆژیی دەدا بە کافرو موسوڵمان بەبێ جیاوازی‌و دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاء﴾ ئەی پێغەمبەر! پێویستە تۆ سنگ فراوان بی، لێبوردووی‌و سنگ فراوانی تۆ بەسەریاندا بڕژێ، ئەی محمەد! لەسەر تۆ پێویست نیە کە بە زۆر خەڵکی کێش بکەی بۆ موسوڵمان بوون، تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە ئامۆژگاری‌و بانگەوازی ئیسلامی بکەی، خەڵکی شارەزای ئایین بکەی، مزگێنی بەهەشت بدەی بە ئەوانەی پابەندی ئامۆژگارییەکانت دەبن، ئەوانەی سەرپێچی دەکەن بیانترسێنی‌و هەڕەشەیان لێ بکەی بە ئاگری دۆزەخ.. بەڵام گەیاندن بە رێگەی راست‌و حەق‌و یارمەتیدان لەسەر لێ لانەدان ئەوە بەدەست خودایەو، دەسەڵاتی پێغەمبەری تێدا نیە. کەواتە ئەی موحەممەد! فەرمان بە خەڵك بکە کە ماڵ ببەخشن بە هەرکەسێك داوایان لێ بکا،، لەسەر هەر ئاینێك بن، با خێرو خێراتیان پێ بکەن بەمەرجێك ئەو نا موسوڵمانانە لە حاڵەتی شەڕدا نەبن دژی موسوڵمانان، بێگومان پاداشی ئەو ماڵبەخشینە لای خودا پارێزراوە، بەڵام بەمەرجێ لەبەرخاتری خودا خێریان پێ بکەن ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ فَلأنفُسِكُمْ﴾ هەر شتێك ببەخشن‌و سوودی هەژارانی تێدا بێ، پاداشەکەی بۆ خۆدی خۆتانەو، بۆ خۆتان سوودی لێ دەبینن ﴿وَمَا تُنفِقُونَ إِلاَّ ابْتِغَاء وَجْهِ اللّهِ﴾ خۆ ئێوەی موسوڵمانیش هەر ماڵێك ببەخشن لەبەر خاتری رەزامەندی خودا دەیبەخشن، مەبەستتان لێ رازی بوونی پەروەردگارە، موسوڵمان نابێ خێرو خێرات بکا بۆ ئەوەی باسی بکەن‌و پێیدا هەڵبڵێن‌و مەدحی بکەن، موسوڵمان بۆیە ماڵ سەرف ناکا هەتا بەسەر ماڵ پێ بەخشراوەکەدا خۆی راوەشێنێ‌و کەش‌و فشیان بەسەردا بکا، یان بە تەما ئەوەبێ خاوەن دەسەڵات‌و پلەو پایە لێی رازی بن‌و فەرمبووی بکەن، بەڵکوو تەنها لەبەر خاتری خودا بەخشندەیی دەکا، بۆیە دڵنیایە خودا صەدەقەی لێ وەردەگرێ‌و دڵنیایە خودا بەرەکەت دەخاتە ماڵ‌و دارابیەوە، دڵنیایە خودا پاداشی دەداتەوە! ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ﴾ هەر خێرو خێراتێك بکەن،هەر ماڵێك ببەخشن پاداشتتان دەدرێتەوەو ئێوە هیچ ستەمتان لێ ناکرێ‌و بە زیادەوە پاداش وەردەگرنەوە!!

لە دونیاو قیامەتدا خۆتان لێی سوودمەند دەبن؛ لە دونیادا ماڵو داراییتان پارێزراو دەبێ، هەژارو نەدارا چاوی تێنابڕنو هەوڵ نادەن لێتان بفڕێننو لێتان بدزن، چونکە برسی هەموو شتێك بە ڕەوا بۆخۆی دەزانێ، لە قیامەتیشدا پاداشتتان چوونە ناو بەهەشتەو دەستەبەربوونی خۆشیو لەززەتەکانیەتی.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە ماڵبەخشین بۆ هەژاران بەگشتی، موسوڵمانو نا موسوڵمان دەگرێتەوە، چونکە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾ ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەو رایە، چونکە ئاشکرایە دیل (اسیر) لە وڵاتی ئیسلامدا جگە لە نا موسوڵمان نیە! ئەوەی پاڵپشتی ئەمە دەکا ئەو حەدیثەیە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ لە رۆژگاری کۆندا پیاوێك پەیمانی دا وتی: دەبێ ئیمشەو خێرێك بکەم، بەشێك لە ماڵو داراییم ببەخشم، ئیتر ئەو شەوە خێرەکەی کرد دای بە ئافرەتێکی داوێن پیس، بەیانی خەڵك کەوتنە مقۆ مقۆ وتیان خێری بە ئافرەتی داوێن پیس کردووە؟! وتی خودایە! سوپاس بۆ زاتی پاکت لەسەر ئەوە کە شارەزاییت کردم لەسەر خێر کردن بە زیناکەر! ئەم شەو دەبێ خێرێکی تر بکەم، ئیتر خێرەکەی خستە ناو دەستی کابرایەکی دەوڵەمەندەوە، بەیانی کە رۆژ بووەوە سەر لەنوی خەڵك کەوتە مقۆ مقۆ دەیانگوت: فلانەکەس خێری داوە بە دەوڵەمەند!! وتی: خودایە! سوپاس بۆ تۆ کە یارمەتیت دام لەسەر خێر کردنم بە دەوڵەمەند!! دەبێ ئیمشەو خێرێکی تر بکەم، ئیتر چوو خێرەکەی دا بە کابرایەکی دز، کە رۆژ بووەوە سەرلەنوێ لێی کەوتنە مقۆ مقۆ وتیان: خێری بە دز کردووە، وتی: خودایە سوپاس بۆ تۆ لەسەر یارمەتیدانم بۆ خێر کردنم بە زیناکەرو دەوڵەمەندو دز!!

ئیتر یەکێك هاتە لایو پێی گوت: خێرەکانت هەموویان وەرگیراونو قبووڵن، بەڵکوو ئافرەتە داوێن پیسەکە تۆبە بکاو داوێن پاکی دەست پێ بکا، بەڵکوو دەوڵەمەندەکەش پەند وەربگرێو دەست بکات بە خێر کردن، بەڵکوو کابرای دزیش واز لە دزی کردن بێنێ.

ئەمجار پەروەردگار کۆمەڵێك هەژار دیاری دەکا کە لە هەموو کەس زیاتر شیاوی خێر پێ کردنن ئەوانیش ئەو هەژارانەن کە پێنج صیفەتیان تێدا بن. ڕەوشتی یەکەمیان ئەوەیە: کە دەفەرموێ: ﴿لِلْفُقَرَاء الَّذِينَ أُحصِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾

١- یەکەم ئەو هەژارانەی کە ماڵو منداڵو سامانی خۆیان لە مەککە بەجێ هێشتووەو لە مەدینە نیشتەجێ بوون، خۆیان تەرخان کردووە بۆ تێکۆشانو خۆبەخت کردن لە ڕێگای خواداو پارێزگاری کردنی پێغەمبەر! وەکوو کۆمەڵێ (صوففە) کە بنکەیان لە ناو مزگەوتی مەدینە بوو، پارێزگاری ماڵەکانی پێغەمبەریان دەکردو دوژمن نەیدەتوانی فرسەتیان لێ بێنن، ژیانی خۆیان لە پێناو خەباتو تێکۆشان لە ڕێگای ئیسلامدا تەرخان کردبوو، بە جۆرێك کە ماوەی ئیش کردنو بازرگانییان نیەو ناتوانن بژێو بۆ خۆیان دابین بکەن؛ لەگەڵ ئەوەشدا دەست پان ناکەنەوەو سواڵ ناکەنو ئەوەندە نەفس بەرزن کەسێ نەزانێ وا گومان دەبا کە ئەوانە تێرو تەسەلو دەوڵەمەندن، کەسێك زۆر بە ڕوونی تێیان نەفکرێو توێژینەوەیان تێدا نەکا حەقیقەتو چۆنیەتی ئەوانی بۆ ئاشکرا نابێ، جا هەرچەندە ئایەتەکە دەربارەی ئەوانە هاتۆتە خوارێ بەڵام دەقەکەی گشتییەو بۆ هەموو هەژارێکی ڕەوشت بەرزی هەموو ڕۆژگارێك دەبێ، هەرکەسێك ئەو ڕەوشتانەی تێدا بن، دەقەکە دەیگرێتەوە.

ئیبنو عەباس دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ڕۆژێك پێغەمبەر لە ناو کۆمەڵێ صوففەدا ڕاوەستاو هەژارییانی بینی، کۆششو دڵپاکییانی هەست پێ کرد، فەرمووی: مزگێنیتان لێ بێ ئەی کۆمەڵی صوففە! هەرکەسێك لە ئومەتی من لەسەر ڕەوشتی ئێوە بێو بەردەوام لەسەر ئەو ڕەوشتانە بمێنێتەوەو ڕازی ببێ بەبەشی خۆی ئەوە لە هاوەڵانی منە..

٢- دووەم ئەوەیە: کە نەتوانن کار بکەن ﴿لاَ يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِي الأَرْضِ﴾ واتە: ناتوانن بازرگانیو ئاڵو وێر بکەنو بە شوێن کاسبیدا بگەڕێن، جا چ لەبەر پیریو کەنەفتی بێ، یان لەبەر نەخۆشی بێ، یان لە ترسی دوژمن بێ، یان لەبەر هەر هۆیەکی تر بێ.

٣- سێیەم نەفس بەرزیو بێ تەماعییانە، هیچ هومێدێکیان بە ماڵی خەڵك نیە، ئەوەندە نەفس بەرزنو هێندە بە قەناعەتن لە بارەی خواردنو پۆشاكو هەڵسو كەوتیان هەر بەتەواوی ئەو لایەنەیان فەرامۆش كردووە، هیچ گرنگییەكی پێ نادەن.

هەر لە مانای ئەم رستەیەی ئایەتەكەدا ئەبو هورەیر فەرموودەیەك دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: « لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِى يَطُوفُ عَلَى النَّاسِ تَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَانِ وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ، وَلَكِنِ الْمِسْكِينُ الَّذِى لاَ يَجِدُ غِنًى يُغْنِيهِ، وَلاَ يُفْطَنُ بِهِ فَيُتَصَدَّقُ عَلَيْهِ ، وَلاَ يَقُومُ فَيَسْأَلُ النَّاسَ شيئا » رواه احمد أيضا عن ابن مسعود.

واتە: هەژار ئەو كەسە نیە كە دەرگاو دەرگاو دوكانەو دوكان دەگەڕێ، دەنكە خورمایەك یان دوو دەنكە خورما، پارووە نانێك یان دوو پارووە نان پەیدا بكا، بەڵكوو هەژار ئەو كەسەیە هیچی نەبێو كەسیش پێی نەزانێ كە هەژارە هەتا شتی بدەنێو خێری پێ بكەن، داوا لە كەسیش نەكاو دەروزە نەكا.

٤- رەوشتی چوارەمیان ئەوەیە كە چەند نیشانەیەكی تایبەتییان هەیە ﴿تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ﴾ ناسینو پێزانینو دۆزینەوەیان پێویستی بە لێورد بوونەوەو تێفكرینی موسوڵمانان هەیە، لێزانیو دووربینیو عەقڵو هۆشی تایبەتی گەرەكە، پێویستە لە هاوسێو خزمو كەسو كاریان پرسیار بكرێ، وێ دەچێ دیاردەی هەژارییان پێوە دیار بێو كزو لاوازو پۆشاك دڕاو بن، بەڵام زۆر جار ئەم دیاردە بەرچاوانە نابنە نیشانەی هەژاریو نەبوونی؛ چونكە وا دەبێ دوو كەس یەكێكیان خۆ بە هەژار پیشان دەداو پۆشاك دڕاو سەروگوێ رووتو پێ خاوسە، یەكێكیشیان پۆشاكێكی پاكو خاوێنو مامناوەندی دەپۆشێو وێ دەچی ئەم هەژار بێو ئەوی تریان درۆ بكا!!

٥- رەوشتی پێنجەم دەروزە نەكردنیانە ﴿لاَ يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا﴾ واتە: بە هیچ جۆرێك سواڵ ناكەنو نەفس بەرزنو نەفس بەرزییان رەوشتێكی هەمیشەییانەو بەهیچ جۆرێك داوا لەكەس ناكەن.

هەندێ لە ڕاڤەکەرانی قورئان دەفەرموون: مەبەست لە ﴿لاَ يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا﴾ ئەوەیە کە بە ئیلحاح داوا لەکەس ناکەن، واتە سواڵ دەکەن بەڵام بە نەزاکەتو ئیلحاح ناکەن! چونکە کەسێك سواڵ بکاو بەشی خۆشی هەبێ ئەوە پێی دەڵێن ئیلحاح کەرو ویرە ویرکەر، کەوابێ ئەم ڕستەیە ئاماژەیە بۆ خراپحاڵی ئەو کەسانەی کە هەیانەو سواڵ دەکەن، سواڵکردنیان کردۆتە پیشە! زۆربەی سواڵکەرانی ئەمڕۆ لەو ئیلحاح کەرانەن.

﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللّهَ بِهِ عَلِيمٌ﴾ هەر خێرو خێراتێك بکەن کەم بێ یان زۆر بێ خودا ئاگادارەو پێی دەزانێو ئاگای لێیەتیو مەبەستو نییەتی بەخشندەکە دەزانێ بۆ چییەو بۆچی نیە، پاداشی پێویستیان دەداتەوە. ﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ سِرًّا وَعَلاَنِيَةً﴾ ئەوانەی ماڵو دارایی خۆیان دەبەخشن، لە هەموو شوێنو کاتێکدا؛ بەشەوو ڕۆژ، بەنهێنیو بە ئاشکرا، هیچ شتێك نابێتە لەمپەرو مانیع لەبەردەم ماڵبەخشینیاندا، ئەوانە ﴿فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ پاداشی باشیان لەلای خودایەو لە گەنجینەی ڕەحمەتی خۆی خەڵاتیان دەداتێ، ئەوانە لە جیهاندا ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام داوە، ئیتر ﴿وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ ترسیان نیەو سەربەرزن، چونکە ئەوان ئەو کاتەی پێویست بووە ماڵی خۆیان ببەخشن بەخیلیو ڕژدیو چروکیان نەکردووە، یارمەتی هەژارانیان داوە، ﴿وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ خەمو خەفەتی ئەوەشیان نیە کە فرسەتیان لە کیس چووبێ، چونکە ئەوانە ئەوەندە نەفس بەرز بوون هەموو ئاواتو هیوایەکیان ئەوەبوو پێداویستی بێ نەوایان دابین بکەنو یارمەتی هەژارێك بدەنو، برسییەك تێر بکەن، یان کەلو پەلو تفاقی پێشمەرگەیەکی ئیسلام دابین بکەنو بینێرنە سەر سنوورو، سەنگەرو کەلێنێکی پێ بگرن، تا بەرگری لە ماڵو ناموسی موسوڵمانان بکەن.

## زیانی ڕیبا (سوود) بۆ تاک و کۆمەڵ

﴿ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَـٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ ۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرْبِى ٱلصَّدَقَـٰتِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴿٢٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٧﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ ۚ وَأَن تَصَدَّقُواْ

خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٢٨١﴾

ئەمجار دوای ئەوەی لە ئایەتی پێشوودا باسی ماڵ بەخشین و خێرۆمەندانی کرد، کە لە پێناو رەزامەندیی خودادا ماڵو دارایی خۆیان دەبەخشن، هیچ مەبەستێکی تریان نیە جگە لە رازی بوونی خودا لێیان! باسی ئەوانەی کرد کە ماڵی خۆیان دەبەخشن بەبێ بەرامبەر، ئەمجار دێتە سەر باسی ریبا وەرگران و سوودخۆران: کە بەبێ بەرامبەر ماڵ وەردەگرن و بەناڕەوا هەژارو نەبوان دەڕوتێننەوە! دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ﴾ ئەو کەسانەی سوود وەردەگرن و ریبا خواردنیان بەلاوە رەوایە بەبێ هۆی رەواو بەناحەق، بەبێ ماندوو بوون و کۆشش ماڵ و سامانی خەڵکی دەخۆن، ئەوانە لە چەواشەیی و دڵەڕاوکێ و ویژدان مردوویی و رۆچوون لە کردەوەی دونیایی دا وەکوو ئەو شێتەو دەست لێ دراوانە وان کە جنۆکە دەستیان لێ دەوەشێنن!

ئەوانە کاتێك رۆژی قیامەت زیندوو دەکرێنەوە، هەر لەو کاتەوە لە گۆڕ دێنە دەرێ تا دێنە دەشتی مەحشەرو دوایی بەرەو بەهەشت و دۆزەخ دابەش دەکرێن – شەپلە لێ دراون و هەڵس و کەوتیان بە نارێك و پێکی دێتە پێش چاو – هەموو دەم پەشێواوو لەش داهێزاوو سەر لێ تێکچوو بەهۆی ئۆباڵی قورسایی ئەو ماڵە حەرام و سوود ئامێزەی کە لە دونیادا بە ناڕەوا خواردوویانە، بە جۆرێك رەنگ و ڕوخساریان لە هەموو کەس جیاوازە، ناتوانن رێ بکەن و هەرکە ویستیان بجووڵێن ئەندامەکانیان هاوکارییان ناکەن و لەدوایان نایەن، ئەمەش وێنەیەکی دزێو قێزلێکراوی هەیە، بەڵگەیە لەسەر ئەو حاڵەت و دیاردەیە کە نیظامی سەرمایەداری سوودئامێز لە جیهانی

هاوچەرخدا بەدی دەهێنێ، هەڵکشان و داکشانی بازاڕو دڵەراوکێ و لە گرێژەنەچوونی سیستەمی ژیان و بڵاوبوونەوەی ترس و لەرزو نەخۆشی دەمارگیری و دەروونی و جۆرەها دەردو مەینەتی تر هەموویان دیاردەی سووخواردن و ریبا وەرگرتن!!

زۆربەی راڤەکەرانی قورئان لەسەر ئەوەن کە مەبەست لە وشەی ﴿لاَ يَقُومُونَ﴾ هەستانەوەیانە لە گۆڕەکانیان تا کاتی کۆبوونەوەو دابەشبوونیان بۆ بەهەشت و دۆزەخ. واتە هەڵسان و جووڵانیان بە شێوەیەکی نائاسیی یەو دەڵێی جووڵەو هەستانی پەرکەمدارەو دەڵێی شێت و شەیاتینی دەستی لێ وەشاندوون ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا﴾ چونکە ئەوان دەیانگوت: سوودو ریبا وەکوو کڕین و فرۆشتنی ئاسایی وان، بۆچوونەکەیان بەتاڵ و پووچ بوو: کە پێیان وابوو: ریباو بەیع وەکوو یەکترین!! دەیانگوت: چۆن رەوایە شتێك کە نرخی حازری دیرهەمێك بێ دروستە بەقەرز بیفرۆشی بە دوو دیرهەم، هەر بەو جۆرە رەوایە ئینسان کاتی پێویستی دیرهەمێك وەربگرێ و کاتی هەبوون و ئاسایی دوو دیرهەم بداتەوە، خۆ هۆی زیادەکە لە هەر دوو سەوداکاندا ماوەکەیە، دەی بۆ ئەویان دروستەو ئەمیان نادروستە؟؟

ئیتر پەروەردگار بۆچوونەکەیانی رەتکردەوەو ئەوەی ئاشکرا کرد کە پێك گرتن (قیاس)ە کەیان هەڵەیەو فەرمووی: ﴿وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾ پەروەردگار کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە ریبای یاساغ کردووە، چونکە سەوداو مامەڵە بەردەوام تێبینی ئەوەی تێدا دەکرێ‌کە کڕیار سوود لە کاڵا کڕدراوەکە دەبینێ، بۆ نموونە کەسێك گەنم دەکڕێ یان لێی دەخوا یان دەیچێنێ، یان دەیفرۆشێتەوە، پارەکە بەرامبەر کاڵاکەیەو کڕیارو فرۆشیار هەردووکیان رازین!! بەڵام ریبا وانیە چونکە لەمامەڵەی ریبائامێزدا خاوەن پارە ئەندازەیەك پارە یان کاڵایەك دەداتە کابرایەك دوایی پاش ماوەیەك زیاد لەو ئەندازەیەی لێ وەردەگرێتەوە، ئەو زیادەیەی وەری دەگرێتەوە هیچ بەرامبەرێکی نیەو بەرزامەندی کابرای خاوەن ئاتاج نیە، ئەو بەناچاری ئەو زێدەیە دەدا بە خاوەن سامانەکە. جا ﴿فَمَن جَاءهُ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِ فَانتَهَىَ فَلَهُ مَا سَلَفَ﴾ کەسێك ئەوەی پێ گەیشتت کە ریبا یاساغەو خێرا وازی لێ هێنا، ئەوە

ئەو ریبایەی لەوە پێش وەریگرتووە بۆ خۆیەتی‌و داوای ئەوەی لێ ناکرێ کە ئەو ریبایەی لەوەپێش وەری گرتووە بیداتەوە، بەڵکوو ئەوەندە بەسە کە ئیتر لەوە بەولاوە ریبا وەرنەگرێ ﴿وَأَمْـرُهُ إِلَـى اللّـهِ﴾ لێبووردن‌و چاپۆشی لێ کردنی بەدەست پەروەردگارەو، بۆ خۆی دەزانێ رۆژی قیامەت چی بۆ بڕیار دەدا، ﴿وَمَـنْ عَـادَ فَأُوْلَئِـكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ کەسێك دوای ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ سوود وەرگرتن‌و ریبا خواردن، وەکوو سەردەمی نەزانی‌و جەهالەت هەزاران بچەوسێنێتەوە، ئەوە شیاوی سزای توندی دۆزەخەولە ناو ئاگردا ماوەیەکی دوورو درێژ دەمێنێتەوەو تۆڵەی ئەو سەرپێچی کردنەی لێ دەسێندرێتەوە).

﴿يَمْحَقُ اللّهُ الْرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ﴾ پەروەردگار خێرو بەرەکەتی ماڵ‌و دارایی سوود تێکەوتوو ناهێڵێ‌و گەشەی پێ ناکا، هەرچەندە بە رواڵەت ماڵ‌و سامانەکە بەهۆی ریباوە زیاد بکا، بەڵام لە راستیدا هەر روو لەنەمان‌و بەرەو فەوتان دەچێ. بە پێچەوانەوە صەدەقەو خێرو خێرات خودا بەرەکەتی تێ دەخاو خێرو بێرەکەی دووچەندانە دەکاتەوە، لە دونیادا هەرگیز صەدەقەو خێر لێ کردن ماڵ‌و دارایی کەم ناکاتەوەو خوا بۆی پڕ دەکاتەوە، لە رۆژی قیامەتیشدا خێرکەر پاداشی خێرکردنەکەی بە دوو چەندانەو چەند چەندانە وەردەگرێتەوە، دیاردەیەکیش لە دیاردە مەعنەوییەکانی خێرو خێرات ئەوەیە کە کابرای خێرکەر هەمیشە لای خوداو ئادەمیزاد خۆشەویستەو، کەس حەسوودی پێ نابا‌و زیانی پێ ناگەیەنێ‌و دزی لێ ناکەن. بە پێچەوانەوە بابای سوودخۆر هەمیشە لای خوداو بەندەکانی دزێوەو رقیان لێیەتی، هەموو کەس بە چاوی سوك تەماشای دەکەن‌و پێیان خۆشە تووشی بەڵاو موسیبەت ببێ، هەموو کەس چاوەڕوانی ئەوەیانە کە تووشی رۆژێکی رەش ببێ! ئەمەش دیاردەیەکە زۆر جاران لە سوودخۆران دیاری دەداو، ریبا وەرگران ماڵ‌و سامانیان تەفرتونا دەبێ‌و لە کۆتایی دا تەندروستی‌و سامانیان تووشی نەهامەتی دێ‌و ماڵیان بە فیڕۆ دەچێ‌و لەش‌و لاریان تووشی نەخۆشی سامناك دەبێ‌و بە خۆیان‌و ماڵ‌و داراییانەوە دەپوکێنەوە.

بوخاری‌و موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە حەدیثێك دەگێڕنەوە كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ تَصَدَّقَ بِعَدْلِ تَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ (وَلاَ يَقْبَلُ اللَّهُ إِلاَّ الطَّيِّبَ، وَإِنَّ اللَّهَ يَتَقَبَّلُهَا بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يُرَبِّيهَا لِصَاحِبِهِ كَمَا يُرَبِّى أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الْجَبَلِ» واتە: كەسێك بەئەندازەی دەنكە خورمایەك لە ماڵی پاك‌و خاوێنی خۆی ببەخشێ (خوداش تەنها شتی پاك قبووڵ دەكا) پەروەردگار بەدەستی راستی لێی وەردەگرێ‌و بۆ خاوەنەكەی پەروەردەی دەكا، وەكوو چۆن یەكێ لە ئێوە جوانوێ پەروەردە دەكا، تا ئەو دەنكە خورمایە بە ئەندازەی كێوێك گەورە دەبێ. ﴿وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ﴾ پەروەردگار هەركەسێك بەردەوام بێ لە تاوان كردن‌داو سوپاسگوزاری نیعمەتی خودا نەبێ‌و لە ماڵ‌و دارایی خۆی نەبەخشێ، خۆشی ناوێ‌و رقی لێی دەبێتەوە. چونكە ئەو سامانداره رژده پێویستی‌و ئاتاجی هەژاران دەقۆزێتەوەو بەهەلی دەزانێ بیانچەوسێنێتەوەو هەست بە ئێش‌و ئازاری هەژارییان ناكا، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە سوود خواردن كارو كردەوەی كافرو خوانەناسانە نەك هی موسوڵمان!

ئەمجار پەروەردگار بەراوردییەك لە نێوان هەڵس‌وكەوتی خودانەناسان‌و ریباخۆرو موسوڵمانان دەكاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ﴾ ئەوانەی بڕوایان بە ئایینی ئیسلام هێناوەو خودا دەناسن‌و بڕوایان بە پێغەمبەر هەیە گوفتارو كرداری چاك ئەنجام دەدەن‌و دڵ‌و دەروونی خۆیان پاك دەكەنەوە، یارمەتی هەژاران دەدەن‌و قەرزداران مۆڵەت دەدەن ﴿وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ﴾ نوێژ دەكەن كە یادی خودایان بیردەخاتەوەو نزیكیان دەكاتەوە لە بارەگای زاتی بێچوونی ﴿وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ﴾ زەكاتی ماڵ‌و سامانی خۆیان دەردەكەن، كە دەبێتە هۆی بارسووك كردنی هەژاران‌و بڵاوكردنەوەی خۆشەویستی لە نێوان سامانداررو هەژاراندا، ﴿لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ ئەوانە پاداشی تەواویان لە لای خودا بۆ ئامادە كراوە، رۆژی قیامەت پێی شاد دەبن، شانازی بە كردەوەی چاكی خۆیان دەكەن.. ﴿وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ لە داهاتوو ناترسن‌و

دڵنیا دەبن لە ئاکامی حیساب‌و لێکۆڵینەوە ﴿وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ خەم‌و خەفەتی رابوردووشیان نیە، شتێك نیە حەسرەتی بۆ بخۆن‌و بڵێن خۆزگا بمانکردایەو دەستی خۆیانی بۆ بشکێننەوە.

دوا بەدوای ئەم بەرامبەری کردنە لە نێوان ئاکام‌و پاداشی ریباخۆرو موسوڵمانانی کردارچاکدا جارێکی تر پەروەردگار بانگی موسوڵمانان دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ﴾ ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوەو بڕواتان بە فەرمان‌و نەهییەکانی پەروەردگار هەیە، خۆتان لە سزای سەختی خودا بپارێزن، پابەندی فەرمان‌و نەهییەکانی بن، چی دەفەرموێ: بیکەن، ئەنجامی بدەن، چی نەیی لێ کردن لێی دوورکەونەوە ﴿وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا﴾ ئەو قازانج‌و سوودەی لای قەرزداران ماوەتەوە وازی لێ بێنن‌وگەردنیان ئازاد بکەن ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر راست دەکەن ئێوە بە دڵ بڕواتان هێناوە، بەراستی پابەندی فەرمان‌و نەهییەکانی ئایینی ئیسلامن!!

ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە ئەگەر کەسێك دوای ئەم فەرمان‌و نەهی‌و هەڕەشانە، وازی لە سوودخواردن‌و ریبا وەرگرتن نەهێنا بە موسوڵمان حلێب ناکرێ‌و بە کافری دەمرێ‌و هەتا هەتایە لە دۆزەخدا سزای دەدرێ، چونکە ئایینی ئیسلام ئایینێکی تێرو تەسەل‌و یەکانگیرە، دەبی موسوڵمان بڕوایان بە هەمووی هەبێ، کەسێك بڕوای بە بەشێکی هەبێ‌و بڕوای بە بەشێکی نەبێ بە موسوڵمان دانانرێ‌و لە ریزی ئەوان حسێب ناکرێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَنْتَهِبُ نُهْبَةً يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ فِيهَا أَبْصَارَهُمْ حِينَ يَنْتَهِبُهَا وَهْوَ مُؤْمِنٌ».

﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ﴾ ئەگەر ئێوە ئەی موسوڵمانان! وازتا لە سوودخواردن‌و ریبا وەرگرتن نەهێناو دەستتان هەڵنەگرت لەو ریبایەی ماوە لای قەرزدارەکانتان ئەوە ﴿فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ﴾ بزانن کە ئێوە شەڕێکی سامناك‌و دژوار لەگەڵ خوداو

پێغەمبەر دەکەن، ئامادەبن بۆ جەنگان لەگەڵ خوداو پێغەمبەردا، چونکە ئێوە بەم هەڵوێستەتان دوژمنایەتی خوداو پێغەمبەر دەکەن‌و پابەندی شەریعەتەکەی نابن، کەسێکیش خودا دژایەتی بکا رقی لێی دەبێ‌و تۆڵەی لێ دەستێنێ، لە جیهاندا بەوە تۆڵەی لێ دەستێنێ کە زەرەرو زیانی لێ دەداو لە قیامەتیشدا بە ئاگر سزای دەدا، کەسێك رقەبەری خوداو پێغەمبەر بکاو فەرمانبەرداری فەرمان‌و نەهییەکانی نەبی دەبێ شەڕی لەگەڵدا بکرێ وەکوو کافرو هەلگەڕاوە حیسابی بۆ بکرێ. ﴿وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ﴾ ئەگەر تۆبەتان کردوو وازتان لە ریبا هێناو پابەندی فەرمانی ئایین بوون، ئەوە دەتوانن دەست مایەکەتان وەربگرنەوە ﴿لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ﴾ زیادە لە قەرزدارەکان وەرنەگرن‌و ستەمیان لێ نەکەن: بەوە کە لە دەستمایەکەتان کەم بکەنەوە، بەڵکوو ئێوە دەتوانن دەستمایەکەتان بەبێ زیادو کەم وەربگرنەوە.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان دەکا کە لەگەڵ قەرزدارە نەبووەکاندا بە نەزاکەت بن‌و دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾ ئەگەر هاتوو قەرزدارەکە نەبوو بوو نەیدەتوانی خێرا دەستمایەکە بداتەوە، ئەوە مۆڵەتی بدەن تا شتێکی دەست دەکەوێ‌و دەتوانێ قەرزەکە بداتەوە، پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) لە فەرمودەیەکدا کە ئەبو هورەیرە لێیەوە دەگێڕێتەوەو موسلیم ریوایەتی کردووە، دەفەرموێ: «مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ».

چونکە حیکمەتی پوچەڵ کردنەوەی یاسای ریبا کاتێك دیاری دەدا ئەگەر تەنگ بە قەرزدارەکە هەڵنەچنرێ‌و نەرم‌و نیانی لەگەڵدا بکرێ، ﴿وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ خۆ ئەگە پیاوەتی لەگەڵ قەرزدارە نەبووەکان بکەن‌و لە هەموو قەرزەکە، یان لە هەندێکی خۆش ببن، ئەوە لە مۆڵەتدانەکە باشترە بۆ ئەوان‌و بۆ ئێوەش خێری زیاترە، ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ واتە: ئەگەر ئێوە دەزانن لێخۆشبوو لە هەموو قەرزەکە، یان هەندێکی خێری زیاترە لە مۆڵەتدان‌و لەسەر وەستان! ئەوە بە گوێرەی زانیارییەکەی خۆتان بکەن‌و لە

براكانتـان خـۆش بـبن‌و ڕەحـم‌و بـەزەيى خۆتانيـان بـۆ دەربخـەن! ئاشـكرايە كـە ئەمـە هەڵنانى تێدايە بـۆ لێبـووردن‌و يارمەتيـدانى قـەرزدارى نـەبوو، داواى ئـەوە لـە خـاوەن قـەرزارەكان دەكـا كـە گيـانى هاريكـارى‌و يارمەتيـدانيان تێـدا بـێ، هەريەكـە لـە عاسـت خۆيەوە بارگرانى لەسەر بـراى موسـوڵمانى سـووك بكـا. پێغەمبـەريش (دروودى خـواى لەسەر بێ) دەفـەرموێ: «إِنَّ الْمُؤْمِنَ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ، يَـشُدُّ بَعْـضُهُ بَعْـضًا» موسـوڵمان بـۆ براى موسوڵمانى وەكوو چينى ديوار وەهان يـەكترى جـۆش دەدەن‌و هەريەكـەيان ئـەوى تر قايم دەكا. ئيمـامى تـەحاوى لـە بۆرەيـدى كـوڕى حەصيبەوە فەرموودەيـەكى تـرى پێغەمبەر (دروودى خواى لەسەر بێ) دەگێڕێتەوە دەفـەرموێ: «مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِرًا كَانَ لَـهُ بِكُلِّ يَوْمٍ صَدَقَةٌ...» كەسێك مۆڵەت قەرزدارێكى نەبوو بـدا هـەموو ڕۆژێـك بەئەنـدازەى قەرزەكە خێرى دەگاتێ.

هەردوو ئيمام ئەحمەدو موسليم حەديثيكى تريـان لـە كـەعبى كـوڕى عـەمرەوە گێڕاوەتەوە كە پێغەمبەر (دروودى خواى لەسەر بێ) فەرموويەتى: « مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً أَوْ وَضَعَ عَنْهُ أَظَلَّهُ اللَّهُ ظِلَّـهِ» كەسێك قـەرزدارێكى نـەبوو مۆڵـەتى بـدا، يـان لـە قەرزەكـەى سەرى دابشكێنێ، ئەوە خودا ڕۆژى قيامەت دەيخاتە ژێر سێبەرى خۆيەوە.

ئەمجار پەروەردگار ئايەتى ريباى بەم ئامۆژگارييە كاريگەرە كۆتايى پێ هێنا، كە ئەگەر موسوڵمان گوێى بۆ بگرێ ماڵبەخشينى بەلاوە ئاسايى دەبێ‌و چى لـە جيهانـدايـە بەلايەوە بێ بايـەخ دەبـێ‌و ئەگـەر هـەمووى هـى ئـەو بـێ‌و بيبـەخشێ شـتێكى ئاسـايى دەبێ، سەير بكە چۆن كۆتايى بە ئايەتەكە دێنێ‌و دەفـەرموێ: ﴿وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَـى اللَّـهِ﴾ بترسـن لـە ناخۆشـى ئـەو ڕۆژە سـامناكەى كـە غـەم‌و پـەژارەى دونيـاتـان ــ لەترسى حيساب‌و لێكۆڵينەوە ــ لە بيردەچێتەوە بترسن لە ڕۆژێكـى سـامناك‌و گـەورەى وەها كە ئێوە تێيدا دەگەڕێنەوە بۆ لاى خـوداو لەسـەر كردارەكانتـان حيسـابتان لەگـەڵ دەكاو سزاو پاداشتان دەداتەوە؛ لەسەر چاكە پـاداش‌و لەسـەر خراپـە سـزاتان دەدا ﴿ثُـمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ﴾ ئەمجار هەموو كەسێك لە خێرو شەڕ شـياوى چـى بـێ وەرى

دەگرێ، هیچ ستەمیان لێ ناکرێو لە پاداشی کرداری چاکتان کەم ناکرێتەوەو لە ڕێژەی سزاشتان زیاد ناکرێ!!

ئیبنو جورمیج دەڵێ: ئایەتی ﴿وَاتَّقُواْ يَوْمًا﴾ نۆ شەو پێش لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هاتۆتە خوارێ، ئیبنو جوبەیرو موقاتیل دەڵێن: حەوت ڕۆژ لە پێش لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هاتۆتە خوارێ، هەندێکی تر دەڵێن: سێ شەو، بڕێکیش دەڵێن: سێ سەعات پێش لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر نازڵ بووە، عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەڵێ: لە نێوان هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتەو لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سیو یەك ڕۆژ بووە.

شایانی باسە کە پەروەردگار سوودی بە چوار قۆناغ حەرام کردووە، وەکوو چۆن عەرەقخواردنەوەشی بە چوار قۆناغ یاساغ کردووە، ئایەتی یەکەم کە دژی ڕیبا دەدوێ لە مەکە هاتۆتەخوارێ، ئایەتەکانی تر لە مەدینە هاتوونەتە خوارێ...

## ئەمەش قۆناغەکانی حەرام کردنە!!

**١- قۆناغی یەکەم**: پەروەردگار لە مەکە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا آتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَ فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلَا يَرْبُو عِندَ اللَّهِ – الروم/٣٩﴾. هەر لە مەکە دەربارەی عەرەقخواردنەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا – النحل/٦٧﴾. لەهەردوو ئایەتەکاندا تەمهیدو ڕێخۆشکردن هەیە بۆ حەرامکردنو یاساغ کردن ئاماژەیان تێدایە بۆ دوورکەوتنەوە لە ڕیباو عەرەقخواردنەوە.

**٢- قۆناغی دووەم**: قورئانی پیرۆز چیرۆکی ئەو جوولەکانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە ڕیبایان لێ حەرام کرابوو کەچی گوێیان بە نەهییەکە نەداو هەر لەسەر ڕیباخواردن بەردەوام بوون، ئیتر خودا سزای دانو تۆڵەی سەرپێچی کردنەکەیانی لێ ستاندن،

دەفـەرموێ: ﴿وَأَخْـذِهِمُ الرِّبَـا وَقَـدْ نُهُـواْ عَنْـهُ- النـساء/١٦١﴾. بـۆ قەدەغـە کردنـی عەرەقخواردنەوەش دەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَـافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِـن نَّفْعِهِمَـا – البقـرة/٢١٩﴾. هـەردوو ئایەتـەکان هەڕەشـەو بـۆنی حەرامکردنیان تێدایە.

٣- **قۆناغی سێیەم**: پەروەردگار نەهی کرد لە ریبای فاحیش‌و دوو چەندانەو چەند چەندانە فـەرموی: ﴿يَا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـواْ لاَ تَـأْكُلُواْ الرِّبَـا أَضْـعَافًا مُـضَاعَفَةً – آل عمـران/ ١٣٠﴾. ئەمـەش دەق وەکـوو قۆنـاغی سـێیەمی عەرەقخواردنـەوە وایـە: کـە دەفـەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى حَتَّىَ تَعْلَمُـواْ مَـا تَقُولُـونَ- النساء/٤٣﴾.

هـەردوو ئایەتەکـە نـەهی ئاشـکرایان تێدایـە؛ ئایـەتی ریبـا نـەهی تێدایـە، لـە شـێوەیەك لـە شـێوەکانی ریبـاخواردن ئـەویش ریبـا وەرگرتنـە بـە شـێوەیەکی دووچەندانەو زیاتر. ئایەتی (خەمر)یش نەهی لە خواردنەوەی عەرەق دەکا لە کاتێکدا کە ئەو کەسە دەیەوێ نوێژ بکا!

٤- **قۆنـاغی چـوارەم**: حـەرامکردن‌و یاسـاغ کردنـی سەرتاسـەرییە بـۆ ریباوەرگرتن‌و عەرەقخواردنەوە، ئەوەتا لەم ئایەتەدا پەروەردگار نـەهی لـەوە دەکا کـە قەرز لەسەر قەرزدارەکە زیاد بکاو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُـواْ اللّـهَ وَذَرُواْ مَـا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ دەربارەی عەرەق خواردنەوەش پـەروەردگار فـەرمانی بـە موسـوڵمانان کـرد کـە بـە هـەموو شـێوەیەك‌و لـە هـەموو کـات‌و سـاتێکدا خۆیـان لـە عەرەقخواردنەوە بپارێزن‌و پێیان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَـا الْخَمْـرُ وَالْمَيْـسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الـشَّيْطَانِ فَـاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُـمْ تُفْلِحُـونَ – المائـدة /٩٠﴾.

**نووسینی قەرزو شایەتی تێداگرتن، بارمتە تێدا وەرگرتن**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَلَا يَأۡبَ كَاتِبٌ أَن يَكۡتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ فَلۡيَكۡتُبۡ وَلۡيُمۡلِلِ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ فَإِن كَانَ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ وَلَا يَأۡبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْۚ وَلَا تَسۡـَٔمُوٓاْ أَن تَكۡتُبُوهُ صَغِيرًا أَوۡ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقۡوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَرۡتَابُوٓاْ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةٗ تُدِيرُونَهَا بَيۡنَكُمۡ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَلَّا تَكۡتُبُوهَاۗ وَأَشۡهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعۡتُمۡۚ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٞ

وَلَا شَهِيدٌ وَإِن تَفْعَلُوا فَإِنَّهُ فُسُوقٌ بِكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (٢٨٢) ۞ وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ (٢٨٣) ﴾.

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار باسی بەخشین و پارمەتیدانی هەژاران و پاداشی بەخشندەیی کرد، باسی ریباو زیانەکانی کرد، دوا بەدوای ئەو باسانە باسی قەرزدان و دەستگرتنی ئەو کەسانەی کرد کە ئاتاجیان پێیەتی – بەبێ سوودو زیادە وەرگرتن لێیان – دەکاو روونی دەکاتەوە، باسی فرۆشتنی کالاو بە قەرزدانی و رێگەی چەسپاندن و تۆکمەکردنی ئەو مامەڵەیان بۆ دیاری دەکا، بۆ ئەوەی مافی هیچ کامێك لە خاوەن قەرزو قەرزدار پێشێل نەکرێ و مامەڵەی چۆنەو چۆن رێك کەوتوون ئاوا نووسەرێك بۆیان بنوسێ و شایەتی لەسەر بگیرێ و واز لە مامەڵەی ریبائامێز بهێندرێ و، موسوڵمانان روو بکەنە خێرکردن و قەرزدان و پارمەتیدانی خاوەن ئاتاجان و رەحم و بەزەیی بکەنە رەفتاری خۆیان و هاریکاری یەکتری بکەن و فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ﴾ ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوەو موسوڵمانن! ئەگەر مامەڵەی کرین و فرۆشتنتان کردو قەرزی تێکەوت و کەوتە (ذمة)وە، جا فرۆشتنی شتێکی حازر بە پارەیەکی قەرز بوو، یان فرۆشتنی کالایەك بوو

بە پارەی حازر کە لەوە دوا ئەو کاڵایە تەسلیم بکرێ. - بەمەرجێ جینسو ئەندازەو چۆنیەتی ئەو کاڵایە لە سەوداکەدا روون بکرێتەوە – کە بەعەرەبی پێی دەگوترێ: سەلەم. یان برێ پارەتان دا بەقەرز بۆ ماوەیەك، ئەوە لەم حاڵانەدا وا باشە چۆنیەتی مامەڵەکەو جۆری رێکەوتنو سەوداکە بنوسرێ، ماوەی قەرزەکە بە رۆژو مانگو ساڵ دیاری بکرێ، بە جۆرێك کە کاتی وەرگرتنەوەی قەرزەکە – چ کاڵا بێ یان پارە – دیاربێ، هیچ تەمولێلییەکی تێدا نەمێنێ ﴿وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ﴾ با ئەو نووسەرەی قەباڵە نامەکەتان بۆ دەنووسێ دادپەروەربێو بەیەکسانو یەك چاو سەیری سەوداکەرەکان بکاو، نەچێ قەباڵەکە وا بنووسێ زیانی لایەکی تێدا بێو سوودی لایەکی تێدا بێ، دەبێ نووسینەکەی مانای روونو ئاشکرای هەبێ، خۆ بپارێزێ لەو شتانەی کە زیاد لە مانایەك دەبەخشن، نووسەری قەباڵە، وەکوو قازیو دادوەر وایە لە نێوان خاوەن قەرزو قەرزداردا، ئەمەش ئەوە دەخوازێ کە نووسەر ئەمینو عادڵ بێ، ﴿وَلَا يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللَّهُ﴾ نابێ نووسەر سەرپێچی بکا لە نووسینی قەباڵە بەو شێوەی کە خودا فێری کردووە، زیادو کەمی تێدا نەکاو شتێك نەنووسێ زیانی لایەكو سوودی لایەکەی تری تێدابێ، نووسین نیعمەتێکی خوداییە دەبێ نووسەر سوپاسگوزاری ئەو نیعمەتە بێ؛ سوپاسگوزارییەکەشی بەوە دەبێ کە داوایان لێکرد بۆ نووسینی قەباڵەو سەنەدێك گیرنەبێو سەرپێچی نەکا، مەرجیشە دەبێ نووسەر زاناو شارەزای حوکمە شەرعییەکان بێو دەبێ مەرجە ئاساییەکانی تێدابێ، واتە: دەبێ نووسەر دادوەرو زانابێ، هەرکاتێ داوای لێکرا قەباڵە بنووسێ ئامادەباش بێ ﴿فَلْيَكْتُبْ﴾ با قەباڵەکە بنووسێو هیچ گیرییەك پیشان نەدا، بەتایبەتی ئەگەر مامەڵە چییەکان نەخوێندەواربن، ﴿وَلْيُمْلِلِ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ﴾ دەبێ قەرزارەکە؛ ئەو کەسەی قەرزەکەی دەکەوێتە سەر ناوەڕۆکی قەباڵە نامەکە بۆ نووسەرەکە بڵێ: تا ببێتە بەڵگە لەسەریو بەدەمی خۆی دان بەقەرزارییەکەیدا بنێو ئەندازەو مەرجو ماوەکەی دیاری بکا، چونکە ئەو خۆی بەرپرسیارە لە جێبەجێ کردنی ئەو قەباڵە نامەیە ﴿وَلْيَتَّقِ اللَّهَ

رَبَّهُ﴾ با ئەو قەرزدارە لەخودا بترسێو چی لەسەرە بەتەواوی بیڵێ ﴿وَلاَ يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئًا﴾ هیچی لێ کەم ناکاتەوە، بەتەواوی ئەندازەی قەرزەکەو ماوەو مەرجەکانی روون بکاتەوە ﴿فَإن كَانَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لاَ يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ بِالْعَدْلِ﴾ ئەگەر قەرزدار نەفامو کەم هۆش بوو، یان منداڵ بوو، یان پیری خەڵەفاو بوو، یان نەزان بوو نەیدەتوانی ناوەڕۆکی قەباڵە نامەکە بەڕێکو پێکی بۆ نووسەر رەتبکاتەوە، پێویستە وەلیو سەرپەرشتیارەکەی یان وەکیلو موتەرجیمەکەی دادوەرانە ئەم ئەرکە ئەنجام بدەن، هیچ کەمو کوڕی تێدانەکەن، ﴿وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ﴾ داوا بکەن دوو پیاوی موسوڵمانو عادل ئاگاداری مامەڵە بەقەرزەکە بنو، ئاگاداری ناوەڕۆکی قەباڵەکەبن ﴿فَإن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ﴾ ئەگەر دوو پیاوی رێکو پێك دەست نەکەوتن با پیاوێكو دوو ژن ببن بەشایەد لەسەر سەوداکە ﴿مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء﴾ لەوانەی لەبارەی ئایینو عەداڵەتکاریو هەڵسو کەوتیان لێیان رازینو دەزانن بەکاری شایەتیدانەکە دێن؛ بۆیەش مەرجی لێ رازی بوون بۆ شایەتی ئافرەت داناوە، چونکە ئافرەت بۆ شایەتیدان زەعیفەو خەڵکی تر کەمتر متمانەیان پێیەتی، لەبەرئەوە بوونی بەشایەت پێویستی بە رەزامەندی سەوداکەرەکان هەیە، بۆیەش لەشوێنی پیاوێك دوو ئافرەتی دیاری کرد ﴿أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى﴾ لەترسی ئەوەی کە یەکێکیان رووداوەکەی لەبیر چووەوە ئەویتریان بیری بێنێتەوە، چونکە زۆرجاران وادەبێ ئافرەت رووداوەکەی بۆ قۆرخ (ضبط) ناکرێو خۆی پێوە هەڵەوگیر ناکا، وێدەچێ لەکاتی شایەتیدانەکەیدا هەڵەی تێدابکا، بۆیە پێویستە دوو ئافرەتبن، بۆئەوەی هەریەکەیان رووداوەکە بیر ئەویتریان بخاتەوە، ئیتر شایەتی ئەمیان دەبێتە تەواوکەری شایەتی ئەویتریان!

بەکورتی لەبەرئەوەی کە هەریەکێك لەدوو ئافرەتەکان گومانی ئەوەیان لێ دەکرێ هەڵە بکەنو سەریان لێ تێك بچێو نەتوانن – وەکوو پێویست – شایەتییەکە ئەنجام بدەن، بۆیە پێویست بوو دوو ئافرەت لەشوێنی یەك پیاو دابنرێن! بۆئەوەی

ئەگەر یەکێکیان شتێکی لەشایەتییەکە پەڕاندو لەبیری چووبۆوە ئەویتریان بیری بخاتەوەو شایەتییەکە تەواوبێ!

پێویستە قازی بەرامبەر بەیەك، شایەتی لەدوو ئافرەتەکان وەربگرێ‌و هەریەکەیان بە ئاگاداری ئەویتریان بەشێك لەڕووداوەکە بگێڕنەوە!! بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ زۆر لەدادوەرو قازییەکان – لەبەر نەزانی – گوێ بەم لایەنە نادەن‌و ژێر لێوی دەخەن! بەپێچەوانەوە ئەگەر شایەتەکان پیاو بوون پێویستە جیا بەجیا شایەتییەکەیان لێ وەربگیرێ، ئەگەر یەکێکیان شایەتیدانەکەی لاوازبوو، وەکوو پێویست نەیتوانی شایەتی بدا، ئەوە بڕوا بەشایەتییەکەی ناکرێ‌و شایەتیدانی ئەوی تریش بە نەزەری ئیعتیبار وەرناگیرێ.

ئەمەش نهێنی تەشریعی ئیسلامییە کە لەجیاتی پیاوێك دوو ئافرەتی داناوە بۆ شایەتی، چونکە لەکۆمەڵگای ئیسلامیدا واباوە کە ئافرەت خەریکی مامەڵەی ماڵ‌و دارایی نەبێ، خۆ بەکێشەو نیزاعی ماڵ‌و سامانەوە هەڵەوگیر نەکا! ئیتر بیرو هۆشی خۆی تەرخان نەکاتە سەر ئەو لایەنە، بەپێچەوانەی کاروباری ناو ماڵ‌و پەروەردەکردنی منداڵ‌و ڕێکخستنی ماڵ‌و خێزان، کە بیرو هۆش‌و توانای ئافرەت تێیاندا لەهی پیاو بەهێزترە.. زانیاری‌و توانای ئافرەت لەبواری غەیری پەروەردەی منداڵ‌و ئیش‌و کاری ناو ماڵ‌و ئەرکە سروشتییەکانی خۆی زۆر کەمەو گرنگیدانی بە غەیری ئەو لایەنە لاوازە.

پێویستە ئاماژە بۆئەوەش بکەین کە کارکردنی ئافرەت لەم ڕۆژگارەدا لەکاروباری بانق‌و مامەڵەی کڕین‌و فرۆشتن هیچ لەم حوکمە ناگۆڕێ، چونکە ئیعتیبار بەزۆرینەیە نەك بەکەمینە!!

لەلایەکی ترەوە هەرچەندە لەم ڕۆژگارەدا پلەو پایەی ماڵی‌و ئیداری دراوە بە ئافرەت‌و لەزۆر بواردا کاردەکا، کەچی تاقە تاقە نەبێ پێشکەوتوویی بەدەست نەهێناوە، زیاد لەوەش هەرگرنگی دەدا بەوکارەی پێی دەسپێرێ‌و گوێ ناداتە کێشەو نیزاعی ئابووری‌و ڕامیارییە گشتییەکان‌و لەو بوارانەدا پسپۆرییەکی هەمە چەشنە

پەیداناکاو، پێشکەوتوویی بەدەست ناهێنێ‌و، هەر حەزی لەکارکردنە لەبواری ئەرکە سروشتییەکانی خۆیداو، پێی خۆشە پسپۆڕبێ لە بەڕێوەبردنی ئیش‌و کاری ناو ماڵ‌و پەروەردە کردنی منداڵ‌و ئەو بوارانەی کە لەگەڵ فسیۆلۆجی خۆی دەگونجێنێ؛ وەکوو بواری پەروەردەو پزیشکی‌و رستن‌و چنین‌و دوورین....

ئەمجار قورئان سەرنجی ئادەمیزاد رادەکێشێ بۆ لای شتێکی تری گرینگ‌و دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يَأْبَ الشُّهَدَاء إِذَا مَا دُعُواْ﴾ واتە: نابێ شایەتەکان سەرپێچی بکەن لە ئامادەبوون بۆ شایەتیدان، بەڵکوو پێویستە شایەت کە بەشایەت گیرا، بەڕێك‌و پێکی رووداوەکە تێبگاو بەباشی سەرنجی بداتێ، ئەمجار کاتی پێویست بچێ لەبەردەم قازی‌و دادوەردا بەڕێك‌و پێکی شایەتییەکەی ئەدا بکا!

ئیمامی رەبیع دەفەرموێ: ئەم ئایەتە کاتێ هاتۆتە خوارێ کە هی وا هەبوو بەناو خەڵکدا دەگەڕا بۆ شایەتیدان‌و کەسی دەست نەدەکەوت! هەندێکیش دەڵێن: مەبەست ئەوەیە؛ کە کەسێ داوای لێکرا ببێتە شایەت، نابێ نکۆڵی لێ بکاو، کاتی شایەتیدانەکەشی نابێ نکۆڵی بکا. سەرپێچیکردن لەشایەتی هەڵگرتن‌و شایەتیدان حەرامەو دەبێ بەدڵ فراوانییەوە بەرەو پیرییان بچێ. ﴿وَلاَ تَسْأَمُوْاْ أَن تَكْتُبُوْهُ صَغِيرًا أَو كَبِيرًا إِلَى أَجَلِهِ﴾ تەمەڵی مەکەن‌و بێزاری دەرمەبڕن لەوە کە قەرزەکە کەمە یان زۆرە، بچووکە یان گەورەیە، ئێوە قەباڵەکەی بنووسن لەگەڵ دیاریکردنی کاتی دانەوەیشیا.. یان ئەگەر خاوەن مامەڵەکان داوایان لێکردن بۆ نووسینی قەباڵەکە هەر لەیەکەم رۆژی مامەڵەکەوە هەتا رۆژی دانەوەی قەرزەکە هەرکاتێ داوایان لێکردن بۆ نووسین – قەرزەکە کەم بێ یان زۆر – ئەوە سەوداکەیان بۆ بنووسن! ئەم جەختکردنەوەو پێداگرتنە بەڵگەیە لەسەرئەوە کە نووسین بەڵگەیەکی بایەخدارە ئەگەر مەرجەکانی دەستەبەر ببن، هۆیەکی گرنگە بۆ چەسپاندنی مافی ئادەمیزادان.

ئەمە کە پەروەردگار دەفەرموێ: قەرز کەم بێ یان زۆر، دەبێ بنووسرێ‌و تەمبەڵی تێدا نەکرێ، بۆئەوەیە مافی بازرگان‌و سەوداکەران نەفەوتێ ئەمەش یاسایەکی پێشکەوتووی ئابووری رۆژگاری ئەمڕۆیە، ئەوەتا ئەمڕۆ هەموو مامەڵەو

سەودایەك لە دەفتەری تایبەتیدا دەنووسرێ‌و ئەندازەو جۆرەکانی دانەوەی دیاری دەکرێ؛ دادگا ئەو نووسینە بە بەڵگەی چەسپێنەرو بەهێز وەردەگرێ. ﴿ذَلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ اللّهِ﴾ نووسینی ئەم قەباڵەیە بەشێوەیەکی رێك‌و پێك، عەداڵەت‌و راستکاری زۆرترە لەوە کە هەر بەشایەتی لەسەرگرتن کیفایەت بکەن. ﴿وَأَقْومُ لِلشَّهَادَةِ﴾ یارمەتیدەریشە بۆ راستکردنەوەی لارو وێری شایەتیدانەکە! چونکە وادەبێ شایەتەکان چۆنیەتی مامەڵەکەیان لەبیر نامێنێ‌و بەنووسینەکە وەبیریان دێتەوە. ﴿وَأَدْنَى أَلاَّ تَرْتَابُواْ﴾ بە نووسینەکە شایەتییەکەیان لەڕاستی نزیکتر دەبێ‌و، لە ناڕاستی دوور دەکەوێتەوە، شك‌و گومانی نامێنێ لە دیاریکردنی توخمی قەرزەکەو نەوع‌و ئەندازەو ماوەی، ئەمەش بەڵگەیە لەسەرئەوە کە شایەتەکان مافی ئەوەیان هەیە پێش شایەتیدانەکەیان داوای بینینی قەباڵە نامەکە بکەن‌و چاوێکی پێدا بخشێننەوە، یان بۆیان بخوێننەوە بۆئەوەی بەباشی چۆنیەتی مامەڵەکەیان وەبیر بێتەوە.

﴿إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلاَّ تَكْتُبُوهَا﴾ واتە: نووسینی مامەڵەکە پێویستە مەگەر ئەو مامەڵەیە بازرگانییەك بێ لەنێوان سەوداگەرەکاندا بکرێ‌و حازر بەحازربێ‌و قەرزی تێنەکەوێ، پارە بدەن‌و کاڵا وەربگرن، ئەوە ئەوکاتە ئەگەر نەینووسن گوناحتان ناگاتێ، چونکە لەو حاڵەدا هیچ کێشەو نیزاعێك چاوەڕوان ناکرێ، خاوەن کاڵا شت دەداو بەنەخت پارە وەردەگرێ، ئیتر چ پێویستی بە نووسین نییە، بەڵام ﴿وَأَشْهِدُوْاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ﴾ لەسەودای بەحازریش شایەتی رابگرن، چونکە رێدەکەوێ لەبڕێ سەودادا دوای تەواوبوونی مامەڵەکە کێشەو نیزاع روودەداو مامەڵە چییەکان پێویستیان بەشایەتیدانی شایەتەکان ببێ! بەڵام قەرزی درێژ خایەن چونکە وادەبێ دوای مردنی شایەتەکان کێشەی تێدا روودەدا، بۆیە پێویستە مامەڵەکە بنووسرێ. ﴿وَلاَ يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلاَ شَهِيدٌ﴾ با نووسەری قەباڵەکەو شایەتەکان زیان بە مامەڵە چییەکان نەگەیەنن، زیادو کەمی لە ئەندازەو ماوەی قەرزەکەو مەرجەکانی نەکەن، هەروەکوو چۆن دروست نییە بۆ سەوداگەرەکان کە

زیان بە نووسەرو شایەتەکان بگەیەنن نەچن بە بەرتیل‌و بەرتیلکاری داوا لەشایەتەکان بکەن، کە شایەتییەکەیان ئەنجام نەدەن، یان شێوەکەی بگۆڕن، نابێ زۆریان لێ بکرێ بۆئەوەی گۆڕانکاری لە نووسینەکەدا، یان لە شایەتیدانەکەدا بکەن، پێویستە رووداوەکە چۆنە ئاوا بنووسرێ‌و شایەتیشی هەرئاوا لەسەر بدرێ! ﴿وَإِن تَفْعَلُواْ فَإِنَّهُ فُسُوقٌ بِكُمْ﴾ زیان گەیاندن بە مامەڵە چییەکان، یان بەشایەت‌و نووسەرەکە، لادانە لە ئایینی پاکی ئیسلام‌و سەرپێچی کردنە لەڕاستی‌و عەدالەت‌و حەق!!

﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللّهُ﴾ خۆتان لەسزای خودا بپارێزن، هەرچی فەرمانی بەکردنی کردووە ئەنجامی بدەن، هەرشتێکیش نەیی لێکردووە توخنی مەکەون، بەرێکیش لەو شتانەی نەیی لێکردووە زیان گەیاندنە بە نووسەرو شایەتی مامەڵەکانتان. خودا فێری ئەوەتان دەکا کەچۆن دەقی ئەو قەباڵە نامانە بنووسن ﴿وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ ئاگاداربن‌و وریابن کەس کارتان تێنەکاو لەشایەتیدان‌و خوێندنەوەی قەباڵە نامەدا گۆڕانکاری مەکەن!

چونکە خودا ئاگاداری هەموو شتێکەو هیچی لێ گوم نابێ، ئاشکراو نهێنیتان دەزانێ، ئاگای لەهەموو هەڵس‌و کەوت‌و مەبەستێکتانە.

﴿وَإِن كُنتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُواْ كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ﴾ ئەگەر ئێوە لەکاتی مامەڵە کردنەکەتاندا لەسەفەردا بوون، نووسەرو قەڵەم‌و دەفتەرو کاغەزتان دەست نەدەکەوت، ئەوە دەتوانن بارمتەیەك وەربگرن‌و لای خۆتان گلی بدەنەوە تا حەقی خۆتان وەردەگرنەوە، ئەمە لەکاتێکدا کەئێوە دڵنیا نەبن لەو کەسانەی مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن‌و بەقەرز شتیان دەدەنێ ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللّهَ رَبَّهُ﴾ ئەگەر بازێکتان هەبوو دڵنیابوو کە ماڵەکەی ناخورێ‌و لەکاتی خۆیدا بابای قەرزدار قەرزەکەی دەداتەوە، ئەوە بارمتە وەرگرتن پێویست نییە!! بەڵام پێویستە قەرزدار بتمانەی خۆی پارێزگاری بکاو، ئەو بتمانەیەی کە خاوەن قەرز پێی هەبووە بەبێ بارمتە کاڵای داوەتێ نەهێڵێ ئەو بتمانەیەی بفەوتێ، لەخوا بترسێ‌و خیانەتی لێ نەکا؛ دوایی نەڵێ: جاخۆ شایەت‌و بەڵگەی بەدەستەوە نییەو ئینکاری دەکەم، چونکە

خودا شاهیدەو ئاگاداره پێویسته لەئەو بترسن. بۆیەش لەم رستەیەدا قەرز بە ئەمانەت ناو بردووه که دەفەرموێ: ﴿فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ﴾ چونکه خاوەن قەرز لە قەرزدارەکە دڵنیاو ئەمین بووه بارمتەی لێ وەرنەگرتووه.

پێویسته ئەوەش بگوترێ: که ئەو دەقانەی قورئان که نووسینو شایەتی گرتنو بارمته وەرگرتن بە پێویست دادەنێن ئەصڵو بنەماو عەزیمەتن، بۆ زیاده دڵنیابوونه لە نەفەوتانی قەرز، ئەم دەقەی که رێگای دا لەکاتی سەفەرو پێویستیدا واز لەنووسین بێنین، یان بارمتەی لێ وەرنەگرین ئەوه روخصەتەو چاوپۆشی لێکراوه!!

﴿وَلاَ تَكْتُمُواْ الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ﴾ ئێوەش ئەی شایەتەکان! ئەگەر بانگکران بۆ شایەتیدانو داواتان لێکرا، شایەتییەکی کەلاتانە مەیشارنەوه، مامەڵەو رووداوەکە چۆنە ئاوا شایەتی لەسەربدەن، هەرکەسێك شایەتی بشارێتەوه ئەوه گوناهبارەو تاوان دەکا.

بۆیەش ئەم جەختەی لەسەر نەشاردنەوەی شایەتی کردووه، چونکه نووسەری قەباڵەو شایەت هۆکاری بارمەتیدەرن بۆ پاراستنی مافی بازرگانان.. بۆیە لەسەریان پێویسته کەهیچ لامجومییەك لە ئەم ئەرکەدا نەکەن. هەروەکوو چۆن پێویسته بازرگانەکان زیان بە شایەتو نووسەری قەباڵەکان نەگەیەنن، چونکه بەرژەوەندی هەموو لایەك لەوەدایە که نووسەرو شایەت وەکوو پێویست ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام بدەن. ﴿وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ هەر شتێك بڵێنو بیکەن، باش بێ یان خراپ، ئاشکرابێ یان نهێنی خودا زاناو ئاگاداره بەسەریداو دەزانێ بەچ مەبەستێك ئەو کارەتان ئەنجام داوه سزاو پاداشی پێویستتان دەداتەوه!!

## فەرمانڕەوایی‌و خاوەنیەتی ئاسمانەکان‌و زەوی هی خودایەو ئاگاداری هەموو شتێکی بوونەوەرە

﴿ لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۗ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٢٨٤) ﴾.

ئەم ئایەتە پیرۆزە تەواوکەرە بۆ کۆتایی دوو ئایەتەکەی پێشوو کە ﴿وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ و ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ن.

بەڵگەیە لەسەرئەوە کە زانستی خودا هەموو شتێك دەگرێتەوە، چونکە کەسێك خاوەنی شتێك بێ‌و دروستیشی کردبێ دەبێ بزانێ چییەو چۆنەو چەندە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ – الملك/١٤﴾.

هەروەها کەسێك خاوەنی شتێك بێ‌و بەدیهێنەریشی بێ بۆی هەیە لەسەر کردەوەکانی ئەو شتە لێپرسینەوەی هەبێ، بۆی هەیە لەسەر شاردراوەیی ناو دڵی بەندەکانی لێکۆڵینەوەی هەبێ، بۆی هەیە بە ئارەزووی خۆی پاداش‌و سزا ئەنجام بدا بەرامبەر کردەوەی بەندەکانی، وەکوو دەفەرموێ: ﴿لِّلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەویدا هەیە، هەمووی موڵکی خودایەو، هەرئەو لە نەبوووەوە بەدی هێناوە، هەر ئەویش بەویست‌و ئیرادەی خۆی تەصەروفیان تێدا دەکاو، کەس هاوبەشی نییە تێیاندا، کەسی تر جگە لەزاتی خۆی شایانی پەرستن نییە، کەس ناتوانێ لە ملك‌و سەڵتەنەتی ئەو دەرچێ، ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ﴾ ئەگەر ئەوەی لەدڵتاندایە: لەخراپەکاری عەزمتان لەسەر کردنیەتی چ کردار چ گوفتاربێ دەری بخەن یان بیشارنەوەو دەری نەخەن ئەوە خودا حیسابتان لەگەڵ دەکاو سزاو پاداشتان دەداتەوە؛ چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە. ﴿فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاء

﴿وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ﴾ ئیتر پاش لێکۆڵینەوەو حیساب لەگەڵ کردن پەروەردگار خۆش دەبێ لەو کەسەی خواستی لەسەربێ‌و، بیەوێ بە رەحمەت‌و گەورەیی خۆی رزگاری ببێ، سزای ئەو کەسە دەدا بیەوێ تۆڵەی لێ بستێنێ..!!

حیساب کردنی بریتییە لەوە بەندەکانی ئاگادار دەکا لە کردەوەکانیان‌و هەرکەسە کرداری خۆی چییەو چی کردووە دەیبینێتەوە، ئەمجا پێیان دەڵێ: بۆچی ئەوەت کردووە؟! بۆچی ئەوەت نەکردووە؟! ﴿وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ خودا بەسەر هەموو شتێکی مووەکیندا بە دەسەڵات‌و توانایەو، هیچ شتێ لە چوارچێوەی دەسەڵاتی ئەو دەرناچێ!

لێرەدا تێبینییەك هەیە؛ ئەویش ئەوەیە: بڕێ لە راڤەکارانی قورئان وەکوو ئیمامی عەلی‌و عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودو (کعب الأحبار)و شەعبی‌و نەخەعی‌و موحەممەدی‌و کوڕی قەتادەو کەسانی تریش پێیان وایە ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە بە ئایەتی ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ لەم رووەوە کە ئایەتی ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ﴾ ئەوە دەچەسپێنێ کە ئادەمیزاد بەرپرسیارە لەسەر خوتووکەی دەروون‌و خەتەرەی دڵ‌و لێپرسینەوەی لەسەرە! ئایەتی ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ ئەوە دەسڕێتەوە.. بەڵام ئەم رایە بەلاواز دادەنرێ چونکە:

١- فەرموودەی پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ﴾ خەبەرو هەواڵە، خەبەریش نەسخ ناکرێتەوە، چونکە نەسخ روودەکاتە جوملەی ئینشائی – فەرمان یان نەهی -، ڕووناکاتە جوملەی خەبەریی.

٢- کرداری دڵ‌و دەروون بەگوێرەی ئایەت‌و حەدیث‌و ئیجماع‌و قیاس، وجوودی هەیەو سزاو پاداشی لەسەرە، جا ئەم کرداری دڵە لەسەر ئەندامانی لەش رەنگبداتەوە یان نا!!

٣- ختووکەی راگوزاریو قسەی نەفس کە نەگاتە پلەی قەصدو عەزم ناچێتە ژێر مەفهوومی ئایەتەکە.

٤- داواکردنی شتێك لە ئادەمیزاد کە لەباریدا نەبێو نەتوانێ ئەنجامی بدا لەگەڵ حیکمەتی خودا یەك ناگرنەوە، واتە: خودا شتێك داواناکا لەمرۆڤ کە لەتوانایدا نەبێ!

٥- لێرەدا مانای نەسخ دەرناکەوێ چونکە نەسخ بریتییە لەگۆڕینی حوکم لەبەر گۆڕانی بەرژەوەندی (مکلف)ەکان دەی خۆ ئەوەی لە نەفسدایە ناگۆڕێو بەگوێرەی رۆژگارو چۆنیەتی کاتو سات گۆڕانکاری بەسەردا نایەت..

## بڕواهێنان بە پەیامی پێغەمبەرانو ئەرك بە ئەندازەی توانا

﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ رَبَّنَا

﴿وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ۖ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ ۚ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾﴾.

پەروەردگار لەسەرەتای ئەم سوورەتەدا باسی قورئانی کرد، ئەمجار هاتە سەر باسی موسوڵمانانو بەراوردی کردن بە کافرو دووروەکان، ئەمجار باسی سەرگوزشتەی جولەکەکانی کردو ئەمجار زۆر حوکمی شەرعی روون کردنەوە وەکوو رۆژوو حەجو نیکاحو تەڵاقو بەگژداچوونەوەی گومڕایانو دەمکوت کردنیان. کۆتایی سوورەتەکەشی بەوە هێنا: کە پێغەمبەری ئیسلامو موسوڵمانان بڕوای پتەویان بە نامە ئاسمانییەکانو پێغەمبەرانی پێش ئیسلام هەیە، ئەوەی روون کردەوە کە پێغەمبەری ئیسلامو پەیڕەوکەرانی بەبێ جیاوازی پێیان وایە هەموو پێغەمبەران راستنو هەموویان لە ئەصڵی پێغەمبەرایەتیو تەشریعدا لەیەك کانو سەرچاوە پەیامیان وەرگرتووە، میسکی کۆتایی سوورەتەکەشی بەوە هێناوە: کە پەروەردگار بە فەضلو گەورەیی خۆی ئەرکی ئاسانو لە تواناداو بووی خستۆتە سەر موسوڵمانانو شتێکی وایان لێ داوا ناکا کە لە توانایاندا نەبێ.

ئەمجار ئەوەشی راگەیاند کە خاوەنی بیرو بڕوای پتەوو هەڵگرانی دروشمی ئیمانو راستی لە ئاکاما سەرکەوتوو دەبن بەسەر کوفرو یارمەتیدەرانی کوفردا. بۆیە دەفەرموێ: ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ﴾ پێغەمبەری ئیسلام بۆ خۆیو موسوڵمانان بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی (محمد) هەیەو بڕوایان بەو نیگاوپەیامە هەیە کە نێردراوە بۆسەر (محمد) کە بریتییە لە عەقیدەو حوکمە شەرعیەکان هەموویان تەصدیقیان کردووە، رەوشتی خۆیان بەو پەیامو نیگایە ئارایشت داوە، بۆیە عائیشە کە لە بارەی رەوشتی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) لێیان پرسی وتی: رەوشتی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) قورئان بوو.. واتە: لە چوارچێوەی قورئاندا بوو...) بێگومان هاوەڵانی پێغەمبەر بەهۆی ئەم ئیمانە پتەوەوە

بوو کە هەمیشە دەروون خاوێنو دڵپاکو وره بەرزو مرۆڤ دۆستو خودا پەرست بوون، توانیان کاری گرنگو سەرسورهێنەر لە مێژوودا تۆمار بکەن، زۆربەی جیهانیان ئازاد کرد، زۆر گەلو نەتەوەیان خستە ژێر رکێفی دەسەڵاتی خۆیانەوە، برایەتیو یەکسانیان خستە ناو گەلەکانەوە رامیارییو مرۆڤایەتییان لەناودا بڵاوکردنەوە، زۆر دادوەرانەو حەکیمانە لەگەڵ ئەو دانیشتوانەدا جوڵانەوە، تەنانەت دوژمنانیش دان بەم راستییەدا دەنێنو مێژووش لە پەڕاوی نەمرانداو بەخەتی زێڕینو لە پلەی ئیمپراتۆرییەتە گەورەکاندا جێگای بۆ دیاری کردوون، چونکە رەورەوەی مێژوویان سەر لەبەر گۆڕی...!!!!

﴿كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ﴾ هەموو ئەو موسوڵمانانە بڕوایان هێناوە بە بوونی خوداو بە تاکو تەنیاییو بە حیکمەتو تواناو دەسەڵاتی لە بوونەوەردا، هەروا بڕوایان هێناوە بە فریشتەی خودا، ئەو فریشتانەی چەندەها ئەرکی گرنگیان پێ سپێردراوەو هەمیشە خەریکی خوداپەرستیو یەکتا پەرستین!! لە لایەن پەروەردگارەوەو دەنێردرێن بۆلای پێغەمبەران.

هەروەها بڕوایان هێناوە بە پێغەمبەرانی بەڕێز؛ ئەو پێغەمبەرانەی کە نامەی ئاسمانییان بۆ نێردراوەو شەریعەتیان بۆ دیاری کراوە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد لە تاریکی نەزانی رزگار بکەنو بییان هێننە سەر رێگای راست. هەمیشە ئەو موسوڵمانانە دەڵێن: ﴿لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ﴾ ئێمە لە بارەی پێغەمبەرایەتیو تەشریعەوە جیاوازی ناخەینە نێوان پێغەمبەرانەوە، پێمان وایە پەیامی هەموویان بریتییە لە ئیقرار کردن بە هەبوونی خوداو تاکو تەنیایی زاتی پاکی پەروەردگار. هەروەها بانگەوازییە بۆ رەوشت بەرزیو مرۆڤایەتی! ئەو زێدە رێزەی کە ئایەتی ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ –البقرة/٢٥٣﴾. دەیگەنێ ئەوە لە لایەنی ترەوەیە، نەك لە بارەی پێغەمبەرایەتیو تەشریعەوەیە. لەم بارەوە هیچ جوداوازییەکیان لە نێواندا نیە.

لەمەشەوە ئاماژە دەکرێ کە موسوڵمانان زێدە رێزیان هەیە بەسەر گەلو نەتەوەکانی تردا؛ ئەو گەلو نەتەوانەی کە بڕوایان بە هەندێ پێغەمبەر هەیەو

بڕوایان بە هەندێکی تر نیە. ﴿وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ موسوڵمانان هەموویان بەیەك دەنگ وتیان: خودایە! پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پەیامی خۆی گەیاند ئێمەیش پەیامەکەیمان بیستو لێی حاڵی بووینو وەرمان گرت. فەرمانبەرداری فەرمانەکانی ئاینیین! بڕوامان وایە هەموو فەرمانو نەهییەکی ئایین بۆ خۆشبەختی دونیاو قیامەتمان. ئەو موسوڵمانە ڕاستاڵانەی هەمیشە خۆیان خۆیان دادگای دەکەنو نەفسی خۆیان موحاسەبە دەکەن.

هەر کەمو کوڕییەکی هەیان بێ هەوڵ دەدەن قەڵاچۆی بکەنو هەر هەوڵی ڕازی کردنی خودای خۆیانیانە! بۆیە هەمیشە دەڵێن: ﴿غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ خودایە! کەمو کوڕیمان بپۆشە گوناهمان بشارەوە، لە دونیادا ئابڕوومان مەبەو لە قیامەتیشدا سزامان مەدە.. واتە: خودایە! داوات لێ دەکەین کە خۆشبی لەو گوناهانەمان کە لەوانەیە لێمان ڕووبداو ببنە لەمپەڕو کۆسپ لەبەردەم پێگەیشتنو بەختەوەربوونمان، خودایە! ئەتۆ هەڵسووڕێنەری هەموو ئیشو کارێکمانی، گەڕانەوەمان هەر بۆ بەردەم قاپی بارەگای تۆیە، چیت بوێ لەگەڵمان دەکەیو کەس نیە بتوانێ ڕێگەت لێ بگرێ.

جا پەروەردگار دەفەرموێ: هەرچەندە ئەوەی بەدڵیاندا دێ ئاگامان لێیەتیو پێی دەزانین بەڵام ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾. پەروەردگار هیچ کەسێ زیاد لە وزەی خۆی ئەرکی ناخاتە سەرێو، لەهیچ نەفسێ داوای ئەنجامدانی کارێك ناکا کە لە تاقەتیا نەبێ، ئەمەش لوطفو ڕەحمەتی خودایە کە هەر نەفسە بە ئەندازەی وزەو توانای خۆی داوای ئەنجامدانی کاری لێ دەکرێ.

ئەم ئایەتە ئەوەی بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕوون کردەوە کە ئەو موحاسەبەی لە ئایەتی ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ﴾ مەبەست ئەوەیە پەروەردگار هەرچەندە پرسیارو لێکۆڵینەوە لەسەر ختوکەی نەفسو قسەی دڵ بکا، بەڵام کەس لەسەر ئەوە سزانادا، چونکە شتێك کە ئادەمیزاد نەتوانێ بەرگری بکا وەکوو ختوکەی نەفسو قسەی دڵ، ئەوە لێی بەرپرسیار نییە!!

﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ﴾ نەفسی ئادەمیزاد بەختەوەر دەبێ بەو کردەوە باشانەی کردوونی‌و بەردەوام بووە لەسەری، پاداشی باش وەردەگرێ، هەروەکوو چۆن سزای دەدرێ لەسەر هەر کردەوەیەك کە ناهەمواربێ‌و تاوان بێ‌و بەویستی خۆی بیکا.

ئەمجار پەروەردگار بەندەکانی خۆی شارەزایی دەکا بۆ نزاو پاڕانەوە، فەرمانیان پێ دەکا کە بڵێن: ﴿رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ خودایە! سزامان مەدە ئەگەر بەهۆی لەبیرچوونەوە (واجب)و ئەرکێکی سەرشانی خۆمان بەجێ نەهێنا، یان بە نەزانی کردەوەیەکی خراپمان ئەنجام داو لەبیرمان چووبووەوە کە حەرامە، یان ڕێگای ڕاستمان هەڵە کردو نەمانزانی ڕێبازی ڕاست کامەیە؟!!!

﴿رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا﴾ خودایە! باری گران مەخەرە سەر شانمان • با بەزەحمەت بشتوانین ئەنجامی بدەین – وەکوو ئەو ئەرکە قورسانەی کە خستبووتە سەر گەل‌و نەتەوەکانی پێش ئێمە، وەکوو بەنو ئیسرائیل کە وەرگرتنی تۆبە لێیان بە کوشتنی تۆبەکار دەبوو واتە: کەسێك تاوانێکی بکردایەو تۆبەی بکردایە مەرجی قبووڵ بوونی تۆبەکەی کوشتن بوو، هەروەها چواریەکی ماڵ‌و سامانیان دەبوایە بدەن بە زەکات، ئەگەر شوێنێکی پۆشاکیان پیس بوایە دەبوایە بیبڕن!!

بەڵام ئایینی ئیسلام زۆر بار سووکی تێدایەو لەسەر ئاسانکاری دامەزراوە، چۆن وانیە؟! پێغەمبەر بۆ خۆی پێغەمبەری ڕەحمەتەو نێردراوە بۆ سەر سەرجەم ئادەمیزاد..

جابیر دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (بعثت بالحنفية السمحة) ئەو ئایینەی بەمنا نێردراوە ئایینێکی پاك‌و پیرۆزی دوور لە پڕوپووچییە، ئاسان‌و خۆشە، شتی پڕوپووچ‌و بێ کەڵکی تێدا نیە.

﴿رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ﴾ خودایە! ئەرکێك مەخەرە سەر شانمان‌و داوای ئەنجامدانی کارێکمان لێ مەکە کە لەتواناماندا نەبێ، بەڵاو موصیبەتێکمان

بەسەردا مەهێنە کە خۆی بۆ ڕانەگرین، بەشتێك تاقیمان مەکەرەوە کە لە وزەماندا نەبێ!! ﴿وَاعْفُ عَنَّا﴾ خۆش ببە لەو تاوانانەی کە لەنێوان ئێمەو تۆدایە، خۆت پێی دەزانیو ئاگاداری کەمتەرخەمیمانی! ﴿وَاغْفِرْ لَنَا﴾ هەروەها خۆش ببە لەو گوناهانەی کە لەنێوان ئێمەو بەندەکانتدا رووی داوە، مەهێڵە ئادەمیزادان ئاگاداری عەیبو لەکەو تاوانمان بن، بەکردەوەو خراپەکانمان بزانن، خودایە! هەموو تاوانو گوناهمان سڕ پۆش بکەو لای خۆت بیانشارەوەو لێمان خۆشبە. ﴿وَارْحَمْنَآ﴾ رەحممان پێ بکە، لە ڕۆژگاری داهاتوودا تووشی تاوان نەبین، بە تەوفیقی خۆت لە گوناه بمانپارێزەو یارمەتیمان بدە لەسەر ڕێبازی ڕاستی ئایینی پیرۆزت بەردەوام بین، کە دەبێتە هۆی بەختەوەری هەردوو جیهانمان!!

**تێبینی**:

دەکرێ کە ئەم سێ ڕستەیە ﴿وَاعْفُ عَنَّا، وَاغْفِرْ لَنَا، وَارْحَمْنَآ﴾ ئاکامی ئەم سێ ڕستەیەی پێشەوەبن، بەم شێوەیە: ڕستەی ﴿لاَ تُؤَاخِذْنَا﴾ ئاکامەکەی ﴿وَاعْفُ عَنَّا﴾ بوو، ئاکامی ﴿وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا﴾ ڕستەی ﴿وَاغْفِرْ لَنَا﴾ بوو، ئاکامی ﴿وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ﴾ ڕستەی ﴿وَارْحَمْنَآ﴾ بوو.

﴿أَنتَ مَوْلاَنَا﴾ پەروەردگارا! تۆ خوداو خاوەنو بەڕێوەبەری کاروباری ئێمەی، ئەتۆی هیدایەتت داوینو پاڵپشتو یارمەتیدەرمانی بۆ بەردەوام بوون لەسەر ڕێبازی ڕاستو حەقپەرستی!.

﴿فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ زیاد لە ئەو داخوازییانەشمان یارمەتیمان بدە بۆ تێکۆشانو زاڵبوون بەسەر کۆمەڵانی خودا نەناسو کافردا سەرکەوتوومان بکە بەسەریاندا چ لەبواری بەڵگەو نووسینو موناقەشەو گفتوگۆدابێ یان لە گۆڕەپانی شەڕو جەنگدا بێ، خودایە! ئاکام خێرمان بکەو بەختەوەری دونیاو قیامەتمان بکە!

مەعاذ (خوای لێ ڕازی بێ) هەموو کاتێ کە لە خوێندنەوەی ئەم سوورەتە دەبووە دەیگوت: (أمین).

پوختەو گرنگترین ئەو حوکمانەی کە ئەم سوورەتی (البقرة)یە لەخۆی گرتووە ئەمانەن:

## یەکەم: لەبواری عەقیدەو بیروباوەڕدا:

أ- بانگەوازی کردنی هەموو ئادەمیزاد بۆ خودا پەرستیو یەکتا پەرستی.

ب- یاساغکردنی هاوەڵ پەیداکردن بۆ خودا.

ج- چەسپاندنی وەحیو نیگا بۆ پێغەمبەرانو پێغەمبەرایەتی بە بەڵگەی قورئانیو تەحەداکردنی هەموو ئادەمیزاد بەوەی کە ناتوانن سورەتێکی وەکوو ئەم قورئانە بخەنە روو.

د- لەخۆ گرتنی بنەماکانی ئایینو یەکتا پەرستیو چەسپاندنی رۆژی زیندووبوونەوە.

## دووەم: حوکمە عەمەلیو شەرعییەکان:

١- بەرەوا زانینی خواردنی هەر شتێك پاكو خاوێن بێ.

٢- پاراستنی ژیانی ئادەمیزاد لەرێگەی دانانی یاسای تۆڵەسەندنەوەو جەنگان لەدژی کافران.

٣- دەستنیشانکردنی روکنە سەرەکییەکانی ئایینی ئیسلام وەکوو: نوێژکردنو زەکاتدانو بەرۆژوو بوونی مانگی رەمەزانو ئەنجامدانی حەجو عەمرە.

٤-ماڵبەخشین لەرێگەی خودادا بە هەژارانو نەبووان بۆئەوەی باری لاسەنگی فەقیران راست بکرێتەوە، تەکافولی کۆمەلایەتی دەستەبەر بکرێ.

٥- یاساغکردنی عەرەقو قومارو ریبا.

٦- سەرپەرشتی کردنی هەتیوانو ژیان بەسەربردن لەگەڵیاندا.

٧- حوکمە شەرعیەکانی ژنو ژنخوازیو مارەکردنو تەلاقدانو ماوەی شیرپێدانی منداڵو عیدەی ئافرەتو نەفەقەو بژیو.

٨- وەصییەتکردنو چۆنیەتی وەصییەتەکە.

٩- نووسینی قەباڵە نامەو شایەتگرتن لەسەر مامەڵەی قەرزو بارمتە دانانو حوکمی شایەتیدان.

١٠- بەجێهێنانی ئەمانەتو ئەمینی کردن لەهەموو شتێکدا.

١١- شێوەی دووعاو پاڕانەوەو نزاکردن.

هەر لەبەرئەوەی کە ئەم حوکمو یاسایەی لەخۆ گرتوون پێیان گوتووە: (قسطاط القرآن).

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

## سوورەتی ئالی عیمران

ئەم سورەتە سێیەم سورەتە لە تەرتیبی سورەتەکانی قورئاندا. سورەتێکی مەدینەییەو دوای سورەتی (الأنفال) هاتۆتە خوارێو ژمارەی ئایەتەکانی (٢٠٠) دوو صەد ئایەتە بەبێ زیادو کەم.

### ئەو هۆیانەی کە سورەتی (البقرە)و سورەتی (ال‌عمران)ی خستوونە پەنا یەکتریەوەو لێکی چواندون ئەمانەن:

١- هەڵوێستی ئادەمیزاد بەرانبەر بە قورئان: هەردوو سوڕەتەکە بەباسی قورئان دەست پێ دەکەنو هەڵوێستی ئادەمیزاد بەرامبەر ئەو کتێبە پیرۆزە دیاری دەکەن، ئەوەتا لە سوورەتی (البقرة)دا باسی ئەوانەی کردووە بڕوایان بە قورئان هەیەو ئەوانەی باوەڕیان پێی نیە. لە سوورەتی (الـعمران)یش باسی هەڵوێستی ئەوانەی کردووە کە گومانیان تێیایەتیو هەر خەریکی ئەوەن رەخنەی لێ بگرنو ماناکانی هەڵگێڕنەوە، وێڕای هەڵوێستی خوداناسان.

ئەوانەی لە زانستو زانیاریدا قووڵبوونەوە ئیمانیان بەهەموو ئایەتەکانی هەیەو پێیان وایە هەموو ئایەتەکانی (بە موحکەمو موتەشابیهەوە) لەخوداوە هاتوون. هەموویان مانای راستو دروستیان هەیە!!

٢- بەراوردکردنی لەنێوان دروستکردنی ئادەمو عیسادا؛ ئەوەتا لە سوورەتی (البقـرة)دا سەرگوزشتەی دروستکردنی ئادەمی تێدایە، لەم سورەتەش دا لێك چوواندنو شوبهاندنی عیسای بە ئادەم تێدایە لەو رووەوە کە هەردووکیان شێوەی دروستکردنەکەیان بەشێوەی نائاسایی بووە.

٣- بەڵگەهێنانەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی جولەکەو فەلەکان (ئەهلی کیتاب). لە سوورەتی (البقـرة)دا زۆری بەڵگەهێنانەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی جولەکەکانو دەستنیشانکردنی عەیبو عارو کەمو کورییانو هەڵوەشاندنەوەی عەهدو پەیمان!! لە سوورەتی (ال‌عمـران)یشدا بە چڕوپڕی بەرپەرچدانەوەی فەلەکانی تێدایە. لەبارەی مێژووشەوە ئایینی مەسیحی دوا ئایینی جولەکە پەیدابووە!

٤- فێرکردنی شێوەی نزاو پاڕانەوە لە کۆتایی هەردوو سوورەتەکاندا: لە سوورەتی (البقـرة)دا نزاو پاڕانەوەکە بەشێوەیەکە کە بگونجێ لەگەڵ سەرەتاو پەیدابوونی ئاییندا و پەیوەندی بە بنەماکانی تەشریعەوە هەیەو لایەنە تایبەتییەکانی ئایین دیاری دەکاو ئەوە دەچەسپێنێ کە ئایینی ئیسلام بار سووکی تێدایەو ئاسانکاریو لێبوردوویی لەخۆ گرتووە، لە سوورەتی (ال‌عمـران)یشدا نزاو پاڕانەوەی تێدایە بۆ بەردەوام بوونی لەسەر ئایینو قبوولکردنی بانگەوازی پەروەردگار بۆ ئیمان هێنانو داواکردنی پاداش لەڕۆژی قیامەتدا.

٥- چەسپاندنی سەرکەوتن بۆ موسوڵمانان: ئەوەتا لە سوورەتی (ال‌عمـران) بەم ئایەتە کۆتایی پێ هێنراوە کە دەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾، سوورەتی (البقرة)ش بەم ئایەتە دەست پێدەکات کە دەفەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ عَلَى هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾.

## ئەو پەیامو مانایانەی کە ئەم سوورەتە لەخۆی گرتوون

ئەم سوورەتە هەردوو لایەنی عەقیدەو تەشریعی لەخۆ گرتووە:-

لەبارەی عەقیدەوە ئایەتەکانی ئەم سوورەتە جەخت لەسەر تاكو تەنیایی خودا دەکەنەوە، هەبوونی پێغەمبەرایەتیو راستی قورئان دەچەسپێنن، شوبهەو شكو گومانی کۆمەڵی جولەکەو فەلە پوچەڵ دەکاتەوە، راوو بۆچوونی هەڵەی ئەهلی کیتاب دەربارەی قورئانو پێغەمبەرایەتی (محمد) (دروودی خوای لەسەر بێ) رەت دەکاتەوە، ئەوە رادەگەیەنێ کە ئایینی پەسەند لای خودا ئایینی ئیسلامەو بەس!

هەروەها موناقەشە کردنی کۆمەڵی فەلە دەربارەی حەزرەتی مەسیحو بەخودا زانینیو بڕوا نەهێنانیان بە پەیامی ئیسلام.

ئەم موناقەشەو ئەو پەرچدانەوەی بیرو رای فەلەکان نزیکی نیوەی سورەتەکەی داگرتووە، هەروەکوو چۆن سورەتی (البقرة) زیاد لە سێیەکی دەربارەی موناقەشەو پووچەڵکردنەوەی راوو بۆچوونو دەست نیشانکردنی تاوانو خراپەکاریەکانیانە، وێڕای ئەوەش سەرزەنشتو هەڕەشە کردنە لێیانو ترساندنی کۆمەڵی موسوڵمانانە لە فێڵو تەڵەکەو پیلانەکانیان!

لەبارەی تەشریعیشەوە ئایەتەکانی ئەم سوورەتە بڕێ حوکمی شەرعی دیاری کردووە، وەکوو (واجب) بوونی حەجو جیهادو تێکۆشان لەرێگەی ئیسلامدا، وێڕای جەخت کردن لە یاساغکردنی ریباو سزادانی ئەوانەی کە زەکات نادەن، هەروا بڕێ پەندو دەرسو ئامۆژگاری وەرگرتن لە غەزای بەدرو ئوحودو نارەزایی دەربڕین لە هەڵوێستی دووڕووەکان (المنافقین) کە هەمیشە وەکوو گیاکەڵە وابوون لەناو کۆمەڵگای ئیسلامدا.

ئەمجار کۆتایی سورەتەکە بەشتێك هاتووە کە لەگەڵ هەردوو لایەنی عەقیدەو تەشریعدا گونجاوە: کە بریتییە لە تێفکرینو وردبوونەوە لە دروستکردنی ئاسمانەکانو زەویو ئەو هەموو شتە عەجایبو سەر سوڕهێنەرانەی کە لەم بوونەوەرەدا هەن، وێڕای وەصییەتو ئامۆژگاری کردنی موسوڵمانان کە خۆڕاگربن لە

گۆڕەپانی جیهادو جەنگ دژی کافران‌و بەردەوام بوون لەسەر تێکۆشان بۆئەوەی بگەنە پلەی فەلاح‌و سەرکەوتن وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾.

## هۆی ناونانی ئەم سوورەتە بە (آل عمران)

ئەم سوورەتە ناونراوە بە: سوورەتی ئالی عیمران چونکە چیرۆکی خێزانی عیمرانی تێدایە کە باوکی مەریەمی دایکی عیسایە، هەروا سەرگوزشتەی پەروەردەکردنی مەریەم کە دایکی بۆ خودا پەرستی تەرخانی کردبوو، هەروەها باسی دەستەبەر بوونی خواردەمەنی بۆ حەزرەتی مەریەم لەلایەن خوداوەو هەڵبژاردن‌و زێدە ڕێز پێدانی بەسەر هەموو ئافرەتانی ڕۆژگاری خۆیدا، وێڕای مزگێنی پێدانی بەوە کە منداڵێکی پیرۆزی دەبێ، ناوی عیسایەو خاوەنی موعجیزاتی زۆر دەبێ!!

سورەتی (البقرة) و (آل عمران) پێشیان دەگوترێ (الزهراوين) چونکە پرشنگدارن‌و شارەزایی خوێنەر دەکەن بۆ حەق‌و ڕاستی‌و گەیشتن بەمراز بەهۆی ئەو مانا پرشنگدارانەی کە لەخۆیان گرتوون. یان هۆی ناونانیان بە (الزهراوين) لەم ڕووەوەیە کە هەردوو سورەتەکە هاوبەشن لەوەدا کە (ئیسمی ئەعظەمیان) لەخۆ گرتووە...

ئەبو داوودو ئیبنو ماجەو کەسانی تریش لە ئەسمای کچی یەزیدەوە دەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: ان الاسم الاعظم في هاتين الايتين: ﴿وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ﴾ والتي في ال عمران ﴿اللّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾...

## فەضڵو گەورەیی سورەتی (آل عمران)

موسلیم لە نەوواسی کوڕی سەعمان دەگێڕێتـەوە، دەڵێ: لـە پێغەمبـەرم بیـست دەیفەرموو: «يُؤْتَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِالْقُرْآنِ وَأَهْلِهِ الَّذِينَ كَانُوا يَعْمَلُونَ بِهِ تَقْدُمُهُ سُورَةُ الْبَقَرَةِ وَآلُ عِمْرَانَ »..

دووبـارە موسـلیم لـە ئـەبو ئومامـەی باهلییـەوە دەگێڕێتـەوە کـە دەڵێ لـە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: «اقْرَءُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّـهُ يَـأْتِي يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ شَـفِيعًا لأَصْـحَابِهِ، اقْرَءُوا الزَّهْرَاوَيْنِ: الْبَقَرَةَ وَسُورَةَ آلِ عِمْرَانَ، فَإِنَّهُمَا تَأْتِيَانِ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ كَأَنَّهُمَـا غَمَامَتَـانِ أَوْ كَأَنَّهُمَا غَيَايَتَانِ، أَوْ كَأَنَّهُمَا فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَـوَافَّ تُحَاجَّـانِ عَـنْ أَصْـحَابِهِمَا، اقْـرَءُوا سُـورَةَ الْبَقَرَةِ فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ وَلاَ تَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَةُ»..

## سەلماندنی یەکتاپەرستیو نازڵکردنی قورئان

﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ﴿٢﴾ نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٣﴾ مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ ٱلْفُرْقَانَ ۗ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَىْءٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٥﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَوِّرُكُمْ فِى ٱلْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦﴾ ﴾.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سوورەتە:

ئیبنو ئەبی حاتەمو ئیبنو جەریری طەبەریو ئیبنو ئیسحاقو ئیبنولونذیر دەڵێن: ئەم سوورەتە لە سەرەتاوە تا ئایەتی هەشتاو ئەوەندەی دەربارەی وەفدی فەلەی نەجران هاتۆتە خوارێ، کە هاتنە خزمەت پێغەمبەر نزیکی شەست سوار دەبوون، چواردەیان پیاو ماقووڵو ریش سپیان بوون لەناویاندا ئەمیرو وەزیرو قەشەکەیان بوون، ئیتر لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) دەربارەی عیسای کوڕی مەریەم کەوتنە گفتوگۆ؛؛ بە پێغەمبەریان گوت کێ باوکی عیسایە؟؟ سێ کەسیان قسەیان کرد، جارێك دەیانگوت عیسای کوڕی مەریەم خودایە، چونکە مردووی زیندوو کردۆتەوە، جارێکیش دەیانگوت: کوڕی خودایە چونکە باوکی نەبووە، یان دەیانگوت: عیسا یەکێکە لە سێ ئۆقنومەکە، بەم شێوەیە درۆو بوختانیان بەدەم خوداوە دەکرد، ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: باشە ئێوە نازانن کە کوڕ دەبێ لە باوکی بچێ؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ئێوە نالێن: خودای ئێمە زیندووەو نامرێ؟ عیساش مردنی بەسەردا دێ؟. وتیان: بەڵێ، فەرمووی: دەی باشە ئێوە نالێن خودای ئێمە بەسەر هەموو شتێکدا بەدەسەڵاتەو دەیپارێزێ رزقو رۆژی دەداتێ؟ وتیان بەڵێ: ئەمجار فەرمووی: دەی باشە ئایا عیسا هیچ کامێ لەم رەوشتانەی هەیە.؟! وتیان: نەخەیر، ئەمجار فەرمووی: دەی باشە ئێوە نالێن: خودای ئێمە شێوەی عیسای لە سکی دایکیدا کێشاوە، بەو شێوەیەی ویستوویەتی جەستەی رێکخستووە؟هەروەها خودا ناخواو ناخواتەوە، پیسایی ناکا؟! وتیان بەڵێ ئەمجار فەرمووی: دەی باشە ئێوە نالێن: عیسا لە سکی دایکیدا پەروەردە بووە؟ وەکوو منداڵانی تر بە شێوەیەکی ئاسایی لە دایك بووە؟ ئەمجا خواردنی دراوەتێ وەکوو هەر منداڵێکی تر، ئەمجار خواردنی خواردووەو ئاوی خواردۆتەوەو پیسایی کردووە؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: دەی باشە ئەدی ئێوە چۆن ئەو بۆچوونە هەڵەیەتان لا پەیدا بووە؟ ئیتر زانیان هەڵەنو بەڵگەیان پێ نەما، بەڵام هەر لەسەر ئینکاری خۆیان بەردەوام بوون، ئیتر خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارێو فەرمووی: ﴿الم﴾، راڤەکەرانی قورئان لە مانای ئەم جۆرە وشانەدا دەڵێن: خودا بۆخۆی دەزانێ مەبەست لە مانای ئەم جۆرە وشەیە چیە،

هەندێکیش دەڵێن: مەبەست ئەوەیە کە قورئان لەم جۆرە پیتانە پێك هاتووە، دە ئێوەش نازابن بتوانن لەم پیتانە کەلامێکی وەکوو قورئان دابنێن.! ﴿اللَّهُ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ پەروەردگار خودایەکی بێ وێنەو پەرستراوێکی حەقە، لە بوونەوەردا جگە لە ئەو خودایەکی تر نیە شیاوی پەرستن بێ، چونکە ئەو بەدیهێنەرە، خاوەن دەسەڵاتی رەهاو فراوانە لە گەوندا، هەر ئەو سەرچاوەی خێرو لابەری شەڕە، زیندووی هەمیشە زیندووە، سەرەتاو کۆتای ژیانی نیە، کارگێڕو هەڵسوڕێنەری بەندەکانیەتی، بە ویستی خۆی گۆڕانکاریان تێدا دەکا باڵادەستو خاوەن دەسەڵاتە بەسەر ئاسمانەکانو زەویدا لە پێش دروستکردنی عیسادا، ئیتر چۆن ئەم بوونەوەرە راگیر کراوە پێش هاتنە دونیای عیساو دوای لە دونیا دەرچوونی؟! دەی ئەگەر عیسا خودا بێ، یان بەشێك بێ لە خودا، دەبوو بەبێ ئەو بوونەوەر راگیر نەبوایە..

﴿نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ پەروەردگار خودایەکی وایە – ئەی محمد! – قورئانی بە نیگا بۆ ناردووی، هیچ شكو گومانی تێدا نیە، راستیی کتێبە ئاسمانییەکانو پێغەمبەرانی پێشوو دەچەسپێنێ، بە شێوەیەکی کورتو لە چوارچێوەی بنەمای پێغەمبەرایەتیو نیگادا پاڵپشتی پێغەمبەرانی رابوردوو دەکا لەوەدا کە بانگەوازییان بۆ یەکتاپەرستیو رەوشت بەرزی کردووە؛ هەمیشە هەواڵی راستو موژدەئامێزیان بە گەلەکانیان داوە.. بە کورتی قورئان ئەو راستییە دەچەسپێنێ کە پێغەمبەرانی پێشوو موژدەیان پێداوە: کە لەوەودوا خودا پێغەمبەرێك دەنێرێ بۆ سەر هەموو ئادەمیزادو قورئانی بەخەڵات دەدرێتێ کە کەلامێکی بێ وێنەو موعجیزەیەو پڕتەو بەخشە هەتا هەتایە! ﴿وَأَنزَلَ التَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ﴾ خودایەکی وەهایە لە پێش قورئاندا تەوراتی بۆ موساو ئینجیلی بۆ عیسا ناردووە، بۆ ئەوەی هەر یەکێ لەم کتێبە پیرۆزانە ببنە پرۆگرامو شارەزایی کەری ئادەمیزادی سەردەمی خۆیان!! کەوابێ پەروەردگار – لە پێش هاتنە دونیای عیساو دوای لە دونیا دەرچوونیشی – نیگاو شەریعەتی بۆ ئادەمیزاد ناردوە، حەزرەتی عیسا بۆ خۆی سەرچاوەی نیگا نیەو نیگای بۆ هاتووەو کراوە بە پێغەمبەر، دەی چۆن پێغەمبەر بە

خودا دادەنرێ؟! ﴿وَأَنزَلَ الْفُرْقَانَ﴾ پەروەردگار قورئانی ناردووە بۆ (محمد) کە حەق و ناحەق لێك جیادەکاتەوە، ڕێگای هیدایەت و گومڕایی دیاری دەکا، بەبەڵگەو دەلیلی بەهێز ڕاستی و ناڕاستی لێك جیا دەکاتەوە!

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِآيَاتِ اللّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ ئەوانەی ئینکاری نیشانەکانی خودایەتی خوداو تاك و تەنیایی زاتی پاکی دەکەن، هەمیشە عەیب و عارو لەکە دەخەنە پاڵی، ڕۆژی قیامەت بەهۆی ئەو کوفرو سەرپێچی کردنەیان سزای بە ئێشیان بۆ ئامادەکراوە، ﴿وَاللّهُ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ﴾ خودا بالادەستەو (منیع الجناب)ە، فرسەتی لێ نابینرێ، خاوەنی تۆڵە سەندنە بۆ کەسێ بڕوای بە خودایەتی خودا نەبێ و نیشانەی تاك و تەنیایی بەدرۆ بخاتەوەو سەرپێچی پەیامی پێغەمبەران بکا، بەهێزو توانای خۆی، بە ویستی خۆی تۆڵەی لە نەیارانی دەستێنێ ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَخْفَىَ عَلَيْهِ شَيْءٌ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاء﴾ بێگومان پەروەردگار هیچ شتێکی لە بوونەوەردا لێ گوم نابێت، دەزانێ کێ بەڕاستی ئیمانی هێناوەو کێ کافرو خودانەناس و دوو ڕووە، کێ بەزۆرو تۆپزیی گفتارو کرداری کوفر ئامێزی پێ ئەنجام دەدەن! بەڵام دڵ و دەروونیان پڕە لە ئیمان و باوەڕ.

دەی عیساو غەیری عیسا هیچ شتێك لەم جۆرە نهێنییانە نازانن کە وابێ چۆن عیسا بە خودا حسێب دەکرێ؟!

﴿هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاء﴾ خودا خودایەکی وەهایە ئێوەی ئادەمیزاد لە منداڵداندا وێنەکێش دەکا، چۆنی بوێ ئاوا ڕخسارتان دیاری دەکا، نێرە، مێیە، جوانە، ناشیرینە، کورتە، درێژە، سپی پێستە،......هتد. دەی خۆ عیساو غەیری عیسا ناتوانن هیچ دروست بکەن و ناتوانن لە منداڵدان دا وێنەی کەس بکێشن!! بەڵکوو ئەوانە بۆخۆیان دروستکراوو وێنەکێشراون، کەوابێ چۆن بەکەڵکی خودایەتی دێن؟؟ ﴿لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ هیچ خودا نین جگە لە پەروەردگار هەر ئەو دروستکەرو بەدیهێنەرەو شیاوی پەرستن و خودایەتییە، بێ باوك و بێ دایك و بێ منداڵە، کەسی لێ

نەبووەو لە کەس نەبووە، کەس دەرھەقەتی نایە... ئەمانە ھەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوە کە عیسا بەندەیەکی دروستکراوە وەکوو بەندەکانی تری ئادەمیزاد، ئەویش وەکوو کۆرپەلەی تر لە سکی دایکیا وێنەی کێشراوەو، لەکاتی پێگەیشتنی سروشتی خۆیدا لە دایك بووە، ئیتر چۆن بەندەیەکی ئاوا بە خودا حلێب دەکرێ؟؟؟

## ھەبوونی ئایەتی مەحکەمو موتەشابە لە قورئاندا

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴿٨﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ جَامِعُ ٱلنَّاسِ لِيَوۡمٖ لَّا رَيۡبَ فِيهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ﴿٩﴾ ﴾.

﴿هُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ﴾

ئەی محمد! پەروەردگار خودایەکی وەھایە قورئانی ناردۆتە سەر تۆو کردوویەتی بە بەرنامەو پرۆگرامی ئیسلامو یاسای بوونەوەر، جا بەشێك لە ئایەتەکانی (موحکەمن) واتە: بەبێ تەمو مژ مانای مەبەست دەگەیەنن‌و ھەموو کەس لێیان حاڵی دەبێ‌و ھیچ

ئیلتیباسو سەرلێ تێکچوونی بۆ پەیدا نابێ، بەشەکەی تریان ئایەتی (موتەشابیهن) واتە: ماناکانیان روونو ئاشکرا نینو نازانرێ مەبەستی سەرەکی لە ماناکانیان چیە؟؟ چونکە بە ڕواڵەت (تعارض)و دژایەتیەك هەیە لە نێوان ظاهیری وشەکەو مانای مەبەست لێی!! یان (متشابە) ئەو ئایەتانەن کە پەروەردگار زانینی ماناو مەبەستی لێیان تایبەت کردووە بە زاتی خۆیو کەسی تر پەی پێ نابا، وەکوو چۆنیەتی قیامەتو باسی رۆحو زیندووبوونەوەو دروستکردنی عیساو لە دوونیا دەرچوونی.

## جا لێرەدا شتێك هەیە پێویستە بزانرێ کە (متشابە) دووجۆرە:

١- ئەوەیە کە وشەکە مانایەك بگەیەنێو عەقڵ بە پێچەوانەوە پەی پێ بەرێ، مەبەستەکە نەزانرێ چۆنەو چۆن نیە، وەکوو ئایەتی ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى – طـه/٥﴾.

٢- ئەوەیە کە پەروەردگار زانینی ئەو شتانەو چۆنیەتییانی تایبەت کردبێ بە خۆیەوە، کەسی تر حەقیقەتو کرۆکی نەزانێ، وەکوو حاڵو چۆنیەتی قیامەت، یان حاڵو چۆنیەتی فریشتەو جنۆکە... هەروا باقی شتە غەیبییەکان!!

ئایەتە موحکەمەکان: وەکوو ئایەتی ﴿قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلاَّ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا﴾و ئەو دوو ئایەتەی کە بەدوایدا دێن لە سوورەتی (الأنعام/١٥١ – ١٥٢) یان ئایەتی ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ﴾و ئەو سێ ئایەتەی لە سوورەتی (الإسراء) کە بەدوایدا دێن، (٢٣ - ٢٦). یان فەرموودەی خودا کە دەربارەی عیسا دەفەرموێ: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَاهُ مَثَلًا لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ – الزخرف/٥٩﴾. ئیتر ئەم ئایەتانەو وێنەیان زۆربەی قورئانیان لێ پێکهاتووە بۆ بەیانکردنی ئەحکامی ئیسلامیو بنەمای عەقیدەو فەرمانو نەهیو حەلاڵو حەرام.....هتد. هەموویان ماناکەیان ئاشکراو دیارەو مانای مەبەست دەگەیەنن، مانای تر هەڵناگرن، ئەم جۆرە ئایەتە موحکەمانەئەصلو بنەمای قورئانن بڕبڕەی ئەو کەلامە پیرۆزەن ئایەتەکانی تر لقو پۆپی ئەوانەن...

کەوابێ ئەگەر شتێکمان لێ ئیشکال بوو، ئایەتێکی (متشابە)مان هاتە بەرو لەمەبەستەکەی حاڵی نەدەبووین، پێویستە بەراوردی بکەین لەگەڵ ئایەتە موحکەمەکانداو بە گوێرەی مانای ئەوان راڤەی ئایەتە موتەشابیهەکە بکەین: بۆ نموونە: ئەم ئایەتەی کە دەربارەی عیسا دەفەرموێ: ﴿وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ – النساء/١٧١﴾. دەبێ بەگوێرەی ئایەتی ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ – الزخرف/٥٩﴾. تەفسیری بکەین، هەروەها دەبێ بەگوێرەی ئایەتی ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ – آل عمران/٥٩﴾ تەفسیری ئایەتی (متشابە)ەکە بکەین.

ئایەتە (متشابە)ەکان وەکوو ئایەتی (١٧١)ی سوورەتی النساء کە دەفەرموێ: ﴿وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾ یان ئایەتی ﴿إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ – آل عمران/٥٥﴾، یان ئایەتی ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى – طه/٥﴾. یان ئایەتی ﴿يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ – الفتح/١٠﴾. ئەم ئایەتانە هەریەکەیان بە بیروبۆچوونی ئێمە چەند مانایەك هەڵدەگرن: کە ئەو مانایانە لەگەڵ ظاهیری ئەو وشەیەی کە مانا مەبەستەکەی تێدایە رێك ناکەون، جاری وا هەیە ئەو مانایە لەگەڵ مانای ئایەتە موحکەمەکە گونجاو دەبێ، جاری وایش دەبێ لەبارەی وشەو تەرکیبەوە لەگەڵ مانایەکی تر دەگونجێ بەڵام لەبارەی مەبەستەوە هەرگیز جیاوازی نابینێدرێ.

کەوابی ئەی کۆمەڵی فەلە! ئێوە بۆتان نیە بەم جۆرە ئایەتە موتەشابیهانە نموونە بێننەوەو بە ئارەزۆی خۆتان مانایەك هەڵبژێرن، بەڵکوو پێویستە پەیرەوی ئایەتە موحکەمەکان بکەن‌و ئایەتە موتەشابیهەکان بە گوێرەی ئایەتە موحکەمەکان مانا بکەن، دەبێ ئێوە عیسا بە گوێرەی ئایەتی ﴿لَّن يَسْتَنكِفَ الْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْداً لِّلَّهِ وَلاَ الْمَلآئِكَةُ الْمُقَرَّبُونَ – النساء/١٧٢﴾. بناسن‌و ئایەتە موتەشابیهەکانی تر دەربارەی عیسا لەگەڵ ئەمدا بەراورد بکرێن‌و بەگوێرەی ئەم جۆرە ئایەتانە مانایان لێ بدەنەوە.

پێویستە ئەوەش بزانین کە موحکەم‌و موتەشابیه لێرەدا ماناکەیان جیایە لەگەڵ موحکەم‌و موتەشابیهی شوێنی تر، بۆ نموونە کە لە ئایەتی یەکەمی سوورەتی (هود)دا

دەفەرموێ: ﴿كتاب أحكمت آياته﴾ مانای ئەوەیە ئەم قورئانە پەڕاوێکە ئایەتەکانی عەیبو لەکەیان تێدا نیە، کەلامێکی وشە فەصیحو مانا راستو دروستەو پڕە لە حیکمەتو پەندو ئامۆژگاری، کە ئایەتی (٢٣)ی سوورەتی (الزمر)دا دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُّتَشَابِهًا﴾ مەبەست بە موتەشابیهـ ئەوەیە کە قورئان هەندێکی لە هەندێکی دەچێ لە جوانیو راستیو شارەزایی کردندا، هەروەها لەوەدا کەوا دژایەتیو نارێكو پێکی تێناکەوێو هەمووی رووەو یەك مەبەستی سەرەکی ئاراستە دەکرێن....

﴿فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ﴾ ئەوانەی دڵیان پڕە لە گومڕاییو سەرلێ شێوانو روویان لە حەق وەرگێڕاوەو نقوومی باطل بوون، هەر شوێن هەواو هەوەسی خۆیان دەکەوون، ئایەتە موتەشابیهەکان وەردەگرنو بە ئارەزۆی خۆیان مانایان لێ دەدەنەوە، چونکە دەتوانن بەهەوەسی خۆیان ماناکانیان بگۆڕنو لەگەڵ مەبەستی خۆیاندا بیگونجێنن!! ئایەتە موحکەمەکانیش پاشگوێ دەخەن باسیان ناکەن! بۆ ئەوەی خەڵکی لە خشتە بەرنو بیانخەنە نێو فیتنەو لە ئایین گومڕایان بکەنو رێگەی راستیان لێ تێك بدەن! واشی دەخەنە پێش چاو: کە ئەوان بەڵگە بە قورئان دەهێننەوە، ئایەتی قورئان پاڵپشتییانە!! بەڵام لە راستیدا ئەو بەڵگانە بۆ بەرژەوەندی ئەوان نیە، بۆ نموونە: فەلەکان بەڵگە دێننەوە لەسەر ئەوە کە عیسا گیانی خودایە دەڵێن ئەوەتا قورئان دەڵێ: ﴿وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾ عیسا گیانی خودایەو خستویەتیە ناوسکی مەریەمەوە، بەڵام ئایەتی ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ....﴾ پاشگوێ دەخەن، یان ئایەتی ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ - آل عمران/٥٩﴾. لە بیر خۆیان دەبەنەوەو نایخەنە روو.. ئەوانە کە ئەم جۆرە هەڵوێستەیان بەرامبەر قورئان هەیەو ئاوا رەفتار لەگەڵ ئایەتە موتەشابیهەکان دەکەن مەبەستیان ئەوەیە ماناو مەبەستەکانی قورئان بگۆڕنو ئایەتەکانی لە حەقیقەتی خۆیان لابدەنو بۆ مەبەستی

خۆیان بیانگونجێنن، واتە: وایان راڤە بکەن کە لەگەڵ ئارەزۆو دابو نەریتیاندا رێك بکەوێ، لەگەڵ عاداتی کۆنینەو بیروبۆچوونی خۆیاندا یەکانگیریان بکەن، بەڵام ئەو ئایەتانەی موحکەمن‌و بیروباوەڕی ئیسلامییان لەسەر بنیات نراوە لەبیر خەڵکی بەرنەوە، یان پاشگوێیان بخەن. ئەوەتا هەرگیز ئەو ئایەتانە ناخەنەڕو کە ئەوە دەگەیەنن عیسا بەندەی خوایەو پێویستە گەردنکەچی فەرمانەکانی بن!!

ئیمامی موسلیم لە عائیشەوە – خوایان لێ رازی بێ – فەرموودەیەك دەگێڕێتەوە: دەڵێ: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) ئایەتی ﴿هُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ﴾ی خوێندەوە، ئەمجار فەرمووی: « إِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ سَمَّاهُمُ اللَّهُ فَاحْذَرُوهُمْ ». واتە: هەرکاتێ ئەوانەتان بینی کە شوێن ئایەتە موتەشابیهەکان دەکەون‌و دەیانەوێ بە گوێرەی هەواو هەوەسی خۆیان راڤەیان بکەن، ئەوە بزانن: ئەوانە لەو کەسانەن کە خودا بە خراپەکار ناوی هێناون‌و بە سەرپێچیکەری لەقەڵەم داون، لێیان بترسن‌و خۆتانیان لێ بپارێزن!.

دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: «إِنَّ الْقُرْآنَ لَمْ يَنْزِلْ يُكَذِّبُ بَعْضُهُ بَعْضاً فَمَا عَرَفْتُمْ مِنْهُ فَاعْمَلُوا بِهِ وَمَا جَهِلْتُمْ مِنْهُ فَرُدُّوهُ إِلَى عَالِمِهِ».

قورئان بۆیە نەنێردراوەتە خوارێ کە هەندێکی هەندێکی بەدرۆ بخاتەوە، ئەوەی ماناکەتان زانی‌و مەبەستەکەی تێگەیشتن کاری پێ بکەن، ئەوەی پەیتان پێ نەبردو نەتانزانی ماناکەی چۆنەو چۆن نیە ئیمانی پێ بهێنن‌و بزانن لەلای خوداوە هاتووە.

مەچن وەکوو ئەو گومڕایانە هەر خەریکی سەرلێ تێکدانی خەڵك بن‌و بتانەوێ بە هەواو هەوەس ئایەتە موتەشابیهەکان تەئویل بکەن، خۆ ﴿وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللَّهُ﴾ جگە لە خودا کەسی تر مەبەست‌و مانای دروستی ئەو جۆرە ئایەتانە نازانێ، چونکە ئەوە زانیارییەکە خودا تایبەتی کردووە بە خۆی‌و کەسی تر پەی پێ نابا،

﴿وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ﴾ ئەوانـەی خـاوەنی پایـەی دامـەزراون لـە عـیلمو زانستدا دەڵێن: بڕوامان بەوە هەیە کە ئەو ئایەتە موتەشابیهانە لـە خـوداوە هـاتوونو کەلامی پیرۆزی زاتی بێچوونن.

کۆمـەڵێك لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) وەکـوو ئوبـەی کـوڕی کـەعبو عائیـشەو ئیبنـو عومـەر پێیـان وایـە دەبـێ لەسـەر وشـەی ﴿إِلاَّ اللّـهُ﴾ هەڵوێـستە بکـرێو رابوەسـتێ، واتـە: رسـتەی ﴿وَالرَّاسِـخُونَ فِـي الْعِلْـمِ...﴾ کـەلامێکی سـەربەخۆ بـێ، عـەطـف نـەبێ بـۆ سـەر وشـەی ﴿اللّـهُ﴾. کۆمـەڵێکیش لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر وەکـوو ئیبنـو عـەبباسو بـڕێ راڤەکـەرانی قورئـانو بـڕێ زانایـانی عیلمـی ئوصول دەڵێن: لەسـەر وشـەی ﴿اللّـهُ﴾ هەڵوێـستە نـاکرێو رسـتەی ﴿وَالرَّاسِـخُونَ...﴾ عەطف دەکرێتەوە بۆ سەر وشەی ﴿اللّهُ﴾ واتـە: جگـە لـە خـوداو زانایـانی دامـەزراو لـە زانستدا کەسی تر مەبەستەکانیان نازانن. ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مـن یـەکێکم لـەو زانایانەی کە خاوەنی پلەی دامەزراون لە زانستدا، کە مەبەستو راڤەی تـەواوی ئایەتـە موتەشـابیهەکان دەزانـین. کـە وابـێ ئەوانـەی لـە زانـستدا دامـەزراون مانـای ئایەتـە موتەشابیهەکان دەزانـن، چونکە خـودا لۆمـەی ئەوانـەی کـردووە کـە دەیانـەوێ مانـای ئایەتەکان هەڵەوگێر بکەنو بەمەبەسـتی سـەرلێ شـێواندنی خـەڵکیو فیتنەنانـەوە لـە ئاییندا راڤەی ئایەتە موتەشـابیهەکان بکـەن بـۆ ئـەوەی لـەم رێگەیـەوە خـەڵکی پـێ لـە ئـایین وەرگێـڕن.. بـەڵام ئەوانـەی رسـوخی زانـستیان هەیـەو لـە زانیاریـدا دامـەزراون هەڵوێـستیان وا نیـە، بـەڵکوو ئـەوان گـرۆی یـەقینو بیروبـاوەڕن، هەمیـشە ئایەتـە موتەشـابیهەکان وا تەفـسیر دەکـەن کـە لەگـەڵ ئایەتـە موحکەمەکانـدا رێـك بکـەونو دژایەتی نەکەوێتە نێوانیانەوە.

بـەڵام رسـتەی ﴿يَقُولُـونَ آمَنَّـا بِـهِ﴾ ئەمـە کـەلامێکی سـەربەخۆو تـازە دەست پێکراوە، واتە ئەو زانایانە دەڵێن: بڕوامان بەو ئایەتـە موتەشابیهانە هەیـە ﴿كُـلٌّ مِّـنْ عِندِ رَبِّنَا﴾ هەموو ئایەتەکان – بـە موحکـەمو موتەشـابیهەوە – هـەموویان لـە خـوداوە

هاتوون. واتـە: زانایـان ئایەتـە موحکەمـەکان دەکەنـە بنـەماو بناغـەو بڕوایـان وایـە – موحکەم‌و موتەشابیهـ – لە خوداوە هاتوون‌و هەردوو جۆریان حەق‌و راستن، هەریـەکی لەو دوو جۆرە پاڵپشتی ئـەوی تـر دەکا، بەڵگەی ئەمـەش ئـەو فەرموودەیـە کـە دەڵێ: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) نـزای بـۆ عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەبباس کـرد فەرمووی: «اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَعَلِّمْهُ التَّأْوِيلَ». خودایە! لە ئاییندا تێگەیشتووی بکەو، فێری شیکردنەوەو مەبەست زانینی قورئانی بکە.

لێرەدا پرسیارێك دێتـە پێشەوەو دەڵـێ. بۆچی لـە قورئانـدا ئایـەتی (متـشابه) هەن؟ لە کاتیکدا کە قورئان بۆیە نێردراوە رەهنومایی خەڵکی بکاو ئادەمیزاد شارەزای خـودا پەرسـتی بکـا!! دەی ئایـەتی موتەشـابیهـ کـە کـەس مەبەسـتەکەی نـەزانێ چـۆن رەهنومایی پێ دەکرێ؟ لەوەڵامـدا دەڵـێین: هـەبوونی ئایـەتی موتەشـابیهـ لـە قورئانـدا لەبەر ئەم هۆیانەیە:

أ- بۆ ئەوەی بڕواداری راستەقینەو ئیمـان قـایم لـە بـڕوا لاوازان جیابکرێتـەوە، تاقیکردنەوەیە بۆ دڵی ئێمە.

ب- زێـدە رێـزو فـەزڵی زانایـان دەربکـەوێ‌و ئاکـامی لێکۆڵینـەوەو کۆشـشیان بـۆ خـەڵکی دیـاری بـدا. هاندانـە بـۆ موسـوڵمانان کـە عـەقڵ‌و هۆشـی خۆیـان بخەنـە کـارو هەمیشە خەریکی توێژینەوە بن بۆ ئەوەی هەمیشە بیروهۆشیان لە گەشەکردندا بێت‌و کول نـەبێ.

ج- پێغەمبــەران نێــردراون بۆســەر ئــادەمیزاد بەگــشتی ئــادەمیزادیش جــۆراو جۆرن، هەیانە زیرەکەو هەیانە کۆڵەوارو نەزانە، بڕێ ماناو ئـەحکامی وردەکاری هـەن کە پێویستیان بەوەیە بە عیبارەتی تایبەتی تـەعبیریان لێ بکرێ، ئـیتر تێگەیـشتن لـەم جـۆرە مەبەسـتانە بوومتـە بەشـی زانایـان‌و ئەوانـەی لـە عـیلم‌و زانیاریـدا رۆچـوون، فەرمانیش کراوە بە رەشە خەڵکەکە کە زانینی مەبەست لێیـان حەواڵـەی خـودا بکـەن، چـونکە زانایـان دەزانـن‌و تێدەگـەن قورئـان چـۆن پـەیام ئاراسـتە دەکـا، هەرچـەندە حەقیقەت‌و کرۆکی شتەکانیش نەزانن، هەر بۆیەشە فـەرمووی: ﴿وَمَـا يَـذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُـواْ

الْأَلْبَابِ﴾ واته: تێ ناگەن‌و لە مانای قورئان حاڵی نابن‌و بەشێوەی راست‌و دروست لەمەبەستەکان ورد نابنەوە، مەگەر ئەو کەسانە نەبێ کە عەقڵ‌و هۆشی ساغیان هەیە، بیریان تیژە بۆ تێگەیشتن!

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێناسەی ﴿وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ﴾ی ئاوا کردووە لە فەرموودەیەکدا کە ئیبنو ئەبی حاتەم دەگێڕێتەوە لە عوبەیدوڵڵای کوڕی زەیدی تابیعیەوە، کە بەخزمەت ئەم سێ هاوەڵانەی پێغەمبەر گەیشتووە: (أنس، أبو امامە، أبو الدرداء) دەڵێ: لە پێغەمبەر پرسیار کرا لە مانای ﴿وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ﴾ پێغەمبەر لە وەڵامدا فەرمووی: (من برت يمينه، وصدق لسانه، واستقام قلبه، ومن عف بطنه وفرجه فذالك من الراسخين في العلم).

واته: ئەو کەسەیە سوێندی نەخات‌و، زمانی راسگۆ بێ‌و، دڵی بەردەوام بێ لەسەر پەیڕەویی حەق‌و، حەڵاڵخوازبێ‌و داوێنپاك بێ، هەرکەسێ ئاوا بێ ئەوە لە دەستەی ئەو زانا (الراسخين)یە کە خودا لە قورئاندا وەسپ‌و سەناخوانییان دەکا!).

هەمیشە ئەو زاناو تێگەیشتوانە دەپاڕێنەوەو نزا دەکەن‌و دەڵێن: ﴿رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا﴾ خودایە! دڵ‌و دەروونمان لەسەر خوداپەرستی‌و بیروباوەڕی راستەقینە بەرقەرار بکە، دوای تێگەیشتن‌و شارەزابوون، گومڕامان مەکەو، سەرلێ شێواومان مەکە ﴿وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ﴾ رەحمەت‌و بەزەیی خۆتمان پێ ببەخشە! لە سۆزو رەحمەتی خۆت بێ بەشمان مەکە، یارمەتیمان بدە لەسەر خێرو بۆ رێگای راست ئاراستەمان بکە! بێگومان تۆی پەروەردگاری بەخشندەو هەموو خێرو بێرێك لە تۆدایە!

عائیشە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) زۆری ئەم نزاو پاڕانەوە دەکردو دەیفەرموو: . يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ.. ئەی ئەو کەسەی کە گۆڕینی هەموو دڵ‌و دەروونێکت بەدەستە! دڵم لەسەر ئایینی خۆت رابگرە!) منیش عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خودا! زۆرجار گوێم لێ دەبێ ئەم دوعایە

دەکەی! پێغەمبەر فەرمووی: هیچ دڵێك نیە مەگەر کە هەیە وا لەنێو دوو پەنجەی پەروەردگاردا ئەگەر ویستی بەرقەراری بکا، ئەوە لە ئیمانو بیروباوەڕدا ڕای دەگری، ئەگەر ویستی لای بدا لای دەدا! ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لاَّ رَيْبَ فِيهِ إِنَّ اللّهَ لاَ يُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ ئەی پەروەردگارمان! بێگومان تۆ ئادەمیزاد زیندوو دەکەیەوەو کۆیان دەکەیەوە لە ڕۆژێکا کە هیچ گومان لە هاتنیدا نیە، چونکە تۆ وەعدەت داوەو وادەی تۆ بەجێیەو دێتە جێ.

پەروەردگار کە ئەم جۆرە نزایەمان فێر دەکا بۆ ئەوەیە کە ترسی ئەوەمان هەبێ بێ بڕوایی دزە بکا بۆ ناو دڵو دەروونمانو لە ڕۆژی قیامەتدا نائومێدی ڕەحمەتی خودا بین!

## سەرەنجامی کافرو ئەوانەی بە ماڵو سامان بوغرا بوون

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ وَقُودُ ٱلنَّارِ ﴿١٠﴾ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١١﴾ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٢﴾ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا ۖ فِئَةٌ تُقَٰتِلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ

كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ ٱلْعَيْنِ ۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُو۟لِى ٱلْأَبْصَـٰرِ ﴿١٣﴾ ﴾.

پەروەردگار لەسەرەتای ئەم سوورەتەدا باسی بنەمای یەكتاپەرستیو ئەو كتێبە ئاسمانیانەی كرد كە ئەو حەقیقەتانە دەچەسپێنن، بە تایبەتی قورئانی پیرۆزو بڕوای زانایان پێی.

ئەمجار لێرەدا حاڵو چۆنێتی كافرەكان باس دەكاو هۆی كافر بوونەكەیان دیاری دەكا كە بریتییە لە بوغرابوونو لە خۆبایی بوون بە ماڵو منداڵ، ئەوەش روون دەكاتەوە كە ماڵو منداڵ لە قیامەتدا فریایان ناكەون، ئەمجار نموونەی بە جەنگی بەدر هێنایەوە: كە لەو جەنگەدا سەربازانی ئیسلام بەرامبەر سەربازانی كوفر جەنگانو تاقمی كەمی موسوڵمانانو خوانـاس بەسەر دەستەی زۆری كوفرو بێدینیدا زاڵ بوون، زۆریی جەنگاوەرو فرەچەكیو سامانداریی بێ سوود بوو بۆ بێ باوەڕانو دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلاَ أَوْلاَدُهُم مِّنَ اللّهِ شَيْئًا وَأُولَـئِكَ هُمْ وَقُودُ النَّارِ﴾ لەسەرتای سوورەتەكەدا پەروەردگار بنەمای یەكتاپەرستی باس كرد، بیروبڕوای زانایانی خستەڕوو ئەمجار لێرەدا باسی كافرو گومڕاكان دەكا دەفەرموێ: ئەوانەی كافرنو قورئان بەراست نازاننو پێغەمبەرەكانیان بەدرۆ خستۆتەوە، سەرپێچی پەیامی خودایان كردووەو بە پێچەوانەی كەلامی خودا جوڵاونەوە، هیچ سوودێكیان لە نیگای خودا بۆ پێغەمبەران وەرنەگرتووە كە ئەمانە بریتین لە وەفدی فەلەی نەجرانو فەلەی ترو جولەكەو موشریكو كافری تر.. ئەوانە سووتەمەنی دۆزەخن، لە رۆژی قیامەتدا ئەوەی پێیان دراوە لە ماڵو منداڵ لەو رۆژەدا هیچ سوودی لێ نابیننو لە سزای خودا رزگاریان ناكا، تووشی جۆرەها ئەشكەنجەو مەینەتی دەبن، ئاكامو سەرنجامیان لەوەدا كە (محمد) بەدرۆ دەخەنەوەو بڕوا بە پەیامەكەی ناكەن

﴿كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ وەکوو کردەوەو حاڵو چۆنیەتی تاقمو گرۆهی فیرعەونو ئەو خوانەناسو ملهوڕانەی پێش فیرعەون لە موئتەفیکەکان وەکوو هۆزی عادو ثەمود کە ﴿كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا﴾ نیشانەی خودایەتی ئێمەیان بە درۆ لەقەڵەمدا، پەیامی پێغەمبەرەکانیان رەت کردەوە ﴿فَأَخَذَهُمُ اللّهُ بِذُنُوبِهِمْ﴾ پەروەردگار لە تۆڵەی ئەو سەرپێچیو ملهوڕیەیان گرتنی بەڵام چۆن گرتنێك!!؟! ﴿وَاللّهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ خودا تۆڵەو سزای بە ئێشەو کەس ناتوانێت بەرنگاری بکا.. ئەمجار هەڕەشە لە کافرو جولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەی محمد! بەوانە بڵێ کە بڕوایان بە پەیامی تۆ نیە ﴿سَتُغْلَبُونَ﴾ لە دونیادا شەڕتان لەگەڵ دەکرێو تێدەشکێنو دەبنە ژێر دەستەو ریسوایی بە خۆتانەوە دەبینن ﴿وَتُحْشَرُونَ إِلَى جَهَنَّمَ وَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾ لە قیامەتیشدا راپێچ دەکرێن بۆ ناو دۆزەخ کە خراپترین جێگایە بۆ خۆتان ئامادە کردووە. ئەمجار ئەی موحەممەد: پێیان بڵێ: لە خودا بترسنو واز لە سەرپێچی کردن بێنن، ئەگینا تووشی شکستییەکی وەکوو شکستی قوڕەیشیەکان دەبن کە لەشەڕی (بەدر)دا تووشیان بوو، لەکاتێکدا ئێوە دەزانن من پێغەمبەرمو نیشانەی پێغەمبەرایەتی من لای ئێوە ئاشکرایەو لە تەوراتدا دەستنیشان کراوە.

بێگومان پەروەردگار وەعدەو هەڕەشەی خۆی بۆ جولەکەکان هێنایە دی، ئەوە بوو موسوڵمانەکان زۆریان لە هۆزی بەنو قورەیظەی خائین کوشت، هۆزی بەنو نەضیری دوو ڕوویان لە وڵاتی مەدینە دەرپەڕاند، قەڵای خەیبەریان فەتح کرد، سەرانەشیان خستە سەر جولەکەکانی تر!!

ئەمجار لەم ئایەتەدا هەڕەشەیان لێ دەکاو دەیانترسێنێو پێیان دەڵێ: کە ئەو جولەکانە بە زۆری ژمارە لە خۆیان بایی نەبنو بەزۆری چەكو تفاقی شەڕیان نەنازن، ئەوەتا لە شەڕی بەدردا قوڕەیشییەکان لە ڕووی زۆریو هەبوونی ئەسبابی شەڕەوە سێ چەندانەی موسوڵمانەکان بوون، کەچی موسوڵمانەکان بەسەر ئەواندا زاڵ بوون! دەی با جولەکەکانیش پەند وەربگرنو واز لە بیروڕای بەتاڵ بووەوەی خۆیان بێنن،

دەفەرموێ: ﴿قَدْ كَانَ لَكُمْ آيَةٌ فِي فِئَتَيْنِ الْتَقَتَا......﴾ ئەی محمد! بە ئەو جولەکانە بڵێ: کە بەزۆری ماڵو دارایی زۆر لە خۆبایی بوون، بە کوڕو کەس و کاری زۆر دەنازن، پێیان بڵێ: بە زۆری ژمارەی پیاوو ماڵو منداڵ مەنازن، چونکە ئەم جۆرە شتانە هۆکاری سەرەکی سەرکەوتن نین، رووداوی رۆژگار باشترین بەڵگەیە لەسەر ناڕاستی بیروبۆچوونیان و نیشانەی بەهەڵە چوونتانە. بۆ نموونە سەیری ئەو دوو کۆمەڵە بکەن کە لە رۆژی بەدردا شەڕیان بوو تێك رژان ﴿فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ کۆمەڵێکیان بە ژمارە کەمن بەڵام خاوەنی بیروباوەڕی پتەون و لە رێگەی خودادا شەڕ دەکەن، خودا پشتیوان و یارمەتیدەریان بوو، بۆیە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بەسەر کۆمەڵی زۆرینەی کافراندا!

بەراستی لە رووداوی بەدردا چەند پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ ئەوانەی عەقڵو هۆشیان هەیەو بەکاری دەهێنن، بە وردی لە رووداوەکان تێبفکرن و سوود لە تێڕوانینەکانیان وەربگرن، شێوەی پەند وەرگرتنەکە لەوەدایە کە دەبێ بزانن لە پشت پەردەوە هێزێك هەیە، یارمەتی کۆمەڵە کەمە خواناسەکەی داوەو بەسەر کۆمەڵە زۆرو خوانەناسەکەدا سەری خستن!! - فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللّهِ – کۆمەڵێك کە لە پێناو ئایینی خودا شەڕ دەکەن ئەوەش نهێنی سەرکەوتنەکەیە، چونکە هەرکاتێ شەڕکردن لە پێناو حەق و عەدالەت دا بێ، لە پێناو بەرگری کردن لە ئایین و بەرنامەی خودادا بێ، نەفسی ئادەمیزاد رووی تێ دەکاو بەرەو پیری دەچێ، چ هێزو توانایەکی هەبێ لەو رێگەیەدا خەرجی دەکا، هەرچی ئامادەباشی و تەگبیرو پلان هەبێ دەیخاتە کار، چونکە بڕوای هەیە کە هێزو تواناکەی پەیوەندی بە هێزو توانای پەروەردگاری بالآدەستەوەیە لەکاتی تەنگانەدا پاڵپشتی دەکا. ﴿وَأُخْرَى كَافِرَةٌ﴾ کۆمەڵەکەی تر کۆمەڵێکی بێ بڕواو خوانەناس، بێ ورەو بێ پشتیوان، بڕوایان بە شەڕەکە نیە، سەرەڕای ئەوەش ﴿يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ الْعَيْنِ﴾ کافرەکان موسوڵمانەکانیان بە دوو چەندانەی خۆیان دێتە بەرچاو، بەمەش ئەوەندەی تر ورەیان دەڕوخێ و ترسیان لێ دەنیشێ و لێوە لەرزەیان پێ دەکەوێ!

بێگومـان موسـوڵمانەکان بـە گـوێرەی توانـا پابەنـدی فەرمانـەکانی پـەروەردگار بوونو بـە مـاڵو بـە گیـان سـەریان لـە رێـدا بـووە بـۆ بـەرز کردنـەوەی ئـاڵای ئیـسلامو بڵاوکردنەوەی ئایینی پیرۆزهەموویان یەك دەستو یەك هەڵوێست بوون لە بەرامبـەر کافرو خوانەناساندا، هەمیشە پابەندی مانای ئەم ئایەتە بوون کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُواْ وَاذْكُرُواْ اللّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلَحُونَ، وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَلاَ تَنَازَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُواْ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾. هەمیـشە ئامـادە بـاش بوون بۆ خۆبەخت کردن لە پێناو ئاییندا، بە دڵێکی پڕ لە ئیمانو بڕوایـەکی پتـەوەوە شەڕیان لەگەڵ دوژمندا کردووە، دڵنیابوون لە یاریدەی خـودا، خـوداش یارمـەتی داونو سـەری خـستوون ﴿يَـا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـوا إِن تَـنصُرُوا اللَّـهَ يَنـصُرْكُمْ وَيُثَبِّـتْ أَقْـدَامَكُمْ﴾ جەنگەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاوێنـەی باڵانومـا بـوون بـۆ پـەیڕەو کردنـی ئـەو ئایەتـە قورئانیانـە، تەنانـەت کـە لـە غـەزای ئوحـودا سەرپێـچی فـەرمانی پێغەمبەریان کردو ئامۆژگارییەکانی ئەویان پاشگوێ خست، تووشی ئەو شکستیە بـوون کە تووشی بوون، دیارە ئەوەش پەندو ئامۆژگارییەکی گەورەیە بۆ کەسێك بیەوێ پەند وەربگرێ.

مێژوو نووسانی ژیاننامەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەڵێن: سوپای موسوڵمانان سێسەدو بیست جەنگاوەر بـوون، حـەفتاو حـەوت کەسـیان لـە کۆچـکەران بـوون، دوو سـەدو سێوشـەش کەسیـشیان لـە یاریـدەدەران (الأنـصار) بـوون، ئـاڵای کۆچکەران بەدەسـت عـەلی کـوڕی ئـەبو طالیـبو، ئـاڵای یاریـدەدەران بەدەسـت سـەعدی کوڕی عوبادەوە بوو، نەود کەسیان وشتر سوارو دوو کەسیان ئەسپ سـوار بـوون، ئەسـپ سوارەکان یەکیان میقدادی کوڕی عەمرو ئەوی تریان میرثەدی کوڕی ئەبو میرثەد بوو، شەش زرێبەندو هەشت شمشێریان پێ بوو! هەموو ئەو جەنگاوەرانەی لەشەڕی بـەدردا شەهید بـوون چواردە کـەس بـوون شـەش شـەهید لـە کۆچـکەرانو هەشـت شـەهید لـە یاریدەدەران بوون!

سوپای کافرەکان نۆسەدو پەنجا شەڕکەر بوون، سەرۆکەکەیان عوقبەی کوڕی ڕەبیعە بوو، ئەبو سوفیانو ئەبو جەهل لە سەرانی قورەیش لەو شەڕەدا هاوبەش بوون، سوپای قورەیشییەکان دووسەد ئەسپو حەوت سەد وشتریان پێ بوو، لە چەكو تفاقیشدا زۆر كۆك بوون. ﴿وَاللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِ مَن يَشَاءُ﴾ پەروەردگار یارمەتیو پاڵپشتی خۆی ئاراستە دەکا بۆ کەسێك بیەوێ سەرکەوتووی بکا. وەکوو چۆن یارمەتی موسوڵمانانی بەدری دا بەوە کە لەپێش چاوی دوژمن زۆری کردن، هەر بە سەیرکردنیان بۆ سوپای ئیسلام ورەیان رووخا ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي الأَبْصَارِ﴾ بێگومان لەم سەرخستنو زاڵبوونو سەرکەوتنی موسوڵمانان بەسەر کافرەکاندا – لەگەڵ کەمیو کەمتفاقی موسوڵمانانو زۆریو پڕچەکی کافرەکاندا – پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسێك پەند وەربگرێو تێ بگا!!

## هەواو ئارەزۆ پەرستی لە دونیادا

﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ ﴾.

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە کە کافرەکان هەمیشە هەڵەو گیری ماڵو منداڵو روویان لە حەق وەرگێڕاوەو نقوومی رابواردن بوون! لایەنو هۆکارو لە خۆبایی بوونەکەیان روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ﴾ پەروەردگار سروشتی ئادەمیزادی وا دروست کردووە کە هەمیشە حەزی

لەم شتانە بێ، کە لەوەدوا ڕیزیان دەکا، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ یان دەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ﴾ جاری وایش دەبێ جوانکردنی کردەوەیەك پاڵ شەیتان دەدرێ کە بەهۆی ختوکەی نەفسەوە کار لە ئادەمیزاد دەکا، هەڵی دەنێ بۆ ئەنجامدانی کردەوەی خراپ ﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ﴾.

کە دەڵێ: (زین) واتە: جوانکراوە، واتە: خۆشەویستییەکە لایان جوان بووەو لێیان بووەتە شتێکی سروشتیو هیچ عەیبو نەنگی تێدا نابینن، بۆیە هەرگیز بیر لەوە ناکەنەوە وازی لێ بهێنن، ئەمەش ئەوپەڕی پلەی خۆشەویستییە کە خاوەنی خۆشەویستییەکە هەست بە خراپەو زیانی کارەکەی نەکاو نەیەوێ لێی پاشگەز بێتەوە با زیانیشی تێدا تووش ببێ!

جاری وا هەیە مرۆڤ شتێکی پێ خۆشە، بەڵام دەزانێ کە ئەو شتەی ئەو حەزی لێیەتیو خۆشی دەوێ زیانی هەیە نەك سوود، خراپە، چاك نییە، وەکوو جگەرە کێش دەزانێ جگەرە کێشانەکەی زیانی هەیە، بەڵام هەر بەردەوامە لەسەر جگەرەکێشان. جا وێدەچێ کەسێك شتێکی خۆشبوێ کە بۆی جوان نەکرابێ وازی لێ بێنێ! بەڵام کەسێك شتێکی خۆشبوێ کە بۆی جوان کرابێ زەحمەتە وازی لێ بێنێ!!

ئەمجار پەروەردگار یەکە یەکە ئەم شتانەی کە جێگای حەزو خۆشەویستینو هەموو دڵو دەروونێکی ئادەمیزاد دادەگرێ، باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالْأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ﴾.

**یەکەم**: شتێك کە پیاو کەمەند کێش دەکاو دڵو دەروونی دادەگرێو عەقڵو هۆشی لێ دەستێنێ ئافرەتە، چونکە ئافرەت شوێنی حەزی پیاوەو دڵو دەروونی لەگەڵیدا ئارام دەگرێو خۆشەویستییان ئاوێتەی یەکتری دەبێ، وەکوو خودا لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا

﴿وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ هەر ئەم خۆشەویستییەیە کە پیاو زۆربەی ماڵو دارایی خۆی بۆ ئافرەت خەرج دەکا، ئەوەی کە بە عەرەقی ناوچاوانو رەنجی شان بەدەستی دێنێ بەدڵ فراوانی بۆ خێزانی سەرفی دەکا، چونکە پیاو خۆ بە بەرپرسیار دەزانێ لە پاراستنو بەخێوکردنی ئافرەت، دەیەوێ ئەو زێدە هێزو توانایەی کە لەبارەی فسیۆلۆجییەوە هەیەتی تەرخانی بکا بۆ خزمەتی ئافرەت، ئاشکراشە کە زێدەڕەوی پیاوان لە خۆشەویستی ئافرەتدا کاردانەوەیەکی گەورەی هەیە لە کاروباری وڵاتداو، رۆڵێکی گرنگی هەیە لە پێشێل کردنو پاراستنی مافی زۆر کەسدا.

لە ئایەتەکەدا خۆشەویستی ئافرەتی پێش خۆشەویستی منداڵ خست – هەرچەندە خۆشەویستی ئافرەت جاری وا هەیە نامێنێ بەڵام خۆشەویستی منداڵ هەرگیز لەدڵ دەرناچێ – چونکە خۆشەویستی منداڵ زێدەڕەوی تێدا ناکرێ، بە پێچەوانەی خۆشەویستی ئافرەت کە زۆر زیادەڕەوی تێدایە! ئەوەتا لەهەموو چاخو سەردەمێکدا، تەنانەت ئێستایش پیاو بەهۆی خۆشەویستی ئافرەتێکی ترەوە ستەمی لە منداڵی خۆی کردووە، زۆر کەس لەوانەی ژنی تازەیان بەسەر ژنی پێشوویان هێناوە هەرچی خۆشەویستی خۆی هەیە داویەتی بەژنی تازەیو ژنی پێشوویی‌و ماڵو منداڵی پاشگوێ خستوونو، وازی لە بەخێوکردنیان هێناوە، بەڵام زۆر بەدڵ فراوانی پارەو ماڵو سامان بۆ منداڵی ژنی تازەی خەرج دەکا، چونکە دایکی ئەمانی زۆر خۆشتر دەوێ! چەندەها کەسی دەوڵەمەند هەن منداڵەکانیان بەکولە مەرگی ژیان بەسەردەبەن چونکە باوکیان دایکی ئەمانی خۆش ناوێو دڵی بەژنێکی ترەوە پەیوەستە.

**دووەم**: لەشتە خۆشەویستە سروشتییەکان منداڵە. کە مرۆڤ لە کۆمەڵدا شانازی پێوەبکاو پێی خۆشە هەیبێ.

مەبەست لە وشەی ﴿الْبَنِينَ﴾ لە ئایەتەکەدا کورو کچە بەگشتی، چونکە لە ئایەتێکی تردا قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ﴾ پێغەمبەریش دەفەرموێ: (الولد مجبنة مبخلة) واتە: منداڵ مایەی ترسنۆکیو مایەی چرووکییە.

هۆى خۆشەويستى ژن‌و منداڵ درێژە پێدانى زنجيرەى ژيان‌و مانەوەى نەتەوەو وەچەيە، تەنانەت ئەم هەستە لە ئاژەڵيشدا هەيە.

أ- بەهۆى كچ‌و كوڕەوە يادو رەفتارى باشى پياو دواى مردنى بەرقەرار دەبێ.

ب- هيواو هومێدى باوك بەكوڕ لەوەدا كە پيربوو پەكى كەوت بەخێوى بكا، بەڵام كەمتر ئەم هيوايەى بەكچ دەبێ.

ج- كوڕ هومێدى لێ دەكرێ دواى مردنى باوكى جێگاى بگرێتەوەو نەهێڵێ شوێنى كوێربێتەوە، سەركردايەتى خێڵ‌و لێپرسراوێتى گەل‌و وڵات بەدەستەوە بگرێ! بەڵام كچ كەمتر لەم بوارەدا دەورى هەيە.

د- هەست بەوە كەكچ دوايى لەهۆز دەپچڕێ‌و وادەبێ دەدرێ بەشوو بە يەكێكى بێگانەو كەمتر پەيوەندى بەخزم‌و كەسوكارەوە دەمێنێ.

هەرچەندە جارى وادەبێ كچ لەبرێ لەم بوارانەدا لەكوڕ باشترە زياتر فرياى باوك‌و دايكى دەكەوێ؛ بەڵام ئێمە لێرەدا مەبەستمان زۆرينەو بەشێوەيەكى گشتييە.

**سێيەم**: سێيەم شت لەوشتانەى خۆشەويستييان سروشتييە پارەى نەختينەيە لە زێڕو زيوو، هەندێكيش دەڵێن مەبەست لە ﴿الْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ﴾ دينارى زێڕو دیرهەمى زيوە كە سكەيان لێ درابێ! هەندێكيش دەڵێن: مەبەست پارەى سەفتە كراوە.

﴿الْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ﴾ ئاماژەيە بۆ زۆرى ماڵەكە بەجۆرێك كە ببێتە هۆى ئەوە بەتەواوى كاتى خاوەن ماڵ داگيربكاو هيچ مەجالێك نەمێنێتەوە بۆئەوەى كارى خێرى تێدا بكاو خودا پەرستى‌و يارمەتى حەقى تێدا بدا!!

هەر بۆيەشە لەناو هەموو گەل‌و نەتەوەيەكدا، كە پێغەمبەران نێردراون بۆ سەريان دەوڵەمەندەكان يەكەم بەرهەڵستكارو سەرپێچيكەريان بوون‌و دژيان وەستاون، ئەگەر بڕواشيان پێ كردبن‌و ئيمانيان پێ هێنابن كەمتر پابەندى فەرمانەكانى ئايين بوون! سەيرى ئەم ئايەتە بكە كە دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ لَكَ الْمُخَلَّفُونَ مِنَ الْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَا أَمْوَالُنَا وَأَهْلُونَا فَاسْتَغْفِرْ لَنَا﴾ خۆشەويستى ماڵ‌و دارايى شتێكى سروشتييەو لەگەڵ خوێن‌و گۆشتى مرۆڤ تێكەڵاو دەبێ، هۆيەكەشى ئەوەيە كە ماڵ‌و دارايى هۆكارێكى

گرنگە بۆ دەستەبەرکردنی هەموو حەزو ئارەزۆیەك، حەزو ئارەزۆی ئینسانیش زۆرو زەبەندن‌و لە ئەژمار نایەن، هەتا ئینسان مەبەست‌و ئارەزۆیەك بەدەست بێنێ هەوڵی زیاتریەتی! هەتا وای لێ دێ ئەو راستییەی لەبیر نامێنێ کە ماڵ‌و دارایی هۆکارو وەسیلەیە نەك ئامانج‌و مەبەست. ئیتر هەزار فرت‌و فێڵ دەکا بۆ ماڵ پەیداکردن، گوێ ناداتە ئەوە ئاخۆ ئەو ماڵە حەرامە یان حەڵاڵە..

ئیمامی بوخاری‌و ئیمامی موسلیم فەرموودەیەك لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێ پێغەمبەر فەرموویەتی: «لَوْ أَنَّ لاِبْنِ آدَمَ وَادِيًا مِنْ ذَهَبٍ لتمنى أن يكون له ثَالِثٌ، وَلاَ يَمْلأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلاَّ التُّرَابُ، وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ»[1] .

واتە: ئەگەر ئادەمیزاد پڕی دوو دۆڵی لە زێڕو زیوو هەبێ ئاواتە خوازە دۆڵێکی سێیەمی هەبێ!! هیچ شتێك ئادەمیزاد تێرناکا مەگەر گڵ، واتە: گڵی گۆڕ تێری بکا! جا ئەوکاتە خودا تۆبەی تۆبەکاران قبووڵ دەکا.

دیارە زەمکردنی ماڵ‌و دارایی لەبەر خودی ماڵەکە نییە، ماڵ‌و سامان خۆی لەخۆیدا نیعمەتی خودایە، بەڵکوو زەمکردنەکەی لەو رووەوەیە کە سەردەکێشێ بۆ ملهوڕی‌و لەرێ لادان‌و بێ دینی، وەکوو لە سوورەتی (العلق ئایەتی ٦-٧)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى﴾ بەڵام ئەگەر موسوڵمانی دەوڵەمەند لە ماڵەکەی حەقی خوداو ئادەمیزادانی لێداو سوپاسی نیعمەتی خودای لەسەر کرد، صیلەی رەحمی بەجێ هێنا، لەرێگەی خودادا لێی بەخشی ئەوە ئەو ماڵ‌و دارایی خێرو بەرەکەتە، هۆی خۆشبەختی‌و نزیکبوونەوەیە لەخودا! پێغەمبەر لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: « نِعِمْ الْمَالِ الصَّالِحِ لِلرَّجُلِ الصَّالِحِ». واتە: ماڵی رەحمەت باشترین دەسمایەیە بۆ پیاوی باش.

---

[1] - ئەم فەرموودەیە جگە لە بوخاری‌و موسلیم کە لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان کردووە ئەحمەدو بوخاری‌و موسلیم‌و ترمذی لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەتیان کردووە.

**چوارەم**: وڵاخی بەرزەی بەخێوکراوو رامکراوی رەسەنە، ئەو ئەسپانەی کە دەوڵەمەندو ساماندارو سەرەك خێڵو پیاو ماقووڵو هەوڵی پەیداکردنیان دەدەن‌و شانازییان پێوە دەکەن، پێشبڕکێ لە دەستەبەر کردنیاندا دەکەن بۆ خۆهەڵنانەوە پێیان، جا ئەگەر دەستەبەر کردنی ئەم جۆرە ئەسپە بوو بەهۆی کاری شەڕو لەخودا دوور کەوتنەوەو پاشگوێ خستنی واجبات، ئەوە کارێکی دزێوو حەرامە! بەڵام ئەگەر ئەم ئەسپانە ئامادە بکرێن بۆ جیهاد کردن لەڕێگای خودادا ئەوە کارێکی باشە چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ – الأنفال/٦٠﴾.

**پێنجەم**: وشترو رەشە وڵاخ‌و مەڕو بزنە، کە ئەم ئاژەڵانە بناغەی ماڵ‌و دارایی گوند نشینەکان پێك دەهێنن، سامان‌و بژێوییان لەوانە دەستەبەر دەبێ، لادێییەکان خۆیان بە هەبوونی ئەم جۆرە ماڵانە هەڵدەنێنەوە، پەروەردگار منەت بەسەر بەندەکانیدا دەکا کە ئەم جۆرە ئاژەڵانەی بۆ رامکردوون‌و دەفەرموێ: ﴿وَالأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾.

**شەشەم**: کشتوکاڵ کردنە: ئەمیش سەرچاوەیەکی گرنگ‌و هەمیشەییە بۆ ژیانی لادێ‌و شارستانی، هەموو گەل‌و نەتەوەیەك پێویستی بە کشتوکاڵ هەیە، جا ئەگەر مەبەست لە کشتوکاڵ کردن سوود گەیاندن بێ بە ئادەمیزاد ئەوە کشتیارەکە پاداشی دەدرێتەوە، ئەگەر مەبەستی خۆ هەڵنانەوەو خۆ گێف کردنەوە بوو، ئەوە دەبێتە کاری شەڕ.

ئەمجار پەروەردگار لە کۆتایی ئایەتەکەدا وەصفێکی گشتی هەر شەش جۆرەکان دەکاو دەفەرموێ: ئەوانە هۆکاری رابواردنی جیهانن‌و لەژیانی دونیادا خۆشییان لێ دەبیندرێ‌و بەس! بەڵام خۆشی بەڕاستی‌و نەبڕاوە خۆشی ئەو دونیایە، کە لەڕۆژی قیامەتدا پەروەردگار دەیانزانێ.. کەوابوو لەسەر موسوڵمانان پێویستە کە بەهەبوونی ئەم جۆرە شتانە لەخۆیان بایی نەبن، هەر ئەوەندە گرنگییان پێ بدەن کە

بیانکەنە هۆکار بۆ ژیانو، خودا پەرستییان لەبیر نەبەنەوە، چونکە موسوڵمان دەبێ هەوڵ بدا بۆ خۆشبەختی هەردوو دوونیا وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾.

## باسی بەهەشتو جوانیو ڕازاوەیی!

﴿ ۞ قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ ۚ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ (١٥) الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ (١٦) الصَّابِرِينَ وَالصَّادِقِينَ وَالْقَانِتِينَ وَالْمُنفِقِينَ وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحَارِ (١٧) ﴾.

ئەمجار دوای ژماردنو ڕانواندنی ئەو شتانەی کە لەبەر دڵی ئادەمیزاد خۆشەویست کراونو ئادەمیزاد لە ژیانی دونیادا پێیانەوە هەڵەوگیرن لە ئایەتی دواییدا لەشوێنی ئەو شتانە شتی باشترو بەردەوامو هەمیشەیی دەخاتە ڕوو، دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ؟﴾ ئەی محمد! بە ئادەمیزادانی سەردەمی خۆتو لەوەدواش بڵێ: ئایا دەتانەوێ من خەبەرتان بدەمێ بەچەند شتێك کە زۆر باشترن لەو شتانەی کە باسکران؟ بۆیەیش ئایەتەکە بەشێوەی پرسیاری سەلماندن (الأستفهام التقريري) باسەکە دێنێ بۆ زێدە گرنگی پێدان بەو شتانەی باسیان دەکاو جوڵاندنی هەستو شعوور بۆ

رووتێکردنو گوێ راگرتن بۆ وەڵامی پرسیارەکە کە دەڵێ: ﴿لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ هەیە بۆ ئەوانەی تەقوا کارنو لەخودا دەترسن چەند باخو باخاتێك کە بەژێریاندا جۆگەو جۆبار دەکشێنو هەتا هەتایە تێیاندا دەمێننەوە! ﴿وَأَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾ لە شوێنی ئافرەت لەدونیادا کە خۆشەویستی لای پیاو سروشتییە، چەند خێزانێکی جوانو پاكو خاوێنیان دەدرێتێ! کە لەهەموو عەیبو لەکەو خەوشو پیسییەك دوورن.. تەنانەت خوێنی حەیزو خوێنی نیفاسیشیان پێدا نایە. ئەمانە خۆشیو لەززەتی جەستەیین: کە لەبەهەشتا بۆیان دابین دەکرێ! زیاد لەوە لەززەتی گیانییان هەیە کە بریتییە لە ڕەزامەندی خوداو پێی بەهرەوەر دەبنو هیچ لەززەتێکی ئاگاتێ لەهەموو لەززەتە مادییەکان خۆشترو گەورەترە!!

ئایەتەکە لەسەرەتاوە شوێنی رابواردنەکەی دیاری کرد کە باخەکانی بەهەشتە، ئەمجار باسی ئەو شتانە دەکا کە خۆشیو لەززەتەکانیان پێ تەواو دەبێ، ئەویش خێزانی پاكو خاوێنو جوانو بێ خەوشە! ئەمجار باسی گەورەترین نیعمەتی بەهەشت دەکا، ئەویش ڕەزامەندیی خودایەو دڵنیابوونیانە لەوە کە خودا لێیان رازییە، ئیتر بەوە لەززەتی جەستەییو خۆشی گیانییان بۆ دەستەبەر دەبێ، کە بریتییە لەچوونە ناو بەهەشتو گەیشتن بەخێزانی جوانو خاوێنو بێ عەیب. دووەم پاداشی گیانی کە بریتییە لە ڕەزامەندیی خودای پەروەردگار وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ — التوبة/٧٢﴾.

ئەمجار ئایەتەکە بەم رستەیە کۆتایی پێ دێ کە دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ﴾ پەروەردگار ئاگادارو زانایە بە حاڵو چۆنیەتی بەندەکانیو هەموو نهێنییەکیان دەزانێ، ئاگای لە کرۆکی تاعەتو خوداپەرستیانە، هەموو کەسێك بە

ئەندازەی کردەوەی خۆی پاداشی دەدرێتەوە چاکە بە چاکە، خراپە بە خراپە!! چونکە خواپەرستی بە روالەتکاری نیە، بەلکوو خواپەرست ئەوەیە کە پەروەردگار بە خواپەرستی بزانێ! بێگومان ئەم رستەیە مزگێنیو هەڕەشەی تێدایە!

ئەمجار پاش ئەوەی باسی خواپەرستو تەقواکارانی کرد، دێ بڕێ ڕەوشتیان باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ خواپەرست ئەوانەن هەمیشە نزا دەکەنو دەڵێن: خوایە! ئێمە بڕوامان بەو نیگاو پەیامە هێناوە کە بۆ پێغەمبەرانت ناردووە، ئیمانێکی پتەوو دامەزراوو جێگیربوو لە دڵو دەروونماندا هەیە، ئیمانەکەمان بە جۆرێکە لە هەموو کردارو گفتارێکماندا رەنگی داوەتەوە، خوایە! بە عەفوو لێبووردنی خۆت گوناهمان بپۆشە، لە ئاگری دۆزەخ دوورمان بخەرەوە؛ بێگومان زاتی بێچوونت لێخۆشبوو بەرەحمو بەزەییە.

وێڕای ئەو رەوشتانە چەند رەوشتێکی تریان هەیە کە لە غەیری خۆیان جیایان دەکاتەوەو شیاوی ئەو قەدرو رێزەن لەلای پەروەردگاریان ﴿الصَّابِرِينَ وَالصَّادِقِينَ وَالْقَانِتِينَ وَالْمُنفِقِينَ وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالأَسْحَارِ﴾ ئەو خواپەرستانە ئەو رەوشتانەیان تێدا کۆبۆتەوەو کە هەر رەوشتەی پلەو پایەیەکی تایبەتی هەیە ئەو رەوشتانەش ئەمانەن:

ا- صەبرو خۆڕاگرییە، تەواوترین جۆری صەبر ئەوەیە بەردەوام بێ لەسەر کردنی طاعاتو وازهێنان لە خراپەکاری، ئەگەر نەفسو شەهوەت جەختی لێکرد بۆ ئەنجامدانی تاوانێك هیچ رێگاچارە نیە جگە لە صەبر، هەر بە صەبرو خۆڕاگری، بڕوا قایمو پتەو دەبێ، ناهێڵدرێ ئادەمیزاد لە چوارچێوەی شەرع دەربچێ، هەر بەهۆی صەبرەوە ئینسان دەتوانێ شەرەفی خۆی بپارێزێ، تەنانەت رەوشتی صەبر رەوشتێکە دەتوانرێ بگوترێ هەوێنی هەموو رەوشتێکی باشە.

ب- راستگۆیی: ئەمەش رەوشتێکی هەرە بەرزی ئینسانییە! بەسە کە پەروەردگار دەرحەق بە راستگۆ دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِي جَاء بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ، لَهُم مَّا يَشَاءونَ عِندَ رَبِّهِمْ ذَلِكَ جَزَاء الْمُحْسِنِينَ..﴾.

ج- بەردەوام بوون لەسەر خوداپەرستیو گەڕانەوە بۆلای خودا وێڕای ترسان لە خوداو گەردنکەچی بۆ زاتی پاکی. لەخوداترسانیش کاکڵەی خوداپەرستییەو گیانی عیبادەتە.

د- ماڵ بەخشین لە هەموو بوارێکدا کە ئایین بە باشی دابنێ، جا ماڵبەخشینەکە واجب بێ یان سوننەت بێ.

هـ- نزاکردنو پاڕانەوەی بەرەبەیان، واتە: خوداپەرستی لە ئاخرو ئۆخری شەوگاردا، چونکە ئەو کاتە کاتێکی بێ گەردە، دڵ مەشغووڵ نیە بە کاروباری دونیاییەوە.

پێویستە وێڕای نزاو پاڕانەوە تۆبەی راستەقینەو نەصووح هەبێ، کردارو گوفتاری لە سنووری شەرع دەرنەچێ! چونکە نزاو پاڕانەوە بەدەم، هیچ سوودی نیە ئەگەر واز لە خراپەکاری نەهێنێ! چونکە ئەو کەسەی داوای لێخۆشبوون دەکا بەڵام بەردەوامە لەسەر خراپەکاری ئەوە وەکوو گاڵتە بە خودا بکا وایە!! گەورەترین شێوەی پارانەوەش ئەو شێوەیە کە ئیمامی بوخاری لە پێغەمبەرەوە ریوایەتی کردووە کە فەرموویەتی: «سَيِّدُ الاِسْتِغْفَارِ أَنْ تَقُولَ: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأَبُوءُ بِذَنْبِي، اغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ».

سەرورەی داوای تاوانپۆشی ئەوەیە بڵێیت: پەروەردگار! هەر تۆ خودای منی، تۆ تەنها خودای، جگە لە تۆ خودای تر نیە، تۆ منت دروستکردووە، من بەندەی تۆم، وە هەتا ماوم بەردەوام دەبم لەسەر بەڵێنو وادەی تۆ، پەنا دەگرم بەتۆ لە خراپەی کردەوەی خۆم، نازو نیعمەتی تۆم لەبەرچاوە، پێ لە تاوانی خۆم دەنێم، چونکە دەزانم کەسی تر رادەی ئەوەی ناکەوێ کە لە تاوان خۆش بێ جگە لە تۆ.

## شایەتیدان بە تاكو تەنهایی خوداو دادپەروەریی زاتی پاكیو ئایینی پەسەند لای خوا

﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٩﴾ فَإِنۡ حَآجُّوكَ فَقُلۡ أَسۡلَمۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسۡلَمۡتُمۡۚ فَإِنۡ أَسۡلَمُواْ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٢٠﴾ ﴾.

ئیمامی نیسابوری دەفەرموێ: كاتێك پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) كۆچی كرد بۆ مەدینەو دەنگو باسی پەیامەكەی بڵاوبووەوە، دوو قەشە لە قەشەكانی شام بەرێ كەوتن بێنە خزمەتی، كە نزیك شاری مەدینە بوونەوەو چاویان پێ كەوت یەكێكیان بە هاوڕێكەی وت: ئەم شارە زۆر لەو شارە دەچێ كە پێغەمبەری ئاخر زەمانی تێدا دەبێ! كە هاتن پێغەمبەریان بینی بە رەفتارو رەوشتی ناسییان، وتیان: تۆ موحەممەدی؟ فەرمووی: بەڵێ: وتیان: تۆ ئەحمەدی؟ فەرمووی: بەڵێ: ئەمجار وتیان: ئێمە پرسیاری شایەتییەكت لێ دەكەین ئەگەر زانیت ئیمانت پێ دەهێنینو بڕوات پێ

دەکەین، پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پرسیار بکەن! وتیان: گەورەترین شایەتیدانمان پێ بڵێ کە لە قورئاندا هاتبێ؟! ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتانەی نارده خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿شَهِدَ اللّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُواْ الْعِلْمِ قَآئِمَاً بِالْقِسْطِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ پەروەردگار تاكو تەنیاییو خودایەتی خۆی بۆ هەموو دروستکراوانی خۆی روون کردۆتەوە – یان پەروەردگار لە خودایەتی راستو بەحەقدا تاكو تەنیایە، بەڵگەی دروستکاریو کارگێڕی زۆرو زەبەندن لەسەر ئەم راستیە، هەر بۆخۆی خودایە لە بوونەوەرداو کەسی تر شیاوی خودایەتی نیە – ئەم راستییەی بە فریشتەکانی راگەیاندووە، ئەوانیش شایەتیان بەم راستییە داوە، هەروەها زانایانیش ئەم راستییەیان پێ راگەیاندراوە، ئەوانیش بە بەڵگەو دەلیل شایەتیان بەم راستییە داوە!!

بەڕاستی ئەمە رێزێکی تایبەتیە بۆ زانایان کە پەروەردگار کردوونی بە شایەت لەسەر خودایەتی خۆی.

ئیمامی ئەعمەش دەڵێ: من شایەتی دەدەم بەوەی کە خودا شایەتی پێداوە ئەم شایەتیە بە ئەمانەت لای خودا دادەنێم.

هەروەها شایەتی دەدەن کە خودا دادپەروەرە لە هەموو کاتو شوێنێکدا، لە هەموو بوارێکدا؛ لە بوونەوەرو دروستکراوانیدا، دادپەروەریش ئەوەیە کە لە حوکمدا فەرمان بە عەدل بکا، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ– النحل/٩٠﴾. یان لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ – النساء/٥٨﴾.

پەروەردگار دادپەروەرە لە یاساو شەریعەتدا، لە هەموو بوونەوەردا، لەوەدا کە بەو شێوە رێكو پێکە یاسای گەونی داناوە، هاوکێشەو بەرامبەری کردووە لە نێوان هێزە رۆحیەکانو هێزە مادییەکان، تەرازوویەکی وردخوێنی داناوە بۆ بەراورد کردن لە بارەی حوکمو ئەرکو واجباتدا، لە نێوان بەندەکانی خودادا، لە نێوان تاكو کۆمەڵدا، لە نێوان هەژارو دەوڵەمەندا.

ئەمجار پەروەردگار جەختی لەسەر تاكو تەنیایی خۆی كردۆتەوەو دەفەرموێ: ﴿لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ﴾ هیچ خودای بە حەقو راست نین جگە لە زاتی خۆی ﴿الْعَزِيزُ﴾ خودایەكی بەهێزی وایە كەس نایوێرێتێ، قودرەتو توانای بێ وێنەیە، دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا دەشكێ، گەورەیەو گەورەییەكەی بە سامو هەیبەتە، ﴿الْحَكِيمُ﴾ هەموو شتێك لە شوێنی شیاوی خۆی دادەنێ، گوفتارو كردارو شەرعو قەزاو قەدەری هەمووی رێكو پێكە، بێ عەیبو كەمو كورییە، چونكە لە عیلمو زانیاری رەها (مطلق)ەوە هەڵقوڵاونو هیچ شتێك لە بوونەوەردا لە ژێر دەسەڵاتی ئەو دەرناچێ.

﴿إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ﴾ بێگومان ئایینی پەسەندو مەقبووڵ لای پەروەردگار ئایینی ئیسلامە، ئەو ئایینەی كە بریتیە لە ئاشتیو صوڵح لەگەڵ ئادەمیزادانداو گەردنكەچی تەواو بۆ خوداو بەندایەتی بۆ كردنی. موسوڵمانی راستەقینە ئەو كەسەیە كە بە هیچ شێوەیەك دیاردەی شەریك بۆ خودا قەراردان لە كردارو گوفتاریدا نەبێ، لەگەڵ بیروبڕوای خۆیدا راستاڵ بێ، چونكە پەروەردگار ئایینی بۆ دوو مەبەستی سەرەكی ناردووە:

ا- راست كردنو پاك كردنەوەی عەقیدەو بیروباوەڕ لە هەموولاریو عەیبو خەوشێكو كورت هەڵهێنانی خودایەتیو پەروەردگاریەتی لە زاتی بێچووونیدا.

ب- دووەم پاك كردنەوەی دڵو دەروونو نیەت خالصی بۆ خوداو بۆ بەندەكانی بە جۆرێك كە لە كردارو گوفتاریدا رەنگ بدەنەوە.

ئەم ئایەتە ئیعلانو ئاگاداركردنەوەی ئادەمیزادە كە پەروەردگار هیچ ئایینێك قبووڵ ناكاو لای پەسەند نیە جگە لە ئیسلام، ئیسلامیش ئەو ئایینە سەرەكیەیە كە پێغەمبەران هێناویانە، هەر لە ئادەمەوە تا حەزرەتی (محمد) كە دوا پێغەمبەرە.. پێغەمبەران یەكە یەكە بانگەوازییان بۆ ئیسلام كردووە. واتە: ناوەرۆكی ئیسلام بریتییە لە شوێنكەوتنی ئەو ئایینو شەریعەتانەی كە پێغەمبەران هێناویانە، چونكە ئایینەكان هەموویان – هەرچەندە لە لقو پۆپدا جیاوازیان بووبێ بەڵام لە بنەماو ناوەرۆكدا بانگەوازییان بۆ یەك شتی سەرەكی كردووە ئەویش یەكتاپەرستی خوداو

ئاشتیو دادپەروەرییە لە هەموو شتێکدا، کە وابێ کەسێك دوای ناردنی پێغەمبەری ئیسلام ئاینێکی تر پەسەنەد بکا، خودا لێی وەرناگرێو کردەوەی رەت دەکرێتەوەو خەسارەتمەند دەبێ. ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ – آل عمران/٨٥﴾.

ئیبنو جەریر لە قەتادەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئیسلام بریتییە لە شایەتیدان بەوە کە جگە لە خودا هیچ خودای تر نین، دان نان بەو یاساو دەستورەی لە خوداوە هاتووە، ئیسلام ئاینێکە خودا بۆخۆی دایناوەو پێغەمبەرانی پێ ناردوون.

﴿وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ﴾ ئەوانەی کتێبی ئاسمانییان دراوەتێ – جولەکەو فەلە – نەکەوتنە کێشەو نیزاعەوە، لەو ئایینە ئیسلامە دەرنەچوون کە پێغەمبەرەکانیان بۆیان هێنا بوون، نەبوونە کۆمەڵو گرۆ گرۆ ﴿إِلاَّ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ﴾ مەگەر دوای ئەوەی زانیاری تەواویان بۆ هاتو لێیان روونو ئاشکرا بوو کە (محمد) پێغەمبەرەو ئایین یەك ئایینەو نابێ جوداوازیو کێشەی تێدا بەرپا بێ، بەڵام ئەوان لەبەر ملهوڕی خۆیان بەهۆی حەسوودیو دڵ پیسی خۆیان کێشەیان تێکەوتو تەفرەقەیان نایەوە، هیچ بەڵگەیەکیشیان بەدەستەوە نەبوو جگە لەوەی حەسوود بوون، دەترسان ئەگەر ئیمان بە پێغەمبەر بێنن دونیا خواردنیان لەدەست دەرچێ، رێگای چەسپاندنەوەو دەستبڕینی خەڵکی ساویلکەیان لێ ببەسترێ، ئەگینا لە کتێبەکانی خۆیاندا نیشانەی پێغەمبەریان پێ راگەیەنرابوو، باش باش دەیان ناسی، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءهُمْ – البقرة/١٤٦﴾. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بڕوایان پێ نەکردو موسوڵمان نەبوون، بۆ خۆیشیان لە ناو خۆیان بوونە تاقم تاقمو گرۆ گرۆ هەریەکەیان بیروڕای خۆی بەلاوە راست بوو، پێی وابوو: ئەو لەسەر حەقەو ئەوانی تر ناحەقن!! مێژووش شایەتی ئەوەیە: کە پاشاو قەشەکانی مەسیحی بوون یەکەم کەس کە ناوا ئایینی (مەسیحی)یان گۆڕیو ئەو هەموو جوداوازیو گۆڕانکارییەیان تێدا پەیدا کردو دوژمنایەتییان خستە

ناوخەڵکەوەو وایان کرد جەنگ لەیەکتری بهێنن‌و دەستیان بچێتە خوێنی یەکترەوە، ئاریۆس‌و کۆمەڵەکەی کە بانگەوازییان بۆ یەکتاپەرستی دەکرد مەلیك قسطنطین ساڵی ٣٥٢ی ز لیژنەیەکی پێك هێنا بۆ دادگایی کردنی‌و، فەرمانی بێدینی‌و لە ئایین وەرگەڕانی بەسەردا دراو کتێبەکانی سوتێنران‌و قەدەغەکران، دوایی کە ڕێبازەکەی جارێکی تر سەری هەڵدایەوە تیودوسیس)ی دووەم فەرمانیدا بە قەڵاچۆکردنی ئاریوسیەکان‌و ساڵی ٦٢٨ی ز قانونێکی دەرکرد بۆ فەوتاندنی ئەو ڕێبازە.

بە کورتی‌و پوختی کێشەو نیزاعیان لە بنەمای ئایینی ڕاستداو لە پێغەمبەرایەتی (محمد)دا بەهۆی خۆ سەپاندن‌و ملهوڕی هەندێکیان بوو بەسەر هەندێکیاندا. بەهۆی حەسوودی بردن بەیەکتری‌و یەکتردزان‌و پشت لێ هەڵکردنیان لەیەکتری بوو! هەندێکیان لە هەموو شتێکدا دژایەتی هەندەکەی تریان دەکرد، تەنانەت ئەگەر ئەویان سووڕ بیزانیایە کە بۆچوونی ئەمیان ڕاست‌و دروستە ئەوە هەر دژی دەوەستاو بەلایانەوە هەڵەبوو!!

﴿وَمَن يَكْفُرْ بِآيَاتِ اللّهِ فَإِنَّ اللّهِ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾ کەسێك بڕوای بە نیشانەکانی خودایەتی پەروەردگار نەبێ‌و، دیاردەکانی خودایەتی خودا لە نەفسی ئادەمیزادو لەبوونەوەردا بە درۆ بخاتەوەو بڕوای بەو فەرمان‌و پەیامانە نەبێ کە خودا لە قورئاندا ناردووینە خوارەوەو داوای پابەند بوون بە ئایین‌و یەکتاپەرستی دەکەن، ئەوە با بزانێ خودا لەسەر ئەوە تۆڵەی لێ دەستێنێ‌و سزای دەدا. ﴿فَإنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلّهِ وَمَنِ اتَّبَعَنِ﴾ جا ئەگەر جولەکەو فەلە، یان کافرەکانی تر کێشەو نیزاعیان لەگەڵدا کردی‌و عاریان نەناو وازیان لە هەڵوێستی خۆیان نەهێنا!! ئەوە پێیان بڵێ: من بەندایەتی خۆم بۆ خودای پەروەردگار ئەنجام دەدەم، بڕوای پتەوم هەیە کە کەس هاوبەشی نیە کەس بەرامبەری ناکاو ناتوانێ ڕقەبەرایەتی لەگەڵدا بکا، نەمنداڵی هەیە نە خێزان لەکەس نەبووەو کەسی لێ نەبووە!! ئەمە بیروباوەڕی خۆم‌و ئەوانەیە کە شوێنم کەوتوون‌و سوورین لەسەر ئەم هەڵوێستەمان. وەکوو لە ئایەتێکی تردا

دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللّهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾.

بەکورتی دەمەدەمێ‌و موناقەشە لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا هیچ سوودێکی نیە، چونکە موناقەشەو دەمەدەمێ بۆ شتێکە کە شاردراوەیەکی تێدا بێ!! دەی خۆ لێرەدا ئەو هەمموو بەڵگانە هێنرانەوە لەسەر تاک‌و تەنیایی خوداو بێ شەریکی‌و بێ هاوەڵی خودا، کەچی ئەوان هەر کەمەندکێش نەبوون‌و نەهاتنە سەر رێگای راست، ئیتر تۆ روویان لێ وەرگێڕەو وازیان لێ بێنە، چونکە هیچ سوودی نیەو کات بە فیڕۆدانە.

﴿وَقُل لِّلَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ وَالأُمِّيِّينَ أَأَسْلَمْتُمْ﴾ ئەی موحەممەد! بە جولەکەکان‌و فەلەکان بڵێ هەروەها بە هاوبەشپەیداکەرەکانی عەرەبیش بڵێ: ئایا موسوڵمان بوون‌و هاتنە سەر رێگای ئیسلام دوای ئەوەی کە بەڵگەتان بۆ شی کرایەوەو نیشانەی راستی پەیامی ئیسلامتان بۆ روون بووەوە یان هەر لەسەر کوفرو گومڕایی خۆتان بەردەوامن؟؟ ﴿فَإِنْ أَسْلَمُواْ فَقَدِ اهْتَدَواْ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ وَاللّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ﴾ جا ئەگەر موسوڵمان بوون‌و وازیان لە خواری‌و چەوتی هێنا، ئەوە رێگای راستیان دۆزیوەتەوەو رێگای گومڕاییان بەرداوە، خۆ ئەگەر روویان وەرگێڕاو دانیان نەنا بە راستیەکانداو داخوازییەکەی تۆیان ئەنجام نەدا، ئەوە پێی دلگران مەبەو زیانی بۆ تۆ تێدا نیە.. چونکە کاری تۆ راگەیاندنەو بەس: بە رێک‌و پێکی ئەرکی خۆت ئەنجامداوە، پەروەردگار ئاگاداری بەندەکانی خۆیەتی حاڵ‌و چۆنیەتییان دەزانێ، ئاگاداری ئەوانەیە کە چاوی خۆیان لە ئاست راستییەکان دەنوقێنن، دەزانێ کێ شیاوی هیدایەتەو شارەزایی بوونە، کێ شیاوی گومڕایی‌و سەر لێ تێکچوونە، هەرکەسە بەگوێرەی کردارو گوفتاری خۆی سزاو پاداشی پێویست وەردەگرێ.

## سزاو تۆڵە ستاندنەوە لەوانەی پێغەمبەرانیان شەهید کردن

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقۡتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَيَقۡتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡقِسۡطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٢﴾﴾.

ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەوەی ئیسرائیل لە چێشتنگاوی رۆژێکدا بەیەك سەعات (٤٣) چل و سێ پێغەمبەریان شەهید کرد. لە ریوایەتێکی تردا (١١٢) سەدو دوانزە، لە ئەبو عوبەیدەوە دەڵێ: (١٧٠) خوداپەرستو عاقڵو هۆشمەندانی نەوەی ئیسرائیل کەوتنە خۆو دەستیان بە ئامۆژگاریو فەرمان بەچاکەو نەهی لە خراپە کرد، لە دەمەو ئێوارەی هەمان رۆژدا هەرهەموویان شەهید کردن، پەروەردگار لەم ئایەتانەی دواییدا باسی ئەوانە دەکاو وەکوو هەڕەشە ئاراستەی جولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەری دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَيَقْتُلُونَ الَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِالْقِسْطِ مِنَ النَّاسِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئەو جولەکانەی ئینکاری ئایەتی خودا دەکەنو نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی (محمد) کە لە کتێبەکەیاندا هەیە ژێر لێوی دەخەنو دەیشارنەوە، (یان مەبەست ئەو جولەکە پێشینانەیە کە لە رۆژگاری خۆیانا بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان نەکردووە، ئایاتە نێردراوەکانیان بەدرۆ خستۆتەوە) سەرباری ئەوەش ئەو جولەکە پێشینانە (کە ئەو جولەکانەی سەردەمی پێغەمبەر نەوەو وەچەیانن)

پێغەمبەرانیان شەهید کردووە وەکوو ئەو شێوە درندەییەی لەگەڵ حەزرەتی زەکەریاو یەحیایان کرد هیچ حەق و مافێکیشیان بەسەرەوە نەبوون، جگە لەوە کە دەیانگوت (ألله) پەروەردگارمانەو بانگەوازی حەقیان دەکردو پەیامی خودایان دەگەیاندو، ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام دەدا هەر لەسەر ئەوە شەهیدیان کردن! بەوەشەوە نەوەستان، بەڵکوو ئەو عاقڵ و هۆشمەندانەی کە دستیان بە ئامۆژگاری خەڵکەکە کردو فەرمانیان بە چاکەو نەهیان لە خراپە دەکرد، ئەوانیشیان شەهید کرد، جا ئەی (محمد!) هەواڵ بدە بەو جولەکانەی سەردەمی خۆت کە لەسەر ڕێ و شوێنی باوک و باپیری خۆیان دەڕۆن بە سزای توندو بە ئێش لە دونیاوو قیامەتدا، ئەوانەی ئەو جۆرە تاوانەیان ئەنجام داوە لە گومڕایی دا ڕۆچوون. ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ﴾ ئەوانە کردەوەیان لە دونیاو قیامەتدا پوچ و بەتاڵە، هیچ سوودی لێ نابینن، لە ڕۆژی دواییدا کەس پاڵپشتیان نیەو لە سزای خودا بەرگرییان لێ ناکا.

هەواڵدان لە جولەکە بەد ڕەفتارەکانی سەردەمی کۆن و نیسبەتی کوفر بۆ لای جولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەم ڕووەوەیە کە ئەو جولەکانەی سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕازی بوون بە کردارو هەڵوێستی جولەکە پێشینەکان و شانازییان پێوە دەکرد، بەڵکوو ئەوانیش بەتەما بوون و هەوڵیشیان دا کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) شەهید بکەن! بەڵام بۆیان نەکرا: بەڵکوو لە صەحیحی سوننەتدا هەیە کە پێغەمبەر لەسەرە مەرگدا دەیفەرموو: «مَا زِلْتُ أَجِدُ مِنَ الأَكْلَةِ الَّتِي أَكَلْتُ بِخَيْبَرَ فَهَذَا أَوَانُ قَطَعَتْ أَبْهَرِى ». واتە: هێشتا هەست بە ئێش و ئازاری ئەو گۆشتی مەرە دەکەم کە لە خەیبەردا خواردم، هاکا بندی دڵی پچڕاندم)[1]

---

[1]- بڕوانە التاج الجامع للأصول ج٢ ص١٩٥ عمدة القاريء ج/١٨ ص٦٠

**لێرەدا چەند حوكمێك هەیە كە پەیوەندی بە فەرمان بەچاكەو نەهی لە خراپەوە هەیە:**

١- ئەهلی سوننە دەڵێن: مەرج نیە ئەو كەسەی بە كاری فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپە هەڵدستێ عادڵ بێ، بەڵكوو پێویستە هەر كەسە لە عاست خۆیەوە ئەو ئەركە ئەنجام بدا.

٢- ئیبنو عەبدول بەڕ دەڵێ ئیجماعی موسوڵمانان لەسەر ئەوەیە كە پێویستە هەر كەسێك بتوانێو دەسەڵاتی هەبێ بەكردەوە دژی مونكەرو كاری نارەوا بوەستێ ئەگەر نەیتوانی با بە زمان دژی بوەستێ، ئەگەر نەیتوانی با بە دڵ پێی ناخۆش بێ، ئەو كەسەیش كە بە دڵ پێی ناخۆشە باوەڕی تەواو كزە.[٢]

لەم بارەوە زۆر فەرموودە لە پێغەمبەرەوە گێڕدراوەتەوەو بوارەكانی پەیڕەوكردنیان زۆرو هەمەجۆرن، بەڵام مەرجە دەبێ ئەو كەسەی بەو كارە هەڵدەستێ تواناو دەسەڵاتی بەرگری هەبێ.. ئەبو سەعیدی خودری دەفەرموێ: لە پێغەمبەرم بیست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيْمَانِ». واتە: هەركەسێك لە ئێوە شتێكی نارەوای بینی با بە كردەوە بەرگری بكاو هەوڵی گۆڕانو قەڵاچۆ كردنی بدا، ئەگەر نەیتوانی با بە زمان هەوڵی نەهێشتنی بدا، ئەگەر نەیتوانی با بەدڵ پێی ناخۆش بی بەڵام ئەوە لاوازترین باوەڕە...).

زانایان دەڵێن: فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپە بەكردەوە ئەوە ئەركی كاربەدەستو لێپرسراوانە، بە قسەو ئامۆژگاری، ئەركی زانایانە بە پێ ناخۆشبوونی دڵ، ئەركی بێ دەسەڵاتو رەشە خەڵكو بۆرەپیاوە.

٣- كەی فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپە وازی لێ دەهێنرێ؟؟

---

[٢] - ریاض/٢/٢١٥ كوردی ز/٢٣.

ئیبنو ماجە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! کەی فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە واز لێ بێنین؟؟ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکاتێ لە نێو ئێوەدا ئەو دیاردە دزێوەی نەتەوەکانی پێشوو پەیدا بوو، واز لە فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە بهێنن، وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ) ئەو دیاردە دزێوە چیە کە لە ناو گەلو نەتەوەکانی پێشوودا پەیدا بووە؟؟ فەرمووی: هەرکاتی ناکەس بەچەو ناڕەسەنەکانتان بوون بە سەرۆكو پاشاتانو، لە ناو پیاوماقووڵو خانەدانەکانتاندا تاوانکاریی‌و بێ شەرمیی بوون بە باو، وە زاناکانیشتان بەدکارو بێ دین بوون.

## پشت هەڵکردنی جولەکە لە حوکمو بڕیاری خودا

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَابِ اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلَّا أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ ۖ وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَاهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

ئەمجار پاش ئەوەی باسی خراپەکاری جولەکەکانی کرد کە بریتی بوو لە پشت هەڵکردنیان لە بانگەوازیی پێغەمبەرانو شەهید کردنیان بە شێوەیەکی دڕندانە، بۆ

ئەوەی دڵنەوایی پێغەمبەر بکاو ئەوەی بۆ روون بکاتەوە کە بە پێرەوە نەهاتنی ئەو جولەکانە بۆ بانگەوازیی ئیسلامی شتێکی سەیر نیە، ئەو سەرپێچی کردنەیان هەر لە کۆنەوە هەبووەو، شتێکی سروشتیو هەمیشەییان بووە، لەگەڵ هەموو پێغەمبەرەکاندا، بە درێژایی مێژوو ئەوە هەڵوێستیان بووە! کەوابێ تۆش ئەی موحەممەد! دڵت بەخۆ نەمێنێو خەفەتیان لێ مەخۆ!!

دوای ئەم روون کردنەوەیە دێتە سەر باسکردنی هەڵوێستێکی سەیرتریان، ئەویش ئەوەیە کە ئەو جولەکانە تەنانەت بڕوا بە کتێبی خۆشیان ناکەنو هەرکاتێ حوکمی تەورات بە دڵیان نەبوو پشتی لێ هەڵ دەکەنو پابەندی نابن!! ئەوانە تاقمو گرۆیەکی سەیرن، خۆیان بەلاوە زۆر پەسەندە، بەوە لە خۆ بایی بوون کە لە نەوەی پێغەمبەرانن و پێیان وایە ئەوە کیفایەتە بۆ رزگاربوونیان لە سزای دۆزەخ، بۆیە گوناهکردنیان بەلاوە شتێکی ئاساییەو هیچ کاتێ کۆ لە تاوانکردن ناکەن!

ئیبنو حاتەمو ئیبنو مونذیرو ئیبنو ئیسحاق لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە: دەڵێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چووە ناو باڵەخانەی میدراس (خوێندگایەکی جولەکە بوو بۆ لێکۆڵینەوەو خوێندنی تەورات) بۆ لای کۆمەڵێك جولەکەو بانگەوازی کردن بۆ ئیمان هێنان بە خودا، نەعیمی کوڕی عەمرو (الحارث)ی کوڕی زەید پێیان وت: ئەی موحەممەد! تۆ بۆخۆت لەسەر ئایینی کێی؟؟؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: من لەسەر ئایینو رێبازی ئیبراهیمی خەلیلم، وتیان: ئیبراهیم جولەکە بوو! پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموون نەخەیر وانیە، ئەوە تەوراتو بیهێنن با لە نێوانماندا حەکەم بێ. بەڵام ئەوان ملیان نەداو نەهاتنە سەر رێگا، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتانەی ناردە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ﴾ ئەی موحەممەد! سەیری هەڵسوکەوتی ئەو کۆمەڵە جولەکەیە بکەو سەرت سوڕبمێنێو شیاوی ئەوەشن لێیان سەرسام بێ! ئەو کۆمەڵەی کە بەشێك لە تەوراتیان – وەکوو خۆی – لا ماوەتەوە زۆربەی زۆریشیان فەوتاندویانە یان گۆڕیویانە چونکە تەورات پێنج سەد ساڵ دوای حەزرەتی مووسا

نووسراوەتەوە، هیچ بەڵگەیەکیش نیە کە مووسا نووسیبێتیەوە، تەنانەت نازانـدرێ بـە چ زمانێ نووسـراوەتەوە، هـیچ بەڵگەیـەکیش نیـە کـە حـەزرەتی مووسـا زمـانی عیـبری زانیبێ!!

مامۆسـتا سـەید قوطـب دەفـەرموێ: ﴿نَـصِيبًا مِّـنَ الْكِتَـابِ﴾ کـە تەوراتـە بـۆ جولەکەو ئینجیلە بۆ نەصرانییەکان، کە هـەردووکیان بەشـێکن لـە کتێبـی خـودا، لـەم رووەوە کە کتێبـی خـودا بـریتی بـێ لـە هـەموو ئـەو کتێبانـەی کـە بـە نیگـا نـاردوونی بۆسەر پێغەمبەرانو تاکو تەنیایی خۆی تێدا چەسپاندوون، کەوابێ لە راستیدا کتێبی ئاسمانی یەك کتێبەو لەیەك سەرچاوە هەڵقوڵاوەو یەك مەبەستی هەیـە؛ بەشـێك لـەو کتێبـە سـەرەکییە دراوە بـە جولەکـە، بەشـێکی لێ دراوە بـە نەصـرانییەکان، ئـەمجار پوختـەو کاکڵـەی هـەموو ئـەو کتێبـە دراوە بـە موسـوڵمانان کـە قورئانـەو کۆکـەرەوەی هەموو بنەما ئاینییەکانەو پاڵپشتو تەئییدی کتێبەکانی پێش خۆی دەکا.

﴿يُدْعَوْنَ إِلَى كِتَابِ اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ﴾ سەرسوڕمانەکە لەوەدایـە ئـەو جولەکانـە بەشێکیان لە کتێبی ئاسمانی دراوەتێ، بۆ خۆیان داوا دەکـەن بـە گـوێرەی ئـەو کتێبـەی خۆیان حوکمیان بکرێ! کەچی دوایـی کـە بـە گـوێرەی ئـەو کتێبـە حوکمیـان بەسـەردا دەدرێ هەموویان گوێبیستی نـابنو حوکمەکـەیان پـێ تەحـەممول نـاکرێ، کۆمـەڵێکیان پشتی لێ هەڵ دەکەنو نایانـەوێ کتێـبو شـەریعەتی خـودا یاسـایان بـێ، بـەجۆرێك کـە ئەوە دەگەیەنێ کە هیچ بڕوایەکیان بە کتێبی خودا نیەو، هەر دەڵێی ئەهلی کیتـابیش نین، سـەیرەکە لەوەدایـە ئـەوان حوکمێـك کـە مـوافیقی حـوکمی کتێبـی خۆیانـە ڕەتـی دەکەنەوە، دەی دەبێ بەچ حوکمێکی تر ڕازی بن؟!

ئـەوەبوو کاتێـك بـڕێ پیاوماقوڵێـان زینایـان کردبـوو؛ ویـستیان پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە حوکمیان بکا، ئەویش حوکمێکی بەسەردا دان کە لەگەڵ ناوەرۆکی تەورات یەك بوو، کەچی پێـی ڕازی نـەبوونو پـشتیان لێ هـەڵکرد. ئەوانە بە سروشت سەرپێچیکەرن! ئەگەر بـانگ بکـرێن یـان خۆیـان داوا بکـەن کـە بـە گوێرەی تەورات حوکمیان بکـرێ ﴿ثُمَّ﴾ پاشـان کـە ئاکـامی دادگـایی کردنەکـەیان بـەدڵ

نەبوو ﴿يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ﴾ کۆمەڵێکیان پشتی لێ هەڵ دەکەن‌و، رووی لێ وەر دەگێڕن!! دیارە برێکیشیان رێگای حەق دەگرن‌و بڕوا بە قورئان دەکەن‌و موسوڵمان دەبن...

ئەمجار لەم ئایەتەی دوایی دا هۆی ئەو پشت هەڵکردنە روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلاَّ أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ﴾.

ئەو مل نەدان‌و نەهاتنە سەر رێگای راست‌و بێ باکییەیان لە سۆنگەی ئەوەوەیە: کە بڕوایان وایە: چەند رۆژێك نەبێ بە ئاگر سزا نادرێن، پاش سزادانێکی کەم دەخرێنە ناو بەهەشتەوە ﴿وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾ هیچ موبالاتێك بە گوناهکردن نادەن‌و تاوانکردنیان بەلاوە شتێکی ئاساییە، چەندەها درۆو دەلەسەیان هەڵبەستووە، بەوە دەنازن کە نەژادیان دەچێتەوە سەر پێغەمبەران، دەمێك دەڵێن: ئێمە کوڕی خوداین، یان دەڵێن: ئێمە خۆشەویستی خوداین، یان دەڵێن: پێغەمبەران شەفاعەتمان بۆ دەکەن، ئێمە مندالی پێغەمبەرانین، یان دەڵێن: ئێمە نەتەوەی هەڵبژاردەی خوداین، یان دەڵێن: خودا وادەی بە یەعقووب داوە کە نەوەکانی – ماوەیەکی کەم نەبێ – سزایان نەدا.

ئابەو جۆرە پڕوپاگەندە بۆ خۆیان دەکەن‌و بە خەیاڵ شت بۆ خۆیان هەڵدەبەستن وەکوو لە سوورەتی (البقرة)دا ئایەتی/٨٠ راڤە کرا کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلاَّ أَيَّاماً مَّعْدُودَةً قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ اللّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ اللّهُ عَهْدَهُ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾.

شایانی باسە دەربارەی ئەوەی دەڵێن: چەند رۆژێك نەبێ ناخرێینە دۆزەخەوە هیچ شتێکیان بۆ نەچەسپاوە، هەندێکیان دەڵێن: ماوەکە چل رۆژە، بەئەندازەی ئەو ماوەیەی کە گوێرەکە پەرستیان کردووە.

جا خۆ ژیانی دوونیا کورتەو هەمووی پێچی مێژەرێکە، ﴿فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَاهُمْ لِيَوْمٍ لاَّ رَيْبَ فِيهِ﴾ دەی باشە چی دەکەن‌و هەڵوێستان چی دەبێ ئەو کاتەی ئێمە

زینـدوویان دەکەینـەوەو رۆژی قیامـەت لـە گۆڕەپانی حەشـردا کۆیـان دەکەینـەوە بـۆ حیسابو لێکۆڵینەوە؟؟ خۆ ئەوکاتە ئەم درۆو دەلەسەیەیان بۆ بەسەر ناچێ؟ ئەو رۆژە هەر دێو هیچ شكو گومانی تێدا نیە، رۆژێکە کەس وەسەر کەس ناپرژێ نەسەبو نەژاد نامێنێو دەوری نابێ، ماڵو منداڵو سامان هیچ سوودێکیان نیە، پیاو لەبەر خێزانی خۆی هەڵدێ! لەبەر کورو کچو باوكو دایك رادەکا، خۆ لە براو خوشكو کەسو کاری دەشارێتەوەو نایەوێ بیان بینێو بیبینن! ﴿وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾ هەموو کەسێك چی کردبێ لە خێرو شەڕ دێتەوە رێگایو ئاکامەکەی وەردەگرێتەوەو بەبێ ئەوەی کەس زیاد لە سزای شیاوی خۆی سزا بدرێ، هیچ ستەمی لێ ناکرێ،تەرازووی عەداڵەت دادەنرێ، کردار رۆڵ دەبینێ، هەرکەسێك بە ئەندازەی گەردیلەیەك چاکەی کردبێ یان خراپەی کردبێ بۆی دێننە پێشەوەو حیسابی لەسەر لەگەڵ دەکەن، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ﴾.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە قەتادەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: (پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) داوای لە خودا کرد کە سەڵتەنەتی فارسو رۆم بدا بە ئوممەتی؛ ئیتر ئەم ئایەتەی دوایی هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاء وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاء وَتُعِزُّ مَن تَشَاء وَتُذِلُّ مَن تَشَاء بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾.

## برێ بەڵگەو نیشانەکانی دەسەڵاتو گەورەیی خوداو گۆڕانکاری لە بوونەوەردا

﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِي ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ

إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾ تُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ وَتُخْرِجُ ٱلْحَيَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَيِّ وَتَرْزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢٧﴾ ﴾.

ئیبنو عەبباس‌و ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێن: کاتێک کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) شاری مەککەی کۆنترۆڵ کرد بەڵێنی بە هاوەڵانی دا کە زۆری پێ ناچێ ئوممەتەکەی سەڵتەنەتی فارس‌و ڕۆم وەدەست دەهێنن‌و کۆنترۆڵی هەردوو ئیمپراتۆری فارس‌و ڕۆم دەکەن! دوو ڕووەکان‌و جولەکەکان بەلاقرتێوە دەیانگوت: ئەوە خەیاڵ پڵاوە، موحەممەدو هاوەڵانی لە کوێ سەڵتەنەتی فارس‌و ڕۆم لەکوێ؟! فارس‌و ڕۆم زۆر لەوە بەهێزترن کە موحەممەدو هاوەڵانی بتوانن کۆنترۆڵیان بکەن! بۆچی محمدو هاوەڵانی بە مەککەو مەدینەوە تێر ناخۆن چاویان بڕیوەتە موڵک‌و سەڵتەنەتی فارس‌و ڕۆم؟! ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ.....﴾

پەیوەندی ئەم ئایەتانە بە ئایەتەکانی پێشووەوە لەوەدایە کە دەبنە دڵنەوایی کردن بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەبەرامبەر هەڵوێستی دوژمنکارەی کافرو جولەکەکان کە بە هەموو جۆرێک ئینکاری پێغەمبەرایەتی پێغەمبەریان دەکرد، کافرەکان دەیانگوت: نابێ پلەی پێغەمبەرایەتی بدرێ بە کەسێک خواردن بخواو بەناو بازاڕدا پیاسە بکا!! ئەهلی کیتابیش پێیان وابوو پێغەمبەرایەتی هەردەبێ لە ناو نەتەوەی ئیسرائیل بێ، نابێ پێغەمبەر لە نەتەوەی تر بنێردرێ! هەروەها ئایەتەکان بیرخستنەوەی پێغەمبەرە بە باڵادەستی خوداو ڕەهایی دەسەڵاتی بەسەر بوونەوەرداو وادە پێدانە بەوە کە خودا ئایینی خۆی سەردەخاو ئاڵای (لا إله إلا الله) بەسەر پانتایی ئەو ئیمپراتۆڕانەدا دەشەکێتەوە. بۆیە فەرمان بە پێغەمبەر دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ﴾ واتە: ئەگەر کافرەکان گوێیان بە

بانگەوازییەکـەت نـەداو ئـەهل کیتـاب – کـە وەفـدی نـەجران بەشـێکن لـەوان – بانگەوازییەکەتیان رەت کردەوە، ئـەوە روو بکـەرە خـوداو بڵێ: ئـەی خـودای ئێمـە! تـۆ خـاوەن دەسـەڵاتو باڵادەسـتی بەسـەر هـەموو شـتێکدا، تـۆ کـارگێڕو هەڵسوڕێنەری دروستکراوانی خۆتی، چیت بوێ ئـەنجامی دەدەی، بـە ویـستو حیکمـەتی خـۆت ئـیش هەڵدەسـوڕێنی، هـەموو شـتێك بەدەسـتی خۆتـە، هـەر تـۆ بەخـشندەو هـەرتۆیش لێگرەوەی! هـەر دەوڵەمەنـدە دەیکەیـە پەڕەنـدە! ئـەمڕۆ خـاوەن مـاڵو سفرەو خوانـە، سبەینێ ئاتاجی پارویێك نانە، ئەمڕۆ دەست ڕۆیشتوو فەرمانڕەوایە، سبەینێ لێخراوەو بێ دەسـەڵاتو گەدایـە، هەرکەسێکی بتـەوێ پادشـایی و پێغەمبەرایـەتی دەدەیـە، هـەر وەکوو چۆن پادشایی و پێغەمبەرایـەتی وەردەگرییـەوە لـەو نەتەوانـەی بتـەوێ لێیـان بـسێنیەوە، ئـەوەتا پێغەمبەرایـەتیت لـە نەتـەوەی ئیـسرائیل سـتاندەوەو دات بـە پێغەمبـەرێکی نەخوێنـدەواری عـەرەبی نـژادو، کردتـە پێغەمبـەر بـۆ سـەر هـەموو ئەجندەو ئـادەمیزاد. ﴿وَتُعِزُّ مَن تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَاءُ﴾ ئـەو کەسـەی بتـەوێ دەست ڕۆیـشتووی دەکـەی و بـەرزی دەکەیتـەوە! ئـەوەی مـەیلت بێنـێ زەلیـل و ژێـر دەسـتەی دەکەی! زۆر کەس ئەمڕۆ شوانو گاوانە سبەینێ دەیکەیە میرو سوڵتان، ئـەمڕۆ پادشـاو فەرمانڕەوایە، سبەینێ کەم دەستو گەدایە! ئـەوە مێـژووی ئـادەمیزاد پـڕە لـە هـەواڵی سەر سوڕهێنەری وەرگەڕانی تەختو بەختی ئەم پادشاو رووخـانی فـلان فـەرمانڕەواو لەناوچوونی دەسەڵاتی ئەمو ئەو..

لەلایەکی ترەوە هاوکات لەگەڵ ئەو رووداوانـە رووداوی پێچەوانەش کـە بـریتین لە چوونە سەر تەختی فلانە میرو نگین دەستکەوتنی فلان پادشـاو سـەرکەوتنی فـلان لەشکرو تێشکانی فیسارە سوپا.

﴿بِيَدِكَ الْخَيْرُ﴾ هەموو خێرو بێرێك بەدەستی تۆیە، بە ویستی خۆت ئاڵو گۆڕی تێدا دەکەی، بۆ تـاك و کۆمـەڵ سـوودی تێدایـە.. خودایـە! بـۆ خـۆت خـاوەنی دەسـەڵاتی رەهـای و بەسـەر هـەموو شـتێکدا باڵادەسـتی، هـیچ رووداوێـك لـەژێر دەسـەڵاتی تـۆ دەرناچێ، ئێمە پشتو پەنامان هەر ئەتۆی و تەوەکولمان لەسەر زاتی تۆیە.

جا هەرچەندە خێرو شەڕ هەردووکیان لەژێر دەسەڵاتی خودادان، بەڵام چونکە خێر لەگەڵ مەقامی ئێرە گونجاوە بۆیە هەر باسی خێری کرد چونکە باسەکە باسی گواستنەوەی بەهرەی پێغەمبەرایەتیو فەرمانڕەواییە لە نەتەوەیەکەوە بۆ نەتەوەیەکی تر!

خێر وشەیەکی فرە مانایە سەرکەوتنو دەستکەوتو شانو شەرکەوتو پلەو پایەو سامو هەیبەتو هەر شتێکی تر کە ئادەمی حەزی لێ بێ بەدەستی بێنێ دەگرێتەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ لِحُبِّ الْخَيْرِ لَشَدِيدٌ﴾.

جا وەنەبێ پەروەردگار هەر دەسەڵاتی بەسەر گۆڕانکاری حاڵو چۆنیەتی ئادەمیزادا هەبێو بەس! بەڵکوو دەسەڵاتی زۆر لەوەش فراوانترە، دەسەڵاتی رەهای بەسەر بوونەوەردا هەیە؛ چۆنی بوێ وا رامی دەکا!

﴿تُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ﴾ خودایە! هەموو گۆڕانکارییەك بەدەستی تۆیە؛ ئەوەتا بەشێك لە شەو دادەبڕیو دەیخەیە سەر رۆژ؛ شەو کورت دەبنو رۆژ درێژ دەبن، بە پێچەوانەوە بەشێك لەڕۆژ دەخەیە سەر شەو، شەو درێژ دەبنو رۆژ کورت دەبنەوە، لەدرێژی ئەمیان وەردەگری دەیخەیە سەر ئەویان، تا هاوتەرازووی یەکتری دەبن، ئەمجار لەویان دەگریەوە دەیخەیە سەر ئەمیانو، جیاوازی لەنێوانیاندا پەیدا دەبێتەوە، تا بەرامبەر بەیەکتر دەبنەوە! ئا بەو جۆرە بە درێژکردنو کورت کردنی شەوو رۆژ بەگوێرەی شوێنی جوگرافی ئەم وڵاتو ئەو وڵات گۆڕانکاری لە شەوو رۆژدا دەکەی! ئەوەتا لەبڕێ شوێندا شەش مانگ شەوەو شەش مانگ رۆژە، هەندێ شوێنی وا هەیە هەژدە تا بیست سەعات رۆژەو چەند سەعاتێك شەوی هەیە. هەندێ شوێن هەن کە خۆری لێ ئاوا دەبێ پاش سەعاتێك خۆری لێ هەڵدێتەوە.

دیارە دروستکردنی زەوی بەشێوەیەکی هێلکەییو هەڵسوڕانی زەویو خۆر هەریەکە لە تەوەرەی خۆیداو بەشێوەی تایبەتی، هۆکاری ئەم گۆڕانکارییەنو ئەوە دەسەلمێنن کە ئیشو کاری رۆژگارو گەردوون هەمووی بەدەستی خودا خۆیەتی ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ

وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ – الزمر/٦٧﴾، جا خودایەك ئەمە بەشێك لە دەسەلاتی بێ، چ ئەرکێکی دەکەوێتە سەر ئەگەر بێتو پێغەمبەرایەتیو سەلتەنەت بدا بە کەسێکی وەکوو (محمد)و ئەم بەهرەیە لە نەتەوەی ئیسرائیل وەربگرێتەوە؟؟ یان سەلتەنەتو دەسەلات لە فارسو رۆم بستێنێتەوە؟؟؟

خو گۆڕانکاریو تاوو توێ کردن لە ئادەمیزادا وەکوو گۆڕانکاری کردن وایە لە شەو رۆژدا.

جا وەنەبێ ئەم گۆڕانکارییانە هەر لە ئادەمیزادا یان لە شەوو رۆژدا هەبێو بەس! بەلکوو لەهەموو بوارێكو ئاقارێکدا دیاری دەداو دەستی قودرەت خۆی دەنوێنێ ﴿وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ﴾ زیندوو لەمردوو دەخەیەوەو پەیدای دەکەی! جا ئەم دەرهێنانی زیندوو لەمردوو یان مردوو لەزیندوو یان بەشێوەیەکی مادییە وەکوو دەرهێنانی خورما لە دەنکەکەیو شیناوەردو زەرعات لە دەنکە تۆم، پەیدابوونی ئادەمیزادو ئاژەڵ لە دلۆپی مەنی! کە ئەویش لە خواردنی شتی بێ گیان پێك هاتووە، پەیدابوونی پەلەوەر لە هێلکە.... هتد یان بەشێوەیەکی مەعنەوی وەکوو دەرهێنانو کەوتنەوەی زانا لە نەزان، موسوڵمان لە کافر، ﴿وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ﴾ مردوو لەزیندوو دەردەهێنێ! جا یان بەشێوەیەکی مادی وەکوو دەرهێنانی دەنکە خورما لە دارخورما، هێلکە لە پەلەوەر، یان بەشێوەی مەعنەوی وەکوو کەوتنەوەی نەزان لە زانا، کافر لە موسوڵمان.

شایانی باسە زانایانی پزیشکی ئەوەیان چەسپاندووە: کە دلۆپە مەنیو هێلکەو دەنکە تۆم ژیانیان تێدایە، بەلام ئەم ژیانە جۆرە ژیانێکە تایبەتە بە زاراوەی ئەو جۆرە زانستییەوە، ئەو دابو عورفە گشتییە ناگرێتەوە کە قورئانی پێ هاتۆتە خواری! بڕێکیش لە زانایانی پزیشکی دەرهێنانی زیندوو لە مردوویان بەوە تەفسیر کردووە کە زیندوو گەشە بە خواردنو خواردنەوە دەکا، خواردنو خواردنەوەش بێ گیانن، بۆ نموونە منداڵ بە خواردنی شیرو شتی تر گەشە دەکا ئەوانەش خۆیان زیندوو نین. دەرهێنانی مردووش لەزیندوو بریتییە لەو ئیفرازاتانەی کە دێنە دەرێ وەکوو شیر کە

شلێکی بێ گیانە، هەروەها مەنتوجاتی کشتو کاڵی کە شتی بێ گیانن‌و لە جیسمی نامی پەیدا دەبن، بەڵام بە پێچەوانەی دڵۆپە مەنی چونکە ئەو حەیواناتی زیندووی تێدایە..

ئا بەو جۆرە زیندوو بە مردوو گەشە پێ دەکا مردوو لە زیندوو دەردێنێ! وێڕای ئەم هەموو گۆڕانکارییانەو هی تریش ﴿وَتَرْزُقُ مَن تَشَاء بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ رزق‌و رۆزیی دەدەیە کەسانێك بتەوێ بیاندەیتێ بەبێ ئەژمارو رێژە، هیچیش پێیەوە ماندوو نابێ‌و، ناڕەحەتی لێ نابینی، گەنجینەی ئاسمانەکان‌و زەوی هەمووی بەدەست خۆتە؛ رزق‌و رۆزیی بەسەر کۆمەڵێکدا دەڕێژیی‌و لە کۆمەڵێکی دەگریەوە، بەگوێرەی ویست‌و حیکمەتی خۆت ئەو دەوڵەمەند دەکەیی‌و ئەو هەژار دەکەی، ئەم دەکەیە ملیۆنێرو ئەو دەکەیە رەندی هەژارو نانی شێوی نادەیتێ!! هەمووشی حیکمەتی یەزدانی تاوو توێی دەکاو سەنگ‌و سووکی تێدادەکا.

**وشەی (الحساب) لە قورئاندا بەسێ مانا هاتووە**:

أ- بەمانا ماندووبوون وەکوو لەم ئایەتەدا هاتووە.

ب- بەمانا ژمارەو ئەندازە وەکوو ئایەتی ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾.

ج- بەمانا موطالەبەو داواکردنە وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَامْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾.

## خۆشویستن‌و دۆستایەتی کردنی کافرەکان کارێکی ناپەسەندەو دەبێ ئادەمیزادان لەڕۆژی قیامەت بترسێن

﴿ لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ۗ

﴿وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ قُلْ إِن تُخْفُوا۟ مَا فِى صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾ يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوٓءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُۥٓ أَمَدًۢا بَعِيدًا ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٣٠﴾﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار پێغەمبەرو موسوڵمانانی ئاگادارکردەوە کە هەر پەنا بەخودا بەرن‌و هەمیشە دان بەوەدابنێن کە سەڵتەنەت‌و دەسەڵاتی رەها بەدەستی خودا خۆیەتی‌و هەر ئەو بوونەوەر هەڵدەسورێنێ! بەگوێرەی ویست‌و ئیرادەی خۆی بەشی ئەو دەداو لەم دەگرێتەوە، ئەو باڵا دەست دەکاو ئەم ژێر دەستە دەکا! ئەمجار لەم ئایەتەی دواییدا ئەومیان بۆ روون دەکاتەوە کە هەرکەسێك پشت بە غەیری خودا ببەستێ‌و پەنا بۆ غەیری زاتی ئەو بەرێ نەفام‌و تێنەگەیشتووە بە فەرمانی خۆی ئەو هەڵوێستەیان لێ قەدەغە دەکا...

ئەوانەی ژینامەی پێغەمبەریان نووسیوە دەڵێن: هەندێ کەس کە موسوڵمان دەبوون دارایی‌و هێزو توانای کافرەکان سەرنجی رادەکێشان پێیان خۆش بوو لێیان دانەبڕێن‌و دۆستایەتیان بکەن‌و خۆیان پێوە هەڵبواسن ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ ﴿لاَّ يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاء مِن دُوْنِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ با موسوڵمانان نەچنە ریزی کافرانەوەو دۆستایەتی‌و هاوپەیمانییان لەگەڵدا نەکەن، نەچن دڵی خۆیانیان بۆ

بکەنـەوە، نهێنـی تایبـەتی موسـوڵمانانیان پـێ بڵێن، لـە نەخـشەو پیلانـی موسـوڵمانان ئاگاداریان بکەن، بەرژەوەندی کافرەکان پێش بەرژەوەنـدی موسـوڵمانان بخـەن، چـونکە ئەمە یارمەتیدانی کوفرە بەسەر ئیماندا.

پوختـەی ئەمـە ئەوەیـە: پـەروەردگار نـەهی لـە موسـوڵمانان کـرد کـە هـاوەڵیو دۆسـتایەتی کـافران بکـەن پـەیمانیان لەگـەڵ ببەسـتن، داوایـان لێ دەکـا: کـە هـەرگیز خزمایـەتیو دۆسـتایەتییان لەگەڵـدا نەکـەن! بـەڵکوو پێویـستە دۆسـتایەتیو دوژمنایـەتییان بـۆ بەرژەوەنـدی ئیـسلامو موسـوڵمانان بـەکاربهێنن! جـا ئەگـەر دۆستایەتیو پەیمان لەگەڵ بەستنەکە بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان بـوو، ئـەوە قـەیناکا! چونکە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) لەگـەڵ خێڵی خوزاعـە پـەیمانی بەسـتو هەر لەسەر کوفرو خوا نەناسی بوون. ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللّهِ فِي شَيْءٍ﴾ کەسێك موسـوڵمانان فـەرامۆش بکـاو کـافرو خـوا نەناسـان بکاتـە دۆسـتو هاوپـەیمانی خـۆی لەشتێکدا کە زیانی بۆ بەرژەوەندی ئایینو موسوڵمانان هـەبوو، ئـەوە هـیچی بـۆ خـودا نییەو، پابەندبوون نییە بە فەرمانی پەروەردگارەوە، یارمەتیدانی ئـایین نییـەو، کـابرا کە ئەوە هەڵوێستی بێ، مانای وایـە پەیوەنـدی لەگـەڵ ئیمانـدا نـەماوەو لـەخودا یـاخی بووەو، دەچێتە ریزی کافرانـەوە وەکوو لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ ئەمـە هێڵێکـی سـەرەکی بـێ پـێچو پەنایـە، سـنوورێکی جیاکەرەوەیـە لـەنێوان کـوفرو ئیمانـدا، پێویـستە موسـوڵمانان هـەموو کاتێـك بـەوردی پابەنـدی ئامۆژگارییەکانی قورئان بنو هـەرگیز دۆسـتایەتی خوانەناسـان نەکـەن! ﴿إِلاَّ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَاةً﴾ واتـە: دابـڕان لـەڕیزی کـافران شـتێکی پێویـستە لەهـەموو حـاڵو زروفێکـدا مەگەر ترسـێکتان هـەبێو بتانـەوێ بـەو پـەیمان بەسـتنو دۆسـتایەتی کردنـە خۆتـانو بەرژەوەندی ئایینو موسوڵمانان لە مەترسییەك بپارێزن! ئەوە ئەوکاتە بۆتان هەیە بە ئەنـدازەی ئـەو خۆپاراسـتنە لێیـان نزیـك ببنـەوەو دۆسـتایەتییان بکـەن! چـونکە قاعیدەیەکی شـەرعی هەیـە بـەم جۆرەو دەڵێ: (درأ المفاسد مقدم على جلب المنافع) ڕەواندنـەوەی زەرەرو زیـان پـێش هێنـانی سـوودو مەنفەعـەت دەخـرێ. جـا ئەگـەر

دۆستایەتیو پەیمان بەستن لەگەڵ خودا نەناساندا بۆ خۆپاراستن لەزیان دروست بێ! ئەوە دیارە بۆ سوود گەیاندن بە موسوڵمانان دروستترە، جا کەوابێ ئەگەر دەوڵەتێکی ئیسلامی بیەوێ پەیمان لەگەڵ دەوڵەتێکی کافردا ببەستێ، ئەوە هیچ قەدەغەیەکی تێدا نییە بەمەرجێ سوودی بۆ دەوڵەتە ئیسلامییەکە هەبێ، جا ئەو بەرژەوەندیو سوودە بەدوور خستنەوەی زیان بێ، یان بەهێنانی سوود بێ، بەڵام هەرگیز دروست نییە: کە دەوڵەتە ئیسلامییەکە پەیمان بەستنەکەی بۆ زیانی موسوڵمانان بێ. ئەوەشمان لەیاد نەچێ ئەم دۆستایەتی کردنە تایبەت نییە بە حاڵەتی بێ هێزی، بەڵکوو هەموو کاتێك دروستە.

زانایانی ئیسلام لەم ئایەتە ئەوەیان دەرهێناوە کە (تقیە) خۆپاراستن لەزیان بەخۆگەیاندن دروستە، بەمجۆرە ئادەمیزاد بەڕواڵەت وتەیەك بڵێ یان کردەوەیەك بکا پێچەوانەی حەقو باوەڕی خۆی بێ، بە مەبەستی خۆ دوورخستنەوە لە زەرەرو زیانیماڵیو نەفسیو ناموس! کەوابوو کەسێك وتەی کوفری بەزۆرە ملێ پێ ئەنجام بدەن، ئەگەر ئەوە ئەنجام نەدا تووشی زیانی ماڵیو نەفسیو ناموس ببێ، دڵیشی پڕبێ لەباوەڕ، ئەوە کافر نابێ، چونکە عوزری هەیە، وەکوو چۆن عەمماری کوڕی یاسر کە قورەیشییەکان زۆریان لێکرد کە وشەی کوفر ئامێز بەدەمیدابێ، ئەویش بەڕواڵەت ئەنجامی دا، بەڵام دڵی پڕبوو لە ئیمانو باوەڕ.

هەر وەکوو چۆن ئەو صەحابەیەی کە موسەیلەمەی درۆزن پێی گوت ئایا تۆ شایەتی دەدەی کەمن ڕەوانەکراوی خودام؟؟ گوتی: بەڵێو گوناهیشی نەگەیشتێو مەرەخەس کرا، بەڵام هاوڕێکەی کە ئەم پرسیارەی لێکرا وتی: گوێم لێ نییەو گوێم گرانە، ئیتر هێنایانە پێشەوەو شەهیدیان کرد. کاتێك هەڵوێستی ئەم دوو هاوەڵە بە پێغەمبەر گەیشتەوە، فەرمووی: شەهیدییەکەی پیرۆزبێ، بەڵام ئەویتریان پەیڕەوی روخصەتی خودای کردووەو گوناهی ناگاتێ.. پێویستە ئەوە بزانرێ ئەم ڕێگا پێدانە بۆ پێداویستی زەروراتەو لەبنەمای ئایین نییە، بۆیە ئەگەر موسوڵمان لەشوێنێك بوو نەیدەوێرا مەراسیمی ئایینەکەی ئەنجام بداو ناتاجی تەقیە بوو ئەگەر ئەو شوێنە

بەجێ بێڵێ‌و هیجرەت بکا باشترە، چونکە باوەڕی تەواو ئیمانی ساخ ئەوەیە کە لەپێناو ئایینی خودادا جیهاد بکاو لە لۆمەی لۆمەکەران نەترسێ، وەکوو خودا دەفەرموێ: ﴿فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ﴾ لە کافرەکان مەترسن لەمن بترسن!! ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللّهُ نَفْسَهُ﴾ خودا ئێوە لە سزای خۆی دەترسێنێ؛ بترسن لە ناڕەزامەندی خودا، هەموو کاتێ کردەوەی باش‌و ڕەزامەندی خودا بۆ خۆتان دەستەبەر بکەن. بە وەسوەسەو ختوکەی شەیتان هەڵنەخەڵەتێن. چونکە خودا بۆ خۆی لەسزای خۆی دەتانترسێنێ‌و دەسەڵاتیشی هەیە هەڕەشەکەی ئەنجام بداو هیچ شتێك نییە ببێتە لەمپەڕ لەبەردەم ئەنجامدانی ویستی خۆی!!

﴿وَإِلَى اللّهِ الْمَصِيرُ﴾ گەڕانەوەی ئادەمیزادو پاداش دانەوەیان لای خودایە، لێکۆڵینەوەو حیساب لەگەڵ هەموو بەندەیەك دەکا، پاداشی کردەوەکانیان دەداتەوە چاکە بەچاکەو خراپە بە سزاو تۆڵە.

ئەمجار پەروەردگار زانستی ڕەهای بێ سنووری خۆی بە دروستکراوانی دەچەسپێنێ‌و دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی محمد! بەو خەڵکە بڵێ ﴿إِن تُخْفُواْ مَا فِي صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ اللّهُ﴾ ئەگەر ئەوەی لەدڵتاندایە بیشارنەوەو سرپۆشی بکەن، یان ئاشکرای بکەن‌و دەری بخەن، ئەوە خودا پێی دەزانێ‌و ئاگای لێیەتی، دەزانێ دڵتان چی تێدایە دۆستایەتی کافران بکەن‌و خۆشتان بوێن یان (تقیە)یان لەگەڵدا بەکاربهێنن خۆتانیان لێ بپارێزن بەڵام دڵتان پڕبێ لە ئیمان‌و باوەڕ، ئەوە خودا ئاگادارەو پاداش یان سزاتان دەداتەوە! ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ زاناو ئاگادارە بە هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەویدا هەیەو دەبێ، بڕێکیش لەو زانیاریانە رووتێکردن‌و دوورکەوتنەوەتانە لە گرۆهی کوفر، چی بکەن ئاگای لێتانە! ﴿وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ خودا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایەو دەتوانێ سزاتان بدا، کەوابێ سەرپێچی فەرمانەکانی مەکەن.. چونکە هەر تاوانێك بکەن ئاشکرا بێ یان نهێنی خودا پێی دەزانێ‌و دەسەڵاتی هەیە تاوانبار سزابداو تۆڵەی لێ بسێنێ. ﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا

عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا﴾ بترسن لە ڕۆژی قیامەتو خۆتانی بۆ ئامادەبکەن، ئەو ڕۆژەی کە هەموو کەسێك ئاکامو سوودی کردەوە باشەکانی ئامادە دەبن لەلای‌و کەیف خۆش دەبێ پێیان‌و شا گەشکە دەبێ بە بینینیان‌و لەززەتی بەو کردەوانە پێدەگا ﴿وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوَءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ أَمَدًا بَعِيدًا﴾ هەروەها ئاکامو زیانی کردەوە خراپەکانی لا ئامادە دەبن‌و پێیان دڵ ناخۆش دەبێ‌و پەنجەی پەشیمانی دەگەزێ‌و ئاواتەخواز دەبێ کە لەنێوان خۆی‌و ئەو کردەوانەدا ماوەیەکی دوورو درێژ هەبوایەو هەر نەی بینینایە، بە ئەندازەی نێوان خۆرهەڵات‌و خۆرئاوا لێی دوور بوونایە، ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللّهُ نَفْسَهُ﴾ ئاگاداربنەوە جارێکی تریش خودا لەسزای خۆی دەتانترسێنێ وریابن خودا ڕقی لێتان هەڵنەستێ‌و لێتان نەڕەنجێ!

هەوڵ بدەن لایەنی خێرو چاکە بەسەر شەڕو خراپەدا تەرجیح بدەن!

ئاگاداربن شەیتان بە وەسوەسەو ختوکە هەڵتان نەخەڵەتێنێ ﴿وَاللّهُ رَؤُوفُ بِالْعِبَادِ﴾ خودا میهرەبان‌و دلۆڤانە بۆ بەندەکانی خۆی، کەوا لەپێشەوە دەیانترسێنێ‌و ئاگاداریان دەکاتەوە کەڕوو لەخراپە نەکەن.

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: نیشانەی میهرەبانی خودا بۆ بەندەکانی ئەوەیە: کە بۆ خۆی لەسزای خۆی لەسەر خراپەکاری دەیانترسێنێ، لەپێشەوە پێی زانانەدوون کە زانینی تەواوو توانای ڕەهای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە!

جا کە بەندەکانی بەم شێوە خودایان ناسی‌و ئەمەیان زانی؛؛ ئەمجار بانگەوازیی کردوون بۆئەوەی داوای ڕەزامەندی لێ بکەن‌و هەوڵ بدەن لێیان نەڕەنجێ‌و خۆیان لەوشتانە دوور بخەنەوە کە دەبنە هۆی ناڕەزامەندی خودا ئەمەش ئەوپەڕی میهرەبانی‌و دڵسۆزییە!!!

## ئەم دوو ئایەتە بەڕوونی ئەم حوکمانەی خوارەوەیان لێ وەردەگیرێ:-

١- بتمانە نەکردن بەکافران‌و مەیلنەدان پێیان لەپێناو بەرژەوەندی گشتی موسوڵمانانندا، هەروەها نابێ بەهیچ جۆرێ موسوڵمان جاسووسی بەسەر موسوڵمانانندا بکاو کافران لەنهێنی موسوڵمانان ئاگاداربکا.

٢- دروست نییە داوای یارمەتیدان لەکافران بۆ شەڕ لەگەڵ کافراندا، ئەمە رای مالیکییەکانە بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیەیە کە موسلیم لە عائیشەوە دەیگێڕێتەوە دەفەرموێ: رۆژی غەزای بەدر پیاوێکی کافر خۆی ئامادەکردبوو کە لەگەڵ پێغەمبەردا بچێ بۆ غەزا، پێغەمبەر پێی فەرموو: (إرجع فلن أستعين بمشرك) بگەڕێوە من کۆمەکی لە هاوبەش پەیداکەر داواناکەم.. هەروەها دەگونجێ بەناوی یارمەتیدانەوە غەدرو فێڵیان لێ بکەن. بەڵام زۆربەی فوقەهاکانی تری چوار مەزهەبەکە پێیان وایە: دروستە داوای کۆمەکی لەکافران بکرێ بۆ شەڕکردن لەگەڵ کافران بەمەرجێ ئەو کافرەی داوای کۆمەکی لێ دەکرێ دەربارەی موسوڵمانان رای باش بێ‌و نییەتی چاك بێ. ئیمامی شافیعی ئەوەشی بەمەرج گرتووە کە دەبێ موسوڵمانان پێویستییان بەو کۆمەکییە هەبێ.

٣- ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە خۆپاراستن (تقیە) دروستە.

**لەڕاستیدا تەقییە بەگوێرەی دوژمنەکە دوو جۆرە**:-

**یەکەمیان**: دەربارەی دوژمنی ئایینییە، هەر موسوڵمانێك لەشوێنێك بوو، نەیدەتوانی مەراسیمی ئایینی خۆی ئەنجام بدا، ئەوە پێویستە ئەو شوێنە بەجێ بهێڵێ، بەڵام ئەگەر موسوڵمانەکان منداڵ‌و ئافرەت‌و پیرو کەفتەکار بوون، ئەوە بۆیان هەیە لەو شوێنە بمێننەوەو هەمیشەش هەوڵ بدەن لەو شوێنە رزگاریان بێ.

**دووەمیان**: ئەوەیە دوژمنکارییەکە بەهۆی ماڵ‌و سامانەوەبێ، ئەوە زانایانی فیقهی ئیسلامی دوو رایان هەیە:- رایەکیان دەڵێ: پێویستە ئەو شوێنە بەجێ بهێڵێ. رایەکیان دەڵێ پێویست ناکا.

٤- ئایەتەکە ئەوە دەچەسپێنێ کە دروستە مەدارا لەگەڵ خوا نەناسان بکرێ‌و بەرواڵەت وا پیشان بدەی کە خۆشت دەوێن، بەمەرجێ زیان بە بەرژەوەندی گشتی موسوڵمانان نەگەیەنێ، هەروەها زیان بەبنەمای ئایین نەگەیەنێ.

٥- پێویسته هەموو دەم ئینسان لەسزاو تۆڵەی خودا بترسێ‌و هەوڵبدا كاری چاك‌و خێرو خێرات پێشكەش بكا.

٦- ئایەتەكە ئەوەشی تێدایە كە زانیاری خودا تواناو قودرەتی گشتی‌و رەهایە، هەموو نهێنی‌و ئاشكرایەك‌و وردو بچووك دەزانێ‌و هیچی لێ هوون نابێ.

## خۆشویستنی خودا بەوە دێتەجێ كەشوێن پێغەمبەرەكەی بكەوێ

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾.

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار لە ئایەتی پێشوودا نەهی لە موسوڵمانان كرد كە هاوپەیمانی‌و دۆستایەتی كافران بكەن! لەم ئایەتەی دواییدا ئەوە روون دەكاتەوە كە خۆشەویستی خودا بریتییە لەپابەند بوون بە فەرمانەكانی خۆپاراستن لەوشتانەی نەهی لێ كردووەو شوێنكەوتنی پێغەمبەرەكەیەتی: دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي..... الآية﴾.

ئیبنولمونزیر لە حەسەنی بەصرییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: چەند گرۆیەك لەسەردەمی پێغەمبەردا وتیان: ئەی محمد! سوێند بەخودا ئێمە خودای خۆمانمان خۆشدەوێ! ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ....﴾.

موحەممەدی كوڕی جەعفەری كوڕی زوبەید دەڵێ: ئەم ئایەتە لەشانی وەفدی مەسیحی نەجراندا هاتۆتە خوارێ چونكە پێیان وابوو ئەو بۆچوونەیان دەربارەی عیسا بریتییە لە خۆشەویستی خوا.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ کاتێك جولەکەکان وتیان ﴿نحن أبناؤ الله وأحباؤه﴾ پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ!

بەهەرحاڵ خیطابی ئایەتەکە هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لافی خۆشویستنی خودا لێ دەدەنو دەڵێن: فەرمانبەرداری یەزدانین، بەڵام پەیڕەوی پەیامو ڕێبازی پێغەمبەر ناکەین!

ئیبنو کەثیر دەڵێ: ئەم ئایەتە سەنگی مەحەکە بۆ هەر کەسێك ئیدیعای خۆشەویستی خودا بکاو بەڵام لەسەر ئایینو ڕێبازی محمد نەبێ! – واتە: هەتا لەهەموو گوفتارو کردەوەیەکیدا شوێن پەیامی پێغەمبەر نەکەوێ ئەو کەسە درۆ دەکاو ڕەنج بەخەسارەو هیچی لێ قبووڵ ناکرێ....!!

بۆیە پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر کردوو فەرمووی: ﴿قُلْ﴾ ئەی خۆشەویست! پێیان بڵێ ﴿إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن پابەندی فەرمانی خودانو دەتانەوێ پاداشی باشتان بداتەوە، ئەوە شوێن ئەو پەیامە بکەون کەخودا بۆ منی ناردووە، پەیڕەوی ڕێبازی من بکەن ﴿يُحْبِبْكُمُ اللّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾ خودا لێتان ڕازی دەبێو لە گوناهتان خۆشدەبێو دەتانخاتە ژێر ڕەحمەتی خۆیەوە. ﴿وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ پەروەردگار لێ خۆشبووە بۆ ئەو کەسانەی گوێ بیستی فەرمانەکانینیو شوێن ڕێبازی پێغەمبەر دەکەون، بەڕەحمو دلۆڤانە بۆیان لەدونیاو قیامەتدا.

دەگێڕنەوە دەڵێن: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارێ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی، وتی: موحەممەد سەیری لێ قەوماوە! پەیڕەوی کردنی فەرمانی خۆی بردۆتە ڕیزی پەیڕەوی کردنی فەرمانی خوداو فەرمانمان پێدەکا کە خۆشمان بوێ وەکوو چۆن مەسیحییەکان عیسایان خۆشویستووە! ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ ﴿قُلْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئیطاعەی خودا بکەنو پابەندی فەرمانەکانی بنو خۆتان لە نەهییەکانی بپارێزن، هەروەها پابەندی فەرمانەکانی پێغەمبەرەکەشی

بـن، پـەیڕەوی ڕێبـازی ئـەو بکـەن، چـونکە شـوێنکەوتنی سـوننەتی پێغەمبـەر شوێنکەوتنی خودایە!! جا ﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ﴾ ئەگەر پشتیان هەڵکردو ڕوویان وەرگێڕاو بەپیر بانگەوازییەکەتەوە نەهاتن‌و، لەخۆیان بایی بوون‌و، لافی ئەوەیان لێ دەدا کە ئەوان کوڕی خودان‌و خۆشەویستی خودان‌و خودایان خۆشدەوێ ﴿فَإِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾ ئەوە بابزانن کەخودا کافرو خوانەناسانی خۆشناوێن‌و، لە کردەوەکانیان ڕازی نییەو، لەگوناهیان خۆشنابێ، ڕقی لێیانە، چونکە ئەوانە: شوێن هەواو هەوەسی خۆیان کەوتوون، پەیڕەوی ئایینی ڕاستیان نەکردووە، پابەندی ئەو پەیامە نەبوون کەخودا بۆ پێغەمبەری ناردووە!! ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەرئەوە کە دژایەتیکردنی پێغەمبەر لەکردارو پەیڕەوکردندا کوفرە، کەسێك ئەوە هەڵوێستی بێ خودا خۆشی ناوێ، با پێی وابێ کە خۆشەویستی خودایەو لێی نزیکە.

## هەڵبژاردنی پێغەمبەران‌و چیرۆکی نەزرەکەی خێزانی عیمران

﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾ ذُرِّيَّةَۢ بَعۡضُهَا مِنۢ بَعۡضٖۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ إِذۡ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ عِمۡرَٰنَ رَبِّ إِنِّي نَذَرۡتُ لَكَ مَا فِي بَطۡنِي مُحَرَّرٗا فَتَقَبَّلۡ مِنِّيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا وَضَعَتۡهَا قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي وَضَعۡتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا وَضَعَتۡ وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰۖ وَإِنِّي سَمَّيۡتُهَا مَرۡيَمَ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

﴿٣٦﴾ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّاۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيۡهَا زَكَرِيَّا ٱلۡمِحۡرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزۡقٗاۖ قَالَ يَٰمَرۡيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَاۖ قَالَتۡ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾ ﴾.

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە: کە خۆشەویستی ئەو پەیوەستە بە خۆشەویستی پێغەمبەرەکەیەوە.. پێویستە کەسێك ئیدیعای خۆشەویستی خودا بکا شوێن ئامۆژگاریو رێبازی پێغەمبەرەکەی بکەوێ! ئەمجار دێ باسی ئەوانە دەکا کە هەڵبژێراوو خۆشەویستن لە پێغەمبەرانو نەوەکانیان، ئەوانەی کە رێگای خۆشەویستی خودایان بۆ ئادەمیزادان روونکردۆتەوە کە بریتییە لە بڕوا بە خوداو فەرمانبەرداریو ئیطاعەی پێغەمبەرانی بەرێزیو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى آدَمَ وَنُوحًا وَآلَ إِبْرَاهِيمَ وَآلَ عِمْرَانَ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾. پەروەردگار ئەم کۆمەڵە کەسایەتیو خانەوادە پیرۆزانەی هەڵبژاردووەو کردوونی بە سەرپشکی هەموو ئادەمیزاد، چونکە بەهرەی پێغەمبەرایەتی تێدا رسکاندوون. ئادەم کە بابەگەورەی ئادەمیزادە هەڵیبژاردو، بەدەستی قودرەتی خۆی دروستی کردووە، ئەمجار لە نوورو گیانی خۆی روحی بەبەردا کردووە، ناوی هەموو شتێکی فێر کردو نیعمەتی زانیاری پێ بەخشی، فەرمانی بە فریشتەکان کرد کە سوژدەی بۆ بەرن، لەبەهەشتا جێگیری کردو ئەمجار لەبەر حیکمەتێکی یەزدانی ناردیە خوارێ بۆسەر زەویو تۆبەی لێ وەرگرتو رێزی لێ نا، پێغەمبەرو رەوانەکراوی خودا هەموو لە وەچەو نەوەی ئەون.

لەدوای ئەو (نوح) (کە بەبابەگەورەی دوومی ئادەمیزاد دەژمێردرێ) هەڵیبژاردو کردی بەیەکەم پێغەمبەری رەوانەکراو بۆسەر ئەهلی سەرزەوی، ئەو ریش سپیو پیری

پێغەمبەرانــە، کاتێـك قەومەکـەی باوەڕیـان پـێ نــەکردو ئیمانیـان نـەهێنا نـزای تێداچوونو بە هیلاکچوونی لێ کردن، خودا بە خنکان لە نـاو ئـاودا تۆڵەی لێ سـتاندن، نوحو شوێنکەوتوانی؛ ئەوانەی بڕوایان پێ هێنابوو لە کەشتییەکدا رزگاریـان بـوو! زۆر پێغەمبەرو رەوانەکراوی خودا لە نەوەی ئەم پێغەمبەرە بـەرێزەن، یەکـەم پێغەمبـەرە دوای ئادەم نێردراوە بۆسەر ئادەمیزادانی سەرزەوی‌و مارەکردنی خوشك‌و کچ‌و پـوورو ئەو جۆرە خزمە نزیکانەی حەرام کرد.

ئەمجار خانەوادەی ئیبراهیمی هەڵبژارد، لەم خانەوادەیە گـەورەترین ئـادەمیزادو سەرخەتمی پێغەمبەران (محمدالمصطفى) هاتۆتە کۆڕی ژیانـەوە، هـەر لـەم خانەوادەیـە ئیسماعـسل‌و ئیـسحاق‌و ئەسـباط هاتنــە کـۆڕی ژیانـەوەو هـەر لـە نـەوەی ئیـبراهیم خانەوادەی عیمرانی هەڵبژاردووە کە عیساو مەریەمی دایکی بەشێکن لەم خانەوادەیە.

پێویستە ئەوە بزانـرێ کـە مەبەسـت بـە عیمـران لەیەکـەم جاردا کـە دەڵـێ: (آل عمران) باوکی موسایە، دوایی کـە دەفـەرموێ: (امـرأة عمـران) مەبەسـت بـەو عیمرانـە بـاوکی مەریـەمی دایکی عیـسایە.. لـە نێوان عیمرانـی بـاوکی موسـاو عیمرانـی بـاوکی مەریەم ١٣٠٠ تا ١٨٠٠ ساڵ ماوەی زەمەنی هەیە!!

عیمرانی باوکی مەریەم کوڕی یاشمی کوڕی میشا کوڕی حزقیا کوڕی ئیبراهیمە.. نەژادی دەگاتە سلێمانی کوڕی داود،، کەوابێ عیسا لە وەچەی ئیبراهیمـە. ﴿ذُرِّيَّةً بَعْضُهَا مِـن بَعْـضٍ﴾ ئەمانـە چـەند خانـەوادەو وەچـەو نەوەیـەکن هـەنێکیان لـە هنـدێکیان کەوتوونەوە.

پـەروەردگار ئـەم خانەوادانـەی هەڵبـژاردوون‌و کردوونـی بـە پوختـەو نموونـەی ئادەمیزادو بەهرەی پێغەمبەرایەتی تێدا رسکاندوون، ئەوانە هەموویان یـەك نەتـەوەو یـەك نـەژادوو یـەك رشـتەن، هەنـدێکیان لـە رێـزو گەورەییـدا لەیەکـدی دەچـن... خانەوادەی ئیبراهیم (آل ابراهیم) کە ئیـسماعیل‌و ئیـسحاق نـەوەکانیانن هـەموویان لـە نەژادی ئیبراهیمن، ئیبراهیمیش لەنـەوەی نووحـەو نـووحیش لـە ئادەمـە.. خانـەوادەی عیمران (آل عمران) کە بریتییە لە مووساو هاروون‌و عیـساو دایکی ئـەمانیش نـەوەی

ئیبراهیم‌و نووح‌و ئادەمن.. پەروەردگار بەسەر هەموو ئادەمیزادا هەڵیبژاردوون، ئەوان پوختەو صەفوەی ئادەمیزادو بەندەکانی خودان، بەلاّم (محمد المصطفی) لە پلەی هەڵبژێراویش تێپەڕیوە چونکە ئەو رەحمەت‌و سۆزو فەرە بۆ ئادەمیزاد، خودا دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ پێغەمبەران دروستکراون بۆ رەحمەت‌و دلۆڤانی، بەلاّم محمد بۆخۆی رەحمەتە، لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: «إِنَّمَا أَنَا رَحْمَةٌ» واتە: من بۆخۆم رەحمەتم‌و کراوم بە دیاری بۆ ئادەمیزاد، ﴿وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ خودا بیسەرو شنەوایە بە گوفتاری بەندەکان، زاناو ئاگادارە بە نێت‌و مەبەستیان.

ماموّستا (سید قطب) دەفەرموێ: ئەوەی تێبینی دەکرێ ئایەتەکە باسی ئادەم‌و نوحی بە شەخصی کردووە، هەر بەتەنها ناوی هێناون بەلاّم بۆ ئیبراهیم‌و عیمران بە (آل ابراهیم)و (آل عمران) واتە: خانەوادەو بنەماڵە ناوی هێناون،، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە هەڵبژاردنی ئادەم‌و نووح بۆ شەخصی خۆیان بووە، بەلاّم بۆ ئیبراهیم‌و عیمران بۆخۆیان بۆ بنەماڵەکەشیان بووە، بەلاّم ئەوەمان لەبیر نەچێ میراتی بەهرەی پێغەمبەرایەتی لە خانەوادەکەیاندا میراتی بیروباوەڕە نەك میراتی گۆشت‌و خوێن!! ئەوەتا لە ئایەتێکی تردا ئەم رستەیە دەچەسپێنێ کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي قَالَ لاَ يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ – البقرة/١٢٤﴾...

﴿إِذْ قَالَتِ امْرَأَةُ عِمْرَانَ﴾ ئەی محمد! ئەوە یادبکەرەوەو باسی بکە: کە خێزانی عیمران – دایکی مەریەم کە ناوی حەننەو کچی فاقود بووە – ئافرەتێکی نەزۆك بوو، منداڵی نەدەبوو، لە خودا پاڕایەوە کە منداڵێکی بداتێ، پەروەردگار نزاکەی قبووڵ کردو حامیلە بوو، وتی: ﴿رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا﴾ خودایە! ئەمن ئەو منداڵەی لە سکمدایە لەبەر خاتری تۆ دەیکەم بە مجەورو دەینێرمە مزگەوتی قودس بۆ خوداپەرستی‌و خزمەتکردنی ئەو ماڵە پیرۆزەی تۆ!! (ئەم نەزرو فۆتۆیە لە شەریعەتی ئەواندا رەوا بووە دوایی پێویست بوو ئەو کوڕە پابەندی ئەو فۆتۆیە بێ‌و

جێبەجێی بکا). ﴿فَتَقَبَّلْ مِنِّي﴾ خودایە! ئەم نەزرەم لێ وەربگرە ﴿إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ بێگومان زاتی بەرزو پاکت شنەوایە بۆ هەموو قسەیەكو هەموو نزایەك دەبیستێ، زاناو ئاگادارە بە نێتی منو ئیخلاصم، دەزانێ کە من لە ناخەوە پێم خۆشە ئەو ئاواتەم بێتە دیو ئەو کارە ئەنجام بدەم. ئەو کاتە خێزانی عیمران نەیدەزانی ئەو منداڵەی لە سکی دایە کورە، یان کچە!! ﴿فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى﴾ کاتێك کە سکەکەی داناو کچ بوو بە نائومێدییەوە وتی: خودایە! ئەوە بۆخۆت دەزانی ئەوەی من بوومە کچە، دیارە کچیش بەکاری خزمەتکردنی مزگەوتی قودس نایە! واتە: دلگران بوو، کە ئاواتەکەی بە تەواوی نەهاتۆتە دی، جا خودا ئاماژە بە گەورەیی ئەو کچە دەکا دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ﴾ خودا باشتر دەزانێ بە چۆنیەتی ئەو منداڵەی کە ژنی عیمران بوویەتی! پلەو پایەی دواڕۆژی لەبەرچاوە، خودا بۆخۆی دەزانی ئەوەی بوویەتی کچێکی پاکی بەڕێزی پایە بەرزە – لێرەدا خودا پلەو پایەی مێینە دیاری دەکا – دەفەرموێ: ﴿وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى﴾ ئەو کوڕەی تۆ بەتەمای بوویو ئاواتەخواز بووی بتبێو نەتبوو وەکوو ئەو کچە نیە کە بووتە: واتە کەی ئەو کوڕەی بە هیوای بووی دەگاتە پلەو پایەی ئەم کچە کە بووتە؟؟ ئەم کچە زۆر باشترە لەو کوڕەی بەتەمای بووی، ئەم دوو دەستەواژەیە ﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ، وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى﴾ وتەی خودانو جوملەی (معترضە)نو خراونەتە نێو تابلۆکەوە.. بەلام قیرائەتێك هەیە تاء (وضعت) بە مەضموومی دەخوێنێتەوە، ئەو کاتە دەبێتە وتەی خێزانی عیمرانو مەبەست تەعظیمو تەنزیهو کاردروستی خودایە. رستەی ﴿وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى﴾ش دەگونجێ هەر لە قسەی خێزانی عیمران بێ بەم مەعنایە عوزری هێنابێتەوە بۆ پەروەردگاری خۆیو بلێ: ئەوە دەزانی من کچم بووە کچیش بەکەڵکی خزمەتکردنی بەیتولمەقدیس نایە، جا لەگەڵ ئەوەشدا کە من کچم بووە کچیش بەکاری مجەووری نایە، بەلام من هەر لەسەر پەیمانی خۆمو پەشیمان نیم ﴿وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ﴾ من ناوم نا مەریەم. مەریەم لە زمانی ئەواندا واتە: خوداپەرستو

خزمەتچی خودا، واتە: کە جەستەی بەکاری مجەوری نەیە با ببێتە خوداپەرست (عابدة) ﴿وإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ من ئەم کچە دەخەمە پەنای تۆوە دەمەوێ پارێزگاری بکەی چاودێری بێ لەشەڕی شەیتانی نەگریس‌و دوورخراوە لە خێر، بیپارێزی، خودایە! داوات لێ دەکەم کە خۆی‌و نەوەکەی (عیسای کوڕی) بپارێزی‌و شەیتان هیچ دەسەلاتی نەبێ بەسەریاندا.. خودا نزاکەی لێ وەرگرت‌و پاڕانەوەکەی قبوول کرد.

ئیمامی بوخاری‌و موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە فەرموودەیەك دەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «كُلُّ بَنِي آدَمَ يَمَسُّهُ الشَّيْطَانُ يَوْمَ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ إِلاَّ مَرْيَمَ وَابْنَهَا». هەموو ئادەمیزادێك كە لە دایك دەبێ شەیتان دەستی لێ دەوەشێنێ جگە لە مەریەم‌و عیسای کوڕی. ﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ﴾ پەروەردگار مەریەمی لە دایکی بۆ خزمەتکاری مزگەوتی قودس‌و خوداپەرست تێیدا وەرگرت؛ ڕازی بوو کە مەریەم - هەرچەندە منداڵ‌و مێینەیە - ئازاد بێ بۆ خوداپەرستی‌و خزمەتکردنی بەیتولمەقدیس. ﴿وَأَنبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا﴾ بەشێوەیەکی ڕێك‌و پێك لە ڕووی جەستەیی‌و گیانییەوە بەخێوی کردو گەورەی کرد، وەکوو چۆن ڕووەك لە زەوی بە پیتدا پەروەردە دەکرێ! ئابەو شێوەیە مەریەم پەروەردەکرا، لە ناو دەستە خوشکانیدا دیار بوو، لە هەموو ڕوویەکەوە نموونە بوو ﴿وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا﴾ زەکەریا کە مێردی پووری مەریەم بوو، پیاوێکی خوداپەرست‌و خاوەن ناوو شۆرەت بوو، سەرۆکی ماڵەکانی بەیتولمەقدیس بوو، کردی بە سەرپەرشتیکارو دەستەبەربووی، بۆ ئەوەی چاودێری بکا بەخێوکردن‌و بەرژەوەندیەکانی بەرچاو بگرێ. هەتا وای لێ هات لە شیر بڕایەوەو گەورە بوو، ئەمجار ژوورێکیان بۆ تەرخان کرد، ئیتر لەو ژوورە تایبەتییەی خۆی دا گۆشەگیر بوو بۆ خوداپەرستی‌و تاعەتکردن، هەموو ڕۆژێ زەکەریا خواردەمەنی بۆ دەبرد ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقاً﴾ هەرکاتێ زەکەریا دەچوو بۆ ژوورەکەی مەریەم‌و سەردانی دەکردو خواردنی بۆ دەبرد، لە

ژوورەکەدا خواردەمەنیو رزقو رۆژییو میوەی جۆراو جۆری دەبینی کە ئەو جۆرە میوانە لەو وەرزەدا دەست نەدەکەوت، بڕێك لە راڤەکەرانی قورئان دەڵێن میوەی هاوین لە زستانداو میوەی زستان لە هاویندا لای بووە! ﴿قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَـذَا﴾ زەکەریبا بەسەرسامییەوە دەیگوت: مەریەم ئەو خواردەمەنیو میوەیەت لەکوێ بووە؟؟ بە تایبەتی کە رۆژگارەکە رۆژگارێکی ناهەموارو گرانیو قاتو قڕی بوو. ﴿قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ﴾ مەریەم دەیگوت: ئەوە لەلایەن خوداوە بۆم هاتووەئەو خودایەی کە رزقو رۆژی هەموو کەسێك دەدا ﴿إنَّ اللّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاء بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ بێگومان خودا رزقو رۆژی دەدا بە کەسێك بیەوێ بەبێ ئەژمار!! هەندێك دەڵێن رستەی ﴿ إنَّ اللّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاء....الآية﴾ قسەی مەریەمەو دەشگونجێ کەلامێکی موستەئنەفو سەربەخۆ بێ.. جێگای سەرنجە کە وەڵامی مەریەم ﴿هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ﴾ نموونەی هەڵسو کەوتی مرۆڤی خوداپەرستە لەگەڵ پەروەردگاری خۆیدا، پاراستنی ئەو نهێنییەیە لە نێوان ئەوو خودای خۆیدا تەواضوعو کار لەسەرەخۆییو هێمنی پێوە دیارە، هەستی رەزامەندی لە خودا تێدایە، خۆهەڵنانو خۆهەڵکێشانی تێدا نیە، ئیتر ئەو دیاردە کەم وێنەیە کە زەکەریبا لەلای مەریەم دەیبینی سەرنجی زەکەریبا رادەکێشێو لە خودا دەپاڕێتەوە منداڵی بداتێ.

## چیرۆکی حەزرەتی زەکەریاو یەحیا

﴿ هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ قَالَ رَبِّ هَبْ لِى مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٨﴾ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ

وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٣٩﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٌ وَقَدْ بَلَغَنِيَ ٱلْكِبَرُ وَٱمْرَأَتِي عَاقِرٌ قَالَ كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴿٤٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَٱذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ ﴿٤١﴾﴾.

وەکوو دەفەرموێ: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ﴾ هەر لەو شوێنەی کە مەریەم قسەی لەگەڵ کردو پرسیارو وەڵام رووی‌دا. زەکەریا دەستی نزای بەرز کردەوەو لە خودا پاڕایەوە واتە: کە زەکەریا ئەو دیاردانەی لەلای مەریەم بینی‌و حاڵو چۆنیەتی مەریەم‌و گۆشەگیری بۆ خوداپەرستی‌و خواردەمەنی‌و میوەی جۆراو جۆری لەلای مەریەم چاوپێکەوتن، زانی کە ئەو خودایەی بتوانێ میوەی هاوین بە زستان‌و میوەی زستان لە هاویندا بنێرێ بۆ مەریەم هەر ئەو خودایە دەتوانێ منداڵ بە پیرو ئیختیاری وێنەی ئەویش بدا. بۆیە زەکەریا دەستی نزای بەرزکردەوەو لە خودا پاڕایەوە ﴿قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾ وتی: خودایە ببەخشە بە من کوڕێکی صالح‌و خوداپەرست‌و پاک‌و خاوێن‌و بەهرەداری وەکوو مەریەم، خودایە! زاتی پاکت شنەوای هەموو گوفتارێکە هەر نزاو پاڕانەوەیەک بە جێ بێ قبووڵی دەکەی!. دیارە سروشتی ئادەمیزاد وەهایە کە منداڵی رێک‌و پێک‌و بەهرەمەند دەبینێ ئاواتەخواز دەبێ کە ئەویش منداڵی وای هەبێ. ﴿فَنَادَتْهُ الْمَلآئِكَةُ﴾ فریشتە بانگی لێ کرد، (جەماوەری زانایان دەڵێن: فریشتە بانگکەرەکە جوبرائیل بووە) ﴿وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ﴾ لە کاتێکدا کە زەکەریا لە پەرستگاکەی خۆیدا لە

میحرابی خوداپەرستیدا لە خودا دەپاڕایەوەو نوێژی دەکرد. واتە هەر دوابەدوای پاڕانەوەکەی فریشتە بانگی کردو مزگێنی پێداو پێی گوت: ﴿أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَى﴾ خودا مژدەت دەداتێ بە کوڕێك کە بە یەحیا ناوزەد دەکرێ.. یەحیا لە (یوحنا) وەرگیراوە لە ئینجیلی مەتتادا هاتووە دەڵێ: پێیان گوتووە (یوحنا المعمدانی) مەعمەدان بەو کەسەیان گوتووە کە تۆبەی بە خەڵك کردووە غوسڵی بە گوناهباران کردووە.

ناوی یەحیا ئاماژەو تیلنیشانی ئەوەی تێدایە کە ژیانێکی بەختەوەر رابوێرێ‌و ببێتە میراتگری باوکی‌و خانەوادەی یەعقووب.. هەندێك دەڵێن: مەبەست بە میحراب لە ﴿يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ﴾دا پەرستگای مەریەمە.. فریشتەکە کە موژدەی پێدا ئەوەشی پێ ڕاگەیاند کە یەحیا ﴿مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ مِّنَ اللَّهِ﴾ بڕوا بە عیسای کوڕی مەریەم دەکاو یەکەم کەس دەبێ کە ئیمانی پێ دەهێنێ.. بۆیە لێرەدا عیسای بە (کلمة الله) ناوهێناوە چونکە عیسا بە وشەی (کن فیکون) پەیدا بووە، نەك بەشێوەی سروشتی ئاسایی لە دایکبوونی ئادەمیزادانی تر کە لە ئاکامی بەیەکگەیشتنی پیاوو ئافرەت پەیدا دەبن. ﴿وَسَيِّدًا﴾ ئەم کوڕە ئادەمیزادێکی بەرزو پیرۆز دەبێ گەورەیی لەناو نەتەوەکەیدا بەدەست دەهێنێ، دەبێتە گەورەی ئادەمیزادانی سەردەمی خۆی لە پلەو پایەو کردارچاکی‌و هەڵوێستدا ﴿وَحَصُورًا﴾ خۆگرەوە دەبێ لە ئارەزۆبازی‌و لە ناوخانەوادەی صاڵح‌و خوداپەرستدا پەروەردە دەبێ، کە گەیشتە تەمەنی پێغەمبەرایەتی دەکرێتە پێغەمبەر... هیچ سەیریش نیە کە وابێ! چونکە ئەم زاتە لە پشتی پێغەمبەران پەیدا بووە ﴿وَنَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾ پێغەمبەرێك دەبێ لە پێغەمبەرانی راستاڵ‌و چاك کردار. ئەمەش مژدەیەکی ترە بەوە کە ئەو کوڕە دەکرێتە پێغەمبەرو نیگای بۆ دەنێردرێ. بەهرەی پێغەمبەرایەتیش بەرزترین پلەو پایەیەکە کە ئادەمیزادی پێ دەگا. جا زەکەریا پاش ئەم مژدە پێدانە بە خۆیدا چووەو تەماشای کرد بۆخۆی پیرو کەنەفتەو خێزانەکەشی پیرەژنێکی بە ساڵاچووە، بە سروشت ئەوەی لێ چاوەڕوان

نـاكرێ تـازە منـداڵی ببـێ، بۆیـە بەسەرسـامییەوە رووی كـردە بارەگـای پـەروەردگارو پرسیاری كرد ﴿قَالَ رَبِّ أَنَّى يَكُـونُ لِـي غُـلاَمٌ وَقَـدْ بَلَغَنِـيَ الْكِبَـرُ وَامْرَأَتِـي عَـاقِرٌ﴾ وتـی: خودایە! من چۆن كورِم دەبێ بۆخۆم بەم تەمەنە گەیشتووم‌و پیرەمێردێكی كۆنەساڵم‌و خێزانەكەشم پیرەژنێكی بەساڵاچووی نەزۆك‌و پەكەتەیە؟؟؟

تەفسیری مەراغی لە مامۆستا (شێخ محمد عبده)وە دەگێڕێتەوە دەڵێ: زەكـەریا كـە ئـەو هـەموو نـازو نیعمەتـەی لای مەریـەم بینـی‌و بەختـەوەری‌و بـڕوا قـایمی‌و بەهرەداری ئەو خانمـەی هەست پـێ كـردو زانـی كـە مەریـەم بووەتـە فریـشتەیەك لـە شێوەی ئادەمیداو بڕوای وایە كە ئەو كەسەی ئەو شتانەی بۆ دەستەبەر كـردووەو بـەو شێوەیە رزق‌و رۆزی دەداتێ خودای بەتواناو خاوەن دەسەڵاتە! ئیتر زەكەریبا لەسەرخۆ چوو لە جیهانی مادە جیابووەوەو پەردەیەك بەسەر جیهان‌و ئەو حاڵەی ئـەوی تێدایـە كێشراو "فەنافی الله" بوو كەوتە پـەروازكردن بـۆ لای خـودای پـەروەردگارو سـەرنجدان لە گـەورەیی خـوداو نـازو نیعمـەتی! لـەو حـاڵ‌و مەقامـەدا لـە حـاڵ‌و چۆنیـەتی لەسـەر خۆچوون‌و غەیبوبەداو رۆچوون لە عالەمی باڵادا بێ پەروا ئەم دۆعـاو نزایـەی بەسـەر زماندا هات‌و موژدەی گیرابوونی نزاكەشی لە فریشتە وەرگرت. كاتێك هاتەوە سـەرخۆو لەو گەشتە گیانییە گەڕایەوە بۆ جیهانی مادەو جیهـانی ئەسباب‌و هۆكـار، دەشـی زانـی كە دۆعاكەی گیرا بووە، پرسیاری لە پەروەردگار كرد كە چۆن ئەم نزایەی گیرا بووە كە بە پێچەوانەی سروشتە!! ئیتر پەروەردگار بـەهۆی فریـشتەی تایبەتـەوە پێـی راگەیانـد كـە بـۆ خـودا شـتی وا ئاسـاییەو هـیچ مانـدوبوونێكی تێـدا نیـە، ﴿قَـالَ كَـذَلِكَ﴾ خـودا فەرمووی: راستە ئەوەی تـۆ دەیلێـی وایـە، بـەلاَم ﴿اللَّـهُ يَفْعَـلُ مَـا يَـشَاءُ﴾ خـودا ئـەوەی بیەوێ بیكا دەیكا، هەركاتێك ویستی كارێك ئـەنجام بـدا هۆكـاری بـۆ دەڕەخـسێنێ، یـان بەبێ هۆكارو سەبەب دەفەرموێ ببەو دەبێ، یەكێكیش لەو ئیشانە پەیدابوونی منداڵـە لە ئـافرەتی پـیرو نـەزۆك! هـیچ شـتێك بـەبێ ویـست‌و رەزامەنـدی ئـەو نابـێ، كـەوابوو ئیشەكە بە خودا بـسپێرەو پرسـیار لـە چۆنیەتەكەی مەكـە، چونكە ئـەوە نهێنییـەكی خوداییەو ئادەمیزاد پەی پێ نابا!!

ئەمجار زەکەریبا پێی خۆشبوو بزانێ کەی خێزانی سکی پڕ دەبێ، حەزی کرد نیشانەیەکی دەست کەوێ ﴿قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّيَ آيَةً﴾ وتی: خودایە نیشانەیەکم بۆ دەستنیشان بکەو بزانم خێزانم کەی سکی دەبێو منداڵی تێدا دەرسکێ!! بۆ ئەوەی خێرا خۆشیو شادی بکەوێتە ناویانەوە، یان بۆ ئەوەی سوپاسی لەسەر بکا.

﴿قَالَ آيَتُكَ أَلاَّ تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ إِلاَّ رَمْزًا﴾ پەروەردگار پێی فەرمووی: نیشانەت ئەوەبێ کە بۆماوەی سێ رۆژ ناتوانێ لەگەڵ خەڵکدا ئاخاوتن بکەی زمانت دەگیرێو قسەت بۆ ناکرێ، بەڵکوو بە ئیشارە جوڵاندنی دەستو سەرو چاوو شتی تر خەڵك لەمەبەستەکانت حاڵی دەکەی! ﴿وَاذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالإِبْكَارِ﴾ یادی خودای خۆت بکە بە زۆری، بەتایبەتی لەکاتی ئێواران‌و بەیانیاندا، واتە: هەرچەندە بۆ قسەکردن لەگەڵ خەڵکدا زمانت دەگیرێ، بەڵام بۆ تەسبیحاتو زیکری خودا زمانت رەهایە، کەوابێ کاتی خۆت بە فیڕۆ مەدە، خەریکی یاد کردنی خوداو نوێژو شوکرو سوپاس بە.

یەحیا لە لە قورئاندا لە چوار شوێن باسکراوە، لە سوورەتی (آل عمران)و سوورەتی (الأنعام)و سوورەتی (مريم)و سوورەتی (الأنبياء).

مێژوو نووسانو راڤەکەران دەفەرموون: خێزانی زەکەریبا ناوی (اليصابات) بوو یەحیای کەوتە سکەوە لەو رۆژگارەی کە عیسا کەوتە سکی مەریەمەوە! یەحیا لەو بنەماڵە پیرۆزەدا لە دایك بوو، لە تاعەتو خوداپەرستیدا گەورە بوو، لە شەریعەتی مووسادا شارەزا بوو، بۆ هەموو فتوایەك سەرچاوە بوو، خەڵك دەچوونە لایو یاسایان لێ وەردەگرت.

هیرودوس کە فەرمانڕەوای فەلەستین بوو کچێکی برازای هەبوو ناوی (هیرودیا) بوو، تا بڵێی جوانو شۆخو شەنگ بوو، ویستی مارەی بکا، کچەکەو دایکیشی پێیان خۆشبوو، کە پرسیاریان لە یەحیا کرد دەربارەی ئەم کارە، یەحیا بە حەرامی داناو نەهی لێ کردن، بەڵام ئەوان گوێیان نەدایەو رێك کەوتنو کچەکە شووی پێ کرد، شەوی زاواو بوکێنی نێوان مامو برازا؛ کچە لارو لەنجەیەکی بە بەردەم مامیدا کرد، کە

بوو بووە مێردی ئەویش زۆری پێ خۆش بوو، داوای کرد چی دەوێ بۆی ئەنجام بدا، ئەویش بە پیلانی پیرەژنی دایکی داوای کرد سەری یەحیا ببڕێو بیخاتە سەر سینییەك! مامەکەی (زاوا ئەفەندی) یەحیای شەهید کردو دڵی بوکێی رازی کرد!

## جولەکە دەربارەی مارە کردنی کچی براو کچی خوشك دوو رایان هەیە:

رەبانییەکان پێیان وایە حەڵاڵەو دروستە.. (قراؤون)ەکانیان بەلایانەوە حەرامەو نادروستە. بەڵگەی (رەببانی)یەکان ئەوەیە دەڵێن: لە تەوراتدا باسی حەرامی برازاو خوشکەزا نەکراوە!

یەحیا لە منداڵییەوە هەموو رەوشتێکی صەلاحو خوداپەرستی تێدا بووە، پێش ئەوەی تەمەنی بگاتە سێ ساڵی کراوە بە پێغەمبەر ﴿وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيًّا – مریم/١٢﴾. هەمیشەش خەریکی بانگەوازی کردنی خەڵك بووە بۆ تۆبەکردنو خوداپەرستی، ئەوانەی کە تۆبەیان دەکرد لە چۆمی ئوردندا غوسڵی پێ دەکردن بۆیە پێیان گوتووە (یوحنا المعمدان). کاتێك کە یەحیا شەهید کرا عیسا بانگەوازی خۆی ئاشکرا کردو دەستی کرد بە تێکۆشانو هەوڵدان بۆ شارەزایی کردنی خەڵك.

## چیرۆکی خاتوو مەریەم

﴿ وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَىٰ نِسَاءِ الْعَالَمِينَ ﴿٤٢﴾ يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ

نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ (٤٤)﴾.

ئـەمجار دوای ئـەوەی باسـی لـە دایکبـوونی یـەحیای کـرد لـە بـاوکێکی پـیرو کەنەفتو دایکێکی نەزۆکی پیرەژن؛ کە بەڕواڵەت شتێکی لـە سروشـتو عـادەت بـەدەر بـوو! دێتـە سـەر باسـێکی گـرنگترو سەرسـوڕهێنەر تـر؛ ئـەویش سەرگوزشـتەی لـە دایکبـوونی عیـسایە بـەبێ بـاوك، مەبەسـتی سەرگوزشـتەکەش چەسـپاندنی ئادەمیزادیـەتی عیسایەو ڕەتکردنـەوەی ئیـدیعای مەسـیحیەکانە کـە دەیـانگوت: عیـسا خودایە یان کوڕی خودایە. بۆیە باسی ئەوە دەکا کە عیسا لە مەریەم بووەو بە عیسای کوڕی مەریەم ناوزەدی دەکا. دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ﴾ ئەی محمد! باسـی ئـەوە بکە کاتێك کە فریشتە بە مەریەمی گوت (مەبەست بەفریشتە جوبرائیلە چونکە لە سـوورەتی مەریەمـدا دەفـەرموێ: ﴿فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا﴾ جوبرائیلمان نارد بۆلای‌و لە شێوەی پیاوێکی ئاسایی دا خۆی نیشان دا، ئـەوەش بـزانین کە قسە کردنی جوبرائیل لەگەڵ مەریەمدا نیگای خودایی نـەبوو بـەڵکوو خستنە دڵ بووە، چونکە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلاَّ رِجَالاً نُوحِي إِلَيْهِمْ﴾ کەوابوو ئاخاوتنی جوبرائیل لەگەل مەریەم، برێتی بووە لە ئیلهام‌و بەدڵدا هێنان.

پێی گوت: ﴿يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاكِ﴾ خودا تۆی هەڵبژاردووە بۆ خزمـەتکردنی بەیتولمەقـدیس ﴿وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاء الْعَالَمِينَ﴾ پـاکی کـردووی لـە هـەموو ئەنگی‌و عەیبێکی ناشیرین‌و هیچ خووڕەوشتێکی ناهەموارت تێدا نیـەو هەڵیبـژاردووی کـە بـەبێ ئـەوەی پیـاو بێتـە لات کوڕێکت ببـێ، چۆن کوڕێـك! کـوڕێکی وا کـە ببێتـە پێغەمبـەر، پـاکی کردوویـەوە بـە جۆرێـك نـە خـوێنی حـەیزت پێـدا بـێ‌و نـە خـوێنی منـاڵبوونـت هـەبێ، ئـافرەتێکی ڕەوشـت بـەرزی‌و داوێـن پـاك‌و خـانم‌و ڕەزان‌و شـاژن،

کردوویتی بە سەرپشکی ئافرەتانی هەموو عالەمو هەموو سەردەمێك یان ئافرەتانی سەردەمی خۆتو ڕێزی تایبەتی لێ ناوی، کەمو کوڕی جەستەیی‌و ڕەوشتیت تێدا نیە.

دوای ئەوەی کە ئەم ڕێزە تایبەتی‌و ڕەوشتە نایابانەی مەریەمی باس کرد ئەمجار فەرمانی پێ دەکا بە زێدە طاعەتو خوداپەرستی‌و دەفەرموێ: ﴿يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾ ئەی مەریەم! فەرمانبەرداری خودای خۆت بە، گەردنکەچی فەرمانو ئامۆژگارییەکانی بە، سوژدەی ملکەچی‌و سوپاس بۆ خودا بەرە، نوێژ بەجەماعەت بکە لەگەڵ نوێژکەراندا ﴿ذَلِكَ مِنْ أَنبَاء الْغَيْبِ﴾ ئەی موحەممەد! ئەم سەرگوزەشتانەی بۆمان گێڕایەوە لە سەرگوزەشتەی زەکەریاو یەحیاو مەریەم هەموویان لەو سەرگوزەشتانەن کە تۆ ئاگات لێ نەبووە، هەواڵی غەیبی بوون، نە تۆ، نە قەومەکەت نەتانزانیوە، ﴿نُوحِيهِ إِلَيكَ﴾ بە سروشت بۆتی دەنێرین‌و جوبرائیل بە نیگا پێت دەڵێ: تا ببێتە بەڵگە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتیی تۆو بۆڕدانی ناحەزانت، ئەوانەی ڕەقەبەریت لەگەڵ دەکەن‌و نینکاری پێغەمبەرایەتیت دەکەن. ﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُون أَقْلاَمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ﴾ ئەی محمەد! تۆ ئاگادار نەبووی‌و لەوێ نەبووی ئەو کاتەی زاناکان‌و مالەکانی بەیتولمەقدیس کەوتبوونە کێشەو ململانێوە، هەریەکەیان قەڵەمی نووسینی فڕێدایە جۆمی ئەردەنەوە، پێنوسی هەموویان شەپۆلی ئاوەکە بردنی، تەنها قەڵەمی زەکەریا وەستاو ئاوەکە نەی برد، ئەوەش نیشانە بوو بۆ ئەوەی کە مەریەم بە زەکەریا بسپێردرێ، خۆتۆ لەوێ نەبووی کە خێزانی عیمران مەریەمی هێناو خستیە بەیتولمەقدیسەوە تا بوترێ: ئەم هەواڵانەی بەچاوی خۆی دیوە، کە ئەوە بوو زاناو مالەکان کەوتنە پێشبڕکێ‌و ململانێی ئەوە کە کامەیان ببێتە سەرپەرشتیکاری مەریەمو پەروەردەی بکا! چونکە مەریەم کچی گەورە پیاوو سەرۆکەکەیان بوو، هەریەکەیان دەیەویست ئەم بەهرەیە بۆخۆی دەستەبەر بکا؛ تەنانەت کێشەکەیان سەری بەوە کێشا کە پەنا بۆ قورعەو تیرو پشك بەرن‌و، پشك هەڵدەن!! کاتی قورعەیان کێشا خواو ڕاستان واهات پشکەکە بۆ زەکەریا دەرچوو!!

دەستەبەرێتی مەریەمی پێ بڕا. ﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ﴾ دیسان تۆ لەوی نەبووی کە ماڵەکان کەوتنە مقۆ مقۆو کێشەوە دەربارەی بەخێوکردنی مەریەم‌و دەستەبەربوونی، تەنانەت تا پشکیان هەڵنەداو قورعەیان نەکرد کێشەکەیان کۆتایی پێ نەهات.

ئەوانەی کێشەیان لێ پەیدا بوو، ماڵەو پیاوە ئاینیەکانیان بوون ئەم هەوڵدان‌و تێکۆشانەشیان لەبەر ئەوە بوو کە پێیان وابوو ئەو کەسەی دەبێتە سەرپەرشتیکاری مەریەم زێدە ڕێزو بەهرەیەکی گەورە وەدەست دێنێ!! جا یان لەبەر ئەوە بوو عیمران سەرۆك‌و ریش سپییان بوو، دەیانەویست هەندێك دەستیاوی پیاوەتی بدەنەوە، یان لەبەر ئەوەبوو کە لە کتێبی خۆیاندا دیبوویان کە ئەم ئافرەتە پاشەڕۆژێکی پڕشنگداری دەبێ‌و خۆی‌و ئەو کوڕەی کە دەیبێ دەبنە ناوازەی ڕۆژگار، یان لەبەر ئەوە بووە ئەنجامدانی ئەو کارە بەلایانەوە ئەرکێکی ئایینی بووەو خێریان دەست دەکەوێ، چونکە مەریەم تەرخان کرابوو بۆ خزمەتکردنی خانەی خوداپەرستی...

ئەم ئایەتە دوابەدوای داستانەکە هێنرا، بۆ ڕوون کردنەوەی ئەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەو چیرۆکانەی نەخوێندۆتەوە، چونکە نەخوێندەوارە، دەماو دەمیش نەگێردراونەوە — وەکوو ناحەزانی پێغەمبەر دەڵێن — چونکە گەلەکەشی نەخوێندەوار بوون. کەوابێ بواری زانینی ئەو سەرگورشتانە یان دەبێ بەهۆی سروش بێ، بە نیگا پێی ڕاگەیەنرا بێ — کە ئەوان ئینکاری دەکەن — یان دەبێ ئاگا لێ بوون بێ بەهۆی ئامادە بوونی سەر ڕووداوەکانەوە، ئایەتەکە ئاگا لێ بوونەکەی ڕەت کردەوە.

بەراستی ئەو خاوەن نامە ئاسمانیانەی ئینکاری پێغەمبەرایەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) دەکەن چەند گرۆیەکی بێ ویژدانن، ئەو شتانەی کە قورئان وەکوو کتێبی ئەوان باسی کردووە، دەڵێن: ئەوە نیگا نیە، لە کتێبی ئێمەی وەرگرتووە، ئەگەر هەواڵەکەی قورئان وەکوو زانیاری ناو کتێبی ئەوان نەبوو دەڵێن:

ئەوە راست نیە، ئەگەر ئەو زانیارییەی قورئان لە کتێبی ئەوانـدا نـەبوو دەڵێن: ئـەو هەواڵە هەر ئەساسی نیەو شتی وا نەبووە.

## چیرۆکی حەزرەتی عیسا

﴿ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾ وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾ وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنِّى قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ أَنِّىٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِى بُيُوتِكُمْ

إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ۚ وَجِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ إِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ ۗ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾.

دوای ئەوە پەروەردگار چیرۆکی زەکەریاو یەحیا – پورزای عیسا —و باسی چیرۆکی دایکی عیسای کرد، جێگەی خۆیەتی کە چیرۆکی عیساو چۆنیەتی لە دایکبوونی بگێڕێتەوەو فەرمووی: ﴿إِذْ قَالَتِ الْمَلآئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ﴾ ئەی موحەممەد! ئەوە بۆ گەلەکەت بگێڕەوە کاتێک جوبرائیل بە مەریەمی گوت: ئەی مەریەم! خودا موژدەت دەداتێ بە کوڕێک کە سروشتی وایە بە وشەو فەرمانێکی خودا خۆی کە (کن فیکن)ە پەیدا دەبێ، دروستکردنەکەی بەشێوەیەکی نائاسایی‌و ناعادەتی دەبێ، بۆیە بەو صیفەتە وەصفدار کراوە.

جا هەرچەندە لە راستیدا هەموو بوونێک بەفەرمانی خودا دێتە گۆڕەپانی بوونەوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قَضَى أَمْراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ هەردەمێ بڕیاری بوونی شتێکی دا هەر ئەوەندە پێی بفەرموێ: ببە ئیتر دەبێ، یان لە سوورەتی (یس) ئایەتی (٨٢) دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ بەلام بە عورف‌و عادەت پەیدا بوونی شت پاڵ هۆکاری عادی دەدرێ پەیدابوونی عیسا ئەو هۆکارە عادییە نیە، بۆیە تەکوینەکەی پاڵ وشەی (کن فیکن) دراوە، دەگوترێ: عیسا بە

وشــەی خــودا (كلمــة الله) پەيــدا بــووە، ديــارە (اطــلاق)ی کەلیمــە بەســەر (عيــسا)دا (اطلاق)ێکی مەجازیە. ئـەی مەریـەم! ئـەو کوڕەی دەتبـێ نازنـاوی مەسـیح دەبێ‌و بـە عیسای کوڕی مەریەم ناو دەبرێ.

مەسیح واتە: ئەو کەسەی ستەم لادەباو ئادەمیزاد شارەزای رێبازی راست دەکاو برایەتی راستەقینە بلاو دەکاتەوە.

وشەی مەسیح نازناوی فریشتە بووەو لەقەبی مەدح‌و رێزلێنانـە لـەم رووەوە کـە داب‌و نــەرێتیان وابــووە هەرکەســێك ببوایــە بــە پاشــا دەبوایــە بــچێتەلای (کــاهن) کوڵەومنانی بۆ ئەوەی بە رۆنی پیرۆز (الدهن المقدس) چەوری بکا.

ئیتر لەم رووەوە بە چوونە سەر تـەخت‌و پاشایەتییان گوتـووە: مەسح‌و ئـەوەی بووەتـە پاشـا پێیـان گوتـووە: مەسـیح. دیـارە پاشـایەتییەکەی عیسا گیـانی بـووە نـەك جەستەیی. قورطوبی دەڵێ: مەسیح واتە: صدیق = راستخواز.

هەروەها لەناو ئەو گەل‌و نەتەوەیەدا (مەسیح)ێك پەیدا دەبێ دەست رۆیشتوو دەبـێ، سـەڵتەنەت‌و دەسـەڵاتی لەدەسـت چـوویان بـۆ دەسـتەبەر دەکاتـەوەو نگینـی رابوردوویان بۆ دەگێڕێتەوە. ئیتر کە عیسا سەری هەڵداو بانگەوازی کـردو بـە مەسـیح ناوی بلاوبووەوە؛ کۆمەڵێك لە جولەکەکان ئیمانیان پێ هێناو وتیان: ئەمە ئەو زاتەیـە کـە پێغەمبـەرانی پێـشوو موژدەیـان بەهاتنی داوەو موڵك‌و سـەڵتەنەتی لەدەسـتچووی داوودو سولەیمانمان بۆ دەستەبەر دەکاتەوە، تەنانەت جولەکەکان تـا ئێـستاش بەتـەمای هاتنی ئەو مەسیحەن‌و پێیان وایە کە هێشتا ئەو مەسیحە پەیدا نەبووە!.

رەحمەت لەو کەسە لەم جۆرە بۆنانەدا گوتوویەتی:

تاکــەی بەتــەمای مــانگی نــوێی ئاســۆی؟

وا چـواردەی مانگـە، ئـەی کـوێری بـێ گـوێی!

بۆیـەش گـوتراوە: (ابـن مـریم = کـوڕی مەریـەم) هەرچـەندە خیطابی ئایەتەکـە لەگەڵ مەریەمدایە، تا ئاماژەبێ بۆئەوەی کە عیسا پاڵ ئەو دەدرێ، چونکە بـەبێ بـاوك لەدایك بووەو ئەم وەصفە لەمێشکی خەڵکیـدا جێگیربـێ‌و لەهـەمان کاتـدا رەتکردنـەوە

بێ بۆ ئەوانەی کە عیسا بەخودا یا بە کوڕی خودا دەزانن، هەروەها پلەو پایەی مەریەمیشی پێ بەرز دەبێتەوە. ﴿وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ﴾ ئەو فرزەندەیەی تۆ خاوەن ڕێزو پلەو پایە دەبێ لە دونیاو قیامەتدا؟

لەدونیادا پلەو پایەی تایبەتیو ڕێزو نرخی بێ ئەندازەی لە دڵو دەروونی ئادەمیزاداندا دەبێ، ڕێزو نرخی بێ ئەندازەی لەدڵی موسوڵماناندا هەیە، ئەو بیرو باوەڕەی بڵاوی کردەوە تا ئێستاش شوێنەواری ماوە.

لە قیامەتیشدا ماقوڵیو ڕێزی لەوەدایە کە لای خودا خاوەن پلەو پایەیەکی بەرزە، ئادەمیزادان دەی بینن‌و خۆشەویستی لای خودا هەست پێ دەکرێ. ﴿وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ﴾ لەو زاتانەیە کە لەو ڕۆژەدا لەخوداوە نزیکن، هەرکەسێ بیروانێتێ دەزانێ چەندە لای خودا نزیكو ڕێزدارە!

وێڕای ئەو بەهرەو ڕەوشتانەی ﴿وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً﴾ لە تافی منداڵیو کامڵیدا ئاخاوتن لەگەڵ خەڵکدا دەکا، ئەمە ئاماژەیە بۆئەوە کە عیسا تەمەن درێژ دەبێو دەژی تا دەبێتە پیاوێکی تەواو ژیرو خاوەن بیر.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: قسەکردنەکەی لەناو بێشکەداو بەمنداڵی بۆ ماوەیەکی کورت بووەو دوایی لەقسەکردن وەستاوەتەوە، تا گەیشتۆتە ئەو تەمەنەی کە بەڕواڵەت منداڵ تێیدا فێری قسە دەبێ.

بڕێ پێیان وایە! عیسا لەبێشکەدا قسەی نەکردووەو پاکانەشی بۆ داوێن پاکی دایکی نەکردووە، وە دەڵێن: سی ساڵ ژیاوە.

جولەکەش بوختان بە مریەم دەکەن‌و دەڵێن: لەگەڵ یوسفی (النجار)دا داوێن پیسی کردووە!! ﴿وَمِنَ الصَّالِحِينَ﴾ هەروەها بەیەکێك لە پیاوە راستاڵەکانی خودا دەژمێردرێ، ئەو پیاو چاکانەی خودا نازو نیعمەتی خودا پەرستی پێداون لە گرۆهی پێغەمبەرانو ڕاست خوازان کە مەریەم بۆ خۆی ژیاننامەکانیان دەزانێ.

جا کە مەریەم ئەو نیگاو سرووشەی لە جوبرائیل بیستو پێش وەخت شێوەو ڕەوشتو چۆنیەتی کوڕە چاوەڕوانکراوەکەی زانی بە سەرسامییەوە ﴿قَالَتْ رَبِّ أَنَّى

يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ﴾ وتی: خودایە! من چۆن کوڕم دەبێ؟ خۆ من هێشتا کچم‌و شووم نەکردووەو پیاو دەستی بۆ نەهێناوم‌و بەدەستی نەگرتووم؟؟. دەشگونجێ مەبەستی ئەوە بووبێ: ئایا کەمن کوڕم دەبێ بەهۆی شووکردن‌و مێردەوە دەبێ، یان بەهۆی شتی ترەوە دەبێ؟

دەشگونجێ مەبەستی سەرسوڕمان بێ لەتواناو دەسەڵاتی خوداو بەگەورە زانینی بێ.

﴿قَالَ كَذَلِكِ﴾ پەروەردگار پێی گوت: ئەوەی تۆ دەیڵێی راستە دروستکردنی منداڵ بەبێ باوك جێگای سەرسوڕمانە بۆ تۆ، بەڵام بۆ خودا شتێکی ئاسان‌و ساکارو ئاساییە. ﴿اللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ﴾ خودا چی بوێ ئاوا دروستی دەکا.

جا لەبەر جیاوازی نێوان داستانی (زەکەریا)و (مەریەم) لەبارەی عەجایەبییەوە؛ لەداستانی زەکەریادا فەرمووی: ﴿يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ﴾ بۆ داستانی مەریەم فەرمووی: ﴿يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ﴾ چونکە بەرواڵەت رووداوەکەی زەکەریا هێندەی رووداوەکەی مەریەم سەرسوڕهێنەر نییە، عادەتیش وایە مادەی (فعل) بەزۆری بۆ ئەو شتانە بەکاردەهێنرێ کە بەرواڵەت بەپێی هۆکاری کەونی پەیدادەبن، بەڵام مادەی (الخلق) بۆ رووداوێك بەکاردەهێنرێ کە زێدە ئیبداعی تێدابێ‌و بەخوا نەبێ بەکەسی تر نەکرێ!! بۆیە دەگوترێ ﴿خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ ناگوترێ ﴿فَعَلَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾، بۆیە پەیدابوونی یەحیا لە دایك‌و باوکێکی پیرو کەنەفت هەرچەندە جێگای سەرسوڕمانە بۆ زەکەریا لەورووەوە کە وێنەی زەکەریاو خێزانەکەی بەرواڵەت منداڵیان نابێ، بەڵام پەیدابوونی عیسا سەرسوڕهێنەر ترە چونکە لە قانوون‌و یاسای سروشت بەدەربوو، بۆیە تەعبیر دانەوە لەو رووداوە بە (يَخلق) شیاوترە لە (يفعل).

﴿إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ کە خودا ویستی شتێك بێنێتەدی‌و کارێك ئەنجام بدا، هەر ئەوەندە دەفەرموێ: ببەو ئیتر دەبێ، چرکەیەك دواناکەوێ‌و

یەکسەر دێتە دی! ئەمە ڕەنگدانەوەی توانای ڕەهاو هاتنەدی ویستو ئیرادەی خودایە، وێنە کێشانێکە بۆ جێبەجێ بوونی ویستەمەنی زاتی خۆدا بەبێ دواکەوتن، بەشێوەی فەرمانڕەوایی‌و کارڕەوایی‌و دەست ڕۆیشتوویی ڕەها. ئەمجۆرە پێی دەگوترێ ئەمری تەکوینی، ئەمرێکی تر هەیە پێی دەگوترێ ئەمری تەکلیفی کە بریتییە لەو فەرمانانەی کەخودا بەنیگاو سرووش بە پێغەمبەرانی رادەگەیەنێ وەکوو ﴿وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ، وَآتُواْ الزَّكَاةَ، لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ﴾.

ئەوانەی بڕوایان بەرەهایی دەسەڵاتی خودا نییەو ئینکاری ئایەتەکانی دەکەن دان بەوەدا نانێن کە عیسا بەبێ باوك بووبێ!!

﴿وَيُعَلِّمُهُ الْكِتَابَ﴾ هەروەها فێری نووسین‌و خەتی دەکا ﴿وَالْحِكْمَةَ﴾ فێری زانستی ڕاست‌و ڕەوان‌و هەڵنەر بۆ کرداری بەسوودی دەکا، ﴿وَالتَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ﴾ شارەزای تەوراتی دەکا کە بۆ مووسا نێردراوە، لەنهێنی بڕیارەکانی تەورات شارەزای دەکا، هەروەها فێری حوکم‌و ئامۆژگارییەکانی ئینجیلیشی دەکا کە بۆخۆی نێردراوە ﴿وَرَسُولاً إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ دەیکا بە پێغەمبەرو ڕەوانەی دەکا بۆ ناو نەتەوەی ئیسرائیل.

ریوایەت کراوە دەڵێن: عیسا لەتەمەنی سیی ساڵیدا نیگای بۆ هات. سێ ساڵیش لەناو قەومەکەیدا پێغەمبەرایەتی کردو دوایی بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان. کە دەکرێتە پێغەمبەر بەڵگە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی خۆی دەهێنێتەوەو دەڵێ: ﴿أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ ئەمن لە خوداوە نیشانەی ڕاستی پێغەمبەرایەتیم بۆ ئێوە هێناوە کە بەهەرەی پێغەمبەرایەتیم دەچەسپێنێ، ئەویش ئەوەیە ﴿أَنِّي أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللّهِ﴾ لەقوڕ شێوەو هەیکەلی باڵندەیەك ڕێك دەخەم، دوایی فووی پێدا دەکەم بە فەرمانی خودا گیانی بەبەردا دەکرێ‌و وەکوو باڵندەی تر دەکەوێتە هەوا پەروازو دەفڕێ.

دەگێڕنـەوە کـە عیـسا (عليـهِ الـسلام) بانگـەوازی ئـایینی خـۆی بڵاوکـردەوەو موعجیزەی پێغەمبەرایەتی خۆی نیشان دان، داوایـان لێکـرد کـە شەمـشەمە کوێرەیـەك دروستبکا، ئـەویش پارچـە قـوڕێکی هێنـاو ڕێکـی خـستو فـووی پێـدا کـردو بـوو بـە باڵندەیەکی ئاسایی‌و دەستی کرد بەفڕین لەنێوان زەوی‌و ئاسماندا، دەڵێن: ئەو باڵندەیە تـا لەبـەر چـاوی خەڵکەکـەدا بووایـە دەفـڕی‌و کـە لـەپێش چـاویان ون دەبـوو دەکەوتـە خوارێ، بۆئەوەی لە باڵندەی حەقیقی جیابکرێتەوە. ﴿وَأُبْرِئُ الأَكْمَـهَ والأَبْـرَصَ وَأُحْيِـي الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللّهِ﴾ هەروەها کوێری زکماك‌و بەڵەك چاك دەکەمەوە، بە ئیزن‌و یارمـەتی خوا مردوو زیندوو دەکەمەوە. بۆیەش ئـەو دوو جـۆرە نەخۆشـییەی باسـکردن چـونکە لەو ڕۆژگارەدا ئەو دوو نەخۆشییە – هەرچـەندە زانیـاری پزیـشکی پێـشکەوتوو بـوو – بـەڵام پزیـشکەکان نـەیانتوانی چـاری ئـەم دوو نەخۆشـییە بکـەن. جـا چـونکە لـەو ڕۆژگـارەدا زانیـاری پزیـشکی پێـشکەوتوو بـوو، بۆیـە پـەروەردگار مـوعجیزەی لـەوەدا پیـشاندان کـە تێیـدا پـسپۆڕبوون، سـوننەتی خـودا وایـە کـە مـوعجیزەی هـەموو پێغەمبەرێك لە توخمی ئەو شتانەبێ کە لەو ڕۆژگارەدا باو بووبێ‌و ئـەو نەتـەوەی کە پێغەمبەرەکـەیان بـۆ نێـردراوە تێیـدا پـسپۆڕ بـووبن، بـۆ نموونـە چونکە لـە ڕۆژگـاری مووسـادا میـصرییەکان لـە سـیحرو جادوبازیـدا پـسپۆڕ بـوون، بۆیـە پـەروەردگار مـوعجیزەی عەصـای دا بەمووسـا، مـارە درۆزنـەکانی سـیحر بازەکـانی قـووت دان، ئـەو سـەردەمەی (حـەزرەتی محمـد)ی تێدا ڕەوانـەکرا ڕۆژگـاری زمـان ڕەوانـی‌و بەلاغـەت‌و ڕەوان بێژی بـوو، چـاخی پێشبڕکێی شاعیرو وێـژەر بـوو، بۆیـە مـوعجیزەی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) قورئـان بـوو؛ کـە فەرمایـشتێکی ڕەوان بێـژی وابـوو کـە تەحـەدای هـەموو عـەرەب‌و ڕەوان بێـژو قسە زان‌و وێـژەرانی ئـەو سـەردەمەو هـەموو چاخەکانی دوای ئـەو کاتەشی کـرد، تەحـەدای کـردن کـە بتـوانن وێنـەی ئـەو قورئانـە بخەنـە ڕوو، بـەڵکوو بـە تەحـەداوە پێـی گـوتن: ئەگـەر هـەموو ئـادەمیزادو ئەجنـدە کۆببنــەوە نــاتوانن وێنــەی ئــەم قورئانــە – تەنانــەت دە ســوورەتی، بــەڵکوو تاقــە سوورەتێکیشی – بخەنە ڕوو!!

﴿وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ﴾ هەروەها هەواڵتان دەدەمێ بەجۆری ئەو خواردەمەنییەی کە دەیخۆن‌و، ئەوەی پاشەکەوتی دەکەن بۆ ڕۆژێکی تر، بەڵێ دەیتوانی خەبەربدا بەهەموو کەسێك بەوەی کە ئەو ڕۆژە خواردوویەتی‌و ئەوەی کە بەزەخیرە هەڵی گرتووە بۆ ڕۆژێکی تر.

جوداوازی نێوان هەوڵدانی پێغەمبەران بەشتی غەیبی‌و هەوڵدانی ئەستێرەناس‌و کاهین‌و فاڵ گرەوە بەشتی نادیار، ئەوەیە پێغەمبەر بەهۆی پێ ڕاگەیاندنی خودا هەواڵەکە دەدا پشت بەشتی تر نابەستێ، بەڵام ئەستێرە ناس‌و کاهین پشت بەرێگەی فرت‌و فێڵ‌و چاو بەست‌و حیساب‌و تاوو توێ کردنی حیساب‌و قاعیدەی تایبەتی خۆی دەبەستێ، پەنا بۆ چەند هۆکارێك دەبەن کە سەردەکێشن بۆ زانینی بڕێ هەواڵ کە زۆرجار چاوبەستییەکەشی بۆ ئەنجام نادرێ!!

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لَّكُمْ﴾ بێگومان لەو موعجیزانەی باسکران نیشانەی گەورەو ئاشکراو بەهێز هەن لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتیم‌و شایانی ئەوەیە کە ئێوە پەند وەربگرن‌و بیربکەنەوەو تێبگەن کەمن لە پەیامەکەمدا ڕاستگۆم‌و پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خودام بۆ ناو ئێوە، دەزانن کەمن لە ڕاگەیاندنی فەرمان‌و نەهییەکانی پەروەردگاردا ڕاستگۆم. ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ڕاست دەکەن بڕواتان بە یەکتا پەرستی‌و پێغەمبەرایەتی مووساو فەرمان‌و نەهییەکانی تەورات هەیە، چونکە ئەوەی من بانگەوازی بۆ دەکەم پێش من تەوراتیش ڕای گەیاندووەو مووسا بانگەوازی بۆ کردووە، ﴿وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ﴾ هاتووم ئەحکامی تەورات دووپات بکەمەوەو بیچەسپێنم‌و پشتگیری لێ بکەم، نەك حوکمەکانی هەڵوەشێنمەوەو دژی بوەستم! مەگەر بڕێ حوکم کە لەسەرتان گرانەو لێتان تەنگکراوە سووکی بکەم ﴿وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ﴾ بڕێ خواردن‌و ئیش کە لێتان قەدەغە کراون بۆتان حەڵاڵ‌و ڕەوا بکەمەوە وەکوو ئەو شتانەی کە لەئایەتی (١٦٠)ی سوورەتی (النساء)دا کە دەفەرموێ: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ﴾

دەڵێن: ئەو شتانەی لە نەتەوەی ئیسرائیل یاساغ کرابوون گۆشتی ماسیو گۆشتی وشترو بەزو ئیشکردن لەڕۆژی شەممەدا بوو.

﴿وَجِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ نیشانە دوا نیشانەم لەخوداوە بۆ هێناون کە دەبنە شایەت لەسەر راستگۆییمو راستی پێغەمبەرایەتیم، راستی ئەو پەیامەی پێم راگەیاندوون، وەکوو دروستکردنی باڵندەو فڕینی، چاکردنەوەی کوێرو بەڵەكو زیندوو کردنەوەی مردوو، هەواڵدان لەشتی غەیبیو نادیار. بۆیە هێنانی نیشانەو ئایەتەکانی خودای دووبارە کردەوە بۆئەوەی ئەم فەرمانەی لەسەر هەڵستێنێ کە دەفەرموێ: ﴿فَاتَّقُواْ اللّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ کەواتە لەخودا بترسنو سەرپێچی فەرمانەکانی مەکەن، بەقسەی من بکەنو ئەوەی پێتان دەڵێم ئەنجامی بدەنو بەپیر بانگەوازییەکەمەوە وەرن کەبنەمای سەرەکی بریتییە لەیەکتا پەرستی ﴿إِنَّ اللّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ﴾ بێگومان (الله) خودای منو ئێوەشە، پەرستشی بکەنو بیپەرستن، ئەوە رێگەیەکی راستو بێ پێچو پەنایەو هەموو پێغەمبەران لەسەری کۆکنو هەر ئەم رێبازە ئادەمیزاد دەگەیەنێ بە کامەرانی دونیاو قیامەتو هەرکەسێ لەم رێبازە لابدا گومڕاو سەر لێ تێکچووە! ﴿هَذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ ئەوەی کە پێتان دەڵێم پێم راگەیاندوون رێبازێکی راستو رەوانە هەموو پێغەمبەران لەسەری کۆکنو لە ئاستیدا یەك ران!!

ئەمە پوختەی ئەرکی پێغەمبەرایەتییە: فەرمان بەتەقوا کردنو گەردن کەچی بۆ خودا، یەکتا پەرستی، ئیعتراف بە بەندایەتی بۆ خودا!

## هەڵوێستی عیسا لەگەڵ قەومەکەی بەخاوەن باوەڕو بێ باوەڕیانەوە

﴿ ۞ فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ

بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾ رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَكَرُوا۟ وَمَكَرَ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٥٤﴾ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَىَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوْقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۖ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٥٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٥٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٧﴾ ذَٰلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ مِنَ ٱلْءَايَٰتِ وَٱلذِّكْرِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٥٨﴾ ﴾.

ئەمجار پاش ئەوەی کە پەروەردگار باسی موعجیزاتی عیسای کرد، داستانی ئەو پێغەمبەرە لەگەڵ قەومەکەیدا دەگێڕێتەوە، کە بانگی کردن بۆ ئیمان هێنان: بڕێک بڕوایان پێ کردو، ئەوانی تر روویان لێ وەرگێڕا، زۆربەی جولەکە بڕوایان پێ نەکردو کەوتنە ئەزیەتدانیو گاڵتە پێ کردنی، بە لاقرتێوە پێیان دەگوت: عیسا! پێمان بڵێ: فلان ئەمڕۆ چی خواردووەو چی پاشەکەوت کردووە؟ عیسا وەڵامی راستی دەدانەوە،

ئەوان قەشمەرییان پێ دەکرد! ماوەیەك ئەم حاڵەتە درێژەی كێشا، ئیتر جولەکە ویستیان بیکوژن‌و لە کۆڵ خۆیانی بکەنەوە، ئەویش ترساو خۆی شاردەوە لێیان، ماوەیەك لەگەڵ دایکیدا جێ گۆڕکێی دەکرد، جا کە دڵنیا بوو کە جولەکە لێبڕاون بۆ کوشتنی، شەوێك لە شەوان قوتابییەکانی – کە دوانزە کەس بوون – کۆی کردنەوە، ویستی ئامۆژگارییان بکاو بزانێ ئاخۆ تا چ ئەندازەیەك ئەو شوێنکەوتوانەی ئامادەباشی بانگەوازی کردن‌و خۆبەخت کردنن لە پێناو پەیامەکەیدا؟؟

﴿فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَى مِنْهُمُ الْكُفْرَ﴾ کاتێك عیسا هەستی کرد کە قەومەکەی سوورن لەسەر کوفرو بەردەوامن لەسەر گومڕایی‌و بەتەواوی لەو هەڵوێستەیان دڵنیا بوو، ویستی بزانێ کێ بە دڵسۆزی لەگەڵیدایە، ﴿قَالَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللَّهِ﴾ کێ یارمەتیدەرمە بۆ بانگەوازی کردن‌و خۆ دەخاتە ریزی ئەوانەی بانگەوازی بۆلای خودا دەکەن؟؟ کێ لەوانە ئامادەباشی خۆی نیشان دەدا بۆ شوێنکەوتنم‌و واز لە عادەت‌و هەواخوازی خۆی دەهێنێ‌و لێ دەبڕێ بۆ یارمەتیدانی پێغەمبەرەکەی؟؟

﴿قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللَّهِ﴾ هەڤاڵە دڵسۆزەکانی عیسا، قوتابییەکانی بەیەك دەنگ وتیان: ئێمە یارمەتیدەری ئایینی خوداین‌و چی بتوانین دریغی ناکەین، ماڵ‌و گیانمان لە پێناو پەیامەکەتدا دەبەخشین‌و پابەندی تەعلیمات‌و بەرنامەی پیرۆزت دەبین‌و واز لە داب‌و عادەتی کۆنینەمان دەهێنین! ﴿آمَنَّا بِاللَّهِ﴾ بڕوامان بە خودا هەیە، ئیمانمان بە تاك‌و تەنیایی پەروەردگار بەهێزو پتەوە، ﴿وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ تۆ شایەد بە کە ئێمە موسوڵمانی تەواوین، موسوڵمانەتی بەم واتایە: کە ئێمە گەردنکەچی فەرمانی خوداین‌و پابەندی ئامۆژگارییەکانین، هەمیشە ملکەچ‌و فەرمانبەردارین.

ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزو رۆشنە کە ئایینی ئیسلام پەسەندکراوی خودایەو هەموو پێغەمبەرێك بانگەوازی بۆ کردووە، هەرچەندە برێ جیاوازی لە ڕواڵەت‌و حوکم‌و هەڵس‌و کەوتیاندا هەبووبێ.

بۆیەش داوای شایەتییان لە عیسا کرد، چونکە پێغەمبەران رۆژی قیامەت شایەدی بۆ گەلەکانیان دەدەن! ئەمجار کەوتنە پاڕانەوەو لالانەوەو عەرزو حاڵی خۆیان ئاراستەی پەروەردگار کردو وتیان: ﴿رَبَّنَا آمَنَّا بِمَا أَنزَلَتْ﴾ خودایە! ئێمە ئیمانمان هێناوە بەو حوکمەو یاسایەی لە کتێبی خۆتدا ناردووتە خوارێ ﴿وَاتَّبَعْنَا الرَّسُولَ﴾ شوێن پەیامی پێغەمبەرەکەت (کە عیسای کوڕی مەریەمە) کەوتووینو پابەندی ئەو ئامۆژگاریانەین کە لە زاتی تۆوە بۆی نێردراوە، ﴿فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ﴾ لە ڕیزی شایەدو گەواهی دەران بمان نووسە؛ ئەوانەی شایەدی دەدەن لە حاڵو چۆنیەتی پێغەمبەران لەگەڵ گەلەکانیاندا.

باسکردنی (الإتباع = شوێنکەوتن) دوای وشەی (آمنا) بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئیمانەکەیان گەیشتۆتە پلەی یەقینو دڵنیاییو باڵادەستی بەسەر نەفسیانداو هەڵنەر بۆ کردەوەی چاك، چونکە زانیاری ڕاست کردەوەی چاکی لێدەکەوێتەوە.

ئەمجار پەروەردگار باسی هەڵوێستی کۆمەڵێك جولەکە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَكَرُواْ﴾ فرتو فێڵیان کرد بۆ لەناو بردنی عیسا، واتە: کۆمەڵێك جولەکە بە ڕەهنومایی کردنی (یەهوذا) پلانێکیان ڕێکخست بۆ کوشتنی عیسا (سەلامی خوای لێبێ) بەشێوەیەکی ناجوانمەردانە، ئەو دڵ پیسو خوانەناسانە هەستان بە فیتنەییو دوو زمانی کردن لەلای پاشای ڕۆمانی ئەو ڕۆژگارە کە ئەویش خوانەناسو ملهوڕێکی ستەمکاربوو ناوی (بیلاطس) بوو پێیان وت: کە کابرایەك پەیدا بووە سەر لەخەڵکی دەشێوێنێو لە ملکەچی بۆ پاشا ژێوانیان دەکاتەوە، مسکێنو ڕەشەخەڵکەکە تێك دەدا، باوكو کوڕ لەیەك دەکا، هەتا وایان لە (بیلاطس) کرد کە صەلاحیەتی تەواویان بداتێ بۆ لەناوبردنی. ئیتر جولەکەکان دەستەیەکیان سەرباز نارد لەگەڵ یەهوذا – کە یەکێك بوو لە قوتابیەکانی عیسا دووڕوو بوو!! عیسا لەوەپێش هەستی پێکردبوو کە دڵڕەشو خوانەناسەو لەگەڵیدا نیازی پاکی نیە – کە گەیشتنە ئەو شوێنەی عیسای لێ بوو تەشریفی لەو کاتەدا لە باخچەیەکدا نوێژی دەکرد لە نزیك هۆدەیەك کە قوتابیەکانی

(الحواريون)ی تێدا نووستبوون! عیسا لە نوێژەکەیدا هەستی بە هاتنی سەربازەکان کرد ترساو خۆی خستە ژووری قوتابیەکانەوەو لە پەنجەرەکەیەوە دەرچووە دەرەوە! یەهوذا کە پێشەنگی دەستە تیرۆرستەکە بوو چووە ژوورەکەوە بەڵام لەوێدا عیسای نەدی ﴿وَمَكَرَ اللَّهُ﴾ خوداش سزای فرتو فێڵەکەی بەم جۆرە دانەوە، رەنگو روخساری عیسای بەسەر یەهوذادا کێشا بە جۆرێك قوتابیەکانی بەخەبەر هاتن یەهوذایان بە عیسا زانی! ئیتر یەهوذا کە عیسای بەرچاو نەکەوت هاتە دەرەوە وتی: عیسا لێرە نیە، سەرۆکی دەستەکە کە یەهوذای بینی بە عیسای زانیو فەرمانی دا بە گرتنو کوشتنی، یەهوذا هاواری لێ هەڵساو وتی: من یەهوذام کابرای سەردەستە وتی: ئەگەر تۆ یەهوذایت ئەی کوا عیسا؟؟ یەهوذاش وتی: دەی باشە کەمن عیسام ئەی یەهوذا کوانێ؟؟ بەڵام سەرۆکی دەستەکە گوێی بەمە نەداو فەرمانی دا یەهوذایان بردو کوشتیان. ﴿وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ پەروەردگار باشترین سزادەرەوەی فێڵبازانە! بەراستی سزای پڕاو پڕی فێڵبازان دەداتەوە، دەبێ فێڵبازی لە ئەمە زیاتر چی بێ یەهوذایەك بە فێڵ خۆ بکا بە هەڤاڵو قوتابی عیسا بچێتە ریزی حەوارییونەوەو خۆی بە دڵسۆزو بانگەوازی کەر پیشان بداو لەپاشملە جاسوسی بەسەر عیساوە بکاو، نهێنییەکانی رۆژ بەرۆژو سات بەسات بە جوولەکە خوانەناسەکان بگەیەنێ؟؟ جولەکەکانیش پیلانی دڵ رەشانەی بۆ بکێشنو لەلای پاشای خوا نەناس ئاوا بەوجۆرە خوێنی بکەنە کاسەوە؟؟ سەرباری ئەوەش یەهوذا خۆی رێ نیشاندەر بێو پێش کۆمەڵێك جولەکە بکەوێو بچێ بۆئەوەی عیسا لەناوبەرێ؟؟ ئەی دەبێ سزا لەمە شیاوتر چی بێ؟. لەو حەلەدا کە یەهوذا روخساری عیسای بەسەردا بکێشرێو بەعیسای بزاننو بیگرنو بیکوژن؟ هەرچەندە هاواربکا بڵێ: من عیسا نیم، پێی باوەڕ نەکەنو بیبەن چوار مێخەی بکێشن، ئەوەی بە خەیاڵی خۆی بۆ عیسای نەخشە کێش کردبوو بەسەر خۆیدا بشکێتەوە.

بــەڵێ پیلانیــان دانــاو ویــستیان عیــسا بگــرنو بیکــوژنو هــەڵی بواســن. پەروەردگاریش ویستی بۆلای خۆی بەرێو بەرزی بکاتـەوەو پـاکی بکاتـەوە لـە تێکـەڵی ئـەو خـوا نەناسـە پیـسانە، ویـستی ڕێـزی لێ بگـرێو شوێنکەوتووانیـشی بخاتـە ژوور ئەوانـەوە، کـە کـافرن تـا ڕۆژی قیامـەت! ویـستی خـودا هاتـە جێو فـرتو فێڵـی پـلان گێڕانو ستەمکاران پووچەڵ بووەوە.

بـەڵێ بێگومـان خـودا باشـترین تەگبیرکـەرو پـلان جێبـەجێ کـەرو پتـەوترو بـەهێزترو بـەتواناترە.. کەسێك کـەبتوانێ زیـان بـەو کۆمەڵـە پـلان گێـڕە بگەیـەنێو ویـستی خـۆی بـە ئـەنجام بگەیـەنێو ئـەمجار لێیـان بگـەڕێ لـە گـومڕایی خۆیانـدا سەرگەردان بنو پێیان وابێ پیلانەکەیان جێبەجێ کردووەو ئارەزۆی خۆیان هێناوەتە دی. بەلام لەڕاستیدا وانییە!! بەپێچەوانەوەیە.

ئیمامی ئـەبو حـەییان دەڵێ: مانـای ﴿وَاللَّـهُ خَيْـرُ الْمَـاكِرِينَ﴾ ئەوەیـە کـە خـودا پاداشـتی خێرەوەمەنـدان بـە فـەزڵو گـەورەیی خـۆی دەداتـەوە، سـزای سـتەمکارانیش دادوەرانە ئەنجام دەدات، چونکە ئەوە کردگارێکی حەقو ڕاستە.

ئەمجار پەروەردگار باسی بەرزکردنەوەی عیسا بـۆ ئاسمـان دەکـاو، ڕووی خیطـاب دەکاتە پێغەمبەری ئیسلامو دەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ ئەی محمد! یادی ئەوە بکەرەوە کە پەروەردگار بە عیـسای فـەرموو: ئـەی عیـسا! ئـەمن لەکاتی دیاریکراودا گیانت دەکێشمو بەرزت دەکەمەوە بۆلای خۆم.

### ڕاڤەکەران (مفسرین)ی قورئان لەمانای ئەم ئایەتـەدا دوو جـۆر مانایـان لێ داوەتەوە:

١- دەڵێن: ئایەتەکە پـاشو پێـشی تێدایـە، واتـە: بـەرزت دەکەمـەوە بـۆلای خـۆمو پاکت دەکەمەوە لە کردارو هەڵوێستی ئەوانەی کافرو خوانەناسن، ئەمجار (پاش ئـەوەی دەتنێرێنـەوە بۆسـەر زەوی) گیانـت دەکێـشم. واتـە: پـەروەردگار عیـسای بەجەسـتەو گیانــەوە بــەرز کردۆتــەوە بــۆ ئاسمــان، لــەپێش دونیــا وێــران بوونــدا بەماوەیــەك

دەینێرێتەوە بۆسەر زەوی بۆئەوەی پەیڕەوی شەریعەتی ئیسلام بکاو بانگەوازی بۆ بکا، ئەمجار خودا گیانی دەکێشێ! چەند فەرموودەی صەحیح پشتگیری ئەم رایە دەکەن. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە حەدیثێکدا دەفەرموێ: ﴿إن عيسى لم يمت وإنه راجع إليكم قبل يوم القيامة﴾ دڵنیابن: کە عیسا نەمردووە، بێگومان دێتەوە بۆ لاتان پێش ئەوەی رۆژی قیامەت دابێ.

٢- دەڵێن: ﴿مُتَوَفِّيكَ﴾ بە مانای مردنی عادەتییە، ﴿وَرَافِعُكَ﴾ مەبەست بەرزکردنەوەی گیانیو پێدانی پلەو پایەی قیامەتییە، وەکوو دەربارەی حەزرەتی ئیدریس دەفەرموێ: ﴿وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا – مريم/٥٧﴾ ئەوکاتە مانای ﴿إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ بەمجۆرە دەبێ: ئەی عیسا! من دەتمرێنمو دوای مردن دەتخەمە شوێنێکی بڵندو پلەو پایەی بەرزت دەدەمێ.

زۆربەی زانایانی ئیسلام رای یەکەمیان بەلاوە پەسەندە، رەبیعی کوڕی ئەنەس دەفەرموێ: مەبەست لە (متوفيك) خەو لێخستنە، بەلگەمان ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُم بِاللَّيْلِ – الأنعام/٦٠﴾ یان ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا – الزمر/٤٢﴾.

ئەوەتا لەم دوو ئایەتەدا مادەی (وفاە) بەمانای خەواندن هاتووە. پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) کە لەخەو هەڵدەستا ئەم دوعایەی دەخوێندو دەیفەرموو: ﴿الحمد لله الذي أحيانا بعد ما أماتنا﴾.. ئیمامی قورطوبی دەفەرموێ: رای پەسەندو رێکو پێک ئەوەیە: کە عیسا بەزیندوویی بۆ ئاسمان بەرزکرابێتەوە. بەبێ نواندنو مراندن. ئیمامی طەبەریش ئەم رایەی بەلاوە پەسەندە، ئەم رایە لە ئیبنو عەباسەوە گێڕدراوەتەوە.

پەروەردگار داستانی بەرزکردنەوەی عیسا بۆ ئاسمانو بەدرۆخستنەوەی هەڵواسین لەچەند ئایەتێکی تردا باس کردووەو دەفەرموێ: ﴿وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَى مَرْيَمَ بُهْتَانًا عَظِيمًا، وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ

وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلاَّ اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا، بَل رَّفَعَهُ اللّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا، وَإِن مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا – النساء/١٥٦ - ١٥٩﴾.

راناو لە (قبل موته)دا، دەگەڕێتەوە بۆ عیسا، واتە: هەریەکێ لە ئەهلی کیتاب ئیللا پێش مردنی ئیمان بە عیسا دەهێنێ، مەبەستی ئەوکاتەیە کە عیسا دێتەوە سەر زەوی پێش رۆژی قیامەت، ئەو کاتە هەموو ئەهلی کیتاب ئیمانی پێ دەهێنن، چونکە عیسا سەرانە وەرناگرێو جگە لە موسوڵمان بوون هیچ هەڵوێستێکی تریان لێ قبووڵ ناکا؟! ﴿وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ پاکت دەکەینەوە لەو شەڕو نەگبەتییەی کە دەیانەوێ تووشت بکەن، رزگارت دەکەین لەو رەوشتە ناشیرینانەی کە دەیانەوێ پاڵ تۆیان بدەن، وێڕای ئەوەش ﴿وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەو ئادەمیزادانەی شوێنت دەکەونو ئیمانت پێ دەهێنن، بڕوایان وایە: کە تۆ بەندەو رەوانەکراوی خودایو تەصدیقی هەڵوێستی مێژوویت دەکەن کە دەڵێی من هاتووم ﴿وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾ مژدە دەدەم بە هاتنی پێغەمبەرێك کە دوای من دێ ناوی ئەحمەدە، ئەمجار ئیمان بە پێغەمبەری ئیسلام دەهێنن. ئەوانە دەخەینە ژوور ئەو جولەکانەی کە فێڵیان لێ کردیو بەدرۆیان خستیەوە، بە پەیامی تۆ پەندیان وەرنەگرتو هەر لەسەر گومڕایی خۆیان ماونەوەو دەمێننەوە.

ئەم بەرزکردنەوەو پلە پێدانە لە بواری بڕوا راستیو ئەدەبو رەوشت بەرزیو بەڵگە بەهێزیدا دەبێ، ئەم پایەو مەقامە بۆ خاوەن بڕوایانو شوێنکەوتووانی تۆ بەسەر ئەوانەی کە بڕوای پڕوپووچیان هەیەو تۆ بە کوڕی خودا یان بە خودا دەزانن. ﴿إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ تا رۆژی قیامەت ئەمە حاڵیان دەبێ. ﴿ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ پاشان گەڕانەوەتان بۆلای ئێمەیە، لە رۆژی زیندووبوونەوەدا حوکم دەکەم لەنێوانتاندا، ئەو شتانەی نیزاعتان تێیدا هەیە بۆتان یەکالا دەکەمەوە، هەموو راستیو درۆیەك دەردەکەوێ، چەواشەکردنی سەرپێچیکەران دەردەکەوێ!

ئەمجار پاداشی حەقخوازان‌و گومڕایان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُواْ فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ﴾ جا ئەوانەی بڕوایان بە پەیامی عیسا نیەو بەدرۆیان خستەوە (کە جولەکەکانن) ئەوە لەدونیا سزای بەئێشیان دەدەم؛ بەژێر دەستەیی‌و بەکوشتن‌و دیلی‌و کۆیلایەتی‌و گەلێ شتی تر، سزای قیامەتیشیان ئاگری دۆزەخە کە گەلێ بەئێش ترە، ئیتر ئەوکاتە یارمەتیدەریان نابێ‌و کەس لای خێریان لێ ناکاتەوە. ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ﴾ بەڵام ئەوانەی کە بڕوایان بە پەیامی عیسا کردووەو دانیان بە پێغەمبەرایەتی ئەودا ناوە. (یان ئەوانەی کە بڕوایان بەتۆ کردووە ئەی محمد! دانیان بە پێغەمبەرایەتی تۆدا ناوەو گەردنکەچی یاسای ئیسلام بوون) وێڕای ئەو بڕوا پتەوەیان کردەوەی چاکیش دەکەن‌و واز لە کرداری خراپ دەهێنن. ئەوانە خودا پاداشی تەواویان دەداتەوە. ﴿وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الظَّالِمِينَ﴾ خودا دۆستایەتی ئەوانە ناکا کە ستەمکارن‌و مافی خەڵکی زەوت دەکەن، یان شت لەشوێنی خۆی دانانێن، ئەوەی کە شیاوی پەرستنە نایپەرستن‌و، ئەوەی شیاوی خودایەتی نییە بەخودای دەزانن. بێگومان ئەمە هەڕەشەیە بۆ خوانەناسان‌و مزگێنی تێدایە بۆ ئەوانەی بڕوایان بەخوداو پێغەمبەران هەیە. ﴿ذَلِكَ﴾ ئەو هەواڵانەی بۆمان گێڕایەتەوە دەربارەی داستانی عیساو مەریەمی دایکی‌و دایکی مەریەم (خێزانی عیمران)، هەروەها سەرگوزەشتەی زەکەریاو یەحیای کوڕی‌و هەڵوێستی قوتابیەکانی عیساو هەڵس‌و کەوتی جولەکەکان لە ئاست عیساو پەیامەکەیدا، بەهۆی جوبرائیلەوە ﴿نَتْلُوهُ عَلَيْكَ مِنَ الآيَاتِ وَالذِّكْرِ الْحَكِيمِ﴾ بۆتی دەخوێنینەوە کە بەڵگەی بەهێزن‌و گەواهی راستی پێغەمبەرایەتی تۆن‌و بە سرووش بۆمان ناردووی ئەگینا نەخوێندەوارێکی وەکوو تۆ ئەگەر لەسایەی خواوە نەبێ کوا دەتوانی پەی بەم زانیارییانە بەری! بەڕاستی ئەم ئایەتە قورئانییانە عیبرەتن، کانی بەهرەو زانیاری لێ وەرگرتنن. بەڵگەی بەهێزن بۆ بۆڕدانی وەفدی نەجران کە هاتبوون لەبابەت عیساوە دەمەقاڵێت لەگەڵ بکەن.

## ڕەتدانەوەی ئەوانەی عیسا بەخوا دەزانن‌و موباهەلەو نەفرینکردن لەوانەی ئەم ڕایەیان هەیە

﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٦٠﴾ فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ ۚ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٢﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٣﴾ ﴾.

پاش ئەوەی لەمەوپێش باسی داستانی عیساو مەریەمی دایکی کرد، باسی پەیامەکەی‌و بڕواکردنی کۆمەڵێك پێی‌و پشت هەڵکردنی کۆمەڵێکی تر لێی، دێتە سەر باسی هەڵوێستی دەستەو تاقمێکی تر کە نە بە تەواوی ئیمانیان بەعیسا هێناوەو نەبێ بڕوایشن پێی، بەڵکوو ئەم تاقمەش لەبارەی عیساوە سەرگەردانن‌و ڕێگایان لێ تێك چووە، بە بۆچوونی خۆیان کە دەگوترێ (كلمة الله وروح منه) مانای وایە: خودا لەمەریەمدا تواوەتەوەو تێیدا حلوولی کردووە، یان (كلمة الله) هاتۆتە شێوەو ڕوخساری ئادەمیزادەوەو لەیەك کاتدا بووەتە ئادەمیزادو خودا، ئیتر پەروەردگار بۆچوونەکەیان ڕەت دەکاتەوە بەوە کە دروستکردنی ئادەم عەجایەبترە لە دروستکردنی عیسا! جا بۆ

پووچەڵ کردنەوەی رایەکەیان ئەوە روون دەکاتەوە کە دروستکردنی ئادەم لەقوڕ زۆر گرنگترە لە دروستکردنی عیسا بەبێ باوك، عیسا هەرچۆنێك بێت لە ئادەمیزادێك پەیدابووە، بەڵام ئادەم لە قوڕێکی بێ گیان!

راڤەکەرانی قورئان دەڵێن: وەفدی مەسیحی نەجران هاتنە خزمەت پێغەمبەرو عەرزیان کرد، ئەی موحەممەد! ئەوە تۆ بۆ جنێو بە پێغەمبەری ئێمە دەدەی کە عیسایە؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی کوا من چی خراپم دەربارەی ئەو گوتووە؟ وتیان: ئەی ئەوە نیە پێی دەڵێی عیسا بەندەی خوایە؟؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەڵێ ئەو بەندەی خودایە، رەوانەکراویەتی‌و بە وشەی (کن فیکن) پەیدا بووە، ئیتر رقیان هەڵساو تووڕە بوونو وتیان: کوا ئادەمیزادێك بەبێ باوك‌و دایك بووە؟ ئەگەر بووە پێمان بڵێ: ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوەو فەرمووی: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ﴾ چۆنیەتی روداوی دروستکردنی عیسا لەلای خودا کە بەبێ باوك دروست کراوە وەکوو چۆنیەتی روداوی دروست کردنی ئادەم وایە: بەڵکوو عەجایەب ترە چونکە ئادەم بەبێ باوك‌و دایك لە قوڕ دروستکراوە، هەردووکیان عیساو ئادەم یەك خودای کردگاری بەتوانا بەدی هێناون، جا ئەگەر دروستکردنی عیسا بەبێ باوك‌و ئادەم بەبێ باوك‌و دایك بۆ ئادەمیزادان جێگای سەرسوڕمان بێ‌و بەلایانەوە شتێکی گرنگ‌و گران بێ ئەوە بۆ خودا شتێکی ئاساییەو بۆ دەسەڵات‌و توانای زاتی بێچوونی کارێکی ئاسانە. کەواتە بۆچی ئادەم بەبێ باوك‌و دایك دروستکراوە بە کوڕی خودای نازانن کەچی عیسا بەبێ باوك لە دایك بووە بە خودا یان بە کوڕی خودای دەزانن؟؟ کەوابێ ئاسانی دروستکردنی عیسا لای خودا وەکوو دروستکردنی ئادەم وایە کە ﴿خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ﴾ پەروەردگار لە گڵێکی مردوو دروستی کردووە، ئەو گڵەی تێکەڵاو ئاو کردو بووبە قوڕێکی لینج‌و خەست‌و خۆشکراو، لەو قوڕە جەستەو شێوەو روخساری ئادەمی رێك‌و پێك کرد ﴿ثُمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ پاشان پێی فەرمووی ببە بە ئادەمی‌و روحی بەبەردا کردو بوو بە ئادەمیزادێکی ئاسایی.

ئەو وێنە هێنانەوەیە بە لەیەکچوونی ئەم دوو رووداوە بۆڕدانی بێ بڕوایانی تێدایە، چونکە ئینکاری کردنی دروستکردنی عیسا بەبێ باوكو ئیعتیرافکردن بە پەیدابوونی ئادەم بەبێ دایكو باب شتێکی سەیرەو عەقڵ نایسەلمێنێ! بۆ ئەوەیان نابێو ئەمەیان دەبێ. کەوابوو ئەو خودایەی ئادەمی بەبێ باوكو دایك دروستکرد؛ هەر ئەو خودایە دەتوانێ عیساش بەبێ باوك بخوڵقێنێ!! خۆ ئەگە ئیدیعای ئەوە کە عیسا کوڕی خودایە لەبەر ئەوەی باوکی نیە رەوابێ؛ ئەوە هەمان ئیدیعا بۆ ئادەم رەواترە! دەی خۆ تائێستا کەس نەی وتووە ئادەم خودایە یان کوڕی خودایە، کەوابێ بۆ عیساش هەر نابێ ئەوە بگوترێ!!

بێگومان پەروەردگار ویستوویەتی تواناو دەسەڵاتی خۆی بۆ ئادەمیزاد دەربخا: ئادەمی بەبێ نێرو مێ دروستکردووە، حەوای لە نێر دروستکردووە بەبێ هەبوونی مێینە، عیسای لە مەریەم دروست کردووە بەبێ هەبوونی نێر، باقی ئادەمیزادانی تری لە نێرو مێ خوڵقاندووە!!.

ئەمجار جارێکی تر راستی رووداوەکەی عیساو مەریەمی دایکی دووپات کردەوەو فەرمووی: ﴿الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ ئەوەی پێمان راگەیاندی دەربارەی عیساو مەریەمی کچی عیمرانو چۆنیەتی داستانەکەیان هەر ئەوە راستەو رووداوەکە بەو شێوە بووە؛ عیسا بەندەو رەوانەکراوی خودایەو بەفەرمانی خودا بە وشەی ﴿كُن فَيَكُونُ﴾ لە سکی دایکیا خوڵقاوە!! نەك وەکوو مەسیحییەکان دەڵێن: عیسا خودایە یان کوڕی خودایە، هەروەها وەکوو جولەکەش نا کە دەڵێن: مەریەم لەگەڵ یوسفی نەجاڕدا دەستی تێکەڵاو کردووەو پێیان وایە: - خوانەخواستە – عیسا زۆڵە.... پەنا بە خوا لە بوختانی وا، خوا پەنامان بدا!!!

﴿فَلاَ تَكُن مِّن الْمُمْتَرِينَ﴾ بەهیچ جۆرێك تۆ دەربارەی عیساو دایکی مەکەوەرە گومانەوە، گوێ بۆ نیگاو سرووشی ئێمە بگرە.

دڵنیابە چۆنت سرووش بۆ کراوە رووداوەکە بەو شێوەیە! تۆ ئەی موحەممەد! لەسەر بڕوای پتەوی خۆت بەردەوام بەو دڵئارام بە، خۆت لە گومان دوور بخەرەوە!

ڕووتێکردنی ئەم نەهی لێکردنە جەخت ئامێزە – کە ناگونجێ پێغەمبەر گومانی هەبێ – دوو جار سوود بەخشە:

ا- زیاد بوونی حەزو ئارەزۆی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر بڕوا پتەوی‌و دڵئارامی.

ب- خەڵکی تر کە ئەم خیطابە توندو تیژە دەبیستن کەبەرەو ڕووی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کراوەتەوە، ئیتر شك‌و گومان لە دڵی خۆیان دەردەهاون، چونکە دەڵێن: لەکاتێکا ئاوا لەگەڵ پێغەمبەردا خیطاب بکرێ، دەبێ لەگەڵ ئێمەماناندا چۆن بێ؟؟ ﴿فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ﴾ ئەمجار هەر کەسێك دەربارەی عیسا دەمەقاڵێ‌و موجادەلەی لەگەڵ کردی ﴿مِن بَعْدِ مَا جَاءكَ مِنَ الْعِلْمِ﴾ دوای ئەوەی زانیاری ڕاست‌و دروستت بۆ هات ﴿فَقُلْ تَعَالَوْاْ نَدْعُ أَبْنَاءنَا وَأَبْنَاءكُمْ وَنِسَاءنَا وَنِسَاءكُمْ وَأَنفُسَنَا وأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: وەرن! هەریەکەمان بانگی کوڕو نەوەی خۆمان بکەین، هەرکەسە ئافرەتی خۆی بانگ بکا، خودی خۆمان‌و ئێوەش، ئامادەبن، بۆ پاڕانەوەو دوعا کردن، موباهەلە بکەین (موباهەلە بریتییە لەوە دوو لایەن یا زیاتر کۆببنەوە دوعا لەیەکتری بکەن، داوای لەعنەت‌و نەفرینی خودا بکەن بۆ ئەو کەسەی کە درۆزن‌و خەتابارو ستەمکارە، بەبێ ئەوەی دەستنیشانی بکەن) ﴿فَنَجْعَل لَّعْنَةَ اللّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ﴾ نەفرین‌و لەعنەتی خودا لەو کەسە بکەین کە درۆزنەو ڕاستی چەواشە دەکا...!!

زۆر حەدیث هەن ئەوە دەچەسپێنن کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) داوای لە نەصرانییەکانی نەجران کرد بێن موباهەلەی لەگەڵدا بکەن، بەڵام ئەوان ئامادەییان تێدا نەبوو، بوخاری‌و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە کە (العاقب) سەرۆکی نەصرانییەکانی نەجران کە ناوی (عبدالمیسح) بوو (السید) کە زاناو قەشەیان بوو، هاتنە خزمەت پێغەمبەرو ویستی موباهەلەیان لەگەڵدا بکا، یەکیان بە ئەوی تریانی گوت: موباهەلەی لەگەڵدا مەکە! سوێند بە خوا ئەگەر ڕاست بکاو پێغەمبەر بێ

موباهەلـەی لەگەڵـدا بکـەین هـەرگیز کامـەرانی بـە خۆمانـەوە نـابینین‌و کـەسمان لێ پاشـەکەوت نابـێ! ئـیتر وتیـان موباهەلـەت لەگەڵـدا ناکـەین، چـیت دەوێ دەتـدەینێ، پیاوێکی بڕاوپێکراوی خۆتمان لەگەڵ بنێرە، ئەویش فەرمووی هەستە ئەبو عوبەیدە لەگەڵیان بچۆ! کە ئـەبو عوبەیـدە راست بـووەوە فـەرمووی ئـەم زاتـە ئـەمینی گـەل‌و ئەتەوەیە.

ئەوەی لە ئایەتەکەدا وەردەگیرێ ئەوەیە: پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرمانی پێکراوە کە بـانگی دەمـەقاڵێ‌و جـەدەل چیەکان بکـا، بـۆ کۆبوونـەوە بـە ژن‌و پیـاوەوە دەربـارەی چـۆنیەتی داسـتانی عیـسا موباهەلـە بکـەن، بـۆ خۆشـی موسـوڵمانان کۆبکاتەوە بە ژن‌و پیاو کوڕو کچەوە بۆ موباهەلە کردن‌و دوعا کردن لەیەکتری ئەمجار نـەفرین بکـەن لـەو کەسـەی کـە درۆزنـەو دەربـارەی عیـسا شـتی نـاڕەوا دەڵـێ: ئـەم داواکردن‌و جەخت لەسەر کردنە بەڵگەی ئەوەیە کە داواکار (کە پێغەمبـەرە) زۆر لـە خۆ رادیوەو بڕوای پتەوی بە خـۆی‌و راسـتی بەرنامەکـەی هەیـە، هـەروەکوو چۆن مـل نەدانی وەفدی نەجران‌و خەڵکی تریش بۆ موباهەلەکردن، بەڵگەیە لەسـەر ترسـنۆکی‌و بێ بنجۆبناوانی بەرنامەکەیان‌و، ئەوە دەگەیەنێ کە بڕوایان بەوە نیە کە دەیڵێن.

ئایەتەکە شتێکی تر ی گرنگی لێ وەردەگیرێ: ئـەویش ئەوەیـە: کـە داوا دەکـا بـۆ ئەو کۆبوونەوە مەصیریە گرنگە ئافرەتەکانیش بەشدار بن‌و هاوبەشی ئەو (موباهەلـە) ئایینیە بکەن. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئافرەت تەنانەت لە کاروباری ئاوا گشتیدا وەکوو پیاو وایە، جگـە لـە چـەند شـتێك نـەبێ کـە لەگـەڵ فـسیۆلۆجی ئـەودا ناگونجێ (وەکوو ئەوەی ناچێتە گۆڕەپانی جەنگەوە یان ناکرێتە دادوەر لە کاروبـاری جینائیـدا) ئەگینا لە شتی تردا، شان بەشانی پیـاو، ئـەرکی سەرشـانی خـۆی ئـەنجام دەدا، لـە کـاتی شەڕو پێکداداندا هەرچەنـدە ناچێتە گۆڕەپانی جەنگەکە بەڵام لـەبواری خزمـەتکردنی نەخۆش‌و دەرمانکردنی جەنگاوەرانی برینـدارو ئامـادەکردنی کـەل‌و پـەل بۆیـان رۆڵـی خۆی دەبینێ!

دەی ئەمە لە کوێ‌و وەزعی ئافرەتانی موسوڵمانی ئەمڕۆ لەکوێ؟ کە لە بەر تێنەگەیشتن لەکاروباری ئایینی خۆیان‌و هاوبەشی نەکردنیان لەگەڵ پیاواندا لە کاروباری دونیایی‌و کۆمەڵایەتیدا بە تەواوی لە گۆڕپانی ژیانی سیاسی‌و کۆمەڵایەتیدا وەدەر نراون؛ ئافرەتی خێزانە دەوڵەمەندەکان لە شارو شارۆچکەکاندا هیچ مەبەست‌و هیواو ئاواتێکیان نیە جگە لە خۆ رازاندنەوەو خۆجوانکردن‌و رازاندنەوەی مێزو سفرەو خوان!!!

ئافرەتی هەژاریش لەلادێ‌و شارۆچکەکاندا بۆ خزمەتی ناو ماڵ‌و کشتوکاڵ‌و بەخێوکردنی ئاژەڵ بەکاردەهێنرێ! هەر دەڵێی بۆکاری ئاژەڵ ئاسایی دروستکراوە، لەبەر ئەم حاڵەتە ئافرەت خۆی لەکن خۆی بێ نرخ بووەو پەروەردەو پێگەیاندنی لاواز بووە، دەڵێی مریشکە بەکرە لە ماڵداو ئاژەڵی بێ خاوەنە لە بیاباندا، زرە موسوڵمان‌و وشکە صۆفی‌و کۆلکە خوێندەوارکانمان ئەم دیاردە نەشازەیان بەلاوە پەسەندەو وای لە خەڵکی دەگەیەنن کە ئەوە هەڵوێستی ئیسلامە بەرامبەر ئافرەت!!

بەڵێ بەخێوکردن‌و پەروەردەکردنی کوڕو کچ بەو شێوە نائیسلامییە جەمسەری خێزان‌و کۆمەڵی تێکداوە، فەسادو مۆرانەی ئەم حاڵەتە فەسادییە پەرەی سەند لە تاکتاکەی کۆمەڵەوە گواستیەوە بۆ هۆزو عەشیرەت‌و هەموو گەلانی سەر زەوی گرتەوە.

لەم ساڵانەی دوایی دا بەتایبەتی لە دوای چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمداو تەنانەت ئێستاش کۆمەڵێك هۆشمەندو رۆشنبیر لە زۆر وڵاتە ئیسلامییەکاندا داوای رزگارکردنی ئافرەت دەکەن‌و بە خەیاڵی خۆیان هەوڵ دەدەن لەو حاڵەتە نائاساییەدا چیدی نەمێنێتەوە، دەیانەوێ وای لێ بکەن هاوبەشی پیاو بکاو، شان بەشانی ئەو لە زانیاری‌و وێژەو کاروباری ژیاندا ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام بدا، ئەم بانگەشەیە لە گوێچکەی زۆربەی موسوڵماناندا جێگای خۆی کردووەو رێگای چوونە قوتابخانەیان بۆ ئافرەت بەرەلا کردوە، موسوڵمان هەوڵ دەدەن کچیان (وەکوو کوڕیان) خوێندەوار بێ‌و بڕوانامەی بالا بێنێ، بەلام لە کاتێکا کە خوێندن‌و رۆشنبیری بۆ ئافرەت شتێکی پەسەندەو کارێکی پیرۆزە، پێویستە پەروەردە کردن‌و پێ خوێندنی ئافرەت لە

چوارچێوەی ئاییندا بێ‌و هەوێنی ئەم خوێندەواری‌و ڕۆشنبیرییە ئەخلاق‌و ڕەوشتی ئیسلامیی بێ‌و، داب‌و نەریتی ئیسلامییان لە دڵ‌و دەروونـدا بڕوێندرێ؛ ئەگینا خوێندەوارییەکەی سوود بەخش نابێ!.

﴿إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْقَصَصُ الْحَقُّ﴾ ئەم چیرۆکەی بۆمان گێڕایەتەوە دەربارەی عیسا هەر ئەوە ڕاستەو واقیعە، نەك ئەوەی مەسیحییەکان بانگەشەی بۆ دەکەن‌و دەڵێن: عیسا خودایە یان کوڕی خودایە، یان ئەوەی جولەکە ئیدیعای دەکەن کە دەڵێن: عیسا لە ئاکامی داوێنپیسی مەریەم‌و یوسفی نەجاردا پەیدا بووە!!

﴿وَمَا مِنْ إِلَهٍ إِلاَّ اللَّهُ﴾ هیچ خودای حەق‌و ڕاست‌و شیاوی پەرستن نین جگە لە خودای تاك‌و تەنیا! ئەمەش ڕەتدانەوەیەکی ترە بۆ فەلەکان کە دەڵێن: خودا سێیەمی خوداکانە، ﴿وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ هیچ خودای بەحەق نین، جگە لە خودای تاك‌و تەنیا کە بێگومان ئەو خودایە خاوەنی تواناو دەسەڵاتێکی وایە کەس نایوێرێتێ، دانایەکی وەهایە هەموو شتێك لە شوێنی خۆی دادەنێ. ﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ﴾ جا ئەگەر ئەو خودانەناسانە دوای ئەم ئامۆژگاری‌و بەڵگە هێنانەوەو نیشانە دەرخستنە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی تۆ، هەر پشتیان هەڵکردو شوێنت نەکەوتن‌و تەصدیقیان نەکردی‌و یەکتاپەرستییان ئەنجام نەداو ئامادەش نەبوون بۆ موباهەلە ئەوە دیارە گێرە شێوێن‌و ئاژاوەگێڕن، دڵنیابە بەسەریانەوە ناچێ چونکە ﴿فَإِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِالْمُفْسِدِينَ﴾ بێگومان خودا زاناو ئاگادارە بە گێرەشێوێنی‌و خراپەکاری خراپەکاران‌و سزای تەواویان دەداتەوە، هەرکەسێکیش لە حەق لابداو ڕووبکاتە بەتاڵ، ئەوە موفسیدو ئاژاوەگێڕە، خوداش بەتواناو دەسەڵاتە، هیچی لەژێر دەست دەرناچێ!!

## بانگەوازیی بۆ یەکتاپەرستیی و خوداپەرستیی لەسەر شێوەی ئایینی ئیبراهیم (علیه السلام)

﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ ٱشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوْرَىٰةُ وَٱلْإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٥﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ حَٰجَجْتُمْ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِىُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ۗ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾.

لەوەپێش قورئان هەموو ئیدیعای مەسیحییەکانی دەربارەی خودایەتی عیسا، ڕەتکردەوە، ئەمجار لەم ئایەتەی دوایی دا بانگی جولەکەو فەلەکان دەکا بۆ ئەوە پابەندی بنەماو پوختەی ئایین ببن، پابەندی ئەو بنەمایانە بن کە هەموو پێغەمبەرێك بانگەوازی بۆ کردووە: کە بریتین لە یەکتاپەرستیو شوێنکەوتنی حەزرەتی ئیبراهیم (باوکی پێغەمبەران) چونکە ئایینی ئەو دەق ئایینی ئیسلام بووە، بۆخۆشی نە جولەکە بووە نە مەسیحی!.

ئیبنو ئیسحاقو ئیبنو جەریر لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: مەسیحی نەجرانو مالەکانی جولەکە لەلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کۆبوونەوەو لێیان بوو بە دەمەقالێو کێشمە کێشم، مالەکان گوتیان: ئیبراهیم جولەکە بووەو جگە لە ئایینی جولەکە پەیڕەوی هیچ ئایینێکی تری نەکردووە!! مەسیحیەکانیش دەیانگوت: نەخەیر ئیبراهیم بەس مەسیحی بووە! ئیتر ئەم ئایەتانە هاتنە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾ ئەی محمد! بە کۆمەلی جولەکەو فەلە بلێ: هەمووتان وەرنو ئامادەبن با بەیەکەوە لەسەر بەرنامەیەکی مام ناوەندیو دادوەرانە کۆببینەوە، ئەو بەرنامەیەی کاکلەو پوختەی بەرنامەی هەموو پێغەمبەرانەو کتێبە ئاسمانییەکان لەسەری کۆکن، صوحوفو تەوراتو ئینجیلو زەبوورو قورئان لەسەری کۆکنو فەرمانیان پێ کردووەو داوای جێبەجێ کردنیان کردووە.

ئەمجار ئەو بەرنامەیە ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا﴾ وەرن با هەموومان جگە لەبۆ خودا بۆ کەسی تر گەردنکەچ نەبین، تەنها بۆ ئەو خوضووعو ملکەچی بنوێنین، بڕوامان وابێ کە دەسەلاتی ڕەهاو مافی یاسادانان هەر بەدەست ئەوە، هەر ئەو شیاوی ئەوەیە کە حەلالو حەرام دیاری بکا! وێڕای ئەم بڕوایەشمان کەس نەکەین بە هاوەلو هاوبەشی، کەس نەخەینە پلەی خودایەتیەوەو بیپەرستین. زیاد لەوەش ﴿وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ﴾ هەندێکمان هەندێکی ترمان بە خودا نەزانێو پێی وانەبێ کە جگە لە خودا بەخێوکەرو

هەڵسوڕێنەری تر هەن! ئەم ئایەتە بە تەواوی یەك خودایی (وحدة الألوهیة) یەکتاپەرستیو بەخێوکردنو کردگاریو پەروەردگاریەتی (وحدة الربوبیة) روون دەکاتەوە، بەراستی دەبێ ئایین وابێ؛ دەبێ پێغەمبەر وابێ.

ئەمجار بانگەوازی ئەوە دەکا کە هەموو ئادەمیزاد بەندەی خودانو لە پلەی بەندایەتیدا هەموویان یەکسانو هیچیان شیاوی ئەوە نین ببن بە خودا بەسەر ئەوانی تردا، ئەم یەکتاپەرستیە هەموو ئایینەکان لەسەری کۆکنو بانگەوازییان بۆ کردووە، پەیامی هەموو پێغەمبەران بووە؛ پەیامی ئیبراهیمو مووساو عیساو پێغەمبەرانی تریش بووە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ – الأنبياء/٢٥﴾ واتە: لەپێش تۆدا هیچ رەوانەکراوێکی خۆمان نەناردووە ئیللا نیگامان بۆ کردووە کە هیچ خودا نین جگە لە منو هەر من بپەرستن. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ – النحل/٣٦﴾.

بێگومان لە ناو هەموو گەلو نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان لە خۆیان ناردووەو، نیگامان بۆ کردووە کە تەنها عیبادەتی خودا بکەنو خۆتان لە پەرستنی ملهوڕو خودانەناسو ناخوا بپارێزن.

بەڵێ: بانگەوازییەکی بە ویژدانانەیە، بانگەوازییەکە هەموو ئادەمیزادان دەخاتە یەك ئاستی بەندایەتی، بەبێ ئەوەی جیاوازیی لە نێوان پێغەمبەرو یەکی تر هەبێ!

بەکورتی پێیان بڵێ: منو ئێوە بڕوامان وایە کە بوونەوەر دروستکراوی خودایەکی تاكو تەنیایە، هەر ئەو خودایە بەدیهێنەرو هەڵسوڕێنەریەتی! هەر ئەو پێغەمبەرانی ناردوون بۆسەر ئادەمیزاد تا پێیان رابگەیەنن چی خوداویستەو چی جێگای رەزامەندیی ئەوە، دەی هەمووتان وەرن یەك بگرینو ئەو ئەصڵو بنەمایانە ئەنجام بدەینو شوبوهات رەت بکەینەوە؛ ئەگەر لە ئاینی مەسیحیدا شتێك هەبوو بە ڕواڵەت ئەوەی دەگەیاند کە عیسا کوڕی خودایە پێویستە ماناکەی وا ئاڕاستە بکەین کە لەگەڵ ئەصڵی یەکتاپەرستیدا دژ نەوەستێ! چونکە ئێمە هەرگیز بڕواناکەین عیسا

شتێکی گوتبێ کە ماناکەی وابێ بۆخۆی خودایەو دەپەرسترێ، قەد بانگەوازی ئەوەی نەکردووە کە خۆی یان دایکی پەرستشیان بۆ بکرێ، بەڵکوو بانگەوازی ئەوەی کردووە کە تەنها خودا بپەرسترێو هەر ئەو بە پەروەردگار بزانرێو بناسرێ، جولەکە یەکتاپەرست بوون؛ بەڵام سەرچاوەی بەدبەختیان لەوەوە پەیدا بوو کە شوێن پیاوە ئاینیەکانیان کەوتن، ماڵەکانیان دەسکاری تەوراتیان کردو حوکمەکانیان گۆڕینو بە ئارەزوی خۆیان فتوایان بۆ دەدانو ئەوانیش ئەو فتوایەیان بردنە ریزی حوکمی خودایی‌و کوێرانە پەیڕەویان کردن!

(مەسیحی)یش پەیڕەوی ئەم ڕێبازەیان کردو مەسەلەی (چەك) پسووڵەی لێخۆشبوونو گوناه داپۆشینیان پەرە پێدا، کە زۆر کاریگەر بوو لە کۆمەڵگای مەسیحیداو، کار گەیشتە ئەوە کە کەنیسە زۆربەی ماڵو دارایی خەڵکی لەم سۆنگەیەوە قووت بداو داگیری بکا، بە جۆرێك وای لێهات ئیشی کەنیسە بریتی بوو لە خەڵك رووتاندنەوە! سەرنجام کۆمەڵێك بەناوی ئیصلاحی ئەو دیاردە نالەبارە سەری هەڵدا ئەویش گرۆهی (پرۆتستانت) بوون ئەمانە بانگەوازییەکەیان بریتی بوو لەوە بە هیچ جۆرێ گوێ لە فتواو بۆچوونی ئەو پیاوە ئاینییانە نەگیرێ کە دینیان کردۆتە پسووڵەی فرۆشتنو کاری وا دەکەن لەگەڵ بنەمای ئایندا یەك ناگرنەوە، ئەم کۆمەڵە ئیسلاح خواهە بانگەوازی ئەوەیان دەکرد کە ئایین تەنها لە کتێبی پیرۆزەوە وەربگیرێو وتەی ئەمو ئەو نەکرێ بە ئایین؛ بەئاشکرا دژی ئەوە وەستان کە عیسا بە خودا یان بە کوڕی خودا بزانرێ!

عەدی کوڕی حاتەم دەگێڕێتەوە دەڵێ هاتمە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) (صەلیب)ێکی ئاڵتوونم لە ملدا بوو، پێغەمبەر پێی فەرمووم: ئەی عەدی ئەو بتە لە ملت دابکەنەو فڕێی بدە! گوێشم لێ بوو لە سوورەتی (التوبة) ئەمەی دەخوێندەوە ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَهًا وَاحِدًا لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾.

ئیتر عەرزیم کرد وتم: ئەی رەوانەکراوی خودا خۆ جولەکەو مەسیحی مالەو قەشەکانیان نەدەپەرستن!؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی ئەوە نەبوو شتیان بۆ حەلاڵو حەرام دەکردنو رەشە خەڵکەکەش بە قسەیان دەکردن؟؟ (عەدی)ش دەڵێ بەڵێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دە ئەوە عیبادەت بۆ کردنە)

﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ﴾ ئەگەر روویان لەم بانگەوازییە وەرگێڕاو پشتیان هەڵکردو هەر ویستیان لەسەر هەڵوێستی نادروستی خۆیان بەردەوام بنو عیبادەتی غەیری خودا بکەن، هاوەڵو ناوەندی بۆ بەرەوا بزاننو حەلاڵو حەرام دیاریی بکەن ﴿فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ ئەوە پێیان بڵێن: دە ئێوە بە شایەد بن، ئێمە جگە لە خودا کەسی تر ناپەرستین، گەردنکەچی هەر بۆ ئەو دەکەین، بۆ وەدەسهێنانی سوودو لابردنی زیان پەنا بۆ هیچ کەسی تر نابەین، جگە لە خودا داوا لە کەسی تر ناکەین، هەرشتێك خودا حەلاڵی نەکا بە حەلاڵی نازانین، هەرشتێك ئەو بە حەرامی دانا بەلامانەوە حەرامە..!

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە نامەی بۆ پادشاو فەرمانڕەوایانی ئەو سەردەمە دەنووسین ئەم ئایەتەی دەکردە هەوێنی نامەکانی، لە نامەکانیدا بۆ کیسرا (پادشای فارس)و هیرقەل (قەیسەری رۆم)و نەجاشیو موقەوقیسو هی تریش ئەم ئایەتەی دەنووسی!

ئیبنو ئیسحاقو ئیبنو جەریر لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان رازیی بێت) دەڵێ: مەسیحی نەجرانو مالەکانی جولەکە لای پێغەمبەر کۆبوونەوەو لێیان بووە دەمەقاڵێ،، مالەکان گوتیان: ئیبراهیم تەنها جولەکە بووە، نەصرانییەکان گوتیان: ئیبراهیم بەس مەسیحی بووە، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێو فەرمووی: ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِي إِبْرَاهِيمَ﴾ ئەی گرۆهانی جولەکەو فەلە! بۆچی دەربارەی ئیبراهیم (علیه السلام) کەوتوونەتە موجادەلەو دەمەقاڵێیەوە هەریەکەتان ئیدیعای ئەوە دەکا کە ئیبراهیم لەسەر ئایینی ئەو بووە (بێگومان ئیبراهیم (علیه

الـسـلام) لـەلای جولەکـەو فەلـە جێگـای رێـزو پلـەو پایـەو مـەقام بـوو، چـونکە لـە کتێبەکانیاندا زۆرجار باسی پلەو پایەی ئەم پێغەمبەرە رێزدارە کرابوو، لەهەمان کاتدا لەلای قورەیشییەکانیش خاوەن رێز حورمەت بوو،، ئەوانیش ئیـدیعای ئـەوەیان دەکـرد کە خۆیان لەسەر ئایینی ئەو پێغەمبەرە رێزدارەن).

ئەی کۆمەڵی جولەکە! ئێـوە چۆن ئیـدیعای ئـەوە دەکـەن کـە ئیـبراهیم جولەکـە بووە،، خۆ سەردەمی ئەو زۆر پێش سەردەمی هاتنەخوارەوەی تـەورات بـۆ سـەر مووسـا بووە! ئەی گرۆهانی فەلە! ئەدی ئێوە چۆن ئیدیعای ئـەوە دەکـەن کـە ئیـبراهیم لەسـەر ئایینی مەسیحی بووە؟؟ خـۆ ئـایینی مەسـیحی زۆر پـاش ئیـبراهیم پەیـدا بـووە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أُنزِلَتِ التَّورَاةُ وَالإنجِيلُ إِلاَّ مِن بَعْدِهِ أَفَلاَ تَعْقِلُـونَ﴾ ئـەو کاتـەی ئیـبراهیم پێغەمبـەر بـووە نـە مووسـا هـەبووەو نـە تـەوراتی بـۆ نێـردراوە، هـەروەها نـە عیـسا هـەبووەو نـە ئینجیلـی بـۆ رەوانـەکراوە، بـەڵکوو ئـەو پێغەمبەرانـە دوای ئیـبراهیم هاتوونەتە گۆرەپانی ژیانەوەو نامەی ئاسمانییان بۆ رەوانەکراوە ﴿أَفَلاَ تَعْقِلُـونَ﴾ ئـەرێ بۆچـی هـۆش ناکەنـەوەو عـاقڵ نـابن؟ بۆچـی رەوتـی مێـژوو دەگـۆڕنو رووداوەکـانی هەڵەوگێڕ دەکەن؟.

لە نێوان ئیبراهیمو مووسادا حەوت سەد ساڵ ماوە هەیە!!

لە نێوان مووساو عیسادا هەزار ساڵ ماوە هەیە، دەی گوایە ئێوە عـەقڵتان بـەوە ناشکێ کە پێشینە ناگونجێ شوێن پاشینە بکـەوێ!! نـازانن کـە ئـەم داوایـەتان بـۆ سـەر ناچێو بۆڕ دەدرێن؟

﴿هَاأَنتُمْ هَؤُلاء حَاجَجْتُمْ فِيمَا لَكُم بِهِ عِلـمٌ﴾ ئاگـاداربنو بـزانن! ئێـوە ئەوانـەن کە دەمەقاڵێتان دەکرد لە شتێکدا کە برێ زانیاریتان تێیدا هەبوو کە رووداوی عیـسا بـوو، جا هەندێکتان پێتان لێ هەڵبڕیو عیساتان بە خودا زانی، هەندێکیشتان بەلایەکی تـردا پێتـان لێ هـەڵبڕیو وتتـان: زۆڵـەو درۆزنـە، ئەمـە لای خۆتـان زانیاریتـان هـەبووەو لـە تەوراتو ئینجیلدا باس کراوە کەچی زانیارییەکەتان لـەو هەڵـە گەورەیـە نەیپاراسـتو جەهلو نەفامیتان دەرکەوت: دەی ئێوە کە ئەمە حاڵتانە ﴿فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُـم

بِهِ عِلْمٌ﴾ چۆن دێن دەمەقاڵێ‌و کێشە دەکەن‌و دەربارەی ئیبراهیم دەکەونە موجادەلەوە دەڵێن: جولەکە بووە یان مەسیحی بووە، لەکاتێکا هیچ زانیاریتان دەربارەی نیە، هیچ شتێك دەربارەی ئەوە کە جوو بووە یان مەسیحی بووە لە ئایین‌و کتێبی ئێوەدا نیە، ئەی چۆن‌و لەکوێوە زانیتان ئیبراهیم جولەکەیە یان مەسیحیە ﴿وَاللّـهُ يَعْلَـمُ﴾ خودا دەزانێ کە ئیبراهیم لەسەر ئایینی هیچ لایەکتان نەبووە ﴿وَأَنـتُمْ لاَ تَعْلَمُـونَ﴾ ئێوە نازانن کە ئیبراهیم چ بیروباوەڕێکی پاك‌و خاوێنی هەبووە، ئێوە تەنها شتێك دەزانن کە بینیوتانە یا بیستووتانە، نە بەبیستن‌و نە بە دیتن هیچ شتێکتان لەو بارەوە بۆ دەستەبەر نەبووە. هەرچی دەیڵێن لەو بارەوە هەر ڕەمڵ لێدانەو وڕێنەیە، هیچ ئەصڵ‌و بنەمایەکی نیە.

ئەمجار دەربارەی ئیبراهیم زانیاری ڕاست دەخاتە ڕوو دەفەرموێ: ﴿مَـا كَـانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلاَ نَصْرَانِيًّا وَلَكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنْ الْمُـشْرِكِينَ﴾ ئیبراهیم نە جولەکە بووەو نە مەسیحی بووە، بەڵکوو باوەڕ پاکێکی موسوڵمان بوو، دوور بوو لە هاوەڵ پەیدا کردن بۆ خوداو بتپەرستی، موسوڵمانێکی گەردنکەچ بوو بۆ خوداو فەرمانبەرداری فەرمانەکانی بوو، خۆی لەو شتان دەپاراست کە خودا لێی قەدەغە کردبوو... ئەوانەی ئیدیعای ئەوە دەکەن کە ئیبراهیم لەسەر ئایینی ئەوان بووە؛ وەکوو جولەکەو فەلەو قورەیشییەکان هەریەکەیان دەڵێن‌و پێیان وایە: ئیبراهیم لەسەر ئایینی ئەوانە! هەموویان درۆ دەکەن‌و بەهەڵەچوون! بەڵکوو گرۆهی ئایینی ئەو، ئەوگرۆهانەن کە لەسەر ڕێبازو شەریعەتی ئەو بوون‌و پەیڕەوی بەرنامەی ئەو زاتە دەکەن ئەوانیش تەنها موسوڵمانانن‌و بەس، هەر ئەوان ڕاست دەکەن کە دەڵێن: لەسەر ئایینی (ئیبراهیم)ین.

ئەمجار پەروەردگار ئەم ڕاستییە دووپات دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَوْلَى النَّـاسِ بِإِبْرَاهِيمَ لَلَّذِينَ اتَّبَعُوهُ وَهَذَا النَّبِيُّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ﴾ بێگومان شیاوترین کەس بە ئیبراهیم‌و نزیکترین گرۆه بۆی ئەو تاقم‌و کۆمەڵەن کە لەسەردەمی خۆیدا پەیڕەوی ڕێبازی

ئـەویان کـردووە، ڕەفتارچـاكو موسـوڵمان بـوون، خودایـان بـە تـاكو تـەنها ناسـیوەو هاوەڵیـان بـۆ پەیـدا نـەکردووەو خاڵـصانە خوداپەرسـتییان کـردووە، هـەروەها ئـەم پێغەمبەرە کە ناوی (محمد)ە ئەوانەی ئیمانیان پێ هێناوە، هەر ئەوانە یەکتاپەرستن‌و بە خاڵصی خوداپەرستی دەکەن، کەس ناکەن بە هاوەڵی خودا، ئەوەش پوختەی ئایینی ئیسلامەو مەبەست لە ئیمانی ساغ ئەوەیە، ﴿وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُـؤْمِنِينَ﴾ خـودا یارمەتیـدەری موسـوڵمانانەو پاڵپـشتیان دەکـاو کاروباریـان بـۆ دەسـازێنێ‌و سەرپەرشـتیان دەکـاو پاداشتیان دەداتەوە.

## هەوڵدانی بڕێ لە ئەهلی کیتاب بۆ گومڕاکردنی موسوڵمانان

﴿ وَدَّت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَوۡ يُضِلُّونَكُمۡ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴿٦٩﴾ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ ﴿٧٠﴾ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٧١﴾ وَقَالَت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَا تُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمۡ قُلۡ إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤۡتَىٰٓ أَحَدٞ

مِّثْلَ مَآ أُوتِيتُمْ أَوْ يُحَآجُّوكُمْ عِندَ رَبِّكُمْ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ﴾.

لە ئایەتی پێشوودا هەڵوێستی جولەکەو گاورەکانی دیاریی کرد کە بریتی بوو لە پشت هەڵکردنیان لە حەق‌و راستی! لەم ئایەتەی دوایی دا هەڵوێستێکی تریان دەخاتە روو: کە بریتیە لە هەوڵدانیان بۆ گومڕایی کردنی موسوڵمانان.

دەڵێن: کاتێك جولەکە بانگەوازی حوزەیفەو عەممارو مەعازیان کرد بۆ ئەوەی لە ئیسلام پەشیمان ببنەوەو بچنە سەر ئایینی ئەوان ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يُضِلُّونَكُمْ﴾ دەستەیەك لە گرۆی جولەکەو مەسیحی ئارەزۆیانە کە گومڕاتان بکەن، دڵتان لە موسوڵمانێتی کرمێ بکەن‌و بتانگێڕنەوە بۆ ئەو گومڕایی‌و سەر لێ شێواوییەی پێشووتان‌و هەمیشە هەوڵێ ئەوە دەدەن: کە شوبهەت‌و کۆسپ لە ناو دڵ‌و دەروونتاندا بڕوێنن، بەڵام ئەوانە خەیاڵیان خاوەو هەوڵدانەکەیان بێهوودەیە. ﴿وَمَا يُضِلُّونَ إِلاَّ أَنفُسَهُمْ﴾ ئەوانە بەس سەر لەخۆیان دەشێوێنن؛ کە خۆهەڵەوگێڕی گومڕاکردنی ئێوە دەکەن، خۆیان تووشی سەرلێ شێواویی دەکەن، چونکە خۆیان مەشغوولی کارێك دەکەن کە سوودی لێ نابینن، بەڵکوو زیانیان پێ دەگەیەنێ‌و دەیانخاتە زەلکاوی تاوان‌و گوناهەوە، بەڵام ئەوان بەخۆیان نازانن‌و ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ هەست بەئاکامی خراپەکاری خۆیان ناکەن، چاوی خۆیان لەعاست راستی دەنوقێنن، لە پەیامی پێغەمبەر ورد نابنەوە، ئەوان گاڵتە بە عەقڵ‌و هۆشی خۆیان دەکەن سروشتی خۆیان بە ئارەزۆ تێك دەدەن. هەست بە بەدبەختی خۆیان ناکەن‌و ئەوە نازانن کە بە دەستی خۆیان عەقڵی خۆیان لەکار خستووە، لەو بەڵگانە ورد نەبوونەتەوە کە خودا داویەتی بە پێغەمبەری خۆی،

سەیری نووری حەق‌و راستییان نەکردووە، ئاشکراشە کەسێك هەست بە بەدبەختی‌و چارەڕەشی خۆی نەکا ئەوپەڕی نەزانی‌و نەفامیەتی.

﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ﴾ ئەی گرۆهی جولەکەو مەسیحی! ﴿لِمَ تَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللّهِ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ﴾ بۆچی‌و بە چ بەڵگەیەك ئێوە کافرن بەو بەڵگە ئاشکرایانەی کە نیشانەی پێغەمبەرایەتی (محمد)ن؟ لە کاتێکدا ئێوە بۆخۆتان شایەتی راستی پێغەمبەرایەتی (محمد) دەدەن لەم رووەوە کە لە تەرات‌و ئینجیلدا نیشانەکانی دیاری کراون‌و مزگێنی بە هاتنی دراوە.

﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ﴾ ئەی گرۆهی جولەکەو فەلە ﴿ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ﴾ بۆچی شت هەڵەوگێڕ دەکەن؟ بۆچی ئەو پەیامە حەقەی پێغەمبەران هێناویانەو لە کتێبەکانیاندا باسکراوە – وەکوو یەکتاپەرستی‌و مزگێنی دان بە هاتنی پێغەمبەرێك لەنەوەی ئیسماعیل کە یاساو شەریعەت‌و حیکمەت فێری ئادەمیزادان دەکا – ئادەمیزاد ئەم راستییە پاشگوێ دەخەن‌و بە پووچی حسێب دەکەن، کەچی ئەو ورێنەو قسە پڕو پووچانەی کە ماڵەکانتان هەڵی دەبەستن بە ئایینی لەقەڵەم دەدەن‌و پێتان وایە پەیڕەو کردنی پێویستەو دەڵێن: ئەمە لە خوداوە هاتووە. ﴿وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ﴾ پێغەمبەرێتی (محمد) دەشارنەوە لە کاتێکا راستی پێغەمبەرایەتی ئەو لە تەورات‌و ئینجیلدا نووسراوە، دەی بۆچی ئێوە ئەم راستییە ژێر لێو دەخەن‌و دەیشارنەوە؟؟ ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئێوە بۆخۆتان دەزانن کە هەڵوێستەکەتان هەڵەیەو بێ بنەمایە هەر لەرووی حەسوودی‌و سەرڕەقی‌و ملهوڕی ئەم کارە ئەنجام دەدەن. جا وەنەبێ هەر بەم هەڵوێستەیان کۆڵیان دابێ، بەڵکوو جۆرەها پیلان‌و فرت‌و فێڵیان دەهێنایە کایەوە، بەڵکوو بتوانن بەرگری لە بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام بکەن، ئەوەتا جۆرێکی تر لە فرت‌و فێڵەکانیان ئەوە بوو کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ﴾ کۆمەڵێك لە جولەکەکان لەناو خۆیاندا بەیەکتریان دەگوت: ﴿آمِنُواْ بِالَّذِيَ أُنزِلَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَجْهَ النَّهَارِ﴾ بەڕواڵەت ئیمان بەو قورئانە بیهێنن کە نێردراوە بۆ موسوڵمانەکان

لەسەرەتای رۆژدا، وەکوو ئەوە وایپیشان بدەن کە نوێژی بەیانی لەگەڵ موسوڵمانەکان بکەنو ﴿وَاكْفُرُواْ آخِرَهُ﴾ ئەمجار لە دەمەو ئێوارێدا پاشگەز ببنەوە، وا پیشان بدەن کە بۆتان دەرکەوتووە کە ئەو ئایینە ئاینێکی بەتاڵە بۆیە لێی پەشیمان بوونەوە ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ بەڵکوو ئەوانەی موسوڵمان بوون چاو لە ئێوە بکەنو پاشگەز ببنەوە! بەم جۆرە هەوڵ بدەن سەر لەتازە موسوڵمانانی هەرزەو نەزان تێك بدەنو دڵەڕاوێکیان تێدا بخولقێننو وایان لێ بکەن بڵێن: دیارە ئەمانە کە بەیانی موسوڵمان بوونو ئێوارە ژێوان بوونەوە، کەمو کوڕییان لە ئاینەکەدا بینیوە، بۆیان دەرکەوتووە کە ئەم ئایینە عەیبو نوقصانییەکی تێدایە، بۆیە سەرلە بەیانی موسوڵمان بوونو سەرلە ئێوارێ لێی پەشیمان بوونەوە! چونکە وێ ناچێ مرۆڤ بیروباوەڕێك قبووڵ بکاو پێی وابێ حەقو راستەو کەچی لێی پاشگەز ببێتەوە.

ئیبنو ئیسحاق لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی صەیفو عەدی کوڕی زەیدو حاریثی کوڕی عەوف: کە جولەکە بوون لەناو خۆیاندا بەیەکتریان دەگوت: وەرن با بەیانی زوو ئیمان بەو پەیامە بهێنین کە بۆ (محمد) هاتووەو موسوڵمان ببینو ئێوارە لێی پاشگەز بینەوە بۆ ئەوەی دڵی ئەوانەی موسوڵمان بوون تێك بدەینو ئەوانیش شوێن ئێمە بکەونو واز لە ئیسلام بێنن!

ئیبنو جەریر لە موجاهیدەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کۆمەڵێك جولەکە لەگەڵ پێغەمبەردا نوێژی بەیانییان کرد – واتە بەڕواڵەت سەرلە بەیانی موسوڵمان بووبوون – ئێوارە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، موسوڵمان بوونەکەیان فرتو فێڵ بوو، بۆ ئەوەیان بوو، وا پیشان بدەن کە ئەمانە بۆیان دەرکەوتووە: کە ئایینی ئیسلام بێ بنەماو پڕو پووچە، بۆیە دوای ئەوەی موسوڵمان بوون پەشیمان بوونەتەوە!! ئەمەش شتێکی سەیر نیە لەوانەوە کە پەنا بۆ ئەم جۆرە فرتو فێڵە بەرن، چونکە ئەوان دەزانن کە نیشانەی بیروباوەڕی حەق ئەوەیە کە مرۆڤ پابەندی بوو لێی پاشگەز نەبێتەوە. بۆیە کە هیرقەل دەربارەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پرسیاری لە ئەبو سوفیان

کرد، وتی: ئایا ئەوانەی دەچنە سەر ئایینەکەی دوایی لێی پاشگەز نابنەوە؟؟ ئەبو سوفیان وتی: نەخەیر.

بێگومان پەروەردگار پێغەمبەری لەم پیلانەی جوومکان ئاگادارکردو ئەم نهێنییەیانی پێ راگەیاندن بۆ ئەوەی فێڵەکەیان کار لە دڵو دەروونی هەندێ نوێ موسوڵمانی بڕوا زەعیف نەکا، هەروەها بۆ ئەوەی کە ئەم پیلانەیان لێ ئاشکرا بوو، ئیتر کۆڵ بدەنو، بیر لە داڕشتنی پیلانێکی تر نەکەنەوە!! هەروەها پێ زانینی ئەم پیلانە ببێتە موعجیزە بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چونکە ئەوە هەواڵێکی غەیبی بوو، پێ زانینی بوو بە نیشانەیەکی تری راستی پێغەمبەرایەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ).

جا جولەکەکان ئەم پیلانەیان دانا بەیەکتریشیان گوت: ﴿وَلاَ تُؤْمِنُواْ إِلاَّ لِمَن تَبِعَ دِينَكُمْ﴾ ئەم جۆرە ئیمانهێنانە رواڵەتییە مەهێنن مەگەر بۆ پەشیمان کردنەوەی ئەوانەی لەوە پێش لەسەر ئایینی ئێمە بوونو موسوڵمان بوون، واتە مەبەستەکەمان پەشیمان کردنەوەی ئەوان بێ، چونکە ئەو جولەکانەی لەوە پێش موسوڵمان بووبوون، زۆر بە موسوڵمان بوونەکەیان دڵخۆش بوونو سوور بوون لەمانەوەیان بە موسوڵمانی، جولەکەکانی تریش زۆریان پێ ناخۆش بوو، موسوڵمان بوونەکەی ئەوانیان زۆر لەسەر شان گران بوو!

یان دەتوانین مانای ئەم رستەیە وا لێ بدەینەوە ﴿وَلاَ تُؤْمِنُواْ إِلاَّ لِمَن تَبِعَ دِينَكُمْ﴾ دڵنیا مەبنو بڕوا بەکەس مەکەن لەوە کە ئەم نهێنییەی لا بدرکێنن مەگەر بەکەسێك لەسەر ئایینی ئێوە بێ.

چونکە جوولەکە پێیان وابوو: هەر خۆیان راستنو تەنها ئیقەیان بە خۆیان بوو، بە بیرو بۆچوونی خۆیان دەبوو پێغەمبەرایەتی هەر لەناو ئەواندا بێ، زیادەڕەویان دەکرد لەوەدا کە خەڵکیان پێ هەتیومچەو کۆیلەو پایە نزم بوو، خۆیان بە خانەدانو پیاو ماقووڵو نەژاد رەسەن دادەنا، وایان دەزانی هەرچی ئەوان دەیکەن چاكو باشەو چی خەڵکی تر دەیکا خراپو ناشیرینە، ئیتر پەروەردگار بەرپەرچی دانەوەو

فەرمووی: ﴿قُلْ إِنَّ الْهُدَى هُدَى اللّهِ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: هیدایەت هیدایەتی خودایە، هەرکەسێکی بوێ شارەزای بکا بۆ ئیمان هێنان بەو پەیامەی بۆ موحەممەد نێردراوە ئەو بەهرەیەی پێ دەبەخشێ، فرتو فێڵی ئێوە، شاردنەوەی باس‌و خواسی پەیامی موحەممەد لە کتێبەکەی خۆتانداو چاوبەستکردن لە نەخوێندەوارانی خۆتان‌و دیکە، هیچ کاریگەرییەکی نابێ، ئێوە ئەو حەق‌و راستییە ئاشکرا بکەن یان بیشارنەوە هیچ لە رۆڵی نیعمەتی هیدایەتی خودایی ناگۆڕێ.

جوولەکەکان لە ناو خۆیاندا بەیەکتریان دەگوت: نەچن ئەوە بڵاوبکەنەوە کە ﴿أَن يُؤْتَى أَحَدٌ مِّثْلَ مَا أُوتِيتُمْ﴾ دەگونجێ پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی بدرێ بەکەسانی تر وەکوو دراوە بە ئێمە، نەچن ئەم نهێنییە جگە لە هاوئایینانی خۆتان بەکەسی تری بڵێن: ﴿أَوْ يُحَآجُّوكُمْ عِندَ رَبِّكُمْ﴾ بۆ ئەوەی بەڵگەتان لەسەر راست نەکەنەوەو لای پەروەردگار بۆرتان نەدەن! بەڵگەو دەلیلتان پووچ بکەنەوە. تەورات بهێنن بیخوێننەوە ئەوەی کە ئێوە شاردووتانەتەوە لەباس‌و خواسی موحەممەدو مژدەدان بە هاتنی دەربکەوێ.

پوختەی مەبەست ئامۆژگاریی یەکتری دەکەن دەڵێن: لای عەرەبەکان ئەوە مەدرکێنن کە ئێوە بڕواتان وایە کە پێغەمبەرێك لەغەیری بەنی ئیسرائیل دێتە کایەوە!!!

بەڵکوو ئەوە سرپۆش بکەن کە ئێمە بڕوامان هەیە موسوڵمانان وەکوو ئێمە نامەی ئاسمانییمان بۆ هاتووە، ئەم نهێنییە جگە لە هاوئایینانی خۆمان بەکەسی تری مەڵێن! بە موسوڵمانانی مەڵێن بۆ ئەوەی بڕوایان بە ئایینەکەیان پتەو نەبێ! بە کافرەکانی قورەیشی مەڵێن نەبادا موسوڵمان ببن ﴿قُلْ إِنَّ الْفَضْلَ بِيَدِ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی بەهرەو بەخششی خودایی‌و بەدەست زاتی پەروەردگارە، دەیبەخشێ بەکەسێك شیاوی بێ‌و مەیلی لێ بێ، ﴿وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ خودای مەزن عەطاو بەخششی زۆرە، خەزێنەی رەحمەتی فراوانە،

دەزانێ کێ شیاوی پێغەمبەرایەتییە، ئەم بەهرەی پێغەمبەرایەتییە دەداتە کەسێك شانی هەڵیبگرێو خودا بۆخۆی دەستنیشانی کردبێ. ﴿يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَن يَشَاءُ﴾ بەخششی بەرفراوانیو رەحمەتی بێ پایانی دەداتە کەسێك مەیلی لێ بێو بەکاری ئەو ئەرکە گرنگە بێ، نەك وەکوو ئەهلی کیتاب بۆی چوونو پێیان وایە: پێغەمبەرایەتی هەر دەبێ لەناو جولەکەدا بێو خۆیان بەلاوە گەلی هەڵبژاردەو هۆزی تایبەتیو بنەماڵەی رەسەن بێ.

پەروەردگار کێی بوێ لەبەندەکانی خۆی دەیکاتە فرستادەو دەینێرێ بۆ راگەیاندنی پەیامی خۆی! کەسێکیش خودا ئەم بەهرەیەی دایێ، ئەوە لە رووی فەضلو گەورەیی خۆیەوەیەو بەس! نەك لە رووی نەژادو بنەماڵەو کردەوەبێ! چونکە خودا مەرایيو چاو بەستەکی لەبەر کەس ناکا، پەروەردگار زۆر لەوە بەرزترە هەڵوێستی ئاوای پاڵ بدرێ! ﴿وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ پەروەردگار خاوەنی بەخششی گەورەو رەحمەتی بێ پایانە، رەحمەتو بەزەیی بەشی هەموو شتێك دەکا

## سپاردە دانەوەو وەفا بە عەهد لای هەندێ لە خاوەن نامەکان

﴿ ۞ وَمِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِمًا ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَيْسَ عَلَيْنَا فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ بَلَىٰ مَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ

﴿ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٧٧﴾.

جا وە نەبێ کار بەوەندەوە وەستابێ بەڵکوو، سەرەڕای پیلانگێڕییانو هەوڵدانیان بۆ پێشگیریو لەمپەڕ دروستکردن لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، چەندین ڕەوشتی ناشیرینی تریان هەیە، کەسایەتیو دەستەو تاقمی وایان تێدایەو دەست پیسو خائینە، هەیانە ماڵ خواردنی خەڵکانی نا جولەکەیان بەلاوە ڕەوایە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ﴾ واتە: وەکوو لە ئایەتی پێشوودا باس کرا ئەهلی کیتاب کۆمەڵێکیان خەریکی پیلانگێڕانو پەشیمان کردنەوەی ئەوانە بوون کە تازە موسوڵمان بووبوون، کۆمەڵێکی تریان ماڵ خواردنی – جگە لە ماڵی هاودینانی خۆیان – بەلاوە ڕەوایە، چونکە پێیان وایە تەورات تەنها نەهی لە ماڵ خواردنی هاودینانی خۆیانی لێ کردووە.

**بەکورتی دەفەرموێ بەنی ئیسرائیلی دوو تاقمن:**

أ- تاقمێکیان هەر شتێکی پێ بسپێررێ زۆر بێ یان کەم بێ، بەرێكو پێکی ئاگاداریی دەکاو دەیپارێزێو هەرکاتێ بتەوێ لێی وەربگرییەوە دەیداتەوە وەکوو عەبدوڵلای کوڕی سەلام، کابرایەکی قوڕەیشی هەزارو دوو سەد ئۆقیە ئاڵتوونی لا دانابوو، کە داوای لێ کردەوە بەبێ پێچەوپەنا بەرێكو پێکی تەسلیمی کردەوە.

ب- دەستەیەکی تریان ناپاکی لە سپاردەدا دەکەن، ئەگەر شتێکی لا دابنێی تەنانەت کەمیش بێ دەستی بەسەردا دەگرێو نایداتەوە، مەگەر بەزۆر شایەتی لێ بگرێو رایکێشێ بۆلای قازیو دادگا؛ وەکوو کەعبی کوڕی ئەشرەف، کابرایەکی

قورەیشی دینارێکی لا دانابوو، دەستی بەسەردا گرت‌و ئینکاری کردو نەیدایەوە! ﴿ذَلِكَ﴾ ئەم کردارە ناشیرینە خیانەتکاریانەیان ﴿بِأَنَّهُمْ قَالُواْ لَيْسَ عَلَيْنَا فِي الأُمِّيِّينَ سَبِيلٌ﴾ لەم رووەوە بوو کە پێیان وابوو ماڵ خواردنی عەرەبەکان بۆیان رەوایەو گوناهیان ناگاتێ ئەگەر بیخۆن!

بەکورتی وایان دەزانی: کە هەرکەسێك جولەکە (شعب الله المختار) نەبێ خودا چی بەسەرەوە نیەو لای خودا فێزمونەو بەهیچی نازانێ‌و هیچ مافو رێزێکی نیە، ماڵ‌و سامانیشی بێ رێزو ئیحتیرام‌و بێ پەرژینە، هەرکەسێك بۆی بکرێ دەتوانێ چەپاوی بکاو بۆخۆی بەرێ!! ئاشکراشە ئەمە ئەوپەڕی زیادەڕەوی‌و ملهوڕی‌و بەخۆنازین‌و لە خۆبایی بوونی تێدایە! بەزەقی ماف پێشێل کردنی خەڵکەو دوورە لە هەڵوێستی مرۆڤایەتی....!

ئیبنو جەریر دەڵێ: کۆمەڵێك موسوڵمان لەسەردەمی نەزانییاندا برێ کاڵایان بە کۆمەڵێك فرۆشتبوو هێشتا پارەکەیان وەرنەگرتبوو موسوڵمان بوون، کە داوای پارەکەیان لێ کردن ئینکاریان کردو وتیان: ناتاندەینەوە، چونکە ئێوە وازتان لە ئایینی خۆتان هێناوەو چوونە سەر ئایینێکی ترو ئەمەش پەیڕەو کردنمانە بۆ تەورات‌و لە کتێبی ئێمەدا ئەم جۆرە حوکمە هەیە.

ئیتر پەروەردگار بەدرۆی خستنەوەو فەرمووی: ﴿وَيَقُولُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ ئەوانە درۆ هەڵدەبەستن‌و شتی دەمهەڵبەست پاڵ خودا دەدەن‌و، بۆخۆشیان دەزانن کە درۆ دەکەن، چونکە ئەگەر ئەم حوکمە هەبوایە دەبوایە لە تەوراتدا بوایە! دەی ئەو تەوراتەی کە لەبەردەستاندایە شتی وای تێدا نیەو رێگەتان پێ نادا بە ناحەق ماڵ‌و سامانی عەرەب بخۆن! بەڵام ئەوان زیادەڕەوییان کردو پەنایان بۆ مالمەکانیان بردو لەوانەوە فتوایان وەرگرت‌و بیروبۆچوونی ئەو مالمانەیان کرد بە ئایین، ئەوانیش بە ئارەزۆی خۆیان فتوایان دەداوگۆڕانکارییان لە دەقەکانی تەوراتدا دەکرد، ئەم جۆرە قسەو قسەلۆکەیان بڵاو دەکردەوە.

﴿بَلَى مَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ وَاتَّقَى فَإِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾ بەڵێ بۆچوونەکەتان هەڵەیە، هەڵوێستەکەتان ناڕەوایە، هەرکەسێ وەفا بە وادەی خۆی بکاو تەقوای خودا بکا، ئەوە خۆپارێزەرەو، خوداش تەقواکارانی خۆش دەوێن، کەوابوو نابێ ئێوە بە ناڕەوا ماڵی نا جولەکەو عەرەبو ناعەرەب بخۆن؛ پێویستە پابەندی وادەو بەڵێنی خۆتان بن؛ قەرزتان لایە بیدەنەوە، سپاردەتان لەکنە بیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکەی بەبێ چەندو چوونو ئەملاو ئەولا کردن.

ئەم ئایەتە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە جولەکە پابەندبوونی خۆیان بە بەڵێنەوە لەگەڵ هەموو کەسدا بەلاوە واجب نەبووە، بەڵکوو ئەگەر بەڵێن پێدراوەکە جولەکە بووبێ ئەوە پابەندی بەڵێنەکەیان بوونو، ئەگەر نا بەلایانەوە پێویست نەبووە!!

هەروەها ئەم ئایەتە ئەوەش دەستنیشان دەکا کە وەفا بە عەهدو خۆپاراستن لە بێ بەڵێنی، نەك بنەچەو نەژاد، بەڵکوو بەندە لە پەروەردگار نزیك دەکەنەوە، چونکە بنەچەو نەژاد لای خودا هیچ نرخو بەهایەکیان نیە. ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً﴾ ئەوانەی کە گۆڕانکاریی لە عەهدو پەیمانی خودادا دەکەن، لە شوێنی ئەوەی پابەندی راستگۆییو بەڵێن دروستی بنو سپاردە بگێڕنەوە بۆ خاوەنیو یەکتاپەرستی بکەنو کەس نەکەن بە هاوەڵی خوداو لە هەموو بارودۆخێکدا خۆیان لە نافەرمانی پەروەردگاریان بپارێزن، پابەندی ئەو سوێندو بەڵێنانەی خۆیان بن کە دەیانگوت: ئەگەر پێغەمبەری ئاخرزەمان هات ﴿لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ﴾ کەچی بە بەهایەکی کەم کە لەرتیل وەرگرتنو دەستبڕینی خەڵکی دەستیان دەکەوت لەو هەڵوێستانەیان ژێوان بوونەوە، پابەندی هیچ وادەو بەڵێنێکیان نەبوون. ﴿أُوْلَئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ﴾ ئەوانە رۆژی قیامەت هیچ بەشو بارێکیان نادرێتێو خۆشیو لەززەتی بەهەشتیان پێ نابڕێ، خودا لێیان نارازییەو، رقی لێیانە، بەچاوی رەحمەتو بەزەیی سەیریان ناکا، رۆژی قیامەت خودا وەسپو سەنایان نادا، کوشندەترین سزای دۆزەخی بۆ ئامادەکردوون.

بـەکورتی خـودا هەڕەشـەی تونـدی لەوانـە کـردووە کـە پەیمانـشکێن‌و وادە بـە خیلافن، هەڕەشەی لێ کردوون بەوە کە لە خۆشی‌و لەززەتی بەهەشت بێ بەریيان بکا، سـزای کوشـندەيان بـدا، لـە نـاو غـەزەبی خۆيـدا بيانتلێنێتـەوە، ناهومێـدی ڕەحمـەتی خۆيان بکاو قسەو عوزريان لێ نەبيسترێ! ئەو هەڕەشەيەی کە خـودا لەمانـەی کـردووە هەرگيز لە داوێن پيس‌و عەرەقخۆری نەکردووە،چونکە ئاکامی کاريگەری ئـەو تاوانانـە زۆر لە ئاکامی کاريگەری ئەم تاوانانە گەورەترە! کەواتـە وەفا بەعەهـدو دەسـتپاکی لـە سپاردەدا نيشانەی بـڕوا سـاغييە، ئـەو تـەوەرە سـەرەکييە کـە بەرزەوەنـدی ئـاوەدانی وڵاتی پێوە بەندە، هەرکاتێکيش ئادەميزاد بەڵێنی خۆيان نەبردە سەرو خيانەتکارييان لـە سـپاردەدا کـرد بتمانـەيان بەيـەکتری نامێنـێ! بـەبێ هـەبوونی بتمانـەش مامەڵـەو پەيوەنـدی کۆمەڵايـەتييان بـۆ ئـەنجام نـادرێ! بۆيـە پێغەمبـەر لـە فەرموودەيەکـدا دەفەرموێ: « آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاَثٌ إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ » نيشانەی دوو ڕووی سێ شتن کە قسەی کـرد درۆ بکا کە بـەڵێنی دا نەيباتـە سـەر، کـە سپاردەی لا دانرا خيانەتی تێدا بکا.

## هەندێ نموونەی درۆ هەڵبەستی جوولەکە

﴿ وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَٰبِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمَا هُوَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾

ئیبنــو عــەبباس دەفــەرموێ: دەســتەیەك جولەكــە چــوونە لای كــەعبی كــوڕی ئەشـرەف كـە دوژمنێكـی سـەر رەقـی پێغەمبـەر بـوو (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) ئـەم كۆمەڵـە دەسـتكاری تـەوراتییان كردبـوو، نامەیـەكیان نووسـیبوو تێیـدا ئـەو رەوشـتو نیـشانانەی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) – كـە لـە تەوراتـدا بـاس كرابـوو – گۆڕی بوویانن ئەمجار هۆزی بـەنو قـورەیظـە زمـانی خۆیـان پێوە بـادەدا بـۆ ئـەوەی وا پیشان بدەن كە كەلامی خودایە.

ئیتر پەروەردگار ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارێ كـە دەفـەرموێ: ﴿وَإِنَّ مِـنْهُمْ لَفَرِيقًـا يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَابِ لِتَحْسَبُوهُ مِـنَ الْكِتَـابِ﴾ واتـە: بێگومـان كۆمـەڵێكی تـری ئـەهلی كیتاب كە مالەو زاناو كاربەدەستەكانیانن وەكوو كەعبی كوڕی ئەشرەفو مالیكی كوڕی ئەلصەیفو هاوەڵانیان دەقەكانی تـەوراتیان گۆڕیـوە، ئـەمجار دێـن ئـەو دەقـە گۆڕدراوە دەخوێننەوە لەكاتی خوێندنەوەكەیدا زمـانی خۆیـان بـادەدەنو دەنگی لێ هەڵدەبڕنو، بە ئاواز دەیخوێننەوە بۆئەوەی وای پیشان بـدەن: كـە ئـەو دەقـە گۆڕدراوە بەشێكە لـە كەلامی خوداو تەوراتە؛ بەڵام لەڕاستیدا ﴿وَمَا هُـوَ مِـنَ الْكِتَـابِ﴾ ئـەو دەقـە گۆڕدراوە كەلامی خودا نیە، ئەوان درۆدەكەن ﴿وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ﴾ دەڵێن: ئـەوە لـەخوداوە هاتووەو فەرمووەدەی ئـەوە؛ ﴿وَمَا هُـوَ مِـنْ عِنـدِ اللّـهِ﴾ ئەوانـە راسـت ناكـەن ئـەو دەقـە گۆڕدراوانە لەخوداوە نەهاتوون ﴿وَيَقُولُـونَ عَلَـى اللّـهِ الْكَـذِبَ﴾ بـێ چاوو روویـی ئـەو تاقمە گەیشتۆتە ئەندازەیەك بێ پێچو پەنا ئەم دەقـە گۆڕدراوانـە دەدەنـە پـاڵ خـوداو هیچ ترسو خۆفێكیان نیـەو پێیـان وایـە: هەرشـتێك بكـەن خـودا لێیـان خـۆش دەبـێ. ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ ئەوەنـدە بێ شەرمو ئـابڕوون، دەزانـن كـە قسەكەیان درۆو هەڵبەسـتە، ئەو دەقە بۆ خۆیان گۆڕیویانە، كەچی نیسبەتی دەدەن بۆ لای خودا، ئەمەش تـاوانێكی فــرە گەورەیــەو بوختــانێكی بــێ پاســاوەو بــە ئەنقەســت ئــەنجامی دەدەن.

## بوختان هەڵبەستنی خاوەن نامەکان لەسەر پێغەمبەران

﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن كُونُوا۟ رَبَّٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ ٱلْكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ أَرْبَابًا ۗ أَيَأْمُرُكُم بِٱلْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار باسی بوختانی جولەکەکانی کرد کە بەدەم خوداوە شتیان هەڵدەبەستو کەلامی وایان پاڵ دەدا کە نەیفەرمووە، ئەمجار دێتە سەر باسکردنی بوختانو قسە هەڵبەستنی هەمان گرۆهـ بەدەم پێغەمبەرانەوە!

ئیبنو ئیسحاقو بەیهەقی لە ئیبنو عەبباسەوە؛ دەڵێ: کاتێك مالەکانی جولەکەو قەشەکانی نەجران لەلای پێغەمبەر کۆبوونەوەو پێغەمبەر بانگەوازیی کردن بۆ موسوڵمان بوون، ئەبو رافیعی قورەظی هاتە قسەو وتی: ئەی موحەممەد! ئایا تۆ دەتەوێ ئێمە بتپەرستینو بەخودات بزانین؟ وەکوو چۆن نەصرانییەکان عیسا بەخودا دەزانـنو دەیپەرستن؟؟ کابرایەکی نەصرانیش هەڵیدایە وتی: ئایا ئەوەت دەوێ؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پەنا دەگرم بە خودا کە جگە لە خودا کەسێکی تر بپەرستن، یان فەرمان بکەم کە جگە لە خودا کەسێکی تر بپەرسترێ!! نە خودا بۆ ئەوە منی ناردووە، نە بەوەش فەرمانی پێ کردووم، ئیتر ئەم ئایەتە لەو بارەوە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ اللَّهُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ﴾ ناشێو هیچ ئادەمیزادێك رایەی ناکەوێ کە خودا نیگای بۆ بکاو بیکاتە پێغەمبەرو

فێری ئایینو نهێنی شەریعەتی بکا ﴿ثُـمَّ﴾ کەچی پاشان لە جیاتی سوپاسو ستایش کردنو بەندایەتیکردن بۆ خودا ﴿يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُواْ عِبَادًا لِّي مِن دُونِ اللّـهِ﴾ بانگەوازی ئادەمیزادان بکا بۆ پەرستنی خۆی لە باتی پەرستنی خودا! دیارە شتی وا نابیو ناگونجێ! چونکە کەسێك خودا پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی بداتێ، بانگەوازی خەڵکی دەکا بۆ ئەوەی زانیاریان بەو پێغەمبەرایەتییە ببێو هەڵیان دەنێ بۆ تێگەیشتن لە یاسای ئایینەکەیو داوایان لێ دەکا ببنە پێشەنگ لە تاعاتو خوداپەرستیدا، دیارە هەرگیز پێیان ناڵێ: لە جیاتی خودا من بپەرستن ﴿وَلَكِن كُونُواْ رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَـابَ﴾ بەڵکوو ئەو پێغەمبەرەی کە کتێبی بۆ نێردراوە هەمیشە بە گەلو نەتەوەکەی دەڵێ: بەندەی خودا بن، خۆتان بە رەببانی (خوداویست) لەقەڵەم بدەن، راستەوخۆ بەبێ ناوەندو وەسیلە لە بارەگای زاتی بێچوونی بپاڕێنەوە، هەمیشە پەنا بۆ ئاستانەی ئەو بەرن، بەهۆی تێفکرینو دیراسەکردنی قورئانو نامەی ئاسمانی، نامەی خودایی، واتە: لە ڕێگەی زانستو زانیاریو فێربوونی نامەی خوداوە، مرۆڤ دەبێتە رەببانیو خوداویست! چونکە هەر زانیارییەك ئادەمیزاد هەڵنەنێ بۆ گوفتارو کرداری چاك، بە زانیاری لەقەڵەم نادرێ. ﴿وَلاَ يَـأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِـذُواْ الْمَلاَئِكَـةَ وَالنِّبِيِّيْنَ أَرْبَابًا﴾ هەرگیز ناگونجێ بۆ کەسێك خودا بیکاتە پێغەمبەر داوا لە گەلو هۆزەکەی بکا کە بە خودای بزانن! هەرگیز فەرمانی واتان پێ ناکا، هەروەها فەرمانی ئەوەشتان پێ ناکا کە فریشتەو پێغەمبەران بکەن بە ئەربابو پەرستراو، ئەم بیروباوەڕە بێ بنەمایەو راستی تێدا نیە! بێگومان لەسەردەمی پێش ئیسلام هەندێ موشریکی عەرەب فریشتەیان دەپەرست! جولەکەکانیش دەیانگوت: عوزەیر کوڕی خودایە، نەصرانییەکانیش دەیانگوت عیسا کوڕی خودایە، ئیتر پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە: کە ئەو بیروباوەڕە پێچەوانەی ئەو ئایینانەیە کە پێغەمبەران هێناویانە کە بریتییە لە خوداپەرستی، یەکتاپەرستی، ئیخلاص بۆ خوداو قەدەغەکردنی پەرستش بۆ غەیری خودا، بۆیە دەفەرموێ: ﴿أَيَـأْمُرُكُم بِـالْكُفْرِ بَعْـدَ إِذْ أَنـتُم مُّسْلِمُونَ﴾ ئایا ئەو

پێغەمبەرە فەرمانتان پێ دەکا بە فریشتە پەرستی یان پێغەمبەر پەرستی؟؟ بێگومان پێغەمبەران هەڵوێستی وا نانوێنن، چۆن پێغەمبەر شتی وا دەکا؟ هەر پێغەمبەرێ شتی وا بکا یەکسەر پێغەمبەرایەتی لێ دەسەندرێتەوەو کافر دەبێو باوەڕی نامێنێ..!

کەسێك خودا نامەی ئاسمانی بۆ بنێرێو حیکمەتو پایەی پێغەمبەرایەتی پێ ببەخشێ، لە هەموو کەس زیاتر خودا دەناسێ؛ چونکە پەروەردگار نیگای خۆی ئاراستەی دڵو دەروونی خاوێنو گیانی پاك دەکا، هەرگیز لە دڵو دەروونێکا تیشکی پێغەمبەرایەتیو بانگەوازیی بۆ پەرستنی غەیری خودا کۆنابنەوە.

ئیمامی عەلی دەفەرموێ: دوو جۆر ئادەمی پشتی منیان شکاند! زانایەکی بێ موبالاتو سوکایەتی کەر بە ئایینەکەی، ئایینەزانێکی خۆ بە موسوڵمان زان، چونکە زانا، کە دەربارەی ئایین بی موبالات بێ، بەهۆی بێ موبالاتیەکەیەوە، خەڵکی لە ئایین دوور دەخاتەوە، نەزانەکەش زۆر کەس دەخاتە سەر ڕێبازێك پێی وایە ئایینەو بەڵام ئایین نیە.

## وەرگرتنی پەیمان لە پێغەمبەران کە پاڵپشتی یەکتری بکەن

﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾ فَمَن تَوَلَّىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٨٢﴾ أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ

﴿يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾﴾.

ئایەتەکانی پێشوو ریزکران بۆ چەسپاندنی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەویش بە ئەژماردنی ئەو شتانەی کە لای ئەهلی کیتاب ئاشکرایە بۆ ئەوەی بەهانەیان نەمێنێ، بیروبۆچوونیان هەموو پووچ بکرێتەوە ئەو شوبهەو دڵەڕاوکێیەیان نەمێنێ کە دەیانگوت: نابێ جگە لە گەلی بەنی ئیسرائیل لە هیچ گەلو هۆزێکی تر پێغەمبەر ببێ، ئیتر ئەم ئایەتەی کەدێ یەکێکە لەو بەڵگە بەهێزانەی کە بیروبۆچوونی تورەهاتی ئەوان قەڵاچۆ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّيْنَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ﴾ ئەی موحەممەد! باسی ئەوەیان بۆ بکە، ئەوەیان بخەرەوە یاد: کە خودای تۆ پەیمانی لە پێغەمبەران وەرگرتو پێی فەرموون: هەرکاتێك پێغەمبەرێك دوای ئێوە هاتو بڕوای بە ئایینەکەی پێش خۆی هەبوو، پاڵپشتی کتێبە ئاسمانییەکانی پێشووی دەکرد، ئێوە ئیمانی پێ بهێننو یارمەتی بدەن، ئێوە لەسەر هەر ئایینو مەزهەبێك بن، هەر کتێبو حیکمەتێکتان بۆ نێردرابێ دەبێ بڕوا بەو پێغەمبەرە تازە بکەن! چونکە مەبەست لە ناردنی پێغەمبەران یەك مەبەستە، کارەکانیان تەواوکەری یەکترین، هەموویان لە بنەماو ئوصوڵدا یەك هەڵوێستن، جوداوازییان - ئەگەر لە فروعدا هەبێ - ئەوە بۆ خۆشبەختی ئادەمیزادە، پێویستە پێغەمبەران هەموویان هاریکاری یەکتری بکەنو یارمەتیدەری یەکدی بن! ئەگەر پێغەمبەرێك لەسەردەمی پێغەمبەرێکی تردا هات پێویستە پێغەمبەرەکەی پێشوو ئیمانی پێ بهێنێو یارمەتی بداو بە گوێرەی توانا هاریکاری بێ.

ئەگەر لەبەرنامەی پێغەمبەرە تازە نێردراوەکەدا شتێك هەبوو حوکمێك یان چەند حوکمێکی لە هی ئایینە پێشووەکەدا نەسخ دەکردەوە، پێویستە پێغەمبەرە

پێشووەکە بێ سێو دوو بڕوای پێ بکا، چونکە هەموو پێغەمبەران لە بنەماو ئوصولدا دەبێ یەك هەڵوێست بن، لە بواری چۆنیەتی خوداپەرستیو فروعدا ئەگەر جوداوازییان هەبوو، ئەوە وەکوو گوترا بۆ خۆشبەختی ئادەمیزادەو ژیانی ئادەمیزادو پێشکەوتنی ژیان داخوازیەتی.

ئەگەر دوو پێغەمبەر لە گەڵێکداو لەسەردەمێکدا بوون وەکوو مووساو هاروون (علیه السلام) ئەوە ئایینەکەیان لە ئوصولو فروع دا یەك شێوەیە. ئەگەر گەلەکانیان جوداواز بوون، ئەوە هەریەکەیان ئیمان بەیەکتری دەهێننو دەبێ لە ئوصولدا یەك بن،بەڵام لە فروعدا نا، وەکوو لوطو ئیبراهیم، وەکوو ئەوە لوط ئیمانی هێنا بەو پەیامەی ئیبراهیم هێنای.

ئەگەر دوو پێغەمبەر یەك بەدوای یەکتردا هاتن وەکوو مووساو عیسا ئەوە دەبێ هەریەکەیان پەیامی ئەوی تریانی بەلاوە ڕاست بێو ئیمانی پێی هەبێ! هەر بەو شێوەیەش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئاخر زەمان کە پێویستە لەسەر شوێنکەوتوانی پێغەمبەرانی پێشوو ئیمانی پێ بێننو پشتگیری لێ بکەن، بەهیچ جۆرێك ئایین نابێ ببێتە سەرچاوەی بەدبەختیو جوداوازیو دژایەتیو کێ بەرکێ، وەکوو ئەهلی کیتاب کردیان، کە پێغەمبەری ئیسلام هات دژایەتیان کردو لێی یاخی بوون، بەڵکوو ئایین هۆکارو سەبەبی یەکییەتیو کۆکیو خۆشەویستیو ڕێگای ئازادیو ڕزگاربوونە لە ناخۆشی!!

﴿أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي﴾ پەروەردگار فەرمووی بەو پێغەمبەرانەی کە عەهدو پەیمانی لێ وەرگرتوون: ئایا دانتان بەوەدا نا کە ئیمان بهێنن بەو پێغەمبەرە لە ئاخر زەماندا پەیدا دەبێ؟ بەڵێن دەدەن کە یارمەتی بدەنو هاریکاری بکەن؟ پەیمان دەدەن کە بڕوا بەو پێغەمبەرە بکەن کە لە ئاخر زەماندا دێو ئەو بڕوای بە پەیامی ئێوە هەیە؟ ئەم پەیامەتان قبووڵە؟ ﴿قَالُواْ أَقْرَرْنَا﴾ وتیان: بەڵێ: دانی پێدا دەنێینو ئیعتیراف بەوە دەکەین، ﴿قَالَ فَاشْهَدُواْ وَأَنَاْ مَعَكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ﴾ ئەمجار پەروەردگار فەرمووی: دە بڕێکتان شایەد بن لەسەر بڕێکتان، منیش شایەدم

بەسەرتانەوەو ئاگاداری ئەم دان پیانانو بەڵێنەتانمو هەموو شتێك دەربارەی ئێوە دەزانمو هیچم لێ هون نابێ!

ئیمامی موسلیمو بوخاری لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەگێڕنەوە کە دەفەرموێ: «يُقَالُ لِلرَّجُلِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ لَكَ مَا عَلَى الأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ أَكُنْتَ مُفْتَدِياً بِهِ قَالَ فَيَقُولُ نَعَمْ. قَالَ فَيَقُولُ قَدْ أَرَدْتُ مِنْكَ أَهْوَنَ مِنْ ذَلِكَ قَدْ أَخَذْتُ عَلَيْكَ فِي ظَهْرِ آدَمَ أَنْ لاَ تُشْرِكَ بِي شَيْئاً فَأَبَيْتَ إِلاَّ أَنْ تُشْرِكَ» ڕۆژی قیامەت دەگوترێ: بەو کەسەی دەخرێتە دۆزەخەوە ئایا ئەگەر هەرچی لەسەر زەوی هەیە هی تۆ بوایە دەتکردە بەدەڵو فیدا بۆ ئەوەی لەم سزایە ڕزگارت بێ، فەرمووی: کابرا دەڵێ: بەڵێ، خودا پێی دەفەرموێ: زۆر لەوە کەمترت لێ داوا کراوە نەتکردووە، پەیمانمان لێ وەرگرتی لە پشتی ئادەمدا کە هاوەڵم بۆ ڕەوا نەبینیو کەس نەکەی بەشەریکم، کەچی گوێت بەو پەیمانە نەداو شەریکت بۆ قەرار دام.

ڕاڤەکەرانی قورئان دەفەرموون: ئەم گفتو گۆیە بۆ تێگەیاندنو ڕوونکردنەوەو ترساندنە لە هەڵگەڕانەوە لە وەعدو بەڵێن، واتە: تەمثیلە، ئەگینا قورئان ئەوە ناچەسپێنێ کە ئەم گفتو گۆیە ڕووی دابێو ئەم قسانە کرابن. ئەم جۆرە دەربڕینانە لە شێوازی ئاخاوتنی عەرەبیدا زۆرن.[1]

﴿فَمَن تَوَلَّى بَعْدَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ کەسێك دوای ئەم دان پێدانانەو بەڵێن وەرگرتنە پشت هەڵ بکاو ئایین بکاتە هۆکاری جوداوازیو دژایەتی خستنەوەو ئیمان بە پێغەمبەری ئاخر زەمان نەهێنێ، کە ئەو بڕوای بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرانی پێش خۆی هەیەو تەصدیقیان دەکاو، ئایینەکەی ئایینێکی گشتییەو سەرتاسەرییە، کەسێك دژایەتی ئەم پێغەمبەرە بکاو بەدرۆی بخاتەوە وەکوو ئەهلی

[1]- لە جزمی نۆیەم لە سووورەتی (الأعراف)دا لەکاتی ڕاڤەکردنی ئایەتی (١٧٢ - ١٧٤) ئەم باسەمان شی کردۆتەوە..

کیتابی هاوچەرخی پێغەمبەری ئیسلام کردیان، ئەوە یاخی بوو کافرو بێ وادەو بەڵێنە، لە پەیمانی بەستراویان لەگەڵ خودادا دەرچوونو پابەندی عەهدو پەیمانی خۆیان نەبوون.

دەی کە ئایینی خودا یەك ئایین بێو، پێغەمبەرەکان لە ئوصولو بنەمای ئایینەکاندا یەك بن، ئەدی ئەهلی کیتاب بە چ ڕوویەك ئینکاری پێغەمبەرایەتی موحەممەد دەکەن؟! ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ اللّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا﴾ ئایا جگە لە ئایینی پەسەندکراوی خودا ئایینێکی ترتان دەوێ؟ پشت لە ئایینی پەسەندکراوی خودا دەکەن؟؟ لە کاتێکدا چی لە ئاسمانو زەویدا هەیە، هەموویان گەردنکەچو پابەندی ئەڵقەلەگوێی خوداوەندن. جا یان بە ویستی خۆیان لە ڕووی ئینصافو تێفکرین لە بەڵگەو دەلیل، یان بەزەبری شمشێرو نیشاندانی ڕووداوی وەها کە ڕێگایان نەمێنێو نەتوانن ئیمان نەهێنن وەکوو هەڵستانی کێو بۆسەر بەنو ئیسرائیلی، یان وێکهاتنەوەی دەریای نیل بەسەر فیرعەونو لەشکرەکەی داو خنکانیان، کە لەپێش ئەوەی بخنکێن کە زانیان مردن یەخەی پێ گرتوونو تازە چاریان نەماوە، یەکسەر ئیمانیان هێنا! بەڵام تازە چ سوود؟!

بەڵێ ئەوانە کە بینیان پەروەردگار ئاوا لە بوونەوەردا بەدەسەڵاتەو دەتوانێ بە ئارەزووی خۆی چۆنی بوێ ئاوا هەڵیسوڕێنێ بە ناچاری ئیمانیان بە خودا هێنا.

پوختەی قسە ئەوەیە ئاییندار‌ی حەق ئەوەیە گەردن بۆ خودا کەچ بکەی، پەروەردگار بە تاكو تەنیا بناسی، بەسینەی سافەوە پەرستشی بکەی!! پێغەمبەران هەموویان ئەوە هەڵوێستیان بووە، پەیمانو وادەیان لە گەلەکانیان وەرگرتووە کە هەرکاتێ پێغەمبەری ئاخر زەمان هات ئیمانی پێ بهێنن؟ بەڵام کە پێغەمبەری ئاخر زەمان هات گەلەکانیان ئەو پەیمانەیان هەڵوەشاندەوەو بەدرۆیان خستەوە، ﴿وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ هەر بۆلای خودا دەگەڕێنەوە هەرکەسێك لە جولەکەو مەسیحیو گرۆهەکانی تر جگە لە ئیسلام ئایینی تر هەڵبژێرێ بەگوێرەی ئەو هەڵوێستەیان سزایان دەدرێتەوە.

## بڕوانەکردن بە هەموو پێغەمبەران و وەرگرتنی ئایینی ئیسلام

﴿قُلْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾﴾.

دوای ئەوە پەروەردگار باسی وەرگرتنی بەڵێنی لە پێغەمبەران کردو وادەی لێ وەرگرتن کە بڕوا بە پێغەمبەری ئاخر زەمان بکەن و یارمەتی بدەن.. دێتە سەر باسی ئەوە کە فەرمانی بە (محمد)یش کردووە کە ئیمان بە پێغەمبەرانی پێشوو بێنێ و تەصدیقیان بکاو، کتێبەکانیان بەراست بزانێ، دەبێ ئومەتەکەشی لەو هەڵوێستەدا شوێنی بکەن و هەمان بڕوایان هەبێ... بەکورتی خودا بەڵێنی لە پێغەمبەرانی رابوردوو تا پێغەمبەری ئاخر زەمان وەرگرتووە کە هەر هەموویان تەصدیقی یەکتری بکەن و بڕوایان بە کتێبی ئەوی تریان ببێ! وەکوو دەفەرموێ: ﴿قُلْ آمَنَّا بِاللّهِ﴾ ئەی موحەممەد! بڵێ: من و ئەوانەی لەگەڵمدان لە موسوڵمانان ئیمانی پتەویان هەیە بە هەبوونی خودای تاک و تەنیاو بێ هاوەڵ و هاوتایە، تاقە دەست رۆیشتوو لە بوونەوەردا ﴿وَمَا أُنزِلَ عَلَيْنَا﴾ هەروەها بڕوامان بە قورئان هەیە کە بە نیگا لە خوداوە نێردراوە بۆ من و منیش بە ئومەتەکەم راگەیاندووە. ﴿وَمَا أُنزِلَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ﴾ هەروەها بڕوامان بەوە هەیە کە خودا نیگای کردووە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق؛ بۆ ئەوەی گەلەکانیان لە گومڕایی ڕزگار بکەن و، بیانخەنە سەر

ڕێگای ڕاستو خوداپەرستی! ئەو نیگایەی بۆ ئەوان کراوە لەگەڵ پەیامی ئێمەدا لە ناوەڕۆكو ئوصولدا یەك ئامانجو یەك مەبەستن، بۆیەش ناوی ئەم پێغەمبەرانەی هێنا چونکە ئەهلی کیتاب بڕوایان بە پێغەمبەرایەتیو کتێبەکانیان هەیە.

﴿وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى﴾ هەروەها بڕوامان بە پێغەمبەرایەتی موساو عیسا هەیە، بڕوامان بە تەوراتو ئینجیلو باقی موعجیزەکانیان هەیە، بۆیەش بەتایبەتی باسی ئەم دوو پێغەمبەرەی هێنا چونکە گوفتو گۆیەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵ جولەکەو فەلەکان بووە ﴿وَالنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ﴾ هەروەها بڕوامان بەو پێغەمبەرانەی تریش هەیە؛ کە لە خوداوە نێردراون وەکوو داودو سولەیمانو ئەیوبو هی تریش کە پەروەردگار چیرۆكو بەسەرهاتەکانیانی بۆمان گێڕاوەتەوە، وەهی هەندێکیانی هەر نەگێڕاوەتەوە؟

هەرچی قورئانی پیرۆز باسی کردووە دەربارەی پێغەمبەرانو کتێبەکانیان — بەکورتی یان بە درێژی — چۆنی فەرمووە بڕوامان پێیەتی! ئەوەش دەزانین کە پوختەی ئایین لای هەموو پێغەمبەران بریتی بووە لە بڕوا بە خوداو بڕواهێنانو بە دڵو تەسلیم بوونو کردارچاکیو بڕوا بە ڕۆژی قیامەت.

﴿لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ﴾ ئێمە جوداوازیی ناخەینە ناو پێغەمبەرانەوە ناچین بڕوامان بە هەندێکیان هەبێو هەندێکیان بە پێغەمبەر نەزانین! وەکوو جولەکەو نەصرانی دەیکەن کە بڕوایان بەهەندێ پێغەمبەر هەیەو بڕوایان بە بڕەکەی تریان نیە! ﴿وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ ئێمە گەردنکەچی پەروەردگارین، فەرمانبەرداری فەرمانینی، مەبەستمان نزیك بوونەوەیە لە خودا، دەمانەوێ ئیصلاحی دڵو دەروونمان بکەینو لە چڵکی گوناه پاکی بکەینەوە.. ئایەتەکە بە وشەی ئیمان (امنا) دەستی پێ کردو بە وشەی ئیسلام؛ (مسلمون) کۆتای پێ هات تا ئاماژە بێ بۆ ئەوە کە بەروبوومی هەموو ئایینو نیگاو ناردنی پێغەمبەرێك ئیمانو ئیسلامە.. ئەمجار فەرمووی: ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ﴾ هەرکەسێك جگە لە ئایینی پاکی

ئیسلام – کە پوختەی هەموو ئایینەکانەو بریتییە لە ئیمان‌و ئیسلام – هەوڵ بدا ئایینێکی تر بنێتە کایەوە. ئەوە لێی وەرناگیرێ‌و چی بکا لای خودا بەتاڵ‌و بێ هودەیە، چونکە ئەگەر ئایین وا لە ئادەمیزادەکان نەکا کە خضوع‌و گەردنکەچی بۆ خودا ئەنجام بدەن بە ئایین حسێب ناکرێ‌و بریتی دەبێ لەچەند کردارو گوفتارێکی بێ مەبەست‌و لاسای کردنەوەیەکە کوێرانە دەبێ‌و هیچ سوودێکیان لێ نابینرێ؛ بەڵکوو زیاتر دڵ‌و دەروون رەش دەکاو، فیتنەی‌و ئاشووب بەرپا دەکاو سەرچاوەی خەسارەتمەندی دەبێ، لە قیامەتدا لە خۆشی بەهەشت بێ بەری‌و تووشی سزای دۆزەخ دەبێ.

## تاقم‌و کۆمەڵە کافرەکان لە روانگەی تۆبەکردنیانەوە

﴿ كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ

ٱلضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٞ فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡ أَحَدِهِم مِّلۡءُ ٱلۡأَرۡضِ ذَهَبٗا وَلَوِ ٱفۡتَدَىٰ بِهِۦٓۗ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٩١﴾ ﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار لە ئایەتەکانی پێشوودا ناوەرۆکی ئیسلامی روون کردەوەو ئەوەی چەسپاند کە ئیسلام ئاینێکە پەیامی هەموو پێغەمبەران بووەو، جگە لەو ئایینە هیچ ئایینێکی تر لەکەس وەرناگیرێ؛؛ ئەمجار دێتە سەرباسی روون کردنەوەی حاڵو وەصفی کافرانو چۆنیەتی سزایان لەلای خودا!

حەسەنی بەصریو قەتادە دەڵێن: ئەم ئایەتە ﴿كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ.......﴾ دەربارەی جولەکەکان هاتۆتە خوارێ، چونکە ئەوان لەوە پێش مزگێنی هاتنی پێغەمبەریان دەداو دەیانگوت: نیشانەو وەصفی ئەو پێغەمبەرە لە کتێبی ئێمەدا دیاری کراوە، هەر لەگەڵ هات پێش هەموو کەس ئێمە پێی دەزانینو دەیناسینو بڕوای پێ دەکەین، کەچی کاتێك ئەو پێغەمبەرە رەوانەکراو قورئانی بۆ نێردرا لەسەرەتاوە بڕوایان پێ کرد، بەڵام کە زانیان نەژادی عەرەبە سەرپێچییان کردو کافر بوون، چونکە حەسوودیان بە عەرەبەکان بردو پێیان ناخۆش بوو کە پێغەمبەرێك – جگە لە نەژادو نەتەوەی خۆیان – بنێردرێ! هەمیشە وایان بڵاودەکردەوە کە پێغەمبەر هەر دەبێ لەبەنی ئیسرائیل بێ!! کەوابێ ئەوان لە راستیدا پێش هاتنی پێغەمبەر ئیمانیان پێی هەبوو، کە نێردراو بانگەوازی کردو زانییان عەرەبە ژێوان بوونەوەو کافر بوونەوە، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ!

نەسائیو ئیبنو حەببانو حاکم لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە: دەفەرموێ: کابرایەکی ئەنصاری موسوڵمان بوو، دوایی هەڵگەڕایەوە ئەمجار پەشیمان بووەوەو ناردی بۆلای خزمەکانیو داوای لێ کردن کە بچن بۆلای پێغەمبەر پرسیاری بۆ بکەن

ئـاخۆ رێگـای تۆبـە کردنـی هەیـە، ئـیتر ئـەم ئایەتانـە (٨٦ - ٨٩) هاتنـە خـوارێ، دوایـی خزمـەکانی راسـپاردەکەیان گەیانـدە پێغەمبـەرو کـە دڵنیـا بـوو بـۆی هەیـە تۆبـە بکـا موسـوڵمان بـووەوە، هەنـدێ زانـای دیکـە هـۆی تـر بـۆ نـازڵبوونی ئـەم ئایەتانـە دیـاری دەکـەن، بـە پێویـستمان نـەزانی بیانووسـین..! بەهـەر حـاڵ دەگونجێ هـۆی نـازڵبوونی ئایەتـەکان زیـاد لـە هۆیـەك بێ،هەرچـەندە قەرینـە هەیـە، کـە ئایەتـەکان دەربـارەی جولەکـــەو نەصـــرانییەکان هاتبنـــە خـــوارێ، هـــەروەها دەربـــارەی هەڵوێـــستی موشـریکەکانیش! چـونکە ئایەتـەکانی پێـشوو ئاراسـتەی ئـەوان کـراونو نیقاشـەکەیان لەگەڵ ئەواندا ئەنجام دەدەن. ئیبنو جەریری طەبـەریو خـاوەنی تەفسیری مـەناریش ئەو رایەیان بەلاوە پەسـەندە.. پوختـەی مانـای ئـەم ئایەتانـە ئەوەیـە کـە بێ بڕوایـان دەکاتە سێ تاقم:

ا- ئەوانەی تۆبەیان کردووە تۆبەیەکی راستەقینە، ئایەتەکە ئاماژەیـان بـۆ دەکـاو لە کۆمەڵی پێشوویان دەردەهاوێو دەفەرموێ ﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ﴾.

ب- ئەوانــەی تۆبــەیان نابــەدڵ کــردووەو تۆبەکــەیان بــێ بنــەماو ســاختەییە، ئایەتەکە ئاماژەیان بۆ دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ﴾.

ج- ئەوانــەی لەبنەڕەتــدا تۆبــەیان نــەکردووەو بــەکافری مــردوون، ئایەتەکـە ئاماژەیان بۆ دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ﴾، ئەمەش دەقـی ئـەو ئایەتانەیـە کـە حـاڵو چۆنیەتی ئـەو سێ دەسـتەیان لـە خـۆ گرتـوون کـە دەفـەرموێ: ﴿كَيْفَ يَهْدِي اللّهُ قَوْمًا كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَانِهِمْ﴾ چۆن خـودا گـەلو هـۆزێکی وەکـوو جولەکـەو نەصـارا دەخاتـە سـەر رێگـای راسـتو وایـان لێ دەکـا شـیاوی پـاداشو خۆشـبەختیو پیاهەڵدان بن؟! کە ئەوانـە لـە ڕوانگـەی تـەوراتو ئینجیلـەوە بڕوایـان بـە پێغەمبـەری ئاخر زەمان کردو ﴿وَشَهِدُواْ أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ﴾ شایەدییان دا کـە ئـەو پێغەمبـەرە کـە (محمـد)ی نـاوەو پێغەمبـەری ئـاخر زەمانـە پێغەمبـەرێکی راسـتو حەقـەو پێویـستە هەموو کەس شوێنی بکـەوێ ﴿وَجَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ﴾ بەڵگەی زۆرو بـەهێزیان بـۆ هـات لـە

ئایەتی قورئانو دەقەکانی تەوراتو ئینجیلو باقی ئەو موعجیزانە کە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر دەچەسپێنن.

شایەتیدانی جولەکەو نەصرانییەکان بۆ ڕاستی پێغەمبەرایەتی (محمد) لەو رووەوە بوو: کە ئەوان ئاگاداری مزگێنی دانی پێغەمبەرانی پێشوو بوونو مزگێنییان بە هاتنی ئەو پێغەمبەرە دەداو نیشانەکانی حەزرەتی (محمد)یان دەزانی، سوور بوون لەسەر ئەوە کە هەرکاتێ ئەو پێغەمبەرە رەوانەکرا، خێرا پێش هەموو کەس ئیمانی پێ بهێنن! کەچی کە پێغەمبەر هاتو بانگەوازی ئیسلامی هەڵدا، لەگەڵ هەبوونی هەموو نیشانەکانی تەوراتو ئینجیل تێیدا، چونکە نەژادی جولەکە نەبوو، پێی کافر بوونو بەدرۆیان خستەوەو دژایەتییان کرد:

ئایەتەکە بە وشەی پرسیار ئامێز دەست پێ دەکاو ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە بەگوێرەی بایستو بایست دار (علةو معلول) ئیمان هێنانی ئەو دەستەو تاقمە دوورەو پێغەمبەر لە ئیمان هێنانیان پێی بێ هیوا دەکا، چونکە سوننەتی خودا بۆ برواهێنانی ئادەمیزاد وایە کە لەلایەك بەڵگەی راستییان پێ نیشان بداو، لەلایەك کۆسپو تەگەرە لەبەردەم ئیمان هێنانەکەیاندا رابماڵێ! دەی پەروەردگار هەموو ئەم پێداویستیانەیانی بۆ دابین کردوونو لەسەرەتاوە ئیمانیان بە (محمد) هێناو کەچی دوایی لێی پاشگەز بوونەوە ﴿وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ پەروەردگار گەلو هۆزی وا ستەمکارو بێ وادەو بەڵێن ناخاتە سەر ڕێگای راستو بەحەقیان ئاشنا ناکا! چونکە ئەوان بۆ خۆیان ستەمیان لە خودی خۆیان کرد، پاش ئەوەی بە گوێرەی تەوراتو ئینجیل ئیمانییان پێ هێنا بوو، بەڵام دوای هاتنی ئەو پێغەمبەرەو پەیدا بوونی نووری پێغەمبەرایەتی هەڵگەڕانەوەو لەوادەو بەڵێنی پێشوویان پاشگەز بوونەوە!

﴿أُوْلَئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ اللّهِ وَالْمَلآئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ سزای ئەو گومڕاو سەر ڕەقانە ئەوەیە؛ کە خودا رقی لێیان بێو نەفرینیان لێ بکاو لە رەحمەتی خۆی بێ بەشیان بکا، هەروەها فریشتەو ئادەمیزادیش نەفرینیان لێ بکەنو داوا بکەن لە دونیاو قیامەتدا خودا لە رەحمەتی خۆی دووریان بخاتەوە، چونکە هەرکاتێ ئادەمیزاد لە

هەڵوێستی نارەوایان حاڵی ببن‌و ناوەرۆکیان بۆ دەربکەوێ یەکسەر نەفرینیان لێ دەکەن! خۆ ئەگەر ئەمڕۆش نەبێ سبەینێ، ئەگەر لە دونیاشدا نەبێ لە قیامەتدا لەعنەتیان لێ دەکەن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ إِنَّمَا اتَّخَذْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّاصِرِينَ – العنكبوت/٢٥﴾.

﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ ئەوانە هەتا هەتایە بە نەفرین لێکراو دەمێننەوە، یان هەتا هەتایە لە سزای دۆزەخدا دەمێننەوە! چونکە ئەوان شیاوی لەعنەت‌و نەفرین‌و سزای ئاگرن‌و بە هیچ جۆرێ سزایان لەسەر سووك ناکرێ، ساتەوەختێکیش سوتمانی دۆزەخیان لە کۆڵ ناکەوێ، بەهیچ بەهانەو عوزرێکیش سزاکەیان بۆ دواناخرێ ﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ مِن بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُواْ فَإِنَّ اللهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ مەگەر ئەوانە نەبێ که دوای کافر بوون‌و خودانەناسی تۆبە بکەن‌و بگەڕێنەوە بۆلای خوا، بەدڵ لێ ببڕێن‌و دەروونی خۆیان لە چڵکی بێ دینی پاك بکەنەوەو کردەومیان باش بکەن‌و لە کردارو هەڵوێستی رابوردوویان پەشیمان ببنەوە، ئەوە بێگومان خودا دەرحەق ئەوانە لێخۆشبووەو، لە گوناهی رابوردوویان خۆش دەبێ‌و، رەحمیان پێ دەکا، وەکوو لە ئایەتێکی تردا، دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَعْفُو عَنِ السَّيِّئَاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ – الشورى/٢٥﴾. ئەمانە گرۆهی یەکەمن لە بێ بڕوایان کە تۆبە دەکەن‌و موسوڵمان دەبن!

دەستەو تاقمی دووەم بریتین لە کۆمەڵێکی تری ئەهلی کیتاب‌و ئەم ئایەتە دەستنیشانیان دەکا؛ کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَانِهِمْ ثُمَّ ازْدَادُواْ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ﴾ ئەوانەی لە پێشدا بەنەدیدەیی بڕوایان بە پێغەمبەر هێناوە، پێش ناردنی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) شایەتیان داوە کە پێغەمبەرێکی حەقە، کەچی دوای رەوانەکردن‌و نیگا بۆ هاتن پێی کافر بوون‌و، دژایەتییان کرد، ئەمجا کوفرو بێ دینییان زیادی کرد بەهۆی سووربوونیان لەسەر کافری‌و دژایەتی کردن‌و بەرەنگاری

کردنــی پێغەمبــەرو شــەڕکردن لەگــەڵ موســوڵمانان، ئەوانــە تۆبــەیان لێ وەرنــاگیرێ! ﴿وَأُوْلَئِكَ هُمُ الضَّآلُّونَ﴾ ئەوانــە لــە کوفرو بــێ دینیـدا ڕۆچوونو لـە گومڕایی دا قـاڵ بــوون، ســەرلێ شــێواوو ســەرگەردانن‌و، ڕێگــای ڕزگارییــان لێ گــووم بــووەو هیــوای ڕزگاربوونیان لێ ناکرێو تۆبەیان لێ وەرناگیرێ!!

تاقمی سێیەمیش بەم ئایەتە دەستنیشان دەکا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ الأَرْضِ ذَهَبًا﴾ ئەوانـەی بـەردەوامن لەسـەر کوفرو بـێ دینـیو هەمیشە کرداریـان کـردەوەی کافرانـەو هـەتا مـردن پەخـەیان پـێ دەگرێو لەسەر حاڵەتی کوفر دەمێننەوە، ئەوانە ئەگەر لـە دونیـادا پـڕ بـەزەوی زێـڕی دابێ بە خێرو چاکە، بری هیچ ناکەوێ بۆیو، سزای ڕۆژی قیامـەتی بـۆ سـووک ناکـاو، هـیچ سـوودو قـازانجێکی بـۆی نابـێو، لـە دۆزەخ ڕزگـاری ناکـا! چـونکە کـوفر هـەموو کردەوەیـەکی باشـیان پووچـەڵ دەکاتـەوە، کەسـێك لـە دونیـادا دڵو دەروونـی خـۆی لە چڵکی کوفر بە نووری ئیمان پـاك نەکاتـەوەو خـۆی لـە زەلکاوی بـێ دینـی ڕزگـار نـەکا ئەوە کردەوەی چاکی دونیای لە ڕۆژی قیامەتدا سوودی نابێو قـازانجی پـێ ناگەیـەنێ!! چونکە ئیمان بەخوداو ڕۆژی قیامەتو کردەوەی چاك بەیەکەوە مرۆڤ لە خـودا نزیـك دەکەنەوە، گریمان ئەگەر ئیمانی بێ کردەوەیش کەمە سوودێکی هەبێ بـەڵام کـردەوەی بێ ئیمان هیچ کاتێك سوود بەخش نابێ! ﴿وَلَوِ افْتَدَى بِهِ﴾ تەنانـەت ئەگـەر لـە فـەرزی مەحاڵـدا بڵـێین: لـە ڕۆژی قیامەتـدا ئـەو موڵـكو داراییـەی هـەبێو بیـدا بـە فیدیـەو فەرمبوو هەر لێی وەرناگیرێ! چونکە لە ڕۆژی قیامەت دا ڕزگـاربوون بـە ماڵبەخـشین‌و خانەدانی نابێ، بەڵکوو بە پاکی نەفس‌و کردەوەی چـاکی دونیـایی دەبـێ، کەسـێك دڵو دەروونــی خــۆی بــە بــڕوای پتــەو کــردەوەی چــاك پــاك کردبێتــەوە ئــەوە ڕزگــار بــووە، کەسێکیش بە کوفرو بێ دینی خۆی چڵکن کردبێو کردەوەی خراپی ئەنجام دابێ ئەوە خەسارەتمەندە!!

پوختــەی قــسە ئەوەیــە، لــە ڕۆژی قیامەتــدا بــەهیچ جۆرێــك مــەجالی فیدیــەو تۆڵەدان‌و خۆکڕینەوە نیە، وەکوو دەڵێن: ئـەو ڕۆژە ڕۆژی چـاندن‌و بەرهـەمهێنان نیـە،

رۆژی دروێنەو چنینەوەیە ﴿أُوْلَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ﴾ ئەوانە سزای بە ئێشیان بۆ ئامادەکراوەو دەخرێنە ناو دۆزەخەوەو کەس یارمەتییان نادا و پاڵپشتیان ناکا!.

## جۆری ماڵبەخشینی چاك‌و پاداشی بەخشین

﴿لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٞ ٩٢﴾.

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار دەمکوتی ئەهلی کیتابی کردو هەموو بیرو بۆچوونەکانیانی پووچەڵ کردنەوەو تێی گەیاندن کە ئەوان گەلی هەڵبژاردە نین‌و، پێغەمبەرایەتی لە نەتەوەی ئیسرائیلیدا کورت هەڵنەهێنراوە، ئەوەشیان راست نیە کە دەڵێن تەنها چەند رۆژێك نەبێ بە ئاگر ناسووتێن، پێیان دەفەرموێ: نیشانەی بیروباوەڕی راست ئەوەیە: کە لەماڵی خۆشەویست‌و بەنرخ ببەخشی‌و مەبەست رەزامەندی خودابێ!! دەی ئێوە ئەی جولەکەینە! ماڵ خۆشەویستی ئێوە گەیشتووەتە ئاستێك کە زۆر لە رەزامەندیی خودا بەلاتانەوە لەپێشترە، ئەگەر ویستتان ماڵ ببەخشن کام ماڵ‌و شتومەك بێ نرخ بێ لەوە دەبەخشن! چونکە خۆشەویستی ماڵ‌و دارایی لاتان لە خۆشەویستی خودا زیاترە، دەی ئێوە چۆن بەهیوان لە گرۆی موسوڵمانان‌و راستاڵ بن‌و ماڵ‌و دارایی خۆشەویست‌و بەنرخ نابەخشن؟؟؟ جا بۆ چەسپاندنی ئەم حەقیقەتە فەرمووی: ﴿لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ ئێوە ناگەنە رەزامەندیی خوداو بە ئەهلی طاعەت‌و گەردنکەچ بۆ خودا حسێب ناکرێن‌و شیاوی پاداشی باش نابن، هەتا نەبەخشن لەو ماڵەی خۆشتان دەوێ‌و کە لەماڵی چاك‌و باشی ئێوەیە، ئیتر لە روانگەی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە موسوڵمانانی راستاڵی پێشوو ئەگەر ماڵێکیان خۆش بویستایە لەرێگای خودادا سەرفیان دەکرد!

**ئیمامی بوخاریو موسلیم لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە دەفەرموون:**

ئەبو طەلحە لەناو ئەنصارەکانی مەدینەدا لەهەموو کەس زیاتر دارخورمای هەبوو، خۆشەویسترین باغە خورمایشی باغی (بەیرەحا) بوو کە لەبەردەم مزگەوتی مەدینە لەرووی رۆگەوە بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) زۆرجار تەشریفی دەچووە ناو ئەم باخەوەو لەناوی شیرینی دەخواردەوە، کە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ ئەبو طەلحە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆشەویسترین ماڵو سامان لای من باخی (بەیرەحا)یە ئەوا کردم بە وەقفو خێری بەردەوام،، هیوادارم خودا بۆم بکا بە تێشووی قیامەت، فەرموو: چی لێ دەکەی لێی بکە! ئەوە لەئێستاوە ئەو باخە لەماڵی من دەرچوو! پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەخ بەخ، ئەوە ماڵێکی سوود بەخشەو سەودایەکی قازانج هێنەرە، ئەوی وتت تێ گەیشتمو مەبەستت حاڵی بووم، من وای بۆ دەچم کە بەسەر خزمە هەژارەکانی خۆتدا دابەشی بکەی، ئەبو طەلحە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆنت دەوێ دابەشی بکە، ئیتر بەفەرمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەبو طەلحە بەسەر کوڕە مامو خزمە هەژارەکانی خۆیدا دابەشی کرد.

لە ریوایەتێکی موسلیمدا دەڵێ: لەنێوان حەسسانی کوڕی ثابیتو ئوبەی کوڕی کەعب دابەشی کرد.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە موحەممەدی کوڕی مونکەدیرەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: کاتێك ئەم ئایەتە هاتەخوارێ، زەیدی کوڕی حاریثە ئەسپێکی زۆر چاکی هەبوو ناوی (سەبەل) بوو خۆشەویسترین ماڵ بوو لای هێنایە خزمەت پێغەمبەرو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم ئەسپەم کرد بەخێرو صەدەقە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لێی وەرگرتو کردی بە وڵاخی سواری بۆ ئوسامەی کوڕی، زەید پێی ناخۆش بوو، وەك ئەوە بڵێی وای زانی خێرەکەی لێ وەرناگیرێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دڵنیابە خودا خێرەکەی لێ وەرگرتووی.

ئـەم دوو سەرگوزەشـتـەو نموونەیـە بەلگـەن لەسـەر لێزانـیو دەروون ناسـیو سیاسەت مەداریی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ئەوەتا کەبینی ئەبو طەلحەو زەید لەڕوانگەی سۆزی ئاینییەوە خۆشەویسترین ماڵی خۆیان بەخشی! بۆیە ئـەویش دای بەنزیکترین خزمو کەسوکاریان بۆئەوەی دڵو دەروون دامـەزراوبن... ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ﴾ هەرشتێك لەڕێگەی خودادا ببەخشن، چاك یـان خـراپ بـێ، کەم بێ یان زۆربێ، دڵنیابن خودا پێی دەزانێو پاداشی گونجاوتـان دەداتـەوە لەسـەریو بەگوێرەی نییەتو مەبەستتان حسابتان بۆدەکرێ.

بەیارمەتی خودا تەفسیری جزمی سێیەم تەواوبوو، ئەمجار دەست دەکەین بە راڤەکردنی جزمی چوارەمو بە ئایەتی (٩٣)ی سورەتی (ال عمران) دەست پێ دەکا. خودایە! دڵمان وا لێ بکەی مەبەستمان رەزامەندی زاتی پاکت بێ، ماندووبوونو شەونخوونیمان بۆ بکەیە عەمەلی صالحو لێمان وەربگریو لێی رازی بی!!

محمود أحمد محمد